# کەوچکێك شەکر بۆ قاوەی تاڵ

مەسعوود محەمەد




دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر - هەرێمی کوردستانی عیراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق


هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com


وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com


تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964


دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

.

مەسعوود محەمەد

کەوچکێک شەکر بۆ قاوەی تاڵ - جۆرەوجۆر

کۆکردنەوە و ڕێکخستنی: بەدران ئەحمەد حەبیب

کتێبی ئاراس ژمارە: ١٠٠٠
چاپی یەکەم ٢٠١٠
تیراژ: ١٥٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٥٩١ - ٢٠١٠
ئەخشاندنی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید. ئاراس ئەکرەم
ڕازاندنەوەی بەرگ: مریەم موتەقییان
هەڵەبڕی: تریسکە ئەحمەد
ڕێنووسی یەکگرتوو: بەدران ئەحمەد حەبیب

# پێڕست

# کەیفی جوانرۆیی

دەسکاریکردنی مێژوو و ڕووداوەکانی، بۆ هەر ئامانجێك بێ، کارێکی نارەوایە. چونکە کە دەرگای دەسکاری کرایەوە ئیتر شتێك نییە پێوەی داتەوە یا لە سنوورێك بیوەستێنێ، وەیا هەمیشە ئەم گۆڕینە بەرەو چاکە ئاراستە بکا. درۆ و هەڵە کە بخرێتە ناو مێژووەوە ئێستاکە و داوارۆژیش بەهەڵە دەبا. خۆ هەر ئێستاکە و داوارۆژن کە سەردەمێك دەبنەوە بەمێژوو. بۆیە خۆگرتن لە "درووغی مەسڵەحەت ئامێز" لە شتی مێژوویی، چ زۆر و چ کەم، پێویستیەکی ئەخلاقی و کۆمەلایەتییە بەسەر شانی نووسەرەوە. گۆیا دەبێ ڕاستی چی خراپەیێکی لێ ڕوو بدا تا بیگۆڕین بەناڕاستی! باوەڕم نییە هیچ جۆرە سوودێك هەبێ لە هەر شتێکی کە لەسەر هەڵە و درۆ هەڵبەسترابێ. ئادەمیزاد زۆر پێویستی بەڕاستی هەیە و، گەلێك قوربانیی داوە لەم ڕێگەیەدا. دەتوانم بڵێم تا ئێستاش لە زۆر مەیداندا بۆ ڕاستی تینووە و، ئەوەندەی چێشتووە لە درۆ و خورافاتی کۆن و نوێ تا کاسەی کەلەڕێژی کردووە.

خوێنەری بەڕێز، بەبووریێ لە نووسینی ئەم پێشەکییە ناچارییە؛ چونکە دەمەوێ لە زووەوە عوزر بێنمەوە بۆ دەربڕین و ڕوونکردنەوەی هەندێ ڕووداوی نارەوا کەوا بێ دەسکاری و گۆڕین لە پێشینانم وەرگرتووە، وە بە هەمان چەشن تەسلیمی مێژووی دەکەمەوە. ئاشەرینی و ئاشیاوێك کە دێنە بەرچاوان لە بەشێکی ئەو شتانەی نووسیومن مزە و نرخی ڕاستی و دەستخاوێنییە (ئەمانەت). کەیفی و هاوچەرخەکانی ئادەمیزاد بوون، نەك فریشتە و پەری، ئەوانیش وەك خەڵقی ئەو دەمە شتی وایان گوتووە و کردووە کە بەگشتی لە باوردا بووە و کۆمەی لێ نەکراوە. ئاشێ دوای ساڵەهای ساڵ لە ژیان و مردنیان من بێم کردەوە و گفتاری دەسکردیان بۆ هەڵبەستم یا هی ناشیرن لە کردەوە و گفتاریان بسڕمەوە تا لاپەڕەی ژیانیان بێگەرد و لەککە نیشان بدرێ. چی زانیومە و بیستوومە و بەڵگەم هەیە بۆ باوەڕ پێکردنی ئەوە دەنووسم، وە ئەوەی بۆم ساغ نەبوویێتەوە وەك هەیە تۆماری دەکەم بۆ سەرنج و لێکدانەوەی خوێنەری کورد.

کەیفی وەك مەعلوومە لای ئەوانەی شارەزای شیعر و ژیانین، ناوی فەتحوڵلا و

مەشهووره بە جوانڕۆیی، ناوی باوك و خانەوادەی لای من نەزانراوە و نەمتوانیوە تا ئێستا لێی بکۆڵمەوە. خەریکبوون بۆ وەگیرهێنانی زانینی تەواو لەبارەی سەرەتای ژیانی کەیفی (هەروەها دوارۆژانی پێش مەرگی) خۆتەرخانکردنێکی دەوێ کە بۆ ئێستاکەی من نالوێ، بەڵام لەو باوەڕەدام ئەم بەڕەیە لە سەروکاری کەیفی و ژیانی بەندیوارییەکی ئەوتۆی نییە بەشاعیری و هونەرییەوە، ڕەنگە هەر نرخێکی مێژوویی - هەبێ کە نرخێکی کەم نییە - چونکە کەیفی بلیمەتێکی خۆڕسك بووە، ئەمامێك نییە لە درەختێکی گەورەوە هەڵی دابێ ، بەڵکو هەر لەسەر بنجی خۆی ڕواوە، ئیتر کوڕی کێیە و لە چ خێزانێك بووە و چۆن دەستی کردووە بە خوێندن، پرسیاری ئەوتۆن وەرامیان هەرچی بێ سەرچاوەی شاعیریەتیی کەیفی ڕوون ناکەنەوە.

بەڵێ ڕاستە شارەزایی بەهەموو قوژبنێکی ژیانی ئەم بلیمەتە ئاوات و ئامانجی هەموو کەسێکە کە خەریکی ئەو چەشنە لێکۆڵینەوەن، بەڵام دەخڵێکی ئەوتۆی نییە بەسەر پێگەیشتوویی و گەشەکردنی ئەدەبی کەیفییەوە . وەك بزانم بەشێوەیەکی نزیك لە قەناعەت لە زووییەکی زووی سەرەتای خوێندن و فەقێیەتیی وڵات و کەسی بەجێ هشتووە و لە کۆیە جێگیر بووە و دەستی کردووە بە خوێندنی ڕاستەقینە و شاعیریەتیی ڕەوشەن بووەتەوە لەو دەمەدا کە کەیفی هاتووەتە کۆیە، واتە دەوری چەرخێك لەمەوپێش، بەپێی مقیاسی ئەو چەرخە، کۆیە ناوچەیەکی گرینگی خوێندن و شیعر و ئەدەبیات بووە بە نیسبەت هەموو کوردستان. ئێستاکەش دەماودەم باس دەکرێ کە مەجالیسی زانیاری و ئەدەبیی ڕۆژانەی کۆیە چی لە قۆناغی دەوڵەمەند و دەستڕۆیییەکان و، چی لە مەدرەسە و مزگەوت و تەکیە و خانەقاکاندا دیمەنێکی هەرە دیاری ئەو شارە بووە. ئەدیبی گەورەی وەك قاسید و جەلی و ئەختەر و حاجی قادر و کەیفی و شێخ ڕەزا بەرێکەوت لەو سەردەمەدا نەخزاونەتە ئەو ناوچەیە ئەمانە و زۆری تر لە شوعەرا و مەلا و شێخی ناودار بەروبوومی خوێندنپەرستی و گیانی ئەدەبی بوون کە وەك میرات لە پێشینانەوە بۆ کۆیە بەجێ مابوو. لەم کورتە باسەی ئێستاکەماندا ماوە نییە ڕووبەڕەی مێژووی زانیاری و ئەدەبیی کۆیە بخوێنینەوە، ئەوەندە هەیە دەبێ بڵێین شاعیریەتیی کەیفی لەم کارگەی زانستی و ئەدەبییەی ئەو دەمەی کۆیەدا مشتومال کراوە: بۆیە جێی سەیر پێهاتن نییە کە لە کتێبی (کۆیە و شاعیرانی)دا کەیفی بەشاعیرێکی کۆیی دانراوە.

## کەیفی کوێندەرییە؟

ئەم پرسیارە شتێکی بەدیهییە و داوای وەرام دەکا، چونکە ئەگەر کەیفی جوانڕۆییە، چۆن دەبێ لە شارەزوور و دێی (کوێرەدێ) هاتبێتە دنیاوە؟ هەموو ئەوانەی باسی کەیفییان نووسیوە ناویان بردووە بە (کەیفیی جوانڕۆیی) و لە هەمان کاتیشدا گوتوویانە لە دێی (کوێرەدێ)ی شارەزوور هاتووەتە دنیا، کەچی جوانڕۆ پارچەیەکی کوردستانی ئێرانە و هەرچەندە هاوسنوورە لەگەڵ کوردستانی عێراق و دراوسێی ناوچەی هەڵەبجەیە، دیسان بەهیچ جۆر ناگونجێ جوانڕۆیی شارەزووری بێ. زانایەکی وەك حاجی قادریش کەوا نزیکترین ئینسان بووە لە کەیفی و دوارۆژانی ژیانی کەیفی لە ئەستەموول لەگەڵ ژیانی ئەو ڕۆژانەی حاجی قادر وەك دوو ڕووی یەك پەرە وان کە هەر لە یەکتر جیاواز ناکرێنەوە، ئەویش لەو شینەی کە بۆ مەرگی کەیفیی داناوە و سەرەتاکەی بە (فەلەك بەتیر و کەمانە لە ئێمە چووەتە کەمین) دەست پێ دەکا بە سەراحەت دەڵێ و ڕادەگەیەنێ کە کەیفی شارەزوورییە:

که چوویتە سەر حەدی بابان و عێلەکەی جافان
بگریە هەر وەکو بارانی مانگی فەروەردین
لە قەوڕ بنەوشە بڵێ قەوم و قەبیلە هاوارە
ئەسیرە کەیفی لە ڕۆما لە حەبسی ژێری زەمین
لە (کوێرەدێ)یێ کە (کەیفی)ی تیا بێ فیردەوسە
جەهەنەمە کە ئەما (کەیفی) شاری قوستەنتین
حەزین و دەرهەمی ئەم شارە زۆری بێگانەن
لە حەسرەتی عەجەبا (شارەزووری) چۆن نەگرین

وشەی (عێلەکەی) جافان، وە بەتایبەتی دێڕی دوایی مەرسییەکە گومان ناهێڵێ لەوەدا کەوا حاجی قادر (کەیفی)ی بەشارەزووری ناسیوە.

بەڵام (کوێرەدێ) دەمێنێتەوە بۆ لێکۆڵینەوە و لێدوان. ئاخۆ (حاجی) مەبەستی لە (کوێرەدێ) هەر مانای وشەکەیەتی کە (دێیەکی وێران) دەگەیەنێ یاخود بەدەم ئەوەوە دەیەوێ ڕابگەیەنێ (کوێرەدێ) دێیەکی شارەزوور و مەفتەنی (کەیفی)یە؟ حاجی زۆر جار لە شیعرەکانیدا، وەك شاعیرێکی بەدەسەڵات، لە تێکهەڵکێشانی وشە ناوی هەندێ

شوێنانی کوردستان بەتێکڕایی و ناوچەی کۆیە بە تایبەتی داتاشیوە. بۆ نموونە چەند دێرە شیعرێکی حاجی لێرەدا دەنووسین.

لەو کاغەزەی کە بەهەڵبەست بۆ حاجی مەلا عەبدوڵا ناردوویەتی لە ئەستەمووڵەوە دەڵێ:

مەلایێکی فەقێیانە ویقارت

بەیانت ناوگردە ئیقتیدارت

واتە ویقارت، ویقاری مەلای فەقێ و موستەعیدانە و بەیانت ڕەوانە وەک ناو و دەسەڵاتیشت وەک گرد وایە لە هەمان کاتدا (فەقێیان) و (ناوگرد) یەکەمیان دێیەکە لە نزیک کۆیە، وە دووەمیشیان شاخێکە بەهەشت دێی (جەلی)یەوە کە مەختەنی باپیرە گەورەی حاجی مەلا عەبدوڵایە و لەقەبی (جەلی زادە) لەوەوە وەرگیراوە.

دیسانەوە حاجی قادر لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێ:

لەبی نازەنین بەختەتی جەلی

لە ئێرانەوە گرتوویە تاهەرات

عومەر گونبەتی لەزەتی دانەیی

تەکەڵتووی شکا زیتی ئەسپی حەیات

دێری یەکەم مانای وەک مەعلومە ئەوەیە کە لێوە جوانەکەی بەختی ئاشکرا لە ئێرانەوە تا شاری هیراتی (کە لە ئەفغانستانە) داگرتووە. بەدەم ئەم مانایەشەوە ناوی (نازەنین و جەلی و ئێران- هیران)یشی ئاڕاستە کردووە کەسێ دێن لە ڕیزی یەکتر و یەهاوینەهەواری ناوچەی کۆیە مەعلومن. مانای دێری دووەمیش زۆر ئاشکرایە پێویست بەدووبارەکردنەوەی ناکا، بەڵام لەگەڵ ئەو مانایەدا ناوی دێی (ئومەر گونبەت) و (تەکەڵتوو)یشی دارشتوون کە هەردووکیان لە دەشتی کۆیەن. دوور نەڕۆین هەر لە بەیتی چوارەمی مەرسییەکەی کە لەسەرەوە نووسیمان بەهەمان وریەکاری و تێکهەڵکێش و تەنینی هونەری ناوی (شارەزوور)یشی داتاشیوە:

حەزین و دەرهەمی ئەم (شارە زۆر)ی بێگانەن

مەبەست لە وشەی (ئەم شارە) ئەستەمووڵە، بەڵام کە وشەی ئەم (شارە) کەوتە تەک وشەی (زۆر) بەپێی دەستووری نووسینی کۆن (شارەزوور) پەیدا دەبێ.

بەراستی زۆر لە گوێنەکە (کوێرەدێ)ش وەك دێیەکانی دیکە وا بێ کە حاجی قادر بەتێکهەڵێنیشی وشە ناوی هێناوەتە نێو شیعرەوە و ئەگەر شوهرەتی جوانڕۆی لە مەیداندا نەبوا گومانێکم لەو ڕووەوە بەزەندا نەدەهات نیتر ئەمە بوو خستمیە سەر فیکری پرسیارکردن لە شارەزایێکی ناوچەی شارەزوور، ئاخۆ دێیەك بەناوی (کوێرەدێ) لەوێندا هەیە یا نییە. بۆ ئەم لێپرسینە حەسەن بەگی جافم دەستنیشان کرد چونکە هەم خەڵقی هەڵەبجە و ناوچەی شارەزوورە و هەم لەگەڵ شیعر و مێژوو لە کۆنەوە خەریکە. لە وەرامدا پێی گوتم دێیەکی بەناوی (کوێرەدێ) نەناوەدان و نەوێران لە شارەزووردا نییە. با چی دیکە لەسەر ئەم لاباسە نەڕۆین، ڕاستییەکەی هەرچی بێ، زۆری و کەمییەك ناخاتە نرخی شیعری کەیفییەوە من لێرەدا باوەڕێکی نیهایی ناتوانم دەربڕم بەڵام سوورکردنەوەی مەوزووعەکەش شتێکی سەخت نییە بۆ هەر کەسێك کەوا ئەختێك لە من زیاتر ماوەی خۆماندووکردنی هەبێ.

## کەیفی کەی لەدایك بووە و کەی مردووە؟

بەر لەوە لەبارەی هاتنە دنیای کەیفییەوە بدوێین، بەکورتی لە ساڵی مردنی قسە تەواو دەکەین. حاجی قادر لە مەرسییەکەی کە بۆ مەرگی کەیفیی داناوە مێژووی مردنی بەوشەی (صغیر) دیار داوە، کە بەپێی حیسابی ئەبجەد ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی دەگرێتەوە. لە دیوانەکەی حاجی قادر چاپی هەولێری ساڵی ١٩٦٩ وا نیشان دراوە کە وشەی (کبیر) مێژووی مردنی کەیفییە و ١٣٠٠ پێك دێنێ چونکە لەسەر ئەم وشەیە (کبیر) نیشارە دراوە و لە ژێرەوە شەرح کراوە، بەڵام ئەمە سەهوە و ڕاستییەکەی ئەوە بوو گوتمان. نرخی وشەی (کبیر) بەپێی حیسابی ئەبجەد ٢٣٢ دەگرێتەوە کە هیچ شتێك ڕاناگەیەنێ، ڕەنگە لە دەمی چاپکردن بەهەڵە نیشارەتەکە خرابێتە سەر وشەی (کبیر) لە جیاتی (صغیر).

ئەمە لەبارەی مێژووی مردنی، بەڵام بۆ زانینی ساڵی هاتنە دنیای شتێکی قەتعی وەك بەیتەکەی حاجی قادر نییە، یاخود من نایزانم . لە موناقەشە و بەراوردیکردن بێ نیازمان بکا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ڕووداو و مێژووی بێ شوبهە هەن کە لەگەڵ ژیانی کەیفی تێکەڵ و عەلاقەدارن ڕەنگە لەم ڕووەوە بمانگەیێنێ بەسنووری قەناعەت.

کەیفی ژیانی فەقێیەتیی لە کۆیە لای حاجی مەلا عەبدوڵا ڕابواردووە و لای ئەوی خوێندووە، کەواتە نابێ کەیفی لە تەمەندا لە حاجی مەلا عەبدوڵا گەورەتر بووبێ

چونکە عادەتەن سوختە لە مامۆستای خۆی چووکتر دەبێ. بەڵێ هەندێ ڕێکەوت هەیە بەپێچەوانەی ئەم قاعیدەیە بەڵام بلیمەتێکی وەك کەیفی لێی چاوەڕوان ناکرێ لە مەیدانی خوێندن لە هاوتەمەنی خۆی دابمێنێ. بەپێی ئەوە کە لە کتێبی (کۆیە و شاعیرانی)دا لەبارەی مێژووی هاتنە دنیای کەیفییەوە نووسراوە و سەرچاوەی مەعلوماتەکەشی گۆیا (مێژووی ئەدەبی کوردی)یە دەبێ کەیفی لە ساڵی ١٨١٤ی زاینی لەدایك بووبێ. دەسانەوە کە هەمان کتێبی (کۆیە و شاعیرانی) ڕاپەگەیەنێ ساڵی ١٨١٥ی زاینی کە گۆیا ساڵی لەدایکبوونی حاجی قادرە دەوەستێتە بەرامبەر بە ١٢٤٦ی کۆچی. بەم پێیە دەبێ ساڵی ١٨١٤ی زاینی بوەستێتە بەرامبەر ١٢٤٥ی کۆچی واتە کەیفی لە ١٢٤٥ لەدایك بووبێ. لێرەدا دەبێ بڵێم ئەم ساڵەی ١٨١٥ لە ڕاستیدا ناکەوێتە بەرامبەر ١٢٤٦، وە بەپێی جەدوەلێك کە لە کتێبی (إمارة بهدينان العباسية)دا نووسراوە دەبێ بوەستێتە بەرامبەر ١٢٢٩یا ١٢٣٠ی کۆچی چونکە ئەو جەدوەلە ساڵی ١٨٠٩ دەخاتە بەرامبەر ١٢٢٤. جگە لەمەش بەراوردێکی حوسابی زۆر سادە بۆمان دەردەخا کە مادام ساڵی ئێستاکەی کۆچی ١٣٨٩– ١٣٩٠ بکەوێتە بەرامبەر ١٩٦٩– ١٩٧٠ی زاینی دەبێ ساڵی ١٨١٥ بکەوێتە پێش ساڵی ١٢٣٥ نەك دوای. جا لەبەر ئەمە کە ساڵی ١٨١٤ (کە گۆیا ساڵی هاتنە دنیای کەیفییە) تا ئەو ڕادەیە کەیفی تەمەندارتر دەکا نیتر بە هیچ جۆرێك مومکین نییە خزمایەتیی هەبێ لەگەڵ هاتنە دنیای کەیفی. من ئەو دوو ساڵەی ١٨١٤و ١٨١٥ی زاینی لە حیسابی خۆمدا دەسڕمەوە و موناقەشەی لەدایکبوونی کەیفی وەك لە کتێبی (کۆیە و شاعیرانی) نووسراوە لەسەر ئەساسی ساڵی ١٢٤٥ی کۆچی دەکەم.

من لەم باوەڕەدا نیم کە ئەمەش ڕاست بێ چونکە حاجی مەلا عەبدوڵا لە ساڵی ١٢٥٠ی کۆچی هاتۆتە دنیا و گومانێکیش لەمبارەوە پەیدا نابێ. حاجی مەلا عەبدوڵا هەم خۆی ئەمەی نووسیوە و هەم بە خەتی باوکی واتە حاجی مەلا ئەسعەد لە حاشیەی چەند پەڕێك لە هەندێ کتێبەکانی کتێبخانەی جەلی زادادا نووسراوە.

بەلای منەوە ناشێ کەیفی پێش ١٢٥٠ هاتبێتە دنیاوە ئەگینا ئەمەبوو بەفەقێ لای حاجی مەلا عەبدوڵا. لە حاشیەی خوارووی ڕووپەڕی (٢٧)ی (کۆیە و شاعیرانی)دا نووسراوە کەوا گەلێ کەس دەڵێن ٢٠ ساڵێك دوای ١٨١٤ی زاینی لەدایك بووە. ئەگەر مەبەس لە ١٨١٤ی زاینی هەر ئەوە بێ کە بەپێی لێکدانەوەی لێرە بەپێشەوە دەکەوێتە بەرامبەر ١٢٤٥ی کۆچی، دەبێ کەیفی لە ١٢٦٥ی کۆچیدا هاتبێتە دنیاوە. من

بەمەش قەناعەت ناکەم. چونکە بەگوێرەی هەندێ ئاسار کە لای ئێمە (واتە جەلی زادە) هەن کەیفی لە ساڵی ۱۲۸۰ی کۆچی شاعیرێکی چەسپاو بووە لە فارسیدا. لەو ساڵەدا خێزانی حاجی مەلا عەبدولا لە تاریکیی ژوورێکی بێ پەنجەرە جانەوەرێکی پێوە دەدا و دەیکوژێ. نازاندرێ جانەوەرەکە مار بووە یا دووپشك. کەیفی مەرسیەیێك بۆ مەرگی خێزانی مامۆستای خۆی دادەنێ کە تەنها فەرد و نیوێکم لە بیر ماوە. ئەوەی دیکەی کە لە بیرم نین لەگەڵ هەموو شیعر و ئاساری کەیفی کە لای ئێمە هەبوون لە کەین و بەینی ساڵی ۱۹۶۳دا سووتێنران. ئێرە جێگەی باسکردنی ئەم سووتاندنەی ئاساری نووسراوی جەلی زادان نییە. هەر بۆیەشم باس کرد کە هۆی ناتەواویی مەرسیەکە روون بکەمەوە. فەرد و نیوەکەی کە لە بیرم ماون ئەمەن و بە دەستووری نووسینی فارسی دەیاننووسم:

یانەهایر بکژدم افتادە        یا گرفتار ماری گیسوشد

خوێنەری بەرێز دەبینی کەوا کەیفیش لە شیعرەکەیدا بەوردەکارییەکی شاعیرانەی سۆزناك جانەوەرە ژەهراوییەکە هەر بە نەزانراوی دەهێڵێتەوە. نیوە فەردەکەشی کە دەکەوێتە دواییی مەرسیەکە بەشێك لە مێژووی رووداوەکەی تێدایە بەحیسابی ئەبجەد، بەشەکەی دیکەی وا دەزانم لە نیوەی یەکەمیەتی ئەمی لە بیرم چۆتەوە. ئەمەیە نیوە فەردەکە:

چون یمینو برفت با نوشد

ئەم چەند وشەیە ۱۲۱۲ تەواو دەکا.

باوەڕ ناهێنم بەوە کە لە تەمەنی ۱۵ ساڵیدا ئەم دەسەڵاتە و رەوانییە و زاڵییە بەسەر شیعر و قافیە و مێژوو دەرهێنان لە فارسیدا بۆ کەیفی مومکین بووبێ. هەڵبەت پێش ئەم ساڵەش شیعری فارسیی داناون چونکە خۆ نابێ لە چاو قوچێنێکدا هەم فارسی فێر ببێ و هەم شیعری وا بەهێزی بە فارسی دابنێ. بەڵگەیەکی دیکەش هەیە کەوا لێرە بەدواوە درێژە دەدەین بە باس لێکردنی ئەوە دەگەیەنێ کەوا کەیفی ئەك هەر مومکین نییە پێش ۱۲۵۰ی کۆچی هاتبێتە دنیاوە بەڵکو دەبێ لای ژووروی ئیحتیمال لە ساڵی ۱۲۵۵ تێپەڕ ناکا. بەڵگەکەش ئەمەیە. وەك لە بەشێکی دواییتر لەم نووسینە بۆمان دەردەکەوێ کەیفی تا ساڵی ۱۲۸۶ی کۆچی لای حاجی مەلا عەبدولا خوێندوویەتی، ناچێتە عەقڵەوە کەیفی بەم هەموو زەکاوەتەوە تا تەمەنێکی ۳۶ ۳۷

ساڵی هەر خوێندبێتی و فەقێیەتیی تەواو نەکردبێ چونکە ئەگەر بڵێین لە ساڵی ١٢٥٠دا هاتۆتە دنیا تەمەنی لە ١٢٨٦دا دەگا بە ٣٦، ٣٧ ساڵ، بەڵام ئەگەر مێژووی لەدایکبوونی بخەینە ساڵانی مەبانی ١٢٥٥- ١٢٦٠ تەمەنی لە ساڵی ١٢٨٦ دەبێتە ٢٧-٣١ ساڵ کە موناسبە بۆ گەیشتن بەپایەی (موستەعیدی) و نزیکبوونەوە لە کۆتاییی خوێندنی مەلایانە، واتە ئیجازەوەرگرتن. خۆ ئەگەر لە بیر نەکەین کەوا حاجی مەلا عەبدوڵا لە ساڵی ١٢٨٦ تەمەنی ٣٦، ٣٧ ساڵی بووە ئیتر بەجارێ نزیک دەبینەوە لەوە بتمانی بێنین بەو مێژووەی کە تەحدیدمان کرد بۆ هاتنە دنیای کەیفی چونکە زۆر لە گوێنە ماموستا ٣٦، ٣٧ ساڵی بێ و فەقێش ٢٧، ٣١ ساڵی، هەرچەند بەجۆرێکی قەتعی مومکین نییە بڵێم ساڵی ڕاستەقینەی هاتنە دنیای کامیانە لەو ساڵانە بەڵام بە تەقریبی مەیلم بۆ ئەوە دەچێ کە بڵێم ساڵی ١٢٥٥ی کۆچی ئەو ساڵەیە.

## کەیفی کەی، وە چۆن کۆیەی جێ هێشت؟

هۆی ڕۆیشتنی کەیفی و تۆرانی لە کۆیە هەروەك لە کتێبی (کۆیە و شاعیرانی) و (دیوانی حاجی قادر- چاپی هەولێر) بەکورتی باس کراوە، ئەو ناکۆکییە و شەڕەجنێوە بووە لە بەینی شێخ ڕەزای تاڵەبانی و کەیفی کە ئەنجامی گەیشتۆتە ئەمە حاجی مەلا عەبدوڵا بۆ دڵدانەوەی شێخ ڕەزا لە کەیفی بدا و دەری بکا. چۆنیەتیی ئەم ڕووداوە بە ڕوونکراوەیەکی ئەوتۆ دەنووسین کە گرینگیی ڕووداوەکە لێمان داوا دەکا و بەو نیازەش کە قەناعەتی خوێنەر وەدەست بهێنی.

لەو دەمەدا کە حاجی مەلا عەبدوڵا ماموستای کەیفی بووە، حاجی مەلا عەبدوڵا و حاجی قادر هەردوویان لای حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی زادە، واتە باوکی حاجی مەلا عەبدوڵا بوونە. کەیفی و حاجی قادر هەر چەند تەفاوتێك هەبووە لە مەبانیان لەلایەن تەمەن و پایەی عیلمی چونکە حاجی قادر لە هەردوو ڕووەوە لە ژووروویی کەیفی بووە، دیسانەوە لەبەر هاوەمەشرەبی و شیعردۆستی و بەیەکەوە ڕابواردنیان تا بڵێی برادەر و خۆشەویستی یەکتر بوون، وە هەردوویان زیاتر لە فەقێکانی ئەو دەمەی کۆیە لای بنەماڵەی جەلی زادە و خەڵقی کۆیە لە پێشتر بوون، وە ڕێزیان لێ گیراوە، تەنانەت حاجی و کەیفی لە ماڵی حاجی مەلا ئەسعەد بەئیستیلاحی خۆمانی بە(کوڕی ماڵ) ژمێردراون. پێوەندیی کەیفی بەو بنەماڵەوە لە زۆر موناسەبە و

رووداوی ڕۆژانەی ئەو دەمەیان وەدیار دەدا. بۆ نموونە و ڕوونکردنەوەی ئەو پێوەندییە لێرەدا شتێکی دیکەش دەنووسم وەك ڕووداوی مەرسییەکە: لە ساڵی ١٢٨٣ حاجی مەلا عەبدوڵا دوای مەرگی ژنی یەکەمی، لە ژنی دووەمی بۆ یەکەم جار کوڕێکی دەبێ، لەوە بەهێشەوە هەر کچی بوون. کوڕەکە ناوی بەهانەدینی لێ دەنێن و لە نێوان خەڵقی کۆیە دوای پێگەیشتنی بە (کاکەباو) شوورەتی سەندووە و زووش جوانەمەرگ بووە. کەیفی بەو ناوە کە مامۆستای خۆی کوڕێکی بووە و تازە ئاقانەیە و بنەماڵەی پێ ڕوون بۆتەوە، سەرەڕای پێوەندیی خۆشەویستیی مەیانی هەردوویان بەدەستی خۆی لێفە بۆ منداڵەکە دەدوورێ و بەنەقش و شیعرێ کە خۆی هەڵی بەستوون ڕووی لێفەکە دەرازێنێتەوە:

شیعرەکان مابوون تا ئەوانیش لەگەڵ نووسراوەکانی دیکە لە ساڵی ١٩٦٣ی زایینی سووتان، داخم ناچی لەو شیعرانە هیچم لە بیر نەماون.

حاجی قادر کە دەچێ بۆ ئەستەمووڵ کەیفی لە کۆیە دەمێنێتەوە. ئەو شوورەتەی کە لە نێوان خەڵق باوە لەبارەی ئەوە کە حاجی قادر و کەیفی بەیەکەوە چوون بۆ ئەستەمووڵ کەم و زۆر ڕاستیی تێدا نییە. نەك هەر ئەمە، بەڵکو گەلێ شتی دیکە لەبارەی ژیان و ڕابواردن و خوێندن و سەفەری حاجی قادر بۆ ئەستەمووڵ مالامالن لە هەڵە. یەك لەو غەڵەتە مەشوورانە لێرەدا سوور دەکەینەوە و ڕاستییەکەی دەردەخەین تا لە گوێرەی ئەمیان ئەوانی دیکەشی ڕادەی دوورییان لە ڕاستی بزانرێ. بەپێی ئەوە کە نووسراوە لە دیوانەکەی حاجی قادر (چاپخانەی هەولێر ساڵی ١٩٦٠) گۆیا حاجی و کەیفی لە کەرکووکەوە بەیەکەوە بەرەو ئەستەموڵ ڕۆیبوون و سەفەرەکەشیان لە ساڵی ١٢٧٠ی کۆچی بووە. کەچی حاجی قادر دەستێك لە دوای ئەو مێژووە دەسخەتی هەیە لەسەر حاشییەی کتێبێکی (سیوطی) چاپی عەجەم، وە لە کۆتاییی حاشییەکیان دەنووسێ ئەمەم لە ئاخر مانگی ساڵی ١٢٧٦ی کۆچی لە دێی بێتووش نووسیوەتەوە، واتە تا شەش ساڵ دوای ١٢٧٠ مانەوەی حاجی قادر لە کوردستانی عێراق شتێکە کە بە شاهێدی حاجی قادر سوور بۆتەوە. ئەم کتێبە لای ئێمەیە و حاشیە و شیعر و ڕوباعی و وردەباسی ئەو دەمەی بەزۆری تێدایە کە حاجی بەخەتی خۆی نووسیوونی و تا ئێستا هیچیان بڵاو نەکراونەوە مەگەر دەماودەم ئەویش بەغەڵەت. یەك لەوانە ڕوباعییەکە لە دژی چاپی عەجەم کەوا لە ڕووپەڕەی ٣٦ لە

دیوانەکەی حاجی (چاپی هەولێر) بەهەڵە نووسراوەتەوە و لە ژێری ڕووپەڕەکە شەرح دراوە کە هەر لە شوێنی خۆیدا ڕوباعییەکە وا ناڕێک بووە، وا ئێمە لێرەدا بەڕاست و ڕەوانی و بێ هەڵە و ناڕێکی دەینووسینەوە کە لە شوێنی خۆیدا بەدەقی حاجی لەو کتێبەدا نووسراوەتەوە:

یا ڕەب بەقەدەر حەرفی (سیووطی) یەک یەک
ڕەحمەت لە (مصنف) و لە (قارئ) بێ گەلەک
ئەمما عەجەم و ئەو کەسە چاپی دانا
بیبەاتە جەهەننەم بەعەزاب و بەکوتەک

بەموناسەبەتی ئەم ڕوباعییە کە ڕاستکردنەوەی هەندێ هەڵە لەبارەی ژیانی حاجی و کەیفی پێویستی کرد بینووسینەوە، ئەم ڕوباعییەی دیکەش لە دژی چاپی عەجەم کە حاجی لە ڕووپەڕە (٧٥)ی کتێبەکەی (سیووطی) نووسیویەتەوە لێرەدا تۆمار دەکەین ڕەنگە نەختێک زیاتر تێنووەتیی دۆستانی شیعر و ژیانی کۆنە شاعیرەکانمان بشکێنێ:

شاییت نەبێ بەچاپی عەجەم نەیکڕی ئەمان
گەر پێی ببی بەشا بە دوو شایی خەسارەتە
وەک من ئەگەر بەسەر هەمووی دابێی لە ئاخری
عیلمی هەموو جەهالەتە نەفعی مەرارەتە

خوێنەری بەڕێز ئەوە بزانێ کە حاجی شیعرەکانی بەم شێوە نووسینە نەنووسیون بەڵکو بەشێوە و دەستووری ئەوساکەی نووسیون: (گەلەک و کوتەک) لە کتێبەکەدا (کلک و کتک) نووسراون. ئەم درێژەدانەم بەم تەفسیلاتە بۆیە بوو کە دیسانەوە عەرزی خوێنەر بکەم چی دەینووسم لە دوای بەراوردی و لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەیە بەپێی دەسەلات و ئیمکان و لە سنووری توانینم بێباکیم نەکردووە بەرامبەر ڕاستی و مێژوو، سەرەڕای ئەمەش زیانێک نییە لێرەدا بەجەم باسی ژیانی کەیفییەوە بەموناسەبەی هەڵکەوت و جێگا شتێکیش لە ژیانی هاوچەرخە زلەکەی حاجی قادر ڕوون بکەینەوە

بەهێنێک دوای سەفەری حاجی قادر و مانەوەی کەیفی لە کۆیە شێخ ڕەزای تاڵەبانی دێتە کۆیە و دەرس لای حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی زادە دەخوێنێ، واتە لای باوکی حاجی مەلا عەبدوڵا. هەروەک لێرە لە پێشەوە گوتمان کەیفی فەقێ بووە لای حاجی مەلا عەبدوڵا، ئیتر ڕێکەوت شێخ ڕەزا و کەیفیی لە یەک جێگا کۆ دەکاتەوە و درێژەش

بەمەش قەناعەت ناکەم. چونکە بەگوێرەی هەندێ ئاسار کە لای ئێمە (واتە چەلی زادە) هەن کەیفی لە ساڵی ١٢٨٠ی کۆچی شاعیرێکی چەسپاو بووە لە فارسیدا. لەو ساڵەدا خێزانی حاجی مەلا عەبدولا لە تاریکیی ژوورێکی بێ پەنجەرە جانەوەرێکی پێوە دەدا و دەیکوژێ. نازانرێ جانەوەرەکە مار بووە یا دووپشك. کەیفی مەرسییەیێك بۆ مەرگی خێزانی مامۆستای خۆی دادەنێ کە تەنها فەرد و نیوێکم لە بیر ماوە. ئەوەی دیکەی کە لە بیرم نین لەگەڵ هەموو شیعر و ئاساری کەیفی کە لای ئێمە هەبوون لە کەین و بەینی ساڵی ١٩٦٣دا سووتێنران. ئێرە جێگەی باسکردنی ئەم سووتاندنەی ئاساری نووسراوی چەلی زادان نییە. هەر بۆیەشم باس کرد کە هۆی ناتەواویی مەرسییەکە روون بکەمەوە. فەرد و نیوەکەی کە لە بیرم ماون ئەمەن و بە دەستووری نووسینی فارسی دەیاننووسم:

یانەهابر بکژدم افتادە    یا گرفتار ماری گیسوشد

خوێنەری بەڕێز دەبینێ کەوا کەیفیش لە شیعرەکەیدا بەوریەکارییەکی شاعیرانەی سۆزناك جانەوەرە ژەهراوییەکە هەر بە نەزانراوی دەهێڵێتەوە. ئێوە فەردەکەشی کە دەکەوێتە دوایی مەرسییەکە بەشێك لە مێژووی رووداوەکەی تێدایە بەحیسابی ئەبجەد، بەشەکەی دیکەی وا دەزانم لە نیوەی یەکەمیەتی ئەمی لە بیرم چۆتەوە. ئەمەیە نیوە فەردەکە:

چون یمینو برفت با تو شد

ئەم چەند وشەیە ١٢٩٢ تەواو دەکا.

باوەڕ ناهێنم بەوە کە لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا ئەم دەسەڵاتە و رەوانییە و زاڵییە بەسەر شیعر و قافیە و مێژوو دەرهێنان لە فارسیدا بۆ کەیفی مومکین بووبێ. هەڵبەت پێش ئەم ساڵەش شیعری فارسیی داناون چونکە خۆ نابێ لە چاو قوچێنێکدا هەم فارسی فێر بووبێ و هەم شیعری وا بەهێزی بە فارسی دانابێ. بەڵگەیەکی دیکەش هەیە کەوا لێرە بەدواوە درێژە دەدەین بە باس لێکردنی ئەوە دەگەیەنێ کەوا کەیفی نەك هەر مومکین نییە پێش ١٢٥٠ی کۆچی هاتبێتە دنیاوە بەڵکو دەبێ لای ژوورووی ئیحتیمال لە ساڵی ١٢٥٥ تێپەڕ ناکا. بەڵگەکەش ئەمەیە. وەك لە بەشێکی دواییتر لەم نووسینە بۆمان دەردەکەوێ کەیفی تا ساڵی ١٢٨٦ی کۆچی لای حاجی مەلا عەبدولا خوێندوویەتی، ناچێتە عەقڵەوە کەیفی بەم هەموو زەکاوەتەوە تا تەمەنێکی ٣٦ ٣٧

ساڵی هەر خوێندبێتی و فەقێیەتیی تەواو نەکردبێ چونکە ئەگەر بڵێین لە ساڵی ١٢٥٠دا هاتۆتە دنیا تەمەنی لە ١٢٨٦دا دەگا بە ٣٦، ٣٧ ساڵ، بەڵام ئەگەر مێژووی لەدایکبوونی بخەینە ساڵانی مەبانی ١٢٥٥- ١٢٦٠ تەمەنی لە ساڵی ١٢٨٦ دەبێتە ٢٧-٣١ ساڵ کە موناسبە بۆ گەیشتن بەپایەی (موستەعیدی) و نزیکبوونەوە لە کۆتایی خوێندنی مەلایانە، واتە ئیجازەوەرگرتن. خۆ ئەگەر لە بیر نەکەین کەوا حاجی مەلا عەبدوڵا لە ساڵی ١٢٨٦ تەمەنی ٣٦، ٣٧ ساڵی بووە ئیتر بەجارێ نزیک دەبینەوە لەوە بتمانی بێنین بەو مێژووەی کە تەحدیدمان کرد بۆ هاتنە دنیای کەیفی چونکە زۆر لە گوێیە مامۆستا ٣٦، ٣٧ ساڵی بێ و فەقێش ٢٧، ٣١ ساڵی، هەرچەند بەجۆرێکی قەتعی مومکین نییە بڵێم ساڵی ڕاستەقینەی هاتنە دنیای کامیانە لەو ساڵانە بەڵام بە تەقریبی مەیلم بۆ ئەوە دەچێ کە بڵێم ساڵی ١٢٥٥ی کۆچی ئەو ساڵەیە.

## کەیفی کەی، وە چۆن کۆیەی جێ هێشت؟

هۆی ڕۆیشتنی کەیفی و تۆرانی لە کۆیە هەروەک لە کتێبی (کۆیە و شاعیرانی) و (دیوانی حاجی قادر- چاپی هەولێر) بەکورتی باس کراوە، ئەو ناکۆکییە و شەڕەجنێوە بووە لە بەینی شێخ ڕەزای تاڵەبانی و کەیفی کە ئەنجامی گەیشتۆتە ئەمە حاجی مەلا عەبدوڵا بۆ دڵدانەوەی شێخ ڕەزا لە کەیفی بدا و دەری بکا. چۆنیەتیی ئەم ڕووداوە بە ڕوونکراوەیەکی ئەوتۆ دەنووسین کە گرینگیی ڕووداوەکە ئێمان داوا دەکا و بەو نیازەش کە قەناعەتی خوێنەر وەدەست بهێنین.

لەو دەمەدا کە حاجی مەلا عەبدوڵا مامۆستای کەیفی بووە، حاجی مەلا عەبدوڵا و حاجی قادر هەردوویان لای حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی زادە، واتە باوکی حاجی مەلا عەبدوڵا بوونە. کەیفی و حاجی قادر هەر چەند تەفاوتێک هەبووە لە مەبانیان لەلایەن تەمەن و پایەی عیلمی چونکە حاجی قادر لە هەردوو ڕووەوە لە ژووروی کەیفی بووە، دیسانەوە لەبەر هاومەشرەبی و شیعردۆستی و بەیەکەوە ڕابواردنیان تا بڵێی برادەر و خۆشەویستی یەکتر بوون، وە هەردوویان زیاتر لە فەقێکانی ئەو دەمەی کۆیە لای بنەماڵەی جەلی زادە و خەڵقی کۆیە لە پێشتر بوون، وە ڕێزیان لێ گیراوە، ئەمانەت حاجی و کەیفی لە ماڵی حاجی مەلا ئەسعەد بەئیستیلاحی خۆمانی بە(کوڕی ماڵ) ژمێردراون. پێوەندیی کەیفی بەو بنەماڵەوە لە زۆر موناسەبە و

ڕووداوی ڕۆژانەی ئەو دەمەیان وەدیار دەدا. بۆ نموونە و ڕوونکردنەوەی ئەو پێوەندییە لێرەدا شتێکی دیکەش دەنووسم وەك ڕووداوی مەرسییەکە: لە ساڵی ١٢٨٣ حاجی مەلا عەبدوڵا دوای مەرگی ژنی یەکەمی، لە ژنی دووەمی بۆ یەکەم جار کوڕێکی دەبێ، لەوە بەپێشەوە هەر کچی بوون. کوڕەکە ناوی بەهائەدینی لێ دەنێن و لە نێوان خەڵقی کۆیە دوای پێگەیشتنی بە (کاکەباو) شوورەتی سەندووە و زووش جوانەمەرگ بووە. کەیفی بەو ناوە کە مامۆستای خۆی کوڕێکی بووە و تازە ئاقاتەیە و بنەماڵەی پێ ڕوون بۆتەوە، سەرەڕای پێوەندیی خۆشەویستیی مەبانی هەردوویان بەدەستی خۆی لێفە بۆ منداڵەکە دەدووریٚ و بەنەقش و شیعرێ کە خۆی هەڵی بەستوون ڕووی لێفەکە دەڕازێنێتەوە:

شیعرەکان مابوون تا ئەوانیش لەگەڵ نووسراوەکانی دیکە لە ساڵی ١٩٦٣ی ژاپنی سووتان، داخم ئاچی لەو شیعرانە هیچم لە بیر نەماون.

حاجی قادر کە دەچێ بۆ ئەستەمووڵ کەیفی لە کۆیە دەمێنێتەوە. ئەو شوورەتەی کە لە نێوان خەڵق باوە لەبارەی ئەوە کە حاجی قادر و کەیفی بەیەکەوە چوون بۆ ئەستەمووڵ کەم و زۆر ڕاستیی تێدا نییە. نەك هەر ئەمە، بەڵکو گەلێ شتی دیکە لەبارەی ژیان و ڕابواردن و خوێندن و سەفەری حاجی قادر بۆ ئەستەمووڵ مالامالن لە هەڵە. یەك لەو غەڵەتە مەشوورانە لێرەدا سوور دەکەینەوە و ڕاستییەکەی دەردەخەین تا لە گوێرەی ئەمیان ئەوانی دیکەش ڕادەی دوورییان لە ڕاستی بزانرێ. بەپێی ئەوە کە نووسراوە لە دیوانەکەی حاجی قادر (چاپخانەی هەولێر ساڵی ١٩٦٠) گۆیا حاجی و کەیفی لە کەرکووکەوە بەیەکەوە بەرەو ئەستەمۆڵ ڕۆیبوون و سەفەرەکەشیان لە ساڵی ١٢٧٠ی کۆچی بووە. کەچی حاجی قادر دەستێك لە دوای ئەو مێژووە دەسخەتی هەیە لەسەر حاشیەی کتێبێکی (سیوطی) چاپی عەجەم، وە لە کۆتاییی حاشیەکیان دەنووسێ ئەمەم لە ئاخر مانگی ساڵی ١٢٧٦ی کۆچی لە دێی بێتووش نووسیوەتەوە، واتە تا شەش ساڵ دوای ١٢٧٠ مانەوەی حاجی قادر لە کوردستانی عێراق شتێکە کە بە شاهێدی حاجی قادر سوور بۆتەوە. ئەم کتێبە لای ئێمەیە و حاشیە و شیعر و ڕوباعی و وردەباسی ئەو دەمەی بەزۆری تێدایە کە حاجی بەخەتی خۆی نووسیبوونی و تا ئێستا هیچیان بڵاو نەکراونەوە مەگەر دەماودەم ئەویش بەغەڵەت. یەك لەوانە ڕوباعییەکە لە دژی چاپی عەجەم کەوا لە ڕووپەڕەی ٣٦ لە

دیوانەکەی حاجی (چاپی هەولێر) بەهەڵە نووسراوەتەوە و لە ژێری ڕووبەڕەکە شەرح دراوە کە هەر لە شوێنی خۆیدا ڕوباعییەکە وا ناڕێك بووە، وا ئێمە لێرەدا بەڕاست و ڕەوانی و بێ هەڵە و ناڕێکی دەینووسینەوە کە لە شوێنی خۆیدا بەخەتی حاجی لەو کتێبەدا نووسراوەتەوە:

یا ڕەب بەقەدەر حەرفی (سیووطی) یەك یەك
ڕەحمەت لە (مصنف) و لە (قارئ) بێ گەلەك
ئەمما عەجەم و ئەو کەسە چاپی دانا
بیهاتە چەهەننەم بەعەزاب و بەکوتەك

بەموناسەبەتی ئەم ڕوباعییە کە ڕاستکردنەوەی هەندێ هەڵە لەبارەی ژیانی حاجی و کەیفی پێویستی کرد بینووسینەوە، ئەم ڕوباعییەی دیکەش لە دژی چاپی عەجەم کە حاجی لە ڕووپەڕە (٧٥)ی کتێبەکەی (سیووطی) نووسیویەتەوە لێرەدا تۆمار دەکەین ڕەنگە ئەختێك زیاتر تینوویەتی دۆستانی شیعر و ژیانی کۆنە شاعیرەکانمان بشکێنێ:

شایەت نەبێ بەچاپی عەجەم ئەیکرێ ئەمان
گەر پێی بچی بەشا بە دوو شایی خەسارەتە
وەك من ئەگەر بەسەر هەمووی دابێی لە ئاخری
عیلمی هەموو جەهالەتە ئەفعی مەرارەتە

خوێنەری بەڕێز ئەوە بزانێ کە حاجی شیعرەکانی بەم شێوە نووسینە نەنووسیون بەڵکو بەشێوە و دەستووری ئەوساکەی نووسیون: (گەلەك و کوتەك) لە کتێبەکەدا (کلك و کتك) نووسراون. ئەم درێژەدانەم بەم تەفسیلاتە بۆیە بوو کە دیسانەوە عەرزی خوێنەر بکەم چی دەینووسم لە دوای بەراوردی و لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەیە بەپێی دەسەڵات و ئیمکان و لە سنووری توانینم بێباکیم نەکردووە بەرامبەر ڕاستی و مێژوو، سەرەرای ئەمەش زیانێك نییە لەوەدا بەخەم باسی ژیانی کەیفییەوە بەموناسەبەی هەڵکەوت و جێگا شتێکیش لە ژیانی هاوچەرخە زلەکەی حاجی قادر ڕوون بکەینەوە.

بەهێنێك دوای سەفەری حاجی قادر و مانەوەی کەیفی لە کۆیە شێخ ڕەزای تاڵەبانی دێتە کۆیە و دەرس لای حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی زادە دەخوێنێ، واتە لای باوکی حاجی مەلا عەبدوڵا. هەروەك لێرە لە پێشەوە گوتمان کەیفی فەقێ بووە لای حاجی مەلا عەبدوڵا، ئیتر ڕێکەوت شێخ ڕەزا و کەیفیی لە یەك جێگا کۆ دەکاتەوە و درێژەش

دەدا بەکۆبوونەوە و هاوبەشییان لە یەك ژیان و رابواردن. بویژیی شێخ رەزا و مەیلی بۆ هەجوو شتێك نییە پێویستی بەباس لێکردن بێ ئەوەندە هەیە دەبێ لە بیر نەکەین کەوا کەیفیش بەرادەی شاعیریتیی شێخ رەزا شاعیر بووە هەروەك چاوەروان دەکرێ بەیەکەوەبوون و ژینی دوو شاعیری وەك شێخ رەزا و کەیفی لە یەك مزگەوت بەناچاری سەرەنجامی دەگا بەشەرەشیعر و توکتە تێکگرتن. وردەوردە ئەم شەرەشیعرە لە مەیانی هەردوویان شیدەت دەسێنێ تا دەگا بەپلەی لە یەکتر زویربوون و ناکۆکی. لە نموونەی شەرەجنێوی شیعری کە لە مەیانی ئەم دوو کەڵەشاعیرەدا رووی داوە لێرەدا دوان دەنووسم کە بیستوومن و لە بیرم ماون، بێگومان دەیەها جاری دی شەرەجنێوی وایان کردووە، رەنگە لە کۆیەدا شەخسی وا هەبێ هەندێکیان لەو شیعرە لەبەر بێ. ئەگەر شتی وا هەیە وەدەرخستن و بڵاوکردنەوەی خزمەتێکی بەنرخە بۆ روونکردنەوەی قووڵایی و پانایی ئەم شەرەدندووکییە مێژووییەی کە شاعیرێکی وەك کەیفی ئاوارە کرد لە وڵات.

جارێکیان شێخ رەزا لە دەمەتەقەی شەرە شیعریدا بە کەیفی دەڵێ:

شاعر چو تووی لب بلهانت ریدم
وزفرق سرت تا بدهانت ریدم

شێخ رەزا شیعرەکانی بەتەرتیجالی دەڵێ، کەیفیش دەستبەجێ لە جەوابدا دەڵێ:

فرقی نەچنان بود میانی سر و کیرم
ای ریدە بەکیرم گذری گوت بگیرم

جارێکی دیکەش لە مەجلیسێکی فەقێیانە تێکی تەواوبوونی دانیشتنەکەیان و دوای خواردنی میوەی مەوسم مەلایەك دێ بۆ مەجلیسەکە زۆر عەلاقەدار دەبێ لەگەڵ کەیفی و خۆشەویستی و دۆستییەکی بەتین دەبێ لە مەیانی هەردووکیان، شێخ رەزا بەم شیعرە بەخێرهاتنی دەکا.

گر نخوردی از فواکه ای...
یك طبق انگور و انجیر از برایت ریدەام

بەداخەوە لە بیر ناوی ئەو مەلایەیە کە شێخ رەزا بەشیعر جنێوی پێ دەدا، من ئەو ناوەم لە بیر نەماوە تا بینووسم. کەیفی بێ وەستان لە تۆڵەی دۆستەکەی خۆی بەشێخ رەزا دەڵێ:

آنکه ریدستی برایش من بچشمی کیری خود

بــارهــا انــدرتــهــی کــونــی بــلــورت دیــدهٲم

شێخ ڕەزا تەحەمولی ئەو جەوابانەی کەیفی ناکا، تا وای لێ دێ نەك بەشیعر و نوکتە بەڵکو هەر جنێوی عادی بە کەیفی دەدا و خۆی لێ تووڕە دەکا. لەم حاڵانەدا کەیفی دەڵێ: «شێخ ڕەزا! ئەگەر مەقامی گەورە و چووکییە تۆ مامۆستا و من فەقێ هەمیشە ئامادەم خزمەتکاریت بکەم، خۆ ئەگەر مەقامی شیعر و نوکتەبازییە بەخوا یەك حەرفت لێ ناسەلمێنم».

شەڕەشیعر لە بەینی کەیفی و شێخ ڕەزا تا دێ زیاد دەکا و دەگاتە ڕادەیەك شێخ ڕەزا چی دی خۆی بێ ناگیرێ. وابزانم بێ تەحەمولیی شێخ ڕەزا لەبەر دوو هۆی ئەساسی بووە، یەکەمیان ئەوەیە کە شێخ ڕەزا لە پلەی کۆمەلایەتیدا خۆی زۆر لە ژوور کەیفییەوە گرتووە و پێی ئەستەم بووە ڕووتەیەکی وەك کەیفی بەو چەشنە بێ پەروا بێ لەگەڵیدا، دووەمیان ئەوەیە کەوا کەیفی هەرگیز دانەماوە لە جەوابدانەوەی شێخ ڕەزا، ئیتر مانەوەی هەردووکیان لە یەك جێگا دەبێتە شتێکی نامومکین. حاجی مەلا عەبدولا، مامۆستای کەیفی، لەبەر ئەو دۆستایەتییە کۆنەی کە لە مەهانی جەلی زادان و تاڵەبانیەهاندا هەبووە، بەتایبەتی لەبەر زێدە خۆشەویستییەکی بەینی حاجی مەلا ئەسعەد و شێخ ئەوڕەحمانی تاڵەبانی، واتە باوکی شێخ ڕەزا سەرەڕای مەقام و دەسەلاتی تاڵەبانییان و بێکەسی و بێ نەوایی کەیفی ناچار دەبێ، واتە حاجی مەلا عەبدولا، کە ڕوو لە کەیفی گرژ کا و لێی بتۆرێ تا چارێکیان بەلێدان لێشی داوە ئەوەی لە هەموو کردارێك ناڕەواتر و ناشیرینتر بووە ئەوە بوو کەوا بەچەشنێکی زۆر دوور لە هەموو ڕەفتارێکی جەوانمەردی هەندێ لە فەقێکانی ئەو دەمە بۆ لایەنگریی شێخ ڕەزا و شکاندنی کەیفی وێنەیەك لە دیواری مزگەوت دەکێشن کە پێویست نییە لێرەدا چۆنیەتییەکەی بنووسین و ئەوپەڕی بێ حورمەتی و سووکایەتیی تێدا دەبێ بۆ کەیفی و بوو بەهەتیمەی ڕیسواکردنی شاعیرێکی وا مەزن. بەدوا ئەوەدا حاجی مەلا عەبدولا کەیفیی دەرکردووە لە مزگەوت، ئیتر کەیفی بەو ڕوحی پڕ هەست و هونەرییەوە ڕووی ئەوەی نامێنێ هیچ ماوەیەك لە کۆیە بمێنێ، بەدڵشکاو و بارێك مەینەت و ستەمەوە دەچێتە هەولێر.

نامەوێ بە هیچ جۆرێك لایەنگیری لە نووسینەکەمدا بکەم چونکە لە هەموو شتێك

زیاتر مەبەستم تۆمارکردنی ڕووداوی ڕاستە ئەگینا بۆ من حەدی ئەمەب دەرچوونە بەو شکڵە باسی کارەساتی وا ناڕەوا بکەم کە لە مزگەوتی باپیرم ڕووی داوە. بەڵام بێ ترس و پەروا لەوە کە لە حەقیقەتم لانابێ دەتوانم بڵێم ئەگەر لەبەر زێدەچاری نەبوا باپیرم ڕێی نەدەدا بەکردنی ئەوەی کە لەگەڵ کەیفیدا کرا. هیچ گومان نییە لەوەدا کەوا کەیفی لای حاجی مەلا ئەسعەد وەك کوڕێکی خۆی خۆشەویست بووە و لای حاجی مەلا عەبدوڵا، واتە باپیرم، ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستیی بووە. بۆ خۆم لە حاشیەی کتێبێك خوێندوومەتەوە باپیرم بەخەتی خۆی نووسیویەتی کەوا فڵان حاجی ئەو میقدارە پارەیەی پێ دام بۆ ئەمە بیدەم بە کەیفی لە بری مانگانەی دەرسگوتنەوەی بۆ کوڕەکەی. هەر لەو نووسینەشدا بۆ یەکەم جار زانیم کەوا کەیفی ناوی فەتحوڵا و جوانڕۆییە، چونکە باپیرم ناوەکەی بەم چەشنە نوسیوە (مەلا فتح الله جوانرووی متخلص به کیفی). ئەمە بۆیە باس دەکەم کە پلەی نزیکی و ڕەوابیتی بەینی حاجی مەلا عەبدوڵا و کەیفی ئەختێك زیاتر ڕوون بکاتەوە، چونکە مەعلوومە کابرای حاجی مانگانەکە نادا بە شەخسی سێیەم ئەگەر نەزانێ لەگەڵ خاوەند هەق جیاوازییەکی نییە. لێرە بەدواوەش ئەم ڕاستییە بەدەم گێڕانەوەی سەرگوزەشتی کەیفی زیاتر خۆ وەدەر دەخا.

کەیفی بەدەرکردن و ڕیسواکردن زاهیری پایەی ڕێزی لای خەڵقی کۆیە کەم نەبۆتەوە، وە لە بیریشیان نەچۆتەوە. ماوەیەك دوای ڕۆیشتنی لە کۆیە و مانەوەی لە هەولێر ڕەشید ئاغای حاجی بەکر ئاغای حەویزی (خاڵی باوکم) شاعیر و ئەدیبێکی پایەبەرزی ئەو دەمە بووە و پێوەندیی دۆستایەتی و خۆشەویستیی زۆر بەهێز بووە لەگەڵ کەیفی کاغەزێکی بەشیعر بۆ دەنووسێ و داوای لێ دەکا کە بگەڕێتەوە کۆیە. بڕوام هەیە ئەم کاغەزە بەئاگاداری و لەسەر پەسەندکردنی حاجی مەلا عەبدوڵا بووبێ چونکە جگە لە پێوەندیی خزمایەتیی مەیانی ئەو و ڕەشید ئاغا، هەمڕەوشتی و نزیکییەکی گیانی تەواویش هەبووە. بێگومان ئەو کاغەزنووسین و داخوازییە بۆ گەڕانەوەی کەیفی نابێ لە دژی ئارەزووی حاجی مەلا عەبدوڵا بووبێ . کەیفی لە جەوابدا ئەم بڕە شیعرەی خوارەوە دەنێرێ بۆ ڕەشید ئاغا:

ئەی نووحی ئەجاتم لە دەسی چەرخی جەفاکار
وەی ڕووح و سەر و ماڵی منت جوملە بەنیسار
با خاکی بەری پێت بێ دڵی زار و ئەزارم
با فەرشی سەری ڕێت بێ گوڵ و گوڵشەن و گوڵزار

لەوساوە بەندەی خامە غەزەل نووسی چی شیرین
شەککەر شکەنیت کردووە وەك تووتی بە مینقار
رەشحەی قەڵەمت مشکی لەسەرنامە فتان کرد
هەم خامە و هەم خامە، هەم ئەشعار و هەم ئیشعار
(فی الجملة) کە نووسیوتە لە بۆ نایەوە گۆیە
چوون بێمەوە ئێستەش کە لەسەرمایە شەری یار
ئێستەش وەکو مورغێ کە زەدەی چەنگی هەڵۆ بێ
بێ هۆشم و ئیفتادە پەرێشان و نگونسار
بێ غیرەت و بێ عارم ئەگەر بێمەوە گۆیە
وەك پەیکەری بێ رووت و وەکو سەر رەشی موختار
ئیمسان و دڵم وا بە دەسی دولیسەری دابوو
ئەیدابوو وەها حاجی رەشك دینی بە دیدار
من خەستە تەن و جەستە شکەستەی غەمی ئەو بووم
ئەو بوو بە دەوا و مەرهەمی بێگانە و ئەغیار
خۆت واقیفی ئەسراری کە چۆن ئاخری کاریش
بێ حورمەتی کردم بە قسەی موفسید و بەدکار
چۆن هەیبەتی بردم لە حوزووری حەزەراتی
چۆن هەیئەتی کردم بەسەر و سوورەتی دیوار
هەرچەندە جەفای دام و سەقام لێ ئەدی ئەمما
شاهانە دەکەم مەدح و ثەنای چاکی بە ئەشعار
دائیم لە هەرابانی حوزووری حەزەراتم
ئەمماوە لەبەر تاعەتی تەن تاقەتی دیدار
هەڵناغەڵەتێ (کەیفی) لەمەولا بە فریبت
با بەس بێ وەفای ئێوە و با بەس بێ جەفای یار

خوێنەری بەڕێز سرنجێك بداتە سۆزی ئەم دێرەیان کە دەڵێ:

ئێستەش وەکو مورغێ کە زەدەی چەنگی هەڵۆ بێ
بێ هۆشم و ئیفتادە پەرێشان و نگونسار

من بۆ خۆم ئەوەندە ئەم بەیتە دەخوێنمەوە مووچڕك دەمگرێتەوە، دەتوانم بڵێم بۆن

سۆزی هەناوێکی هەڵقرچاوی لێ دێ... خاوەن هەست و هونەرومەرێکی وەك كەیفی خاوەن گیانی نازكی شاعیری دەبێ چی چێشتبێ لەوەی كە لەگەڵیدا كراوە و چی چەشنە ئینفیعالاتێك سروشت و هۆش و وجوودی داگرتبێ و ئەنجن ئەنجنی كردبێ؛ باوەڕم هەیە ئەوەندە بەخۆیدا شكاوەتەوە هەستی خەجاڵەت و ستەمی كردووە كە نەیتوانیوە تاكە یەك ڕۆژیش دوای كارەساتەكە لە كۆیە بمێنێتەوە. دەسەڵات چییە بەسەر ڕووداوێكی كۆن؟ ئاواتمان ئەوەیە شتێكی وا ڕوو نەداتەوە بۆ هیچ هونەرمەندێك بەڵكو هیچ ئادەمیزادێك.

## دەرچوونی كەیفی لە كۆیە كەی بووە؟

بۆ وەرامی ئەو پرسیارە بەڵگەیێكی مێژوویی هەیە لە ڕووداوی ئەو ڕۆژانە: حاجی مەلا عەبدوڵا لە ساڵی ١٢٨٨ی كۆچی لە ڕێی سووریەوە، لە خزمەت باوكیدا دەچێ بۆ حەج، كاتێك دەگەنە حەڵەب كەیفی مامۆستای كوڕانی والیی ئەو شارە بووە. كە دەزانێ ئەمان هاتوون بۆ حەڵەب خۆی پێ ناگیرێ دەچێتە لایان بۆ بەخێرهێنانیان و هەموو ئەو ڕووداوانەی كەلێنی خستبووە خۆشەویستی و پێوەندیی مەیانیان لە بیر دەچێتەوە. كەیفی هەروەك لە دوا دێرانی ئەو برە شیعرەی لەسەرەوە نووسیمان تیحترامی، دەربڕیوە بۆ مامۆستای خۆی، دیسان لە شاری حەڵەبیش هەمان ڕێزی كۆن لە مامۆستای خۆی دەگرێ و وەك چوكەیێك تێشی بۆ دەكا. حاجی مەلا عەبدوڵا دەگێڕێتەوە دەڵێ خەڵقی حەڵەب زۆریان بەلاوە سەیر بوو كە دەیاندیت كەیفی، مامۆستای كوڕانی والی، كەلوپەل و شتومەك هەڵدەگرێ و بەدوا كابرایەكی كورد دەكەوێ و خزمەتی دەكا، بەتایبەتی چونكە حاجی مەلا عەبدوڵا لە كیسوەتی خادمی لە خزمەت باوكیدا سەفەر دەكا. شتێكی مەشهوورە لە سەفەرەكەی حاجی مەلا ئەسعەد بۆ حەج كە لە هەر جێگایێك تووشی موجادەلەی عیلمی دێ لەگەڵ مەلاكانی ئەو شارانەی كەوتوونەتە سەر ڕێگای حیجاز دەڵێ بانگی قەتارچییەكەم بۆ بكەن تا جەوابتان بداتەوە. مەبەس لێرەدا هەر ئەوە نییە باسی سەرەنجامی كەیفی و ئاشتبوونەوەی بكەین بەڵكو لەگەڵ ئەوەدا دەمانەوێ ساڵی ڕۆیشتنی لە كۆیە سوور بكەینەوە چونكە دیاركردنی ئەو ساڵە هەروەك ئێستاكە باسی دەكەین بەستراوە بەو ساڵی (١٢٨٨)ی كۆچییە كە باسمان كرد. حاجی مەلا عەبدوڵا زۆر جار گوتوویەتی دوای دوو ساڵ لە ڕۆیشتنی كەیفی، لە حەڵەب چاوم پێی كەوتەوە كەواتە تۆران و

رۆیشتنی کەیفی لە کۆیە سالی (١٢٨٦)ی کۆچی بووە. ئەمەی لێرەدا گێرامەوە لە بابەت رۆیشتن و دیتنەوە و ئاشتبوونەوەی کەیفی مەعلووماتێکە بە تەواتور بەئێمە گەیوە و ئەو مێژووانەی کە لەو کورتە نووسینەدا بەیانم کردوون بە خەتی باپیرم حاجی مەلا عەبدوڵا لە موناسەبەی جووناجوون تۆمار کراون. یەک وشەی خۆکردی تێدا نییە.

چەند ساڵێك لەمەوبەر چیرۆکێکی تەمسیلی لە بەشی کوردیی ئێستگەی رادیۆی بەغدا بلاو دەکرایەوە وای رادەگەیاند کەوا کەیفی بەزۆری زۆرداران لە کۆیە دەرکرا. ئەمە کەم و زۆر پێوەندیی بەراستییەوە نییە. ئەوەی لەو رووبەرانەی ئەم نووسینەدا گێرامانەوە هۆی راستەقینەی تۆران و رۆیشتنی کەیفی بووە. خاوەن دەسەلاتەکانی ئەو دەمەی کۆیە رێزی زۆریان هەبووە بۆ کەیفی و حاجی و بێ ئەندازە خۆشیان ویستوون. وەك دیمان رەشید ئاغای حاجی بەکر ئاغا کە یەك لە دۆستانی کەیفی بووە کاغەزی بۆ نووسیوە و داوای گەرانەوەی لێ کردووە. جەوابەکەی کەیفیش گومانێك ناهێڵێ لەوەدا کە دەسەلاتدارەکان سووچێکیان نەبووە لە بەسەرهاتی تۆران و رۆیشتنی کەیفی. هەر شیعرەکانی کەیفی رێز و خۆشەویستییان لێ دەبارێ بۆ رەشید ئاغا کە لە بنەماڵەیەکی بەهێزی ئەو دەمە بووە. دیوانی حاجی قادریش چەند قەسیدەیەکی بە نرخی تێدایە لە ستایشی ئەمین ئاغا و حەمەغا و بەهارێزەری موڵك و میللەتیان دەژمێرێ. مەبەستم لەمەدا شتێك نییە مەگەر حورمەتی مێژوو و راستی.

لێرە بەپێشەوە گوتمان حاجی قادر پێش کەیفی لە کۆیە رۆیبوو:

بەڵگە بۆ ئەمە دوو شتە. یەکەمیان بەڵگەی شایەتی و گێرانەوەیە کە لە جیلی پێش خۆم بیستووە و وەك مەعلووماتێکی خانەوادەیی ماوەتەوە و موجیبێکیش نییە شوبهەی لێ بکرێ. دووەمیان بەڵگەی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە: لەم هەموو ماجەرای شەرەشیعر و جنێو بەیەکدانی بەینی کەیفی و شێخ رەزا یەك ناوی حاجی قادری تێدا زیکر نەکراوە و هیچ دەورێکی نەبووە. حاجی کە شاعیرێکی وا بە دەسەلات و نزیکترین برادەر و دۆستی کەیفی بووە نەدەبوا بەدرێژاییی ئەو کارەساتە بێدەنگ بێ ئەگەر لە ولات با، کە بیاوێکی وەك رەشید ئاغا بەو چەشنەی باسمان کرد بەشداریی کردبێ لەو رووداوە بێگومان دەبوا حاجی قادر هەر ببێتە لایەنگیر و یارمەتیدەری بێ پێچ و پەنا بۆ کەیفی. کە ئەمە نەبووە لەبەر مەوجوودنەبوونی حاجی بووە.

کەمێکی کەم ماوە لە ژیانی کەیفی لێرەدا بتوانم باسی لێ بکەم چونکە ئەوەی کە دەیزانم لە ژیانی حەلەب و ئەستەموولی شتێکی زۆر کەمە. دەڵێن کەیفی کە دەچێ بۆ ئەستەمووڵ بە زوویی فێری زمانی فەرەنسی دەبێ، وە لە ڕۆژنامەیێکی فەرەنسیدا دەبێتە نووسەر. وەك دەگێڕنەوە گۆیا ڕۆژنامەیێکی پاریس لە بارەی کوردەوە شتی ناڕەوا دەنووسی. کەیفی ئەم نووسینە دەبینێ و دەست دەکا بە جوابدانەوەی هەر لەو ڕۆژنامەیە کە خۆی تێیدا نووسەر بووە، لە ڕێزە مەقالێکی مێژوویی چی عەیب و عاری مێژووی فەرەنسە هەیە دەیهێنێتە ڕووەوە بە قەڵەمێکی سووتێنەر نووسینەکانی دەڕازێنێتەوە تا وای لێ دێ باڵیۆزی فەرەنسە ئیحتیجاجێك دەدا بە وەزارەتی دەرەوەی عوسمانی، ئیتر فەرمانبەرانی عوسمانی دەکەونە ئاوبژیکردن تا کەیفی واز دێنێ و چی تر لە سەری ناڕوا.. بەلام دەمی شیرن دەکەن ئەوجا؟

## بەراوردێکی تایبەتی

لەو ڕووداو و مێژووانەی کە ئەمتوانیوە فیکرەیەکی مەیلەو ڕوون و تەحدیدکراوی دەربارە پەیدا بکەم و عەلاقەدارن بەنووسینەکەمان دوانن، یەکەمیان: کەی کەیفی هاتۆتە کۆیە؟ دووەمیان: کەی حاجی قادر لە کۆیە ڕۆییوە بۆ ئەستەمووڵ؟

لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ ڕووداو و مێژووی قەتعی و هەندێکی مەیلەو قەتعی هەن کە ماوەی بەهەڵەچوون تەواوێك تەسك دەکاتەوە وا لە ژێرەوە بە زنجیرە تۆماریان دەکەین.

١- حاجی قادر لە کۆتایی ساڵی ١٢٧٦ی کۆچی لە دێی بێتووش بووە.

٢- کەیفی پێش ١٢٨٠ هاتۆتە کۆیە.

٣- کەیفی لە ١٢٨٦ لە کۆیە ڕۆیوە.

ئەم سێ مێژووە هیچ گومانێکیان تێدا نییە.

٤- حاجی ماوەیێك پێش ڕۆیشتنی لە کۆیە لەگەڵ کەیفی ژیاوە و بەیەکەوە لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد بوون و پێوەندیی دۆستایەتی و برادەرییان بەهێز بووە.

٥- حاجی لەو ڕۆژانەی کە ناکۆکیی بەینی شێخ ڕەزا و کەیفی پەیدا بووە لە ولات نەماوە و چووە بۆ ئەستەمووڵ، یاخود دەتوانین بڵێین کە شێخ ڕەزا هاتووە بۆ

خوێندن لای حاجی مەلا ئەسعەد حاجی قادر لە کۆیە نەبووە. جا ئەگەر بزانرایە کەی شێخ ڕەزا هاتووە بۆ کۆیە بەم زانینە ساڵێکمان بۆ دیار دەکرا کە بگوترێ ئەمە کۆنترین ساڵە کەوا مەعلووم کراوە لەوە بەپێشەوە حاجی قادر کۆیەی جێ هێشتووە.

خوێنەری بەرێز! لە دوای ئاگاداربوون لەو شتانەی کە نووسیومن دەتوانی وەك من لێکدانەوە و بەراوردەیی بکا بۆ دەرهێنان و دەستنیشانکردنی ئەو مێژووانەی کە بە تەواوی مەعلووم نین. خۆ ئەگەر لەگەڵ لێکدانەوەی زەینی پرسیار و تەحقیقاتێکیش بکرێ لەو کەسانەی ئاگاداری ژیان و بەسەرهاتی ئەدیبەکانی کوردن کە چوونەتە ئەستەمووڵ و لەوێ ژیاون، وەك نالی و حاجی و کەیفی و ئیبراهیم حەیدەری و پیاوی دیکەی ئەدیب و ئەفسەر و مەئمووری مەری ڕەنگە مەعلووماتی نوێ و شیعری نەبیستراو و ڕووداوی زۆری وا کە هیچی لێ نازانین وەدەست بێن و ژیان و هونەر و ئەدەبی ئەوان بلیمەت و هەڵکەوتووانەی کوردەواری بەجۆرێکی فراوانتر و قووڵتر ڕوون بکرێنەوە.

بڵاوکراوەی دەفتەری کوردەواری، بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٧٠

# نامەیەك

لە ژمارە (١٦)ی گۆڤاری (بەیان)ی خۆشەویست گوتارێكی ژیكەلانەی ژیرانەی دڵسۆزانەم خوێندەوە لە ژێر ناونیشانی (رەدووكەوتن) دا.

من لە مەڵكەوتی ئێستامدا دەرفەتی خۆڕوونكردنەوەم نییە لە عاست ناوەرۆكی گوتارەكە خۆی، هەروەها بەهۆی هەمان بێ دەرفەتییەوە ناتوانم لەسەر باسی (رەدووكەوتن) بیروباوەڕێك دەربڕم كە لە گۆشەبینیگای خۆمەوە بۆم بووە بە كرلانەی نێوەڕامان لە رەدووكەوتن و گەلێك رواڵەتی تری كۆمەلایەتیمان كەوا تێكڕایان ڕووپێو (مساحە)یێكی بەرفرەوان لە ژیانی كوردەواری پێك دێنن.

لەم چەند دێرە كورتیلەیەمدا، كە دەمەوێ سەرەڕای ڕاگەیاندنی مەبەستم لە نووسین، پەیامی ڕێز و خۆشەویستیشم ڕاگەیەنێ بۆ خاوەنی گوتار و بۆ گۆڤاری بەیان.

هەر هێندەم بۆ دەكرێ چەند تێبینییەكی قوت و سادە بێنمە ڕوو لەبارەی یەك دوو وشە و تەعبیری ناو گوتارەكە لە ڕووی زانستی زمانەوە و گونجان و نەگونجانیان لەگەڵ ڕاستە دەستوورەكانی ڕێزمانی كوردی و بەس.

بەدەنگهاتنم لەو وشە و تەعبیرانە چ زیانێكی تێدا نییە. ئەگەر نیشانەم پێكا بێ سوودی ئەو پێكانە بۆ سەرجوملەی نووسینی كوردییە. خۆ ئەگەر بەسەهووش چووبم لەم سەهوەمدا هەر خۆم دەبمە لایەنی تێشكاو.

لە دێری (٩)ی ستوونی یەكەمی لاپەڕە (٢٢) وشەی (بەمێت) دێتە بەرچاو. خوێنەر دەزانێ، چ جایی نووسەر، ئەم وشەیە كاری ئایندە (فعل مضارع)ی وشەی (هێنای)ە كە لە چاوگی (هێنان)ەوە هاتووە.

بەپێی دەستووری داڕشتنی وەیا وەرگرتنی، كاری ئایندە لە ڕابردووەوە، دەبێ بڵێین (دەهێنێ یاخود دەهێنێت) دانیشتوانی هەندێ ناوچەكانی كوردستان كە شاری (سلێمانی) یەكێكە لەوان نیشانەی كاری ئایندە (فعل مضارع) دەنگی (ئە) بەكاردێنن لە جیاتی (دە) و دەڵێن (ئەهێنێت).

زۆربەی نووسەرانی كورد بەرەو بەكارهێنانی (دە) دەچن، تەنانەت مامۆستا (تۆفیق وەهبی) لە ژمارە یەكی گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورددا گوتارێكی لەسەر ئەم

(ئە، دە)یە نووسی و ئەویش لەو باوەڕەدایە (دە) کوردی ڕەسەنە و دەبێ واز لە (ئە) بهێنرێت.

هەرچەند من لێرەدا ڕێ بەخۆم نادەم بەکارهێنانی (ئە) پاساغ بکەم. دانیش بەوەدا دێنم واز لێهێنانی و نەهێنانی خواهشتێکی نووسەرانە، بەڵام دەتوانم داوا لە نووسەر بکەم لە جیاتی (یەنێت) (نەهێنێت) بنووسێ چونکە قاڵبی (پەنێت) بەکجار ناوچەیی و تەسکییەوە نەگەر هات و هەر کەسە خۆی لکاند بە تایبەتی ئاخاوتنی شار و دێ و گەڕەکی خۆیەوە، دووچاری نووسینێك دەبین بە بەریەوە هەبێ هەندێکمان تێی بگەن و هەندێکیشمان نا!

بەزۆری، نووسەرانی شاری سلێمانی، دەنووسن (پیاوێکی کە - دارێکی کە - ناوی کە - بەردی کە) مەبەسیشیان (پیاوێکی دیکە و دارێکی دیکە..)یە وا دەبێ بەکارهێنانی ئەم (کە)یە لە شوێنی وەهادا سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ. بێگومان (کە)ی ئەم جێگایانە کورتکرایەوەی (دیکە)یە کە مافی ئەوەی نییە لەهجەی شار و گەڕەکی خۆی بسەپێنێ بەسەر شێوازی نووسین و ڕێزمانی ئاخاوتنی زمانی میللەتێك. هەرچەند شێوە ئاخاوتنی سلێمانی بەلای باوەڕی منەوە لە ڕیزی هەرە پێشەوەی زارەکانی کوردیدا دێت، دیسانەوە ناشێ ئەو تایبەتییانەی خۆی کە لە ڕاستە شەقامی کوردییان لاداوە بپانکا بە دەستوور و دەستووره ڕاست و ڕەوانەکانیان بێ کوێر کاتەوە.

نابێ (بچۆرەوەوانێ) بە خۆی و بەم هەموو قورسایی و درێژاییەیەوە نەفەسی (بچۆوە) ببڕێت، هەروەها وشەی (مەند، نەفەندی، دەربەند...) ناشێ بکرێنە (مەنگ، نەفەنگی، دەربەنگ...).

بە نموونە دەڵێم لە فەرەنسیدا شێوەی پاریس هەرە پێشکەوتووی ئاخاوتنی میللەتی فەرەنسییە، خەڵقی پاریسیش دەنگی (ر) بە (غ) دەخوێننەوە، بەڵام لە نووسینی فەرەنسیدا ئەم (ر)ە هەر بە (ر) دەنووسرێت با خەڵقی پاریسیش بە (غ)ی بخوێننەوە..

لە میسر دەنگی (ق) بە (ك) واتە (هەمزەی عەرەبی) دەنگی (ج) بە (گ) دەخوێنرێتەوە، بەڵام ئەوانیش لە نووسینی ئەدەبی و ڕەسمیدا هەر بە (ق، ج) دەیاننووسن تەنانەت بەشێکی زۆری فارس دەنگی (ا) دەکەن بە واو و دەڵێن (تەروون - لە جیاتی تەهران) بەڵام لە نووسیندا ئەلفەکە هەر ئەلف دەمێنێتەوە.

خەڵکی سلێمانیش ئازادن لەوەدا بەقسەکردن چۆنیان بەلاوە خۆشە وەها وشە و پیتەکان دەربڕن، لە زەرووورەتی شیعریشدا چ گلەییێك نایێتە سەر ئەو کەسە شێوەی ناوچەی خۆی بەکار بێنێت، بەڵام نابێ ڕێ بەخۆدان لەوەندە تێپەڕ بکات. ئەم گوتەیەشم بەرامبەر هەموو کوردە، بەڕێکەوت پتر پەخەگیری شێوەی سلێمانی دەبێت لەو ڕووەوە لە سەدی هەشتا وەیا زیاتری نووسینی کوردی لە شاری سلێمانی وەیا خەڵکی سلێمانییەوە زەنە دەکات.

با پێشدەستی بکەم لە کەسێك بیەوێ لە تۆڵەی ئەو ڕەخنانە ڕەخنەی هێندێم لێ بگرێ کەوا من ناوناوە دەنووسم (دەکا، دەبێ) و ناوناوەییێکیش (دەکات، دەبێت ..). ئەم (ت)ەی کۆتاییی فیعلەکانی (دەکات، بکات، دەکەیت، بکەیت) دەمەتەقەییێکی زۆری لەسەر هەیە. ئەوەی ڕاستیش بێ ڕەنگە یەکەم دەمەتەقەی گەورە کە لەسەریان هەڵستابێ لەلایەن منەوە بووبێ، تەنانەت لە گوتارێکی دوور و درێژەدا لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا (بەرگی دووەم) ئەختێك بە درێژی لەسەر ئەم (ت)انە دواوم بەلای منەوە (دەبێ، دەبێت، دەبێتن، ببێ، ببێت، ببێتن) هەروەها (دەکەی، دەکەیت، بکەی، بکەیت) هەموویان ڕاست و دروستن و بەدرێژاییی کات، لە کۆنەوە، بەسەر زار و خامەی میللەتی کورد و نووسەرانی کوردەوە بوون. کەس ڕێی نییە شەقامەڕێی بەرفرەوانی مێژووی ئاخاوتنی کوردی لە خۆوە کوێر کاتەوە .. قسە درێژەی هەیە و دەرفەت تەسك.

با بگەڕێمەوە سەر گوتارەکە خۆی.

لە ستوونی دووەمی لاپەڕە ٢٢ لە دێری شەشەمدا وشەی (هەڵگرتو) هەیە. ڕاستی ئەم وشەیە کە لە سەروبەری ژن هەڵگرتندا بەکار بێ (ژن هەڵگرتو)ە نەك (هەڵگرتو)ی سادە، چونکە بە تەنها چ دەلالەتێك نایگێڕێتەوە بۆ لای ژن، لەوانەیە هەنار هەڵگرتو وەیا بەرد هەڵگرتو بێ. لێرە بەدواوە لەسەر ئەم داڕشتنەی وەك (هەڵگرتو، گرتو، بەرکەوتو، کەوتو، نوستو، کوشتو ...) ئەختێك وردبوونەوە دێتە پێش.

هەر لە هەمان لاپەڕە ٢٢ لە ستوونی سێیەم و دێری هەشتەمدا وشەی (پێ هەڵسەرەکان) بەکار هاتووە پێی ناوێ بڵێم ئەم داڕشتنە بۆ دروستکردنی (ناوی کارا – اسم فاعل) بەکار هاتووە لە (کار – فعل)ی (هەڵستا – هەڵستان). ئێمە ڕێمان هەیە لە زۆر ڕووەوە ئەم (پێ هەڵستان)ە هەڵسەنگێنین و بڵێین ئاخۆ دەشێ لە کوردی (قام

بە)ی عەرەبی بۆ هەمان مەبەس وەرگێڕینە سەر (پێ هەڵستا..)؟ کە ئەمەشمان بەکلا کرد ئەوسا بپرسین ئاخۆ دەبێ بڵێین (بە کارەکە هەڵستام؟ کارەکە پێ هەڵستام؟ بە کارەکە پێ هەڵستام؟) ئاخۆ (هەڵستان) کە خۆی فیعلێکی لێکدراوی تێنەپەڕە (واتە لازمە) دەشێ بەهۆی پێشگرێکی وەک (پێ) بکرێتە تێپەڕ؟ چونکە دەزانین کاری (هەڵستان) تێنەپەڕە و کاری (پێ هەڵستان) تێپەڕە؛ لە عەرەبیدا تێپەڕکردنی کار (تعدیة الفعل)ی تێنەپەڕ بەهۆی (حروف الجر)ەوە دەستوورێکی بەرفراوانی زمانەکەیە. تۆ بڵێی لە کوردیدا ئەمە بلوێ و بشێ؟ من لەو هەموو پرسیارانە و هی تریش، واز دێنم بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنێکی تری ئەم قاڵبە داڕشتنەی (پێ هەڵسەر).

داڕشتنی ناوی کارا (اسم فاعل) لە کوردیدا بە هۆی لکاندنی (ەر) بە کۆتایی فیعلەوە شتێکی تازە داهاتووی نووسینی کوردییە. لە کۆنەوە (نووسەر و خوێنەر و کوژەر) بەکار نەهاتوون. ئەوەی زیهن بەسەهوو دەبا لەم شوێنەدا ناوی کارا (اسم فاعل)ی لێکدراوی وەک (نانکەر، باربەر» و هی ئەوتۆیە کە لە ڕواڵەتدا ئەمرازی (ەر)یان بە دواوەیە و لەوەرا مرۆڤ پەی بۆ ئەوە دەچێ کە (نووسەر، خوێنەر)یش وەک ئەوان داڕێژێ. باسەکە ئەختێك وردبوونەوەی دەوێ بەنیسبەت زمانزانەوە چ جایی ئەوەی بەزمانەوە خەریك نەبووبێ. من لێرەدا بە کورتی و بەوردی لێی دەدوێم تا بگەمە ڕوونکردنەوەی تێبینییەکی تر. وشەکانی (نانکەر، باربەر» وەك وشەکانی (نانخۆر، جلشۆر، دووربین، سەربڕ) جۆرێکن لە ناوی کارای لێکدراو (اسم فاعل مرکب). لەم تەرزە داڕشتن و لێکدانەدا کەرتی دووەمی وشە لێکدراوەکە کە لە فیعلەوە هاتووە سەربەخۆ واتا نادا. سەیری وشەی (پیاوکوژ) بکە. کەرتی (کوژ) لە وشەکەدا کە لە (کوشتن)ەوە هاتووە بە تەنها هیچ واتایێك ڕاناگەیەنێ. هەروەها لە (نانخۆر، جلدرو، سەربڕ)یشدا «خۆر، درو، بڕ» هیچ کامێکیان مەبەستێکی تەواو بەدەستەوە نادەن. لە وشەی وەك (نانکەر، باربەر)یشدا (کەر، بەر) ئەوانیش لەخۆوە واتای تەواویان نییە. ئەم پیتەی (ر) کە لە کۆتایی وشەکاندا هەیە هەر هەمان پیتی ناو فیعلی (کردن ، بردن)ە نەك لەلاوەرا هاتووە وەك ئەمرازی کارایی (فاعلیة). سەیرکە (نانخۆرەر) ئەویش پیتی (ر)ی تێدایە چونکە لە فیعلی (خواردن)دا ئەم (ر)ە بە ئەسڵ هەیە.

لەم شێوە داڕشتنەدا ئەوەندەی فکرم کردبێتەوە تەنها لە دوو فیعلی (دان ، تان) پیتێکی (ر) لەلاوە دێ و کەرتە ناتەواوەکە دروست دەکا و دەگوترێ (ناندەر، چێشت

لێنەر) بەنیسبەت (نان)ەوە ڕەچاو دەکرێ کە ئەم فیعلە بەبێ پێشگر بەکار نایێت دەگوترێ (هەڵنان، لێنان، تێنان، ڕاونان). تەنها لەگەڵ وشەی (ناو)دا دەشێ بێ پێشگر بەکار بێ وەك كە بڵێی (ناوم نا دارا). بەڵام دەبێ ئەوە بزانین لێرەشدا ئیمکان هەیە پێشگرەکە بێتەوە و بگوترێ (ناوم لێ نا دارا). لەمەش زیاتر دەبێ لەبیر نەکەین کەوا ناوی کارای لێکدراو (اسم فاعل مرکب)ی ئەم فیعلەش بەبێ پێشگر دروست نابێ. تۆ دەتوانی بڵێی (ناو لێنەر) نەك (ناو نەر).

بەهەمەحاڵ ئەم تازە قاڵبەی ناوی کارا (اسم فاعل)ی وەك (کوژەر، نووسەر، بینەر) بووە بەداهاتێکی زمان و ئەدەب نە بەکەس ڕەش دەکرێتەوە نە لە ڕەشکردنەوەی چ سوودێك پەیدا دەبێ. من بۆ خۆم بێ پەروا بەکاریان دێنم. ئەمانە و گەلێك باس و خواسی تر لەسەر ئەم جۆرە داڕشتنە ئەویاوە هەڵدەستێ و لێرەدا جێی هەموویان پەیدا نابێ. ئەوەی ڕاستی بێ سەرلەبەری تێبینییەکان ئەو تێبینییە بنجی و تایبەتییە نییە کەوا ڕاستەوخۆ لە وشەی (بێ هەڵسەرەکان)ەوە هەڵدەقووڵێ. لەم وشەیەدا دەستوورێکی گرنگی داڕشتنی ناوی کارای لێکدراو (اسم فاعل مرکب) لە دوو سەرەوە ژێرپێ خراوە:

لە سەرێکەوە ئەو ڕاستییەی لەبیر کردووە کەوا کەرتی فیعل لە ناوی کارای لێکدراودا کورتەبڕێکی فیعلەکەیە نەك هەموو فیعلەکە. تۆ دەڵێی (پیاوکوژ، کاغەزنووس) ناڵێی (پیاوکوژەر ، کاغەزنووسەر) کەچی (بێ هەڵستەر) سەرلەبەری فیعلی (هەڵستان)ی تێدایە.

لە سەرێکی ترەوە کە ئەمەیان یەکجار گرنگتریشە فیعلێکی تێنەپەڕ (لازم)ی کردووە بە ناوی کارا (اسم فاعل) لە حاڵێکدا داڕشتنی ناوی کارا بە لێ زیادکردنی (ەر) لە کۆتایی فیعلەوە تەنها بۆ فیعلی تێپەڕ دەست دەدا و ناشێ و ناکرێ فیعلی تێنەپەڕ بکرێ بە بنگەی ئەم داڕشتنە. سەیری وشەکانی (نووسەر ، کوژەر ، بینەر ، نێرەر...) دەبینی هەموویان فیعلی تێپەڕن نە لە کەس بیستراوە و نە بۆ کەس جایەزە بڵێ (نووستەر ، ڕۆیشتەر ، هەڵستەر، کەوتەر) ناوی کارا لە کار (فعل)ی تێنەپەڕ تەنها یەك جۆر داڕشتنی هەیە ئەویش بەزیادکردنی (و) لە کۆتایی کارەکەوە دەڵێی (نوستو، ڕۆیشتو، هەڵستاو، کەوتو، هلیسکاو، سوتاو...) فیعلی تێنەپەڕ بەرکار (مفعول)ی نییە تاکو داڕشتنی وەك (نانخۆر، دەستشۆر)ی لێ پەیدا بێ. ئەمە دەڵێم لەو ڕووەوە کەوا شتێکی ئاشکرایە لە وشەی وەك (نانخۆر، پیاوکوژ) کەرتی یەکەمی وشەکە

بەرکار (مفعول)ە و پێش کەرتی فیعلەکە کەوتووە. دیارە لە فیعلی تێپەڕیش بەولاوە فیعلی تر پێویستی بە بەرکار نییە.

لەبارەی ئەم قاڵبە داڕشتنەی ناوی کارای لێکدراوەوە دوو تێبینیی تری زۆر گرینگ هەیە دڵم نایێ لە خوێنەری بشارمەوە چونکە هەر یەکێك لەوان لایەنێکی مووقڵاشی و وریەکاریی زمانی کوردی نیشان دەدات.

تێبینیی یەکەم ئەمەیە: لە داڕشتنی ناوی کارای لێکدراوی وەك (پیاوکوژ، نانخۆر، جێگر، دووربین) واتایەکی وەسفیی بەردەوام پەیدا دەبێ نەك کاتی. کە دەڵێی (ئەم پیاوە پیاوێکی تەلاقخۆرە) مەبەست ئەمەیە کەوا کابرا تەلاق خواردنی لێ بووە بەپیشە. بەلام کە گوتت (کوا کابرای تەلاق خواردو؟) ئەو کەسەت لە خەیاڵدایە کە تەلاقی بەسەر زاردا هاتووە، نەك پیشەی تەلاقخواردنە. وا دیارە لەم شێوە داڕشتنەی وەك (نانخۆر، دووربین، پیاوکوژ) کەوا لێکدرانەکەی بووە بە جۆشخواردن لە ڕێی کورتکردنەوەی کەرتی فیعلەکانەوە لە وشەکاندا، زیهن و سەلیقەی کورد هەستی بەمە کردووە کە جۆش خواردنی وشە لەگەڵ بەردەوامبووندا پتر دەگونجێ.

تێبینیی دووەم: ئەمەیە لە وشەی لێکدراوی وەك (گۆشتخواردو- گورگانخواردو- مەرکوشتو- زەهر کوشتو، ڕۆژووشکاندو - شێرشکاندو)دا کە هەموویان لە فیعلی تێپەڕەوە وەرگیراون ئەم داڕشتنانە جارێکیان دەبن بەناوی کارای لێکدراو (اسم فاعل مرکب) جارێکیشیان دەبن بە ناوی بەرکاری لێکدراو (اسم مفعول مرکب). هەر ساتێك وشەی پێشەوەی داڕشتنەکە لێی وەشایەوە بەرکار (مفعول) بێت واتای هەموو وشەکە دەبێتە ناوی کارا (اسم فاعل) چونکە دیارە بەکار (مفعول) چاوەنۆڕی کارا (فاعل) دەکات بۆیە کەرتی دووەمی وشەکە (خواردو) دەبێتە تەواوکەری واتای کارا (فاعل). بەپێچەوانە کە وشەی یەکەمی لێکدراو کە لێی وەشابەوە کارا (فاعل) بێ بەهۆی ئەوەوە کە کارا داوای بەرکار دەکات تێکڕای واتای لێکدراوەکە دەبێتە ناوی بەرکار.

بەنموونە کە گوتت (گۆشتخواردو) چونکە گۆشتەکە دەخورێ واتای وشەکە دەبێتە ناوی کارا. بەلام کە گوتت (گورگخواردو) چونکە گورگ دەخوا و ناخورێ واتە کارایە نەك بەرکار، واتای سەرلەبەری وشەکە دەبێتە ناوی بەرکار. پوختەی گرتە ئەمەیە کارایی و بەرکاری (فاعلیة و مفعولیة)ی ئەم وشانە پێچەوانەی کەرتی یەکەمی وشە لێکدراوەیەکە. بەلام وا دەبێ یەك وشەی لێکدراو بەپێی داخوازیی جێگە جارێکیان ناوی کارا و جارێکیشیان ناوی بەرکارە. بە نموونە کە بڵێی «گورگخنکاندو» لەوانەیە

مەبەستی ئەو بەرخە بێ کە گورگ خنکاندبێتی، لەوانەیشە مەبەستی ئەو سەگە بێ کە گورگی خنکاندبێ.

دەگەڕێینەوە بۆ وشەیێکی تری گوتارەکەی (بەیان) لە هەمان ستوونی چوارەمی لاپەرە (٢٢) لە دێڕی (٢٥)دا وشەی (گێڕاندنەوە) هەیە. ئەختێك لێ وردبوونەوە دەری دەخا ڕاستیی وشەکە (گێڕانەوە)یە نەك (گێڕاندنەوە) چونکە بەهۆی فیعلێکی تێنەپەڕ بەهۆی پاشگری (اندن)ەوە بکەی بە تێپەڕ دەبێ دەست لە تەرکیبی فیعلە تێنەپەڕەکە نەدەیت، هەر ئەوەندەی لەگەڵدا بکەیت کە (اندن)ی بخەیتە سەر. لێرەدا فیعلە تێنەپەڕەکە (گەڕانەوە)یە کە ئەویش بۆ خۆی لە (گەڕان)ەوە هاتووە، کەواتە دەبێ دەست لە تەرکیبی نەدەین و یەکسەر بیکەینە (گەڕاندنەوە) وەك (کوژانەوە – کوژاندنەوە ، بژانەوە – بژاندنەوە...).

بەڵام ئەم فیعلەی (گەڕان – گەڕانەوە) وەك کۆمەڵێك فیعلی تر دەتوانرێ بێ پاشگری (اندن) بکرێتە تێپەڕ لە ڕێی سیغەیێکی تایبەتییەوە کە دەماودەم و پشتاوپشت هاتووە ئەویش سیغەی (گێڕانەوە)یە. دیارە کە گێڕانەوەمان بەکار هێنا دەخڵێکمان بەسەر پاشگری (اندن)ەوە نامێنێ و نابێ بڵێین (گێڕاندیەوە). ئەمە چەند نموونەیێك لە فیعلی وەك (گەڕا – گەڕاندی – گێڕان).

| فیعلی تێنەپەڕ | فیعلی تێپەڕ بەهۆی (اندن)ەوە | فیعلی تێپەڕی ڕاستەوخۆ |
|---|---|---|
| کەوت | کەوتاندی، کەواندی | خستی |
| دڕا | دڕاندی | دڕی |
| گەڕا | گەڕاندی | گێڕای |
| بڕا | بڕاندی | بڕی |

ئەم جۆرە فیعلانە هی تر زۆر هەن لزووم بە گوتنەوەیان ناکا. فیعلی ئەوتۆشی هەیە ڕاستەوخۆ بێ (اندن) دەکرێ بە تێپەڕ وەك:

هات هێنای

هەڵ بوو هەڵی کرد

گیرا گرتی .. هتاد.

دەمەوێ لێرەدا بڵێم ڕێگەت نییە فیعلێکی وەك (کەوت) بکەیتە (خستاندی) یاخود

(گەڕا) بکەیتە (گێڕاندی) واش دەزانم ڕوونکردنەوەی تر پێویست نییە. چاوی کورد بە ئاسانی ئەم وردەیانە دەبینێ هەر هێندەی پێ دەوێ دەستێکی بۆ ڕابهێڵێ.

خوێنەر بمبەخشێ لە بەکارهێنانی ڕێنووسی هەمەچەشنە چونکە دەستم بەڕێنووسی کۆن ڕاهاتووە و چاویشم گەلێک ڕێنووسی تر دەخوێنێتەوە. تێبینیی هەبوون و نەبوونی پیتی داڕژاوی کوردیش دەکەم لەو چاپخانەیەدا کە گۆڤاری (بەیان)ی لێ چاپ دەکرێت. من لە نووسینەکەمدا تەنها لایەنی زمان و ڕێزمانم بەهەند هەڵگرتووە. لەو پەلەپەلەی کە خۆشی تێدا دەبینم پێم نەکرا چاوێک بە نووسینەکەمدا بخشێنمەوە یاخود پاکنووسی بکەم. کە هەڵەیێک لە چاوان چەقی حەز دەکەم ڕێی ڕاستکردنەوەی لێم نەگیرێ و دەرفەتم پێ بدرێ بۆ دەربڕینی بیروباوەڕی ترم، کە هەمبێ، نەک هەڵەکەم یەکجارەکی لەسەر حیساب بکرێ.

دوور کێشانەوەی نووسینەکەم لێرەدا وەستاندمی لەوە چی تر چینە بکەم لە کێڵگەی گوتارە نرخدارە خۆشەکەی (ڕەدووکەوتن)، کەواتە چی تر (بەدووی ناکەوین)

بەیان، ژمارە ١٨، ١٩٧٤

# شاکاریکی ئاگرین

پێشینان بۆ ئەوە خۆ باوێننە ژێر باری زەحمەتی گەیشتن بەدۆزینەوەی هۆیە نهێنییەکانی هەڵکەوت و ڕووداو، بابی ئەوەی ڕواڵەتی بەسەرهات لێی بوەشێتەوە هەندێ کۆمەڵاپەتییان لێ وەرگرتووە و بەپیاساکانی ئەو پەندانەش ڕازی بوون، یەکێك لەو پەندانەی بڕیاری ڕواڵەتی بەسەرهات سەپاندوویەتی گوتەی یەکجار پەرەسەندووی بێ دەستەقەی بەخت و تالعە. منیش وەك پێشینان لەم گوتارەمدا پەیڕەوی ڕواڵەت دەکەم و دەڵێم بەخت و تالع بۆی هەیە ئەگەر بۆی نەبا چۆن ڕەوای دەکە پێنج خشتەکییە یەکجار نرخدارە پیرۆزە ئاگرینەکەی مەلا حەسەنی (قازیی هەڵەبجە) کە سەردەمێك لە پایەی مارسیلیزی کوردی بوو بەم شکڵە بێبوو بکرێ و پشتگوێ بخرێ وەك هەر ڕۆژێك لە ڕۆژان لەبەر گوێی گەلی کوردا نەزرینگابێتەوە:

ئەی کوردی ستەمدیدەیی مەزڵوومی سەهەجار
وەی میللەتی مەعسوومەیی بەدبەختی گرفتار
تاکەی لە خەوان ئێوە و دوشمن هەموو بێدار
تاچەن ئەبێ هەر مەست بن و خەڵقی هەموو وشیار
خۆتان ئەکەنە مەزحەکەیی مەحرەم و ئەغیار

عالەم هەموو مەشغوولی تەلاش و وەس و بردە
هەر میللەتە بۆ خۆیە هەریەکی زەد و خوردە
هەر کەس لە بۆ خۆی حاکمی خۆیە وەکو مەردە
مەحروومی هەموو حەق و حقووق میللەتی کوردە
ماتەم زەدە و سووك و پەریشان و گرفتار

لەم نەفەسی گەرم و هۆندنەوەی شاعیرانە و هەست و سۆزی کوردایەتییەوە چوارە برگەی پێنج میسرەعی دەخوێنیتەوە کە هەموویان نموونەی ئەدەبی پێشکەوتووی ئەوسا و ئێستا و هەموو ڕۆژگارێکن، لە هەندێ شوێنیش هێندە بەرز بۆتەوە و سەرمۆزۆور تێ هەڵکشاوە، تاك تاکە ئەبێ، دەستی هونەرکار و ئەدیبی ئاگاتێ. هەر لە بیرمە لە قۆناغی خوێندنی سەرەتاییمدا، کە منداڵ بووم و تازەپەتازە گروگاڵی

کوردایەتیم دەکرد لەگەڵ هاوڕێکانی ئەوسام. سەرگەرمی خوێندنەوە و گوتنەوەی ئەشید و هەڵبەستی نیشتمانپەروانە بووم و گەلێك جار لە خوێندنەوەیاندا خۆم و هاوڕێکانم جۆش و خرۆشی ساف و بێگەردی کوردایەتی پەیتاپەیتا موچرکی بە لەشە ساواکانماندا دەهێنا، تا لەو کاتە پڕ جەزبە و عیشقی کورد و کوردستاندا ئەم پێنج خشتەکییە لە نێوان ئاڵقەی جەزبەگرتووانی کوردپەروەردا وەك بۆمبای ئاتۆم تەقییەوە و چەند جار لە تین و تاوی جەزبەی کۆنی حەڵقەکەی زیاد کرد و ئەشید و هەڵبەستەکانی لە خۆی بەهێشتەوەی خستە نزمایی و تاریکایییەوە. بەڕاستی کورد لەو کاتەدا کە تازە برینی کارەساتی کوردستانی باکور کەوتبووە دڵییەوە پێویستی بە هەڵبەستێکی بورکانی بوو هاوتای بورکانی ئەوە نگبەتە بێ و هێندەی ئەو کەفوکوڵ و هەستی پەرۆش و ڕق خەفەت و بەزەیی هەڵڕێژێ. لەو ماتەمە زلەی میللەتی کورد نووزانەوە و لاوانەوەی ئەرمەگریان و سینە کوتانی کلاسیکی گوێچکەی شێوەنگێڕ، کە گەلی کوردە، نەیدەبیست.

دەبوو دەنگێکی وەك قرتەنە و بلەرزە باوکەڕۆ و ڕۆڵەرۆی کوڕی شەهیدان هەڵگیرێتەوە بە نرکە و ئەعرەتەی کوڵتەدان بۆ بەرگوێچکەی کورد و ئادەمیزاد و مێژوو پێنج خشتەکییەکەی مەلا حەسەن لەو دەمەدا ئەو قرتەنەیە بوو کرۆژنی شیوەن و للفەی غەزەب و چریکەی هانداتی کردە یەك سیمفۆنیی قەومیی پڕ لە هارمۆنیی مێژوویی.

بەس تاڵیی تاڵانی یەك و کوشتنی یەك بن
بەس جاهیدی بێ دەستی و دەست بەستنی یەك بن
بەس ئانیلی فەوتانی یەك و مردنی یەك بن
مەشغوولی برایەی یەك و یەکخستنی یەك بن
تا کۆمەڵ و یەکدەستە و یەك بن وەکو ئەغیار

هەڵسن لە خەوێ خەزمە دەم و چاوێ بشۆرن
چاوێکی هەڵێنن لە چەپ و ڕاستە بنۆڕن
پرسێکی لەیەك کەن لە چ ئەحواڵ و چ شۆرن
ئەم عالەمە بۆچ عاجز و بێ کەیف و سروورن
بۆچی دەکەن ئەم کوردە فەقیرە هەموو هاوار

ئەم دەنگ و هەرا و نالە و شینە لە چ لایە

ئەم شاهی جگەرسوز و گریینە لە چ لایە

ئەم گشت جەزەع و کوشت و بڕینە لە چ لایە

سەرچاوەیی ئەم چەشمەیی خوێنە لە چ لایە

چی بێ نەبێ ئەم شۆڕش و غەوغایە لە ئەغیار

ئەم دەنگە هەموو ناڵەیی کوردانە لە دەست غەیر

ئەم شۆڕە سەدای شیوەنی کوردانە لە دەست غەیر

ئەم ترکە هەموو سۆزشی کوردانە لە دەست غەیر

ئەم خوێنە گەشە خوێنی شەهیدانە لە دەست غەیر

ئەم نەعرە هەموو نەعرەیی کوردانە لەسەر دار

لەمانەدا شاعیر هەڵبەستەکەی بەبەر قەلافەتی خوێناویی ئەنجن ئەنجکراوی ئەوسای گەلی کورد بڕیوە، کەیلی هەڵبەستیشی نوستادانە چین چین هەڵناوە و پێیەیێ بەرەو پۆپەی بەهێکەری درامی بردووە تاکو لەگەڵ تەرمی شەهیدانی کورد بەسەردارەوە هاوشانی کردووە.

ئەگەر پەندی کۆنینەی بێ تالع و بەختی، لەم ئاگرستانە بەڕاست ئەگەڕابێ بۆ دەبێ ناوێکی ئەبرێ و دەنگێکی ئەبیسترێ و چ زمانێک ئەیڵێتەوە و چ چاوێک ئەیخوێنێتەوە بەشەرمەوە دەڵێم ناوناوە نووسەرێکمان زەنگێکی موژدە و خۆشیمان بۆ لێ ئەدا و بەڵێنی بڵاوکردنەوەی گەنجینەیەکی ئەدەبیی شاراوەمان پێ ئەدا، ولش دەبێ نووسەرێکی تر گوتار بڵاو دەکاتەوە وەک ئەم گوتارەی من، شیعر و شاعیرێکی پێ هەڵئەداتەوە کەچی ئەوەی دێتە ناو کەشکۆڵی تەوەفوعمانەوە شتێک دەردەچێ ئەگەر لەبەر ناچاریی دەوروبەشانەمان نەبێ ئەوە نییە چ کەشکۆڵێک بەخۆیەوە بگرێ. پێی ناوێ من بڵێم هەرچی کێش و قافیەی هەبوو مەرج نییە شیعربێ، هەموو شیعرێکیش هی هەڵدانەوە نییە. تەنانەت کۆبوونەوەی دانا و کێش و قافیەشی نابێتە شیعر ئەگەر مۆسیقاکەی خۆش نەبێ وەیا هێزی بزاڤتنەوەی گیانی گوێگری نەبێ وەیا دارشتنەکەی هونەرکارانە نەبێ:

تا دوشمن بژی لە نێو ولاتان

هەر ژێردەست دەبین نابێ ئەجاتان

دەشعیرە و ئەهیچ ناخۆ چ فەرقێکی دەکرد ئەگەر بگوترابا.

تـا دوشمـن بـژی لـە نێو ولاتمـان
هەر دوشمن دەژی لە نێو ولاتمان

یاخود یەکێك بێ و بڵێ دوێنێ شەو تا بەیانی ڕۆژ هەڵنەهات، وەیا من بڵێم بەدرێژایی نووسینم خەوم لێ کەوتبوو. ژێردەستبوون و نەجاتنەبوون بەیەکەوەیان هەندێکن و کەرتێکن لە ئەنجامە یان و قووڵەکەی ژیانی دوشمن لە ولاتندا.

پێی ناوێ من یەخەی ئەم بەیتە بەستەزمانە بگرم و بەری نەدەم چونکە گەلێك جـاران هـەڵبـەست و پەخشانی هـاوتـای ئـەم پێیدا هـەڵدەگوترێ و نوقڵی شاباشی بەسەردا هەڵدەدرێ، مەبەستیشم لێرەدا ئەوە نییە دەست لەسەر بەرهەمی ئەم و ئەو دانێم و بیکەمە بەڵگەی گوتەکانم هەرچەند هەندێك لەو بەرهەمانەی مەدح دەکرێن وەك (نان و بەفرەکەی) مەلای مەشوور وایە کە خەڵق پەسندیان نەکرد و ئەویش گوتی ئەوەی ڕاستی بێ بۆ خۆشم ڕام لێی نییە. چونکە گومانم نییە لەوەدا بەرهەمی بێ کەڵك کەسیش لە دژی ئەوەستێ لە خۆوە دەمرێ. کەواتە پێویست نییە نووسینی من یا یەکێکی تر خێرایی بکا لە مردنی.

لەگەڵ ئەم ڕاستییەشدا مرۆڤ پەرۆشیەتی بەرهەمی کز و لاواز لە مافی خۆی زیاتری پێ بدرێ، لەوە هەر گەڕێ بەر لەو مافە زیادە. لە سەرەتاوە خەڵقێکی زۆری بە خۆیەوە خەریك کردووە و ڕووپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامانی داگیر کردووە و کرێکار و فەنییەکانی چاپخانەی عەوقاندووە و لە ئەنجامدا پەنجەیێکیش دەخاتە گیرفانی خوێنەرەوە و باجی خۆی لێ دەستێنێ.

وەك گوتـم سەرلـەبـەری پێنـج خشتـەکییەکە ١٤ بڕگەیە واتە جگە لەو شەشەی بەنموونە هاتنە ناو ئەم نووسینەوە هەشتی تری ماوە ئەوانیش لەم ڕێکار و هێز و تەوژمەدان، بەڵام نەمویست ڕووپەڕی زۆری بێ گرمەوە لە ڕووپەڕەکانی بەیان بۆیە نەمهێنانە ناو نووسینەکەم، لێرەشدا کۆتایی بە گوتار دێنم بە ٣ میسرەعی یەکێك لە بڕگەکان و دەهانکەم بەسکاڵای تایبەتی خۆم و گوڵاوپژانی ڕووی خوێنەران.

وا چاکە هەموو موتەحید و یەك دڵ و چا بین
بۆ یـەك نـەکو وەك دەستەبرا هەینی برا بین
مەردانە لە بۆ مەقسەدی یەك پشت و پەنا بین

بەیان، ژمارەی ٢١، ١٩٧٥

# فۆلكلۆر

## بەشی یەكەم

فۆلكلۆر وەهای شۆرەت بەستووە لە نێوان نووسەر و خوێنەراندا كەوا بەو بەرهەمە ئەدەبییە وەیا هونەرییە دەگوترێ خاوەنی ناسراوی نەبێ و بە ماڵی هەموو میللەت لە قەڵەم درابێ.

ئەم ناساندنە و سنوور بە دەورەدا كێشانە گەلێك ڕاستیی گرنگ بە دووری فۆلكلۆرەوە دەشارێتەوە چ لەلایەن قاڵبەوە بێ و چ لەلایەن ناوەرۆكەوە بێ.

فۆلكلۆر بەر لەوە خاوەنی ناسراوی هەبێ یا نەبێ خۆی لە خۆیدا تایبەتییەكە كە ئەگەر لێی دابڕا لە (فۆلكلۆرایەتی) دەكەوێت و دەبێتە شتێكی تر. فۆلكلۆر خاوەن شێوازێكی سەربەخۆیە وەك شەقڵ (علامة فارقة) پێی دەناسرێتەوە. ئەم شێوازە هەرچەند بەر تەعریفێكی پتەو و مەحكەمیش نەكەوێ، یاخود با بڵێم ئەشتوانین تەعریفێكی ڕێكوپێكی بۆ دانێین كە لە شتی تری هەڵاوێرێ، بەزەوق و سەلیقە و هەستی گشتیی مرۆڤ دەناسرێتەوە و سەهووی تێدا ناكرێت.

فۆلكلۆر چونكە لە دڵ و دەروون و قەناعەت و تەجرەبەی میللەتەوە هەڵدەقوڵێ شێوازەكەشی (میللی) دەبێت، واتا لەو شتانە و لەو گوتانە دەچێت كە تێكڕای میللەت دەیكات و دەیڵێت. پاش هەبوونی ئەم مەرجەی (میللیبوون)ی شێوازی بەرهەمی هونەری وەیا ئەدەبی، ناسران و نەناسرانی خاوەنەكەی دەخلێكی نامێنێ بەسەر (فۆلكلۆربوون)ی بەرهەمەكەوە. ئەو لاوكەی (حەسەن جەزراوی) دەیچڕێ بە فۆلكلۆر حیسابە ئەگەر خۆیشی بەندەكانی هەڵبەستبێ. زۆر جاران شاعیری قسەڕەوان لە كاتی هەڵپەڕكێدا بەستەی شایی هەڵدەبەستێ و كۆڕی هەڵپەڕینی پێ گەرم دادێنێ. ئەم بەستانە فۆلكلۆرن هەر چەند بشزانین كابرای شاعیر خۆی هەڵی بەستوون. بەستەی شایی هەمووی یەك شێوە و شێوازن خاوەنەكەی هەر كێ دەبێ با بێ.

هەر لەم لێكدانەوەشەوە دەزانین ئەو بەرهەمە ئەدەبییە وەیا هونەرییەی كە شێوازەكەی (میللی) نەبێ بە فۆلكلۆر دانانرێ با خاوەنەكەشی نەناسرێ. گریمان غەزەلێك خاوەنەكەی نەناسراو مایەوە، هەرگیز غەزەلەكە ناچێتە ڕیزی فۆلكلۆرەوە وە

هەروەهاش پارچە مۆسیقایێکی نوێ نابێتە فۆلکلۆر هەرچەند دانەرەکەشی ناوی خۆی بەدەستەوە نەدات.

ئەگەر ئەمەی لێرەدا دەیڵێم ئەسطەمێندریّ بۆ دەرخستنی بابەتی فۆلکلۆری، دەبێ هەموو بەیتەکانی عەلی بەردەشانی لە ڕووپەڕەی فۆلکلۆری کوردی بسڕێتەوە. هەموو ئەو غەزەل و قەسیدانەی خاوەنەکانیشیان نەناسراون بچنە ڕیزی فۆلکلۆرەوە کە ئەمە کارێکی بریتییە لە ماڵ گوێزانەوەی فۆلکلۆر بۆ خانەیێکی تری ناناشنا و تێخزانی بێگانە لە ماڵەکەی فۆلکلۆر.

من ئەمە دەڵێم هەرچەند دەشزانم فۆلکلۆر بە زۆری لەو بابەتانە پێک دێت کە خاوەنی نەناسراوە ئەمە دەڵێم چونکە من بڵێم و نەڵێم (ناسران و نەناسرانی خاوەن) تێکەڵ بە سروشت و ناوەرۆک و شێوازی فۆلکلۆر نابێت و دەخلێکیشی بەسەریانەوە نییە.

دەزانین بە عادەت پیاوی هەژار بیتاقەی دەرەجە دووی سینەما دەبڕێ و لە ریزە ناخۆشەکانی پێشەوە دادەنیشێت. بەلام هەژار هەر هەژارە ئەگەر لە لۆجیش دانیشێت، دەوڵەمەندیش نابێتە هەژار ئەگەر بە قاچاغیش بچێتە ریزەکانی دەرەجە چوار. هەروەک هەژار و دەوڵەمەند بە جێگۆڕکێ خۆگۆڕکێ ناکەن، هەروەهاش فۆلکلۆر و بابەتی تر بە ناسران و نەناسرانی خاوەنیان بەیەکتر ناگۆڕێنەوە.

لەمەدا چ گرفت نییە بەلام دەبێ وەرامی تێبینییەکی تر بدرێتەوە: دەگوترێ لە فۆلکلۆردا کەسایەتی و شەقڵی (دانەر) کە تاکێکی میللەتە دیار ناکەوێ و ئەوەی تێیدا دیارە گیان و هەست و جووڵەی هەناوی میللەتە وەک ئەوەی کە میللەت خۆی دانەرەکەی بێ.

ئەم تێبینییە زۆر راستە. بەلام دیسانەوە چ دەخلێکی بەسەر ناسران و نەناسرانی دانەرەوە نییە چونکە بابەتی فۆلکلۆری، بەتایبەتی ئەوەی لە زاراوە دەربێت، دەبێ تاکێک دایبنابێت. کە گۆڕانیشی بەسەردا هاتبێت هەر تاک گۆڕیویتی، خۆ میللەت لە سەرەتای دانانی بەندێک وەیا بەستەیێک نەهاتووە خۆی بکات بە (کۆرەس) و تێکڕای تاکەکانی بەیەکەوە دەنگ هەڵبڕن و قسەکانی بڵێنەوە تاکو بتوانین خۆ بدزینەوە لە دانیشتنان بە دەوری تاک لە بەرهەمهێنانی فۆلکلۆردا.

ئەم ڕاستییانە بەولاوە بنێین کە لە ڕادەی بەڵگەنەویستدان. ئەگەر فۆلکلۆرمان لە

(تاك) ستاندموه و به گەلمان بەخشی، كە دەزانین ستاندنەوە بەخشینێكی بێ جێ و نارەوایە. چ شەرمەنێكی زیاد بە فۆلكلۆر دەگەیەنین كە پێشتر نەبوو؟ ئەگەر دانیش بە دەوری تاكدا بێنین لە فۆلكلۆردا، كە دەزانین دان پێداهێنانێكی خوێندەوارانەیە كام پایە و نرخمان لە فۆلكلۆر داشكاند كە پێشتر هەبوو؟ دەبێ بزانین (گەلدۆستی) هەرگیز (تاكنەویستی) نییە. گەل بریتییە لە كۆمەڵێك (تاك) و چەندین ڕابەڵی كۆمەلایەتی لە بیروباوەڕ و نەریت و پێوەندی و چاكە و خراپە كە نابێتە ئەژمارەوە لە نێوان ئەم كۆمەلایەتییەدا خۆشی و ناخۆشیی تاكەكان ڕادەگەیەنێ ئایا كۆمەڵ بەختیار ە یاخۆ چارەڕەش؛ كۆمەڵ بۆ خۆی لەش و هەستی تایبەتی نییە تاكو لە خۆشیی و هەبوویی تاكەكان كەم كەینەوە و بەوی ببەخشین و بڵێین گەلمان شاد كرد. كە تاكەكانی ناشادبوون شادی لە نێوان گەلدا پەیدۆست دەكات. خۆ ماندووكردن بەرەشكردنەوەی دەوری تاك لە فۆلكلۆردا ڕاستەوخۆ دەمانكات بە ناحەزی گەل چونكە بەمەدا ستەممان لە تاكێكی هۆشیار (ڕەنگە دڵسۆزیش ڕاست بێ بگوترێ) و هونەرمەندی گەل كردووە و بایی پوولێكیش سوودمان بە هیچ یەكێك لە تاكەكانی تری گەل نەگەیاندووە.

سڕانەوەی كەسایەتی و شەقڵی تایبەتیی دانەر لە بەرهەمی فۆلكلۆریدا، وەك پێشتر گوتم، مەرجێكی گرنگە لەو مەرجانەی بەرهەم دەیاتە ڕیزی فۆلكلۆرەوە، بەڵام ئەم مەرجە لەلاوە خۆی بەمل فۆلكلۆر و دانەری فۆلكلۆردا نەبڕیوە بەڵكو لە سروشتی بابەتی فۆلكلۆرییەوە زەنەی كردووە وەك كە ئاو لە كانی زەنە دەكات و لەلاوە بۆی ناهوازرێتەوە.

ئێمە كە سەلماندمان بابەتی فۆلكلۆری لە دڵ و دەروون و قەناعەت و تەجرەبەی میللەتەوە هەڵدەقوڵێ (وەك لە سەرەتاكانی ئەم گوتارەدا گوتم) بەوەدا شێواز و ڕێباز و دەم و ڕاوێژ و بەشی هەرە گرنگی ناوەرۆكیشمان لە بابەتی فۆلكلۆریدا دەستنیشان كردووە چونكە ئەوەی لە میللەت ئەوەشایەوە و لەوانە نەبوو لەو هەڵستێ چ لەلایەن ناوەرۆكەوە بێ چ لەلایەن شێوەوە لە خۆوە بێ تێكەڵبوونی من و تۆ لە دەفتەری فۆلكلۆردا ڕەش دەبێتەوە یاخود با بڵێم ناچێتە دەفتەری فۆلكلۆرەوە چونكە بە خۆیەوە ناگرێ وەك كە مریشك جوجكەی لەگەڵەك بەخۆوە ناگرێ.

خوا لێخۆشبووی مەلا عەبدوڕەحمانی ڕاجی بەلاسایكردنەوەی عەلی بەردەشانی گەلێك بەیتی خۆشكەڵە و نێسك سوكی دانابوون. ئەم بەیتانە لەلایەن شێوازەوە

کوتومت وەك هی بەردەشانی بوون. بەڵام ناتوانم بڵێم ناوەرۆکەکەشی بە هی ئەو دەگێران. ئێستا هێندەم بەبیر نەماوە بزانم ئایا چ بابەت و مادەی مەلایانە و خوێندەوارانەیان تێ کەوتبوو کە بیانکا بە ماڵی مەلا و خوێندەوار یاخود لەویشدا سادە ماڵی میللەت و عەوامی لە کار هێنابوو. لە فەرزی ناوەرۆکی ئەو بەیتانە سەر بە بابەتی فۆلکلۆری بن چ دەمەتەقە هەڵناستێ لەوەدا کە پێیان بگوترێ فۆلکلۆر هەرچەند دەشزانین مەلایێکی شاعیر دایناون چونکە ئەوەی کە لە فۆلکلۆر بە مەرجی بنجی بگیرێ تێیاندا پەیدا دەبێ هەر هێندە دەمێنێتەوە کە بەیتەکانم بۆ خوێندیتەوە پێت نەڵێم هی مەلا راجین، کە حاڵیش وابوو دیارە چ بایەخێك بەوە نادرێ ئایا پێم گوتوویی یا پێم نەگوتوویی بەیتەکانیان خاوەنیان هەیە یا نییە؟ ئەوەی بایەخدارە لێرەدا رادەی نزیکبوونەوەی بەیتەکانە لەو شێوە و ناوەرۆکەی کە ئەگەر میللەت بەیتیان دابنێ، بەو شێوەیە و لەو ناوەرۆکەیان دادەنێ، ئەوپەڕی داشکانی بەیتەکانیش لەلایەن فۆلکلۆربوونیانەوە ئەوەیە کە بگوترێ ئەو بەیتانە بابەتی فۆلکلۆرین و فڵانە کەس دایناون کە ئەمە چ فەرقێکی نییە لەگەڵ ئەوەدا بڵێین بەیتەکان بابەتی فۆلکلۆرین و خاوەنیان نەناسراوە.

ئەم دەمەتەقەیەی کەم بایەخی، وەیا بێ بایەخی، ناسران و نەناسرانی خاوەنی فۆلکلۆر سەرەتایێکە لەبارەی لایەنێکی تا بڵێی بێگانەی دوورەپارێز کە بگیرێ بەو تایبەتی و سروشت و خاسیەتەی کە لە ناوەرۆك و شێوازی فۆلکلۆردا دەبن بە ماك و پێکهێنەر.

رەنگە خوێنەر هەبێ بڵێ چۆن دەشێ (ناوەرۆك) دابلەنگێ و بخرێتە تای تەرازووی شێوازەوە وەك لەم رستەیەی سەدا کە تازە بەکارم هێنا هەردووکیانم لە یەك رێکار ( مستوی) داناوە؟ بێگومان ئەگەر ناوەرۆك مەبەس بوو لە بەرهەمدا شێواز ئەو نرخەی نابێ بیگەیەنێتە ریزی ئەوەوە وەك کە دەبینین مرعادەلەیێکی حیساب وەیا زانیارێکی جوغرافی وەیا پرسیارێکی فەلەکی لە هەر قاڵبێکدا بێت نرخی کەم و زیاد ناکات، بەڵام هەموو ئەو بەرهەمانەی کە بریتین لە (ناوەرۆك و شێواز) نرخی شێواز تێیاندا شانبەشانی نرخی ناوەرۆکەوە دێت، تەنانەت لە زۆر بابەتی هونەریدا نرخی شێواز پێش نرخی ناوەرۆك دێت چونکە مەبەستی یەکەم لەوێدا (جوانی، رێکی، جۆری تەعبیر، هارمۆنی و گونجان....) مەبەس دەبێ نەك مادەی بابەتەکە وەك کە یەکێك بە دوا خەتی خۆشدا بگەرێ یەکەم شتێ مەبەستی دەبێ خەتەکە و شکڵەکەی دەبێ نەك

واتاکەی، تا ئەگەر دیندارێکیش بێ رازی نابێ پارە بە (بسم الله الرحمن الرحیم)ی ناخۆش نووسراو بدا بەڵام رەنگە روباعیێکی پشت لە دیتی خەیام بە پارەیێکی زۆر بکڕێ بەمەرجێك خەتەکەی خۆش بێت. خولاسە لە گەلێك حاڵدا لایەنی (چۆن) بەسەر لایەنی (چی)دا زاڵ دەبێ، واتە شێواز لە پێش ناوەرۆکەوە دێت. بەداخەوە من لێرەدا دەرفەتی درێژە پێدان و شیکردنەوەی ئەم گوتانەم نییە کەوا بەڕاستی سەرلەبەری بەرهەمی زانستی و ئەدەبی و هونەری دەگرنەوە، بەناچاری ڕووی خامەم وەردەگێڕمەوە سەر تاکە باسی فۆلکلۆر بۆ ئەوە بزانرێ چۆن شێواز لە فۆلکلۆردا تای ناوەرۆك دەکاتەوە و لێی ناپچڕێتەوە. مەودای گوتار یەکجار بەرفرەوانە، من هەوڵ دەدەم بە چەند ڕستە و نموونە کورتە توێژینەوەیێکی تێدا بکەم و لێی ببمەوە بەڵکو نووسینەکەم بە بەر لایەنی تری فۆلکلۆر ڕابگات کە ئەگەر لێی نەدوێم وەك ئەوە دەبم کە هەر لە هیچی نەدوابم.

لە بەردەوای بەشی دووەمی کتێبی (حاجی قادری کۆیی) چەند بەیتێکی عەلی بەردەشانیم لە کتێبی (ئۆسکارمان)ەوە ڕاگوێستەوە وا لێرەدا بێ دەسکاری دەیاننووسمەوە تاکو بەراوردیان بکەین لەلایەن شێوازەوە لەگەڵ هەڵبەستێکی نوێی حەماسی بۆ دیارخستنی دەوری شێواز لەم بەرهەمە فۆلکلۆرییەدا. عەلی بەردەشانی لە سەرەتاکانی بەیتەکەی کە بۆ عەبدوڕەحمان پاشای بابانی هەڵبەستووە ئەمانە دەڵێ:

ئاکەم خزمەتی وەزیری
ئانێ دەستێنم بە شیری
بە شیری نەبێ قەت پێك نایە
دەوڵەت ئایەتە ڕەدایە
ناچمە سەفەری لەحسایە
باغی دەبم لە بەغدایە
باغی دەبم ئەنشانەلا
خزمەتی ناکەم وەلا
ئافەریم بارەکەلا
ئەوەکسکول تەعالەلا
هەی کورە بەبەینە هەلا

سرنج لە دەم و دووی بەیتەکان بگرە و بەراوردی بکە لەگەڵ ئەم تاکە فەردەی سەرەتای نەشیدێکی نوێدا:

دەمـــی ڕاپــەڕینـــە دەمـــی ڕاپــەڕین

هەتا کەی بە سستی و بە پەستی بژین

سەیرێکی وردی هەردوو بابەت بکە: بەرەدەشانی کە دەڵێ (هەی کوڕە بەبەینە هەلا) لە شێوازێکی میللیی یەکجار ئاشنا و پەرەسەندوودا هانی ئەوجەوانەکانی بابان دەدات بۆ هەڵمەتبردن وەك کە شاعیری سەردەمی نوێمان بە شێوازی ئەدەبی هانی کورد دەدات و بە داڕشتنێکی خوێندەوارانە دەڵێ:

دەمی ڕاپەڕینە دەمی ڕاپەڕین

شێوازی بەرەدەشانی هێندە میللی و پەرپەست و زانانشنا و کوردانەیە لە بیرت دەباتەوە کەوا بەیتەکان لە پێشەوە وەك مامۆستای شارەزا مەشقی ئازایی یەکوێکر دەکەن و لەگەڵ مەشق پێکردندا ڕێگەی تێقناعکردنیشیان بۆ هەموار دەکات. لایەنی ئوستادی و پسپۆڕی و زیرەکی و (فەلسەفە) کە پڕاوپڕی بەیتەکانن بەتەواوی و بەجۆرێکی جادووگەرانە لە ناو تەلەسمی شێوازدا سڕاونەوە تۆ سەیری چۆن لە وەزیری پشتڕێ دەبێت و دەست بۆ شیر دەبات و دەیکاتە هۆی هێنانە ڕەدایەی دەوڵەت، ئەوجا وەك جەزبەی دەروێش و سۆفییان دەکەوێتە نێوان ئەو چەند میسرەعە حاڵگرتووەی کۆتاییی قسەکان: یاغی دەمم نیشانەلا خزمەتی ئاکەم وەلا... ئافەریم پارەکەلا.. تەوەکول تەعالەلا – لێرەدا کەفوکوڵی مەنجەڵی دڵە جۆش خواردووەکەی سەر دەکا و دەنەڕێنێ: هەی کوڕە بەبەینە هەلا! لەم بەیتانەدا شێواز کزۆڵەکە و نێرگەی ناوەرۆکە کە ئەگەر ئەو نەبێ ئەم نابێ، بەڕاستی بەسە بۆ شێواز کە ناوەرۆکت لە بیر بباتەوە.

ئەم شێوازە میللییە ڕەوان و بێ فێزەت و گرفتەی بەیتی بەرەدەشانی کە لایەنی مامۆستایی و پێتۆڵی و (فەلسەفە)ی ناوەرۆکی گوتەکانی لە مەناوی خۆیدا شاردۆتەوە لە حاڵێکدا دەزانین گوتەکان و ڕچە بەستنەکەیان پڕە لە زیرەکی و پێتۆڵی و (فەلسەفە)، لە نەشیدەکەدا چ جێگری نییە هەرچەند هەڵبە و کڵپەی هەردووکیان لە یەك سەرچاوەی سۆز و پەرۆشەوە هەڵدایسێن.

نەشیدەکە لە ڕێبازێکی یەکسەرەوە (مباشر) بەرەو ئامانجی هەڵبەست ڕۆیوە،

هاندەرێکی (عقلی تێکەڵ بە عاطفی)شی کە لە میسرەعی دووەمدا بێ پەردە و سەرپۆشی ئاراییشت خستۆتە بەرچاو و دەستی خوێنەر و گوێگرەوە معادلەی (وروژاندن و ئیقناعکردن)ی بێ تەواو کردووە کەوا زۆر بەئاشکرایی (هۆش) بەشدارە لە شیکردنەوەیدا نەک تەنها (سۆز و عاطفە). ئەوەی ڕاستی بێ سۆز و عاتیفە لە بنەڕەتدا لەگەڵ (معادلە) و یەکگرتن و بەراوردکرن و بێ سەلماندن بێگانە و نەناسە، منیش کە لێرەدا بەیەکەوەیان باس دەکەم لەبەر ئێشکی بەیتەکانی بەرەوشانیدا پێویستیی (مقارنە) تێکیان دەبەستێ نەک خزمایەتی و بەیەکەوە گونجان. لەم مقارنەیەشدا چ مەبەستم نییە عەیب لە ئەشیەکە بگرم کە دیارە ئەشیەکی ڕێکوپێک و خاوەن زرینگە و زیلێکی دەوڵەمەندە، گەلێک هەڵبەستی تری زۆر ناوداریش وەک ئەم، بگرە لەویش زیاتر، تاو و تەئسیری خۆی لە لێکدانەوە و ئیقناعکردن هەڵێنجاوە وەک لەو دوو میسرەعەدا دەردەکەوێت:

مەڕی بۆ مردن بەرە بۆ ژیان

چۆن قازانجی دەکەی تا نەکەی زیان

وەها لەم چەند بەیتە عەرەبییەدا بەدی دەکرێت کە زووتر خاوەنەکەی هانی خەڵق دەدات بۆ شۆڕش، لێرەشدا (منطق) بەکار دێنێت بۆ ئیقناعکردن:

فأما الى حيث تبدو الحياة

لعينيك مكرمة تغنم

واما الى جدث لم يكن

ليفضله بيتك المظلم

ئەم هەڵبەستە پێشکەوتووانە چییان لێ کەم نابێتەوە بەوەدا کە بکرێن بە بەڵگە بۆ زیندە بڵیمەتی و هونەرکاریی بەرەوشانی هەروەک بەیتەکانی بەرەوشانیش چ دانالەنگێن بەوەدا کە بزانین شێوازیان لە تەرازووی نرخی هونەریدا پەسەنگترە لە هەموو لایەنێکی تریان، من و تۆ و تێکڕای میللەتیش چ زەرەر ناکەین لەوەدا بۆمان ڕوون بێتەوە شێواز لە کاری ئەدەبی و هونەریدا بەشێکی هێندە بنجییە کە ئەگەر کەم بایەخ بوو سەر لەبەری کارەکە کەم بایەخ دەبێ وەها هەر بەجارێ کەڵکی پێوە نامێنێ، تەنانەت وا دەبێ دەگاتە پلەیێک لە هونەر و جوانکاریدا کە، وەک جادوو، جوانیی ناوەرۆکیش بۆ خۆی دەدزێتەوە هەر دەڵێی شووشەی بەلوورە شەراب و ڕەنگە

نالْ و بلەخشیەکەی دەکا بەخەرمانەی ناورینگ و بریق و باق بە دەوری خۆیەوە.

ڕوونکردنەوە:

ئەم بەیتانە لە کتێبەکەی (نۆسکارمان)دا بەم جۆرە نووسراوە کە من لێرەدا خستمنە بەرچاو. بێگومان (نۆسکارمان) چی بیستووە ئەوەی نووسیوە بەڵام دیسانەوە بێگومان، لە چەند جێگەیەکدا لەنگیی بەیتەکان خەتای ئەو کەسانەیە کە دەماودەم بەیەکتری ڕادەگەیەنن و لێی زیاد و کەم دەکەن دەنا وا دەزانم سەلیقەی بەرەنشانی توانیویەتی لەنگ نەبێ.

بەیان، ژمارە ۳۱، ۱۹۷۵

# فۆلكلۆر

## بەشی دووەم

لە سروشتی فۆلكلۆردا چەند تایبەتێك و پێكهێنەرێكی بنجی هەیە كە لە (ئەدەب و هونەرە جوانەكان)ی هەڵداوێرێت. هەمووشی لەو ڕاستییەوە سەر هەڵدەدات كە فۆلكلۆر بەرهەمێكی كۆمەڵایەتیی زادەی بیر و چێژ و قەناعەتی تێكڕای میللەتە نەك هی بەرەیێكی بەرتەسكی میللەت، كە ئەدیب و هونەركار و زانایە

ئەم ڕاستییە كە لە ڕادەی بەدیهییەدایە ڕاستەوخۆ و پاتەوپات پێمان دەڵێ فۆلكلۆر خەریكی ڕووداو دەبێ نەك (تجرید). بەولای ئەم ڕاستییەوە، وەك لە پێشەوە گوتم، گەلێك تایبەتیی تری فۆلكلۆر هەیە لێی دەبن بە شەقڵی پێناسینەوە كە ئەوانیش پێویستە نرخی خۆیان پێ بدرێت و پێیەیێ و جێبەجێ لێیان بكۆڵرێتەوە، بەڵام جارێ لایەنی (ڕووداو و تجرید- مادە و واتا) باس دەكەین بەدوا ئەودا، كە دەرفەت هەبێ، جڵەوی خامە بادەدەمێنەوە بۆ سەر چەندوچۆنی تایبەتییەكانی تر. سەرهەڵدانی فۆلكلۆر لە (ڕووداو) كە بریتییە لە شتی بەرهەست و بەرچاو و مادی، كاری ناچارییە بەدەست من و تۆ و بەدەست دانەری فۆلكلۆریش نییە. میللەت كە زۆربەی زۆرینەی تاكەكانی نەخوێندەوار بووە و لە ئاست فەلسەفە و فكر و وێنەی خەیاڵی و تێكهەستنی واتا بە واتاوە داماو و بێ دەسەلات بووە، هەر ڕووداو و شتی بەرهەست و زەق دەمێنێتەوە زیهنكاری و هونەرنارایی تێدا بكات و بڕی خۆی پێ بشكێنێت. لێرەدا زنجیرەی قسەكانم دەبڕمەوە بۆ ئەوە نموونەیێكی وەها بهێنمەوە كە ئەم لایەنەی (پەسترانەوە بە وێنەی مادی و وێنەی خەیاڵی) لە فۆلكلۆر و ئەدەبدا خێرا بە خێرا ڕوون كاتەوە بەر لەوە لێی دوور بكەومەوە.

گوێم لێ بووە كچە بڵباس لە شەڕەدندووكێی (بالۆرە)دا ئەمەی بە كچەكەی تر گوتووە:

مایەێ سەر بێ ڕێشم
لە برای خۆمت كێشم

لەمەدا كچە بڵباس وێنەیێكی بەرهەست و بەرچاوی ڕۆژانەی ناو ڕەوە وڵاغی هۆز

و هۆیەکەی خۆی کردووە بە نموونە و مەشقی لەبەردا کردووە، وێنەیەکی خۆشکەلانەی خەیاڵیی تێدا هەیە. کە ڕەنگە ئەختێکی لە ڕێکەوتەوە هاتبێ. ئەو واتا و وێنەیەیە کە لە وەسفی (سەر بێ ڕێشم)دا بەدی دەکرێت چونکە ماینی بە حورمەت هەمیشە ڕێشمەی بەسەرەوەیە و لەسەر سنگی پاڵ ناخوردا بەستراوەتەوە، کاتێك کە لەگەڵ ئەسپیش جووت دەبێ سەری ڕێشمەکەی بە دەست مەیتەرەکەیەوە دەبێ، نەك وەك ماینی ناو ڕەوە، بێ ڕێشم و بێ جڵەوگرتن و بێ حورمەت لەگەڵ ئەسپ جووت دێت. کە بێین ئەم وێنە فۆلکلۆرییە بگرین بەوێنەیێکی ئەدەبی وەکو خۆی دەزانین خەیاڵی شاعیر چەند هەریك دەبێ وێنەی ناو هەڵبەست لە سادە وێنەی واقیعیی ڕووت دوور بخاتەوە و بەرگی تەجریدی تێ بئاڵێنێ.

لێرە بۆ مەبەستی بەراوردکردن نموونەیێکی یەکجار عادەتی دێنمەوە کەوا ڕەنگە نزیکترین نموونەی ئەدەبی بێت لە شێواز و وێنەی ناو بالۆرەکە:

سالم لە نیوە دێری یەکەمی بەیتێکیدا ئەمەی گوتووە:

ڕەشە تیغی شکەمی کەر بە ڕەشت

دەبینیت چۆن خۆی ماندوو کردووە بە هۆنینەوەی وێنەیەکی هونەراویی تێکهەڵکێش و سەرپۆشکراو لە جیاتی ناوبردنی شتی پاتەوپاتی مادیی بەرهەست، بەتایبەتی کە هاتووە وشەی (شکم– شکەم)ی فارسیشی هێناوە لە جێی (سك، زگ)ی کوردیی داناوە بۆ پتر بەرەو (تەماوییەتی) بردنەوە تاکو تێکڕای واتای میصرەعەکە بەر ئەو دەستوورە گشتییەی عەوامی کوردەواری بخا کە زمان دەگرێ لە گوتنەوەی وشەی ئەوتۆ کە بەلای خۆیەوە دەبێ پەردەی بۆ بگێڕێتەوە وەك کە بە ژن دەڵێن (خێزان، منداڵەکان) وەیا خوشك دەکەن بە (هەمشیرە). سالم لەوەش پتر هونەری وشەی بەکار هێناوە کە لە دوو سەری میصرەعەکەوە وشەی (ڕەش)ی داناوە بۆ پارسەنگکردنی مۆسیقای شیعر سەرەڕای خۆلادان لە گفتوگای عادەتی بەنیسبەت وشەی (ڕەش)ی کۆتاییی میصرەعەکەوە ئەم وێنەکێشانەی پڕ تەشبیهە و تێك هەڵکێشان و سەرپۆشکردنە، بە عادەت، لە چێژی دەسەڵاتی فۆلکلۆر بەدەرە و دەشێ بەدەر بێ چونکە هاوەنی فۆلکلۆرەکە کە تاکێکی نەخوێندەوەی میللەتە ناتوانێ و نازانێ نەخشی وشە و واتا بهۆنێتەوە. گریمان توانیشی ئەم هۆنینەوەیە بەکار بێنێت هەر بە کاری نایەنێت چونکە دەزانێ زۆربەی میللەت تێی ناگا لە حاڵێکدا ئەو مامڵەتی

هونەرەکەی لەگەڵ زۆربەی میللەتە نەک لەگەڵ تاکە بەرەی خوێندەوارەکانی میللەت، جگە لەوە کە ئەو بە بابەتێکەوە خەریکە سادە و نزیکەدەست و لە ڕێگەمێکیشەوە بۆی دەڕوات کە ئەویش سادە و هەموارە و چ ڕێگەیەکی تریش شک نابات بۆ تێداڕۆیشتن.

لەم دوو میسالەدا بە ئانقەست نموونەیەکی فۆلکلۆریی بەرز و یەکێکی ئەدەبی عادەتیم هەڵبژارد بۆ ئەوە لە حاڵی پێویستدا بتوانرێ نموونەی ئەوتۆ بخرێتە بەرچاو کە هەموو دەسەڵماندن و بەرهەڵستییەک پێشێل بکات و نرخەکەی مەبەست باوێژێتە بەر قەناعەتی سەلیقە و چەژی مرۆڤی نیوە خوێندەوارەوە.

نموونەی فۆلکلۆریی بەرزتر و هی ئەدەبی بەرزووڕتر بەسەر زاری هەموو خوێندەوارانەوەن، چ پێی ناوێ من لێرەدا جێگایان بۆ پڕ بکەمەوە. هەر هێندە دەڵێم لە بابەتی (ئەدەبی بێ پەردە)ی وەک ئەم باڵۆرەیە و کەرتە بەیتەکەی سالم سەیرێکی (مەستوورە)ی نالی و شەوە مەشوورەکەی (مصباح الدیوان) بکە و سەرنجیان لێ بگرە چۆن واقیعی بەرهەست و وێنەی خوێن و گۆشت لە ئەدەبدا بەرەو (تجرید) دەچێ و لە ناو تەمومژی قەندە پەرداوییەکانی مەجاز و کینایە و تەورییەی تەشبیهدا دەبنە تارمایی، کە ئەمانە تێکڕایان بێگانە، ناناشنان لە جیهانە سادە و سافیلکە و بێ گەوە و پێچ و پەناکەی فۆلکلۆردا.

لەم زەمینەیەی (سادەیی و بێ پێچ و پەنایی)ی فۆلکلۆر دوو تێبینیی گرنگ هەن یەکێکیان سەر دەکێشێتەوە بۆ سەر زاتی هونەرمەندەکە ئەوی تریان دەگەڕێتەوە بۆ بابەتەکە دوو تێبینییەکەش لەوانەن کە ورتە ئیعتیرازێک دێننە بەر ئەو ڕایەی سادە و بێ پێچ و پەنابوونی فۆلکلۆرەوە: تێبینی لەبارەی زاتی بەرهەمهێنی فۆلکلۆر ئەوەیە کەوا هەروەک لە نێوان ئەدیب و هونەرکاردا خوار و ژوور و بەهێز و بێ هێز هەیە، ئەوانەی بە فۆلکلۆریشەوە خەریکن یەک چوون و هاوتا نین دیارە بەرهەمەکانیشیان هاوتا نابن، تەنانەت ئەگەر بابەتەکە لە سادەیی و سەرەتاییدا گەیشتبێتە ئەوپەڕیش شوێن پەنجەی داهێنەرەکەی تایبەتییەکی وای پێ دەدا کە لە هی یەکێکی تری لە خۆی بەرزووڕتر وەیا بەرزتری هەڵاوێرێت و جودای کاتەوە. ئەمەش ئەنجامێکی چاوەڕوانکراوە لە هەموو مەیدانێکی بەرهەمی مرۆڤدا بگرە لە دروستکردنی کۆلێتی مریشک و پینە لێدانی قوندەرەش.

تێبینییەکەی تر کە دەربارەی بابەتی فۆلکلۆرە ئەوەیە بابەتی وا هەیە خۆی لە

خۆیدا زەحمەتە بێ ئەوەی بەرهەمهێنەکەی لە ڕێی ئارایشتدان وەیا سەرپۆشکردنەوە زەحمەتی کردبێ وەك ئەوەی کە لە (مەتەڵ) دێتە بەرچاوەوە مەتەڵ لە مەیدانی ئەدەبدا دەوەستێتەوە بەرانبەر (لُغز و معمیٰ) کە ئەوانیش لە بابەتەکانی تری ئەدەب زەحمەتتر و سەختترن.

ئەوەی ڕاستی بێ (مەتەڵ)ی کوردی گەلێکی وەهای تێدایە زۆر تێ هەڵکشیوە بەرەو قەندی واتایی و وشەیییەوە، هەر دڵێی ویستوویەتی خۆی لەگەڵ قەندەکانی ئەدەبدا تاقی بکاتەوە، یەکێکیان ئەمەیە: داری شەکراوێ، چوارلکان راداوێ، سێی لەبەر سێبەرێ، دووی لەبەر هەتاوێ (نوێژ مەبەستە) کەوا گوتەیێکی زۆر ورد و مەشووری (تصوف)ت بەبیردا دێنێتەوە:

چوومە سەر کانی ئاو نا
ڕۆژ هــەڵات هــەتــاو نــا
دەستم شوشت و چاو نا

واتاکەشی ئەمەیە (چوومە سەر کانی حەقیقەت واتە ئەو کانییە نا کە ئاوی تێدایە. دەستم لە دونیا شوشت نەك دەست و چاو شوشتنی عادەتی. ڕۆژی یەقین هەڵات، کە ئەویش ڕۆژی هەتاو نییە.)

من لێرەدا کە ڕا دەنوێنم بابەتە فۆلکلۆرییەکە لاسایی ئەدەبی کردبێتەوە مەبەستم ئەوە نییە بڵێم سەرلەبەری مەتەڵ پێڕەوی لوغز و موعەممای کردووە چونکە پتر بە بڵـەوە دەنووسێ، بە پێچەوانە، ئەدەب بە هەموو کەرتەکانییەوە بەرەژوورچوون و پێشکەوتنی فۆلکلۆر بێت هەروەك گۆرانی نوێەرا وەیا سەمای بالێ زادەی گۆرانیی سەرەتایی و هەڵپەرکێی کاڵ و کرچن، کاخی ئاوێنەبەندیش ئەوەی شرەزنجی بابەلباپیری مرۆڤە... بەڵام پاش ئەوەی بەرهەمی ئەدەب وەیا هونەری پێشکەوتوو پەیدا دەبێت جێی باوەڕکردنە فۆلکلۆریش هەندی لێ وەرگرێ و لاسایی بکاتەوە لە پەراوێزی ئەو دەسەڵاتە کەمەی کە بەرهەمهێنی فۆلکلۆر تێیدا دەچەمێ. کەواتە دەبێ لە بنەڕەتدا لوغز و موعەماش زادەی مەتەڵ بن. بەهەمەحاڵ ئێرە جێگەی دەرهێنانی (قسام شرعی وەیا نظامی)ی فۆلکلۆر و ئەدەب و هونەرە جوانەکان نییە تا بزانین کامیان وەچەی کامیانن هەرچەند بە شێوەیێکی رووکەشیش زۆرە ناوێکی باوك و ئەولادەتیمان لێ نان.

**بگەڕێینەوە سەر فۆلکلۆر و ڕووداو.**

ئەم دیاردەیەی پەیوەستبوونی بابەتی فۆلکلۆری بە ڕووداو و شتی مادییەوە کە ڕاستەوخۆ لە پێنەویرانی میللەت بە (تجرید و وانا و ئارایشت)ەوە سەر هەڵدەدات لە گوتەی پیاوانی فکر و فەلسەفەی لێرە بە پێشەوەشدا تێ خوێندراوەتەوە. یەکێکی هەرە دەستڕۆیشتوو لە مەیدانی بیری کۆمەڵایەتیدا کە لە ڕێبازی تەحلیلی مادییەوە بۆ شیکردنەوەی دیاردەکانی کۆمەڵایەتی و مێژوویی ڕۆیشتووە، مارکسیستە گەورە مەشوورەکەی رووس (پلیخانۆف)ە: نووسینێکیم دیتوە دەڵێ سەرچاوەی ئیلهامی میللەتە سەرەتاییی و دواکەوتووەکان بۆ بابەتی هونەری، هۆی ژیان و بەرهەمهێنانیانە واتە ئەو کارەی پێی دەژین وەها ئەو هۆیەی شتی پێ بەرهەم دێنن دەبێتەوە بنگەی هونەریان، لێرەشدا چەند میسالان دێنێتەوە یەکێکیان ئەوەیە کە دەڵێ ئافرەتی هۆزە دواکەوتووەکانی کۆنە دانیشتوەکانی ئوستراليا Aboridyeons لە شایی و هەڵپەڕکێدا ئەو جوولانەوە و هەڵسووڕ و داسووڕانە دەکەن کە ڕاستەوخۆ لە کەسایەتیی ڕۆژانەیانەوە وەرگیراوە کە ئەویش هەڵکەندنی ڕەگی گیایە، واتە ئافرەتەکان لە شاییدا وەها دەبزوون هەر دەڵێی ڕەگی گیا هەڵدەکەنن... من کە ئەمەم خوێندەوە (بەر لە ٣٠ ساڵ) قسەیێکی باوکم بیر کەوتەوە کە دەیگوت شایی (سێ پێیی)ی کوردی لە پێمەڕەکارییەوە وەرگیراوە چونکە هەمان جووڵە و قاچ پێش و پاش خستن و هەنگاو بەرەوپێش و بەرەودوا بردنی پێمەڕەکردن بۆتەوە بەهەنگاوە ڕێک هراوەکانی شایی سێ پێیی. هەرکە ئەمەشم بیر هاتەوە، دوای چەندین ساڵ، لەلای خۆمەوە زەینم بۆ ئەوە ڕۆیشت کە شایی (سێ پێیی) نەک تەنها خۆی بەڵکو ناوەکەشی لە پێمەڕەکارییەوە وەرگیراوە چونکە لە کاتی پێمەڕەکردندا سێ پێ پەیەکەوە کۆدەبنەوە دوویان هی کابرای پێمەڕەدار یەکێکیشیان پێمەڕەکە خۆی. دیارە میللەت کە هاتووە جموجووڵی پێمەڕەکارییەکەی خستۆتە قاڵبێکی ڕێکوپێکی هونەرەوە ناوەکەشی ئارایشت داوە بەوەدا کە لە (پێ مەڕەیی)یەوە گۆڕیویەتی بە (سێ پێیی) کە ئەمیشیان گۆڕینێکی ئێسک سووکە.

پلیخانۆف لێرەدا، پتر لەوەی من بۆی دەچم، بەشێکی زۆری فۆلکلۆر دەکاتەوە بە وەرگێڕانێکی ئالی (هۆی ژیان) بۆ هونەر. من وا دەزانم هەموو واقیع و ڕووداو و شتی بەرهەست و بەرچاو، نەک تەنها لایەنی ئابووری، دەبن بەسەرچاوەی فۆلکلۆر بەتایبەتی ئەو بابەتە فۆلکلۆرەی کە لە دەمەوە دەردێت وەک پەند و گۆرانی و

سەرگوزەشت و بەند و بالۆرە و هەڵبەست و بەستە و لاوك و... هتاد، كە ئەمە راستییەكە بۆ یەكەم سەرنجی لەسەرخۆ دەردەكەوێت. بە نموونە لە شاییی سێ یەیبدا كە خۆی لە هۆیێكی گوزەرانەوە وەرگەڕاوەتەوە سەر هونەر، هەرچی بەستە و گۆرانی و دەهۆڵ و زوڕنا و هەموو سەروبەرێكی شاییەكە هەیە لە سەرچاوەی ناتابوورییەوە هەڵدەدەن كە (دڵداری) لە پێش هەموویانەوە دێت... تەنانەت چاوەشی زوڕنانەنگێو وەیا دەهۆڵ لێدەر وەیا شاباشكەر كە لە نوقتەی ئابوورییەوە دەجمین و دەجووڵێن، كە دەوره دراون بە ئاڵقەیێكی فرەوانی سەدان كەس كە هەموویان لە شاباشكردندا دژی بەرژەوەندیی ئابووریی خۆیانەوە رەفتار دەكەن بۆ مەبەستی خۆ هەڵدانەوە وەیا راكێشانی نیگای كچێكی جوان وەیا موجامەلەی خاوەن شایی وەیا شكاندنەوەی ناحەزێك كە ئەتوانێ بەربەرەكانیی پارەبەخشین بكات بە پارە. لە نێوان هەموو ئەو كەسانەی كە بە شاییشەوە خەریكن ئەو سێ كەسەی كە پارەی شاباش وەردەگرن (زوڕنانەنگێو، دەهۆڵ لێدەر، شاباش وەرگر) تەنها سێ كەسی ریز لێ نەگیراون، واتە لایەنی رەچاوكردنی ئابووری لە كەسبەكەیان نەبۆتە هۆی بەرەوپێش چوون و حورمەت، بە پێچەوانە هەرچی پایەیە نەیهێشتووە وەك شایی و هەڵپەركێ كە دیتمان بنچەیێكی مادیی هەبوو، هەرچی فەندی سوارچاكیش هەیە لە بنەڕەتدا هەمووی فەندی جەنگ و موبارەزەیە كە لێی سواوە و مشتوماڵ دراوە بۆ ئەوە بشێ ببێتە هۆی خۆشگوزەری و كەیف و گەپ، دیارە جەنگیش ڕووداوێكی مادیی بەرهەستە، چ خەیاڵبازی و وشەسازیی تێدا نییە. بەشێكی زۆر لە سەمای پەرستگەكان ئەویش لە فكرەی پەرستنی غەیبەوە هاتووە، ئەو غەیبەی كە شیرازەهۆنی رشتە و راپەڵی كۆمەڵایەتی و دەستوورات و نەریتی مرۆڤە بەتایبەتی مرۆڤی كۆمەڵگەی سەرەتایی و نەخوێندەوار كە بە جۆرێكی عەفوی هەموو ئەو شتانەی ئێیان ناكات (بە راستی لە هەزاری دەی شتانیش ناكات) دەیانگێڕێتەوە بۆ غەیب، هەر بۆیەشە دەبینین ئەم تەرزە مرۆڤە ئەوەندەی ئامادەیە هۆی بەقوربانی دار و بەردی مەرقەدی چاك و پیران وەیا كۆڵەگەی ماڵی شێخ وەیا خانەی پەرستن وەیا یەكێك لە باوەڕەكانی ئاین بكات ئامادە نییە بۆ بەرژەوەندیی مادی ئەم فیداكارییە بكات، هەروەك گوێشی دەكاتەوە بۆ ئەفسانە و وێنەكانی دێو و پەری و جندۆكە وەیا پیرەوی فێڵبازێك دەكات و زەرگ لە سینگ و لاگوێی خۆی دەدات، بە دەیان فەیلەسووف و پیاوی ژیر و رابەری شۆڕش ناتوانن دوو بهری مەعقوول بخەنە مێشكییەوە وەیا دوو درۆی ئەفسانە لە دڵی

بسرنەوە وەیا ئیقناعی کەن بە ڕاستی و پیرۆزیی ڕێی خەبات. تا ئەم گوتە ڕاست و دروستانە دەچنە مێشکییەوە سەدان ساڵ تێ دەپەڕێت و هەزاران دێو و درنج لە نەفسیدا زاوزێ دەکەن.

پلیخانۆف بۆ پتەوکردنی باوەڕەکەی خۆی کە هونەری میللەتی سەرەتایی بۆ بنیچەیێکی ئابووری دەباتەوە، دێت و دەڵێت چونکی بۆرجوازییەکان چینی بەرهەمهێن و پەیداکەر نین سەماکانیان لایەنی (دڵداری)ی تێدا ڕەچاو دەکرێت. ئەم ڕایەی کە پەرۆشێکی خۆبەختکردووانە بۆ لایەنگیری چینی هەژار پێکی دێنێت پتر لە ڕایەکانی پێشووتری کردەوەی هونەری دەکاتەوە بە وەرگێڕانێکی ئالیی واقیع بۆ هونەر. من لەم چەند گوتەی پەلەدا ناچمە هەڵسەنگاندنی ئەو بیروباوەڕەی کە حەز دەکات هەموو دەورێکی پێشخستن و فراژیکردن و بەرهەمهێنان و سازدان و ڕێکخستن لە بەرەیێکی زۆر فرەوان و زۆر پێشکەوتوو و زۆر چالاکی میللەت بسەنێتەوە کە هەموو داهێنەر و دۆزەرەوە و جیهانگەڕ و شاعیر و فەیلەسووف و هونەرمەندی لێرە بەولاوە لەو پەیدا بوون چونکە ئێرە جێی ئەم هەڵسەنگاندنە نییە و پێویستێکیشمان پێی نییە، بەڵام ڕێی ئەوەندەم هەیە بڵێم بەپێی بۆچوونی خۆم وا دەزانم ئەگەر پلیخانۆف تا ئەم ڕۆژگارە مابایە لەم ڕایەی دەکشایەوە چونکە دەوڵەتە سۆشیالیستەکانیش، دوای چەسپانیان، بەردەوام بوون لەسەر داهێنانی سەما و مۆسیقا و بابەتەکانی تری هونەر بەو جۆرەی کە کۆمەڵگەیێکی ئاسۆشیالیست داپان دێنێت. بنگەی یەکجار ڕازاوەوە دروست دەکەن بۆ بالێ و ئۆپەرا کە چ پێوەندیی نەبێ بە هۆی ژیان و بەرهەمهێنان و جیهانپەتی و چەوساندنەوە و ئەو تەرزە سەرچاوانەی کە بەپێی ڕایەکەی پلیخانۆف دەبوایە ئەوان سەرچاوەی هونەر بن لە دەوڵەتێکی سۆشیالیستدا. بە چاوی خۆمان هەموو ڕۆژێك لە تەلەفزیۆندا دەبینین فیلمی کارتۆنی ڕووسی پتر لە هی دەوڵەتێکی سەرمایەدار خەریکی ئەفسانە و جنۆکە و دێو و ئەمیر و پەپاوی ئاپن و ئەو شتانەیە کە لەبەر تیشکی ڕایەکەی پلیخانۆفدا دژی هەموو بیروباوەڕێکی سەر بە جیهانپەتین. بێگومان هونەرکارەکانی سۆڤیێت هەنگاوی فرەوانیان بەرەو پێشەوە ناوە بەم خۆ ڕەهاکردنە لە قەیێکی تەسکی ئاکە سەرچاوەی (بەرژەوەند و بەرهەمهێنان)، هەرچەند وا دەزانم پتر لە پێویست دەوری جنۆکە و دێو و سیحر و تەڵسەم هەڵدێن وەك بڵێی بەجۆرێکی لاشعووری دەیانەوێ بە جیهان ڕابگەیەنن کە ئەوان پابەندی هیچ ئەگایێکی تەسك نین وە یاخود بیروڕایە

فەلسەفییەکەیان چ ڕێگایان لێ نابەستێت.

ڕاستی لەم مەسەلەیەدا ئەمەیە: ئەو چینە کۆمەڵایەتییەی کە دەگاتە دارایی و دەسەڵات هەر ئەوەندەی لێ ڕەچاو ناکرێ کە لە تاکە سەرچاوەی (دارایی و دەسەڵات) چاوەڕوان دەکرێ چونکە دارایی و دەسەڵات هەرچی هۆی زانین و دۆزینەوە و داهێنان و سازدان هەیە بە دەوری خۆیەوە کۆ دەکاتەوە و لە هەموویان ئیلهام وەردەگرێ نەک هەر لە (بێ ئیشی و هەریک نەبوونەوە)، بۆیەیە ڕێی ئەوەمان نییە بڵێین مرۆڤی پارەدار چ کار و کەسبی نییە جگە لە (دڵداری) کە ڕۆژگاری پێوە ڕابوێرێ وەیا ئیلهامی دانس و گۆرانی و پەیکەرتراشی و نەخش و نیگار و سەرجوملەی هونەری لێ وەربگرێ، هەروەها ڕێی ئەوەشمان نابێ بڵێین هونەرکاریی کۆمەڵگەیێکی سۆشیالیستیش چاری ناچارە دەبێ بە هەموو عومری خەریکی فکرەی چاندن و دروستکردن و قوڕکاری و دروێنە و خەیاتی چینایەتی بێت. مرۆڤ کە خوێندەواری و تێگەیشتن و بیرکردنەوە و فەلسەفەی بوو لە نۆکەرایەتیی تاکە عامیلی (نابووری) وەیا تێکڕای عامیلی (دەوروبەری مادی) ڕەها دەبێت و دەچێتە پلەی ئەو ژوورخانەی کە بریتییە لە فکر و وێنەی خەیاڵی و دەستووردانان و تێک هەڵکێشانی واتا و شێوە خستنە سەر شێوە و (تجرید) و هەزاران فەند و فێڵی تر کە لە تەک ئەواندا عامیلی سادە و سافیلکەی (بەرهەمهێنان و بەرهەمنەهێنان) لە مەیدانی هونەردا لەوەندەی پتر بۆ نامێنێتەوە کە ببێتە پاشخانێکی (خلفیة) بێ ڕەنگ و کەم سەنگ هەندێ جارانیش هەر بەجارێ دەسڕێتەوە لە نێوان پەربە ناوڕەنگییەکانی تەجریددا.

لەم ڕۆژگارەدا تێکڕای مرۆڤ توانیویەتی بیری خۆی لە کۆت و بەندی دەوروبەری تەسک ڕزگار بکات و جوانی و ناسکی و هونەر لە پەروازی خەیاڵەوە کۆ بکاتەوە، لەمەشدا چەپ و ڕاست و ناوەند لە یەک ئاسۆدا دەخولێنەوە چونکە خەیاڵ هەر خەیاڵە ئەفسانەش هەر ئەفسانەیە لێ هەڵهێنجانیشی بۆ هەمووان، وەک ئاوی بیر، بە دۆلکەی مێشک دەکرێ، لەوە بەولاوە ڕێی تێ دەچێ هەریەکە لەم سێ بەرەیە هەڵێنجانەکە و تەجریدەکە و سەرلەبەری کارەکە بکات بە خزمەتکاری ئەو ئامانجەی حەزی لێ دەکات.

پوختەی قسە ئەمەیە لە نێوان گەلانی پێشکەوتوودا فێرگە و دەزگا و ساختمانی تایبەتی هەیە بۆ دانانی هونەری تازە وەیا وەرگێڕانی دیاردەکانی جیهان، بە مرۆڤ و سروشتییەوە، بۆ سەر زمانی هونەر. بە خەیاڵی کەسیشدا نایەت بڵێ دەبێ

دەزگاکانی سۆشیالیست لە هۆی بەرهەمهێنان و گوزەرانکردنەوە ئیلهام وەرگرن لە حاڵێکدا هونەرکارێکی وڵاتی سەرمایەدار هەر خەریکی بەرهەمی دڵدارانە بێت تاکو خاوەن فابریقە و ئاو و بەراو و پارەوپوول تەرپەماغی خۆیانی پێوە بکەن

تێ هەڵکشینی مرۆڤ بەرەو پێشی فکر و هونەر و ئارایشت و ئازکی هەر لەوەندە نەوەستاوە بەرهەمی تازە داهاتوو بگەیەنێتە ڕێکاری ژیانی تازە هەرچی بابەتی فۆلکلۆری کۆن و نوێش هەیە ناخرێتە بەرچاوی تەماشاکەرانەوە ئەگەر بەرگێکی شۆخ و شەنگی ئارایشت و ڕێکخستن و مشتوماڵدان و بەرزکردنەوەی لەبەر نەکرێ. لە سەرانسەری جیهان یەک شانۆی ڕێز لە خۆگرتوو نییە دیمەنێکی سادە و هەژار و سەرەتاییی فۆلکلۆر بکات بە بەرنامەی شەوانەی و هونەرکارەکانی پێوە خەریک کات و خۆی پێوە هەڵداتەوە لە نەزەر تەماشاکەراندا. ئەوەی ڕاستی بێ فۆلکلۆری سادە لە شانۆی پڕ شکۆی ئەم ڕۆژگارەدا نە جێی بەرەکەوێت و نە تەماشاکەریشی دەبێت، لەمەشدا کەس ستەمی لە فۆلکلۆر نەکردووە چونکە دیارە هەروەک فۆلکلۆر خۆی کردووە بە (زووڕخان)ی ڕووداو و بەرگی ئارایشی پۆشیوە، دەزگای هونەری نوێش مافی هەیە فۆلکلۆر بەرز کاتەوە بۆ ڕێکاری خۆی و ئەو بەرگانەی لەبەر کات کە لە کاخی پڕ شکۆ دەوەشێتەوە.

بەیان، ژمارە ٣٥، ١٩٧٦

# روونکردنەوەیەکی وردیلە

لە لاپەرە (١٧٥)ی کتێبە پڕ سوودە تازە بابەتەکەی دکتۆر کەمال مەزهەر کە توێژینەوە و پشکنینەوەی تێدا کردووە لەبارەی ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی)یەوە، دوو بەیتی مستەفا بەگی کوردی ئەخنێك بە ناڵۆزی لەلایەن نووسەری کۆنە ڕۆژنامەکەوە، کاتی خۆی، واتایان لێ دراوەتەوە دواتریش کە بەیتەکان لە (دیوانی کوردی)دا چاپ کراون بەهۆی گۆڕینی یەك وشەیان هەر بەجارێ چ پێوەندییەکیان بەو واتا و مەبەستەوە نەماوە کە دڵ و دەروونی مستەفا بەگیان جۆشاندووە.

بەپێی کتێبەکەی دکتۆر کەمال ئەو دوو بەیتە لە ڕۆژنامەی ( تێگەیشتنی ڕاستی)دا بەم شێوەیە نووسراون:

خەبەرێکم بەدەنێ ئەهلی خەبەر حەشرە مەگەر
ڕۆژی ئەمڕۆ کە لە مەغریب سەری هێناوەتە دەر
نووری مەهدی لە تەرەف مەککەوە زاهیر بووە یا
غەلەبەی ڕۆمە لە بۆ کوشتنی (مَن کان کفر)

نووسەری (تێگەیشتنی ڕاستی) بۆ ئەوە چووە کە ئەم دوو بەیتە پەنجە ڕادەکێشن بۆ ئەو ڕۆژەی کە تورکەکان سلێمانییان داگیر کردووە و سەربەخۆیی حاکمایەتیی بابانیان لە بن هێناوە.

بۆ ئەوەی واتای بەیتەکان لە تاریکیدا نەمێڵینەوە پێویستە سەرلەبەری قەسیدەکە بخەینە بەرچاو تا ببینین تێکڕایان بەرەو چ ڕێنەیەکمانەوە دەکەنەوە.

لە بەیازێکی شکڵ کەشکۆڵی کە وەختی خۆی لەلایەن خوا لێخۆشبووی (نیهانی – شێخ موحیدینی شێخ کەریمی بەرزنجی کۆیی) نووسراوەتەوە، دەقی بڕە شیعرەکە ئەمەیە:

خەبەرێکم بدەنێ ئەهلی خەبەر حەشرە مەگەر
ڕۆژ کەوا ئەمڕۆ لە مەغریب سەری هێناوەتە دەر
نووری مەهدی لە تەرەف مەککەوە زاهیر بووە یا
غەلەبەی ڕۆمە لە بۆ کوشتنی مَن کان کفر

ئەشکی خوێنینە بە چاوما بەگریێ وەستاوە
یا غوباری ئەلەمە باعیسی عومیانی بەسەر
خەوە یا وەسوەسەیە یانە بەرەنەیولعەینە
ئەم عەلاماتە کەوا دێتە ئەبەر مەدی ئەزەر
ڕۆحی شیرینە کە دەردێ لەتەنی مەهجوورم
یا مەهی من نییەتی ڕیحلەتە بۆ عەزمی سەفەر
بۆ سەفەر کردنی من لایقە گەر بەردی فەلەك
بێتە سەر دەستی و(أ)[1] بۆ ڕەدی عەدوو بێ بە سوپەر
باوجود ئاکە ڕەقیب یاوەری ئەم دلبەرە بێ
هیچ تەفاوت نییە بۆ من لە سەفەر یا لە حەزەر
دائیما دەست بە دوعا ئێمەتیم و شایەد زوو زوو
شای سەفەر کردنی من بێتەوە بێ عەجز و زەرەر
سۆزشی کوردییە یا جۆششی ئەییامی فیراق
ئاتەشی عیشقە مەگەر یا شەرەری ناری سەقەر

وا بزانم بەیتەکان دەمەتەقە هەڵناگرن لەوەدا کە لە موناسەبەی سەفەرکردن و دوورکەوتنەوەی خۆشەویستێکی (کوردی) بەوپەڕی کزە و سۆز و پەرۆشەوە لە ناخی دڵ و دەروونێکی هەڵقرچاوەوە سەریان کردووە تا دەبینین لە کۆتایی شیعرەکاندا کزە و سۆز سەرێ بە (ناری سەقەر) دەگەیەنن، لەوەش پتر داوا لە شیعر ناکرێ کە دەستەچیلەی ئازاری دووری و جۆششی عیشق ئاگر بەر بداتە گیان و وجودی شاعیر وەك کە لێرەدا (سۆزی کوردی و جۆششی فیراق و ئاتەشی عیشق و شەرەری سەقەر) خەریکن پارچە شیعرەکە بە خاوەنییەوە بسووتێنن.

وا پێ دەچێ نووسەرەکەی ئەو کۆنە ڕۆژنامەیە (غەلەبەی ڕۆم)ی بەهەڵ زانیوە بۆ ئەوەی دوو نیشان بە یەك تیر بپێکێت، یەکێکیان دزێوکردنی ناوی تورکەکانە کە مەبەستێکی هەرە بنچینەی ڕۆژنامەکە بووە لەو سەردەمەدا، ئەوی دیکەشیان بزاوتنی دەماری کوردایەتییە لە دەروونی خوێنەرانی ئەوسای کوردا. وەك دکتۆر کەمال بۆی

(١) ئەم وشەیەم بەم شێوەیە نووسی کە لە بەیتەکەدا دەخوێندرێتەوە.

چووه نەبێ خاوەنی نووسینەکە شوکری فەزلی بوو‌بێت کە سوارچاکێکی ئەوسای جووتە مەیدانی کوردایەتی و ئەدەب بووە و لەگەڵ مێجەرسۆندا سەرپەرشتی دەرچوونی ڕۆژنامەکەی کردووە.

ئەوەی بەلای منەوە جێی سەرسوڕمانە شتێکە سەر بەواتای (غەلەبەی ڕۆم)ە کە شوکری فەزلی خۆی لێ دزیوەتەوە وە یا بەجارێ هەر بۆی نەچووە، واش بێ دەچێ بۆنەچوونەکە ڕاست بێ نەك خۆ لێدزینەوە چونکە ئەگەر شەبەنگی ئەو واتایە بە مێشکیدا تێپەڕیبایە ئەدەشیا پشتگوێی بخات چونکە ئەوسا دەیزانی خوێنەری ئەوتۆ زۆرن واتای ڕاستیەی (غەلەبەی ڕۆم) بزانن و خۆ لێبێدەنگکردنی بە ناتەواوی لەسەر حیساب بکەن.

بێگومان ئەم (غەلەبەی ڕۆم)ە هێنانی ئیشکێکی قورئانە بۆ ناو هەڵبەست کە جارێکیان لە سەرەتاکانی پەیدابوونی ئیسلامەتیدا ڕۆمەکان لە ئاست فارسەکاندا شکست دەهێنن ئیتر کافرەکانی قورەیش ئەم شکستەی (ئەهلی کیتاب) بەرانبەر مەجووسییان کرد بە تانە و لە موسڵمانەکانیان گرت کە گۆیا بەهێی چاوەڕوانیکردن لە قورئان و باوەڕی ئیسلام ئەدەبوو ڕۆمی خواپەرست بەدەست فارسی ئاگرپەرستەوە شکستخوردە ببن. قورئانیش لە سوورەی (الروم) بەم شێوەیە وەرامی کافرەکانی دایەوە: «بسم الله الرحمن الرحيم . الم . غلبت الروم. في ادنى الارض وهم من بعد غلبهم سيغلبون...» و موژدەی سەرکەوتنێکی نزیکی ڕۆمەکانی بە خەلق ڕاگەیاند زۆریشی پێ نەچوو سەرکەوتن.

مستەفا بەگی کوردی لە (غەلەبەی ڕۆم) مەبەستی سەرکەوتنەکەیە نەك ژێرکەوتنەکەی (غلبت) چونکە دیارە لە بەیتەکەدا (سيغلبون) لەگەڵ (کوشتنی من کان کفر) دەگونجێت، هەر ئەمەیشە هاوجێنسی دەرکەوتنی نووری مەهدییە لە مەکە.

لێرەدا ڕەنگە گرفتێك بێتە بەر زیهنی خوێنەرەوە و بڵێت کە مەبەستی (کوردی) لەو بەیتانەدا سەفەرکردنی خۆشەویستەکەی بێت چۆن دەگونجێ باسی زاهیربوونی نووری مەهدی و غەلەبەی ڕۆم بکات کە پێچەوانەی دوورکەوتنەوەن. دەبوو پێژ ئاوابوون و نوور بزربوون بکات بە ساکی ئەشبیهی ئەو دوورکەوتنەوەیە. ئەم گرفتە لە دوو ڕووی زۆر ڕوونەوە وەڵام دەدرێتەوە:

ڕووی یەکەم ئەوەیە کە هەموو بڕە شیعرەکە خەریکی داد و بڕوێنە لە دەست

سەفەرکردنی خۆشەویستی شاعیر، تەنانەت قەسیدەکە دەشێ بکرێ بە نموونەی قەسیدەی خاوەن (وحدە). جا ئەگەر ئێمە بێین لەبەر خاتری بۆرە ئەگەرمێک دوو بەیتی سەرەتای قەسیدەکە لە لەشی قەسیدەکە دابڕین وەک ئەوەیە کە سەری گیانلەبەرێک ببڕین و پەکی ژیانی بخەین.

رووی دووەم هێزێکی تەواویش دەداتەوە بە رووی یەکەم بەوەدا کە سەرلەبەری ئەو وێنە پڕ هەڵپە و کڵپانەی کە لە قەسیدەکەدا نەخشەی باری نەفسی و عاتیفی شاعیر دەکێشن هەموویان، تاک تاک و پێکەوە، حالەتێکی جەزبەگرتووانە و خۆ ونکردووانە دەدەنەوە کەوا کەمتر بەوە ڕادەگات کێشانە و پێوانەی وردی مەنتیقکاری لەگەڵ خۆیدا بکات. ئەم جەزبە و خۆ ونکردنە پتر نووری مەعدی و غەلەبەی ڕۆم و ئەشکی خوێنین و غوباری ئەلەم و خەم و وەسوەسە و... هتد کۆ دەکاتەوە لەوەی کە کارەساتی زۆر ناسازی داگیرکرانی سلێمانی کە لە (غەلەبەری ڕۆم)ەوە دیاری دەدا لەگەڵ هەڵاتنی نووری مەعدی لە مەکە یەکدی بگرنەوە چونکە نووری مەعدی ناشێ ئەو ناڕەوایە بێ کە سەفتوسۆی داگیرکرانی وڵاتی پێ بناسرێتەوە.

هەرچەند شوکری فەزلی ویستوویەتی بۆرە تەئویلێک بۆ ئەم لایەنە بهێنێتەوە (کتێبەکەی دکتۆر کەمال بخوێننەوە) بەڵام هیچ تەئویل و گونجاندنێک بابی ئەوە ناکات کە بەبێ بەڵگە دوو بەیتی سەرەتای قەسیدەکە لێی دابڕێت و بۆ لایەنێکی نادیار و تێنەخوێندراوەوە بیبرێتەوە.

دوور نابینم سەفەری خۆشەویستەکەی (کوردی) بەرەو ڕۆژئاوا بووبێت و لەوەوە عەلامەتێکی قیامەتی هەڵاتنی ڕۆژە لە ڕۆژئاواوە، وەهاڵ عەلامەتێکی دیکەی قیامەت، کە دەرکەوتنی مەعدییە، دابێت و ڕەوای پرسیارکردنی لەبارەی حەشرەوە دیبێت. لە دوو بەیتەکەی سەرەتای هەڵبەست، کوردی، زێدە شارەزایی خۆی بە هەواڵی دین و ئاین و بڕوا بەدەستەوە داوە هەرچەند پێشەوە دیار نییە کە دەرخستنی ئەو شارەزاییەی مەبەست بووبێت چونکە ڕەوانیی هەڵبەستەکە و مشتیبوونی لە سۆز و کەف و کوڵی عاتیفە ع هەناسەسواریی خۆ هەڵدانەوەی تێدا دەرناکەوێت. زێدە شارەزاییەکەی لە هەردوو بەیتدا بە تێکڕایی و لە (ئەملی حەبەر) بەتایبەتی دیار دەداتەوە، لەو رووەوە کە ئەوانەی سەرکاریان لەگەڵ حەبەراتی حەشر و قیامەت هەیە پێیان دەڵێن (ئەملی حەبەر).

لە ئیوە دێڕی یەکەمدا (کوردی) دارشتنێکی فیعلی (دان)ی بەکار هێناوە کە ئێستاکە لە سلێمانی خەریکە بە تەواوی ون دەبێت. گوتوومتی (خەیەریکم بدەنێ) و ئەم (ێ)یەی بە فیعلەکەوە نووساندووە کە من لە نووسینی خۆمدا پێی دەڵێم (ێ)ی ڕێژەی ئینتیقالی و لەگەڵ کۆمەڵە فعلێکی کوردیدا دێن وەك (دامێ، کردمێ، بوومێ، گەیشتمێ، چوومێ، نۆڕیمێ... هتد). نالیش ئەم ڕێژەیەی بەکار هێناوە وەك کە دەڵێ:

وای فەرموو کە ماچت ئەکەمێ ڕووڕەشی توو بم

ئەمساڵە بەجێ دێ ئەسەری وەعدەیی پاری

نابێ (تۆ) بنووسرێت چونکە ڕەونەقی شیعرەکە و نوکتەکەی دەدۆڕێت. وشەی (توو) هەم بە واتای (تۆ) و هەم بە واتای (تووك) دێت. دیارە ڕووی پارەکەی دوای ساڵێك (توو، تووك)ی لێ هاتووە پێی ڕەش بووە.

بە هەمە حاڵ ئەم لابازە ئەگەر پێوەندیشی بە بنگەی نووسینەکەمەوە نەبێت زیانێکی تێدا نییە. با بگەڕێمەوە بۆ (حەشرەکە و ئەعلی خەیەرەکە) لە (دیوانی کوردی)دا کە خوا لێخۆشبووی گیوی موکریانی بلاوی کردۆتەوە. ئەم دوو بەیتە بەم جۆرە نووسراون: (بەیتەکانم لە کتێبەکەی دکتۆر کەمالەوە ڕاگوێست):

خەیەریکم بدەنێ ئەعلی خەبەر حەشرە مەگەر

ڕۆژ کەوا ئەمڕۆ لە مەغریب سەری هێناوەتە دەر

نووری مەهدی لە تەرەف مەکەوە زاهیر بووە یا

غەڵبەیی کوردە لە بۆ کوشتنی (من کان کفر)

ئیوە دێڕی یەکەم بەیتی شیعرەکان لە (دیوانی کوردی) و کەشکۆڵی دەستنووسی (بنەهانی) وەکو یەکن، هەر دەڵێی گیو لەو کەشکۆڵەوە بەیتەکەی ڕاگوێستبێت، دەمێنێتەوە ئەو جوداوازییەی نێوان وشەی (غەلبەی) کەشکۆڵەکە و (غەڵبەیی) دیوانەکە. کە بگەڕێینەوە بۆ لای کەشکۆڵەکە دەبینین وشەکە (غلبە) نووسراوە لەبەرەوە دەشێ بڵێین گیوی موکریانی (غەلبەیی) خوێندبێتەوە منیش (غەلبەی).

وا دیارە سۆزی کوردایەتی پاڵی بەرموانشاد گیوەوە نابێت و ئەو غەڵبەیە و کافر کوشتنەی پێ کردبێتە شاباش و بۆ بەرهەمنگاری میللەتەکەی خۆی هەڵدابێت، ئیتر شیعرەکەش واتای دەمێنێ نامێنێ (ملی دەقوتەوە).

ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ٧٥، ١٩٧٩

# سلاوێك لە شیعری نوێبابەتی كوردی

تێبینییەكی سەرەتایی هەیە لەبارەی ئەو ئامێرانەی مرۆڤ تەعبیریان پێ لە شتان دەداتەوە دەشێ ببێتە تیشك بە دەوروبەری (شیعر – ئامێری تەعبیر)دا، ئەختێك چەشمەندازی بینەر ڕوون بكاتەوە:

مرۆڤ بە دوو جۆرە ئامێری ڕاگەیەنەر نیازەكانی خۆی دەردەبڕێ.

یەكەمیان، هونەرە جوانەكان.

ئەوی دیكەیان، ئاخاوتن كە دەشبێتەوە نووسین.

لێرەدا ڕەمز و ئیشارەت و برۆ هەڵتەكاندن و تەلیهاڵی و شتی ئەوتۆیی نایەنە ناو حیسابی ئەم وتووێژە چونكە ئەمەچنە ڕیزی هونەر و ئاخاوتن و ئەمەشگەنە مەیدانی ئەوان هەرچەند بەجۆرێك لە جۆران، تا ڕادەیەك، توانای تەعبیریان هەیە. خۆ ئەگەر بایەخ بەو چەشنە هۆیانەی تەعبیر بدەین دەبێ ئیشاتەكانی هاموشۆی سەر شەقامانیش بهێنینە ڕیزی هونەر و ئاخاوتن، ئینجا فیكەی شوان و دەرگە لێدان و ئەحم و نازانم چیش... نەك هەر ئەمانە بگرە وشەی وەك (هەچە، وشە، چفە...)ش هەر نایەنە ناو لیستەی ئامێرەكانی تەعبیر هەرچەند لە شێوەی (دەنگی زمان)یش لە زارەوە دەردێن. قسەم لێرەدا لەگەڵ هونەر و ئاخاوتنە.

بەر لەوەی بچمە قووڵاییی لێكدانەوەوە، تایبەتییەكی زێدە جوداكەرەوەی ئاخاوتن لە هۆیەكانی دیكە تەعبیر دەدەمە بەر نیگای خوێنەر. ئاخاوتن تاكە ئامێرە كە بە مانە و واتایەوە زادەی هەناوی مرۆڤ بن، هونەرەكان هەر لایەنی واتایان بەچكەی مرۆڤە لەوە بەولاوە ڕەنگ و زەیت و بەرد و قوماش و فرچە و پیشە و ژێ و گەچ... و... هەموو ئەو كەرەستانەی كە لە بەرهەمی هونەریدا بەشدارن لە مرۆڤ بێگانەن.

ئاخاوتن لە هەموو ڕوویەكەوە و بە هەموو وجودیەوە زەنەی هەست و هۆشی مرۆڤە تەنانەت مرۆڤ دروستكەر و داهێنەری ئاخاوتنە پتر لەوەی هی منداڵەكەی بێت، بگرە لە گەرمایی لەشیشی لێی نزیكترە چونكە منداڵ و گەرمایی لە مادەی بە پێز و بەرهەستی دەرەوەی وجودی مرۆڤ بەدەر دەدەمەوە كەچی (وشە) لە خودی مرۆڤەكە دەزێتەوە بەڵام زانەوەی مەعنەوی نەك مادی. ڕەنگە بیر بۆ ئەوە بڕوا كە (وشە)ش لە

مادەوە وجود پەیدا دەکات. گۆیا (دەنگ) کە قاڵبی وشەی واتادارە پێوەندیی بە هەواوە هەیە هەواش مادەیە. ئەم بۆچوونە روالەتی و سەراوییە چونکە مرۆڤ دەتوانێ لە دەروونی خۆیدا وتوویژ بکات بێ ئەوەی بە زمان دەریان ببڕێت. خۆ زۆر کەسی بێ زمان هەیە هەموو شتان تێ دەگات و هەموو شتانیش بە دڵ و مێشکی خۆیدا تێ دەپەڕێنێت و یەك وشەشی لێ دەرناپەڕێت .. هەر نەیە با بگەڕێینەوە بۆ سەر رچەی مەبەستی ئەم نووسینە.

هونەر، تێکرایان، کە لە رووی شێوە و جۆری (تێگەیاندن – راگەیاندن)ەوە لەگەڵ ئاخاوتندا بەراورد بکرێن دەچنەوە بۆ لای (تجرید) و هێماکاری، واتە بەر لەوەی هونەرکار بیەوێ هیچ بەرگی ئاموێی لەبەر هونەرەکەی بکات، هونەر خۆی وەك هەیە بە جۆرێکی تەجریدی واتا دەبەخشێ و فەرهەنگی قەراردادە و نووسراوی نییە واتاکانی لێك بداتەوە وەك کە زمان فەرهەنگی هەیە هەڵبەت بۆیە هونەر پێویستی بە (وەرگێڕان) نییە لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێکی تر وەیا راستتر ئەوەیە بڵێین وەرگێڕان هەڵناگرێ وەك کە زمان هەڵی دەگرێ و داخوازیشی دەکات، بە نموونە کە گوتت (تووڕەیی) عەرەبێك تێت ناگا تا بۆی نەکەیتە (غضب) بەلام کە بە وێنەکێشی تەعبیرت لە (تووڕەیی – غضب – fury ..) داوە هەموو بینەرێك لە واتاکەی دەگات رەنگە کوردێك و ژاپۆنییەکیش هەردوویان بە جۆرێکی لە یەکتری نزیك تەعبیر لە (تووڕەیی) بدەنەوە، ئەگەر جوداوازییەکیش لە نێوانیاندا هەبێت لەوانەیە هەر بە قەدەر جوداوازیی نێوان دوو وێنەکێشی کورد وەیا ژاپۆنی بێت. ئەوەی راستیش بێ تەعبیردانەوەی تەجریدی لە واتا بەناچاری جوداوازی دەخاتە نێوان بەرهەمی هونەرکارانەوە چونکە مومکین نییە خوریەی دڵ و تاسەی دەروون و رەنگینیی پەنجەی دوو کەس وەك دوو نوسخەی یەك شت بن، کە ئەم بزوێنەرانەش لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی دیکە گۆڕان هەڵبەت بەرهەمیشیان دەگۆڕێ.

رەنگە راست بێ بگوترێ رەسم لە پلەی پێشەوە و سەرەتای (تجرید)دا بێت مۆسیقاش لە دوایین پلەدا، واتە رەسم لە هونەرەکانی دیکە مەفهوومتر بێ و مۆسیقاش لە هەمووان زاتیتر و دەروونیتر بێ هەر نەبێ لەبەرئەوەی کە ئامرازی تەعبیر لە هونەری مۆسیقادا، کە دەنگ و ئاوازە ، لە خۆوە خزمترە لەگەڵ مەعنا و خەیاڵ و خوولیادا بە ئەرك و بڵێمەتی مۆسیقار نەبێ ناتوانێ وەیا هەڵناگرێ تەعبیر لە شتی رەق و زەق و بەرهەستی وەك بەرد و دار رەنگ و بێن و بینراو و بەرهەست و

چێژراوانەیە. ئینجا دەشتوانێ بەهۆی وێنەی گوڵ تەعبیر لە (بێن) بداتەوە وەیا بەهۆی کەمانی ناو باوەشی مرۆڤێك واتای (ئاواز) ببەخشێ...

بە هەرحاڵ ئەم خاسیەتەی بەکارهێنانی (تجرید) و ڕێگە تەعبیری تەماوی و پشت پەردە لە هونەردا، بۆی بووە بە قەڵغان و بەدرێژایی مێژوو لە زۆر بەڵای ناگەهانی ئەم جیهانە پڕ کێشەیەی پاراستووە سەرەڕای ئەوەی کە (هونەر) لە بنەڕەتدا مەخلووقی ئارایشت و جوانکارییە: تا ئێستاکەش هونەردۆستی هەموو جیهان مەرجەبا لە بەرهەمی هونەرێك دەکەن کە لە ڕووی هونەری ڕووتەوە بێ عەیب بێ دواتر سەر لە ناوەرۆکی خوار دەکەنەوە. ڕەنگە هەر گوێشی نەدەنێ. هونەر خۆی لە خۆیدا گەرمستەیەکی مام سەلامەتۆکەی تەعبیرە. زۆر بە درەنگەوە خاوەنەکەی دەهاوێژێتە ناڕاحەتییەوە. ئەمە ڕاستییەکە هونەر لە چارچێوەی ڕەوای خۆیدا دادەنێت، لە نرخی کەم ناکاتەوە. وەك ئەوەی کە هەنجیر و هەنگوین و ترێ و گۆزەویش نرخیان بەوەدا نادۆڕێنن کە لە لوولەی تفەنگەوە دەرنایەن.

لە تاقمی ئامێرە زمانییەکان، کە پەخشان و هۆنراوە، پەخشانیش بەسەر بگە زۆر ئەژمارەکانی ئەدەب و زانست، ئینجا گوتار و کتێب، ئینجا چیرۆك و شانۆگەری.. هتد دابەش دەبێ. بێگومان ئامێرە هەرە بەهێز و پێز و بەبڕشت و دەنگ و سەداکەی تەعبیر لە نێوان بەرەی ئاخاوتن و نووسیندا گوتاری سیاسی و نووسینی سەر بەسیاسەت و باوەڕە کە ڕاستەوخۆ و یەکسەر، بێ تەئویل و زمانگرتن و (پێچی دەوەنێ) نشتەر لە دوومەڵ دەدات چیرۆك و شانۆگەری، بەعادەت، لەناو هەڵوەست و ڕووداوی ناو سەرگورشتەکەیان (پەروەرا) دەردەبڕن و لەوانەیە گوتە هەرە بەجورئەتەکانیان لەسەر (نووسەر، دەرهێنەر) حیساب نەکرێن چونکە بەسەر زمانی غەیری خۆیدا دەریان دەبەڕێنێ و ڕێی ئەوەی دەمێنێ پەنا بباتەوە بەر سایەبانە زۆر مەشوورەکەی (ناقل الکفر لیس بکافر).

ئەوەی مەترسی و بەڵا بۆ نووسەری چیرۆك و شانۆگەری دەهێنێتەوە، ڕەنگە چیرۆکەکە نەبێت بەڵکو (انتمای) نووسەرەکە بێت. لەوانەیە هەمان قسە و هەڵوەستی ناو چیرۆکەکە لە نووسەرێکی دیکە کە (انتمای) نییە وەیا جودایە بەداوێوە نەکرێ. ئاوێك لە مێژوو بدەوە دەبینی لە وڵاتی مسڵماناندا هەمیشە مسڵمانەتی بۆتە شەفاعەتکاری ئەوانەی قسەی بەجورئەتی پشت لە عەقیدەیان کردووە، نەك لە چیرۆك و بەس، بگرە لە هەموو مەیدانێکدا. هەڵبەت لە نێوان مەسیحییانیشدا هەمان دیاردەی

حاڵبەخشکردنی مرۆڤی مەسیحی لە چاو هی (کافر) باو بووە هەروەهاش لە نێوان باوەڕە جوداجوداکانی دیکەی ئەم جیهانەدا.

کە بێین و لە ڕوانگەی مەترسی و سەلامەتیی تەعبیرەوە سەیری (ناخێوەر، ناخاوتن) بکەین دەبینین لە کۆنەوە شیعر ئامێرێکی سەلامەت و بێ خەتەر بووە لە چاو پەخشان: هەموو ئەو قسە بێ پەروا و بێ پەردانەی کە ئەگەر نووسەر بیانکاتە پەخشان هەرای بۆ دەنێنەوە لە شیعردا بە درێژاییی ڕۆژگار چاوی لێ پۆشراوە و بە قسەی جوان و نوقڵ و بابەتی ئارایشت لە قەڵەم دراوە.

سەیری شیعرەکانی نێو نەلف لەیلە بکە و بزانە چی تێدا گوتراوە [نەلف لەیلە بە شیعر و پەخشانیەوە ئەم بێ پەردەییەی تێدا بەدی دەکرێ بەڵام شیعرەکانی کە بە نموونە دێنەوە زەقترن لە ڕووی جرونەتی زایەندییەوە «زایەند – جنس – sex»]. ئینجا گوێ بگرە خەییام چۆن ناوناوە دەگاتە پایەی (ابن الراوندی) و هەر بە خواناس و (حکیم)یش ناوی دەبرێ. لە کۆنی هەرە کۆنەوە (هەڵبەست) بە تێکڕایی یەکجار کەمتر لە قسەی عادەتی، چ جایی نووسین، حیسابی (جدیە)تی بۆ کراوە، ئێستاش هەر وەهایە. نالی کە دەڵێ:

شیقەی فەلەکولئەتڵەس و ئەستوونەیی زێڕین
بێ پێکە بە ئارایی سەر و سرکەیی والا

لە جیاتی ئەوەی پێی بڵێین مامە نالی چۆن دەکرێ ئاسمان و پەلکەزێڕینە بدەینە دەمی مەقەس و نووکی دەرزی، هەزار ئافەرین لە خەیاڵە بڵند پەروازەکەی و دارشتنە سیحراوییەکەی دەکەین، جا ئەگەر یەکێکی عادەتی، یاخود نالی خۆی، بچێتە بازاڕی قوماش و جلدرووان و مامەڵەی ئەو تەرزە بابەتە و درووما‌نە بکات دەبێ چ وەرامێك وەرگرێتەوە! کام نووسەر وێراوەتی لە پەخشاندا شتێکی وەك (هەتیوی بولغار و پەهودی پەچە)ی شێخ ڕەزا و شەوە زۆر مەشوورەکەی ئەدەب (مصباح الدیوان) بە قەڵەمی خۆیدا تێ بهەڕێنێ؟

مەسەلەی حیساب لەگەڵ نەکردن و لێ پەداوێنومنەکردن پەزیادەوە لە هەڵبەستی فۆلکلۆری سەهاو و دەگرتوو بووە، واتە شایەر و گۆرانیبێژ و بەیتخوێن و بالۆرەبێژ پتریش لە شاعیر پەرەو تەعبیری بێ پەردە و وێنەی شەرمهێنەوە دەڕۆن بێ ئەوەی کۆ لە جەزا و چاوسوورکردنەوە بکەن چونکە دەزانن کەس لێیان زوێر نابێ. لە زۆر

بەستەی شایی و گۆرانیی میللی، حەزکردن رووی لە ئافرەتی شووکردوو دەکات وەك کە هەموو جاران شایەر دەڵێ (مێردە گولەی بمرێ..) وەیا (... ناوێرم بینم ناوی، لەبەر مێردی گلاوی) وەیا گۆرانیی (لانکۆلێ) هەمووی هەر خەریکی زیرکردنەوەی منداڵە بۆ پەیداکردنی دەرفەتی زواتی دەمەوبەیان، لەوە هەر گەڕێ کە گەلێك جاران لە شایی رەشبەڵەکدا باسی لەشی ئافرەت بەو شێوەیە دەکرێ کە لەوێدا نەبێ جایەز نییە.... بە تێکرایی، شیعر لە چاو فۆلکلۆر، پتر زمان دەگرێ لە ئاست ئەو وشە و تەعبیرانەی بیری بیسەر بۆ لای زایەند دەبەنەوە هەرچەند گەلێك پتر لە پەخشان ڕێی تەعبیری رەهای بەرەو زایەند بە خۆی دەدات و لێشی دەسەڵمێندرێ.

بەهەرحاڵ، شیعر بە زۆر ناکەوێ لەسەر شاعیر، ئەمەش ڕاستییەکە لە خۆوە ئاشکرایە هەرچەند باسیشی ناکرێت و هیچ حیسابێکیشی لەسەر هەڵنەستاوە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ منیش لە مامەڵەکردندا هەرگیز ئەو سەلامەتییەی شاعیرم تێ نەخوێندۆتەوە تێشی ناهوێنمەوە لە نووسینیشمدا ئەوەندەی باسی شاعیری کوردم بە تەقدیسەوە کردووە پەخشاننووسی کوردم باس نەکردووە. لێرەشدا کە ئەم ڕاستییە بە فراوانی دەدەمە بەر لێدوان پێش هەموو شتێك مەبەستم ڕوونکردنەوەیەکی شوێن هەنگاوی شاعیری نوێخوازی کوردە جا ئەگەر بۆچوونەکانم هەڵبگرێ، ڕەنگە بە سوودی خۆی تەواو بێ، خۆ ئەگەر گرێشی نەدامێ چ زەرەرێکی نەکردووە. تەنانەت ئەگەر لە خۆشمی زوێر بکەم دۆستی لە من بەردەوامتر و ڕێز لێنەرتری چەنگ ناکەوێ، بۆیە وا بێ پەروا دەڵێم لە ڕووی خەتەر و سەلامەتییەوە شاعیر دەکەوێتە نێوان هونەرکار و نووسەر. بابی ئەوەی کە شیعر وەك هونەر ئارایشت و مۆسیقا و تەجریدە پشکی سەلامەتیی هونەر وەردەگرێ، بابی ئەوەش کە بە هۆی ئامرازی (وشە) تەعبیری مەفهوومتر لە هونەر بەکار دێنێت بەرەو پەخشان دەبێتەوە لە مەڵبەندی ترس و خەتەردا. لە کۆنەوەش گوتراوە (زمان بەڵای سەرە).

ئەم لایەنەی بێ خەتەری، وەیا کەمخەتەری، کاری نەکردۆتەوە سەر شۆرەتی شاعیر هەروەك کاری نەکردۆتە سەر هونەرکاریش، بە پێچەوانە شاعیر هەمیشە لە نووسەری پەخشان بەناوبانگتر و مەرجەعیا لێکراوتر بووە. هەڵبەت دەزانم بەشێکی بەرچاوی ئەم پاداشە مەعنەوییە دەچێتەوە بۆ ئەو لەزەتە عاتیفییەی کە مەردم لە شیعری نازکی وەردەگرێ. لە بری هەستی حەسانەوە و ئارامیی گیان و تامەزرۆیی شکان کە لە بیستن و گوتنەوەی شیعری جوانەوە بە مرۆڤ دەگات مرۆڤەکە پاداشێکی خۆشویستن و سۆز

بە شاعیرەکە دەداتەوە. ئینجا هۆی دیکەش هەیە پاڵهشتی لە بڵاوبوونەوە و ناو دەرکردنی شیعر و شاعیر دەکات وەك ئەوەی کە شیعر پتر لەگەڵ دەروونی بیسەردا وتوویژی بەردەوام دەکات و گەلێك درەنگتر خەڵق لە گوتنەوەی تێر دەبێ، پتریش لە پەخشان دەست دەدا بۆ ئەوەی لەلایەن خەڵقەوە لەسەر شانۆ و لە کاتی کۆبوونەوە و نمایشت و چەندین موناسەبەی دیکەدا بگوترێتەوە و بخوێندرێتەوە، باشتریش لەگەڵ جۆشی عاتیفە هاوئاهەنگ دەبێ، ئاسانتریش دەبێتە گۆرانی.. دەڵێ ئەمانە هەمووی پاریدەی شیعر دەدەن تا ئەویش وەك هۆیەکانی دیکەی ناو دەرکردن (گۆرانیبێژی، سینەما، رۆژنامەگەری، پاری، مۆزیمایەتی....) بە خێرایی شاعیر مەشوور دەکات و دەیباتە پلەی عەبدولحەلیم و حەسەن زیرەك لە شۆرەتدا. بێنە قوتابییەکی زانکۆ کە شیعر بڵاو بکاتەوە، لە رووی شۆرەتەوە بەو مامۆستایەی بگرە کە هەرچی زانستی سەخت هەیە بە دەرسی دەڵێتەوە و کتێبیشی لەسەر دادەنێ، دەبینیت قوتابییەکە زۆر لە مامۆستاکەی مەشوورتر دەبێ، ئەمە راستیی بێگومانە کە لە هەردوو دەستە تەرازووی ئەرك و پاداشدا بە سوودی شاعیر لەنگەر دەبەستێ .

بەولای ئەم راستییەوە راستییەکی دیکە هەیە، ئەویش لە سوودی شاعیر زیاد دەکات و لە ئەرکی دادەشکێنێت، هەتا واتای شیعر تەماویتر بێ هەڵوەستی شاعیر سەلامەتتر دەبێ، چونکە نامۆییی تەعبیر وەك ئەو کالانەیە کە تیژایی و بڕندەیی تیغ لە نێو خۆیدا دەشارێتەوە و زۆر بەدرەنگەوە لێی بەدیار دەدا کە دەیەوێ برین بخاتە لەشی ناحەزەکەیەوە. لە سەرێکەوە شیعر بە هۆی شیرینی و روحسووکی و خنجیلەیی خاڵبەخش کراوە لە سەرێکیشەوە شاعیر بە تەعبیری تەمایی خۆی جەب دەدات لەو ئەرمە خەتەرەی کە شیعری وەك:

ملك ودستور ومجلس امة

کل عن المعنى الصحيح محرف

کاتی خۆی رەنگ بوو بیهێنێتە بەر هەنگاوی (رصافي). ئەوەی راستیش بێ شیعرەکە و هی تریش دووچاری هیچ ناڕاحەتییەکیان نەکرد، ئەوەی پێی سەغڵەت بوو دەم لێدانی شتی سەر بە ئاین بوو کە لە حەقیقەتدا بە گەلێك مەزهەبی رەواش هەر رەوا بوو کەچی کۆمەڵێك مەلای لێ بەخەبەر هێنا، رەنگە هەر ئەو کەسانەش پاریدەی رزگاربوونیان دابێت کە بە هەڵبەست هێرشی دەبردنە سەر. شتە سەر بەئاینەکان بە پەخشان نەك بە شیعر بڵاو بوویوونەوە بۆیە بوو ئەو کارەی کرد، ئەخۆ زەهاوی بە

شیعر ئەری بری کە ئەبێ (أتهر) خوا بێ چونکە هەموو ئەو سیفەتانەی دەدەنێ کە لە خوادا ڕەچاو ئەکرێ و هەر ئەمێنێتەوە هۆش و خواز (ارادة)، کە ئەو دوانەشی پێ بدرێ بۆ ئەبێتە خوا؟ ئەمەی گوت [هەڵبەت من ئەقی قسەکانی زەهاویم نەهێناوەتەوە] و پێشم شك نایەت کەسی لە خۆی بەدەنگ هێنابێ.

ئۆ بێنە لە هەڵبەستدا هەرچی جەهەنەمی دنیا و قیامەت هەیە لە گیانی زۆردار و بەدکار و خوێنمژ و داگیرکەر و (سیخوڕ)ی بەربدە کەس تووڕە ناکەیت چونکە قسەکانت هیچ تاکێکی دیار و پەنجەنیشان ناگرنەوە. شیعریش پەخشی نەخبار نییە ناوی کەسان و شوێنان و مێژووی ڕووداوان بکاتە لیستە و لە دێڕەکانیدا قەتاریان بکات، بۆیەیە ئەوەی لەبارەی خراپەوە دەیڵێت، زۆر جاران، لەوانەیە بەدکارەکەش بیڵێت. لەمەوە دەمەوێ بە شاعیری کوردی نوێخواز بڵێم هەستکردنی تەموەژی ناو تەعبیر و هەڵنانی پەردەی ناموێی بە دەوری هەڵبەستەوە حەشارگەی خۆ تێدابواردنە ئینجا نمایشتی ماسوولکەی هونەرە. ئینجا سلێمانی گوتەنی (خەنجەر لە کا)یە بێ ئەرك و مەسرەفەکەیە. ئینجا (بهتاقەی شەرەف) بەخۆیەخشینە بۆ ڕیزی هەرە پێشەوەی قارەمانە ڕاستینەکانی هەرای فکر و باوەری کۆمەڵایەتی و چارەنووسی گەلان. ناخێوەر هەتا لە تەم و ناموێی زیاد کات خۆی لە خەبات دەشارێتەوە. بووکەکانی فکری مارەبڕی خۆی ناکات. بگرە دەخزێتە ناو ئەو بورجە عاجینەی کە لە فێرگەیەکی سەرلەبەری فکر و هونەر کراوە بەعەیب. ئینجا ئەگەر جوانی و شکڵی شیعر جارێکیان پەرژینی سەلامەتی بۆ کێشابێ. ئەو جەنگڵ خواردنەی لە نێو بورجە عاجینەکەدا بە هۆی تەعبیری نامەفهووم لە زۆرەی هەرە زۆری گەلی دادەبڕێت چونکە یەك تاکی جەماوەرەی ئەو خەڵقە لە قسەکانی ناگات. شاعیری کەس تێنەگەیشتوو کە لەلایەن خەڵقەوە پێشوازیی لێ دەکرێت، بەهۆی مەفهوومنەبوونی قسەکانی ئەو پێشوازییەی لێ ناکرێت، بەڵکو لە شێوەی قەرز و خواستنەوەدا پشکی (حورمەت و خۆشەویستی) لە تێکڕای مەفهوومی (شاعیریەتی)، نەك لە مەفهوومنەبوون، بۆی دەبێ بە ماڵ. سەرمایەی شاعیری نامەفهووم لەو شەعبییەتەی کە هەیەتی قەرزی دەست بەسەردا گیراوە.

شیعری زیندە ئەماوی، بەناچاری دەبێتە وتوویژ لەگەڵ خۆدا کردن. ئەوەبری لێك کێشرانەوەی جفزی مەفهوومبوونی ئەوەیە بەرەی شاعیران لە ڕێی کوتانەوەی ڕێگای لە یەکدی نزیك و لە یەکدی شارەزا بدۆزنەوە بتوانن لە یەکدی بگەن. یاخود

هەریەکەیان بەپێی بۆچوونی تایبەتی خۆی واتا لە شیعری هاوڕێکەی بداتەوە، کە ئەمەش شێوازێکی نوێی بابەتی لێکدانەوەیە جەریکە لە زۆربەی مەیدانەکانی سەقافەت خۆی دەکاتە ڕوانگەی سەلمێنراوی تێوە ڕامان. تا ئەوەی بەرهەمی کۆنینە دەڕێتە بەر نیگای سەردەم نەک بە نیازی پتر تێدا ڕووچوون و ڕوونترکردنەوە و سەرەژوورتربردنی سەرچاوەی ماکەکانی ئەو بەرهەمانە بەڵکو بە ڕاگوێستنی پاتەویات و پەکسەری بەرهەم و خاوەنەکەی لە ڕۆژگاری خۆیەوە بۆ ئەم ڕۆژگارە وەک کە کوڕی ئەم ڕۆژە بێت.

سەیر لەوەشدایە کە هەندێ جار دەستەتەقە هەڵدەستی لەسەر نیاز و خوازی هونەرمەندێکی سەردەم و زیندوو لە فلانە بەرهەمیدا. کابراش زەق زەق دەبینێت و تەق تەق دەبیەت و بەدەنگیش نایە بڵێ هۆ هەلقینە ئەمەیە مەبەستەکەم، خۆ هەرای هونەرکاران بە دووروپشتی وێنەی سوریالیستەوە کە هەریەکەیان بە جۆرێک واتای لێ دەداتەوە بە تەواوی خاوەن هونەرەکە کپ دەکات.

دەبێ بزانین شیعر لە بنەڕەت و لە یەکەم جوولەی هەڵتانیەوە جۆرە داهێنراوییەکی وەک پەردەی تەنک یا دەستووری بەسەرەوەیە لە چاو قسەی عادەتیدا. تا ئەوەی ڕەنگە ڕاست بێ بگوترێ شیعری زێدە سادە و ساکار و مەفهووم بە کاری هونەری لە قەڵەم . نادرێت. مەگەر لەوانە بێ کە پێی دەگوترێ (سهل ممتنع).

بە نموونە ئەم دێرە شیعرەی شێخ ڕەزا بەهۆی داڕشتنێکی ئەهتەک ناعادەتییەوە بوو بەو نامەفهوومەی کە هەر ئێستا باسی دەکەم:

کێ بێ لە دلێرانی عەشایر کە نەچووبێ

وەک تیری ئەجەل نووکە ڕمی جافی بەنافا

وەک دەبینێت دێرە شیعرەکە لە بەشی هەرە ولتا ئاشکرای هۆنراوەیە کەچی نیمچە شاعیرێک ئەمەی خوارەوەی لێ خواستەوە و کردی بە دیاری بۆ نەوەیەکی عوسمان پاشای جاف:

(ئـــەی نـــەوەی مـــیـــری بـــەنـــاف

ناعەلاجم شەو لە داخت لیر ئەکەم)

ئەگەر دێرە شیعرەکەی شێخ ڕەزا هەڵوەشێنینەوە بۆ باری عادەتیی ناخاوتن و بڵێین (کێ بێ لە دلێرانی عەشایر کە نووکە ڕمی جافی بە ناوکدا نەچووبێ وەک تیری

ئەجەل؟) ئیمجە شاعیرەکە چاوی ڕەشکە و بێشکەی ئەمەکرد لە وشەی (بەنافا) و وا تێ بگا لە کۆتاییی شیعرەکەدا سیفەتە بۆ (جاف). ئینجا هەقیشم نییە بەسەر ئەبوونی کێش و واتا لەوەی بە دەوری (بەناف) فەرموویەتی.

شیعری ئێستاکەی کوردی، زۆر بەداخەوە پێمەبێ تێ هەڵکشەوە لە نامەفهوومی تاکو گەلێك جاران دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە لە خاوەنی بەولاوە ڕەنگە کەس تێی نەگات. ئەو نامەفهوومییە و نامۆییە لەوە دەرچووە زادەی عەفوییەت و وروژان و جۆشان و هەڵڕژان بێت وەك ئەوەی کە دەمەوانەی دەفری داخراو و ناخناوت هەڵگرت ناوەڕۆکی دەفرەکە هەڵڕژێت و دەپەڕێت. نامۆیی لە شیعری نوێبابەتی کوردی بووە بە شەقڵ و دەق و نەخش و ڕوخسار، بگرە تا ڕادەیەك بەرەو دەروونی شاعیریش ڕۆیشتووە لەوەدا کە خەریکبوونی شاعیر بە دۆزینەوەی داڕشتنی سەخت و وێنەی کوێر بەرەو خەیاڵ و واتای ورد و تێك هەڵکێش و نامەئلووفی ئەوتۆیەوە دەبات کە (معاناة)ی عادەتی ناهانگاتێ. ڕەنگە ئەم وردبینییە و تەنك هەڵبڕینەوە و خەیاڵ باریککردنەوەیەش تەنها سوودێك بێت بە شیعری کوردی بگات لە بری لەدەستچوونی ڕوونی و ساکاری و ئاشکرایی کە سەرچاوەی لێخواردنەوەی ئابۆرەی خەلقە. واتا و خەیاڵی دووردەست بە خۆی و نرخە هونەری مەعنەوییەکەیەوە وەك ئەو گەنج و زێڕ و گەوهەرەیە کە لە خەزنەی دەوڵەمەنددایە و بەر ئێگای من و تۆ ناکەوێ، داخیشم ئەو داخەیە کە گەوهەری وەها ناهابی کوردی، وەك لە دەست ئێمە چووە، تەرجەمەش نەکراوە بۆ زمانانی دیکە بە شێوەیەك لە عالەمی ڕابگەیەنێ کە شاعیرە بێ پووڵ و پارەکە بگرە بێ شەعابەکەی، کورد بە گەوهەری واتا و شێوەی کەسنەبیستوو و کەسنەدیتوو ئەو سامانە مەعنەوییەی بەدەوری ڕووتەڵەیی خۆیەوە هەڵناوە تا ئەو ڕادەیەی بتوانێ بەخشندە بێ و لێی بخوازرێتەوە. هیچ موجامەلە لەوەدا نییە کە دەڵێم شیعری نوێبابەتی کوردی وەهام بیستووە بە قۆناغ پێش زۆربەی، ئەگەر نەڵێم هەموو، شیعری نوێبابەتی جیرانەکانی کورد کەوتۆتەوە. تەنانەت جارێکیان بە یەکێك لەو شاعیرانەم گوت کە تۆ دێیت و لە فڵانە برە شیعرتدا، بەلای خۆتەوە، بەناوهێنانی چەند شاعیری غەیری کورد ڕووکاری هەڵبەستت بەرز دەکەیتەوە لە ڕاستیدا دەستیان بۆ شۆڕ دەکەیتەوە ئینجا لە بەرزایی هەڵبەستەکەتەوە دەتوانی دەست بگەیەنیە دەستە بەرزکرلوەکانیان بەرەو ئاسۆی پەروازت. لە مەشدا یەك تۆسکاڵ موجامەلەم بەکار نەهێنا چونکە بە ڕاستی و سەد جاران بەڕاستی ئەو برە شیعرە کە نموونەی گەلێك

پارچەی دیکەی وەك خۆی بوو تاکە یەك هاوتای نەبوو لە هەموو ئەو شیعرە تاوەرکردووانەی غەیری کورد کە من لەو چەندین ساڵانەی دواییدا بیستوومن. جوانی و بەرزیی برە شیعرەکەش یەکی لەسەر ئەوە نەکەوتبوو ئایا تێیان دەگەیت یا نەگەیت. وەك فیزکەی بەمەواوە هیچیشی تێ ناگەیت و پێشەوە دەحەبەسێنێت.

شیعری نوێخوازی کورد گلەیك بەولای شیعری سەدەی نۆزدەمی کورد، لە ئاموزیی و نامەفهوومی تێپەڕی کردووە. جا ئەگەر گلەیی لە شاعیرێکی بەر لە ۱۰۰ ساڵ بکەین کە شیعری توێکڵداری گوتوون دەشزانین ئەو شاعیرە لە سەردەمێکدا ژیاوە کە وا جاری شیعر تێیدا نەبووبووە فەرمانبەری بیروباوەڕ شاعیریش داوای شەعبییەت و گەلدۆستی نەدەکرد، خۆدیوانەکەشی چاپ نەدەکرا، هیچ بەرەو تاقمێکی ڕۆشنبیرانیش بۆی نەدەبوونە پڕوپاگاندەچی، نە خۆی بەتامایە و نە کەسیش لێی دەسەلماند ببێتە پاڵەوانی کۆمەڵایەتی و قەومایەتی و.. نە.. نە..

ئینجا شیعرەکانیشی لە چاو شیعری سەردەم ساکار و ڕوون بوون ئایا دەبێ چ جۆرە گلەییەك بکرێ لە نامەفهوومیی شاعیر توێ خوازی نوێبابەتی کورد کە هەموو ئەو (نە.. نە..)یانەی شاعیری کۆن بۆ ئەو (ئەری.. ئەری.. بەدێ... بەدێ... بەلێ.. بەلێ..)یە؟ ڕێز و خۆشەویستنم بۆ شاعیری سەردەم ئەوەم لە بیر نابەتەوە کە دەبێ تێی بگەم دەبێ خۆی لێم ئاشکرا بکا: داوا لە هونەر و توانای دەکەم یا قاڵبی وەها دابڕێژێت بە دڵی خۆی و بە فەهمی بیسەر بێ، یاخود پتر ڕووناکی بخاتە نێوان شێرازەی تەنینەوەی داوە باریك و لوولخواردووەکانی ئەو فکر و سۆزەی کە لە بەشێکی بەرچاوی شیعری ئێستاکەیدا بۆ شیعرخوێنی عادەتی و فراژووش گرێچکە دەکا. من ناڵێم، لێشی قبووڵ ناکەم، بە دەموودووی ناخاوتنی عادەتی و پەخشانی سادە لەگەڵمدا سکاڵا بکات، تاوانباریشی دەکەم کە بەنیازی خۆ ڕوونکردنەوە و مەفهوومبوون واز لە وێنە و واتای کێوی و ڕەمکردوو بهێنێ... مۆسیقا بدۆزێنێ... پەردە و پۆشینەکانی سەر ڕووی بووکە خولیاوییەکانی بپێچێتەوە. من مامۆستای قوتابییانم لە شاعیر و هونەرکار ناوێ.. واعیز و پەندیاریشم ناوێ.. ڕابەری ئاین و کۆمەڵایەتیشم ناوێ. ئەمانە بێ ئەوەی شاعیر بن هەن و لە کاردان.. من شاعیرێکی هەستیاری هونەرکاری دەستڕەنگینی مەناو تەقیوی جەزبەگرتووی شێت و شەیدا و بەلەرز و تا و... مەفهوومم دەوێ، ئۆباڵی ڕسکان و نەڕسکانی ئەو مەرجانەش دەچێتەوە ئەستۆی بەهرەکەی، ئۆباڵی لێحاڵیبوونیشی، ئەوسا، دەچێتەوە ئەستۆی خۆم.

نامۆیی شیعر، یا هەر بابەتێك بێ. كە گەیشتە پلەی پێچرانەوە و لوولخواردنی ئەولای تێگەیشتنەوە چ پێویست بەوە ناهێڵێ لە ناوەرۆکەکەی بکۆڵرێتەوە تاپا رووی قسە و وتووێژی لەگەڵ چەندیەکی میللەت و کام بەرە و چینی میللەتە. پارچە هەڵبەستی وەها هەیە هەر لەبەر شێوازە نوێبێوەکەی دەزانری نوێخوازە و کۆنەپەرست نییە. تۆ بڵێی ئەم داڕشتنە پشت لە (عروض)ە و ئەم شێوە تەماوییە نامەفهوومە لە کوێوە پەڕییەوە بۆ ناو هەڵبەستی کوردی؟

هەڵبەت ناشێ بڵێین نمای ناسایی و فراژووربوونی خۆرسك شیعری کوردیی لە عەرووزەوە ڕاگوێست بۆ ئەو حاڵ و بارەی کە هیچ پێوەندیی بە ڕیردوویەوە نەهێشت. چونکە وەك دەزانین ئەو گۆڕانەی کە لە هەڵبەستی کوردیدا گەیشتە ڕاەی بەرەواژبوون و هەڵگەڕانەوە لە چەند ساڵێکدا ڕووی دا بەحاڵ بەشی لاساییکردنەوەی دەکرد چ جایی ئەوەی عەرووزی تێدا پیر و گەندەڵ بێت و چرۆی تازە دەرکات و ببێتە ئەساسی شیعری نوێی کوردی. ئەوەی دیەوێ گۆڕانی شیعری کوردی بباتەوە بۆ گۆڕانی باری کۆمەڵایەتی و شارستانەتیی کوردستان ئەگا دەماری پێوەندیی ژوورخان بەژێرخانەوە بپچڕێ، دەبێ ئەوە بە یادی خۆیدا بهێنێتەوە کە وا کاتێك شیعری (گۆران) تەتەوری کرد و بەدوای ئەودا زۆربەی شاعیرەکانمان عەرووز و شێوە داڕشتن بۆچوونی میراتییان تەڵاق دا هێشتا لە هەموو کوردستانی عێراق سێ ناوچەی لیوا و یەك دوو ناوچەی قەزا کارەبای تێدا هەڵکرابوو و جاری کوردەواری یەك بست بەلای پیشەسازی و جوولەی هونەری و پەرەسەندنی خوێندەواری و تازەبوونەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و نازادیی نافرەت و ڕەهابوونی بیروڕا و ئەو جۆرە دیاردە ژیاریپانەوە نەچووبوو کە ئیتر ناشێ بڵێین گۆڕانی مێژوویی کورد هۆی گۆڕانی شیعری کوردی بوو. کە شیعری کوردی کیفی کۆنی خۆی، وەك ماری دەمو هاوینان، داڕنی جارێ زۆربەی کوردەواری لە بری (ژنەکەم) دەیگوت (خێزانم، ماڵەوە.. منداڵان..).

بەکورتی دەڵێم ئەوەی بووە بنەمای گۆڕانی شیعری کوردی دوو جشت بوو: یەکەمیان چاو لێکەریی شێوازی دەرەوەی کوردستان، بگرە هی ڕۆژهەڵاتیش. دووەمیان، کە هەر خۆی پەلەی بەهۆی یەکەم کرد، بڵاوبوونەوەی زۆر خێرای فکری نوێخوازی دوای شەڕی دووەم بوو بەهەموو دنیا نەك هەر بە کوردستاندا، کە یەکێك لە دامێنانەکانی نێو کورداتی ئەوە بوو وای لە نۆبەرەی ڕۆشنبیری ئەوسای کورد گەیاند گۆیا شکڵی عەرووزی لە شیعردا پاشماوەی سەردەمە پاشکەوتووەکانی

کۆنەپەرستییە هەروەك لە گەلێك مەیدانی دیکەی کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕدا شەڕی بێ ئامانەوە دژی ئەوەی پێی دەگوترا کۆنینە. ئەوەی زیاتریش لە نێو شاعیرە نەوباوەکانی کورددا وای کرد شیعری عەرووزی و شێوازی کۆن قرانی تێ بکەوێ پتر لەوەی لە نێوان فارس و عەرەبدا قرانی بێت هەژارییە بێ سنوورییەکەی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری و سەرلەبەری وجوودی مێژوویی کورد بوو کە ئەوەندە سامانەی بۆ کوردی دوای حەربی دووەم بەجێ نەهێشتبوو هێزی لەبەر شاڵاوی نوێخوازیی بێ سنوور بگرێت. ڕابردووی کورد ئەوەندە هەژار بوو نەیتوانی ڕوخساری حازری بپارێزێ لە ئاست ئەو ڕووڕژمەی کە فکری نوێخواز لە ژیاریی ئەورووپاوە بۆی هێنا، بەپێچەوانەی عەرەب و فارس کە لە بەرانبەر پاڵەپەستۆی فکری نوێخوازی پاش شەڕی دووەمدا سامانی فکری و مادیی میراتی ئەوتۆیان هەبوو زۆرانێ لەگەڵ هێزە هەڵتەکێنەکانیدا بگرێ و بارتەقای ڕاوەستێ. کوردەواری بەر لەوەی لە پلەی بەرەژوورچوونی مادیدا بگاتە میسری سەردەمی محەمەد علی پاشا، هەر لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە وازی لەو شێواز و داڕشتنە هێنا کە ئێستاکەش لە قاهیرەی ۱۹۸۰دا هەر باوە لە پاشماوەی گەشەکردنەکەی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، کە درێژەکێشانی ڕسکانە کوتوپڕە سەرکەوتووەکەی ئەدەبی نالی و شاعیرەکانی دیکەی کوردی سەدەی نۆزدەم بوو. چەند شاعیرێك بە تەمەنی کامڵیانەوە لێرە و لەوێ – بە زۆریش لە سلێمانی –، لەگەڵ شێوازی کۆن و شێوەی عەرووزیدا بەسەریان برد تاکو چرای عومریان کوژایەوە ئیتر جیلی دوای، هەروەك لە بیرکردنەوەی ڕامیاریدا پێوەندییان بە کۆنەوە نەما لە شێواز و ناوەرۆکی شیعریشدا بە تەواوی لێی دابڕان تا ئەو ڕادەیەی کە ڕاستە بگوترێ دەماری ئەسەبیان بە ڕابردووەوە هەڵبڕییەوە. وەك دەزانین ئەم لە قەیێلك هاتنەدەر و داڕنینی کیفی کۆن کە ڕۆشنبیری کوردی دوای شەڕی دووەم کردی کێشایەوە سەر دوژمنایەتیی (تراث) و بەپێنێکیش دەوامی کرد. بەڵام پاش ئەوەی کە گەشبینی و بەڵێنە هۆشکەڵەکانی فکری نوێخوازی کورد لەسەر تەختە بەردی ڕەق و تەقی هەژاری و نەداریی کورد ورد و خاش بوون (تراث) ئرخێکی پەیدا کردەوە، چونکە وردە وردە بەدەم تەجرەبەی تاڵەوە زانرا کە جێی لێرە بە پێشەوە و لەوان بە پێشترەوە ئەو گوناهبارە نین کە خەیاڵە شلکە سافیلکە بێ تەجرەبەکەی گەنجە نوێخوازەکان لێیان بەهەڵەدا چووبوو. تاوانی دواکەوتنی کوردیش ناچێتەوە ئەستۆی (تراث) و (ڕۆشنبیر)ی کلاسیکیی کورد، مەگەر بایی

ئەوەی حاڵ و باری نالەباری کوردی سەردەمی ئەو گەنجانە بچێتە ئەستۆی گەنجەکانەوە، واتە تێشکان و نەمانتنەدیی هەڵێتنەکانی باوەڕی نوێخوازیی کوردی دوای شەڕی دووەم پێیەیێ بوو بەپاکانە بۆ ڕابردووی کورد چونکە بە هەست و بە دەستیش زانییان ڕەهابوون و بەناواتگەیشتن بۆ میللەتی هەژار و بێ هێز ئەو دەست هەڵێنجە نییە کە لە ڕابەرێنەکەی (وتبە)وە گەنجە نوێخوازەکان لێی بەپەلە بوون. ئێستای بینینی ڕۆشنبیری کورد، وەك مزاش، خورمەتگرتنی کەلەپوور و بەردەوامبوونە لەسەر شێواز و نیازی نوێ.

لەبەر تیشکی ئەم ڕوونکردنەوەیەدا، کە من بە ڕاستی دەزانم، مەعلووم دەبێ شێوازی نوێی عەرووزنەویستیی شیعری کوردی لەسەر بنجی مێژوویی خۆی تەمای نەکردووە، بەرەسەندنیشی هی پێداویستی سەردەمی کوردی نییە بایی ئەوەی کە وەچەی لێك مارەبڕانی هەزاریی مێژوو کردی کورد و ڕووژمی سەقافەتی ڕۆژئاوایە، ئینجا کە شاعیرێکی کورد دێت و لە نێو لووزەوە جوداجوداکانی فکر و شێواز و بۆچوون و ڕواڵەت و گەشکەگرتن و بە تێکڕایی (ناوەرۆك و ڕوخسار)ی سەردەمدا تەکان دەدات و مۆدێل دەگۆڕێت و ڕاوی واتای ڕەکردوو دەکات و تەمومژ لە خۆی دەئاڵێنێ بۆ ئەوەی، بە لای خۆیەوە لە کاروانی بزووتنەوەی ئەدەبیی جیهانی دانەبڕێ دەبێتە مامڵەتکەری مەڵبەندێکی (شیعرکردی حەواڵکردی لاسایکرد)ی ئەوتۆ ئەگەر لە کوردستانی هەڵکەنێت و بیبەیتە (تەمومژستان) خۆی لە دەوروبەرێکی زۆر ناناشنادا نابینێتەوە چونکە لەوێشدا هەمان مامڵەت و کار و بازاڕ لە گەڕدایە.

تەمومژ و نامۆیی بەبەریەوە هەیە تارمایی مێوان بە هی خانەخۆی بناسرێت...

بەیان، ژمارە ۱۹۸۰

# تاوانی دیاردە چاوغەڵەتێنەکان

ئەم جیهانە بێ سەروبنە، بێ سنوور و کۆتاییە کەس تێ بڕنەکردووەی وا لەبەر چاو و هەست و هۆشماندا، بەرواڵەت، هێندە کراوەیە هەر دەڵێی بانگەوازی ئاشکرایی و دەروون شکافیی خۆی بەبەر گوێی بیسەردا بەرز هەڵدەبڕێ، کە لێی ورد دەبیتەوە دەبینیت دەوراندەورتی تەنیوەتەوە بەتەڵەی فیکر و تەپکەی هۆشی ئەوتۆ کە هەر یەکێکی لەوانەیە بەترووکە چاوێک خلیسک بەنیگات ببات بۆ ناو زیندانە داخراوەکانی.

من لێرەدا نامەوێ ڕێی کورت درێژ بکەمەوە بۆ باسە دوورەدەست و پەنامەکی و وردەکانی فەلسەفە و میتافیزیک و ماتماتیک و .. تیک .. و تیک و هەزار و یەک تیک و .. ئیزم (ism)ی زانا و پسپۆڕ بەندیار و ڕابەرە وردبین و تەنگدابڕ و هێماساز و زلرقەڵەمباڵغی زانستە بەدەرگە و دۆلابەکان و هونەرە لوولخواردووەکان و فێڵ و فرە خۆ-داپێچاوەکان، کە لەواندا تەپکەی فیکر بۆ زاناکان نراوەتەوە نەک بۆ زۆربەی خەڵق چونکە زۆربەی خەڵق هەستیان پێ ناکەن تا تێیان بکەون مەگەر لە ڕێگەی بەدەڵەچوون و سەر لێشێواوی زاناکان لەو تەپکانەدا ساکارەکانیش بەدوا ئەواندا پاندی تەپکەکان ببن وەک کە قوتابی لە شێوەی تووتی قسەی مامۆستاکانی دەڵێتەوە دیارە زۆربەی خەڵقیش لە تەک ئەو زانایانەدا وەک قوتابی و بەرەژێرتریشن. ئنجا بۆیە لێرەدا تەنها دەست بۆ تەپکەی ئاشکرا دەبەم کە هەموو چاوێک دەیبینێت و پێیەوە دەبێت، ئاوناوەیەک نەبێ، کە بەپێی داخوازی، سەرکێڵێکی هەندێ تەپکەی نابەرچاو دەکەم. بەڵام لە پێشەوە دڵخۆشکەرییەکی مرۆڤی ساکار دەدەمەوە [کە خۆم یەکێکیانم] بەوەدا بەشێکی تەپکە بەرچاوەکان لە کۆنەوە ڕابەرەکانیش وەک ئێمە لێی بەسەهوو دەچوون و تێی دەکەوتن و لێکدانەوەی زانستییانەی ئەوسایان لێ هەڵدێنجا، واتە شەرمی تێوەگلانی سافیلکانە باییی نوشتوویەکی بەهێز بەسەر شانی ئەوانیشدا دەدووڕا، هەر لەم نووسینەشدا ئەم لایەنەت بە بەرچاوڕا تێ دەپەڕێ.

مرۆڤ یەکەم تێوە ڕامانی هۆشدارانەی بەرەو شتێکی ڕوون و ئاشکرا و بەرز و پان و خاوێن بووە کە ئەگەر لە ئاستیدا بەسەهوو چووبێت بەزۆر لەسەری کەوتبێت ئەویش (ئاسمان)ە بەخۆی و بەرزی و جوانی و ڕەنگینی و مانگ و ئەستێرە و هەور و برووسکە

و کاکێشان و ... و ... بەوە، هەر لە یەکەم نیگاشیەوە لێی بەسەهوو چوو کە وای زانی شینە [چونکە شین نییە] کە وای زانی گومبەتە [ . گومبەت نییە]، کە وای زانی سەرقاپە بەسەر زەویدا نخوون بۆتەوە [نە سەرقاپە و نە نخوون بۆتەوە] کە وای زانی بگێڕی بوونەوەرە گشتە ئاسمانییەکانە [نە بگێڕە و نە هیچ...]، دواتریش کە فەلەکناسەکان بەوردبوونەوە لە بزووتنەوەی ئەو بوونەوەرە ئاسمانییانە حەوت هەشت فەلەکی تەبەق لەسەر تەبەقی بۆ تیك و دەرزیان کردە هەڵسووڕێنی چەرخ و دۆلابی هەموو جیهان، خۆیان و زانستی زێدە گرنگی فەلەکیان لەو بەرزاییەوە بردە ناو زیندانێکی فیکری وەها کە دوو هەزار ساڵێکی پێ چوو تاکو لە سەردەمی کۆپەرنیکۆس و گالیلیۆ بەر لە ٤٠٠ ساڵێك دوای ترس و لەرز و قوربانی و زەمانەبڕین و کافرکردن و سووتاندنی چەندین بێ خەتایان تەبەقەکان پچڕانەوە و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە وەستاوەکان و گەڕۆکەکان لە کاروانی شەوانە و ڕۆژانەی ئەزەلی ڕەها کران و هەریەکەیان بەپێی تێپڕکردنی هۆشی فەلەکناسەکانی ئەو سەردەمە بەشێکەی حەسانەوەیان بۆ ساز درا، مانگ و ئەستێرە گەڕۆکەکانیش مانەوە لەسەر تاکە بزووتنەوەی تایبەتی خۆیان کە پەیوەندیی بەهەڵاتن و ئاوابوونەوە نییە. ئنجا کە ئەمە کرا یەکسەر و بەناچاری (مامە زەوی) کە تاکو ئەو کاتە لە مەرکەزی جیهان پاڵی لێ دابۆوە خرایە گەڕ و کرایە بەرپرسیاری ئەو چاوبەستەکییە زلەی کە بزووتن و گەڕان و سووڕانی ئاسمان و بوونەوەرە پرشنگدارەکانی لە هۆشی مرۆڤیان دەکرد چونکە دەرکەوت (زەوی) خۆی بوو دەسووڕا و دەبزووت و ئاسمانی لە بەرچاوی سافیلکە و پەسپۆڕاندا دەکردە چەرخوفەلەك.

تۆ ئەگەر بیر بکەیتەوە لە چاوبەستەکێکە تا هەڵوەشانەوەی، کە هێشتاکەش پاییی سەردێڕێکی لێ ماوەتەوە، ئنجا بگەڕێیت بەدوا ئەو کارە زێدە گرنگ و بەئەرك و ژان و ژوارەی کە کردۆتییە سەر ژیین و باوەڕ و ئایین و زانست و هونەر و ئەفسانە و ... و .. بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ سەیرت لەوە دێتەوە کە چۆن مێشك و دڵ و دەروون و ناخی هەست و ئەستی مرۆڤ هەر لە ڕسکانییەوە مەحکووم بووە بەو دیمەنە بێ ڕەزایە چاوغەڵەتێنە هۆش حەپەسێنە گیان ورووژێنەی پاك و ڕوون و بەرز و هیچ و پووچەش. وەهای تێ ئەگەی تەپکەی (ئاسمان)ە شینی پان هەروا بەسێنایی و بێ سەروسەمەرە و کاریگەریی هۆشی مرۆڤی لە خۆیدا حەشار دا تا ئەو ڕۆژگارەی کە بەرمووێنی چوونی زانست قێڵەکەی بۆ دۆزییەوە ئەویش وەك دیلی حوکم تەواوکردوو

لێی دەرچوو. لە تاو و کاریگەریی دیمەنی ئاسمان بۆ ناو دڵ و دەروونی ئادەمیزاد ئەوەندە بەسە کە بەشی هەرە گەورە و پیرۆزی ئەوەی پێی دەڵێین (ژوورخان-بناء فوقي)ی کۆنینەی ئادەمیزاد ڕاستەوخۆ و بێ مامۆستا و یەکسەر لەو شێنە پانەوە بۆی شۆڕ بۆتەوە، تەنانەت بۆ ماوەی دوور و درێژی هەزاران ساڵ بە (خوا) ناسراوە وەیا هەر نەبێ هێندەی خوا هێز و پیرۆزیی پێ بەخشراوە، زۆریش لەو خوایانەی گەلان پەرستوویانن بەچکەی ئەو ئاسمانە بوون. گوێ بگرە لە وتوویێژی دیندار و پەندیار و شاعیر و قسەکەر و ڕیش سپی و حیکایەتخوانی گەلانی هەزاران ساڵ لەمەوبەر لێیان دەبیەیت کە چارەنووسی مرۆڤ لە تەگبیری ئەو شێنە پانەیە نەک لە گەنم و جۆ و بەرخ و گیسکێکی پێی دەژیت، بەرخ و گەنمەکەشی مەحکوومی ئەو بڕیارەیە کە ئاسمان و هێزە نهێنییەکانی پێی ڕەوا دیتوون تەنانەت گیسکی بۆ هەزاران سەرنەبڕیوە ئەگەر بەنیازی ڕازیکردنی ئاسمان نەبووبێت. چەند سەیرە بەزەیی مرۆڤ بۆ ئاسمان بەرز بێتەوە ئنجا لەوێوە بەسەر برسی و لێقەوماودا نشێو بێتەوە پیاوەتییەکەش بۆ ئاسمان حیساب بکرێت ئەم (قدرية-Fatalism)ەش تا بەرەو چینی هەژار و زەحمەتکێش و نەخوێندوو دەبووبەوە پتر ئەستوور و خەست دەبوو تا ئەوەی قسەیەکی مەیلەو ئازادی باباپەکی مێشک کراوە لای ئەو کەڕەوارانە بەکفر لە قەڵەم دەدرا نێستاش پاشماوەی ئەم حاڵە هەر بەرچاوە.

بەدوادا گەڕانی هەزاران هەزار ئایدیۆلۆجیا و باوەڕ و ئەرکی مادی و پاداشتی مەعنەوی و پەلەفرەی گیان و شاگەشکەبوونی دڵ و شەڕ و ئاشتی و جموجووڵ و جانفیدایی .. و .. و .. کە ئاسمان بەسەر مرۆڤیدا بڕیوە بۆ لێکدانەوەی خوێنەر بەجێ دەهێڵم چونکە کارێک نییە من وەیا یەکێکی دیکە بەنووسین و بەناخاوتن لێی بەکۆتایی بگات. ئاسمان گەورەترین و کۆنترین و وردترین و قووڵترین فێڵی لە هۆشی سافیلکان کردووە، هەزاران هەزار دنیاپەرستیش بەناو ئەو فێڵەدا بۆ ئومێد و ترسی ئەو سافیلکانە چووە و بۆ خۆی داپڕیوون، پیاوی ئاینیی فیکرڕووتیش بەشێکی هەوڵ و تەقەلای بۆ ڕەسواکردنی ئەو تەرزە تەڵەکەبازییە بووە بەڵام چی بۆ کراوە؟ ئەگەر خوێنەر لێشم ئاسەلمێنێ، کوردی گوتەنی، ئەمە گەز و ئەمەش ڕابردووی مرۆڤ بڕۆ بیپێوە.

مرۆڤ کە نیگای لە ئاسمان بەربووە سەر زەوی، دیسانەوە دەکەوێتە ناو ئەپکەهای بەگرێوگاڵ و بەپێنەوپەرە کە دەبینێ زەوی وەک ئەستوورکی ئانەوا لە بەردەست و دەمیدا

بەهەموو لایەکدا پان بوونەوە و بەپەراوێزی ئاسمانەوە نووساوە بێ تەقەڵ و بێ تیک. لەم ڕوانگەیەوە بۆ ئەوە چوو کە ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان هەر جارە لە زەوییەوە دەردێن و بەچەرخوفەلەکی ئاسماندا لە ئەنجامی گەشتێکی نێو ئاڵقەیدا دەچنەوە ناو هەناوی ڕۆژئاوای زەوی و دەحەسێنەوە بۆ گەشتێکی نوێی سەرلەبەیانی. هەندێک لەو کەسانەی شەیدای جەبەرووتی هێزی پەنامەکین، تا ئەو ڕادەیەی بەفەسەکانیاندا دەسەلاتیشی بۆ دەخوازنەوە، وەهایان لایەقی دەسەڵاتی ئەزەلی دێت بڵێن لە سەرەتای هەر بەیانییەکدا ڕۆژێکی تازە دروست دەکرێت و لە کۆنە چەرخوفەلەکە تێ دەنیشێت. هەر ئەم قسەیە سەرەڕای خۆشکەڵەیی، پتریش لەگەڵ قودسیەتی ئاسمان و ڕووناکایی و بەرزایی دەگونجێت لەوەی هەر شەوە ڕۆژی نوورانی بچێتە ناو باخەڵی خاکی ساردوسڕ و بەتەپوتۆز و تاریک، خۆ ئەگەر بشێ لە کاتی ڕۆژگیران و مانگگیراندا بەتەنەکە لێدان حووتە قووتەرەکە بترسێت و بەقیان بکاتەوە، ئەو هەموو تەبەق لەسەر تەبەقی خاک و بەردەی کە بەشەو و ڕۆژەکەی تێدا حەشار دەدرێ لەوانە نییە ڕێ بەهیچ گرمە و لرمەیەک بدا بەرەو تاریکستان و غەیبستانی هەناویەوە بڕوات، ئنجا حووتیش لەوێدا نییە بترسێ یا نەترسێ چونکە سەرلەبەری ئەستووکی زەوی، وەک گوتمان، کورسیی ئەعنای ڕۆژی قووت داوە ئیتر چی لەگەڵدا دەکرێ ئەگەر هات و ڕۆژەکەی نەدایەوە! وا چاکە بەخشندەیی غەیب هەموو سبەینەیەک ڕۆژێکی تازە بەمەخلووقات ببەخشێت وەک بەدرێژایی ئەزەل و ئەبەر ژیان و بوونی بەخشیوە و دەیبەخشێت هەرچەند لە دەمێکیشەوە زاناکانی فەلەک بەعەقڵیان ڕاگەیاندبوو زەوی خڕە و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە لە بەرچاوان ئاوابوی ئاسۆی ڕۆژئاوا دەبنەوە و قووت نادرێن بەڵکو لە وڵاتێکی دیکە هەڵدێنەوە تا سووڕی تەواو بەدەوری زەویدا دەکەن و لە ئاسۆی ڕۆژهەڵاتەوە سبەینان قوت دەبنەوە لەگەڵ ئەمەشدا لە چەند فەلەکناس و سوختەی زیرەک بەولاوە کەسی سافیلکە بەدوا ئەو تەرزە قسە بەرمواژانە نەکەوت، تەنانەت مەلاکانی خۆمان کە فەلەکی کۆنیان بەدەرس دەخوێند و دەگوتەوە تەواوێک لە دەست حیکایەتی (ئەرز لەسەر پشتی گایە .. ) بەتەنگ دەهاتن و لە موناسەبەی دینیی عادەتییدا ناچار بوون وەک خەڵکی دیکە پێشیدا دەهاتنەوە و وتوویژی فەلەکناسانەیان هەر لە ئاڵقەی خۆیاندا دەکرد چونکە چی ئەوان لە زانستی فەلەک باسیان دەکرد شتێک نەبوو بچێتە فامی نەخوێندەوارانەوە حاڵ گەیشتە ڕادەیەک مەلایەکی مەغریبی دانی بەکافربوونی (شیخ محمد عبده)دا داهێنا لەبەر ئەو جۆرە

ڕایانەی کە یەکێکیان بزووتن و خڕبوونی زەوی بوو. بەهەمەحاڵ ئەم شێوە پان و ئەستوورکییەی زەوی بوو وای کرد هەندێ بابای پێتۆڵ چیای قاف بەرۆژهاوڕۆژی ئەستوورکەکەدا هەڵبێ ئەوەك کەس سەرمەتاتکە لە لێوارییەوە بکات وەیا بگاتە پێکدا دووڕانی ئاسمان و زەوی و دەست لە کاری ناڕەوا بدات، دێو و عیفریتی پشت چیای قافیش هەر بەرهەمی لایەلایی تەختبوونی ڕووی زەوی بوو چونکە زۆر حەیفە ئەو مەڵبەندە کەس نەیبێتووەی پشت چیای قاف بە بەتاڵی بمێنێتەوە لە کیس خولیای ئاشقەدیز و جنۆکەپەرست بچێت. سەیر لەوەدایە [ڕەنگە سەیریشی تێدا نەبێ] کە مێشکی مرۆڤ ئەفسانەی هەڵمەت و زاخاوەکەی بەخۆیەوە گرت بارتەقای ئەفسانەدۆستیی شەڕ لەگەڵ ڕاستیدا دەکات و بەگژ بیری ڕووناك و پاکدا دێتەوە، تەنانەت کە داهێنانە نوێیەکانی وەك تەلەفۆن و گرامەفۆن و فڕۆك هاتن و سەری ڕێیان بەهۆشی مرۆڤ گرت و تەنگیان بەئەفسانە بابلییەکان هەڵچنی پاسەوانەکانی ئەفسانە بەکاری شەیتانیان دانان و لە خەڵقیان حەرام دەکردن، دواتر نەختێك بەشەرم و تەوازووعەوە دەیانگوت ئەمانە هەموویان (گاورکار)ن و عەقیدە تێك دەدەن، تا ئێستاش مرۆڤی وەها هەیە لە پەروشی بێ فێڵەوە دەسکێك بەڵگە بهێنێتەوە بۆ درۆزنبوونی چوونە ناو مانگ. تاکو جارێکیان یەکێك لەوانەم گوت ئەدی ئەگەر پەلیان گرتیت و لە ناو کەشتییەکی ئاسمانگەڕیان داناپیت و لەسەر مانگ دایانبەزاندیت؟ گوتی ئەو دەمەش تەئویلێکی بۆ دەبینمەوە لە ئاسیاوی خۆم کەسی وەهام دیتووە، تۆش دیتوتە کە شەوان کەشتیی ئاسمانگەڕ وەك ئەستێرە بەناو ئەستێراندا دەگەڕا دەیگوت کوڕینە تەماشای مەکەن! بۆ خۆشی چاوی دەبڕییە زەوی .. ئەویش و زۆری دیکەش شادی دای دەگرتن کە گەشتێکی ئاسمانی تێك دەچوو وەیا ئاسمانەوانێك تێ دەچوو، لەمەشدا هەر هێندەی ساوای نەخام گلەییان دەچێتەوە سەر.

ئەرکیی زەوی سەرلەنوێ فێڵێکی گەورەی لە زانا کۆنەکان کرد کەوا پەروالەتی هەڵخەڵەتان و وایان زانی زەوی لە چوار ماکە مەشوورەکەی (ئاو، ئاگر، خاك، هەوا) پێك هاتووە کەچی ئێستا دەزانین هەر چواریان مادەی ئاوێتەی هەرە گرنگی زەوین.

دۆزینەوەی ئەو چوار ماکەش بەرهەمی بیرکردنەوە و لێکدانەوەی زاناکان بوو نەك هەڵبەی مەیلی ئەفسانە وەیا ڕوانینی سافیلکە. ئەفسانەپەرست و سافیلکە بەعادەت بەرانبەر دیمەنی نامەفهوومی سرووشت یا هەر دەحەپەسێ و یەکسەر بۆ غەیبی دەباتەوە، یا لە ئاستیدا بێ باك و بێ وردبوونەوە دەبێت، بەتایبەتی ئەو شتانەی

هەمیشە دەیانبینێت، تا ئەو دەمەی کە خەریکبوونی بەژیان و گوزەرانەوە لە شتانی هەڵدەنەنگوێنێت ئیتر حیسابێکیان بۆ دەکات.

سافیلکە دەزانێ ئاو لە خۆڵ سووکترە، هەست بەهەواش دەکات، دیارە ئاگریشی دیتووە بەلام ئەو لێکدانەوە مەیلەو وردە ناکات کە هەرچی لەسەر زەوی بەرچاو و بەرهەستە یەکێکە لەو چوار شتە، بۆ ئەم مامڵەتە نیمچە (تجریدی)یە لەگەڵ سروشتدا گوێ لە مامۆستاکەی دەگرێ، هەتا ڕاگەیاندنەکانی مامۆستاکەشی سادەتر بێ لێی خۆشتر دێت. دنیا بێ وردکردنەوە مەخلوقی خوا بێ خۆشترە لەوەی ئاو و ئاگر و خاك و هەوا بێ، چواریش بێ لە ئەوەند خۆشترە تۆ لە سافیلکە بگەڕێ، ڕابەرە مرۆڤدەرەکانی ئەو چوار ماکە چەندین حیسابی زانستیان لەسەر جیهانی (چوارماکی) هەڵستاندووە، تەنانەت میزاجی مرۆڤیان بەپێی نزیکبوونی لە خاسیەتی هەر کامێك لەو چوارە بەچوار جۆر دابەش کردووە دەرمانی نەخۆشیشیان بەپێی میزاجی نەخۆشەکە ساز داوە.

دایاردەیەکی هەمیشەیی دیکەی زەوی هەیە هەموو چاوێك دەیبینێت و هەتا سەردەمی (نیووتن)یش بەداخراوی لە شێوەی تەپکەی فیکر مایەوە فێڵی گەورەشی لێ کردین. هەرچی قورسایی هەیە بەرەو نزمایی دەبێتەوە ئەم دیاردە بەڕواڵەت بەدیهی و سەرەتاییە وای لە نیگای زانا و نەزان کرد بۆ ئەوە بچێ کە (ژووروو) هەتا سەرووی هەرە سەرەوە هەر بەرز بێت و (خواروو)ش هەتا تەختی بنی دنیا هەر نزم بێت. ئنجا کە ئەمەی لێ بوو بەباوەڕی بنچی، بەڵگەی هەرە گەورەی تەخت و ڕاستبوونی ڕووی زەوی لێ داتاشی بەو گوتەیەی کە ئەگەر زەوی خڕ بێ لە پێشەوە هەرچی ئاو هەیە دەڕژێتە بۆشایی ژێرەوەی زەوی، هەرچی شتی ڕەقیش هەیە لە تەنیشتەکان و دیوی بنەوەی زەوی ئەوانیش بەربدەبنەوە بۆ بۆشایی نزم. چ فەلاتێکە ئەو خراپییەی زەندیقەکان بەمل زەویدا دەبڕن! خڕی چی و ماشێنەی چی! (زاناکانی یۆنان و فەلەکناسەکانی فێرگەی بەتلەمیۆس لەو حیسابە بەدەرن). من سافیلکەی وەهام دیتوە کە دەگوترا زەوی بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە گورج قسەکەی بەدرۆ دەخستەوە بەوەدا کە ئەگەر خولابایەوە دەبوو سبەینان کە لە خەو هەڵدەستا سەری لە جێی پێی بێت و پێشی لە جێی سەری.

چاوبەستەکێی بوونەوەر، ئاوئاوە، بۆ ئێوە ڕامانی عادەتی بەلای سیحر و تەلەسمدا دەچێتەوە وەك کە کاتیاوەکان هاوینان ساردن و زستانانیش هێندەی حەمام

هەڵمیان لێ هەڵدەستێ و خەڵق خۆیانی تێدا دەشۆن. هەر لە پەنا ئەم تەڵەیەدا یەکێکی دیکە هەیە ئەویش بەلای ئێگای سادەوە چ تەفسیرێکی ژیربێژانەی نییە کە دەبینێ هەتا پیاو بەرەو بەرزایی سەرروی شاخەکان تێ هەڵکشێت ساردترە هەرچەند لە ڕۆژیش نێزیکتر دەبێتەوە. ئەم دیاردەیە وای کرد بەر لە چەند سەد ساڵێك (ابن خلدون) بڵێ گەرمایی ڕۆژ دوای گەیشتنی تیشکەکەی بۆ سەر زەوی و عەکسبوونەوەی ئنجا پەیدا دەبێ. بەڕاستی ئەو جۆرە دیاردانە کە لە ڕواڵەتدا دژی بەدیهییەن و بەر هیچ سادە حیسابێکی مەفهووم ناکەون وەك پلانگێڕی بەنانقەست سەرپۆشی پەنامەکیەتی بەسەر هەڵکەوت و بوونەوەردا دادەنەوە. هیچ گۆشەیەکی پەردەکەش دیار نییە پەنجەی هۆشتی لێ گیر بکەیت و هەڵی بدەیتەوە. ئاخر ئەگەر کاری جنۆکە و مێردەزمە نەبێ چۆن زستانان هەڵم لە کانیاوی سارد هەڵدەستێ؟ نزیکبوونەوە لە ڕۆژ ساردایی پەیدا دەکات؟ ئاگر لە ناوی باران بەر دەبێ؟ ئەم پرسیارانە و سەدانی وەك ئەوان بۆ مرۆڤی نەخوێندووی بەر لە هەزار ساڵ و دوو هەزار ساڵ برای سیحر و جادووکاری بوون و خورجینەی ئەفسانەی میراتییان دەناخنی و ڕێیان بەمرۆڤی فێڵباز دەدا بەناو تاریکاییی هەر یەکێك لەو پرسیارانەدا بۆ دەروون و گیرفانی سافیلکان خشکە بکات.

دیمەن و دیاردەی دیکە زۆرن کە لە هیچ کەلێنێکەوە هۆش و گۆشی مرۆڤی نەخوێندوو تیی بڕ ناکات و بەرانبەری دەحەپەسێ. لەمانە دوو دیاردە زۆر سەیر و نامەفهوومەکەی برووسکە و پەلکەزێڕینەن. ئەگەر لە غەیبەوە هۆیەکی ڕق بزوێن بۆ بروسکە و یەکێکی ئەشپلانە بۆ پەلکەزێڕینە پەیدا نەکرێ ئەو خەڵقە سافیلکە و سادەیە دەبێ هەر دەمەبەشکەی سەرسووڕمانی پێوە بێت. خوێندەواریش لە کۆنی کۆنەوە هۆی ڕاستینەی ئەم دوو دیاردەیەی نەدەزانی، ڕەنگە تا ئێستاکەش بەشەراوی ڕوون نەبووبێتەوە بۆچی هەوری فشەڵۆك دەتوانێ بروسکەی ٢٠ کیلۆمەتری بەرپا بکات کەچی گەورەترین ڕشتەی کارەباسازی ناتوانێ لە چەند مەترێك دوورتر کارەبا بەهەوادا ڕاگوێزێ، واتە بروسکەی مرۆڤکرد هەزاریەکی بروسکەی سروشتکرد دەرناچێ؟ لەمەش بگەڕێ، ئەدی چۆن ئاك گەواڵەیەك هەور هەر دەڕوات و بەدرێژایی هەزار کیلۆمەتر لێشاوکەی وێرانکەر هەڵدەڕێژێ خۆ ئەگەر هەموو هەورەکە هەڵگوشێت سەدیەکی ئەو ئاوەی لێ پەیدا نابێ؟ لە وەرامی ئەم لایەنە کە جارێ نازانین چییە، بیر لەو دەریایە بکەوە کە لە کۆنەوە خەڵقی نەخوێندەوار وایان دەزانی

بەئاسمانەوەیە و لەسەر شتێکی وەك بێژنگ ڕاوەستاوە کە کونەکانی کرانەوە دڵۆپەکان هەڵدەڕژێن! ئەم خەیاڵەیان دەکرد هەرچەند لە عەقیدەشیاندا، کە قورئانە، باسی باران بەڕوونی کراوە نە بەحر و نە بێژنگیشی تێدایە. پەلکەزێڕینە لە بارانیش سەرنجڕاکێشتر و سەرسوڕێنترە. من تا ئێستاش لە بارەیەوە هەر ئەوەندەم خوێندۆتەوە و خوێندووە کە دڵۆپی باران شێوەی (منشور) ڕەنگەکانی تیشکی ڕۆژ دەشکێنێتەوە لەوە بەولاوە ج تەفسیرێکم بەدەستەوە نییە لەوەدا کە چۆن ڕەنگەکان وەها پان دەبن کە لە دوورەوە بدیترێن چونکە ئەو تەفسیرەی من خوێندوومە هەر ئەوەندەم تێ دەگەیەنێ کە ڕەنگەکانی تاکە یەك زنجیرەی دڵۆپە باران بەر بیلبیلەی چاوم دەکەون، ئەو ڕەنگی لە زنجیرەی سەرووتر وەیا خوارووتر دەشکێتەوە لە بیلبیلەی چاو بەرەژوورتر وەیا بەرەژێرتر دەوەستێ. خۆ ئەگەر وا دابنێین هەر ڕەنگە لە ڕیزە دڵۆپێکەوە عەکس دەبێتەوە ئەوساش حەوت زنجیرەی دڵۆپە باران بەسەریەکەوە هەر هێندەی هەتێکی باریك خۆ دەنوێنن، وەهاش لە یەکدی نزیك دەبن کە سەرلەنوێ تێکەڵ بەیەکدی ببنەوە و بگەڕێنەوە بۆ شکڵی تیشکی ڕۆژ، کەچی وەها دەبێ، ناوناوە، پەڵە هەورێك لە دوورایی پازدە کیلۆمەترەوە هەمووی دەبێتە پەلکەزێڕینە. ئینجا ناشزانم بۆچی بەزۆری دوو پەلکەزێڕینە هەڵدێن. یەکێ زۆر گەش لە ژێرەوە یەکێکی کزیش لە سەرەوەتر! هەڵبەت ئەم پرسیارانەم ناکەن بەئەفسانەپەرست چونکە سەرپێچیم لە ئەسڵی تەفسیرەکە نییە کە دەڵێ مەنشوورەکانی دڵۆپە باران ڕەنگەکانی تیشکی ڕۆژ دەدەنەوە، من هەر ئەوەندە دەڵێم کە تەفسیرەکە جارێ، باییی هەموو دیاردەکە ناکات. هەرچی ئەفسانەپەرستە لە پێشەوە پەنا بۆ دێو و پەری و قەمچیی فلانە پاڵەوان و کەزیی فلانە فریشتە دەبات. ئەو قسانەشم لەلای خۆمەوە ترنجاندە ناو نووسینەکەم بۆ ئەوەی باشتر دەرکەوێ کە چەند زەحمەتە مرۆڤ لە ڕێی خوێندنیشەوە بەڕاستییە بنجیبەکانی دیاردەی سروشت بگات، ئینجا دەبێ حاڵی مام باپیری گوندی (دەوژان)ی بەر لە (٥٠٠) ساڵ چی بووبێت! ئەوەی ڕاستیش بێ زۆری خوێندەوارەکانی ئەم سەردەمەش لەلایەن تەسلیمبوون بەوەی پێی دەڵێن تەفسیری عیلمی هێندەی ئەو مام باپیرە خۆش جڵەون هەر بۆیەیشە لە ئاست گۆڕانی هیچ تەفسیرێکی عیلمی ناکەونە ڕەخنەکارییەوە و بڵێن چۆن دەشێ کە فلانە شت تا دوێنێ بەڕاست دادەندرا ئێستا دەرکەوێ هەڵەی ڕووت بێ؟ بەهەمەحاڵ بادەمەوە سەر ڕچەی نووسینەکە.

وەرزێری ولاتی کوردەواری لە تەجرەبەی خۆیدا هەستی بەوە کردووە کە بای

شەماڵ هەرچەند لە لەشی مرۆڤ خۆش دێت نەخۆشیی شیناوردی وەك شۆکە و دژی پێوەیە، ڕەشەباش، بەپێچەوانەوە، لە لەش ناخۆش دێت بەڵام نەخۆشیی شیناوردی پێوە نییە بگرە نەخۆشیش دەبەرێنێ. ئەم دیاردەیە لە هیچ ڕۆشنە و کەلەبەرێکەوە تەفسیر بەدەست وەرزێری سادەی بێ سەوادەوە نادات، ئەویش ناچار هانای بردە بەر ئەرشیفی بیروباوەڕی میراتی و گوتی هەرچی ڕەشەبایە بای بەهەشتە بەسەر جەهەنەمدا تێ دەپەڕێ، شەماڵیش بای جەهەنەمە بەسەر بەهەشتدا دێت. سەیر لەوەدایە کە هێشتا ئەم بۆچوونە لێکدانەوەیە [تفسیر، تعلیل] خارپنترە لەوەی نەفەسی ئەژدەها و ورشەی باڵی پەری وەیا هاتوهاتی پشت چیای قاف تێکەڵ بەمەسەلەکە بکرێ چونکە هەر نەبێ بەهەشت و جەهەنەم لە ئاینی بێ فێڵ و بێ ئەتوێلدا هەن هەرچەند ج دەخلیشیان بەسەر شۆکە و دژوە نەبێ. خەلق فێڵێکی بچووکی دیکەش لە خۆیان دەکەن لەوەدا کە هەر جارە لە تکاو سەرمایەك دێت و دەبینن بەفر لە شاخان باریوە گورج دەڵێن سەرمایەکە هی بەفرەکە بوو کەچی، بەپێچەوانە بەفرەکە هی سەرمایەکەیە. کاتێك سەرما هی بەفر دەبێ کە بێین لە لاوە بەفر بهێنین و بەسەر شاخانیەوە بڵاو بکەینەوە و وڵاتی پێ فێنك بکەین. ئەم سەهووە بچووکە ئەگەر زەرەری نەبێ سوودیشی نییە بڕاستکردنەوەشی زەرەری تێدا نییە، جگە لەوە کە لەوە ڕاهاتنمان بەسەلماندنی سەهووی بچووك لە کاری گرنگیشدا بەلای بۆچوونکاریی چەوتماندا دەباتەوە وەیا هەر نەبێ فێری چاوپۆشی دەبین لە هەڵەی گەورەش. ئەوەی ڕاستیش بێ گەلێك باوەڕی چەوتی زێدە گرنگ و بەتەرك لە بنەڕەتدا لەسەر هەڵەیەکی فیکریی بچووك هەڵستاوە، وردە وردە تەنییوەتەوە و ڕەگی داکوتاوە، مرۆڤیش بەتێکڕایی زوو دەسخەڵەت دەدرێ تا ئەوەی مەشوورەکەی (عقلی لە چاویدایە)ی لێ بەڕاست دەگەڕێ لەو ڕووەوە کە ئەوەی چاو دەیبینێت بەڕواڵەت دیمەنی ڕاستەقینەی شتانە وەك کە پێست سەرپۆشی ڕاستەقینەی لەشە، هەر بۆیەشە بیاری فێڵباز هەمیشە بەجۆری سەرنجڕاکێش و لە باری ناناساییدا خۆی بەخەلق نیشان دەدات. بڕوا دەکەم ئەگەر ساحیری نێوان هیندییە سوورەکان خەتی سەوز و شین بەسەر ڕوویاندا نەکێشن کەس ئەوتۆیان بەدوا ناکەوێ، وەیا گەورەترین سەرکردەی شەڕ لە حەمامدا بێ تاج و ئەستێرە و قایش و قرووش کەس سڵی لێ ناکاتەوە

گومان لەوەدا نییە کە ئەم جیهانە هەزاران تەپکەی فیکریی ناوەتەوە نێتر سروشتکرد بێ وەیا مرۆڤکرد، لەوەتەی فیکری ڕوونیش خەباتی دەست پێ کردووە

هەر خەریکی ئاشکرا کردنی ئەو فرۆفێڵە بووە کە لەو تەپکانەوە دزەی بۆ ناو مێشك و دەروونی ئادەمی کردووە و نرخی قورسی لێ ستاندووە. زۆر جاران هۆکۆزیشی بێ کردووە.

بێ ئەوەی من بڵێم لە هۆوە دیارە ئەرکی ڕەواندنەوەی تاریکایی تەپلەی فیکر دەچێتە ئەستۆی ڕۆشنبیر چونکە ئەو وێڕای زێدە توانای تێگەیشتن و وردبوونەوە کە بەخوێندن پێی گەیشتووە هەر خۆیشی خۆی بەرابەر و چاوساغ و قوماندان داناوە. بەلای منەوە رابەرایەتی و پێشەوایەتیی ڕۆشنبیر لە مەیدانی فیکردا سێ مەرجی بنجیی گەورەی پێویە:

١- لەسەریەتی بەدرێژایی عومری ڕۆشنبیرایەتیی خۆی خەریکی وەدەستهێنان و پترکردنی زانیار (معرفە) بێت و شانبەشانی قافڵەی بەرەوپێشچووی فیکر و ئەدەب و هونەر و کۆمەڵایەتی هەنگاو هەڵێنێ تاکو هەمیشە چاوی بەهەموو لایەکدا بنۆڕێت و لە ڕەشکە و پەشکەی تێوە ڕاماتی تاکە قوژبن ڕەها بێت. لێرەدا دەبێ بڵێم پەرۆش بۆ بیروباوەڕی شەخسی داوا لە ڕۆشنبیری دەکا کە خۆی بەهەموو چەکێکی فیکری ئاراستە بکا نەك تاکە چەکی باوەڕی خۆی کەوا ڕەنگە هەر بەقەدەر کولە خەنجەرەکەی باوەڕی ناحەزەکەی بڕشتی هەبێ. زانست و هونەر و ئەدەب و تەکنیك لەم سەردەمەدا وەها خێرا بووە ئەگەر لێی لە لینگان نەکەیتە دەنگ تۆزیشی ناشکێنیت. کتێبێکی بێ ناوونیشانی ئەورووپا دەخوێنیتەوە سەرت سوڕ دەمێنێ لەو هەموو وردبینی و قووڵ دلگرتن و بەرفرەوانییەی کە لە باسێکی وەها، بەزاهیر، کەم بایەخدا بەکار هاتووە. من ناڵێم ڕۆشنبیر مەیدانە تایبەتییەکەی خۆی چۆڵ بکا بۆ گەشتی ناو مەیدانەکانی دیکە من دەڵێم وێڕای پسپۆڕبوون لە مەیدانی خۆیدا دەبێ ئاگاداری هاتوباتی مەیدانەکانی دیکەش بێ بەتایبەتی ئەوانەی لە هی خۆی نزیکن هەر نەبێ بەئەندازی ئەوەی خۆی پێیان دەوڵەمەندتر بکا و بشتوانێ لە کاتی پێویستدا لە چاوبەستەکێی حیلەگەری ئەو مەیدانانە ڕزگار بێ و ڕیشی خۆی تەسلیم بەغەیر نەکا. من لە تەجرەبەی خۆمدا شتی وەهام دیتووە دەهاوێتە سەر گومانکردن لە بڕیاری پسپۆڕان، بەنموونە لە تەلەفزیۆنی وڵاتێکی ئەورووپا دیتم کێبەرکێ لە نێوان گۆرانیی (١٨) دەوڵەتدا دەکرا، هەر گۆرانییەك لەلایەن تاقمە پسپۆڕی غەیری هاوەن گۆرانییەکەوە نومرەی دەدرایێ، بەزۆری وەها دەبوو گۆرانییەك لەلایەن پسپۆڕێکەوە (١٠٠)

نومرەی بۆ دادەندرا لە لای یەکێکی دیکەشەوە (٠)ی دەدرایێ. ئنجا کە حاڵی پسپۆڕ وەها بێ با بێین کوێر و کەڕ بکەینە حەکەم وەیا تیروپشکێ و خەتوشێرانێ بەکار بهێنین هۆ هەتا سەعوو بکرێ لە نێوان (سعد و سفر) تێیمەڕ ناکات.

ئەم مەرجەیان لە مەیدانی فیکر [ئەدەب، هونەر، فەلسەفە .. ] بەسەنگە مەیدانی زانست و تەکنیک مەگەر فەلسەفەیان لەسەر هەڵنرێ ئەهۆ ڕۆشنبیری فیکر هاتوچۆیان تێدا ناکات.

٢- پێویستە ڕۆشنبیر ئەوە بەچاوی خۆیەوە بگرێ کە مومکینە خۆیشی وەک خەڵقی دیکە بەتەپکەی فیکرەوە بوو بێت. بۆیە لەسەریەتی هەمیشە بەبینین و باوەڕ و هەڵوەستی خۆیدا بچێتەوە و تاقییان بکاتەوە نەوەک بەدزییەوە هەڵەیان تێ خزابێت. ئێمە دەبێ بزانین، مرۆڤ بەعادەت لەگەڵ قەناعەت و بیروڕای خۆیدا دەگونجێت و پێی دەحەسێتەوە. هەرکە لێشی بەگومان کەوت، کوردی گوتەنی، کێچ دەکەوێتە کەوڵییەوە. هەر ئەو حەسانەوەی گونجان لەگەڵ قەناعەتە وای کردووە باوەڕی پووچەڵ بۆ ماوەی هەزار و دوو هەزار ساڵ لەگەڵ گۆمەڵی دواکەوتوودا بژیت چونکە بەهیچ مامۆستایەکی فێڵباز و جادووگەر ناکرێ هەزاران هەزار مریدی سادە بهاوێتە سەر ڕێبازێک کە هەمووی زەرەر بێت ئەگەر لێیان خۆش نەبێت. تۆ سەیری ڕابەری دڵسۆز بکە، چ عەزابێک دەخوا بەدەست تێقناعکردنی سافیلکان لەو ڕێنماییەی کە هەمووی پاکی و چاکە و بەرژەوەندە ئنجا بەهەزاری یەکێکیش بەدوا قسەکانی ناکەوێ. لە دەوروبەری خۆمان دڵسۆزێکی وەکو حاجی قادر بەر لە (١١٥) ساڵێک وەختابوو بکوژرێ بەدەستی ئەو مریدانەی بەئەرک و مەسرەفی خۆیان خزمەتی وێنەکانی شێخی ماویلیان دەکرد. دواتر، لە ئەستەمبوڵەوە، حاجی بەبیر خەڵقەکەی دەمێنایەوە کە دەیگوت:

لە دەوری کەر نەبی تا دەوری گای کوێر
لە گوێی گا نوستوون زۆر حەیفە بۆ شێر

بەهەمەحاڵ مرۆڤ کە باوەڕێکی بەدڵدا چوو، با هەڵەی ڕووت و ڕەجاڵیش بێ، وەهای بۆ دێتە جۆش هۆی تێدا لە بیر دەکات، ڕۆشنبیریش مرۆڤە و فریشتە نییە گەلێک جارانیش پتر لە سافیلکان شێتگیرە دەبێ بۆ باوەڕێکی فریوک وەیا هەڵوەستێکی پووچ. جا ئەگەر خۆی ڕانەهێنێ بەوەی ناوەناوە چاو بەهەڵوەست و قەناعەتیدا

بگێڕێتەوە کەڵکی ڕابەرایەتیی پێوە نامێنێ.

مەرجی سێیەم کە تەواوکەری مەرجی دووەمە، ئەوەیە کە پێویستە مەیدانی ڕەخنەگرتنی دڵسۆزانەی بێ نیاز لەبەر فیکر و نوێبوندا بەربەرەڵا بێ و ڕۆشنبیری لێ وەتەنگ نەیەت هەرچەند ڕەخنەکە ڕوو لە خۆی و باوەڕیشی بکات. فیکر و ئەدەب و زانست و هونەر و داهێنان و بەرهەمهێنان و گەشتی بن دەریا و فڕینی ئاسمانان هەمووی لە پێناو خزمەتی ئادەمیزاددا شەرەف پەیدا دەکەن. کە هات و یەکێك لەمان ڕووبەڕووی مرۆڤ خرا و لێی کرا بەبوت لە خانەی شەرەفی مرۆڤدۆستی لا دەچێت بۆ خانەی مرۆڤنەویستی. لە سەردەمی گەشەی ژیاری عەباسییەکاندا دەوری حەفتا باوەڕی سەر بە تاکە ئاینی ئیسلام وێکڕا دەژیان و هەرچەندە لە هیچیان نەدەکرا، بەسەرنج گرتنیش لەو باوەڕانە و کارێکی کردوویانە دەرمکەوێ بەرژەوەندیی گشتی لێیان زەرەرمەند نەدەبوو. خەڵق لە ڕێی باوەڕەوە یەخەگیری یەکدی نەدەبوون تەنانەت مەسیحی و جوولەکە و زەردەشتی و هی دیکەش لە پەراوێزی باوەڕدا پێکەوەیان هەڵدەکرد. بێگومان گەشەی ژیار (حضارة)ی عەباسییەکان قەرزداری ئازادیی باوەڕە ئەخۆ ئەگەر دەنگی ئەدیب و خاوەن فیکر و زاناکان خەفە کرابایە دەریای کتێبان کووچە و بازاڕی بەغدا و شارەکانی دیکەی ئەوسای ئیسلامیان پڕ نەدەکرد، ئیسلامەتیش ئەوە نەدەبوو ئێستا مسڵمان و عەرەب شانازیی پێوە بکەن. بەلای منەوە ڕێدان بەڕەخنەگرتن جێی سەرێشی و ئەسڵماندن نییە، ئەوەی دەشێ لەبارەی چەندوچۆنی ڕەخنەگرتنەوە قسەی لێ بکرێ شێوەی ڕەخنەگرتن و دەربڕینی باوەڕە، لێرەدا هاوێنی زمان و دڵ و قەڵەم پێش مافی ڕەخنەگرتن دەکەونەوە چونکە بەهیچ مەزەبان ڕەوا نییە (ماف) ببێتە هۆی تێچەنکردنی نیازی بەد و وشەی بێ حورمەت. بێگومان جۆری ڕەخنەکاریی نێوان ڕۆشنبیران و شێوەی ڕەخنەگرتن و وەرامدانەوە پێوانەی هەرە ڕاستە بۆ ئەزموونی پلەی پەسەندلیەتی و سوودبەخشایەتیی ئەو هێندە ڕۆشنبیرییەی کە مافی ڕەخنەگرتنی تێدا تاقی دەکرێتەوە. هەتا ڕێکاری (ڕەخنە و وەرام) بەرزتر بێت پتر بەڵگە بەدەستەوە دەدات لەسەر سوودبەخشی و جوامێریی کارەکە و هەموو سەروبەرێکی ڕۆشنبیری و خوێندەواری ڕەخنەگر و وەرامدەرەوەکان.

ئەم نووسینە لەوانە نییە کۆتاییی بێت چونکە هەتا بەدووی بکەویت شریتە درێژ دەکاتەوە. هەرچی بوونەوەر هەیە بەسروشت و مرۆڤیەوە دەشێ خورد بکرێتەوە بۆ

تەپكەی فیكریی بچووك و گەورە كە هەر یەكێكیان ڕۆژێك لە ڕۆژان فامی مرۆڤی بەهەڵە بردبێ تا ئەو ڕادەیەی تاریكایی گەیاندبێتە بیروباوەڕ و پێوانەی چاكە و خراپە كە سەیری ڕەوتی مێژووش بكەیت دەبینیت هەموو هەنگاوێكی بەرەوپێشەوەی مرۆڤ بەدوو قاچی ئیمتیهاری هەڵنراوە یەكێكیان دۆزینەوەی هەندێك ڕاستی، دووەمیشیان پووچاندنەوەی هێندێك هەڵە ئنجا وەهاش بووە ئەو ڕاستییەی دوێنێ چرای كۆمەڵایەتی بووە، بێ ئەوەی باری ئابووری وەیا ڕۆشنبیری گۆڕا بێ، وردەوردە [لەبەر ئەو هۆیانەی كە لێرەدا جێی باسكردنیان نابێتەوە] تاریكایی داوەتەوە و سەرلەنوێ خەباتی تازەبابەتی بەمل دڵسۆز و مێشكڕوونەكان دابڕیوە.

ناچارم واز لە شریتەی نووسینەكە دەهێنم تاكو ماوەم بمێنێ بۆ ئەوەی تەپكەیەكی فیكریی زۆر بەناوبانگ بخەمە بەر نیگای خوێنەر و مافی ڕەخنە گرتنی تێدا بەكار بهێنم. ئەم تەپكەیان وەك هەر ئێستا ڕوون دەبێتەوە فێڵی لە زاناكان كردووە لە ڕێی ئەوانیشەوە قوتابییەكانیان پابەندی بوون، منیش كە دێم ڕەخنەی لێ دەگرم هونەرەكە دەگەڕێنمەوە بۆ ئەو كەسەی كە لە سەرەتاوە بیری وەهای كردووە من بەخۆیەوە خەریك بكات.

لە شیكردنەوەی مێژوو كە بەسەر ڕاڕەوی مادیی مێژوویدا دەڕوات عەبدایەتی بەقۆناخی مێژوویی داندراوە وەك دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری. بەپێی بۆچوونی من كە لەبەر تیشكی مادیی مێژوویدا سەیری پرسیارەكە دەكەم عەبدایەتی دیاردەیەكی كۆمەڵایەتییە نەك قۆناخی مێژوویی چونكە لەو ئەزمەرییەدا ئەوەی سیفەتی (قۆناخ) بەهێلكانەیەكی مێژوو دەبەخشێت لایەنی ئابووری و جۆری (بەرهەمهێنان)ە واتە دەبێ (قۆناخ) زادەی عەمەلیەتی گۆڕانی ئابووری بێت و ڕووداوێكی مێژوویی و ناچاری بەئابوورییەوە بەسترابێت وەك كە فەلاح و مڵكدار لە بەرهەمهێنانی كشتوكاڵی سەردەمێكدا لە شێوەی حەتمی پەیدا دەبن. هەرچی عەبدایەتییە زادەی عەمەلیەتی بەرهەمهێنان نییە، بەچكەی ڕاستەوخۆ و یەكسەری ئابووریش نییە بەڵكو بەزۆری لە ئاكامی دۆڕاندنی شەڕدا دانیشتوان وەیا عەسكەرەكانی وڵاتە تێشكاوەكە بەدیل گیراون و بوونەتە عەبد، وەیا لەبەر ئاگزووری خەڵق منداڵی خۆیان فرۆشتووە، ڕەنگە خۆشیانیان فرۆشتبێ. منداڵ فرۆشتن بەوەندە نابێتە بنچەی پەیدابوونی (قۆناخی بەئابوورییەوە بەستراو) كە فرۆشتنی تێدایە چونكە مەڕ و كەڵەك و عەلیشیش و كەڵەشێریش دەفرۆشرێن چ قۆناخانێش دروست ناكەن. حاڵ و باری

منداڵفرۆشتن و مەرفرۆشتن پەیوەندیی بەجۆری بەرهەمهێنان و هێزی بەرهەمهێنانەوە نییە. مامڵەتێکە دەشێ شانبەشانی چەندین قۆناغ بەردەوام بێت. ڕەنگ بوو ئەگەر یاسا مرۆڤ فرۆشتنی مەنع نەکردبایە ئێستاش لە هەندێ شوێنی ڕووت و برسی و دواکەوتوودا هەر لە برەو بوایە، لە برەویشدایە. ڕاستییەکەی، لە وڵاتی خۆمان تا ئەم نزیکانەش وەها بووە منداڵ فرۆشراوە بەڵام نەبیستراوە قانوون نە لە کۆن و نە لە نوێدا سەلماندبێتی.

چی لێرەدا گوتم لەبارەی قۆناخنەبوونی عەبدایەتی بەوەندە هەڵناوەشێتەوە کە لە پایتەخت و شارە گەورەکانی دەوڵەتە زلە کۆنەکاندا لە ئاکامی شەڕی بەردەوام و سەرکەوتوو، هەزاران عەبد و جارییە لە ژێرووی هەموو چینەکانەوە کۆمەڵەیەکی دەستەبەسەر و بێ ماف و بێ مزەیان لێ پەیدا بووە و شێوەی (چین)یان وەرگرتوە چونکە قسەمان لەگەڵ (قۆناغ)ە. جا ئەگەر ناوی قۆناخت لەسەر هەڵگرت با لە شێوەی (دیاردە)دا هەر ناوێکی پێ دەدرێ بدرێ. بەهەمەحاڵ ئەو عەبدانەی پارە و پوولیان چنگ کەوتووە خۆیانیان کڕیوەتەوە و ئازاد بوون. لەوانەیشە لە شەڕێکی دیکەدا کۆنە عەبدەکە خاوەنەکەی خۆی بەدیل گرتبێ و کردبێتیە عەبد. هیچ دوور مەبینە یەکێك عەبدی ئازاد کردبی و دواتر خۆی هەژار بوویێت و کۆنە عەبدەکەی کڕیبێتی. تۆ ناتوانیت وا بەقسە (فەلاح) ڕەها بکەیت وەك کە بەقسە عەبدێك ئازاد دەکەیت، کرێکاریش بەقسە نابێتە ماڵدار وەیا ئاغا کەچی دەشێ هەر لە شێوەی عەبدایەتیدا عەبد فەلاح بێ وەیا سەرباز بێ وەیا بازرگان بێ واش بووە بۆتە (سلطان)ێکی وەك کافووری ئیخشیدی. عەبدایەتی بەقەدەر (بوتپەرستی) دیاردەیە و هەردوویان بە بەریانەوە هەیە پێکەوە شانبەشانی چەند قۆناغ بەمێژوودا سەرەژێر ببنەوە هەردووشیان (چۆنیەتی)ن و بەبڕیار و بەقسە بەردەوام دەبن یاخود هەڵدەوەشێنەوە.

ئەو بیروبارەی دیاردەی عەبدایەتیی بەقۆناغ دانا بەر تەپکەی لێکدانەوە و وردبینیی خۆیەوە بوو کە دیتی لە ڕووبەرەکانی مێژوودا دیمەنی هەزاران هەزار عەبد لە شکڵی پەرە بەردی دیوار چینێکی هەرە ژێرووی ئەلافەتی کۆمەلایەتی پێك دێنێ ئیتر بۆچی پێی نەگوترێ چین؟ کە کڕین و فرۆشتنیشی بەسەرەوە بێ بۆچی قۆناخی مێژوویی نەبێ؟ لە ڕاستیدا عەبد وەك (قوتابی) و (عەسکەر) چەند خەسیەتێك لەوەی دابڕێ قۆناغ بێ:

١- عەبد و قوتابی و عەسکەر هەرسەی هەموو چینەکانن بگرە لە شازادەوە تا هەژاری

ڕووت و برسی.

٢- زاڵەی یەکسەر و ڕاستەوخۆی بەرهەمهێنان نین بەڵکو پێداویستێکی چاك وەیا بەدی کۆمەڵایەتین. ئەو پێداویستە پێوەندیی بە ئابوورییەوە هەبێ یا نەبێ.

٣- دەشێ هاوعومری زۆربە قۆناخە مێژووییەکان بێ هەرچەند لەلایەن سەرەتای پەیدابوونەوە عەبد و عەسکەر کۆنترن لە قوتابی. عەسکەر و قوتابیش پتر دەوام دەکەن، ڕەنگە قوتابیش بەردەوامتر بێ لە عەسکەر.

٤- هەروەك قوتابییەتی و عەسکەری حاڵەتێکی کاتییە بۆ تاکەکانیان دەشێ عەبدایەتیش بۆ تاکە عەبە کاتی بێت بەهۆی ئازادکردن وەیا خۆکڕینەوە وەیا هەڵاتن بۆ جێی دوورەدەست وەیا دەرچوونی یاسای ئازادکردنی عەبد وەیا مردنی خاوەنەکانی ..

هەڵبەت گەلێك دروشمی جوداکەرەوەش هەیە لە نێوان ئەو سێ تاقمەدا وەك ئەوەی کە عەسکەر نابێ بەستوورە. قوتابیش لە چاو عەبد عومری تایبەتی هەیە کەمتریش خێزان پێك دێنێت ...

دەتوانین لە قوتابییەوە بەڵگەیەکی بەهێز وەرگرین بۆ ڕوونترکردنەوەی لایەنی قۆناخنەبوونی عەبدایەتی. قوتابی بەهێی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتی گەیشتە پلەیەك کە ژمارەی بەقەدەر تێکڕای کرێکار و فەلاح بێت. لە زۆر وڵاتی پێشکەوتوودا چواریەکی کۆمەڵ قوتابین. بگرە نیسبەتەکە لەوەش تێپەڕ دەکات چونکە زۆربەی هەرە زۆری هەموو ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان شەش ساڵ و بیست ساڵدایە قوتابین. خۆ ئەگەر ئەو ساوایانەی جاری نەگەیشتوونە تەمەنی خوێندن لە حیسابەکە دەرهاوێژین ژمارەی قوتابییان خۆی لە نیوەی ژمارەی هەموو دەخشێنێت. دەرهاوێشتنی ساوایانیش لەوەوە دێت کە ئەوان جاریٰ لە ئاڵقەی هیچ بەرپرسیدا نین ئەرکێکی پێوە بێ و ناوێکی لێ بنرێ ئەوە نەبێ کە خۆیان ئەرکن بەسەر شانی غەیرەوە. یەکەم پلەی بەرپرسێتییان قوتابییەتییە جارانیش وا دەبوو دەبوونە شاگرد. بەهەمەحاڵ ڕۆژەك دێت هەرچی بێ لە کۆری ژیان بێت بێتە قوتابی لەگەڵ ئەمەشدا کەس ناڵێ قوتابییەتی قۆناخە چونکە بەهێی تێك بەستراتی (قۆناخ) بە (ئابووری و بەرهەمهێنان)ەوە قوتابییەتی سیفەتی قۆناخی نابێت هەرچەند خۆیشی سەرچاوەی ئەو کەسب و کارانە دەبێ کە قۆناخ و چین پێك دێنن. ڕەنگە ئەزمەیە پەیدا ببێ

حیسابێکی تازە بۆ قوتابی بکات و ژووررووی چینەکان و قۆناخەکانی بخاتەوە بەڵام ئێمە قسەمان لەگەڵ ڕاڕەوی مادیی مێژوویییە کە لەوێدا مەرجەکانی قۆناخ [هی چینیش] لە قوتابیدا نایەنە جێ هەروەك لە عەبدیشدا نایەنە جێ. قوتابییەتی پێوەندیی بەئابووری و گوزەران و بەرهەمهێنانەوە نییە هەرچەند زۆر جاران شوێنپەنجە لە کارەساتی ڕامیاریی زیندە گرنگیش دادەنێ چ جایی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری.

لە عەسکەر و قوتابی هەڵکشێین بۆ (موظف) کە دەزانین ١- کار دەکات ٢- مەعاشخۆرە ٣- بەرپرسە ٤- کاریگەرە ٥- ناوی (چین) هەڵدەگری. ئنجا پێی ناگوترێ قۆناخ چونکە بەڕاستی دیاردە و پێداویستی کۆمەڵە نەك قۆناخی مێژوویی. ئەگەر هاتبا (موظف) دوو مەرجی لێ هاتبایە دی منداڵ بێ، بەزۆریش ئێرینەیە ژمارەشی دەبوو بەقۆناخ:

مەرجی یەکەم: پێوەندیی ڕاستەوخۆی بەبەرهەمهێنان و ئابوورییەوە هەبوایە.

مەرجی دووەم: ئەویش وەك ئەو چینانەی بەدوا یەکدیدا دێن شتێکی دیکەی زادەی هەناوی خۆی بەدوا خۆیدا هێنابایە وەك کە سۆشیالیزم بەدوا سەرمایەداریدا دێت و لەویش دەکەوێتەوە.

عەبدایەتی بارتەقای سەرباز و قوتابی و مووەزەفە کە هیچیان زادەی قۆناخ نین و دایکی قۆناخ نین و خۆشیان قۆناخ نین. لە هەموو حاڵاندا دیاردەی کۆمەڵایەتییە بەڵام مێندەی قوتابی و مووەزەف حەتمی و ناچاری نییە چونکە دەشێ لە کۆمەڵدا عەبد هەر پەیدا نەبێ وەك کە نەبیستراوە لە کوردەواریدا عەبدایەتی مێندە هەبووبێ کە سەرنج ڕاکێشێت وەیا پێی بگوترێ چین.

بەهەمەحاڵ ئەگەر عەبدایەتی دیاردە بێت و بەس کار ناکاتە سەر هیچ سەروبەرێکی ناوەرۆکی تەزەرییەکە هەرچەند کەمێك لە چۆنایەتیی ڕوخساری دەگۆڕێ ئەویش هەر بابیی جوداوازیی عینوانی (قۆناخ) لە عینوانی (دیاردە) بەسەر فۆرنەییەکی تەزەرییەکەوە.

ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ٨١، ١٩٨٠

# پایەی شیعری کوردی لە ئەدەبی کوردی سەدەی نۆزدەمدا

بەر لەوە من بڵێم، لەخۆوە دیارە، شیعری کوردی برێتییە لە هەموو ئەدەبی کوردی سەدەی نۆزدەم چونکە بێ لە شیعر هیچ بابەتێکی دیکەی ئەدەب لە نێو کورداندا زمانی کوردیی بۆ بەکار نەهاتووە نە لەو چەرخە و نە لەویش بەپێشتر. بەرواڵەت سەیر لەوەدایە کەوا پەخشان لە زمانی کوردیدا دوای شیعر کەوت چونکە وا چاوەڕوان دەکرێ مرۆڤ زووتر ئامرازی سادەی تەعبیر بەکار بهێنێ (کە لێرەدا پەخشانە) ئنجا مەیلەو لەسەرەخۆ و بەدرەنگە کاتەوە تێ هەڵکشێ بۆ بەکارهێنانی ئامرازێکی باهەڵداوی، تێك هەڵکێشێ، بەهێوانە و کێشانەی وەك شیعر. بەلام، ڕاستییەکەی، لەو ژیانە زێدە هەژارە - زێدە سەرەتاییە - زێدە سادە - زێدە سەراوەی کە گەلی کورد بەدرێژایی مێژوو بەسەری بردووە پەخشان کالایەکی بەفیز و ناز و ئەریستۆکرات و دوورەدەست و نایاب بووە کە لە کۆمەڵگەی کورددا بەرای ببرای کڕیاری نەبووە، تەنانەت نامەی عادەتیی نێوان خەڵق بەزمانی بێگانە - بەزۆری فارسی - نووسراوە. زمانی بێ خاوەن و خزمەت تەنها بەسەر زاری ئاخێوەرەوە دەژیت. نەحکوومەت، نەتیجارەت، نەکەسب و کار، نەمەزهەب و دین هیچیان لە نووسینی ڕەسمی و ئەدەبی و زانستیدا بەلایەوە ناچن. زمانی بێ خاوەن هەروەك نووسەر و داتەری نابێ، لە شکڵی بەدیهییەدا، خوێنەرەوەشی نابێ. ئەگەر بشێ بڵێم لە میللەتی وەك کوردی بێ فێرگە و دەزگای ڕۆشنبیری بەر لە سەدان ساڵ موسکین بوویێ خوێندەوار هەبوویێ، کە نەبووە، مەبەستیش لە بوون و نەبوونی خوێندەوار لە نوختەنیگای ڕەواجی پەخشانەوە ئەو ژمارە بەهێزەیە کە کڕێ و بازاڕێك بۆ کالا و بابەتەکە پەیدا دەکەن نەك تاك و تەرا. بەهەمەحاڵ حیکایەتی نەبوونی پەخشان لە نێو گەلی بێ کیان و بێ دەسەلات و ساماندا خۆی بەتەنها باسێکی بەرفرەوانە و گەلێك هۆ و ئەنجام تێیدا تێك دەکەنەوە و دیاردەیەکی زێدە سەلبیی کاریگەر لە کۆمەڵدا پێك دەهێنن کە یەکێك لەوان پەیدانەبوونی زمانی ئەدەبی یەکگرتووە. بەلام ئێرە جێی لێدوان و شیکردنەوەی ئەم باسەی تێدا نابێتەوە، تەنانەت ئەگەر بەدوا شیکردنەوەی تاکە دیاردەی سەرگومبوونی مێژووی میللەتی بێ پەخشان و بێ نووسینی ئەدەبی و بێ زمانی یەکگرتوو بکەوین بەدرەنگەوە لێی دەبینەوە. بۆیە وەها بەخێرایی و سەرکێڵ بایەی ئەوەی تاکە وشەی

(ئەدەب) داوای کرد پێیدا تێ پەڕیم و لێشی دەرچووم بۆ ئەوەی بڵێم: شیعر پتر لە بەخشان دەتوانێ بێ ئەوەی بازاڕی کڕین و فرۆشتن و مامڵەت لەگەڵ کردنی هەبێ بژیت و پەرەش بسێنێت چونکە شیعر بەر لە هەموو شتێک سکاڵای تاکی هەستیار و هونەرکارە لەگەڵ دەروونی خۆیدا کە ئەمە لە سەرەتاوە پەکی لەسەر کڕیار نەکەوتووە، ئنجا بەهۆی سۆز و جوانی و ئارایشت و هونەرێکی تێیدا هەیە گوێگریشی دەبێ بێ ئەوەی لەو گوێگرتنەدا سوود و زەرەر و پێداویستی مادی چ دەخلێکی هەبێ. تۆ لە شیعر ڕاگوێزە بۆ هەڵبەستی فۆلکلۆری دەبینی لەوێشدا شاعیر و گۆرانیبێژ و بەیتخوێن پەکیان لەسەر پاڵپشت و پاریدەدەر نەکەوتووە، بەدوا کڕیاریشدا ناگەڕێن چونکە ئەوانیش وەک شاعیر، بەڵام سادەتر لەو، هەستی دەروونیان لە کولانەی ئەو بەهرە فیترییەی کە دەسەڵاتی هەڵبەستن و چڕینی پێ داون بۆ بەر گوێی ئەبیست و بیسەر وەدەر دەنێن. خۆ ئەگەر کڕیارێک پەیدا بوو لە ڕۆژی شایی و زەماوەند و داوەتدا دەها چاکتر، زێدە پاروویکە لە خوا و بیسەر بەزیاد بێ.

کە زانرا کورد لە سەدەی نۆزدەمدا تاکە بابەتێکی ئەدەبیی هەبوویێت شیعر بووە ڕێی ئەوە نامێنێت بەدوا لێکۆڵینەوە لە پایەی شیعر لە ئەدەبی کوردی ئەو سەدەیە بکەوین چونکە شیعرەکە خۆی هەموو ئەدەبەکەیە. لەم حاڵەتەدا دەشێ هەوڵ بدەین بۆ دیارخستن و ڕوونکردنەوەی پایەی شیعری کوردی، وەک کە شیعرە، ئەویش لە ڕێی بەراوردکردنی لەگەڵ شیعری دراوسێکانی کەوا، کەم و زۆر، ئەوانیش لەو چەرخەدا مەیدانەکانی ئەوسای شیعری کوردییان کوتاوەتەوە، بەڵام نووسینەکەی من ئەو بەراوردکردنەی نەکردۆتە مەبەسی ئێستاکەی خۆی چونکە نیاز لێرەدا باسی (پایەی شیعری کوردی لە ئەدەبی کوردی)یە، کە شیعرەکەش خۆی ئەدەبەکە بوو دروستتر ئەوەیە بزانین پایەی لە ژیانی کوردەواریدا چی بووە؟ چ دەورێکی دیتووە لە بووژاندنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی؟ گیانی قەومایەتی؟ چ کەلێنێکی لە دەروونی مەردمدا پڕ کردۆتەوە؟ چ خزمەتێکی بەزمانی کوردی گەیاندووە؟ چ هەنگاوێکی بەرەوپێشەوەی بەکوردگەل هەڵناوە؟ تا ئەم تەرزە پرسیارانە و وەرامەکانیان پێوەندیی ڕاستەوخۆ و زیندەڵ لە نێوان شیعری کوردی و کۆمەڵایەتی و قەومایەتیی کوردەواری ڕوون دەکەنەوە و پایەی شیعری کوردی لە ئەک پێکهێنەرە مەعنەوییەکانی ژیان و ژیاری کوردی دەستنیشان دەکەن. بەڵام بەر لە هەموو شتێک دەبێ وەرامی پرسیارێکی سەرەتاییی دیکە بدەینەوە کەوا جارێ لەم نووسینەدا ڕووبەڕووی نەبووین. چۆن وەها

ڕێك كەوت كە كوردستانی خواروو، لەتكاو، لە سەرەتاكانی سەدەی نۆزدەمدا ملی نابە شیعری كوردی؟ ئەم هەڵبەزینەوە و بازدانە لە چییەوە بوو؟

وەك دەزانین شیعری كوردی بۆ یەكەم جار لە كوردستانی خوارووا لەلایەن نالی و سالم و كوردییەوە بەكار هاتووە ئنجا ئەگەر ژیانی نالی بكەین بەدیارخەری ئەو ڕۆژ و كاتەی كە شیعری كوردیی هەڵێنا، بێ دەمەتەقە، سەرەتای شیعری كوردی لە كوردستانی خوارووا دەكەوێتە یەكەم پێنجیەكی سەدەی نۆزدەم. چونكە وەك سەرچاوە نووسراوەكان باسی نالیمان بۆ دەگێڕنەوە نالی لە ساڵی ١٧٩٧ هاتۆتە دنیا؛ بەپێی ئەوە كە بەشی هەرەمەرە زۆری شیعرەكانیشی كوردین، تا ئەو ڕادەیەی دەتوانین چاو لەو دوو سێ پارچە هەڵبەستەی بپۆشین كە بەفارسی و توركی و عەرەبی دایناون، دیارە هەر لە سەرەتاوە بەكوردی شیعری هەڵبەستووە. جگە ئەوەی ڕاستی بێ یەكێكی وەك نالی گومانی دانانی شیعری عەرەبی و توركیی لە سەرەتاكانی شاعیریەتییەوە هەرگیز لێ ناكرێ چونكە لەو تەمەنە زووەدا هیچ یەكێك لەو دوو زمانەی نەزانیوە، زانینێك كە بەسەر هەڵبەستیدا ڕاشكێنێ. دەمێنێتەوە فارسی كە دەزانین بۆ نالی و هەموو هاوچەرخەكانی لە عەرەبی و توركی ئاشناتر بووە، ئەویش بە سەرنج لێگرتن هەر دەچێتەوە ڕیزی عەرەبی و توركی چونكە مەهارەت پەیداكردن لە زمانی فارسی بایی ئەوەی كوردێك شیعری پێ هەڵبەستێ لە ئیمكاندا نییە مەگەر دوای خوێندنی فارسی و ئەزبەركردنی دیوانی شاعیرەكانی فارس. دیارە ئەم مەرجانەش لە تەمەنی ١٢ – ١٥ ساڵیدا بۆ نالی و كەسی دیكەی وەك ئەو نایەتە دی. كەواتە گومان لەوەدا نییە كە نالی بزانی هەستی شاعیرییەت و یەكەم دەربڕینی خولیاكانی لە ڕێی هەڵبەستی كوردییەوە بووە ئنجا تۆ بڵێ چ هۆیەكی مێژوویی وەیا كۆمەڵایەتی وەیا ڕامیاری وەیا هەر هۆیەكی دیكە بێ پاڵی بەنالی و هاوڕێكانییەوە ناوە بەرەو هەڵبەستی كوردی؟

لێرە بەپێشەوە لە نووسینی دیكەمدا وەرامی ئەم پرسیارەم داوەتەوە، بەر لە وەرامەكەش زۆر زەینبزێوی و خەیاڵگێڕیم كردووە بۆ دۆزینەوەی وەرامی پرسیارەكە چونكە لە كەسم نەدەبیست و لە كەسم نەدەخوێندەوە دوور و نزیك خۆی لە پرسیارەكە بدات وەیا لە شێوەی گرێپچكەدا بیخاتە بەر نیگای خۆی و خوێنەران و داوای كردنەوەی گرێكە بكات.

وەك بۆم ساغ بۆتەوە، وەیا هەر نەبێ وەك باوەڕم هێناوە، نالی و هاوڕێكانی لە

حوکمڕانی عەبدوڕەحمان پاشای باباندا گەیشتنە ئەمەنێك شیعری تێدا بهۆننەوە چونکە بەپێی ڕاگەیاندنی سەرچاوە مێژووییەکان عەبدوڕەحمان پاشا لە (١٢٢٨)ی کۆچی (١٨١٣ ی زاینی) مردووە کە لەو ساڵەدا نالی بەتەمەنی (١٦) ساڵەیی گەیشتووە ئەمەش تەمەنێکە بەهرەی شاعیریەتیی تێدا بەکرێنەوە. بگرە زووتریش دەکرێتەوە. تەنانەت لەو سەردەمانەدا مرۆڤ کە بلوغی دەبوو هەستی بەرپرسیاریی خێزان و گوزەرانگێڕانیشی بەخەبەر دەھات و بەزۆری لەو تەمەنەدا ژنیشی دەهێنا. باری نیشتاکەی ژیان و گوزرانی شێوەی کۆمەڵایەتی و قانوونی و جۆری گوزەران و خوێندن و دەوری حکوومەت لە ئەخشەی کۆمەڵ و سەروبەرێکی بەسەربردن و هەڵکردن وای کردووە لەم ڕۆژگارەدا مرۆڤی شازدە ساڵی بەدەمڕووت و هەرزەکار لە قەڵەم بدرێ لەمەشدا نیشتاکە و ڕابردوو هێندەی بڵێی لە یەکدی ترازاون چونکە ئەم هەرزەکارە شازدە ساڵەیە بەر لە (١٠٠) ساڵ بەهیاو دەخوێندرایەوە بەتایبەتی لە نێوان خێڵ و ئێلەکاندا کە بەفەرمانی پێداویستیی گوزەران، ئەرکی بەرپرسی و پەلەی ژیان خێراتر ئێرینەی دەروەشتی لە منداڵییەوە هەڵدەداشت بۆ ناو چەقی کامڵی، زووتریش شووی بەکچان دەکرد.

ئەم ڕاستییەی گەیشتنی نالی و هاوڕێکانی بەتەمەنی شاعیرییەت لە حوکمڕانیی عەبدوڕەحمان پاشادا دەچێتەوە ڕووناکایی ڕاستییەکی دیکە کەوا لەبەر تیشکی ئەودا دەبینین چۆن لە شێوەی حەتمی هەڵبەستی بەزمانی کوردی لەلایەن شاعیرەکانی بابانەوە دەبێتە بڕیاری مێژوو: عەبدوڕەحمان پاشا یەکەم ئەمیری بابان بوو دەستی دایە کوردایەتی و لێشی بەدیار کەوت، واتە ئەم مرۆڤە لەوە دەرچوو وەك مەرێکی عادەتیی حوکمخواز و دنیادۆستی ڕووت بێت چونکە وێڕای نیازی شەخسی لە حوکم و دەسەڵاتدا هەستی نەتەوایەتیش پاڵی پێوە دەنا بەرەو وەدەستهێنانی چارەنووس بۆ میللەتەکەی.

خوێندنەوەی ئەم هەستە پیرۆزەی نەتەوایەتی لای عەبدوڕەحمان پاشا لەوانە نییە چاو و زەینی سەرنجدەر ماندوو بکات چونکە لە زۆر لاپەڕەکانی ژیانی ئەم ئەمیرەدا کردە و گوتەی ئەوتۆ نووسراوە کوردایەتیی بێ فێڵ دەڵێنەوە: یەك لەوان قسە مەشوورەکەیەتی لە ئاست ئەو پێشنیارەی بۆی کرا کە ببێتە والیی بەغدا بەرەوتیەی وەزیری ئەویش هات و گوتی یەك فرە بەقڕاوی کوردستان بەوە ناگۆڕمەوە. دووەمیان ئەو وەقفنامەیەتی کە بەسەر کتێبی دەستنووسی (صحیح البخاری)یەوە سنووری

قەڵەمڕەوی بابان دەکێشێت و کتێبەکە وەقف دەکا بۆ (العلماء العاملین بناحیة کردستان بین الموصل وبغداد وسنندج..) وەك دەشزانین کتێبی (صحیح البخاری) لای کوردی سوننی لە دوای قورئانەوە دێت کە تێتر خزمایەتیی بەھەرچیی سەر بەدنیاوە ھەیە نایھێنێت، جا ئەگەر ھەستێکی زیندە بەھێزی ئازادناسی تێکەڵ بەھەستی خواناسی نەبێ کتێبەکە لە قەبەڵ تەنھا عولەمای سەر بەئازادێکەوە ناکرێت... سێھەمیان قسە ئاگرینەکانی عەلی بەردەشانییە لە بەیتی (عەبدوڕەحمان پاشا) کە ھەمووی دەنگدانەوەی سرکە و کورکە و ڕاز و نیاز و وتووێژ و قسە و ڕاوێژی دیوەخانە و بارەگا و سپا و دەستەوداییەرەی سەر بەعەبدوڕەحمان پاشایە کە عەلی بەردەشانی وەھا بەپسپۆڕی دەیانکاتە ھانەر و وروژێنەر و باڵ پێوەنەر و تەکانەر.

وا لێرەدا بەشێکی سەرەتای ئەو بەیتە بەشایەد دەگرم بۆ دروستبوونی ڕایەکەم:

نەزم عەلی بەردەشانی
دەبەندیم ئەکەی زەمانی
بەیتی دەڵێم بەدیوانی
مەدحی پاشای کوردستانی
مەدحی پاشای کامیان باشە
شایەد ڕۆم و قزڵباشە
ھەر جاری شەڕی دەکێشا
ھەمووی دەھاتنە تەماشا
عالەم ئالایە چاوەشە
سەرە عەبدوڕەحمان پاشا
پاشای بەبان جیھانگیری
تەحا بەڕا و تەگبیری
ڕانابوێری بەرەزیلی
ناکەم خزمەتی وەزیری
نانی دەستێنم بەشیری
بەشیر نەبێ قەت پێك نایێ
دەوڵەت نایەتە ڕەدایێ
ناچمە سەفەری لەحسایێ

یاغی دەبم لە بەغدایێ
یاغی دەبم ئێستانەلا
خزمەتی ناکەم بە وەلا
ئافەریم و بارەکەلا
ئەوەکەکول بە تەعالەلا
هەی کورە بەمەیتە هەلا

ئەوەی ئەختێک وێنەی ڕووداو و ڕۆژگار و چەندوچۆنی سەردەمی خۆمان و ئەو سەردەمانەی کە لە مێژووەوە بۆمان پارێزراوە لە دڵدا هەڵگرتبێ دەزانێ لەرزۆتای نەتەوەپەرستیی ناو ئەو بەینەی بەر لە (١٦٠) ساڵێک گەلێک گەلێک بەولای هەستی کوردایەتیی دەیان ساڵی سەدەی نۆزدەم و بیستەمی بەشێکی زۆری سەرلەبەری میللەتی کوردەوەیە. بێگومان بۆرگی هەناو و تەلی زمانی عەلی بەردەشانی ئاخناو و تەرجومانی ڕەمەڵ و هەورەتریشقەی نیشتمانپەرستیی دەوروبەری خۆیان بوون.

هەستی نەتەوایەتیی عەبدوڕەحمان پاشا کەوا ڕاستییەکی ئەولای گومان و دەمەتەقەیە زادەی سەردەمێکە بە بەرییەوە هەبوو مرۆڤی هەستیار و هۆشیار و بەپەرۆش و دڵئاوەدانی وەک ئەو پیاوەی تێدا بگاتە خۆناسینەوە و شانازی پەگەل و مەفتەنەوە کردن.

کە سەرنجێک بدەینە مێژووی کتێبە دەستخەتەکەی بوخاری (١٢١١ی کۆچی) دەبینین ئەو ساڵە دەکەوێتە بەرانبەر (١٧٩٦ – ١٧٩٧)ی زایینی، واتە ٧ – ٨ ساڵێک دوای بەرپابوونی شۆڕشی فرەنسە. وەک دەشزانین ئەو شۆڕشە ڕووداوە مێژوویییە ڕاگەیەنەرەکەی بیری قەومایەتی و مافی نەتەوایەتی بوو نەک هەر لە ڕێی پەند و سکالا و ئامۆژگاری و فەلسەفەوە، بەڵکو بەهۆی دەمەچەقۆی ئاگاکەرەوەی کارەساتی پڕ ژان و ژوار و بەسفتوسۆی تێک هەڵقژان و ڕەوبردن و لەسەرخۆکردنەوە و تێکدان و بنیاتنان و خوێن و ئاگر و بوومەلەرزەی گۆڕانی کۆمەلایەتی و ئابووری و ڕامیاری و زانستییەوە ئنجا کە مەرێکی ئاسۆفرەوانی تێگەیشتووی بەرژەوەندزانی وەک عەبدوڕەحمان پاشا پەندی بیری نەتەوایەتی لەو ڕووداوە بێ ڕەزایە وەربگرێ و لە کرتە و گوتە و دەوروبەری تا دەگاتە شایەری بەهێتبێژی بەسەر بداتەوە جێی خۆیەتی، بەڵکو لە پێداویستەکانە، کە شاعیرەکانی بگەنە پلەی هەڵبەستن بەزمانی دایکزانە.

ئەم گووران و رسکانەی ئاووهەوای (شیعری کوردی) بەدوا شۆرشی فرەنسە و لە حاکمایەتیی عەبدورەحمان پاشادا جاریکی دیکەش لەوەدا خۆ بەدیار دەخات کە شاعیری کورد لە سەرانسەری کوردستانی عیراق و ئیراندا. بێ وەخران، شوێن پێی نالی و کوردی و سالمیان هەڵگرتەوە و کەوتنە سەر رارەوی هەڵبەستی کوردی هەر دەڵێی، کوردی گوتەنی، بیستانێك بوو بێنی تێ گەرابوو چاوەنۆری شەپۆلێکی گەرما بوو کاڵك و کۆڵك و گۆزەڵەکانی تێکرا بگەن.

ئەم قۆناغە زیندە گرنگەی ژیانی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتیی کورد کە شاعیری کوردی تێدا گەیشتە پلەی هەڵبەستی کوردی ئیشکێك بەرەودواوە دەهاوێژێت و دیمەنێکی پڕ دەلالەت هەستی فیتریی قەومایەتی رووناکتر دەکاتەوە. بەر لەوەی شیعری کوردی پەیدا بێ هەر دەڵێی کورد شاعیری نەبووە. ناوناوەیەکی زۆر کەم نەبێ، ئاك و تەرا، لێرە و لەوێ کوردێك قەسیدەیەك و غەزەلێك و دوو بەیت و سێ بەیتی بەفارسی وەیا عەرەبی داناییت لەوە بەولاوە چی ئەوتۆمای لە بەرهەمی شاعیری کوردستانی خوارووی سەدەی نۆزدەم و پێشووتر پێ نەگەیشتووە (دیوان) پێك بێنی. ئەگەر مەلا عەبدولای بێتوشی و شێخی نۆدەهی (لە شیعری عەرەبی - کە بەزۆری هی موناسەبە و هی دینن) و مەولانا خالید ( لە فارسی و عەرەبی کەمێکی کوردی بەلەهجەی هەورامی) و حاجی بەکر ئاغای کۆیێ لە حیسابان دەراوێین تەنها دەمێنێتەوە ئەو چەند بەیتەی کە مێژووی مەرگێك وەیا مندالبوونێك وەیا خانووبەروستکردنێکیان بەحیسابی ئەبجەد پێ دەرهاتووە. ئەویش ئاغڵەب بەفارسی. کەمتاکورتێکیش وەها بووە نامەی برادەرانە هەڵبەستی فارسی لە نێواندا هاتوچۆیەکی کردووە. خولاسە دەتوانین بڵێین لە کوردستانی خواروودا بەر لە پەیدابوونی هەڵبەستی کوردی شیعرێکی ئەوتۆ بەغەیری کوردی نەبووە تێ بخوێندرێتەوە هەرچەند لەو سەردەمانەدا مەلایەتی و شێخایەتی، کە بنەمای خوێندەواریی ئەوسا و جێ مەزەندەی شاعیری بوون، لەوپەڕی گەشەدا بوون. وا دیارە شیعر کە پێوەندیی سەرەکیی بەهەست و سۆزی دەروونەوە هەیە پتر لەگەڵ زمانی دایکزادا ئامادەیە لە زووێکەوە بەژۆ. ئەوەی بەتەما بێ لە رێی زمانی بێگانەوە وتووێژی دەروونی دەربرێت سەردەمی گەنجایەتی و گوڕی عاتیفەی لە دەست دەچێ ئنجا دەتوانێ هێندە مەهارەتە پەیدا بکات کە لەو زمانەدا شیعر هەڵبەستێ، ئەوساش بەخۆهێنان و بردنێکی ئەرکدار چەند بەیتێکی ساردوسڕی موناسەبە گەلاڵە بکات.

هەر ئەم هۆیەی ئەقینەوەی بەهرەی شاعیرییەت بەزمانی دایکزا وای کرد شاعیری کورد بتوانێ پتر لە جاران بەزمانی بێگانە، فارسی بەتایبەتی، شیعر دابنێت چونکە دەمەزەنکردنەوەی هەمیشەیی بەهرەکەی بەزمانی دایکزا کە لە سەرەتای عومری شاعیریەتییەوە گەشابۆوە دەبووە مانیعی کۆبوونەوەی تواناکەی بۆ بەکارهێنانی ئەو بەهرەیە لە هەر زمانێك بێت کە تێیدا بپەڵەوە، هەرچی جاران بوو تا دەهات فێری زمانی بێگانە بێ لە تەمەنی پڕ هەیەجانی عاتیفەی گەنجایەتی دەترازا بەرەو تەمەنێك کە وەك گۆمی بەر پێژگەی قەڵبەز رادەوەستێت و کەفوکوڵی هەڵرژانی دەبووژێنەوە. هەر لەم کولانەوە، بەقیاس، تێ دەگەین چۆن مەلای دانەر و پەراوێزەنوس (موئەلف و محشی) هەڵی تەئلیف و حاشیەنووسی بەزمانی عەرەبی لە دەست نەدەچوو چونکە حاشیە و تەئلیف بەرهەمی پێگەیشتن و تێگەیشتن کە هیچ پێوەندییان بەگەنجایەتی و عاتیفە و بەهرەی شاعیرییەتەوە نییە بەپێچەوانە لەگەڵ تەمەنی کامڵیدا گونجاو و خزم و دراوسێ و یاران.

نەبوونی هەڵبەست بەزمانی بێگانە لەلایەن خوێندەواری کوردەوە دیمەنێکی دیکەی فەرمایەتی - کۆمەلایەتی لە خۆی بەرفرەوانتر دەکاتەوە بۆ بەر چاو و زیهنی سەرنجدەر، کە خوێندەوارەکە نەیتوانیبێ وەیا نەیویستبێ بەزمانی دەرەکی شیعر هەڵبەستێ نەخوێندووەکە هەرگیز نەیتوانیوە، بگرە بەبیریشیدا نەهاتووە، شیعری بێگانە لەبەر بکات و بیڵێتەوە چونکە دیارە شتی نامەفهووم لەبەر ناکرێ، کە بەزۆرەملێ و نیوەچڵ لەبەریش کرا گوتنەوەی بەشێوەیەکی شکستەی ناقۆلا و ناحەز دەبێتە خەیاڵشکێن نەك دڵبزێو، ئەوسا لە کۆدوولەی ئەوێشدا گوێگری نابێ بەڵکو دەشێ گوێگران شیعرخوێنی ئەوتۆیی دەمکوت بکەن ئەگەر لێی نەدەن...!

لەم بۆچوونەوە دەردەکەوێ کەوا بەر لە پەیدابوونی شیعری کوردی کۆڕی بەزم و ئاهەنگ و کۆبوونەوەی خۆشی و شایی و مەجلیسی ئیجازەی مەلایان و دانیشتنی شەوانەی دیوەخانان، بەدەگمەن نەبێ، شیعری تێدا نەگوتراوە، ئەوەی گوترابێ بابەتی فۆلکلۆری کوردی بووە وەك بەیت و لاوك و حەیرانە و گۆرانییە ڕەسەن و میراتییەکانی ئەلاوەیسی و خاوکەر و تێك هەڵکێش و نابای و نیوەشەو و ئەو ئەرزە دەنگ و ئاوازانە. هەروەك لەم ڕۆژانەی خۆمان تێیدا ژیاوین خۆشکەرەوەی بەزم و ئاهەنگ شیعر و هەڵبەستی کوردی بووە، بەقیاسی ئەولا ئەریق، گۆرانیچڕ و گوێگری کوردی بەر لە سەدەی نۆزدەم هەنگامەی کەیف و شادیی خۆی بەئاواز و هەڵبەستی دایکزا

تەنیوەتەوە نەوەك دەنگ و وشەی نامەئلووف و نامەفهووم تەڕەدەماغییەکەی لێ بشوێنێ. ڕاستییەکەی، نەفسی ئادەمیزاد لە دەمی خۆبەردان بۆ شادی و حوزن، وەك ساوا، گڕوگاڵ و لاواندنەوە بەتاکە زمانی دایکزا و شیرمژ هەڵدەڕێژێ چونکە تەقینەوەی عاتیفەی گەلێك خێراتر و کەلەڕێژترە لەوەی گیر بخواتەوە بەدەست تەرجەمە و ڕێکخستن و سازاندن و وەبیرهاتنەوەی لەسەرەخۆ و بەکێشانە و پێوانەی مامۆستایانە. بەهەمەحاڵ قسەی ئێمە لێرەدا لەگەڵ ئاپۆرەی خەڵقە نەك تاك و تەرایەکی بۆی ڕێك کەوتبێ کە هێندە لە نێو بێگانانندا ژیابێ زمانەکەیان و هەموو ئاداب و داب و دەستوور و بۆچوون و هەست و ئەستیانی لێ بووبێتە هاوتای سروشتی زگماك.

ئەم خۆدانەوە بەزمانی دایکزا، نەك هەر لەدەمی خۆشی و ماتەمدا، بگرە لە هەموو هەڵوەستێکی ئەوتۆدا کە مرۆڤ موحتاجی قسەی گورج و گۆڵ و لەسەرێەك و نیشانەنەنگێو و دابڕ و دازڕ بێ هانابردنێکی ئاسایی و سروشتییە بۆ بەر چەکە هەرە بڕندەکەی لەسەرخۆکردنەوە و هەڵمەتبردن وەك ئەوەی کە لە کاتی هەرای شەڕە چەپەڵۆك و تێك هەڵقژان و شەڕە جنێو و یاری و گەپدا کەس بەبیریدا نایەت خەیاڵ لە قسەی ناو کتێبان بکاتەوە وەیا قسەی دەماودەمی بێگانە بەبیری خۆیدا تێ پەڕێنێت، تەنانەت زمانە ئەدەبییەکەی خۆشی لەو دەمەدا فەرامۆش دەکات و یەك ڕستەی لێ بەکار ناهێنێت. ئەم ڕاستییە پتریش ڕوون دەبێتەوە بەوەدا کە تا ئێستا لەو تەرزە حاڵ و بارانەدا شیعری نوێبابەتی ڕەها بەکار نایەت. تاکە یەك گۆرانی لە دەمی کەس دەرنەهاتووە شیعری بێ کێش و قافیە و پڕ لە پەردە و دەرگە و دزلابی تازەبابەتی گرتبێتەوە هۆیەکەش دەچێتەوە بۆ نەگونجانی عەفوییەتی گۆرانی لەگەڵ (معاناة)ی هەردوو ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکی شیعری نوێ.. لەم تێبینییانەوە بۆ ئەوە دەچم کە گۆرانیبێژی کورد بەر لە پەیدابوونی شیعری کوردی دەمی لە شیعری بێگانە نەداوە. ئنجا کە ئەمە وەها بێ دەزانین شیعری کوردی چ کەلێنێکی گەورەی لەو بەتاڵاییییە جوانکارییە هونەرییەی ڕووپێوێکی بەرینی ژیانی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و ویجدانیی کوردی پڕ کردۆتەوە. تۆ بێنە دیمەنی ئێستاکەی کۆڕی بەزم و شادیی پڕ لە ئاواز و زەمزەمەی شیعری کوردی بگرە بەدیمەنی ئەو سەردەمانەی کە بەر لە پەیدابوونی شیعری کوردی وشکێن و برەنگێن و بێ تەڕاوەتی غەزەل و قەسیدەی شلك و ڕازاوەی کوردی بوون، ئنجا بیر لەوەش بکەوە کە گۆرانیبێژ و گرینگری کورد چ ناتەواوییەك و

نوقسانییەکی گەورەی هەست کردووە لە نەبوونی غەزەل و قەسیدە بەسەر لەرزە و لەرەی ئاهەنگەکانییەوە رەنگە تاوناوەیەك کە لە دەمی دەرویش و گەریدەی جیهانییەوە گوێگری کورد غەزەلی فارسیی بیستووە حەپەساتێك و سەیرماتنەوەیەکی بێ رەوانەوەی تووش هاتبێ و هەستی ناڕاحەتیی لە دیارنەبوونی کالایەکی ئەوتۆی کوردی دای گرتبێ تا ئەو ڕۆژەی کە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەمدا پاڵپەستۆی مێژوو و لێهاتوویی عەبدوڕەحمان پاشا بلویرە سیحرییەکەی هەڵبەستی کوردییان نایە سەر لێوە گەوهەرڕێژینەکەی نالی و سالم و کوردی، ئیتر لەوانەوە زۆر بەخێرایی تێکڕای شاعیری کورد کەوتنە سەر ڕێبازی چرین و هەڵبەستی کوردی.

خۆشامەدیکردنی کۆمەڵگەی کوردزمان لە شیعری کوردی گەیشتە رادەیەك کە ئەگەر پێشتر شاعیری کورد لە ئاڵقەی پیاواندا دەست نەدەکەوت دواتر ناوناوە ئافرەتی کوردیش بوو بە شیعربێژ. بەڵێ ڕاستە ژمارەی شاعیری ئافرەتی کورد تا بڵێی کەمە بەلام دیسانەوە کە ئەو کەمتاکورتە بەنەبوونی شاعیری کورد دەگریت و بەراورد لە نێوان هەبوون و نەبووندا دەکەیت ژمارەکە بەزیادەوە گرنگ دەبێت. هەرچەند(ماه شەرەف) لەلایەن بەکارهێنانی کوردییەوە ناگاتە (ماه شەرەف)ی بوێژی فارسی، ئەو حیسابەی هەر بۆ دەکرێ کە ئەویش لە پلەی پەیدابوونی هەڵبەستی کوردیدا بۆتە بوێژ و شیعری کوردیشی هەن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە دووروبەر و پەروەردەبوون یارمەتیی ماه شەرەفی دابێت بۆ گەیشتن بەپایەی بوێژی، دیسانەوە ئەمەمات بەکوردی شیعر بڵێ ئەگەر شیعری کوردی لەبەر گوێیدا نەزرینگابایەوە، نالیش ئەمەمات بەنشتەری زمانی کوردی گەوهەرەکانی بۆ بسمێ ئەگەر لایەنی کوردبوون و شاعیری کوردبوونی ماه شەرەفی ڕەچاو نەکردایە. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمدا بوێژێکی هاتوونی وەك (حەزینە) لە کۆیە ماوەیەکی بەرفرەوانی مەیدانی مەهارەت و شارەزاییی لە شیعری کوردی بڕی تا ئەوەی لە بەشێکی شاعیرانی ئەو سەردەمەش پێش کەوتەوە. بێبەشبوونی ئافرەتی کوردی ئەو ڕۆژگارانە لە بەهرەی خوێندەواری هۆی کەمبوونی ژمارەی ئافرەتی کوردە لە بوێژیدا، ئەو چەند تاکەی کە بووشن بەبوێژ لەوانە بوون دەورووبەر کردبوونی بەخوێندەوار.

دیاردەی نەبوونی شیعری بێگانە بەسەر زمانی گۆرانیبێژی کوردەوە بیرمان بۆ

دیاردەیەکی دیکە دەبات کە ئەویش هەر دەچێتەوە بۆ گونجانی عەفوییەتی زمانی دایکزا لەگەڵ عەفوییەتی کرانەوەی دەروون بۆ شادی و حوزن. شیعری هەر یەکێك لە لەهجەکانی کوردی تەنها لە نێوان ئاخێوەری ئەو لەهجەیەدا دەبیسرا چ بەگوتنەوە بێ و چ بە گۆرانی، ئەوەی کە لە بابەتی لەهجەیەکەوە بۆ لەهجەکانی دیکە بڵاو دەبۆوە شتی فۆلکلۆری بوو، بەتایبەتی بابەتێك کە سەرگوزشتە و حیکایەتی دەگێڕایەوە وەك زۆربەی لاوکی لەهجەی سەروو، بەعادەت گوێگری گۆرانی هەتا بەستە و شیعری لەهجەی خۆی چەنگ بکەوێ گوێ بۆ شتی دیکە شل ناکا، بەڵام کە لە گۆرانیدا باسی بەسەرهاتی دڵداران وەیا شەڕی نێوان چاپووکسواران وەیا هەر ڕووداوێکی دیکەی ئەوتۆیی هەبێ خەڵقەکە سەرەڕای بیستنی دەنگی خۆش و ئاوازی سازگار لەو گۆرانییانەدا، بەدیار باس و خواسی ساڵحی تۆی قاوەچی و کەزێ و گەنج خەلیل و شێخ قادر و فەتاح بەگ گوێ و دڵ دەکەنەوە هەر ئەبێ بابیبی ئەوەی کە بۆ سەرگوزشتەی حەفت دەروێشە و سەلیمی جەوهەری و کۆڕەی پەمەن قوتاغ دەبن. وەك بە سەرنج گرتنیش دەردەکەوێ، بابەتێ فۆلکلۆری لە نێوان ئێلەکاندا لە لەهجەیەکەوە بۆ لەهجەیەکی دیکە پتر برەو دەستێنێ نەك لە نێوان دانیشتوانی شارستان واش بزانم هۆی ئەم ڕاستییە تا ڕادەیەك دەچێتەوە بۆ هاوچوونبوونی زەوق و خەریکبوون و ڕێکاری تێگەیشتن و نرخاندن و سەنگاندن و پێوانەی (نرخ و گرنگی)ی شتان لە نێوان ئێلەکاندا کە لە سەرەتا و بنەڕەتدا باری کۆمەڵایەتی و ژیاری و گوزەرانیان پتر لەگەڵ یەکتردا هاوچوونە نەك لەگەڵ هی شارستان. تۆ سەیری حەیرانە مەشوورەکەی دزەییاتی بکە دەیبینی پتر لە دەشت و دەر و نێوان ئەهلی عەشرەتدا دەگوترێتەوە. بەهەمەحاڵ ئەم لایەنە لێرەدا بەتەواوی مەودای ساغکردنەوەی نییە. دیاردەیەکە لە شیعر و هەڵبەست و گۆرانییەوە، کەوا ڕەنگدەرەوەی کۆمەڵایەتین، سەر هەڵدەدات. بەڵام دەبێ ئەوەندە بخەمە سەر قسەکانم کە نامەئلووفبوونی لەهجەیەکی زمان لەبەر گوێی ئاخێوەری لەهجەیەکی دیکەدا دەچێتەوە بۆ لەیەکدی دابڕانی خەڵقەکە، وا بەچاوی خۆشمان دەیبینین لەوەتەی هۆی یەکدی دیتن و یەکدی بیستن و لە یەکدی شارەزابوون پەیدا بووە، بەتایبەتی ڕادیۆ، خەریکە سەرلەبەری گوێگری میللەتێك، چ کورد چ غەیری کورد، گەلێك پتر لە جاران بەدیار گۆرانیی لەهجە جوداکانییەوە دەگەشێتەوە، هەتا دەنگی گۆرانییەکەش دڵگیرتر بێ گەشانەوەکە گەشکەدارتر دەبێ.

هەڵبەستی کوردیی کوردستانی خواروو لە سەرەتای پەیدابوونییەوە شەقڵ و چەژ و

داڕشتن و ڕوخسار، تا ڕادەیەکیش ناوەرۆکی شیعری فارسیی بەخۆیەوە گرت. لەمەشدا بێگومان خزمایەتیی نێوان هەردوو زمان وێڕای ئاو و تینی ئەدەبی فارسی بۆ وێژدانی ئەدیب و خوێندەواری کورد دەوری هەرە گەورەی هەبوو. خەیاڵی شاعیری کورد لە خەیاڵی شاعیری فارس نزیک دەبۆوە نەک هی عەرەب و تورک کە دەزانین شاعیری تورکیش لە شیعردا پتر شوێنپێی شاعیری فارسی هەڵدەگرتەوە نەک هی عەرەب. هەرچی زمانی عەرەبییە لەلایەن موسڵمانانی غەیری عەرەبەوە لە قەبەڵ باسەکانی ئاین و زانست کرابوو، تەنانەت مەلاکان کە هەموو عومری خوێندن و مەلایەتییان لەگەڵ (صرف ونحو)ی عەرەبیدا بەسەر دەبرد نەیاندەتوانی دوو قسەی عادەتی بەزمانی عەرەبی بڵێن مەگەر مەلاکە خۆی لەگەڵ عەرەبدا ژیابێت، لە ڕاستیشدا زمانی نەحوی عەرەبی بەلای عەرەبیشەوە هەر سەختە چونکە دەستوورەکانی زەحمەتترن لە دەستوورەکانی ئەو عیلمەی پێی دەخوێندرێ شاعیر هەتا دێت هەست و سۆزەکەی خۆی دەداتەوە بەحوکمی (مرفوع ومنصوب وغیر متصرف ومنتهی الجموع..) و ئەو تەرزە دەستوورە ورد و پەنامەکییانە هێزی بوێژی و داڕشتن و قافیە سنجی لێ دەبڕێت. یەکێک دەتوانێ لەگەڵ دەستوورە سەختەکانی (صرف ونحو)دا شیعربێژ بێت کە لە منداڵییەوە بەهۆی ڕاهاتن و مشتوماڵبوونی زەوقە ئەدەبییەکەی لەگەڵ ئەو دەستوورانەدا صرف و نحوەکەی لێ بووبێتە بەشێکی پێکهێنەری هێزی ئاخاوتن و مەلەکەی شاعیرییەت ئەمڕۆ هەروەک مەهارەتی وەستای بەتەنا بەسەیرکردنی سادە پێک نایەت تا ڕاهێنانی دەستی لەگەڵدا دەبێت هەروەهاش هەڵمشتنی دەستوورەکانی (ثلاثي مجرد) لەلایەن منێکەوە بەڕاشکاوی نایێتە زمانڕەوانی ئەگەر لە فێربوونیاندا زمان هاوبەشی منێک نەبووبێت.

یەکێک لەو شەقڵانەی شیعری فارسی کە بۆ شیعری کوردی ڕاگوێزرا نازناوی شاعیر بوو، سەد جارانیش دەستیان خۆش بێ لەو کارەی کردیان هەر نەبێ لەبەر دوو هۆی یەکجار گرنگ:

هۆی یەکەم ئەوەیە کە ئەگەر (نازناو) هاوەنایەتیی پارچە هەڵبەستەکە بۆ دانەرەکەی نەپاراستبایە لەوانە بوو بەشێکی زۆری شیعری ئەو سەردەمانە کە جارێ چاپکردنی دیوانی شاعیری کورد فەرمانێک بوو دەیان ساڵ دوای مەرگی شاعیر جێبەجێ دەکرا، بۆ غەیری خاوەنەکەی ساغ ببێتەوە و دروشمی شاعیرەکانمان لەو ڕێگەوە تێکەڵ پێکەڵ بەڵکو کوێر ببێتەوە. ئێمە دەزانین لەگەڵ هەبوونی نازناویش

گەلێ جار هەڵبەستی شاعیرێکمان بۆ یەکێکی دیکە دەبردرێتەوە لەمەشدا شیعری کوردی گەلێك پتر لە هی عەرەب و تورك و فارس دووچاری خاوەنگۆڕی بووە. وا پێ دەچێ کورد کەمتەرخەم بووە لە رێکخستنی دیوانی شاعیرەکانی تا ئەوەی یەکێکی وەك حاجی قادر لە دەستەیۆڵەوە دەست و دامانی هاوولاتییەکانی دەبێ و دەڵێ:

ئەی رەفیقانی وەتەن زۆر غەزەلم ماوە لەوێ
لە کەلێنێکەوە تەقدیرە وەکو هەڵبکەوێ
وەك سەفینە بگەڕێ بیدەیە بەر مەدی ئەزەر
حەیفە وەك من لە غەریبی بمرێت و نەتەوێ

ئنجا کە حاڵ ئەمە بێ پارچە شیعرەکانی بێ مۆری نازناو چۆناوچۆنی بۆ خاوەنەکانیان دەبرێنەوە؟

هۆی دووەم ئەوەیە کە هەبوونی نازناو یەکۆتایی شیعرەوە وەك تەزکەرەی نفووس گەلێك باری شیعرەکە روون دەکاتەوە دەزانین هی کام رۆژگارە. هی کام مەڵبەندە. تێ دەگەین چ جۆرە گۆڕانێك بەسەر ناخاوتنی ئەو مەڵبەندەدا هاتووە لە چاو ناخاوتنی ئێستاکەی. بەنموونە لە شیعری نالییەوە تێ دەگەین کە بەری بابان لەو سەردەمەدا وشەی وەهای تێدا بەکار هاتووە کە ئێستاکە وەك تێیدا نەماوێ وەهایە:

دوور لە تۆ ئێدی مەپرسە قوربان
حاڵی نالی کە نە مرد و نە ژیا

وشەی (ئێدی، ئی دی – بەواتای ئیتر) لە ناخاوتنی ئێستاکەی سلێمانی بەسەرچووە.

هەر نالی خۆی لە جێگەی (نە)ی ناپێندە (دە) بەکار دەهێنێ:

ریشەکەی پان و درێژی بۆ ریا خزمەت دەکا
من گریە ئەتۆ خەندە بەیەکدی دەفرۆشین
لێت موعەییەن بێ کە نالی گوڵ بە دڵ پەرژین دەکا

خولاسە نازناو گەلێ سوودی هەیە. بگرە لە سوود بەولاوە تێیدا نییە.

* ئەم وتارە لە دیداری شیعری کلاسیکی کوردی لە سلێمانی خوێندرایەوە

بەیان، ژمارە ۷۲، ۱۹۸۱

# خۆ دیتنەوە لە دوو ڕەخنەی دۆستانەدا!

لەو دەمەدا مۆژدەی نزیکبوونەوەی دەرچوونی گۆڤاری (کاروان)م پێ ڕاگەیەندرا چاوەچاوی هەواڵ ترووسکەی بووم وەکو ئەستێرەی بەیانییان لە ئاسۆی خۆرهەڵاتەوە تریفەکانیم بۆ بنێری لەگەڵ بێن و بەرامەی نزار و گوڵزارێکی تازە گەشاوەی ئەدەبی کوردی، کەچی (بەختی خەواڵوو)م کردەی بەو ڕۆژووەوانەی کە لە دەمی بانگی ئێوارەدا وەنەوزی دابێت و خۆی لە تەراویحی نوێژی هەفتاندا دیتبێتەوە. منیش لە ڕۆژی دەرچوونی ژمارەی دووەمدا ژمارەی یەکەمی کاروانی هەنجەلانم پێ بوو بەئەستێرە گەشەی پاش خۆراوا و قومە شەربەتی فتاری بەدرەنگە کاتەوە. تا من چاوم هەڵێنا کاروان بەخۆی و کاڵای گەوهەرییەوە لە کۆش و باوەشی گەرموگوڕی مەفتەن و خۆێنشاوەندی کورد و کوردستانە ئەزەلی و ئەبەدییەکەی حەسابووەوە و گەشابووەوە.. باڵای بەناڵو واڵای ئەڵەمچنی ئەدیبە هێژاکانمان ئاوڕێنکی پەلکەزێڕینەی دەدایەوە. چیم پێ ئەما مەگەر وەک شاباشی دوای ئاهەنگی ئەم ڕیزە دراوێلکەی وشەی بەسۆز و پەرۆش لەم گوتارەدا بەرەو هەنگاوی کاروانی پێشڕەوە هەڵاوێژم و پێی بیمە بەشداریی شەوارە و گۆزەبانەی گۆڕیەیەکی نازدار.

ڕاستییەکەی، لە دڵی خۆمدا چاوی تەمام بڕیبووە بابەتێک لەوانەی کەمتر دێنە بەرنیگای خوێنەرانەوە بەڵکو هەر ئەمێ بەخۆی تازەییەوە شیاوی یەکەم بەخێرهێنانی چلچرایەکی نوێی ئەدەبی کوردی بێ، بەڵام ڕێکەوت وەها بوو لە ڕووپەڕەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەی ئەم دواییەدا نووسینی ئەوتۆ بڵاو بوونەوە ئەگەر زوو بەزوو تێبینییان تێدا نەکرێ گژیان بەسەر دەچێ. لە هەوڵەوە ویستم چەند بابەتێکیان لێرەدا ناوکێڵ بکەمەوە بەڵام خۆم لکاند بەتێر ڕەنگکردنەوەی دوو بابەتی سەیهاتبوویەوەی ڕەخنە لێگیراو کە پێوەندیی هاوبەشایەتیم بەیەکیانەوە هەیە و هاوەنی ئەو دیکەیانم. لە هەردوو کارێشدا مەبەستی سەرەکیم ڕوونکردنەوەیە نەک لەسەرخۆکردنەوە.

i

لە ژمارە یەکەم و دووەمی (کاروان)دا دوو بەشی گوتاری مامۆستا ڕەئووف ئالانی لە

ژێر سەرەناوی (تێرخاندنێك) و (تێرخاندنێك دەربارەی زاراوە زانستییەكان) بڵاو بووەتەوە لەگەڵ بەڵێنی دەرچوونی بەشی دیكەشی. هەرچەند وەها پەسەند دەكرێ كە دوای بڵاوكردنەوەی سەرلەبەری بابەت قەڵەمی تێبینیی وەڵامدانەوە بكەوێتە گەڕ بەڵام ئەو بارەی منی تێدام بەبەرییەوە نییە پشووی چاوەنۆڕیی تێدا درێژ بكەمەوە هەر نەبێ لەبەرئەوەی كە بەزەحمەت دەستم دەگاتە چاپەمەنی. ئەو دوو دانەیەش لە گۆڤاری كاروان بە رێكەوت تێیان هەڵتەنگووتم جا ئەگەر ژمارەی دیكەی لێ چاپ كرابێ تا ئێستا ١٥/٢/١٩٨٣ بە من نەگەیشتووە ئەمە لە لایێكەوە، لە لای دیكەشەوە بەهەویا نیم لە ئاست رەخنەكانی مامۆستا ئالانیدا خۆم دانووسێنم لە هەرچی دەیڵێت و جوابەجێیی لەگەڵ بكەم. هەم لەبەرئەوەی كە كاری وەها لە رادەبەدەر درێژخایێنە و هەم لە رووی ئەوەوە كە زاراوەكان لە سەرەتاوە بۆ رەخنە لێگرتن و عەیب برینیان بڵاو كرانەوە بەو پێیە نووسینەكەی مامۆستا ئالانی وەرگرتنەوەی خوایشتی لیژنەی ئەو زاراوانەیە و سپاسی بۆ دەچێتەوە لێرەدا من تەنها بەسەر ئەو شتانەدا دێمەوە كە تروسكەی زاراوسازی و زمانناسی لە هەڵگێر و وەرگێریان هەڵستێنێتەوە، ئەویش بایی دەسەڵاتێكی لە بارەدا بێت.

١- لەبارەی (شێوە - ڕواڵەت - وێنە)وە:

وەك من بۆی دەچم وشەی شێوە پتر لە (وێنە - ڕواڵەت) هۆگری (بابەت) دەبێت چونكە (ڕواڵەت) ڕووكەشێكی بێ بایەخە (وێنە)ش بەلای شكڵی ناو ئاوێنە و كامێرادا دەچێتەوە. form ی ڕۆژاواییش نەڕواڵەتە و نەوێنە. ئینجا ئەگەر ئێو هێندەی (ڕواڵەت و شێوە) چاوپۆشی لە كەرتی دووەمی زاراوەكە بكەین ئەوسا (شێوەبەروەرایەتی) گەلێك بەولای (ڕواڵەتایەتی و ڕواڵەتی) واتای (خۆ پێوەبەستنەوە) دەگەیەنێ كە لە ئەسڵی زاراوەكەدا مەبەستێكی بنەڕەتییە.

٢- لە كوردیدا تەعبیری (پێت بەهێت) بەتایبەتی لە نێو مەلایاندا هێندەی دەقاودەق و پتریش لە باو بوو، هەردووكیان بۆ یەك واتاش بەكار دەهاتن ئینجا هەر كامێكیان پەسەند بكرێ جێی خۆیەتی بەڵام نابێ ڕێگە لەوی دیكە كوێر بكاتەوە.

٣- وشەی (ڕارەو) هەر چونكە لە واتادا بەرتەسكترە لە (ڕێگا - ڕێباز) پتر دێتە ڕەدابێ بۆ واتای (مذهب فلسفي) كە ئەویش بۆ خۆی بارێكە ڕێگەیە.

٤- لەگەڵ ڕوونكردنەوەی مامۆستا ئالانیش من هەر لایەنگیری (گومانگر) دەبم نەك

(گومـانـدار). چـی لیـژنـەش لـە بـارەی تێکڕای ئـەم خـاڵـەی گـوتـووە پێوانـەی زمـانـنـاسـانـەی تێدا کـراوە. (تـێـپـەڕ و تێنـەپـەڕ) لێرەدا بێ دەخلـە. کـەرتـی دوای (گومان)یش چ (گر) بێت و چ (دار) هەردوویان تێپەڕن هەروەك دەگوترێ باجگر دەشگوترێ پارەدار و ملکدار و زەویدار و بەرهەمگدار.. ئەم پاشگرەی (دار) لە (دارشتن - داشتەن)ی فارسییەوە هاتووە کە (مضارع)ەکەی دەبێتە (دارد) و ناوی کارای لێ پێك دێت و دەبێتە (..دار). ئەو مەبەستەی کە لە واتای (متشکك)دا هەیە لەگەڵ (گرتن) باشتر دەڕوا نەك لەگەڵ (تملك) کە دەکاتەوە (داشتەن - دارەد - دار) چونکە لە (گرتن)دا (نیاز) ئاشکراترە.

٥- لیژنە لە پەسەندکردنی ئەداتی (ەکی) بۆ نیسبەت نەیویست لە هەموو بارێکدا بۆ هـەمـوو زاراوەیـەك هـەر (ەکـی) بـەکـار بـێت چـونـکـە دیـارە (ی)ی نـیسبـەت هـی بەلاوەنان نییە. تەعبیری (خۆ لێدزینەوەش) هەر لایەنی ناچاری ڕادەگەیەنێ، دیارە ئەگەر (ی)ی نیسبەت بۆ هەموو وشەیەکی دەست دابایە ئەلیژنە خۆی لێ دەدزییەوە ئەکوردەواریش زمانی لە (لاوەکی، شەوەکی..) دەگێڕا. کەس نالێ و نەیگوتووە (کوردی، بەهاری، خۆمالی..) دەبێ ڕەش بـبـنـەوە. بـەلام بێگومـان ڕستەی (ئەم کێشەیە هۆشەکییە نەك کردەکی) هەڵکەوتووترە لە ڕستەی (ئەم کێشەیە هۆشییە نەك کردی وەیا کردنی). تا ئێرە جوداوازیی بیروڕا لەم مەیدانەی نیسبەترا دەگەڕێتەوە بۆ قەناعەتی زمانناس و زاراوەساز چونکە هەردوو ڕێباز شوێن پێی ئاخێوەری پێوەیە. بەلام وا دیارە مامۆستا ئالانی (ی)ی نیسبەت و (ی)ی نـاوی مـەعـنـای بـەلاوە پـێك شێن. ئا لێرەدا قەناعەت بڕ ناکات چونکە هەروەك لە ڕێی قەناعەتەوە (تێپەڕ) نابێتە (تێنەپەڕ) هەروەهاش (ی)ی نیسبەت نابێتە (ی)ی ناوی مەعنا. دەبێ کاکە ئالانی بەرەودوا بگەڕێتەوە و بەنێوان دوو ڕاستەڕێی ئەو دوو بـابـەتـەدا سەرەژێر بێتەوە بێ ئەوەی تێکەڵیـان بکـات. خۆ هەرگیز موجامەلەش لەوەدا نییە کە بڵێم ئالانی یەکێکە لە تاك تاکی ئاخێوەری کوردی لە سەلیقەی هەستیاری زگماك و بێ هەوشەوە کوردانە دادەڕێژێتە گوتن و نووسین، کوردانە لە بابەت هەڵدەهێنجێت و کوردانە دادەبڕێت و تێ دەکاتەوە ئینجا ئەگەر ئالانی لەم جووت چاویلکەی بەریانی ڕێزمان بازنەی تەڕ بووبێ کێ بێ جارەها و بارەها پێلاوی لە دەقی نووسین ڕوو نەچووبێ.

لە ئاخاوتن و نووسینی ئێستاکەی فارسی و کوردیدا بۆ نیسبەت و بۆ ناوی مەعنا

هەمان (ی)ی درێژی قووچاو بەکار دێت و دەگوترێ – بۆ نیسبەت دەشگوترێ (جوانی – بۆ ناوی مەعنا) لە کۆندا بۆ نیسبەت (یك) و بۆ ناوی مەعنا (یە) بەکار هاتووە. کتێبە کۆنەکانی پەهلەوی و پێش پەهلەوی ئەم جوداپێکردنەیان شتێکی دەستوورییە. بە نموونە لە لاپەڕە (١٠)ی کتێبی کارنامەی ئەردەشێری پاپەکان – نووسینی بهرام فرەوشی، چاپی تاران ١٣٥٤ – ئەم وشانەی (چاپوکیە، «سواری») لە ناوی مەعنا و وشەکانی (گەرامیك «گرامی، ڕێزدار»، ئەباریك «بە واتای دیگر، هی تر»، ئامیك «نامی، ناودار») لە نیسبەتدراو دەدیترێن. لە نێوان ڕۆشنبیرانی کوردی ئێرانیش ئەم زانیارییە وەك ئەلفوبێی لێ هاتووە بەڵام لای خۆمان مەسەلەکە هێندە ئاشکرا نییە. یەکەم جار لەلایەن د. فارووق عومەر سدیقەوە، کە ئەوسا جاری خوێندکاریش بوو، باسی بنەچەکی ئەم دوو (ی)ە بەگوتار لە گۆڤاری کۆڕدا بڵاو کرایەوە. بە نموونە وشەی (زندیق، زەندیك) نیسبەتە بۆ لای (زەند). دوور نابینم ڕێژەی (دەرەکی، ناوەکی..)ش لەو وشانەدا پاشماوەیەکی شێواوی ئەم نیسبەتە کۆنەی زمانە ئێرانییەکان بێت هەرچەند ناتوانم بڕیاری لەسەر بدەم چونکە زمانی کوردی بەنووسین شێوە ئاخاوتن کۆنی نەپارێزراوە تاکو بزانین لە کەنگێنەوە ئەو ڕێژەیە پەیدا بووە و ئایا لە بنەڕەتەوە (ەکی) بووە یاخود لە (یك)ەوە گۆڕاوە. نموونەکانی مامۆستا ئالانی کە لە لاپەڕە (٧٢،٧١)ی ژمارەی یەکەمی کاروانڕدا بۆ نیسبەتی حیساب کردوون بەشی زۆریان هی ناوی مەعنان. وشەکانی (برایی، هاوبەشی، وشەسازی، داماوی، سەپانی، کەڵەگایی، هەرزەکاری، جودایی، لاوی، گەنجی، ئازایی، ئازایەتی، لاوێتی، گەنجێتی) هەموویان ناوی مەعنان و پێوەندییان بەنیسبەتەوە نییە لەبەرئەمە ڕەخنەیەکی لەسەر بنەمای ئەو وشانەوە هەڵستاین بەرەو بۆشایی دەڕۆن.

وا دەزانم بەکارهێنانی (ەکی) بۆ نیسبەت لە شوێن و باری ئاستەنگدا نووسەر و ئاخێوەر ڕەها دەکات بەنموونە:

تێر بۆ شەمان

تێری بۆ شێخ

ئێنجا ئەگەر ویستمان بڵێین (شەمانی) و ئەو (ی)ەمان بۆ بەکار هێنا هەر دەبێ بڵێین (تێری) کە بۆ (شێخ)مان دانا کە ئیتر لەگەڵ (شێمانی)دا تێکەڵ دەبێ بەڵام دەتوانین تا ڕادەیەك چاوپۆشی لەو لەمپەرە بکەین چونکە لە هەموو زمانێکدا وشەی واتا جودا دەگەڕێتەوە یەك فۆرم هەروەك لە عەرەبیدا وشەی (أری – فعل مضارع للمفرد

المتكلم) دهگاتەوە (أری – فعل ماضی للمفرد الغائب). لەمەڕی گەورەی لەوەدا دەبێ کە بمانەوێ ڕێژەی نیسبەت بۆ (تێری – بە واتای شبع) بەکار بهێنین و (ی)ی تێدا بخەینە گەڕ کە هەر دەبێتەوە (تێری). ئینجا ئەگەر هاتا بیەینە بەر (ەکی) لەمەڕ لە ئێواندا نامێنێ.

تێر بۆ شبعان

تێری بۆ شبع

تێرەکی بۆ شبعانێ

تێرەکیەتی بۆ شبعێ

خۆ ئەگەر ویستمان (شبعانی – تێرەکی) کە ناوی مادیە بکەینە ناوی مەعنا ئەوسا بەرانبەر (الشبعانیة – کە مصدری صناعییە و ناوی مەعنایە) دەڵێین (تێرەکیەتی) برواش ناکەم دەرفەتێکی دیکە لە دەستووراتی زماندا پەیدا ببێ بۆ دەربازبوون لەم ناستەنگە. ئەو وشانەی کۆتاییان بە (ی)ی درێژی قووچاو دێت وەك (برسی، ترۆزی، سۆفی) ناتوانن (ی)ی نیسبەت بەخۆیانەوە بگرن، ناشبێ خەیاڵ بۆ (برسییانە، ترۆزییانە، سۆفییانە) بروات چونکە ئەمانە ناوەڵکارن، هەرچی وشەی نیسبەتدراوە ناوەڵناوە. ئینجا ئەگەر ئەڵێین (برسییەکی، ترۆزییەکی، سۆفییەکی..) ڕێگەی کورتمان لێ درێژ دەبێتەوە وەیا هەر بە جارێ ڕێگەکە کوێر دەبێتەوە.

لە زۆر شوێنی کوردزماندا ئەگەر ناوی جێگە و ناوایی وەك (جەلی، داری کەلی، سلێمانی) بە (ی) کۆتایی هاتبێت بۆ نیسبەت دەڵێن (جەلییەتی، داری کەلییەتی، سلێمانییەتی) واش دەبێ کورتی دەکەنەوە و دەڵێن (جەلەتی..). ئەم بەکارهێنانە تا ئێستاکەش باوە و بۆ خۆم گوێبیستی بووم بەلام خەریکە لە بن شالاوی شارستانەتی و خوێندنی ئێستدا کەوا گەلێك نادگاری میراتی تێ دەچێت، ئەمیشیان تێ بچێت. باوەڕ دەکەم لەو گوندانەی قوتابخانەیان تێدا کراوەتەوە تەنها بەساڵداچووەکان بزانن بڵێن (سەرووکانییەتی، جیاقوولییەتی..) هەرچی وەچەی تازەیە خەریکە (دار، دوور، زار، زیر) فێر دەبێ و بەلای ئەو وشانەدا ناچێتەوە کە مامۆستاکەی لێیان بەڵەد نییە.

لە کوردیدا (ی)ی ناوی مەعنا هەر بەو وشانە دەوێری بپانکاتە ناوی مەعنا کە ناوەڵناون و وەسفی مادە دەکەن نەك خۆیان مادەن. وەك: جوان، جوانی – شیرن، شیرنی – ناسك، ناسکی – دزێو، دزێوی.. زمانی کوردی وێڕای (ی) سێ ئەداتی

دیکەی هەیە بۆ دارشتنی ناوی مەعنا.

١- ئەداتی (ەتی) وەك: پیاو، پیاوەتی – دایك، دایکەتی – برسی، برسیەتی.

٢- ئەداتی (ایی) ئەمەیان بۆ مەبەستێکی ورد لەکار دێت. بەنموونە، وشەی (درێژی) بۆ (مطلق الطول) دێت بەلام کە ویستت (هەندێك طول) ئەك (مطلق الطول) دەربببڕیت دەڵێیت (درێژاییی) ژوورەکە، شیرناییی شەکرەکە، رووناکاییی پەنجەرە، بەرزاییی شاخەکە، سەوزاییی گیاکە).

٣- ئەداتی (ایەتی) بە زۆری بۆ دەرخستنی پێوەندیی نێوان مرۆڤ بەکار دێت وەك (خزمایەتی، دوژمنایەتی، دۆستایەتی، کوردایەتی، قەومایەتی، مەردایەتی، کەسایەتی، رابەرایەتی، عەبدایەتی..). هەر ئەم ئەداتەیشە دەتوانێ ناوی مادی رەق و زەقی بە پێز وەرگێڕی بۆ ناوی واتا وەك (بەردایەتی – التحجر، الحجریة، گەچایەتی، الجبریة، خۆلایەتی، ئاسنایەتی..)

زۆرینەی ئەو وشانەی دەنگی ئەلفیان تێدایە وەك (برا، گەدا) ئەلفی (ایەتی)یان دەسووێت و دەبنە (برایەتی – نەك برایایەتی – گەدایەتی نەك گەدایایەتی. ) لە شوێنێ دیکە دەمێکە ئەم دیاردەیەی تێچوونی ئەو ئەلفەم روون کردووەتەوە لێرەدا ناچمەوە سەری..

نووسەرانی سلێمانی بەپێی ئاخاوتنی ناوچەیی لە جیاتی (برسیەتی، ئەمیندارییەتی، ئیتالییەکان..) دەنووسن (برسێتی، ئەمینداریێتی، ئیتالێکان..) هەرچی زۆربەی کوردە جۆرەکەی دیکە کە بەکارهێنانی رەسەنە پەیڕەوی دەکەن، رەسەنایەتیی ئەو جۆرەیان لە دوو بەڵگەوە بەئیسپات دەگات: بەڵگەی یەکەم ئەوەیە کە زۆرینەی هەرە زۆری کورد دەڵێ (برسییەتی، وەلییەتی..) بەڵگەی دووەم ئەوەیە کە ئاخێوەری سلێمانیش لە ناچاریدا بادەداتەوە بۆ رێبازە رەسەنەکە کە مەجبوورە بڵێ (ئیتاڵییە هونەرمەندەکان). چارت ناچارە بڵێی (برسییە هەزارەکان) مامۆستا ئالانیش بە رێبازی ئاخێوەری سلێمانی بۆ (لاوێتی، گەنجێتی..) چووەتەوە هەر چۆنێك بێ ناشێ رێبازە رەسەنەکە رێی لێ بگیرێ، تەنانەت لە وشەی وەك (رۆشت، گەشت)یشدا ناشێ (رۆیشت، گەیشت) کە راسترە کوێر بکرێتەوە. بێخود دەڵێ (لەو رۆژەوە رۆیشتووە تۆراوە دڵی من). نالی دەڵێ (کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتووت) حاجی دەڵێ (کە پیر بووم تێ گەیشتم دەستی گرتم). ئەدیب لەسەریەتی لەمانە و لە هەرچی

وەك ئەمانە هەیە خۆی لە ڕێبازە ڕەسەنەكەی كوردی ڕابهێنێ. ئێمە لە سەرەتاكانی ڕەنگوڕێژكردنی شێوازی ئەدەبیی كوردیداین، چی ئێستاكە ڕەگ دابكوتێ دەبێتە شەقامڕێی تەعبیری كوردی. ئەو زەمانەی شێوەی ئەدەبیمان دەقی گرتووە لە ماوەی ٥٠ ساڵدا یەك پێتیان لێ ناسووێ و ناقرتێ. كورتكردنەوەی بێ حیساب لە شێوە ناخاوتنی ڕەمەكیدا دەبێ تا ئەوەی خەڵقی تووش لە ناخاوتنی یەمەن ناگەن، سنەیەش زەفەر بەوتووێژی ناكرێ نابات. چەندێكی بلوێ لە پاشماوەی كۆنە زمانەكەمان بهارێزرێ سوودی خۆمانە چونكە هەتا بەرەو دەق و دەستووری ڕەسەنەوە بڕۆین پتر خەڵقی تێدا كۆ دەبێتەوە و لە یەكدی حاڵی دەبن. كوردی لەو دوو هەزار ساڵەدا هێندەی لێ سوواوە لە لزووم بەدەر بێ.

بەر لەوەی لە بەشی یەكەمی گوتارەكە بڕۆم بۆ بەشی دووەمی چەند وردە تێبینی هەن پێیاندا تێپەڕ ببم:

كەرتەكاری (گر) و پاشگری (گەر – بووەتەوە «گر») لە یەكدی جودان: هەرچی (گر)ە كەرتێكی كاری (گرتن)ە و ناوی كارای لێكدراو (بەتەعبیری جاران اسم فاعلی مركب) دروست دەكات وەكو كەرتی زۆربەی كارەكانی دیكە (چلشۆر، نانخۆر، باجگر، سەرتاش). بەعادەت كاری تێنەپەڕ لەگەڵ وشەی (صفە) و لەگەڵ ناوەڵكاردا لێكدراوی ئەوتۆیی دروست دەكات چونكە بەركاری ناوێت وەك (خۆشڕۆ، سەرەڕۆ، بەسەرهات، زۆردەڕ..) هەرچی (گەر – لە بەشی زۆری وشە لێكدراوی ئێستاكەدا بووەتەوە «گر») بارتەقای (ەوان) لەگەڵ ناو دێت و سیفەتی لێكدراو دەكاتە ناوی كەسابەت وەك (ئاسنگر، مزگر – دەرگەوان، پاسەوان).

لە وشەی (نێرگە پەیاز)دا بەشی یەكەمی وشەكە لە (نێرەك)ەوە نەهاتووە بەڵكو لە (نێرەك)ەوە سوواوە. بە ئەسڵ (نێرتكە پیاز و دەستكە قوڕادە) بووە. ئێستاش لە هەندێ ناوچەی عەشیرەتیدا پیرەكان، بگرە زۆر كەسیان (نێرتك و دەستك) بەكار دەهێنن، هەروەك وشەی (قەنەنە)ش دەكەنەوە (قەڵنە) كە پتر بەرەو (قەلوون و قلیان)ەوە چووەتەوە.

وشەی (ڕێژە) بۆ (صیغە) دەست دەدات وەك (ڕێژگە)، هەرچی (ڕێژگە)یە وەك (ئێستگە، بنگە، شەرگە..) ناوی شوێنە (نەك ناوەڵناوی شوێن). وشەكەش لە (ڕێشتن)ەوە بەربووەتەوە كە بە هەڵە وەیا بۆ سووككردن دەكرێتە (ڕشتن) بەڵكەش

ئەوەیە کە لە ئاینده و فەرماندا ئەو (ی)ە دێتەوە.

ئاوەکەم ڕێشت
ئاوەکە نەڕێژم
ئاوەکە بڕێژە

(ڕێژە و بێژە)ش هەر بەڵگەن.

لە وشەی (کەڵەمێرد)دا ئەو (ە)یە کە فەتحەی عەرەبییە نێوبەند نییە. دەنگێك دەبێتە نێوبەند (ئاوگر) کە بترنجێتە کلێشەی وشەوە نەك بهێتە نێوان دوو وشەوە. بە نموونە لە وشەکانی (بزووتن، بزاوتن - بووردن، بواردن) ئەو ئەلفە نێوبەند (ئاوگر)ە. بەلای منەوە دەنگی (ر)یش لە (گرنج)دا ئاوگرە ترنجاوەتە کلێشەی (گنج) هەروەها (ر)ی (قرژ) چووەتە ناو (قژ).

دەرۆم بۆ ژمارە دووی کاروان:

کاتی خۆی کە رەخنەکانی مامۆستا ئالانی بۆ کۆڕی زانیاریی کورد هاتن گەرماوگەرم لیژنەیەك - بەسەرپەرشتیکردنی خۆم دەستی دایە ڕێکخستن و ئامادەکردنی ئەو ڕەخنانە و هی دیکەش کە لە نووسەری دیکەوە هاتبوون و بۆ بڵاوکردنەوەیان. وێڕای ئەو ڕەخنانە ئالانی، ڕاسپاردەی بەنرخی دیکەشی بۆ کۆڕ جێبەجێ کردبوو لە بابەتی فۆلکلۆر و کەلەپوور. خەریکی ڕێکخستنی ئەوانیش بووین بەلام ڕێکەوت وەها بوو بەر لە سازدانی ئەو کارانە پێوەندیم بە کۆڕەوە نەما، زۆریشی نەبرد پاسای تازە دەرچوو، (دەستەی کوردی) خستە شوێنی کۆڕ و ئەو بووە بەرپرس. دەمەوێ زۆر بەخێرایی لە بەشی دووەمی نووسینی مامۆستا ئالانی دەرچو، بۆ هەر مەبەستێك بێ (قسە ڕستنەوە) بەجێترە لە (قسە کاوێژکردنەوە). ڕەنگە (هاوبەندی)ش لە (هاوبەنگی) بۆ (ترابط) لەبارتر بێ ئەگەر ئارەمایی (هاونیری) بۆ خۆی نەهانەوە.

(ژیربێژی) بۆ هونەر وەها زانستی (منطق) و (ژیربێژ) بۆ کەسێکی (منطق زان) بێ و (ژیربێژەکی) بۆ نیسبەتێ وەلای (ژیربێژ) و (ژیربێژییەکی) بۆ نیسبەت وەلای (ژیربێژی) کرە ناکەن، هەرچی (ژیربێژانە)یە ئاوەڵکارە وەك بڵێی: ژیربێژانە دەدوێ، کوردانە دەپۆشێ، مەردانە هاتە کایەوە. وشەکان لەم ڕستانەدا وەسفی کار دەکەن نەك کارا (فاعل).

ئەگەر (پۆلاندن) بۆ تەسنیف ببێتە دەستووری داتاشینی (کار) لە (ناو) خزمەتێکی

گەورە بە زمانەکەمان دەگات هەرچەند لە پۆلاندنیشدا هەر واتای کۆ و کۆمەڵ و ناپۆرە وەردەگیرێ نەک واتای (جۆرجۆر و خوارووژوور) کە لە (صنف)ی عەرەبی classـی ئینگلیزی وەردەگیرێ. بەلام لزووم نابینم بیمی پێوە بنێین و و بڵێین (کابرا چەتری لێ دا و خۆی عەلیشیشاند..) مەگەر بە نیازی گەپ و گاڵتەکردن بێ.

وشەی (ڕەخسکان) لە ئاخاوتندا باوە هەرچەند لە هەموو فەرهەنگێکیشدا ناشنا نەبێ. ئەم نەبیستبوونەی ئەدیبەکانمان کە دەچێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەتایی، یەکیان نەگەڕان و سەر لێنەدان. دووەمیان نەبوونی چاپەمەنی لە هەموو هەرێمەکاندا، تا ئەم نەبیستبوونە زۆر جاران دەمەتەقەی هەڵستاندووە تەنانەت جارێکیان نووسەرێکی سەر بەزمان لە ئاست وشەی (چیم) بەواتای (فریز - فریزوو) وەها ئەسڵمێن بوو هەر لە بنەوە ئینکاری هەبوونی دەکرد. کەچی فریزجار بەواتای چیمجارە. ئەو پێمەڕەیەی بۆ کێڵانی زەویی چیمجار دروست دەکرێ پێی دەڵێن (پێمەڕەی چیمبڕ). نووسەرێکی دیکەش بەرانبەر وشەی (ڕایەخ) سەری لەو (ی)ەی ناو وشەکە سوڕمابوو، بەدرێژی لە تەعلیلی پەرینەوەی پیتیەکە بۆ ناو وشەکەی دەکۆڵییەوە چونکە هەر گوێبیستی (ڕاخستن، هەڵخستن، خستن..) بووبوو کەچی فۆرمی وشەکە (پەخستن، پێخستن، نێخستن، هێخستن)ە لە هەموویشیاندا دەنگی (ی) هەیە کە ئیتر دیارە (ڕایەخ) لەوان کەوتووەتەوە. گۆرانیبێژی کۆیی (حوسێنی حەمەتۆز) بەر لە ٥٠ ساڵ پتر قەوانی دەرکرد دەڵێ (هات کاروانێ کەرداران، پێخستیان لە بن داران، لێیدەن دەردی هەڵۆکێ..). وشەی (تێ وەرێخ) لە دوو پێشگری (تێ، وەر) و کەرتێکی بەرایی (پەخستی) پێک هاتووە هەر لەو جۆرەی گوێبیست نەبوونە جارێکیان دوو فەرهەنگنووسی کوردی لە وشەی (فروسمان) کە من لە نووسینمدا بەکارم هێنابوو رامان و نەیانبیستوو کەچی لە زۆر شوێنی بەری سۆران بە واتای (نەخسوون لێ خوێندن، تڵەسم بەندکردن) لە گەڕدایە. یەک لەو دوو فەرهەنگنووسە (زەبیحی) دواتر پێمی گوتەوە کە توێژینەوەی لە وشەکەدا کردووە لە خەڵقی باڵەکایەتی بیستووە لە جیاتی فروسمان دەڵێن (فلیسمان). وا دیارە وشەی (ڕەخسکان)یش بۆی ڕێک نەکەوتووە بەر گوێگری بەری بابان کەوتبێ. دەنگی (ک) لە وشەسازیی کوردیدا دەورێکی چالاکی هەیە لێرەدا کارمان بەیەک باری ئەو دەورە هەیە کە دەبێتە پاشگری کار و زێدە واتایەکی تێدا پەیدا دەکات. پاشگری (کا) لە چاو پاشگری (ا) هەستوخۆڵییەک وەها شێوەگۆڕییەک لە وشەدا پەیدا دەکات. بە نموونە، لە ڕەگی

(بزر)ەوە بە هۆی پاشگری (ا) کاری (بزران) پەیدا دەبێ. کە پاشگری (کا)ی پێوە لکا دەبێتە (بزرکان) شێوەیەکی نوێ بۆ (بزرکاو) پەیدا دەکات لە چاو (بزراو). وشەی (پەشێو) دەبێتە (پەشێوان) و دەشبێتە (پەشێوکان) کە سەختترە لە پەشێوان. هەر خۆشیەتی بووەتە (پەشۆکان). دوور نابینم (هەڵبڕوان) و (هەڵبڕووکان)یش دوو دڵۆپی ئەم خورگەیە بن. نووزانەوە بنگەی وشەی (نووسکانەوە)یە بەڵام دەنگی (ز) بەجیرانەتیی دەنگی (ك) بووەتە (س) چونکە هەردووکیان واتە (س، ك) دەنگی کپن هەرچی (ز)ە ئاوازەدارە لەبەر خاتری (ك)ەکە خۆی کپ کردووە وەك کە وشەی (نازك) کە لە (ناز)ەوە هاتووە بووەتە (ناسك) لەبەر هەمان سەبەب. (بازوو)ش بووەتە (باسك). هەرچی وشەی (ڕەمسکان)ە خزمی نزیکی (ڕەخسان)ە و هەردوویان لە واتادا بە (ڕەخسین و ڕەسین) دەگەنەوە. بەڵام لە (ڕەمسکان)دا زێد هێزێك هەیە ئەگەر (کۆگر) بە (جامع) وەربگیرێ (کۆتەگر) نابێتە (مانع)، دەبێتە ئەو شتەی هەندێکان دەگرێ و هەندێکان ناگرێ. بۆ ئەوەی ببێتە پێچەوانەی (کۆگر) دەبێ بگوترێ (هیچنەگر) ئەوساش (هەمووگر) پەسەندتر دەبێ لە (کۆگر). بەڵام (هیچنەگر) هەر لە بەرانبەر (کۆگر، هەمووگر)دا دەسازێ نەخۆ (مانع) (هیچنەگر) نییە.

لە کۆتایی ئەم پێداچوونەوەیەدا دڵێم ماندووبوونەکەی ئالانی جێی سپاسە و دەبێ بەویەڕی هەناسەدرێژییەوە لەگەڵ زاراوەکاندا خەریك بێ. منیش ئەگەر چاوم بە نووسینەکانی کەوت و بەچاکم زانی پێیاندا بچمەوە تا پێم بکرێ تێبینییەکانم بۆ خۆی دەنێرم بەمەرجێك ئەدرەسی بزانم. زۆریش گوشاد دەبم هەر جارەکە دەبینم نووسەران لەو زاراوانە وشە وەردەگرن و بەکاری دەهێنن، وەك بڵێ حەسانەوەی ئەو باغەوانە هەست پێ دەکەم کە دەبینێ ئەمامەکەی شین بووە و بەریشی گرتووە.

## ب

لە (العراق)ی (٩)ی شوباتی ١٩٨٣، لە ژێر سەرمناوی (وێنەی هونەری لە شیعری حاجی قادری کۆیەدا) مامۆستا عەبدوڕەزاق بیمار بەدوا شیکردنەوەی چەند نموونەیەك لە نیگارکێشیی هەستیارانەی بەهارییەکەی حاجی دەنووسێ: «جا لەم ڕووەوە وتەکەی مامۆستا دانەری کتێبی (چەپکێك لە گوڵزاری نالی) بە ئاسانی ڕەت دەکرێتەوە کە لە لاپەڕە ١٩٩دا گوتوویەتی:

«یادی گوتەیێکی تری (دڵدار) دەکەمەوە کە دەیگوت حاجی قادر لە بەهارییەکەیدا

شوێنپێی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم)ی نالیی هەڵگرتووەتەوە و ئەوسا من ئەمەم لە دڵدار نەدەسەلماند کە چی ئێستا وەک بەدیهییە ئاشکرایە لەبەرچاوم چی دڵدار دەیگوت ڕاستە».

چونکە دانەری ئەو کتێبە منم پێویست بوو لێرەدا ئەختێک ڕووناکایی بۆ لای ئەو شوێن پێ هەڵگرتنەوەیە و ڕەنگدانەوەکەی بهاوێژم.

دەبێ لە پێشەوە بڵێم شوێن پێ هەڵگرتنەوەی نالی لەلایەن حاجی قادرەوە ئەکەمایەتیی تێدایە ئەبلەماتێکیشە لە کەس بەعەیب بگیرێ. لە نێوان شاعیرانی کورددا وێڕای شوێن پێ هەڵگرتنەوە (تضمین وقتباس)یش بەرچاو دەکەوێ کە پتر لە نزیکەوە خوولیای شاعیر بە غەیری خۆیەوە دەلکێنێ. نالی کە دەڵێ:

نـاری سینـەم گـەر نـەبێ غـەرقم ئەمن
نـاوی چـاوم گـەر نـەبێ سووتـاوم ئەز

یەکسەر واتاخوازیی لەم بەیتەی (ابن الفارض) کردووە:

فلولا زفیري اغرقتني ادمعي
ولولا دموعي احرقتني زفرتي

بەلام نالی مەهارەتێکی تێدا بەکار هێناوە وا بزانم لەو کتێبەی (چەپکێک..)دا ڕوون کراوەتەوە. جارێکیان باسی ئەم ئیقتیباسەم بۆ (بلە) کرد. لە پێشەوە نەیسەلماند بەلام کە گوتم ناشێ نالی شیعری تەسەوفی وەها.. قسەکەی پێ بڕیمەوە و گوتی کە تەسەوفت ناو هێنا سەلماندم.

حاجی قادر دەڵێ:

بە (تضمین) بەیتەکی نالی دەهێنم تا ڕەفیقانم
بزانن من بە ئەو نابم هەرزەف قەت وەک گەوهەر نابێ
«کەمەندی زولفی دوو لانە لەبۆ گەبر و موسڵمانە
دەکێشن بێ محابانە چ لە ملابێ چ لەولابێ»

پێنج خشتەکی لەلایەن کورد و غەیری کوردەوە جۆرێکە لە تێک ئالانی دەروونی و پوالێتی شاعیر و شاعیر..

(تلمیح)یش هەر لەم بابەتانەیە.

ئەمانە هەمووی لە نێوان کورددا باو بوون بەڵام ئەوەی پێی دەگوترێ (معارضە) لە کوردەواریدا بەرچاو ناکەوێ، هەر نەبێ من نەمدیتوە بەڵام وا بووە دوو شاعیر هەمان پارچە هەڵبەستیان لە شیعری بێگانەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی وەك كە بێکەس و گۆران کردیان. دەشبێ ئەم بابەتانە تێکڕایان خۆ ناقیکردنەوە و خۆ بە خەڵك گرتن و خۆ نواندنیان تێدایە هەرچەند ئەم نیازانەش ڕێ لە هەڵچوونی عاتیفە ناگرن، بگرە وەها بووە لە پێنج خشتەکیی سەرکەوتوودا سۆزی شاعیری دووەم سەر دەکات كە بەناهەنگی سەد لە سەدی شاعیری یەکەم دەدوێت:

دڵــی بـردم بـەنــاز و عـیشوە دیسان شۆخـی عـەیـیـاری
فریبی دام بە چاوی مەستی خۆی مەحبووبی سەححاری
لـە هـیـجرانـی ئـەڤـم کرد ئـەی ڕەفیقـان کوا مەدەدکاری
ئـەمـان مـردم عـەلاجێ سا لـە ڕێی پێغـەمـبەرا چـاری
وصـال یا قتل یا تەسکین لە هەر سێ بۆم بکەن کاری

سەرلەبەری دیوانی شێخ ڕەزا تاکە یەك غەزەلی تێدا بۆ سۆزی دڵداری تای ئەم پێنج خشتەکییەی کردبێتەوە کە لە بڵێسەی کوردییەوە ئاگری تێ بەربووە (معارضە) بەو شیعرە دەڵێن کە لە کێش و قافیەی شیعری بەر لە خۆی هەڵبەسترابێ وەك كە ئەحمەد شەوقی موعارەزەی قەسیدەی ئیبن زەیدوون:

أضحى التنائي بديلا من تدانينا
و ناب عن طيب لقيانا تجافينا

دەکات و دەڵێت:

يـا نـائـح الطلـح اشبـاه عواديـنـا
نـأسى لواديك أم تشجـى لوادينـا

ئەگەر بەهارییەکەی حاجی لە کێش و قافیەی قەسیدەکەی نالی بایە پێی دەگوترا (معارضە). لەلایەن کێشەوە هەردوویان لە یەکدی نزیکن تا ئەوەی هەندێ شاعیریش فەرقی پێ ناکەن، بەشێکی بەرچاوی (مصدر) وەیا (عجز)ەکانی بەهارییەکەش وەك دیرە شیعرەکانی نالی دەبنە ١٤ برگە بە نموونە (لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا) ١٤ برگەییە صەدرەکەش ١٥ برگەییە.

لەم بوارەدا دەبێ ڕاستییەکی گرنگی دیکەش ڕوونکەرەوەی شوێن هەنگاومان بێ،

داسەپاندنی بڕیاری (نییە) پتر موحتاجی بەڵگەیە لە (هەیە) چونکە مەبەستی (هەیە) بە تاکە یەك بەڵگە ئیسپات دەکرێ وەك ئەوەی گوێت لە خشەیەك بوو و دەنگت دا (کێیە؟) بە تاکە وەڵامی (منم) دەزانرێ خشەی بەنیادەمە بەڵام کە وەڵامێکت وەرنەگرتەوە جەوالێك بەڵگەت دەوێ تا ئیسپاتی (بەنیادەم نەبوون)ی خشەدارەکە دەکەیت، ڕەنگە یەك بەڵگەشت چنگ نەکەوێ. لەگەڵ ئەمەشدا بڕیاردان لەسەر هەبوونی خزمایەتی لە نێوان ئەو دوو قەسیدە بەناوبانگەدا تا ئەوەی خەیاڵ لە (شوێن پێ هەڵگرتنەوە) بکەین بەهادی هەوا ناپێ بەتایبەتی کە دەنگ و سەدای ئیعتیراز بڵند بوو، پێویستە لێرەشدا (منم)ێك بە هەمبەر بهێنین.

ئەوسا لە (چەمکێك..)دا کەس بەرهەڵست نەبوو تاکو بەڵگەکاریی تێدا بکەم، قسەشم لە دڵدارەوە دەگێڕایەوە کە ئیتر لزوومم نەدەدیت بە بەڵگە و نموونە هێنانەوە لە سیفەتی (شایەد)ەوە، ببمە داواکار.

بەڵگەی ئەم شوێن پێ هەڵگرتنەوەیە لە چەند لایەکەوە تێك دەکەنەوە. نالی شاعیرێك بووە لە سەرامەدی شاعیراتی سەدەی نۆزدەم، چ سەیر لەوەدا نییە شیعری بێتە ئەو (بەرەدەعازەبانە)یەی گەنجی لە خۆڕازی هێزی خۆی بێ تاقی بکاتەوە. ئێمە بڵێین و نەڵێین نموونەی زیندە باڵا لە هەر هونەرێکدا هەبێ دەبێتە (سەرمەشق). حاجی قادر لە چەندین جێگەدا باسی نالی و شاعیریەتیی دەکا. وەك دیتمان (تضمین)یشی لە شیعری کردبوو، لەو (تضمین)ە بەهێزتریشی هەیە کە دەڵێ:

زاهیرەن شیعرم لە کوردی و نالی زۆر کەمتر نییە
تاڵەم بەرگەشتەیە بەدبەختە بەختم نووستووە

پێم بڵێن کام شاعیری نوێخوازی کوردی لە تاووتێنی گۆران ڕەها بووە؟ ڕەهابوونی چی؟ هەرچی هەیە دەڵێ گۆران دەروازەی شیعری نوێی کوردی خستە سەر گازەرای پشت، واوەی گۆران لەم ڕۆژەدا کام شاعیر سەرەتاتکە لە شیعری شێرکۆ بێکەس ناکات؟ ئینجا ئەگەر شاعیرەکانمان لە هەڵبەستدا باسی گۆران و شێرکۆ نەکەن و لە تۆژینەوەی ئەدەبیدا ناویان بهێنن هۆ حاجی قادر لە شیعردا خۆی بۆ نالی شکاندووەتەوە، ئینجا هاتووە خۆیشی بەو (و بە کوردی) گرتووە لەمە زیاتر چیمان دەوێ بیکەین بە ڕووناکی بۆ ناو دەروونی حاجی تا شەهەنگی نالیی تێدا بدۆزینەوە؟ بە خەیاڵ لە حاجی بپرسین ئایا نالی و شیعرەکانی چ ئەسەرێکیان بووە لە ویژدانی

ئەودا دەبێ چ وەڵامێکیان بداتەوە؟ ڕەنگە پرسیارەکەمان لێ بەعەیب بگرێ چونکە خۆی بە شیعری یاتەوەیات ئەو ئەسەرەی کردووەتە بەڵگەتەویست. خۆ ئەگەر بگوترێ حاجی باسی شاعیری دیکەشی کردووە و هەڵی داوەتەوە دەڵێم.

١- باسی شاعیر و ئەدیبێکی بەقەدەر نالی نەکردووە.

٢- شیعری کەسی دیکەی بە (تضمین) نەهێناوەتەوە.

٣- لە نالی و کوردی بترازێ خۆی بەکەسی دیکە نەگرتووە.

بەدوا ئەمانەدا دەڵێم:

٤- شوێنپێی غەیری نالیی هەڵنەگرتووەتەوە.

لە فەرزی یەکێك بۆم ئیسپات بکات کە حاجی بۆ غەیری نالیش دەروون کرایەوە بوو ئەوسا کاری من ئاسانتر دەبێ چونکە بەڵگەیەکی تازەم بەدەست دەکەوێ و ژمارە (٥ -)ی دەدەمێ و دەیخەمە ڕیزی بەڵگەکانی سەروو.

وردبوونەوە لە شیعرەکانی حاجی دەری دەخات کە لە مەیدانی (نالی ئەوازی)دا حاجی بە سێ پلەدا تێ پەڕیووە. یەکەمیان ئەوە بوو گوتی (من بە ئەو نابم - وەیا ناگەم). دووەمیان ئەوە بوو گوتی (بەیتم لە کوردی و نالی زۆر کەمتر نییە). سێیەمیان ئەم بەهارییەیە کە بەهێبرکێی تێدا کردووە لەگەڵ (قوربانی تۆزی ڕێگەتم) هەتا شاعیریش شاعیر بووبێ نەیتوانیوە هێندەی بەهارییەکە ڕاستی نموونەی سەرمەشقی کردبێتەوە لەوەشدا حاجی سەد جاران ئەو نەرمە چریەچرپ و منگەیە ڕیسوا دەکات کە لە بن لێوانەوە دەڵێ حاجی لە شۆڕەتی شاعیرییەتدا قەرزداری قەومایەتییەکەیەتی مایەی شانازی حاجی و ئێمەیشە. بەڵام هەزار قەومایەتی و حەقپەرستایەتی و مەلایەتی بەسەر یەکدا کەڵەکە بکەن (بەهاری) وەها پاراو و ئاوێنگدا و ئەفسووناوی نازێن ئەگەر شاعیرایەتیی لەگەڵدا نەبێ. چارویار حاجی بە زاری خۆی دەڵێ گلەیی لە کەموکوڕیی ئەم شیعرەم مەکەن چونکە دەمەوێ (.. لەم بەند و باوە دەربچن) کەچی لە بەهارییەکەیدا لە پشت پەردەیەکی تەنکی وەقاردا ئەو هەڵبەستە دەکاتە بەڵگە بۆ زمانی کوردی کە بەلاغەتێکی هەیە هیچ زمانێ نایگاتێ. حاجی ئەو لە خۆ ڕادیتنەی ناو بەیتی (زاهیرەن شیعرم لە کوردی و نالی زۆر کەمتر نییە) لەم بەهارییەدا بە ئیسپات دەگەیەنێ چونکە بەڕاستی نموونەیەکی هەرە پێشکەوتووی هونەری شیعرە بە

روخسار و ناوەڕۆکەوە، لە کوردی و غەیری کورددا، خۆ هەتا خەتمی کەلام بە شیعری شیرین هاتبێ شیرنتر نابێ لەمە.

بەهەمەحاڵ دەرخستنی مەهارەت و پەنجەڕەنگینی و نارایشت و سۆز و هەستی بریندار و هەنیسکی غوربەت و واقیعییەت و ئەو جۆرە دیمەنانە لەو بەهارییەدا گەلێکی بەبەرەوە هەیە کە دەبێ لەلایەن بەڵەدی زانستە ئیسلامییەکان و ئەدەبی کلاسیکییەوە توێژینەوە و شیکردنەوەی بیندریژی تێدا بکرێ. هەتا تێ دەگەین وەیا تێ ناگەین لە بەیتی:

پیاڵەیی زەڕی ئەرگس لەسەر کەفی سیمین
لە بۆ نثاری مەهابە پڕ لە زێڕی طلا

چۆن شیا (ظرف)ی ئێرگز خۆی زێڕ بێت و (مظروف)ەکەشی (زێڕی طلا) زێڕ بێت و هەردووکیشیان (ظرف و مظروف) ئەو زەردایییەی ناو ئێرگزەکەن؟ تا تێ دەگەین شەکەت دەبین.

نالی ڕاسپاردەی بە بادی (خۆش مرور)دا بەڕێ دەکات، حاجی قادریش لە مەهارەتی خۆیەوە (بەهەتی خەواڵوو) دەدوێنێت و گرێچکەکانی هەناوی بەرەو کوردستان بەڕێ دەکات. دیارە بەختیش پتر لە بای چالاك پێوەندیی بە مرۆڤەوە هەیە جێی خۆیەتی بە دەنگ بێت و بکەوێتە وتوویژ. لەوە بەولاوە ناوەڕۆکی هەر یەکێك لە دوو قەسیدەکە دەبێتە تەرجومانی ئەو گیانەی ناوە ناگرینەی بورکانی خۆی وەدەر دەنێ. هەروەك لە (معارضە)دا دوو قەسیدەی لە یەکدی ڕاماوی هاوکێش و هاوقافیەش دەبێ ناوەڕۆکیان جودا بێ دەنا قەسیدەی (معارض) لە بایەخ دەکەوێ و دەبێتە لاساییکردنەوە، لە شوێن پێ هەڵگرتنەوەشدا دەبێ ناوەڕۆك جودا بێ تەنانەت لە یەکدی نزیکبوونەوەیان لە بەیت و دوو بەیتدا قەسیدەی دووەم دانالەنگێنێ. بەنموونە حاجی قادر کە دەڵێ:

ئەگەر منم لە فراقیان گرژم لە جەرگەوە دێ
ئەگەر دڵە وەکو جەرگم دەڵێی ئەوا سووتا

قسەکانی خۆیان لەو دوو بەیتەی نالی دەخشێنن:

سووتا ڕەواقی خانەیی صەبرم دڵ و دەروون
ئەیماوە غەیری گۆشەیی ذکرێکی با صبور

لەم شەرحی دەرد و میحنەتە لەم سۆزی غوربەتە
دڵ وەختە بێ بە ئاو و بە چاوما بکا عبور

خزمایەتیی واتای ئەم بەیتانە هەر بۆیە لەسەر حاجی قادر بەلاساییکردنەوە و واتا خواستنەوە حیساب ناکرێ چونکە مەحکەمی و (اصالة)ی سەرلەبەری بەهارییەکە لە توخمەی وەها دەهارێژرێ، ئەویش وەکو نالی لەبیرکردنەوەدا هەستی ئاگر ئینەربوون دەکات، ئیتر چۆن ناڵێ سووتام.

هەروەک حاجی شاکاری نییە بەرانبەر بەهارییەکەی راوەستێ، سالمیش هەڵبەستێکی نییە بگاتە ئەو وەلامەی کە بە (بادی سەحەر)دا بۆ نالیی دەنێرێتەوە

قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادەکەی سەحەر
وەی پەیکی شارەزا بە هەموو راهی پڕ خەتەر

نە سەیرە و نە لە سالمیش بە عەیب دەگیرێ کە لە جوابدا بەوشەکانی نالی دەست پێ بکاتەوە و هەمان بادی خۆش مروورییش بکاتەوە بە پەیکی نامەهەڵگر چونکە ئەو یەکسەر لەبەر تین و تاوی پۆلووەکانی نالی دڵی خۆی دەتاوێنێتەوە. لە سالم و حاجی بترازێ (مصباح الدیوان)یش شیعرێکی نەگوتووە هاوتای پێنج خشتەکییە بێ پەردەکەی بێ کە راستەوخۆ لە (مستورە...)ی نالییەوە تیشکی داوەتەوە تەنانەت سەرنجم بۆ ئەوە دەکشێ کە (مصباح...) بە ئاتقەست چوار میسرەعی هەرە پڕ هەست و خوستەکەی وسفی یاری هێناوەتە سەر قافیەی قەسیدەی (مستورە...) کە کێشیشیان لەگەڵیدا پێکەڵێ

وەک تازە هەڵووژێکی لە ناو دوو لقەدا بێ
وا رێک گوشرابێ کە لە دوو... هەتاد..

بەش بەحاڵی خۆم هەستی سەربڵندی دەکەم لەوەدا کە سێ کەڵەشاعیری کورد بە رەفاقەتیی سەرامەدێکی شیعری کوردی بەسەر خۆیاندا زاڵ بووبن.

ئێستا بە ئیزنی کاکە بیمار وا پەسەند دەکەم هەڵەی ئەو بەیتانەی بە نموونە لە بەهارییەکەی هێناونەوە راست بکەمەوە بەداخەوە زۆر لەدیوانی شاعیرە بەسەرچووەکانمان لە نووسینەوەدا هەڵەیان تێ کەوتووە جگە لەوەی کە لە دەمی چاپکردنیشدا هەڵەیان تێدا دەگرێ تا ئەوەی کێشی بەیتەکان تێک دەچێت، ناوناوە مەعناشیان نامێنێ.

میسرەعی (لە کێو و کەژ کە سەر لە نێوارە ماڵات) بەم شکڵە پازدە بڕگەیە کە دەبوو لەبەر وشەی کۆتایی میسرەعەکە (ماڵات) چواردە بڕگە بێ چونکە ئەم وشەیە لەوانەیە لە دوو بڕگەوە بکرێتە سێ بڕگە و کێشی شیعرەکەش تێك ئەچێ. بۆ روونکردنەوە دەڵێم ئەگەر میسرەعەکە بەڕاستی وەرگیرابایە دەشیا (ماڵات)ەکەی بکرێتە (مەڕوماڵ) و کێشی تێك نەچێ کەچی ئێستا دەیکاتە شازدە بڕگە. وا بزانم دەبێ بگوترێ:

لە کێو و کەژ کە سەر نێوارە دێتەوە ماڵات

لەمەشدا پێویستە (سەرێوارە) بخوێندرێتەوە دەنا کێشی تەنبەڵ دەبێ. بەم جۆرە ئەگەر بگوترێ (.. مەڕوماڵ) کێشی ناشێوێ چونکە وەك لە پێشتر گوتوومە بەحرەکە بە پێی سازدان ١٤ بڕگە و ١٥ بڕگەش هەڵدەگرێ. تۆ بڵێیە (لەسەر کەفی سیمین) بکە (لەسەر کەفی گوهەرین) کێشی عەیبدار نابێ. لێرە قسە لە نەشێوانی کێشی شیعرە، دەنا دەزانم حاجی نەیگوتووە (مەڕوماڵ).

وشەی (گوهەرین)یش جێی نابێتەوە لەو میسرەعەدا چونکە زەردایی نێرگز بۆ زێڕ دەچێتەوە نەك گەوهەر.

میسرەعی (مەلانیکەی سەر تاق و ڕەواقی مینایی) بووەتە ١٣ بڕگە و هەڵەیە دەبێ بڵێین (مەلانیکەی سەری تاق و ڕەواقی مینایی).

وشەی (جومبش) دەبێ بنووسرێ (جنبش - جونبوش) چونکە لە (جنبیدن)ەوە هاتووە (منارەی جنبان - جونبان)ی ئیسفەهان ڕێژەی ناوی کارا (اسم فاعل)ی (جنبیدن)ی تێدا بەکار هاتووە.

هەردوو میسرەعی:

پیاڵەی زەڕی نێرگز لەسەر کەفی سیمین
پڕە لە شەبنەم وەك دوڕی لۆلۆی لالا

دەبێ ڕاست بکرێنەوە بەمە:

پیاڵەیی زەڕی نەرگس لەسەر کەفی سیمین
پڕە لە شەبنەمی وەك دوڕڕ و لۆلۆی لالا

حاجی وشەی (نرگس و سیمین)ی گوتووە کە هاتین گوتمان (نێرگز) دەبێ بنووسین (زیوین).

بەهار وا هەموو ساڵێك دێتەوە ئەمما

بووەتە ١٢ برگە ڕاستییەکەی ئەمەیە:

بەهاری وا هەموو ساڵێك دەبێتەوە ئەمما

وەیاخود:

بەهاری وا هەموو ساڵێکی دێتەوە ئەمما

دەبێ بڵێین:

مەکانە: شەوقی بەعیلاتە..

حەیاتە: زەوقی بەئەحبابە.

مەبەرەعی (گەر بێ یو بچییەوە ئێستا (کانی) دیسان بەقسەی عادەتیش قبووڵ ناکرێ وا دەزانم ڕاستییەکەی ئەمە بێ:

گەر بێ یو بچییەوە ئیستاکە بۆ وەتەن دیسان
سەفەر دەکەی لە وەتەن دەچییە شاری جابولقا

لەم دەمەدا دیوانەکەی حاجی و دەسخەتی دیوانەکەشم لا نییە بزانم لەواندا ئەم بەیتە و ئەوانی دیکەش چۆن نووسراون. بەرێنمایی کێش و واتا و ئەختێکیش پاریدەی بیرهاتنەوە قاڵبی ئەم بەیتانەم ڕاست ڕاگرتنەوە ئەوەی ڕاستیش بێ هەرچی نموونەیەکە لەو نووسینەدا هێنابێتمەوە هی یادکردنەوەیە ئینجا ئەگەر سەهوویان تێدا بێ لێم ببوورن.

لە کۆتاییدا دەڵێم مامۆستا بیمار هەقی هەیە ئەو بۆچوونە پەسەند بکات کە بەلایەوە ڕاستە بەڵام منیش هەقمە بڵێم ئەو بەڵگانەی بۆ (بەناسانی ڕەتکردنەوە)ی هێنابوونەوە بایی ڕەتکردنەوە ناکەن. لەگەڵ ڕێزمدا.

کاروان، ژمارە ٧، ١٩٨٣

# دەساتیر

ئاوناوە لە خوێندنەوەی بابەتی فارسیی سەر بە زمان و ئەدەب و ئاین چاو لە وشەی «دساتیر – دەساتیر» هەڵدەئەنگوێ وەك كە دەنووسرێ فلانە وشە دەساتیرییە ویا فلانە باوەڕ لە دەساتیرەوە هاتووە. هەندێ جاریش دەبینیت فەرهەنگی وەك «برهان قاطع» پایەی بەرمزێر دەكرێتەوە بەوەدا كە وشەی دەساتیری تێ كەوتووە. ئێمەمانانی كوردی عێراق لەبەر كەم پێوەندیمان بە سەقافەتی نوێی فارسییەوە لە ئاست ئەم دیاردەیەی بەدەم داهاتنەوەی نووسەرانی فارسی سەردەم لە دەساتیر تەنها هەستی كێشەیەكی بێ سەر و سۆراغمان بۆ دەمایەوە، تەنانەت بەش بەحاڵی خۆم نەمدەویست پرسیاریش لە دۆستە یاخەبەرەكانم بكەم نەكا وەكو ئەزموونی وەرسكەری بێ وەڵامی لێ بێت. ئەم پرسیارە دەرنەبڕاوە مایەوە تاكو دوای كرانەوەی كۆڕی زانیاری كورد و ئاڵوگۆڕی دیاری چاپكراو لە نێوان ئەو و بنگە ڕۆشنبیرییە دوور و نزیكەكاندا. بەشێك لەو كتێبە فارسییانەی بە دیاری بۆی هاتن پرسیاری دەساتیریان یەكالا كردەوە ئەوساش چونكە كتێبەكان تەنها لە كتێبخانەی كۆڕ چنگ دەكەوتن، هێندێكیشیان بۆ خۆم دەهاتن [زۆربەیان بۆ كۆڕ مانەوە] و بەدەگمەن نەبێ لەلایەن ڕۆشنبیری كورد نەدەخوێندرانەوە، مەسەلەكە لە تاریكیدا مایەوە لە یەكەم جاری سەرم بەم باسەدا گرت و بۆم ڕوون بووەوە حەزم كرد بخرێتە سەر خوانی ئەدەبی كوردی، بەڵام باری نالەبار دەرفەتی نەدام تاكو بەو دواییە عوزری پشتگوێخستنیم بەدەستەوە نەما، ئیتر ویستم لە گۆشەیەكەوە ڕووناكاییی بۆ بهاوێژم، بەڵام ئەوساش بۆ دڵنیاییبوون لەوەی كە بڵاوكردنەوەی باسەكە خۆ پێوە ماندووكردن دەهێنێ لە هەندێ ڕۆشنبیری هێژاوی شارەزا بە سەقافەتی فارسیی كلاسیكیم پرسیار كرد، دیار بوو لە ناوی دەساتیر بەولاوە شتێكیان لەو بابەتە پێ نەگەیشتووە. بەم جۆرە بۆم دەركەوت ڕوونكردنەوەی پرسیاری دەساتیر هەر نەبێ سووچێكی سەقافەتی میرانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیك لە تاریكی دەردەهێنێ جگە لەوەی كە نموونەیەكی گرنگیش لە (ساختەكاریی ئانقەست بە نیازی ڕەهێنشخستنی ئامانجی ڕەچاوكراو) بەبەر هۆش و گۆشی خوێنەرەوە دەگرێ، بەوەشدا تەلێكی خاوبوویەوەی هەست و سۆسەكردن لە مەیدانی هەڵفریواندنی فكریدا كشت دەبێتەوە. بەهەمەحاڵ ئاگاداربوون لە هەوڵی جۆراوجۆری دەستخەڵەتدانی خەڵق

بەرەو ئامانجی بەرژەوەندی دنیایی، بە تایبەتی لە ڕێی ئاینەوە پێی ناگوترێ ئەرك و كات بەفیڕۆدان چونكە وەك دەزانین ئەم پەتۆڵەیەی تێكبەستنی ئاین و بەرژەوەند لە كۆنەوە باو بووە، ئێستاش بەهێی داخوازی و بۆلوان هانای دەبرێتە بەر، تەنانەت بە زۆری، ئایدیۆلۆجیی ڕامیاریش لە شێوەی ئایندا باوەش بە بەرژەوەندی دنیاییدا دەگرێ ئینجا پێڕەوەكانی خۆیانی تێدا بەخت دەكەن. هیچ ئامانجێكی دنیایی لە شێوەی مادیی ڕەق و تەق و بێ ئارایشت و ئاوەڕەنگدا ناتوانێ ببێتە عەسای ئەفسووناوی بەدەست ڕابەری دنیاییەوە خەڵقی بێ ڕاپێچەك بدات بەرەو لەخۆبووردن. هەر چونكە دەساتیریش لە شێوەی ئایدیۆلوجیدا شێلەوێنەی لە مەردم بزركاند توانی بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ شەدایان بكات، دواتریش كە بە بەڵگەی زانستی بێ دەمەتەقە پووچەڵبوونی بە ئیسپات گەیشت ڕێز و پایەی لای پارسییەكانی هیند بمێنێتەوە لەوە هەر بگەڕێ كە زەمەی سەدان وشەی دەساتیر بۆ ناو فەرهەنگ و ئەدەبی فارسی سەری گەیاند بە حاڵ و بارێك كەوا ڕەنگە سوانەوەی لە ئێمكاندا نەمابێ. چ ئەهێنییەكی سەرسووڕێنە وەها دەكات باوەڕی پووچەڵ و جنۆكاوی هێندە بە ئاسانی بتەنێتەوە و بچەسپێت؟ هەتا بیرێكی ڕاست و ڕووناك دەچێتە دڵانەوە ئێسكی خاوەنەكەی دەبێتە خۆڵ كەچی هەلەق مەلەقی دەجاڵ و گای ژێر زەوی هەست هەست دەنیشێتە ناخی دڵ و گیانی ملیۆنان خوێندەوار و نەخوێندەوار، نە حكوومەتیشی پەدواوەیە و نە بەرتیلیشی لێ خەرج دەكرێ. سەیر لەوەدایە كە دەبینین بابەتی زانستیش ئەگەر هیچ لایەنی تێدا بێ سەر بە عاتیفەوە بنێ ئەویان جەزبە بە هەلق دەكرێ. ئەم دەساتیرەیش لە بابەتی هەلەق مەلەقی ڕێز لێگیراوی بێ بەرتیل و بێ دەسەڵاتە.

لە كتێبی (فرهنگ ایران باستان - فەرهەنگی ئێرانی كۆن) لە بڵاوكراوەكانی دانشگای تەهران، ساڵی ٢٥٣٥ی شاهەنشاهی، نووسینی پوور داوود ئەم باسەی دەساتیر هەر لە لاپەڕە ١٧ تا كۆتایی لاپەڕە ٥١ی لێ گرتووەتەوە. دواتریش لە پاشكۆی كتێبەكە شەش لاپەڕەی دیكە، لە ٣٢٩ڕا تا كۆتایی ٣٣٤، بە پشكنینەوەی نوێ پڕ دەكاتەوە بۆ سەپاندنی باوەڕێكی یەكجارەكی خۆی لەبارەی سەرچاوەی لێ هەڵقووڵینی دەساتیرەوە.

لە سەرەتاكانی نووسینەكەیدا باسی تەجرەبەی خۆی لە مەیدانی عیشقی زمان و داستانی كۆنی پارس دەكات كە چۆن مەجزوویانە ڕێگوزەری سەری بە (دساتیر)ەوە

تا .... و هەموو جار چ پایەیەکی لە دڵ و ویژدانیدا هەبووە و دواتر مرۆی لە خۆی باخەبەرتر چاویان باداوەتەوە سەر ساختەکانی و وردەوردە ئەویش ڕاستیی مەسەلەی دەساتیری بۆ ڕوون بووەتەوە و تێ گەیشتووە چ زەرەرێکی لە باوەڕ و لە زمانی پارسی و فارسیی داوە...

وەک کە پوور داوود خۆی لە ناوەڕاستی لاپەڕە ۲۵دا دەڵێ، منیش دەڵێم [اینك ببینیم دساتیر چیست – ئێستا بابیبینین دەساتیر چییە؟]. لێرە بەدواوە قسە لە پوور داوود دەگێڕمەوە.

مەلا کاووس لە پارسییەکانی هیند، بەنیازی ڕەواندنەوەی ئەسازی و ئەگونجانێکی ساڵنامەی یەزدگوردی کە تەفاوتی مانگێك تێیدا سەری ئابوو بە پێش و پاشکەوتنی جەژنەکانی ئاینی زەردەشتی، لە ساڵی ۱۷۷۸ ز. بەرانبەر ۱۱۹۲ ك. قەمەری، لەگەڵ کوڕی خۆی (فەروز – فەیرووز) ناو چوو بۆ ئێران تاکو لە زەردەشتییەکانی ئێران ئاگادارییەك لەبارەی ساڵنامە پەیدا بکات و ئەو گرفتەی تەفاوتی یەك مانگی لە ساڵنامەی یەزدگوردی چارەسەر بکات. لە شاری ئیسفەهان دەسخەتێکی (دساتیر) کە تاکە نوسخە بووە بەدەستی دەکەوێت لەگەڵ خۆیدا دەیباتەوە بۆ هیند. ئەوسا مەلا فەیرۆز کوڕی مەلا کاووس گەنج بووە، دواتر پاش چەندین ساڵ لە ڕەنج و زەحمەت کە دەساتیر بە چاپ دەگەیەنێ لە دیباچەکەیدا ئەم بەیتە بە مێژووی بڵاوبوونەوەی کتێبەکە دادەنێ:

بد صد و پنجاه هشت و یکهزار
سال کین گنج نهان شد آشکار

«ساڵی هەزار و سەد و پەنجا و هەشت بوو کە ئەم گەنجە شاراوەیە ئاشکرا بوو» مەبەست لە ساڵی ۱۱۵۸ مێژووی یەزدگوردییە کە دەکەوێتە بەرانبەر ساڵی ۱۸۱۸ی زایینی.

نوسخەی ئەو دەسخەتە کە بە فارسی نووسراوە تا ئێستاش لە کتێبخانەیەکی بۆمبای کە بە ناوی مەلا فەیرۆز ناونراوە هەر ماوە. ئەو نوسخەیە بەخەتێکی جوان نووسراوە. لە ژێر ڕستەکانی دەقی کتێبەکە خەتی سوور کێشراوە و تەفسیریشی بە دوادا هاتووە. نە ناوی دانەری و نە ساڵی نووسینی ڕوون نەکراوەتەوە.

مەلا فەیرۆزی پارسی کوڕی مەلا کاووس بە زمانی فارسی شیعری دادەنا و

هەڵبەستەکانیشی لە کتێبێکی سێ جلدی بە ناوی (جورج نامە) کە مێژووی داگیرکرانی هیند لەلایەن ئینگلیزەوە باس دەکات چاپ کراوە و لای پارسییەکان ناسراوە

مەلا فەیرۆز لە ساڵی ١٨٣٠ ز. بەرانبەر ١٢٤٦ی ك. دوعاخوازیی لە دنیا کرد، تا ئێستاش لای پارسییەکان بە چاکە ناوی دێت. بەپێی نووسینی مەلا فەیرۆز لە دیباچەی دەساتیر، ساڵانی درێژی بەو کتێبەوە خەریك بووە. مێژوونووسی ئینگلیز سیرجۆن مالکم sinjohn malclom نووسەری کتێبی History of Persia "مێژووی فارس" لە چەند نامەیەکدا مەلا فەیرۆزی هان داوە بۆ بڵاوکردنەوەی دەساتیر. هەرچەند لە مێژووەکەیدا ناوی دەساتیری هێناوە، خۆی کتێبەکەی نەدیتووە بەڵکو لە زمانی خەڵقەوە قسەی لە بارەوە دەکا. دوایی مەلا فەیرۆز بەیارمەتیی ویلیەم ئەرسکین william Erskine دەساتیری هێناوەتە سەر ئینگلیزی و بە دوو جلد بڵاوی کردووەتەوە جلدی یەکەم بریتییە لە دەق و تەفسیر و پێڕست لە زمانی دەساتیر. جلدی دووەمیشی وەرگێڕانییەتی بۆ ئینگلیزی.

بەر لە تەرجەمەی مەلا فەیرۆز و ئەرسکین کابرایەکی دیکەی ئینگلیز duncan ناوێك فەرمانفەرمای بۆمبای بووە دەستی داوەتە تەرجەمەی دەساتیر بەڵام بەر لە تەواوکردنی خۆی مردووە دوای مردنی نە تەرجەمە ناتەواوەکە و نە نووسینی دیکەشی نەدۆزرانەوە ڕەنگە هەندێ کەس گومان بیا کە مەلا فەیرۆز دەساتیری هەڵبەستبێ بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە مەلا فەیرۆز پیاوێکی پاك بووە و ساختەی ئەوتۆییی لێ نەوەشاوەتەوە، بەر لەویش بەسەد ساڵی هی وەها هەبوون دەساتیریان دیتبێ. کۆنترین سەرچاوەیەکی ناوی دەساتیری هێنابێ کتێبی (شارستان چهارچمن)ە

نووسەری ئەمەیان [کە بەپێی ناوەکەی دیارە ٤ جلدە] (بهرام کوڕی فرهاد کوڕی ئەسفەندیاری پارسی) مەشوور بە (فرزانە بهرام)ە گۆیا لە دەورووبەری ١٠٣٤ی ك. بەرحەیات بووە. شارستانی چهار چەمەنیش لە ١٢٢٣ یەزدگوردی لە بۆمبای چاپ کراوە بڵاوکەرەوەکەی (سیاوخش کوڕی اورتزدیار کوڕی سیاوخش اذری) لە دیباچەدا دەنووسێ کە ئەو فەرزانە بەهرامە لە شاگردانی (حضرت سپهر فضل اذرکیوان کوڕی اذر گشسپ) بووە کە نەسەبی دەگاتەوە (حضرت وخشور ساسان پێنجەم) لێرەدا دەبێ ساسانی پێنجەم کە بە پێغەمبەر ناسراوە لە بیر نەکەین تاکو دێینە سەر باسی ئەو لە دەساتیردا. کتێبی شارستان بە ناتەواوی کەوتووەتە دەست

ئەو سیاوەخشەی کە بڵاوی کردووەتەوە لە چەمەنی یەکەم باسی (کیومرث، سیامك، هوشنگ، تهمورس، جمشید، آبتین، فریدون، ایرج، منوچهر، نوذر) هاتووە

لە چەمەنی دووەم قسە لەبارەی (کیان، کیقباد، سیاوخش، کیخسرو، کی پشین، کی اروند، لهراسپ، گشتاسپ، زرتشت)ەوە کراوە. سەرانسەری ئەو کتێبە بە تایبەتی قورئان و بە حەدیس و فەلسەفە و تەسەوف و عرفان رازاوەتەوە هەر دەڵێی نووسەرەکەی ویستوویەتی لە نێوان ئیسلام و (مزد یسنا – مەزدەیەسنا)دا گونجانێك پەیدا بکات. رەنگە مەبەستی دیکەشی هەبووبێت بەڵام من [پوور داوود] بۆی ناچم، بەڵام کتێبەکەی خۆی مایەی سەرسوڕمانە. فەرزانە بەهرام لە لاپەرە ۲۲۸دا دەڵێ «نابێ بە رواڵەتی نامەی زەرتەشت کە پێویستی بە تەئویل هەیە رەفتار بکەین بەڵکو دەبێ تەئویلی بکەین تاکو لەگەڵ دەساتیر بگونجێ». لەم رستەیە و هی دیکەشی وەها پێ دەچێ فەرزانە بەهرام دەستێکی لە سەروکاری دەساتیر هەبێ. (محسن فانی) لە کتێبەکەی (دبستان المذاهب)دا کە لە سەرەتای سەدەی دوازدەهەمی ك. نووسیویەتی لە چەند جێگەیەکدا ناوی دەساتیر لە (شارستان چهارچمن)ەوە نەقڵ دەکات (محمد حسین کوری خلف التبریزی) لە فەرهەنگە ناسراوەکەی خۆی (برهان قاطع)دا سەدان وشەی دەساتیری هێناوە ئەمجا لە پێشەکیی فەرهەنگەکەدا ناوی دەساتیر نابات بەڵکو سەرچاوەکانی وەك (فرهنگ جهانگیری، مجمع الفرس سروری، سرمە سلیمانی، صحاح الادویەی حسین الأنصاری) سەرژمار دەکا. لەمەوە گومان نامێنێ کە ئەمانە پێش مەلا فەیرۆز دەساتیریان دیتووە تەنانەت مەلا فەیرۆز خۆی لە دیباچەی دەساتیردان دەنووسێ کە دەساتیر تا ڕۆژگاری (شاەجهان کوری شاه اکبر) لای زانایان ناسراو و ناوداریش بووە دواتر کەوتووەتە پەنهانی. کاتێکی کە مەلا فەیرۆز بەپێی گوتەی خۆی نوسخەی دەساتیری لە ئیسفەهانەوە بۆ هیند هێنا ناوی هیچ نوسخەیەکی دیکەی دەساتیر لە هیند نەبیستراوە.

وەك دەبینین لە هەر جێگەیەك ناوی دەساتیر هاتبێ و وشەیەك لەوەوە یاد کرابێ وەیا قسەیەك لە ناوەرۆکییەوە کرابێ هەمووی هەر لە نووسینی نوێیە و هیچ یەکێکیش لەو نووسینانە بایەخ و گرنگییەکی نییە. لەوەوە دەردەکەوێ مێژووی دانانی دەساتیر لە ۳۵۰ ساڵ تێ ناپەڕێ، واتە ناچێتەوە پێش زەمانی شا عەباسی گەورەی سەفەوی۹۹۵ – ۱۰۳۸. خۆ ئەگەر دەساتیر وەکو شارستانی چەهار چەمەن و (برهان قاطع) لە هیند نووسرابێ و نوسخەیەکی لەوێوە بۆ ئێران هاتبێ دەبێ لە

ڕۆژگاری (أکبر شاه هندی) پەیدا بووبێ. یەبێ ئاوەڕۆکی دەساتیر پتر هەڵبەگرێ کە لەسەر زەمینی هیند نووسرابێ تەك لە ئێران. بووژانەوەی ئاینی لە زەمانی ئەکبەر شاهدا زەمینەیەکی هەمواری بۆ ئاینسازی پێك دەهێنا. ئەکبەر شاه خۆی لە ساڵەکانی ٩٦٣ - ١٠١٤ی ك. حوکمڕانیی کردووە و خوازیاری ئاینێکی نوێ بووە بە ناوی (توحید الهی).

دەساتیر کە ئاوێتە باوەڕی جۆراوجۆر و بەیەکدی دژ و تێك هەڵشێراوە دەبێ بەرهەمی بیروباوەڕە تێکەڵ و پێکەڵەکانی ئەو سەردەمە بێ کەوا دەوەستێتە بەرانبەر ڕۆژگاری شا عەباسی گەورە.

کە دەڵێم نابێ سازدانی دەساتیر لە ٣٥٠ ساڵ کۆنتر بێ لەو ڕووەوەیە کە ئەو تەفسیرەی بەسەر دەقی دەساتیرەوە نووسراوە دەمودووی ئەو زەمانەی هەیە. هەرچەند لە دەساتیردا وەها ڕانوێندراوە گۆیا تەفسیرەکەی هی ساسانی پێنجەم و لە ڕۆژگاری (خسرو پرویز) بۆ دەساتیر نووسراوە، بەڵام دیارە دەبێ ئەو فارسییە ساختە و نادروستە هی سەردەمی سەفەوییەکان بێ. ئەوەندەش نزم و نارێکە دەبێ لە دەرەوەی ئێران نووسرابێ. چەندین پێشگۆیی خراوەتە دەساتیر [وەك کە خەبەری فەتحی ئیسلام بۆ ئێرانی تێدایە] کە دەستی ساختەچییان دەکاتەوە.

لە نامەی ساسانی پێنجەم لە بەندەکانی ١٨، ١٩، ٢٤، ٢٥، ٣١ هاتووە: «دەبێت بەدکاری ئێرانییان کە پەرویزیان کوشت، ئەو کەسەی من بەرزم کردەوە ئەوان هەڵیان داشت، وا لە عەرەبان پاداش وەردەگرنەوە. هەڵگرنەوە کوژراوی خۆیان لە سەرزێوش و ڕەشپۆشان. کە هەزار ساڵی عەرەب بەسەر دیندا [دینی ئێرانە] نێ بەری گۆڕانی وەهای بەسەر دادێت بە خاوەنێ ئیشان بدی ئەیناسێتەوە».

ئەم پێشگۆییە بە چاکی ئەوە ئاشکرا دەکا کە نووسەری دەساتیر هەزار ساڵ دوای ڕەوی عەرەب ژیاوە کە دەکاتەوە زەمانی سەفەوی. هەروەها بەندی دوایین لە پێشگۆییەکەدا پاتەوپاتی ئەم شیعرەیە کە دەڵێ:

دیـــــن نـــــزا ازیـــــی ارایشنــــــد
ازیـــــی ارایش و پـــــیـــــرایشنـــــد
یــکــــه بـــهیشتـــنــد بــران بــرگ و ساز
گــرتــو بــه بـهیـشــی نشنـــاسیش بــاز

هەریەکن ئارایشتی دینەکەت دەمن
ئارایشتی دەمن و ڕێکی دەهەن
ئەوەندەیان بەرگ و بار تێ بەستووە
گەر بینیتەوە ئاپەناسیتەوە

ئەو ئەرزە پێشبینییانە بە تایبەتی لە نامەی ساسانی یەکەم زۆرە کەوا جگە لە عیسا خەبەر لەمانی و مزدەك و حەزرەتی محەمەدیش دەدات.

کەواتە دەساتیر سەرەڕای ئەو هەموو تەقلەبازییە ڕێی نییە شانازیش بکا بە کۆنینەیی بۆ ئەوەی گوتە درێژ نەبێتەوە چاو لەو نیشانانە دەپۆشین کە بە ڵگەی نوێبوونی دەساتیر بەدەستەوە دەدەن و پەخەی تەقلەبازییەکانی دەگرین.

ناوی دەساتیر خۆی وەك ئەو زمانەی پێی نووسراوە و بابەتەکانی تێیدان، ئەویش نادروست و ساختەیە چونکە وشەی (دساتیر) ڕێژەی (منتهی الجموع)ی عەرەبییە و لە (دستور)ی فارسییەوە هاتووە فەرهەنگی (انجمن ارای ناصری) بە خۆڕایی هەوڵی داوە بۆ پەیداکردنی ڕیشەیەکی دیکە بۆ (دساتیر).

بە گوتەی دەساتیر شازدە پێغەمبەر، کە بە تەعبیری دەساتیر پێیان دەڵێ (فرجیشور) گەیشتوونەتە پلەی وەرگرتنی قسەی ئاسمانی ئەمانە پێغەمبەرەکانن ١ – مهاباد ٢ – جی افرام ٣ – شای کلیو ٤ – یاسان ٥ – گلشاه ٦ – سیامك ٧ – هوشنگ ٨ – تهمورس ٩ – جمشید ١٠ – فریدون ١١ – منوچهر ١٢ – کیخسرو ١٣ – زردتشت ١٤ – سکندر ١٥ – ساسانی یەکەم ١٦ – ساسانی پێنجەم [ بەرێنووسی ناو کتێبەکە ناوەکانم نووسی].

دەساتیر بریتییە لەو نامە ئاسمانییەی کە بۆ پێغەمبەرانی هەناردوون. نامەی (هوشنگ) ناوی (جاویدان خرد) بووە. نامەی (تهورس) ناوی (برین فرهنگ) هی (جمشید) ناوی (فرازین اروند). هی (فریدون) ناوی (هنرستان) هی (منوچهر) ناوی (دانشیار) هی (کیخسرو) ناوی (سروش کردار). خانەدانی یەکەم پێغەمبەر کە پێی گوتراوە (آبادیان) لە ماوەی یەك سەد (زاد)دا خوسرەوییان کردووە. بابزانین (زاد) دەکاتە چەند ساڵ.

لە دەساتیردا هەر (زاد)ێك هەزار (واد) ساڵە. واد سێ هەزار (جاد) ساڵە. یەك جاد هەزار (مەرد) ساڵە. یەك مەرد هەزار (وەرد) ساڵە. یەك وەرد هەزار (فەرد) ساڵە.

هەر فەرمەدێك یەك ملیۆن ساڵە، ملیارێك ساڵ پێی دەگوترێ (اسهار). دە ملیۆن ساڵ (سحار)ێکە. سەد هەزار ساڵ (سلام)ێکە. بەو پێیە یەك زاد ساڵ دەبێتە ئەم ژمارەیە ...............۳ [لە نووسینی پوور داوود لە جیاتی (۳) ژمارەی (۲) نووسراوە بەلام هەڵەیە چونکە ژمارە (۳) لەو حیسابانەدا هەیە نەك (۲)] ئینجا بۆ خۆتان بزانن یەك سەد زاد کە درێژەی فەرمانڕەوایی خانەدانی ئابادیانە چەند ساڵ دەگرێتەوە [سێ سەد هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن]. دوایین پادشای ئەم خانەدانە کە ناوی (ابادازاد) بووە خەستە و دڵماو بووە کە ئیتر نەیتوانیوە مەردم لە کەچ ڕەفتاری بگێڕێتەوە بە ناچاری لە جیهان زویر بووە و لەبەر چاوان بزر بووە. جیهان لەوەدا پڕ بووە لە ئاژاوە. چەندین کەسی مێرخاس داوایان لە (افرام) کوڕی ئاباد ئازاد کردووە کە لەسەر تەختی باوکی دابنیشێ، لەو دەمەدا فەرمانی ئاسمانیشی بێ گەیشت و بوو بە هەڵبژاردە بۆ سەرۆەری و ڕێنوێنیی خەڵقی ئەم دنیایە. کە تۆزەی پێغەمبەرایەتی و خوسرەوایەتی بە ئەفرام گەیشت لەقەبی (جی) بۆ خۆی هەڵبژارد. لەوە بەدواوە جێنشینەکانی ئەو هەموویان بە (جی) ناو دەبران. خانەدانی (جیان) یەك (اسهار) ساڵ کە دەکاتە یەك ملیار ساڵ فەرمانڕەوا بوون. دوایین مەزنی ئەم خانەدانەش (جی الاد) وەکو (ابادازاد) لە کرداری نابەجێی مەردم وەتەنگ هات و ڕووی لە دنیا وەرگێڕا. ئەوسا دیسان ئاژاوە تەنییەوە تاکو کوڕی ئەو (کلیو) بە داخوازتی مەردم و فەرمانی ئاسمان لە شوێنی باوکی دانیشت و لەقەبی (شای) بۆ خۆی هەڵبژارد. خانەدانی ئەمیان بە (شاییان) ناوبران. ئەم خانەدانە یەك خانەدانە یەك (سمار) ساڵ کە دەکاتە دە ملیۆن ساڵ فەرمانڕەوا بوو. دوایین مەزنیان (شای مهبول) لە کرداری ناڕەوای خەڵق پەککەوتە بوو ئەویش وەك (اباد ازاد وجی الاد) لە گەورەیی کنارگیر بوو و لە بەرچاوان ون بوو. دیسان ئاگری ئاژاوە زەمانەی گیشا تاکو مەردم بە فەرمانی ئاسمان (یاسان) کوڕی (شای مهبول)یان بە گەورە و ڕابەر و پێغەمبەر هەڵبژارد. خانەدانی یاسان پێی دەگوترێ (یاسانیان) جوودەتی ئەمانە نەوەد و نۆ (سلام) ساڵ بووە. گوتمان هەر (سلام)ێك سەد هەزار ساڵە. دوایین پادشای ئەم خانەدانە کە ناوی (یاسان اجام) بووە ئەویش لە پاشایی و لە ژیان کنارگیر بووە. ئاژاوە دنیای داگرت، مەردم وەکو دێوان کەوتنە گیانی یەکدی تا ئەوەی ناوی ئادەمیزادییان بێ ڕەوا نەدیتراوە. دنیا ڕووی لە کاولی کرد. وەهابوو تاکو خوای گەورە (گلشان)ی کوڕی (یاسان اجام)ی بە پێغەمبەری و فەرمانگوزاری خستە کار.

له مێژوو و داستان و نووسینە دینییەکانی ئێران کەسمان چەنگ ناکەوێ بە ناوی (مهاباد و جی افرام و شای کلیو و یاسان). ئەمانە فەرمانڕەوای دەسکردی ناو دەساتیرن.

بەڵام دوازدە پێغەمبەرەکەی دیکە کە لە دەقی دەسّاتیر بەناوێك و لە تەفسیرەکەیشی بە ناوێکی دیکە نووسراون بەم جۆرەن.

١- فرزینسار گلشاه یاخود کیومرث

٢- سیامر سیامك

٣- هورشار هوشنگ

٤- تخمورد تهمورس

٥- جرمشار جمشید

٦- پرسیدوم فریدون

٧- میرزاد منوچهر

٨- لیکلاسرو کوڕی هیرتاووش کیخسرو کوڕی سیاوش یاخۆ سیاوش یاخۆ سیاوخش

٩- هرتوش یاخۆ هرتوشاد کوڕی هرسفتمار زرتشت اسفنتمان

١٠- سیمکندش سکندر

١١- هرمین سرسار یەکەم ساسان

١٢- پندم اردیناس پێنجەم ساسان

بۆ ئەوەی بڵێین دیارە ئەم ناوانە نووسەری دەساتیر هەڵی بەستوون. هیچ یەکێك لەوان ئەو ناوەیان نەبووە کە دەساتیر بۆی داناون. لە ئاڤێستادا کە بەکۆنترین سەنەدی نووسراوی ئێرانییان حیساب دەکرێ تا دەگاتە (زرتشت) بەم جۆرە ناویان هاتووە:

کیومرث gaya -maretan

سیامك syamaka

| | |
|---|---|
| هوشنگ | Haoshangha |
| تهمورث | Takhmo - urupa |
| جمشید | Yima - khashaeta |
| فریدون | Thraetaona |
| منوچهر | Manush - tchithi ra |
| خسرو | Haosra vanyhn |
| سیاوش | Syavat shan |
| زرتشت | Zarathushtra |

ناوی خانەدانی زەرتەشتیش Spitama سپیتمان.

لە ئاڤێستادا (کیومرث) لە جێی ئادەمی سامییەکان یەکەم مرۆڤە. لە دەساتیردا (مهاباد) یەکەم مرۆڤە. ئەوانی دیکە هەموویان بەجگە لە زەرتەشت لە ئاڤێستا و لە داستانانەدا لە چاکان و گەورەپیاوان و ناودارانن. چونکە داستانی پێشدادییان مرشتەرەکە لە نێوان ئێرانییان و هیندییان هەندێك لەوانە ناویان لە نامەی دینی برەهمەنان (ڤیدە Veda)دا هاتووە. بەڵام لە هیچ ڕوویەکەوە لەگەڵ ناوەکانی دەساتیر یەك ناگرنەوە.

واتای ئەو ناوانەی لە لیستەی سەرەوەدا ژماردمانن بۆ ئێمە ئاشکرایە. گومانیش لەوەدا نییە کە لە سەرچاوەی ئاڤێستا و نووسینەکانی پەهلەوییەوە بە دروستی پێمان گەیشتوون، ئەو گۆڕانەی لە فارسیشدا بەسەریاندا هاتووە بەپێی دەستوور و قاعیدە بووە.

ئەما یەکەم ساسان و پێنجەم ساسان کە لە دەساتیردا بە پازدەمین و شازدەمین پێغەمبەر ژمێرراون و گوایا یەکێکیان لە باپیرانی ئەردەشیری پاپەکان و ئەوی دیکەشیان لە ڕۆژگاری خوسرەوی پەرویز لە (مرو) پێغەمبەر بووە. وەك دەزانین لە مێژوودا ساسان باپیر وەیا یەکێك پێشینانی ئەردەشیری پاپەکانە کە لە ساڵی ٢٢٤ی ز. خانەدانی شاهەنشاهیی ساسانیانی بنیاد ناوە. لە گۆشە و سووچەکانی مێژوودا تووشی چەند کەسێك دەبین ناویان ساسان بووە بەڵام لە هیچ جێگەیەکدا ناونیشانی پێغەمبەر ساسانی یەکەم و پێغەمبەر ساسانی پێنجەم نییە. وەك دیتمان لە دەساتیردا

ئەسکەندەر دوای زەرتەشت چواردەمین پێغەمبەری ئێران بووە لە دەساتیردا ئەسکەندەر ناوی هاتووە بە (سەکەندەش کوڕی ئەشاب واتە دارا). ئەم پێغەمبەرە هەمان مەلعوونە کە لە ۳۳۰ ساڵ پێش عیسادا ئێرانی لە خاك و خوێن گێڕا. دلێرخی و بەغدایی ئەو لە عەرەبەکان [لە نووسینی خۆمدا گوتوومە نووسەرانی فارسی سەر بە قەومایەتی ئیسلام و جەنگیز وەکو یەکێ حیساب دەکەن. م. محەمەد] و تەیموور کەمتر نەبووە. ئەسکەندەر لە هەموو نامە ئاینییەکانی پەهلەوی بە (گجستك – گوجەستەك) واتە پیس و ناپاك و وێرانکەری ئاین ناوی هاتووە و لە کۆنەوە بەلای ئێرانییان مەعلوومە ئەو ئاڵۆستای سووتاندووە. گومان نییە لەوەدا کە لە ئاکامی داگیرکرانی ئێران لەلایەن ئەسکەندەر و جێنشینەکانی (سلوکییەکان) بەشێکی نامەی ئاینیی ئێرانییان لەناوچوو، تەنانەت گاتەکان و سروودەکانی زەرتەشتیش هەر لەو ڕۆژگارانەدا نابوود بوون و تەنها چەند پارچەیەکیان بە ئێمە گەیشتووە.

ڕاستە ئەسکەندەر لە داستانەکانی ئێمە وەك شانامەی فیردەوسی و ئەسکەندەرنامەی (نظامی) و مێژووی (طبری) و هی دیکەش، ناوی بە چاکە هاتووە بەڵام دەبێ بزانین نزیکی هەشت سەدە دوای ئەسکەندەر کتێبێکی کە یۆنانییەکان لەبارەی ئەسکەندەریانەوە نووسی و بە ناوی کالیستینس kallisthenes بڵاو بووەوە بریتییە لە داستان و ئەفسانە بەپێی دڵخوازی خۆیان لەو کتێبەدا ئەسکەندەریان باس کردووە. ئەو کالیستینسەی کتێبەکەیان لە ناوی ئەو بەستووە یەکێك بووە لە نووسەرە ناودارەکانی یۆنان کە لە کاتی لەشکرکەشیی ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران لەگەڵ کۆمەڵێك مێژوونووسی یۆنانی بەگەڵ لەشکرەکە کەوتبوون. لەمەدا وەك کە دواتر سوڵتان مەحموودی غەزنەیی لەڕەوی بۆ سەر هیند دەستەیەك نووسەری لەگەڵدا بوون تاکو بەنووسین پێیدا هەڵبڵێن، ئەسکەندەریش ژمارەیەکی لە نووسەران بەگەڵ خۆیدا بوو تاکو مەدحی بکەن و تام و شامێك بخەنە داگیرکردنەکانییەوە و باسی پاڵەوانێتیی بکەن بەڵام کالیستینس نەیویست خراپەکانی ئەسکەندەر بە چاکە لە قەڵەم بدات و پلەی ئەسکەندەر بگەیەنێتە پایەی خوایەکانی یۆنان. ئەمە بووە هۆی نارەزامەندیی ئەسکەندەر لە کالیستینس تا بە گوناهێکی تاوانبار کرد و خستییە زیندانەوە و تێیدا مرد. ئەوەی کالیستینس لە ژیانی خۆیدا بە ڕەوای نەزانی دوای هەشتسەد ساڵ لە مەرگی کەسانی دیکە هاتن پەسەندیان کرد و هەر بە ناوی ئەوەوە قاتڵەکەیان، کە ئەسکەندەرە وەکو پەروەردگار هەڵداوە. ئەفسانەی ئەسکەندەر لە

سەرەکانی ناوەڕاستدا بە زمانی لاتینی و ئەرمەنی و عیبری و عەرەبی تەرجەمە کرا. هەرچی لە ئەدەبیات و داستان و مێژووی فارس لەبارەی دوژمنە کۆنەکەی، ئەسکەندەرەوە، یاد کرابێ هەمووی لە سەرچاوەی یۆنانی و هەمان کتێبی ساختەوە هاتووە بێگومان کتێبی (خدای نامك)ی پەهلەوی کە کانیاوی لێوە هەڵێنجانی شانامەیە هیچ باسێکی ئەوتۆیی لەبارەی ئەسکەندەرەوە تێدا نەبووە. بە پێغەمبەر زانینی (گجستك ئەسکندر) لە دەساتیردا باشترین بەڵگەیە کە ئایینی دەساتیری هیچ سازانێکی نییە نە لەگەڵ دینی زەرتەشت و نە لەگەڵ مێژوو.

دەساتیر بەچاولێکەری لە ئاڤێستا خاوەنی مەتن و تەفسیرە. مەتنەکەی بە ١٦بەش دابەش کراوە و هەر بەشێکیشی بە پێغەمبەرێکەوە بەستراوە هەر یەکێك لەو ١٦ نامانە خاوەنی چەند بەندێکە. بە نموونە، نامەی ئاباد ١٧٠ بەندە، هی (جی افرام) ٨٨، هی (شای ملیو) ٨٠، هی (یاسان) ١٢. هەروەهاش نامەکانی دیکە درێژترینیان نامەی زەرتەشتە بە ١٦٤ بەندەوە کە هیچ یەکێکیان وێچوونی نییە لەگەڵ گوتەکانی زەرتەشت لە گاتەکاندا. تەنها پێنج سروود لە گوتەکانی زەردەشت لە گەزەندی ئەهرەمەنی ڕۆژگاری ئەسکەندەر ڕزگار بووە بە ئێمە گەیشتووە سەرەڕای ئەوەی کە هیچ شتێك لەو سروودانەدا جێی بەراوردکردن نییە لەگەڵ ناوەرۆکە ساختەکەی دەساتیردا، سەرتاپای زمانی ئەو سروودانە و هی هەموو ئاڤێستاش لە هیچ ڕوویەکەوە خزمایەتیی لەگەڵ زمانە هەڵبەستراوەکەی دەساتیردا نییە.

هەر یەکێك لەو ١٦ نامانەی دەساتیر بە مەدحی خوا دەست پێ دەکا و لە ئەنجامدا موژدەی پەیدابوونی پێغەمبەرێکی دیکە ڕادەگەیەنێ. لە کۆتایی ناوی (منوچهر) خوا پێی دەڵێ: لە دوای تۆ پێغەمبەرێك دێت ناوی (کیخسرو)ە لە ئەنجامی نامەی زەرتەشت خوا دەڵێ: «ئەی وەخشوور زەرتەشت، دوای تۆ ئەسکەندەر (چەر) دەبێ. دواتر یەکەم ساسان بە پێغەمبەری دێت. نامەی تۆ (همسیرازی) ڕۆشن دەکات.» چەمەر بە زمانی دەساتیر (ئاشکرا) و (همسیراز) تەرجەمەی تەفسیرە. خراپ نییە چەند ئایەتێك یا بە گوتەی دەساتیر چەند (چمراس)ێك لە مەتنی دەساتیر بهێنین و بزانین خوای دەساتیری بە چ زمانێك نامەکانی ئاسمانی بۆ (فرجهشوران) واتە وەخشوورانی خۆی [وەخشوور هەر بۆ زەرتەشت بەکار هاتووە] هەناردووە. لە (چمراسەکانی) ٢٨- ٨٣ نامەی فەرجیشور (جی افرام) دەفەرمووێ: «گرودفرتاش - جمشان - جمساس - چمساش - همساشان خمساش - واسالاس یاسایاس - راساراس تاساتاس -

کریاس نامود - کرتاس تود - الیاس هود - الماس رود - سناساب - سناشاب - جاماجاب - تورالتوس - سارانوش - اموال فانوس - اهوالی کاروس - گستهم توش - سمرنوش - جودبروش - اورنگان پوش [دوای ٤ دێڕی دیکە ئەمانە دێن] هامستنی رامستنی شامستنی زامستنی - شالشتنی شالشتنی شالتنی شالشتنی مزدستنی سزدستهنی و زدستنی ازدستنی شالشتنی شالشتنی - شالشتنی سهدنستنی میدستنی جهدستنی مهدستنی شالشتنی - کاپستنی کارستهنی مارستنی وارستنی شالشتنی - هیرکستنی ترکستنی سرکستنی فرکستنی شالشتنی [شەش دێڕی دیکەش لەم مطلق و مطلقە بەسەر دەچێ ئینجا بە پێنج جاران شالشتنی ئەو ئایەتانە کۆتاییيان دێت. پێویستم نەدیت هەموویان بنووسمەوە. م. محەمەد]

خوێنەران ناچارن دڵیان بەوێ بزانن (شالشتنی) کە هێندە جارە دەگوترێتەوە چ واتایەکی هەیە. خۆشبەختانە لە زەمانی پەرویزی ساسانی پێغەمبەر ساسانی پێنجەم لە تەفسیری خۆی ئەو وشەیەی لە چاوگی (شالستی) وەرگرتووە بە واتای (دانستن - زانین). لە تەفسیری (چەراس) ٦٨ و ٨١ دەفەرمووێ (دانستنی دانستنی دانستنی). بەڵێ دەمانزانی دنیا شتی وەهای زۆر تێدایە کە (دانستنی - هی زانین) بێ، بەڵام هەرگیز نەمانەدزانی زمانێك هەبێ لە ماوەی سەدان هەزار ملیۆن ساڵ گۆڕانی بەسەردا نەهێت (دوای چەند دێڕێك نموونەی ئەگۆڕانەکە دێت. م. محەمەد] کەچی زمانی ئێستاکەی فارسی لەگەڵ پەهلەوی و زمانی پەهلەوی لەگەڵ هەخامەنشی جوداوازییان زۆرە هەموو جوداوازییەکەش لە ماوەی یەك هەزار ساڵدا ڕووی داوە چونکە مەعلوومە لە نێوان ئەردەشێری سێهەمی هەخامەنشی (٣٥٩ - ٣٣٨ پێش عیسا شاهەتیی کردووە) کە نووسراوی بە فارسی تا ئێستاش ماوە و لە نێوان (حنظلەی بادغیسی) کە چەند شێعری فارسیی لێ بەجێ ماوە تەنها هەزار و سەد و ئەوەندە ساڵە تێ پەڕیوە و جوداوازییان دیارە. ئەما زمانی دەساتیر لە ڕۆژگاری مەهابادەوە کە زانیتان پێش چەندین هەزار ساڵ ژیاوە هەتا ڕۆژگاری ساسانی پێنجەم کە هاوچەرخی خوسرەوی پەرویز بووە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە. بە نموونە لە سەرەتای نامەی مەهاباد چەراس ٣، دەفەرمووێ (فرشیدشمتای هرشنە هرشنشگر زمریان فراهیدور). لە سەرەتای نامەی ساسانی پێنجەمیش دەنووسێ (فرشید شمتای هەرشنە هرشنشگر زمریان فراهیدور).

ئەم زمانەی دەساتیر نە بە زمانی کۆنی ئێرانی وەك فورسی هەخامەنشی و

ئاڤێستایی و پەهلەوی و پازەند. نە بە لەهجەکانی کۆنی وەك تەخاری و سەکری و سوغدی و غەیری ئەوان دەچێ [بە کورتی] خزمایەتیی لەگەڵ هیچ زمانی ئادەمیزادی کۆن و نوێدا نییە. ئەم زمانە لەلایەن دروستکەرەکەیەوە پێی گوتراوە زمانی ئاسمانی. چونکە لە هیچ جێگە و هیچ کاتێك و لای هیچ یەکێك لە میللەتانی جیهان زمانی وەها نەبووە هەر دەمێنێتەوە لە چەرخی فلەك و لە ناهید و کەیوان کە لە نهێنییەکانیان ئاگادار نین زمانی وەها بەکار بهێندرێ یاخود دەبێ بڵێین کابرایەکی فێڵباز لەم تۆیە خاکییەی خۆمان زمانێك گۆشەگیری کردووە و ئەو زمانەی لە لای خۆیەوە هەڵبەستووە.

خواوەند بەم زمانە چ ئاسمانی بێ چ زەمینی، لەگەڵ شازدە پێغەمبەری بژاردە گفتوگۆی کرد و بۆ ئێمەی بەندەکانی خۆی وەڵامی نارد و دەستووری دانا تاکو بتوانین [رازچاو بازشناسیم - ڕێگە لە زیندان جودا بکەینەوە] و لە سەرئەنجامدا ڕزگار بین. دەستووری ئاسمانی دەبێ لەلایەن مەردمەوە تا ڕۆژی ژیانەوە بەکار بێت و ئاینی مەهابادی گەورە لە بیر نەکەن. هەر چونکە ڕزگاریی لە هەردوو دنیادا بەند بووە بەپێڕەوییکردن لە دەساتیر، خواوەند فەرمانی دایە دوایین (وەخشوێر)ی خۆی کە ساسانی پێنجەمە تاکو نامەی پێغەمبەران بهێنێتە سەر زمانی دەورانی خۆی.

ساسانی پێنجەمیش وەهای کرد، هات فەرموودەکانی هەر شازدە پێغەمبەر کە نامەی خۆیشی یەکێکە لەو فەرموودانە تەفسیر کرد و بەپێی پێویست ڕوونی کردنەوە لە دوای هەر ئایەتێك تەفسیرەکەی دێت بەو جۆرەی کە ئەمڕۆ دەزانین پێغەمبەری پێشینان چییان گوتووە ئەگەر ئەو تەفسیرە نەبوایە نەمانئەزانی (کایستنی کارستنی هارستنی ولرستنی شالشتنی) چ واتایەکی هەیە بەڵام لە ڕووناکیی ئەم تەفسیرەوە دەزانین (جی افرام) بەوەدا دەفەرمووێ (گوتەی خوا و نامەی خوا و هەنارەدی خوا دەبێ بزانرێن). هەڵبەت ئایەتی کورتەلەی ئاسمانی واتای زۆری هەیە بۆیە ساسانی پێنجەم ئەو پێنج وشەیەی مەتنی دەساتیری بە ۱۷٦ وشەی دیکە شەرح داوە [لێرە بەدواوە ۹ دێڕ لە نووسینەکەی پوور داوود جۆرێکە ئەگەر وەکو خۆی وەرگێڕدرێتە سەر کوردی لێحاڵیبوونی زەحمەتە من مەفهوومەکەی بە کورتی دەنووسمەوە: ساسانی پێنجەم کە هاوچەرخی خوسرەوی پەرویزە دەبوو ئەو تەفسیرە بە زمانی ئەو سەردەمە بنووسێ. لەو سەردەمەشەوە نموونەیەکی نووسراوی گرانبەها بە ناوی (ماتیکان هزار داتستان) بەجێ ماوە کەچی تەفسیرەکە هیچ ویچوونێکی لەگەڵ ئەو زمانەدا نییە

بەڵکو بە زمانی فارسی سەردەمی شا عەباس نووسراوە کە هەزار ساڵ لە ساسانی پێنجەم دواترە. دیارە ئەو کەسەی دەساتیری هەڵبەستووە لە سەردەمی شا عەباس بەزمانی سەردەمی شا عەباسی نووسیوە]

زمانی تەفسیری دەساتیر فارسییە ئەما پارسی نەگمە. لە هەر جێگەیەکی بەرانبەر وشەی عەرەبی هی فارسی چنگ نەکەوتبێ یەکێکی ساختەی بۆ دروست کردووە. هەر ئەو وشە ساختانەن بە پارسیی دروست وەرگیراون و چوونەتە ناو (برهان قاطع و چمن ارای ناصری) لە نامەی (جی افرام)دا دوو بەندی ٧٠ - ٧١ ئەمە دەڵێ: «دوو جۆر نامە خودایین، یەکیان (مهین نامە - نامەی گەورە) کە لە خەلقی دوو جیهان دەدوێ. ئەوی دیکەش دەساتیر کە (کهین نامە - نامەی) بچووکیشی پێ دەگوترێ.»

ئەمەش نموونەیەک لەو (کهین نامە)یە کە دەساتیری ئاسمانییە: خوا نۆ ئاسمانی خەلق کرد. هەر یەکێکیان خاوەن هۆش و گیان و لەشە. لە ئاسمانانەدا فریشتەی بێ ئەژمار و ئەستێرەی زۆر هەن، هەریەک لەوانیش هۆش و گیان و لەشی هەیە. ئەستێرە گەڕۆکەکانیش خاوەن هۆش و گیان و لەشن. هۆش و گیان و لەشی مانگ ناویان (فرنوش، ورنوش، اردوش)ە هۆش و گیان و لەشی تیر (عطارد) (وارلاس، فرلاس، ورلاس)یان پێ دەگوترێ. ناوی هۆش و گیان و لەشی ناهید (زهره) (نزوان، فروان، رزوان)ە. ناوی گیان و هۆش و لەشی ڕۆژ (شادارام، شادایام، تشادارسام)ە. هۆش و گیان و لەشی بەهرام (مریخ) بە (بهمن زاد، فرشاد، رزبادواد) ئافرەت بوون. ناوی هۆش و گیان و لەشی هرمزد یاخۆ برجیس (مشتری) (نجم داد، نجم اراد، شیداراد)ە. هۆش و گیان و لەشی کەیوان (زحل) (فرنسا، لاتینا، ارمنا) ناویانە.

جیهان وەکو ئادەمیزادە، ئاسمان پێستی ئەوە کەیوان سپڵی، بەرجیس جگەری، بەهرام زلاوی، ڕۆژ دڵی، ناهید میعدەی، تیر مێشکی، مانگ سپەرلاکی، ئەستێرەکان و بورجەکان دەمارەکانی، ئاگر هەوا هەناسەی ئاو ئارەقەی خاک تۆزی پێی بروسکە بزەی لێوی، گرمەی هەور ئاوازی، باران فرمێسکی، کانگەکان گیاکان و گیانلەبەرەکان کرمی لەشی.

پێستی ئادەمیزاد وەکو ئاسمانە و حەوت ئەندامەکانی، سەر و سنگ و میعدە و دوو دەست و دوو قاچەکانی، لە جێی حەوت ئەستێرەگەڕۆکەکانن. خوێن و بەڵغەم و سەفرا و سەودای لە جێی چوار (عنصر)ی ئاو و ئاگر و خاک و هەوان.

ئەستێرە بێ ئەژمارەکان و حەوت چەرخ لە کاری جیهاندا دەسەڵات و تەئسیریان هەیە پێویستە بۆ ئەوان (سنجرستان) واتە جێگەی پەرستن دروست بکرێت و بە بوت برازێنتەوە.

لە دەساتیردا قسە لە بارەی (تناسخ)ەوە زۆر هاتووە. گیانی هەموو بوونەوەر، لە مرۆڤ و گیاندار و رووەك و شتی بێ گیان، لە لەشێکەوە بۆ لەشێك گوێزە دەکات. لە نامەی مەهابادا پێغەمبەر ئاباد لە خوا دەپرسێ بۆچی پاشایان و فەرمانڕەوایان و توانایانیش لە ژیاندا ڕەنج و غەم دەبینن؟ خوا لە وەڵامدا دەڵێ: چونکە ئەوانە لە ژیانی لەشی پێشتریان بەدکار بوون جەزایان لە ژیانی دواتریان دەبیننەوە. بە نەخۆشی و ڕەنجووری لەدایك دەبن وەیا بەدەردی دیکە گرفتار دەبن. گیانداری زەهراوی و دڕندە دەیانگەزن. ئەمانە تۆڵەی کردارەکانی ژیانی پێشینی خۆیانە. هەروەها گیانەوەری دڕندە و مەل و چارپێ هەریەکەیان پاداش وەیا جەزای ژیانی پێشینی خۆیان لە ژیانی دواتریان دەبیننەوە. ئەگەر سووری یەك ژیان بایەی سڕینەوەی گوناهی پێشووتری نەکرد لە دەورەی ژیانی سێیەم و چوارەم جەزا دەدرێن. ئەوەن دەچن و دەبنەوە تاکو گوناهی پێشین پاك دەبێتەوە. ئەو کەسانەی بەدکارن لە ژیانێکی دیکەیان دەچنە قاڵبی گیا و ڕووەك. مەردمی بێ پەروەردە و درێوکار دەچنە قاڵبی کانگە (معدن)ەوە. چارپێیەکانی کە لەم جیهانەدا وەکو ئەسپ و گا و حوشتر و کەر بارکێشن کەسانێك بوون کەوا چوونەتە قاڵبی جانەوەران و لە بارپەریدا جەزای ڕەفتاریان دەبیننەوە.

لە دەساتیردا زەحمەتکێشان و وەرزش و خۆشەکاندن زۆر بایەخی پێ دراوە لە ریازەکێشان و ڕۆژووگرتن و دوعاکردندا دەشێ گیانی ئادەمی لە کڵێشەی دەرچێت و بۆ تەماشای جیهان بڕوات و دواتر بێتەوە لەشەکەیەوە کەسێکی گەیشتە ئەم پایەیە چی دیکە گیانی قاڵبگۆڕی ناکات. ئەو تەرزانە دوای مەرگ لە بەهەشتدا ئەمر دەبن.

کوشتنی چارپێ و خواردنی گۆشتیان لە دەساتیردا حەرام کراوە. دەبێ مردوویان بەخاك بسپێررێ یاخۆ بسووتێندرێ. لەوجۆرە مەبەستانەوە کە پێچەوانەی ئایینی ئێرانییانە دیار دەدات دەساتیر پێوەندیی بە هیندەوە هەیە یاخۆ وەك پێشتر گوتمان، لە هیند نووسراوە. جگە لەمە زۆر لە وشەی دەساتیر هیندین کە هاتووە سەر و گوێلاکی شکاندوون و شێوەی گۆڕیوون و وشەی نوێی لێ سازداون هەروەك لەگەڵ زۆر وشەی فارسیشدا ئەمەی کردووە.

نووسەری دەساتیر هەر شتێکی لە دینی برەهمەنی و زەردەشتی و ئیسلام و دینی دیکەی بیستبێ وەیا خوێندبێ دینێکی نوێی لێ پێك هێناوە و بەناوی خوایەك كە پێی دەڵێ (مزدام) و بە یارمەتیی ١٦ پێغەمبەر بانگهێشتنی خەلق دەکا بۆ ئەو دینە. لە دەساتیردا دینی برەهمەنی پتر لە دینەکانی دیکە شوێنی دیارە. تەسەوفیش کە لە سەردەمی ئەکبەر شای هیندی ڕەونەقی هەبوو لەو دینەدا دەردەکەوێتەوە.

ڕەنگە تا ئێستا کەس پەیڕەویی ئەو دینەی نەکردبێ هەرچەند لە دەساتیردا نامەی ساسانی یەکەم دەڵێ ئەردەشێری پاپەکان وێرای ئاتەشکەدە بوتخانەی ئەستێرانیشی دروست کردووە. ئەمەرۆکە شتێکی لە دەساتیردا گرنگ بێ زمانەکەیەتی نەك باوەڕەکەی چونکە زەرەرێکی لەوەوە پێمان گەیشتبێ لە زمانە ساختەکەیەوە هاتووە نەك لە دینە ساختەکەیەوە. ئەگەر زیانێکی دیکەش هەبووبێ لە غەیری زماندا بەزەردەشتییانی گەیاندووە کە پێیان نامەی وەها نایاب بەنامەی ئایینی خۆیانی وەربگرن. لێرە بە پێشەوە گوتمان نووسەری (برهان قاطع) سەدان وشەی هێناوە بێ ئەوەی بڵێ ئەو گەوهەرە گرانبەهایانەی لە کام گەنجینەی نرخدار هێناون.

بەدبەختانە ئەو فەرهەنگە سەراپا نادروستەی کە لە هیند نووسراوە و کەوتووەتە دەست ئێرانییان بێ ئەوەی وشەکانی هەڵسەنگێنن لە هەڵبەست و پەخشان بەکاریان هێنان. دوای بڵاوکردنەوەی دەساتیر ئەو وشانە وردە وردە پتر کەوتنە کایەوە هەرچەند بڵاوکەرەوەی دەساتیر مەلا فەیروز لە دیباچەیدا نووسیویەتی: «دەبێ بزانرێ زمانی ئەسڵی ئەو (صحایف منزله) بیرای بیرای خزمایەتی بە زەند و پەهلەوی و فارسیی دەرییەوە نییە بەڵکو لەگەڵ هیچ زمانێکی ناسراوی تایفە جوداکانی ئەم سەردەمە نیسبەتی نییە.» هێندە هەیە مەلا فەیروز نەیگوتووە دەساتیر ساختەکاری درۆزنێکی تەڵەباز بێ. لە هەموو جێگەدا بەتامویز ناوی دەبات بە کتێبی پیرۆز و پووپەرەی ئاسمانی دادەنێ تاکو لە ئێران وەهایان زانی کەوا بە ڕاستی دەساتیر لە نووسینەکانی ئێرانی کۆنە و هاوتای ئاڤێستایە. زمانیشی یادگارێکە لە ڕۆژگاری ئێهەرپو. ئەمەیە دەبینین نووسەرانی سەردەمی (ناصرالدین شاه) بۆ ئەوەی شتێکی نوێ بخەنە بازاڕ دەستیان دایە تاڵانکردنی دەساتیر بەڵام هیچ یەکێکیان لە خۆی نەپرسی ئایا ئەگەر دەساتیر ڕاست و دروستە بۆچی تاکە یەك فەرهەنگی پێش (برهان قاطع) زمانی دەساتیریان یاد نەکردووە؟ بۆچی لە شیعری شاعیرانی پێش خۆیان یەکێك لەو وشانە دەرنەکەوتووە؟ بۆچی لە هەزاران کتێبی هۆنراوە و پەخشان قسەیەك

لەبارەی (مهاباد، جی افرام، شای کلهو، پاسان) نەگوتراوە؟ بۆچی دەساتیر خۆی بەر لە چاپکردنی لە هیچ کوێیەک ناوونیشانێکی نەبووە؟

(محمد تقی خان) بەنازناوی (حکیم) و نووسەری (گنج دانش) هیچ بەرلێدا نەهاتووە کە دەساتیر ساختەی باباپەکی تەقڵەباز و ناپەکار بێ، بۆیە لە بارەیەوە دەنووسێ: «دەساتیر ناوی کتێبێکی ئاسمانییە کە بۆ (مەهاباد)ی یەکەم پێغەمبەریان (مەبەست ئابادییەکانە) هاتووەتە خوار و بە جۆرە زمانێك نووسراوە تێگەیشتنی مومکین نییە و ساسانی پێنجەم وەری گێڕاوەتە سەر پارسی کۆن و لە (توحید و تجرید و حکمت و طاعت) دەدوێ و بریتییە لە چواردە ڕوویەرە (صحیفە) کە بۆ چواردە مەزنەپیاو نازڵ بووە و لە بەندەری بۆمبای چاپ کراوە و وەرگێڕدراوەتە سەر ئینگلیزی و بۆ ئێرانیان ناردووە و وشەکانیشی لەگەڵدایە [واتە تەرجەمە کراون]. خاوەنی (برهان) دیتوویەتی و هێندێك لە وشەکانی وەرگرتووە [زکر کردووە] ئێستا بەردەستە و بابەتی خۆش پەسەندی تێدا زۆرە و لای پارسییان گەلێك خۆشەویستە و ڕێزی لێ دەنێن» من خۆم [پوور داوود] سەر وشەی دەساتیرم هەڵبژارد و تەماشای ئەو فەرهەنگانەم کرد کە لە دەستمدان، هیچ کامێکم لەو وشانە تێدا نەدیتن.

لەمانە: (لغت فرس أسدی) کە لە سەدەی پێنجەمی ك. نووسیویەتی. (فرهنگ جهانگیری) کە جمال الدین حسین بەناوی جهانگیری پاشای هیند لە ۱۰۱۷ بە ئەنجامی گەیاندووە (فرهنگ مجمع الفرس سروری) کە محەمەد قاسم کوڕی حاجی محەمەد ئەلکاشی سرووری لە زەمانی شا عەباسی گەورەی سەفەوی کۆی کردووەتەوە. (فرهنگ رشیدی) کە عەبدولڕەشید کوڕی عەبدولغەفوور ئەلحوسەینی مەدەنی ئەلتەتەوی لە ساڵی ۱۰٦٤ لە هیند نووسیویەتی کە لەودەمەدا محەمەد حوسێن بن خەلەف ئەلتەبریزی لە ۱۰٦۲ هەر لە هیند (برهان قاطع)ی نووسیوە.

هەروەها هیچ یەکێك لەو سەد وشەیەم لەو شانامەیەدا کە ٥٠٠٠٠ ڕێکی هەستووە نەدۆزییەوە و لە ناو ئاڤێستا و پەهلەوی و پازەندیش تووشی تاکێکی نەبووم، بەڵام هەمووم لە (برهان قاطع)دا دۆزییەوە و دیتم هەرگیز ناوی دەساتیریان لەگەڵدا ناهێنێ هەرچەند گومانم نییە لەوەدا کە نووسەری برهان قاطع هەمووی لە دەساتیر هەڵگرتوونەتەوە دەربەستی دروستی و نادروستی وشە نەبووە هەرچی پەیدای کردووە خستوونیەتە فەرهەنگەکەیەوە، ئەوەندە هێزمشی نەبووە وشەکانی تورکی و عەرەبی و هیندی لە یەکدی جودا بکاتەوە وەیا ئەو وشانەی بنج و ڕەگی فارسییان هەیە لە

**وشەی ساختە بناسێنەوە**

نووسەری دەساتیر بۆ وشەسازی چەندین شێوازی بەکار هێناوە بۆ هەندێک وشەی مەعنای تازەی داناوە: ئامیغ کە بەواتای (امیزش – تێکەڵکردن)ە لە دەساتیردا بوومتە (حقیقت – ڕاستی) (امیغی – ڕاستەکی)، (یوزە) تووڵەی ڕاوە بوومتە (تفتیش – پشکنین)... و هی دیکەش. بۆ هەندێ وشەی عەرەبی وشەی فارسیی ساز داوە وەک: (خانە اباد – خانەی ئاوەدان) بەرانبەر (بیت المعمور – کعبة) و (هرسوبە پادشاهان – پاشایانی هەرلایە) لە جێی (ملوك الطوائف) و (کنور – کون ور) بۆ (فاعل – کارا) و (چشمیدە – چاوێنراو) بۆ (منظور) و (برش دید – بڕینی دیتن) بۆ (قطع نظر)...

یەک ڕشتەی وشەکانی لە مەفهوومی عەرەبییەوە هاتووە وەک (رویش – ئەومتی) بۆ (هویة) و (ڕاست پوش – کافر) و (افرازستان « هەورازستان» عالم علوي) و (فسردەشهر – علم سفلی) و (نخستین انداز « یەکەم ئەندازە» بدیهیە)

هەندێک لە وشەکانی لە ڕێی پێکگرتن (قیاس)ەوە ساز داوە. لە (خورشید)ەوە وشەی (هورشید و ماەشید)ی دروست کردووە لە زۆر وشەی فارسیدا پیتی یەکەم وەیا دوایی قرتاندووە یاخۆ پیتێکی بەسەرەوە وەیا کۆتاییەوە ناوە و وشەی دیکەی لێ هەڵبەستوون. (نیوارە) کە تیرۆکی ئانکردنە و (وردنە)شی پێ دەڵێن لە دەساتیردا بوومتە (نیور، نیوار) بەڵام بەواتای جۆ. (باستان) بووتە (باس) بەواتای (کۆنینە) لە بەرانبەر (حادث). وشەی (چم = واتە) پیتێکی (ر)ی پێوە نووساوە و (چمر) بەواتای ئاشکرا و پەیدا. وشەی (همە – هەموو) نیشانەی نەفی (أ)ی چووەتە سەر بوومتە (اهمە – ئەهمە) بەواتای ناتەواو.. هی دیکەش زۆر. بەم شێوازە نووسەری دەساتیر وڕێنەکانی خۆی خستوومتە قاڵبی وشە و ڕستەی ئاسانەوە و بە زمانی سەردەمی ساسانییانی لە قەڵەم داوە بۆ هیچ وشەیەک یەکی نەکەوتووە چەندان جار بۆ وشەیەکی عەرەبی چەندێکی داتاشیوە بە نموونە: (هرآینەبود، هرآینە هستی، ناچارباش، ناگزیرباش، ناچارهست، گروزفرتاش) هەمووی بەواتای (واجب الوجود) و (شایستەهستی، شایستە بود، ناورفرتاش) لە جێی (ممكن الوجود)

لە دەساتیردا زۆر وشەی هیندیش دەبینرێ وەکو وشەکانی فارسی سەر و پێ و دەستی شکاوە و واتایەکی دیکەیان پێ دراوە.

[لێرە بەدواوە پوور داوود ١٦ دێر لە وشەی جۆراوجۆری ساختەکراوی دەساتیر

دەمێنێتەوە کە لە فارسی و هیندی و عەرەبی و هیچە داتاشراون.. پێویستم بەدیت لە چەند نموونەیەك بەولاوە ڕاگوێزم بۆ تێرەکانە چونکە کەس پێیان دەولەمەند نابێ . م . محەمەد]

| | |
|---|---|
| اپرخیدە | صریح و بیّ رمز |
| اوچیز | حقیقت و ماهیت |
| پازتازی | جزئی |
| فراتین | گفت – اسمانی |
| روزستان | اهل حرفت |
| نمشتە | عقیدە |
| نولە | کلام |
| نواد | زبان |
| وندسار | نقطة وسط دائرة |
| بمینە | معدە .... |

گوتمان لە برهان قاطع سەدان لەو وشانە یادکراون و ناوی دەساتیریان لەگەڵدا نەهاتووە. وەك دەشزانین لەم فەرهەنگەدا بۆ هیچ وشەیەك شایەد نەهێنراوەتەوە. لەبەرئەمە ناسینەوەی وشەی ساختە بۆ ئەو کەسانەی مایەیان نییە زۆر زەحمەتە. (رضا قلیخان هدایت) لە فەرهەنگەکەی خۆی (انجمن ارای ناصری) وەکو خاوەنی برهان قاطع سەدان وشەی دەساتیری یاد کردووە بەڵام هەرچەند لە ناست هێندێك وشەدا دەڵێ لە دەساتیر وەیا لە برهان قاطعەوە وەرگیراون، لە زۆر وشەدا نە ناوی دەساتیر نەهی برهان قاطع ناهێنێ. تەڵبەت بۆ هیچ یەکێك لەو وشە ساختانەش شایەدێکی نییە.

رەزا قولیخان بەرانبەر وشەی (فرسنداج) دەنووسێ: «بە هەرچی پێغەمبەرێکەری پێغەمبەران هەیە دەگوترێ. لە فەرهەنگی دەساتیر وەها نووسراوە. زۆر وشەی کە لە جهانگیری و سروری و رشیدی و برهان پەیدا نین لەفەرهەنگی دەساتیر ناوە کۆنەکانی پارسیەکان بە دەست کەوتووە و نووسراوە.» کاتێکی رەزا قولیخان فەرهەنگی خۆی دەنووسی دەساتیر بە یارمەتیی مەلا فەیرۆز بڵاو بووبووەوە. رەزا قولیخانیش وەکو سەدان لە نووسەرە هاوچەرخەکانی خۆی دەساتیری بە نامەی دینیی ئێرانی کۆن و دەناسی و لە زەمینەی یادکردنی وشەکانی دەساتیر پتر لە

برهان کەمەری هیممەتی بەستبوو و، لە هەندێ جێگەدا هەڵەی برهانی راست کردووەتەوە و هەر لە سەرچاوەی دەساتیری ئاسمانییەوە نرخ و واتای ئەوانەی چەسپ کردووە. زۆر جێی داخە کە برهان قاطع و انجمن ارا لە ئێران سەرنجراکێش بوون بەڵام فەرهەنگی جهانگیری و مجمع الفرس سروری کە باشترین فەرهەنگن بەلاوە نراون. ئەم گوتارە جێی رەخنەگرتن لە برهان قاطعی تێدا نابێتەوە. جگە لە دەساتیر وشە نادروستەکانی برهانیش پێرن لەوەی لێرەدا بگونجێن.

بێگومان برهان لە مەیدانی رەواجدان بە وشەی دەساتیر لە پێشەوە دێت، بەڵام هۆیەکی کە ئەو زمانە و وشانەی بەرانەی قبووڵ گەیاند مەلا فەیرۆزە چونکە پەیدا هەڵگوتنی ئەو لە دەساتیر وەهای کرد کەسانێکی لە زمانە کۆنەکانی ئێران ئاگادار نەبوون متمانە بکەن کە ئەم نامەیە یادگارێکی گرانبایەی رۆژگاری تێپەڕیو و میراتێکی پیرۆزی پێشینانە.

وەك دەزانین چەند کەس لە دۆستە زاناکانم خەریکی گردکردنەوەی فەرهەنگی فارسین. ئومێد دەکرێ لە هەر کوێیەك تووشی وشەی دەساتیری بوون بنووسن کە هی دەساتیرن و ساختەن چونکە ئەگەر ئەمە نەکەن لەداوڕۆژدا ئەو وشانە پەنەگیری حەڵق دەبن. ڤوللری vullers لە فەرهەنگی فارسی و لاتینی خۆیدا کە لە چەندین فەرهەنگەوە پێکی هێناوە لە هەموو شوێنێك کە وشەیەکی دەساتیری نیشان داوێ نووسیویەتی هی برهان قاطع و ڕاگوێستەیە لە دەساتیر بەجۆرێك کە ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپا لەو گەزەندە دوورن.

لە ئەنجامدا دەبێ بەسەر قسەکانمەوە بنێم: وشەکانی دەساتیر کە دزەی بۆ ناو فارسی کردووە زۆریان لە تەفسیری نامەی ئاسمانی سەر بە (فرجیشور) ساسانی پێنجەمە. ئەو پێغەمبەرەی کە خوا پێی دەفەرمووێ: «ودم تهالیس ارجم فرجیشوریك هورانگ زاهد» واتە « وە لە تۆخمی تۆ هەمیشە پێغەمبەرێك دەمێنێ». نامەی ئاسمانیی ساسانی پێنجەم بە (پرتوستان – پرتەوستان) ناودەبرێ.

با ئەوەش بڵێم کە زمانی مەتنی دەساتیر بریتییە لە:

یەکەم: یەك مست لە وشەی وەرگەراوی فارسی و عەرەبی و هیندی وەك. چمین = چونین (وەها). نام = فام (پاشگرە وەك زردفام) زمیر = زمین. چار = چهار (چوار). پندم = پنجم. سنجم = ششم. سفدم = هفتم. دشمیر = دشمن [سێ دێڕی دیکەش لەو

جۆرە وشانە. م . محەمەد].

دووەم. لەو وشانەی کە بە هیچ رەمزی و ئوستورلابێك نازاندرێ چین و لە کوێوە هاتوون وەك: چاگڤری = بیداری (بەخەبەری). پلیر = نخست (یەکەم). فرداب = پرتو (تیشك). جمساش = نور (رووناکی ). کاپ = سایە.

هیرتاسیام = ئیرانیهان. نوراخ = یونان. کلبار = اندوه (غەم). شلیده = فرزانه (زانا، زیرەك، پاك نژاد...).

نموونەیەك لە کار (فعل): هوزامیدن = پەنابردن.

شالندن = زانین. آدن = بوون. کمدن = کردن. انتامانیدن = انجامانیدن (ئەنجام پێدان). زاهدن = مان. وختن = گوتن و هی دیکەش..

جگە لەوەی کە ئەم چاوگانە بەپێی چاوگی فارسی بە دال و نون [وختن = گفتن بە تێ ونونە] دروست بوون، لە گەردانیشدا وەکو کاری فارسین. لێرەشدا دیارە کە نووسەری دەساتیر بێئێکی لە زمانە کۆنەکان وەرنەگرتووە ئەوەندە هۆشەشی نەبووە بۆ ئەم زمانە ساختەیە رێزمانێکی ساختەش دابنێ. وەکو دەزانین چاوگ لە زمانی ئاڤێستا و فورسی هەخامەنشی و لە سانسکریتدا کە یە خوشکی زمانە کۆنەکانی ئێران دەناسرێ وەنەبوو وەك چاوگی پەهلەوی هەر بە (تن) و وەك چاوگی فارسی هەر بە (تن، دن) کۆتایی بێت بەڵکو وەك کۆنە زمانەکانی هیندی – ئەورووپایی و وەك ئێستاکەی زمانی ئینگلیزی دەشیا بە هەر حەرفێك (دەنگێك) کۆتایی بێت.

هەروەها لە زمانی کۆنی ئاڤێستا و فارسی و سانسکریت کار (فعل) وەك کاری فارسی [نوێ] گەردان نەدەکران.

ئینجا فارسیی نوێ ئەگەر ریشەی بە مەتنی دەساتیریشەوە نەبەسترابێتەوە کە گۆیا بەر لە هەزاران ملیۆن ساڵ بەسەر (فرجیشوران)دا دابەزیوە، بەڵکو بە تەفسیرەکەیەوە بەسترابێتەوەکە گۆیا لە زەمانی (خسرو پرویز) بە ئەنجام گەیشتووە، خۆ ئێمە لەبارەی زەمان و زمانی ئەو دەورانە [بابەی لێککردنەوەی راستی و درۆ] بەڵگەیمان هەیە.

لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە زمانی دەساتیر خەتی تایبەتیشی نییە و بە ئەلفبێتکەی فارسیی ئێستاکە نووسراوە، ئەمەش عاجباتییەکی کتێبەکەیە.

نووسەری دەساتیر بێ هیچ دەستوور و قانوون وشە یەککەوتەکانی پەهلەویی هەڵبژاردووە تەفسیری بێ نووسیوە.

لە ناواخنی دیارە دەساتیر لە هیند نووسراوە و نووسەریشی ڕەنگە بە ئەسڵی زەردەشتی بووبێ بەڵام لە ئاینی دێرین ڕووی هەڵگێڕاوەتەوە و بە زەردەشت خۆی دەڵێ: «جم دساتیرکانی لەونی = جزدساتیر کاری نکنی. جگە لە دەساتیر کارێك نەکەی.» ئەمەیە دەساتیر، کتێبێکی بەر لە ١٢٠ ساڵ لە نامەکانی دینی ئێران حیساب کراوە و زمانیشی بە فارسیی پێشکەوتوو وەرگێڕاوە ئەما ڕاستییەکەی سووکیکردنێکە بە ئێران و زمانی فاسی.

بەمەدا گوتارەکە تەواو دەبێ. لە ژێرییەوە دەنووسێ:

«تەماشای ڕووپەڕە ٣٢٩ی ئەم کتێبەش بکەن»

لەو ڕووپەڕەیەدا سەرناوی (ملحقات – پاشکۆکان) چەند کورتەنووسین و تێبینی بەدوا خۆیدا دەهێنێ. یەکەم جار لە شەش ڕووپەڕدا بە باسی دەساتیردا دێتەوە. بەدرێژی باسی ئەو بەڵگانە دەکات کە دانەری دەساتیر دەبێ ئەو (ادزکیوان)ە بێ کە پێشتر ناوی هات و لە (دبستان المذاهب) ناوی ئەو و موعجیزاتی و ناو و ناکاری پیرەوەکانی بەزۆری هاتووە کە ئەمەش هەر بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە نووسەری (بستان المذاهب)یش یەکێکە لەو گرووپەی بە دوا ئازەر کەیوان کەوتوون و بۆ دەساتیر خەبتاون. پوور داوود لەو پاشکۆیەدا هەڵەیەکی خۆی ڕاست دەکاتەوە کە لە گوتاری دەساتیردا بۆ ئەوە چوو بوو کە دانەری (دبستان المذاهب) موحسین فانی بێت.

دەڵێ: «لە ڕووپەڕە ٢٨ ، لە گوتاری (دساتیر) نووسەری (دبستان المذاهب)م بەموحسین فانی داناوە ئەمەش هەڵەیەکە کە لە پیاوێکی ئینگلیز sir w. jones ەوە بە هەڵەی گەیشت و دەمێکیشە ڕاست کراوەتەوە بەڵام من بەدرەنگەوە زانیم: لە دبستان المذاهب ناوێکی موحسین هاتووە و لە زاری ئەوەوە باسێکی یەك لە شاگردانی ادزکیوان گێڕاوەتەوە ئیتر بەهەڵە لەوەوە موحسین فانی بە نووسەری دبستان زانراوە. دانەری دبستان نەناسراوە بەڵام لە ناوەرۆکیرا دیارە کەمێك پێش ساڵی ١٠٢٧ك. لە هیند هاتووەتە دنیا. بە گەنجی چووەتە (اکبر اباد – اگره – aqra) و لە کشمیر و لاهۆری ڕابواردووە و سەفەری بۆ ئێران کردووە و چووەتە مشهد و.. و .. لە نێوان ساڵانی ١٠٦٤ و ١٠٦٧ دبستان المذاهبی نووسیوە و لە ساڵی ١٠٨١ لە پازدەمین ساڵی حاکمایەتیی اورنگ زیب مردووە وەك خۆی دەڵێ: (هراد و فرشید و ردوبهمن و خرمند)ی لە patna و (موبذ هوشیار دوم، سروش، خودا جوی) لە کشمیر دیتووە ئەو

کتێبانەی کە نووسەری دەبستان ناویان دەبات و ئەو مەیەستانەی لێیانەوە نەقڵ دەکات هەمووی لە نووسینەکانی ئازرکیوان و شاگردەکانی ئەون وەک کتێبەکانی. ئامیفستان، دساتیر، اخترستان، جشن سده، سرودمستان، جام کیخسرو، شارستان چهارچمن، زردست افشار، نوش دار و، سکنگبین، بزمگاه ارژنگ مانی و هی تریش. چونکە دانە لەو نامانە کە (دساتیر و جام کیخسرو و شارستانی چهارچمن و زردست افشار)ن هەن و لە هیند چاپ کراون. ناوی نووسەری دەبستان لە یاداشتێک بە (موبد شاه، یاخود، ملا موبد) هاتووە [لە پەراوێزدا دەڵێ سەیری ئینسایکلۆپیدی ئیسلام TOMI بکە]. هتد . هتد...

کاروان، ژمارە ١٢، ١٩٨٣

# زرەخەون لە تەمومژ بە دەوری "مەحوی" تروقەنەوە

لە بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیریی جەماوەر، لە سلێمانی، بانگهێشتنێکم بۆ هات وێڕای نامەیەکی دڵسۆزانە لە مامۆستا عەبدوڵڵا ئاگرینەوە بەبۆنەی سازدانی میهرەجانێکی بیرهەرەوەی شاعیری مەزنی کورد (مەحوی) لە ڕۆژانی ١٢/١٧ و ١٩٨٧/١٢/١٨. هەر لە سلێمانی. چەندێك بەو میهرەجانە دڵخۆش بووم هێندەم پەرۆش خوارد لە نەلوانی دەرفەت بۆ ئامادەبوونم تێیدا. باری نالەبار و تەنسازیی مەیلەو لار بوونە سەرباری چەند هۆیەکی دیکەی نەگوتەنی لە شوێنی خۆمدا پێشیان پێ خواردمەوە چ ماوەیەکیش نەبوو لە نێوان شەوی ١١- ١٩٨٧/١٢/١٢ کە نامە و بانگهێشتنەکەم پێ گەیشت لەگەڵ ڕۆژی بەرپابوونی میهرەجانەکە بایەی ئەوە بکات بە گوتار پایەی ئەو کەڵەشاعیرە لە هەستەدا بەمەوە بە خامە و بیکەمە نامەی پیرۆزبایی و منەتباری بەڵکو قەرزداریم لە ئاست گیانی مەحوی و چاکەی بەڕێوەبەرانی میهرەجانەکە نەختێك کەمتر بکاتەوە ئێستە لە ١٩٨٧/١٢/١٩ کەوا گاگوڵە بە خامەی ساوا دەکەم بۆ ناو باغ و ڕاغ و دەشت و بەهەشتی جیهانی مەحوی نازانم میهرەجانەکەی بە چ گەیشت. تەما و ڕاپەڕموونم بە پایەی مەحوی و هەستی ترخزانی و بایەخناسیی ئەدیب و ئەدەبدۆست و جەماوەری خوێنەری کورد بە گشتی و هی شاری سلێمانی بە تایبەتی هانم دەدا لە تاریکیی بێ هەمبەریدا گەشبینانە چاوەچاوی ئەو دەمە پیرۆزە بم کە موژدەی نە تەنها سەرکەوتن بەڵکو هی هەڵمەتبەری و بەهرەبەخشی و بەرهەمداریی میهرەجانەکە گیانم دەگەشێنێتەوە وا لە ئێستاوەش ڕێم بە خۆم داوە هتووکەی شادیی دەروونم بەو موژدەیە بگرژێنێتەوە و بەوەدا تام و شامی کۆڕی مەحوی بەبزێنە سەرمکەمەوە و بە خۆشاو بتکێنە ناو دێڕەکانم بۆ بەر چەژی خوێنەران:

دڵـی مردم بـەشۆخی دلـبەرێکی تـازە سەرلـەنوێ
موبارەك بێ لە دڵ سەودایەکی کەی کەوتە سەر، لە نوێ

بەڕاستی و بێ تەئویل، موبارەك بێ لە دڵ سەودای دەریا و دەشت و دۆڵ و کەژ و چەمەن و باغی مەحوی کە بە نەفسوونی شیعرەکانی جلوە لە خەیاڵی خوولیادار

دەبەستن، ترکە و نەعرەتە و هەڕەشەی ئەم سەردەمە لەبەر گوێی دڵدا دەگۆڕن بە ئاهەنگی بلبل و ساز و عودیان هەر نەبێ وەك بەنجی برینکاری ئازاری هەستی زامدار سڕ دەکەن. کێ بێ لە ئێمەی کوردی ئاخطێوەی ساڵی بەدبوومی ١٩٨٧ و سەدەی بیستەمی خوێن لێچۆڕاو دڵێکی یان ملێکی بەر تیغی بڕندە نەکەوتێبێت:

لە چاوا ئەم ئەما بۆ گریە نۆبەی سەجدە بەر دەرییە
سپاساڵم ئەبارە نوێژی ئیستیسقا ئەکەم چ بکەم

خۆم لە جیاتی قەڵەم سەد جار (سەجدە بەردەر)ی پەرستگەی دیوانی مەحویم کە لەوێدا بێ لە چاکی و پاکی شتێك نییە سەجدەی بۆ ببردرێت.

خەیاڵی کۆن و نوێم لێ تێکەڵ دەبن و دەمگێڕنەوە بۆ ڕابردووی دە دوازدە ساڵێك لەمەوبەر و حیکایەتخوانیم بێ دەکەن تا بڵێم یەکێك لەو خولیایانەی دەمی ئەندامەتیم لە کۆڕی زانیاری کورد کە هەست و خوازمی بۆ خۆی دەکێشا ئەوە بوو، دوا بەدوای لێبوونەوە لە باسی حاجی قادر، یان بە کتێب یان بە زنجیرە گوتار لەسەر شاعیرانی ڕیزی یەکەمی خاوەن دیوانەکانمان بنووسم. بێگومان مەحوی لووتکەیەك بوو لەوان، هەر چەند شیعری مەحوی تە حەفتاکانیش هێندەی شیعری نالی و سالم و کوردی و شێخ ڕەزا و وەفایی و مەسباحولدیوان... بە بەرچاومدا تێ ئەپەڕیبوو، بەلام ئەو نموونانەی بیستبوومن و خوێندبوومنەوە بێ هەڵوەستکردن، شەبەنگی مەحوییان لە هەستمدا بەرەو پایە هەرە بڵندەکان دەبرد. مەعارەتێکی لەو نموونانەدا ڕەنگی دەدایەوە دەتگوت لە گۆمی نالی بلّق دەدات:

ئەوا لەیلا بەڕۆژی حەشر ئەدا وادەی لیقا «مەحوی»
هەتا تامی قیامەت ئاه و واوەیلا ئەکەم چ بکەم

چەند ئاشکرایە (واوەیلا) جڵەوی هۆشت بەرەو (وا لەیلا)وە دەبات کە لە بەرایی ئەوە دێری یەکەمی بەیتەکە دەدرەوشێتەوە. (وا)ی سەرەتای وشەکە سێبەری ئەو (و)ەی بۆ ناو وشەی دواتر بردووە و (لەیلا)ی کردووە بە (وەیلا). سەیریش بکەی دەبینیت لە (ئەوا لەیلا)دا دەقی (وا لەیلا) بە تەواوی دروست بووە، ئینجا لە وشەی (وادە)ی دوای وشەی (حەشریش) ئەکانێك بۆ ئەو (و)ە باس کراوە دەچێت کە (لەیلا)ی کردووە بە (وەیلا) و بە تیرێك دوو نیشان پێکراوە. ئەم مەعارەتە، بەر لە مەحوی، تەنها لە نالیدا بەدی کراوە کە گوتوومتی:

بۆ شەدی کلامت کە بە اشرابی لطافت
(لذة) دەگەیێنێ بە دڵ و (دهن)ی مخاطب

بە ئانقەست و بۆ خاتری باشتر ڕوونکردنەوە بەیتەکەم بە ڕێنووسی کۆن نووسی.

داڕشتنی بەیتەکە و ئەو کەرەستەی تەعبیری تێیدا بەکار هێنراوە نوختەیەکی پیتی (ذ)ی گوشراو لە (لذة)وە دەگەیەنێ بە (دهن) و دەیکاتە (ذهن). شەدی کەلام لە (دهن)دا کە بەواتای دەم و زارە جێی دەبێتەوە بەلام کە (لطافت)ی تێکەڵ بوو حەقیەتی بگاتە (ذهن)یش. شەهد و دەم هەردوویان مادین، بەلام (ذهن) مەعنەوییە بە (لطافت) کە وەک ذهن مەعنەوییە ئەو شەهدەی پێ دەگات. وشەی (دهن)ی فارسی ئەگەر وەک خۆی (دەهەن) بخوێندرێتەوە کێشی بەیتەکە تێک دەچێت بەوەشدا دیارە تەرخان کراوە بۆ قۆستنەوەی نوختەکەی (ذ) تاکو ببێتە (ذهن) کە لەگەڵ (دهن) نەک (دەهەن)دا هاوکێشن، سەیری دوای (لذة) بکە یەکسەر (دەگەیێنێ) هاتووە کە هەر (گەیاندن) چاری ڕاگوێستنی ئەو نوختەیە دەکات بۆ سەر (دهن). دەمێنێتەوە بڵێین (دڵ) هەر شیرنایی مەعنەویی شەهدەکە هەست دەکات، نە نوختەی ڕاگوێزراو بە خۆیەوە دەگرێت و نە پەکیشی لەسەری کەوتووە بۆیەیە ئەو نوختەیە لە شێوەی (حتمی) بۆ (دهن) دەچێت. وەک کە شیرنایی مەعنەوی بۆ دڵ و ذهن لەبارە، شەهدیش بۆ (دهن) کە دەمە لە شوێنی خۆیدا بە مادی دەمێنێتەوە

مەحویش کە لەیلای لە جێگەی (یارم، مەحبووبە...) دانا و ئەیگوت:

ئەوا یارم بە ڕۆژی حەشر ئەدا وادەی...
ئەوا مەحبووبە ڕۆژی حەشر ئەدا وادەی...
ئەیگارم وا بە ڕۆژی حەشر ئەدا وادەی...

مەبەستیەتی تێی بگەیێ دەیەوێ (وا لەیلا) وێردی زاری بێت تا ڕۆژی قیامەت. لە سێبەر یاخود لەبەر تیشکی وا وەیلا و وا لەیلادا (قامی قیامەت)یش قوتەقوتێک لەگەڵ هێما ناسینەوەماندا دەکات. ئەگەر ئەگونجانی کێش لێ گەڕابایە دەشیا (قامی قامەت) لە جێی (قامی قیامەت) بێ وەک کە شیا وا وەیلا لە جێی وا لەیلا بێ، چونکە لە پێشەوە باسی حەشر هاتووە لە واتادا فەرق نامێنێ لە نێوان قامی قیامەت و قامی قامەت کە دەزانین قامی قامەتی ئەو نازدارە لەیلایە هەزاران جار پتر پەسەندی مجێزی عاشقە، هەتا قامی قامەت دەبێ بڵێم وا لەیلا.. دەرکەوتن و ڕاستبوونەوەی قامەتی لەیلاش تاواتێکە هێندەی حەشر لە تەمای عاشق دوورە، هێندەی حەشریش

ناشووبی شەیدایی لە جیهان پەیدا دەکات

مەبەستم نییە بڵێم ئەو مەهارەتە و هونەرەی مەحوی لەم بەیتەدا چاولێکەرییە لەوەوە بۆ نالی، خۆ ئەگەر وەهاش بێت ﭺ کەمایەتیی تێدا نییە، بگرە زێدە بەهرەیەکی مەحوییە لەو بەیتەدا دیار دەدات چونکە ئەم جۆرە چاولێکەرییە ناسەنگترین ڕێگەیە شاعیر پێیدا بڕوات لە هونەری شیعری خۆبەستنەوە بە شیعری یەکێکی دیکەوە وەک: اقتباس، تضمین، معارضە... ڕاستییەکەی ئەگەر مەحوی هەستی بەو هونەرەی نالی کردبێت، کە بە ترجیحەوە دەڵێم هەستی پێ کردووە، تاکە کەسێک دەبێت لە شوعەرای کوردی دەیانناسم ئەو هونەرەی لە نالیدا دۆزیبێتەوە. من لە گوتارێکی زنجیرەی (چەپکێك لە گوڵزاری نالی)دا دەوری ئەم شێوە هونەرەی نالی هەڵاتووم، ئەوساش جارێ بەیتەکەی مەحویم نەدیتبوو بۆیە بوو پەنجەم بۆ نموونە شیعری ڕانەکێشا لە بابەتی بەیتەکەی نالی بێت، ئەو هونەرەش نەمبیستوە ناوی بۆ داندرابێت مەگەر بە تەنوێلێکی دوور بدرێتەوە بە (استخدام). ئەوساش پەراوێزی ئیستیخدام وەها لێك دەکێشرێتەوە زۆرینەی جۆرەکانی (محسنات)ی تێدا جێ ببێتەوە. ئێرەش جێی لێکۆڵینەوەی باسی ئەوتۆیی نییە لە مەحویمان بدزێتەوە بۆ خۆی...

دوای دابڕانم لە کۆڕ باری چالاکیم لە مەیدانی نووسیندا گۆڕا. حاجی و نالی جگە لەوەی کە خۆم بە دڵ و زمانیش پێیانەوە خەریك دەبووم، بڕیاری ئەنجوومەنی کۆڕیش ئەوە بوو لێیان بکۆڵمەوە و بۆ حیسابی کۆڕ ئەو لێکۆڵینەوانە بڵاو بکرێنەوە لە بەرەو کۆتاییی ساڵی (١٩٧٨)ەوە نیمکان نەما خۆم تەرخان بکەم بۆ تاکە باسی کەسێك یان بابەتێك ساڵێکم لێ بخایەنێ مەگەر یەکێك یان لایەنێك بەرباری ئەرکی ئەو کارە بێت، ئیتر ئەشیا چی دیکە بە پلان و ئەفەسی درێژەوە تەمای خۆم لە توێژینەوەی ئەدەب وەها ژیانی کەسانی دەستنیشان بنێم. لوان و ڕێکەوت جۆنی هێنا و کێی خستە توێی فکرمەوە دیمانەی بەختیر. قەدەر، ڕێکەوت وەها بوو کە ئەم ساڵەی ١٩٨٧ لە گیانەلاوەی بەسەرچوونیدا هات دوو لێوەی مەرگی لێك بنێت بابەتی ئەم نووسینەی بەرکەت و بە میرات بۆ منی بەجێ هێشت. ئاخر منیش ٣٦٥ ڕۆژی ڕەبەقی ڕەق ڕووڵەییم کردووە و لێی بووم بە میراتگر. دەڵێن سەیرە لە کۆیێ بەڵام سەیرترە لە ڕۆژگار کە ساڵی وەها ڕەش میراتی وەها گەش بەجێ بهێڵێت. ئایەتی (یخرج الحي من الميت)م بە بیردا دەهێنێتەوە.

مەحوی و هاومەسلەکە ئەمرەکانی لەو جۆرە ئەستێرانەن ئاوابوون و بزربوونیان

بۆ نییە. لە دەمێکەوە بە دڵ و هۆش ئاشنایانم، بێ بەپێی فراژیبوونیشم لە ئاسینەوەی بایەخ و نرخ و جوانی پتر ئۆگری ئاو و شاعیریەتییان بووم. ئەو ڕاستییەش لە زیندە بەهاوچاکیی خۆمەوە نییە بگرە لە زیندە بەهاوەتیی ئەوانەوەیە کە لەسەر بنگەیەک دامەزراوە بە دروستترین عەیارەی نرخ پێو سفتی و پتەوییەکەی بە نیسبەت دەگات. لە گەیشتن بەو نیسباتەش ڕەنجم بردووە:

من لە عەیارەی نرخ پێو هەرچی خاترانەیە تێم نەهێنندووەتەوە، مەرجەکانی پەسەندایەتیی عەیارەش لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێک دەگۆڕێن. ئەو بابەتانەی کە لایەنی (جوانی) تێیاندا بنەڕەتییە دەبێ لە پلەی جوانیدا زۆرزووی (ناوەنجی) گەرتبێتنەوە دەنا بەعەیارەی من لە سەنگ دەکەوێ، ناچاریش نەبێ خۆمیان تێ ناگەیەنم. بێکەس لە موناسەبەیەکدا گوتی: هەردوو گوێم پڕ بوو. منیش دەڵێم ئەرز و ئاسمان پڕ بوو لە گۆرانیی ناوەنجی و مۆسیقای ناوەنجی و بەستەی ناوەنجی و شیعری ناوەنجی و چیرۆک و ڕەسم و پەیکەر و شلە ساواری ناوەنجیش تاکو لە دەفری تەحەمولمان کەلەپێژییان کرد. ئەو بابەتانە – جگە لە شلە ساوار – تێکڕایان بەر جغزی مەهارەت دەکەون، بابەتیش هەن وەکو پزیشکی، بەنایی، خەیاتی، دارتاشی، شەعبەدە، چاپوک دەستی... و دەیان و سەدان کەسب و کار لە هەمووانیدا مەهارەت هەیە تا ئەوەی پزیشکی ناماهر دەبێتە مەرگی نەخۆش بەڵام دوو نوختە (ناڵێم پتر) لێکیان جودا دەکاتەوە. نوختەی یەکەم ئەوەیە کە هەرچی بەرەو هونەری تەواوەوە دەچێت لایەنی جوانی و مەهارەت تێیدا بەرچاوترە تا ئەوەی ڕەنگە هونەری هەبێ هەر مەهارەتی ڕووت بێت کەچی پزیشکی لە سەرەتاوە زانستە دواتر مەهارەتە. نوختەی دووەم ئەوەیە پزیشکی و نەجاری و لێخوڕی و بەنایی بە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سینەما و شانۆ و نووسینی ڕۆژانە ناخرێتە بەرچاو و گوێی خەڵق... گۆرانیبێژێکی نەوداشت لە هەموو زاناکانی وڵاتی خۆی مەشوورتر دەبێت، تێشیاندا هەیە لە مەرگیدا کچان خۆیانیان بۆ کوشتووە.

شیعر بابەتێکە لە لایەن مەهارەتەوە دەکەوێتە نێوان ئەدەبی پەخشان و هونەرەوە بابیی زیندە بەشێکی لە جوانی و مۆسیقا پەخشان بەجێ دەهێڵێتەوە بۆ لای هونەر. هەرچی بابەتێکی بەشێکی جوانی و مەهارەتی تێدا بەرچاو بێت لە پلەی یەکەمدا ڕوخسارە ئەوجا ناوەرۆک. تابلۆیەکی ڕەسم کە مەرجی هونەر و مەهارەتی تێدا نەهاتە دی نرخی نابێت با لە ناوەرۆکدا پێش نیسبیەی ئانیشتاینیش گەرتبێتەوە ڕەنگە

مولحیدێك وێنەیەكی معمارەتی كەعبە بەدەیان هەزار دینار بكڕێت هەروەك دیندارێش لەوانەیە رەسمێكی پشت لە دینی پڕ لە معمارەت بەو نرخە بكڕێت بە مەرجێك خۆی مەیلی هونەری هەبێت. ئینجا كە زانیمان شیعر خزمی هونەرە هەقمانە لێی داوا بكەین جوان و ڕازاوە بێت، كە وەها نەبێت لە شیعرایەتی دەكەوێت.

ڕاستییەكی دیكەی گرنگیش هەیە داوا لە شیعر و تێكڕای هونەر دەكات ڕازاوە و بێ عەیب بن. شیعر و هونەر لە چاو قسە و پەخشان نامێری مام سەلامەتۆكەی تەعبیرن. جاری لە پێشەوە با بڵێم هونەری ڕووت چونكە قسە ناكات یەكجار بە دەرەنگەوە ڕقی خەڵق هەڵدەستێنێت لە خۆی، شیعریش بە درێژایی ڕۆژگار بە قسەی خۆش و جوان و شیرین لە قەڵەم دراوە و خاڵیبەخشیش كراوە لە جورنەتێكی تێیدا بوو بێت. شیعری بێ پەردە و پشت لە دین كە بەرەهایی لە ماوەی هەزار و چوار سەد ساڵدا بڵاو بووەتەوە ڕێی خۆش نەكرد بۆ بڵاوبوونەوەی یەك لاپەڕە نووسینی پەخشانی پشت لە دین و بێ پەردە.

چەند سەیرە كە دەبینین هەموو ئەو تامەزرۆییانەی خەڵق بۆ لای زایەند (جنس) كە بە قسەی نووسراو لە كتێب و گۆڤار و ڕۆژنامانەدا ناشكێندرێت بە ڕەسمی ڕووت خۆی دابین دەكات هەر چونكە ڕەسم هونەرە و قسە نییە. گۆڤار و ڕۆژنامەش هەر ئەوەن كە هەن.

لەمەوە دەڵێم پەخشانێكی هەڵەتی تێدا بێ بۆ سەر ڕوویەكی كۆمەڵایەتیی ناڵەبەر ئەگەر ڕواڵەت و ڕوخساری كزیش بێت جێی خۆیەتی ڕێزی لێ بندرێت چونكە نازایی شەفاعەتی بۆ دەكات، قۆنتەراتیشی ئەگرتووە جوان و شلك بێت. بەڵام هەمان هەڵەت بە شیعری لاواز نرخی نابێت چونكە مەرجی شیعرایەتیی تێدا نوقسانە. یەكێك ناتوانێ بە شیعری جوان هەڵەت بەرێت خۆ پەنجەی لە پەخشان ڕەق نەبووە هەڵەتەكە بداتەوە بە پەخشان. بۆیە دەبینین نووسینی لاواز پتر لە شیعری لاواز بڵاو دەكرێتەوە. بەیتێكی لەنگ بێت لەخۆوە دەسرێتەوە.

لزووم نابینم خۆم لە خوێنەران بكەم بە پسپۆڕی نرخی جوانی و بایەخی بابەت لە كاری ئەدەبی و هونەری و هی دیكەشدا هەرچەند دەشزانم بازاڕی ڕۆشنبیریمان تا بڵێی پێویستی بەناسینەوەی ئەو نرخانە و پایەیان لە پلەی خوار و ژووردا هەیە چونكە بەداخەوە لە گەلێك نووسیندا دیتوومە بەرهەمی ترسنۆك وەها بردراوەتە

بەرزایی هەر دڵێی قارەمانەتیی دوازدە سوارەی مەریوانم بۆ دەگێڕێتەوە

شیعری شاعیرە بەسەرچووەکانی قوتابخانەی (نالی) دەبێ لەو کولانانەوە سەیری بکرێت. لەلایەن ئاوەزوکەوە ناشێ لە کۆتایی سەدەی بیستەمەوە عەیارەی نرخاندن بە دیاری بنێرم، وەکو کۆتك و تەبەقی دەستەوایی. تاکو (ساقی لە پەردە دەرهات و مەستوورە و غەیری وەحدەت لە وجودا نییە و لە تەلقەی ناڵ و شەققەی پانی بەرزی و پەھودی بەچچە...)ی بێ هەڵبسەنگێندرێن.

مەچۆی کە بدرێتەوە بە ڕۆژگاری خۆی تۆقەڵەیەکە لەو تۆقەلانەی گەردەن کێل کە لەودیوی ئاسۆی بەسەرچوونیانەوە بە پرشنگ و تاو و تین، ڕووناکایی و گەرمایی و جوانی لە شێوەی میراتی بێ براندوە بۆ چین لە دوا چینی زیندووان بە دیاری دەنێرن. چی گونوومتی و کردوومتی بە ڕوخسار و ناوەرۆکەوە دەبێ لە نرخاندندا ئینسافی دۆستانەی لەگەڵدا بەکار بێت. ئینسافی دۆستانەش پێویستی بە لایەنگیری نییە. دوو نوختەی سەرەکیی سادەی تێدا ڕەچاو بکرێ بەسە:

١- داوا ناکرێ لە شاعیر قارەمانی خۆبەختکردوو بێت.

٢- کەس بێ عەیب نەخولقاوە.

بەسە بۆ مرۆ عەیبی ئەوتۆی نەبێ شەرمەزاری بکات.

ئینجا ئەگەر کەسی وەها هەبوو بە نازایی لە نێوان هەموو عالەمدا خۆی لە پێناو گەل و مەفتەن گەیاندبێتە پەتی سێدارە وەها هێندە بێگەرد بووبێت لە عومەری عەبدولعەزیز و غاندیشی تێ پەڕاندبێت، ئەوا زێدە نازایی و پاکییەکەی بە سافی تەواوەوە بۆی حیساب دەکرێت، بەڵام ناشێ ئەو پاڵەوانەتییە سێبەر بهاوێتە سەر خەلقوڵڵای جیهان کە خۆیان بەخت نەکردووە کاتێك گەلییەکە بەسەرشانی تێکڕای میللەتدا دووڕا ئەوسا جێی خۆیەتی عەیبداری وەکو بارانی پەڵەی ئیقلیمگیر هەموو شاعیر و ئەدیب و شێخ و مەلا بگرێتەوە.

لێرەدا ڕاستییەکی سەر بە کۆمەڵایەتی هەیە بەر پەراوێزی ئەم باسە دەکەوێ، لەو دەمانەدا کە کۆمەڵ وەکو گۆمی داوەستاو و بێ جووڵە ژیانێکی ڕۆژانەی کەمڕەنگ بەسەر دەبات و وەك چۆلەکە و کەروێشك خەریکی گوزەران و خۆپاراستنی (ناگرە سوورە لە خۆم دوورە)یە، هەموو چالاکییەکی گۆم شەقێن کە یاری نارام و مەندی کووچە و بازاڕ و ڕێ و بانان لەبەر هەنگاوی کەسایەت و گوزەران دەشێوێنێ خۆی

زەق و رەق و ناحەق دەنوێنێ. کە گوتراوە لە قەدەر بەری خۆت پێت ڕاکێشە وەیاخود مریشك هێلکەی قاز بکات وەهای لێ بەسەر دێت تەعبیری لە دڵ و دەروونی ئەهلی بازاڕ و کاسبی عادەتی و هەژاری بێ دەسەڵات داوەتەوە ئینجا هی دەسەڵاتدار. بەدریژایی ڕۆژگار بۆرەپیاوی سەربزێو لەلایەن ڕەشوڕووت و بێ دەسەڵاتەوە سەرشکێن کراوە (ئەگەر بە دەستم بوایە پەیکەری سەربازی نەناسراوم بۆ ئەو سەربزێوانە هەڵدەنا) دواتر قسە گەیشتووەتە توجار و شێخ و مەلا. حاجی قادر لە کۆیەی سەدەی نۆزدەمدا نموونەیەکی بێ مانەند و دەگمەنی چەندین سەد ساڵە بوو، خۆ ئەگەر مەلا نەبوایە و زمانی لە شیعری بڕند نەگەڕابایە هەرگیز نەیدەتوانی لە بەرگی فەلاحێکی نەخوێندەوو بەهەی شێخ نەبی و شێخ غەفوور بگرێت، کە بەخەشی گرتن توانی لە پەنا مەلایەتی و شاعیری و شەخسیەتی خۆیەوە ڕێزی خۆی بپارێزێ دەنا کەس بەدوا دەنگییەوە نەدەچوو. مریدەکانی شێخ ئەمیش کە بریتی بوون لە ڕەشوڕووت و کاسبی بازاڕ و بەشێکی توجارەکان و ئاغای لێکەوتە وەها چاو ئازا بوون پەلەیان کرد لە ڕۆژی ڕووناندا هەڵی بدرن. حاجی لەگەڵ ئەو ئازایەتی و هۆشیارییەشییەوە نەیتوانی لە کۆیێ بکاتە ئەو بزێوییەی پێی دەڵێن چالاکیی کوردایەتی، دواتریش کە لە ئەستەنبوڵەوە پەندی کوردایەتیی بۆ هاونیشتمانەکانی دەهەنارد کەس بەکردەوە گوێی بەقسەکانی نەبزووت. گۆمی داوەستاوی کۆمەڵ کە لە بنەڕەتدا بەسەر هەژارییەوە داوەستاوە و پەنگ خواردووی ژیانی کولەمەرگییە، هێندەی عەزابی گۆڕەوشار وەتەنگ دێت لە بزێویی بێ سەرویەر و داك و باب کەوا ترووسکەی ئومێدێکی تریك و بەرچاوی لێ دەرناکەوێت. کۆمەڵی دەوڵەمەند ئەگەر بە حەقیش تەبێ بە ناحەق دەستدرێژی لە جیرانی دەکات. فەلسەفە و بیری ڕووناکی بەرەو هاندان و هەڵگەڕانەوەش لە کۆمەڵی نیوەمردوو کار ناکات. لە نوخەنە نیگای ئەم قسانەشەوە ئەبوونی کەمان لە هەموو هۆیەك بێ ڕەزاترە بۆ چەسپاندنی ئەو مرەڵبییەی لە هەژارییەوە دەرسکێت. بە بیرم دێت لە بیستەکان و سییەکان، خەڵقی شار لە شایی و بەزمی شەوانەی چایەخانە و دانیشتنی دیوەخانەکان لە شیعری غەرامی بەولاوە گوێیان لە شتێکی دیکە ڕانەدەگرت، ناوناوەیەك ئەبێت کە گۆرانیبێژ بای دەدایەوە سەر شیعری ئاینی. ئینجا لەخۆوە دیارە کەوا بەر لە ٤٠ – ٥٠ ساڵیش زووتر ئەو خەڵقە هەر شیعرە دڵدارییەکانی حاجی قادریان لە کۆڕی شادیدا دەخوێندەوە قوتابیی مەکتەب هەوڵ جار بوون بە ئیستگەی بێتەلی شیعری

نیشتمانی، لەوانەوە وردە وردە خەڵقەکە ڕاهات ناردی گۆرانی لە مزاشی شیعری دڵداری و وەتەنی بهاڕێن. ڕەوای حەق نییە ئێمە مجێزی سیاسی و فەلسەفیی خۆمان لە چەژی مرۆی بەر لە سەد ساڵ بگێڕین وەیا بە عەیارەی وڵاتە هۆشیارەکانی ئەو سەردەمە کوردستان و کوردەواری هەڵسەنگێنین. ئایا ئەگەر ئیستاکەی خۆمان بە ئیستاکەی ئەڵمانیا و سوید بگرین چ دەردەچین؟ تا نووسینی ئەم دێڕانە یەک بانکی کورد لە مندالدانی مێژوو نەڕسکاوە، نەک بانك تاکە یەك (صراف)ی کورد پەیدا نەبووە، ئێمە هەتا ئێستا لە قسە بەولاوە فێری هیچی دیکە نەبووین قسەکەشمان لە خەڵق وەرگرتووە. ئەگەر لەوانمان نەبیستبایە هەر گاڵ و بوغی ڕۆژگاری سەردەمی حاجی و بەر لەویشمان دەکوتایەوە با ئەوەش لە بیر نەکەین کە حوکمداریی بابان و سۆران و ئەردەلان و نازانم کوێ لە سەردەمی خۆیاندا، لەگەڵ هەموو شانازییەکی ڕەوای پێیانەوە دەکەین. بەند بوو بە دەسەلاتی کەسانێکی وەیا بنەماڵەیەکی بەر زاراوەی (دەرەبەگ) دەکەون و لەلایەن بەشێکی زۆری ڕۆشنبیرانی سەردەمەوە تۆمەتی برندەی درندەیان تێ دەگیرێ، تۆمەتیش لە بەیندا نەبێ دەبێ بزانین ئەو ئەمیران و حوکمدارانە بە کردەوەیان لە واقیعی دواکەوتووی کورد زماندا تێیان دەگەیەنن کە بەرژەوەندیی خۆشیان ئەیخستنە سەر باری هاریکاری و دۆستایەتیی ناوکۆیی لە ئاست هەڕەشەی هێزە بێگانە زلە داگیرکەرەکانی ئەوسای کوردستان. خەڵقەکەی ئەوساش، لە دەرەوەی چەقڕی لەشکر و دەست و پاوەندی حوکمدارەکان دەورێکی بەرچاوی تایبەت بە خۆیانیان نەبوو لە هەڵسوکەوت و چەندوچۆنی ڕووداوی سەر بەحوکم و ئەوەی لە پەلاماری بێگانەوە بۆ سەر حوکمدارەکان و خاکی کوردستان بەنگبەت بۆیان دەمایەوە. چ سەیر و سەمەرەش لەو تابلۆیە ڕەشەدا هەڵنازەقێنەوە چونکە کەسانێکی لەوانە نەبووین پرسیاریان پێ کرابێ وەیا تێ خوێندرابێنەوە لە شەڕ و ئاشتی و شێوازی حوکم و چەندوچۆنی یاسای مالی و ئابووری... و هتد، جۆرێکی حەتمی و ناچاری هەر خەریکی خەتەجووت و دێراوی شیناورد و سەلەم و ڕێبەندی بازاڕ و مەڕ و ئاژەڵ لەوەڕاندن و ئالێ دەڵی بابەی مزگەوت و زەرگ لە خۆدان و شەڵتە خواردن و خەرەک ڕێسی و مازوو چنین و جموجووڵی گوزەران دەبن.

چاوەڕوان ناکرێ لە یەکێکی وەها بێ کیفایەت کە پرسی پێ نەکرابێ حەز لە چ بکات، تا ئەو بێ کیفایەتە سەر لە قور بنێت بۆ حاکمێکی لێی دەقەوەمێت هەرچەند لێ قەومانەکە بۆ ئەویش بەسفت و سۆ بێت. لەم سەردەمەدا من و تۆش کەمتر خەم دەبین

کە پرسمان پێ نەکرێت، خۆ بەخۆشمان دەڵێین ڕۆشنبیر، پێشڕۆ، ڕابەر. ئینجا مام بارامی عەبابەپلێی ساڵی ١٨٨٧ و ١٧٨٧ کە نەیدەزانی کاغەزیش مۆر بکات دەبێ چەند بەختەمی ئەم دنیایەوە بووبێت؟ کابرای جاف کە گوتی. مەحموود پاشا دەمرێ نامرێ ملی وەقونەوە، وامێ دەمرێ. ئەگەر وەهای ئەگونبایە زۆڵە ڕۆڵەی ئەو دەمە دەرنەچوو، پێت سەیر نەبێت باباپەکی ئەو سەردەمە چ مەلا بێت و چ شاعیر و چ کاسبکار بۆ تێشکانی پاشای ئیسلام لە ئاست پاشای نائیسلامدا پەرۆشی پتر بووبێت لەو پەرۆشەی بوویەتی لە تێشکانی حوکمدارێکی کورد بەرانبەر پاشای ئیسلام چونکە باوەڕی ئیسلامەتی لە شوبهەدا نییە کە هەبووە بەلام هەبوونی باوەڕی قەومایەتی ئەو بێ شوبهەیە نییە ئێستاکەش خەڵقەکە بەپێی باوەڕی خۆی پەرۆش دەخوات چ ڕۆشنبیر و چ نەخوێندوو تەنانەت باوەڕە سیاسییەکانی ناو کوردایەتی و هەموو جیهانی سێیەم هەمووی بووەتە جۆرە ئایینێك کە ڕەخنە هەڵناگرێ و ڕابەرەکانیان لە پایەی پێغەمبەرایەتیدان، ئیتر سەیر نییە ئەوانیش قەومایەتی بە قوربان (خەلیفە)ی شەقامەڕێی باوەڕەکەیان بکەن وەك کە ڕۆشنبیران بێ پەروا دەیکەن.

مەحوی مەلا و تەریقەتدار و شاعیر بووە. تەلێی داوا دەکرێ بە تەنها شیر و تیر لە زۆردار هەڵبگرێت کە ئەگەر هەڵی بگرتایە دەبوو بەر لە هەموو زۆردارێك بەخەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی بگرێت. ئەگەیپشی بۆ دەچێتەوە لەوەدا کە زێدە لە هەموو میللەت ئالای کوردایەتیی هەڵنەکردووە ئەگەر لە خۆمان بسەلمێنین دروشمی سیاسەتی ساڵی ١٩٨٧ بەسەر داروەکازی مەحوییەوە بشەکێنینەوە دەبێ خەریك بین لە خەیاڵەوە دروشمە سیاسییەکانی ساڵی ٢٠٨٧ بە چەرمگە و ئەقیزەکانی ئەمایشتی ئەم ڕۆژەماندا بدرووین دەنا بە گەز و گرێی خۆمان ئیفلاس دەکەین.

بەپێی ئەو باس و خەبەرانەی لە مەحوییەوە بە ئێمە گەیشتووە لەلایەن ڕەفتار و ئاکارەوە هەرچی هەوشێکی لەوانە بێ لە ئادەمیزاد بەداوێوە بکرێ تێیدا نەبووە مەلایەکی تەریقەتداری خواناس، لە چەقۆی باوەڕی ئیسلامەتیی خۆی دەرنەچووە هەوڵی گوزەرانیشی هەر پاپیی پەلەکوتکەی ژیانێکی سادە بووە کە بەحاڵ لە مەلایەکی خاوەن مەدرەسە و فەقێ دەوەشێتەوە ئەو سەفەرەی کە بەپێی قسەی مامۆستا سەجادی بۆ ئەستەمبوڵی کردووە لە ساڵی ١٨٨٣ ز گۆیا چاویشی بە سوڵتان عەبدولحەمید کەوتووە، ئەگەر ڕووی دابێ، خەبەرێکی خۆشە پایەی مەحوی لە سادە مەلا و تەریقەتدارێکی سەر بەرماڵ بەرزتر دەبات، زۆریش ئەك کەم، چونکە

گەیشتن بە سوڵتان لەوسەردەمەدا کارێکی ئاسان نەبووە پیاوێکی شۆرەتی مەزنایەتییەکەی بەر لە خۆی ڕێگەی چوونە لای سوڵتانی بۆ هەموار نەکردبێت تەمای سەردانی سوڵتانی نابێت. سوڵتانیش لە حیسابیدا نەبووە هەر بۆرەپیاوێکی ئارەزووی کرد خێرا دەرگای (بابی عالی)ی بۆ بکرێتەوە. خۆ ئەگەر دروستکردنی خانەقاکەی (مەحوی)ش مایەی ئەو ڕێزگرتنە بێت هێندەی دیکە بەڵگەی شەخسییەتی مەحوی دەچەسپێنێ. ئەو ڕوباعییە فارسییەش کە لە لاپەڕە (بیست و حەوت)ی پێشەکییەکەی (دیوانی مەحوی)، لە شەرحی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم و کاک محەممەد، بە عەیب حیساب کراوە لەسەر مەحوی بەوەدا کە حەمە عەلی شای قاجاری پێ هەڵداوەتەوە، ئەویش دەبێ بدرێتەوە بەو سەردەمەی تێیدا هۆنراوەتەوە تا ئەگەر خەڵقی سلێمانی وەیا کوردستان بە تێکڕایی لەسەر مەحوییان بە عەیب حیساب کردبێت ئێمەش پێرەوییان لێ دەکەین. بەڵام دەبێ کە ئەمەمان کرد هەموو ئەو ڕۆشنبیرە کوردانەش تاوانبار بکەین کە بە بروسکەی گەرموگوڕ پیرۆزباییان لە عەبدولکەریم قاسم کرد لەسەر بۆردمانەکەی کوردستان لە (١١)ی ئەیلوولی ١٩٦١. من دڵنیام لەوەی کە مەحوی گلەیی لێ نەکراوە چونکە ئەو خەڵقەی کە بە خەیاڵ دەهاتنەبەنە سەر گلەییکردن لە مەحوی بۆ خۆیان بەرزەیی بۆ زابیتێکی تورک ڕاست دەبوونەوە و دەستەونەزەر بەرانبەری دەچەقین. کوردەکەی ئێرانیش لە ئاست حکوومەتەکەی قاجاری هەروەها بوون، کەسیش بەتەما نییە گلەیی بە خەبەر بهێنێ لێیان. واقیعێکی هەناسەبڕی پشتشکێنی ئەو خەڵقەی تێدا گرفتار بووە ئەوە نییە لە ترسی گلەیی دواڕۆژ (کە هەر بە وەهمیش دانەهاتووە) سەرپێچی و سینگ دەرپەڕاندنی پێ کردبێ لە ئاست داگیرکەری بێ ڕەحم. سەیری مێژووی کۆن و نوێ بکەیت دەبینیت کورد کەمتر لە میللەتانی دیکە سەودای کوڕێنی و دەماغبەرزیی شك بردووە. قسە لەم ڕێبازەوە شریتەی هەیە من لێی دەبڕمەوە. بەڵام ڕاستییەکەی حەزم دەکرد بزانم ئەو ڕوباعییە لە چ زەرفێك و بە چ نیازێك داندراوە و چۆناوچۆنی بۆ مەدح کراوە کە بەڕێ کراوە. مەحوی هێندە کۆن نییە سەروشوونی هەمیراتی بزر بووبێت، لە غەریبیش نەژیاوە تاکو سەودای دوور باسوخواسی کپ کردبێت. لە نموونەدا دەڵێم ئەو دەفیکرانەی ئەو و چەند مەلایەکی دیکەی سلێمانی بۆ بەغدا کە لە ساڵی ١٢٩١ ك. ڕووی داوە و لە لاپەڕە (شەش)ی دیوانی مەحویی باسکراودا هۆیەکەی بە نەزانراوی هێڵراوەتەوە خستمییە سەر پرسکردن. بە کورتی دەڵێم بە تەلەفۆن داوام لە برادەرم

(عەلی دەروێش) کرد لە سلێمانی، ئەویش قسەکەمی بە مامۆستا عەبدوڵڵا ئاگرین ڕاگەیاند، ئەویش لە هەمان دەمدا بە تەلەفۆن پێی گوتم کە لە مەلا ئەسعەدی مامی خۆی بیستووە چەند مەلایەك بە حکومەتیان ڕاگەیاندووە کە مەحوی و مەلاکانی دیکە پەیوەندییان بە حکومەتی ئێرانەوە هەیە بۆ سستکردنی دەسەڵاتی عوسمانلییەکان... گوتیشی ئەم باسەی لە گوتارێکی خۆی کە ساڵی، وابزانم ، ١٩٧٧ لە گۆڤاری زانکۆی سلێمانی بڵاو کراوەتەوە. شەرح دلوە دەبارە حەسوودی مەلاکانی خەبەردەری خستووەتە سەر ڕێگەی وەها دزێو، پێشی ناوێ بە تەئویل عوزریان بۆ بهێنێتەوە بەوەدا کە وا ڕەنگە جوداییی مەزهەب لە سنییەوە بۆ شیعە کەمەری هیمەتی بۆ چوغڵی پێ بەستبن... مەحوی کە بەعایەرەی ناکار و ڕەفتار و ئەدەبیاتی سەردەمی خۆی هەڵکێشرێت لە کار و عەقیدەدا خواناسێکی ڕاست و حەقپەرست دەردەچێت، دەبارە مرۆی ئەوتۆیی ڕاست و حەقپەرست لای چاکەی خەڵق دەگریت کە ئەگەر بە کردەوەش نەیتوانیبێت حەق بە خاوەن حەق بگەیەنێت بەدڵ و بەزار و بەقەڵەم ڕارەوی حەقناسی و حەقسەلمێنی و دژەستەمی دەگرێتە بەر. لێرەدا دەبێ بڵێم، بەندی (لە شاری کوێران دەبێ چاو بنووقێنیت، یان دەست لەسەر چاوت دانێیت) هەر نەبێ بۆرەسێبەرێکی خۆی دەکاتە سەر ڕەفتاری ئادەمی، ئەو بۆرەسێبەرەش لە کەس بە عەیب ناگیرێ. حەدیسی مەشووری (من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبقلبه وذلك اضعف الايمان) دەستووری واقیعی ئینسافکارانەیە لەم مەیدانەدا.

چارەسەرکردنی بەدایەتی و ستەم و بێ وێژی و ناکاری وەها چەپەڵ بە پاڵەوانبازیی تاك تاکی مرۆی کەم دەسەڵات ورێنە و وەهمە، لە زۆر باردا خۆدزینەوەش لە بەدایەتییەکی کە زۆردار بەسەر خەڵقیدا دەسەپێنێ ئاسان نییە، بەسە بۆ شەرافەتی مەحوی و کەسانی وەك ئەو کە لە چەنزی ئەو حەدیسە دەرنەچن. ئێمە ئەگەر لە کولانەی (نظری)یەوە سەیری کۆمەڵایەتی بکەین دەبێ بەوە ڕازی بین مرۆ خراپە نەکات، کە خراپەی نەکرد خاڵەبەخش بێت لە بەرهەڵستی نەکردن لە خراپەی غەیر، کۆمەڵایەتیش لێرەدا ئەوەیە کە خۆمان و مەحویی تێدا ژیاوە نەك هی سویسرە و فنلەندە لایەنی (نظری)ش لێرەدا ئەوەیە کە (مرۆ) خراپەی نەکرد خراپە نامێنێ بەرهەڵستیی لێ بکرێت.

دوای ئەوەی لەلایەن ناکار و کردارەوە لە مەحوی بووینەوە بۆ ئەو ئەنجامەی پێی گەیشتین لە شەرافەت و خاوێنی و خواناسی و دادخوازی، چ ڕێگایەك لەبەر مەنگاوی

مندا نامەنێ تێیدا بڕۆم لە باسی ژیان و بەسەربردن و ڕووداوێکی بەدەنگ و سەدا دووچاری بوو بێت چونکە هەر ئەوەی لێ دەزانم کە بە کورتی لە پێشەکییەکەی (دیوانی مەحوی)ی باسکراودا هاتووە لەمەش بترازێین، من نەهاتووم لە ژیان و بەسەرهاتی مەحوی بکۆڵمەوە چونکە موناسەبەکەی میهرەجان پەراوێزی بە دەوری ئەم نووسینەدا کێشاوە کە مەبەستی بنجی تێیدا دەبێ ئەدەب بێت نەك بەسەرهات. ئەمە لەلایێکەوە لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی تەنگەپشتنی من لە هێنای ڕووداوێکی ڕەنگی دابێتەوە لە دیوانی مەحوی بەو جۆرەی ئێم بگەیەنێ کە دەقلی تایبەتی هەبوو بێت لە ئەدەبی مەحوی وەیا ڕووکاری بەرەو لایەنێکی نوێدا سووڕاندبێت هیچی ئەوتۆ نابینم لە چاو ئەقالیدی شاعیرە کۆنەکانمان زەق خۆ بنوێنێت. لە نموونەدا دەڵێم سەیرێکی قەسیدەی لاپەڕە ۱۲۱، ۱۲۲، ۱۲۳، ۱۲٤ لە دیوانەکەی مەحوی بکە کە لە تێشکانەکەی ڕووسان بەرانبەر ژاپۆنیای ساڵی ۱۹۰٥ هۆنراوەتەوە و بە هەمووی یەك ساڵ ماوە ژیانی مەحوی لە ۱۹۰٦ کۆتایی بێت، دەبینیت چ فەرقێك نییە لە نێوان ئەو قەسیدەیە و هەرچی پێش خۆی گوتراوە لەلایەن داڕشتن و فەرهەنگۆك و باوەڕ و تەسەور و هەرچی شتێکی کە ڕێی تێ دەچێ بێتە ناو شیعری شاعیر وەیا ڕەنگێکی جوداکەرەوەی تێ هەڵسوێت. باوەڕ ناکەم لەو تاکە ساڵەشدا کە تەمەنی مەحوی بەلای کەمەوە (۱۳۲٦ – ۱۲٥۲) ۷۳ ساڵ بووە مەودا هەبێ بۆ گۆڕانێك و ڕووسووڕانێك کار بکاتە سەر خۆی یا ئەدەبی. گەورەترین بنگەی خەیاڵ لەو قەسیدەیەدا دوو شتە: یەکیان ئەوەیە کە (زۆر) لە ناست (کەم)دا هەڵاتووە بەوەشدا باشتر توانای کرێگار بۆخەڵق ئاشکرا دەبێت، ئەمەش عەقیدە دڵخۆش دەکات. دووەمیان ئەوەیە کە (قەیسەر) لە زمانی ڕووساندا (چار)ە ئیتر دەرفەت پەیدا بووە بۆ کەڵك وەرگرتن لە ڕێکەوتێکی خۆش کە لە کوردی و فارسیدا وشە هەن (چار) بێت وەیا (چار)ی تێدا بێت بە واتای هەمەچەشنە:

چـاری قـەیـەر بـزانـە نـیـیـە، چـەنـدە چـاری وا
بێ چارە ما کە بوو بە دوو پەنجەی قەزا دووچار

تا لەم دوو تیوە دێڕەدا چوار جاران جێگە بۆ (چار) دۆزرایەوە لە بەیتی دیکەشدا (چار) هاتووە لە جیاتی (چوار) ئەمەیش شتێکە لە چەژی شیعر شیرین دێت. لەم قەسیدەیەدا دەرفەت بۆ منیش هاتووە کە دەوری بەیتی چوارەمی هەڵێنم:

دەڕزە تـریـشـقـەیـێکـە کـە کـێوی دەدا بـە بـاد
ئەشباه – ئەوەندە زۆرە بە کەس نایەتە شومار

لەم بەیتەدا هێمایەکی بەهێز هەیە بۆ ئایەتی (فلما تجلى للجبل جعله دکا، خر دگا وخر موسى صعقا). مامۆستا مەلا کەریم و کاك محەمەد ئەم لایەنەیان تێ نەخوێندووەتەوە. سەیر ئەوەیە پاش مەرگی مەحوی بە ٣٩ ساڵ بۆمبای ئاتۆم (درة) بەسەر ژاپۆندا هاتە خوار و ئەو تریشقەیەی لێ کەوتەوە کە دەزانین کێو دەدا بەباد. ئەگەر مەحوی مریدی مابانایە (ئەبرە تریشقە)یان بۆ بە پێشبینی و کەرامەت لە قەڵەم دەدا.

کە دەڵێم لەم نووسینەدا باسی چۆنیەتیی ژیان و ڕووداوەکانی بەرهەنگاوی مەحوی مەبەست نییە ئەهاتووم بڵێم زانینی ئەو لایەنە کەم بایەخە، هەر ئەوەیە کە جێگەی لێرەدا نابێتەوە. ئەما ئەگەر بڵێین بۆ تێگەیشتنی مانای شیعرەکانی دیراسەی ژیان و مێژووی سەردەمەکەی پێویستە، ڕاستییەکەی زۆر بەداخەوە، ناوناوەیەك نەبێ شاعیرەکانمان تابلۆی دەروونی خۆیانیان بەشیعر کێشاوە نەك بوونەتە ئاوێنەی ڕۆژگاریان. بوونی شاعیر و مەلا و خوێندەوار بە ئاوێنەی واقیع بەوەندە نابێ باسێکی زوڵم وەیا خەفەتێك بۆ داد وەیا ڕەنگێکی عادەتی واقیع بکەوێتە بەرهەمیانەوە چونکە مرۆڤ هەر زار هەڵێنێت بە ناچاری شتێکی بەزماندا دێت پێوەندیی بە بازار یاخود کۆڵان یاخود مزگەوت و تەکیە و خەرمان...وە هەبێت یا هیچ مەبەستێکی نەبێت من و تۆ لە نووسیندا بە دۆستی مێژووی هەڵدەینەوە. کە مرۆڤەکە کەوتە سەر باری شیعردانان دەست دەکات بە بژاردەکردنی وێنەی شیعری. لە ڕۆژگاری مەحوی و پێش مەحویدا (وێنەی شیعری) ئەوە بوو کە لە دیوانەکانیاندا دەیبینین: خەیاڵ، وردەکاری، ئارایشت، نوکتەئارایی، مەهارەتی دارشتن، وێنەی هونەری تازە یاخۆ تەقلیدی بەهێی دەسەلاتی شاعیر... و شتی ئەوتۆیی کە چارچێوەی مەفهوومی سەلمێندراو و بە عەیارەی مەقبوول پێوراو کێش و قافیەی ڕێك بن. ئەوەندەی شاعیر خەریك بوو بە زمانی شیعری ئەوسا ئیسپاتی ئەبوونی دەمی یار بکات و کەمەرەکەی لە موو باریکتر بکێشێت گوێی نەداوەتە ڕووداو، بگرە خۆی لە چاکە و خراپەی دنیا نەگەیاندووە سەرنج بگرێت دەبینێت شاعیرەکان مەنهەجێکیان نەبووە بۆ خۆ تێ گەیاندنی کاروباری ئەم دنیایە. کەی ڕووداوێك کەوتە بەرچێژی یاخۆ هزمەتی مەهارەتێکی ناوشیعری کرد نیگایێکی لێ خوار دەکاتەوە. سالم ئەو شێوەنەی بۆ بابانەکان کرد لەوەوە بوو کە برین کەوتبووە لەشی خۆی دەنا هەشت ساڵێك پێش تێچوونی بابان ڕەواندز لێی قەوما بوو بیری بۆی نەچوو. هەڵبەت من زۆر مەمنوونی سالم کە

شیعری خۆی کردە لاواندنەوە بۆ شێوەی تێچوونی بابان. خۆ دەیتوانی بەو ئەدەبە پێ دزێلکە بکات بەرەو دەسەڵاتی نوێ، کە ئەیکرد لە مەردایەتی و هەستی بریندار و دەماری کەڵەڕەقەوە بوو. بەڵام دەبێ خۆمان بە سەهوو نەبەین لە دەلالەتی ڕووداو: لەو دەمانەدا کەس گلەیی نەبووە لە خۆدزینەوە وەیا خامۆشبوون لە نگبەتیی یەکێکی لە نزیکەوە خزم و دۆست نەبووبێت. بە ڕێکەوت مەحوی و سالم و کوردی... شیعریان هەیە لێیان دەبێتە شایەدی چاکە و خراپە، ئەدی ئەو عالەمەی کە شیعری نەگوت خۆ هەموویان هەر بێباک بوون بۆچی جاهیلبوونیان ببێتە شەفاعەتکار؟ هەر ئەو جاهیلە لەسەر گیسکێکی خۆی ئامادە بوو دز بکوژێت کەچی بۆ ڕەواندز گوێی نابزوێت. شاعیرەکان کفریان نەکرد بەهرەیان هەبوو، ناشاعیرەکانیش چ چاکەیان نەکرد کە بەهرەیان نەبوو. با ئێمە عەیارەمان خوار نەبێت و تەرازوومان لەنگ نەکەین بەوەدا کە چاکەی شاعیرەکان لە بیر بکەین هەر چونکە وەکو ئاپۆرەی خەڵق هەستیان بە ئێش و ئازار کردبێت نەک وەکو غاندی.

من کە لەسەر شاعیر دەکەمەوە جەماوەر خەتابار ناکەم. دەمەوێ بە چاوێکی ئینسافەوە سەیری خەڵقی ئێرە بەهێشەوە بکرێت. نەشاعیر و نەغەیری شاعیر لە بارێکی نەفسی و ژیاری و ڕامیاری و نابووریی ئەوتۆدا نەبوون ڕێز بگرن و لە دژی زۆر و ستەم هەڵچەقن. هەزار لۆمەی بەدوا کاتی ئەم ڕۆژگارە بایی هەزاریەکی ئەو نەگبەتە نییە کە باپایەکی بەر لە ١٠٠ ساڵ بەشەق و شوێلاق دەخرایە زیندانەوە و ماڵ و منداڵیشی لە ترسان و لە برسان زەبرەیان لێ هەڵدەستا. هەستی سڕی کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمانە کە مێژووکرد بوو نەک هی نامەردایەتیی خەڵقەکە وەها نەبوو بۆ ئازاری غەیر بەخەبەر بێت وەیا بتوانێ تیماری دەردی غەیر بکات. هەر کەسە هەریەک بوو خۆی بژیت و بەرەکەی لە ناو دەرکات، ئینجا کە من گلەییت لێ ناکەم تۆش گلەییت بەسەرمەوە نامێنێ.

چ شاعیر و چ غەیری شاعیر لە هیچ سەرویەرێکی کاری دنیا بەشدار نەبوون هەتا چاوەنۆڕ بین دەنگی هەڵوەستی ڕەخنەگرانەیان لە کاری ناڕەوا ببیەین. هەڵوەستیش قسەی ڕووت نییە، کردەوەی لەگەڵە چ زاڵمێکیش بە تەما نەبووە لە قسەی ڕووت تووڕە بێت. لە نووسینێکی عەرەبیم، کە جارێ لە ژێر چاپدایە گوتوومە: (كل فلسفة في الارض وكل حكمة في السماء تكون معطلة اذا عدمت بشرا يؤمنون بها ايمان اداء وتنفيذ) دواتریش لەو نووسینەدا دەڵێم: ستەمکار چونکە دەیزانی ئەوانەی لە دیوانی

دادمنیشن ریاکارن هەرگیز خەیاڵی بۆ ئەوە نەچووە کە لە شیعردا دژی ستەم قسە دەکەن ئەویان مەبەست بوویێت خۆ ئەوان باتەویات بە داد و ئینساقی ئەویان هەڵدەگوت. لە کوردەواریدا شاعیری (مداح) بە واتای مەفهوومی سەردەمە کۆنەکان پەیدا نەبووە چونکە باری وەهای بەخۆوە نەدیتووە لە دەوڵەمەندی و سیاسەتمداری و بەرژەوەندیی زل کە بۆ دەوڵەتپاریزی پەکی لەسەر شیعر کەوتبێت. لە کوردستانی باشووردا بەر لە ناخەلۆوەی حوکمی عەبدوڕەحمان پاشا شیعری عەرووزی کوردیمان نەبوو چ جایی شاعیری مەداحمان هەبێت.

شێخ رەزا بە هەڕەشە نەک دەست پانکردنەوە مزەی مەدحی لە کەسانێک دەستاند کە حەزیان دەکرد باسیان نەکرێت. ئەم حاڵەتەی دەستکورتی و بێ سامانی و هەژاریی سیاسیی وەهای کرد کە شیعری سەردەمی مەحوی لەو جغزەدا بمێنێتەوە کە شیعری شاعیرە گۆشەگیرەکانی سەردەمی عەباسی و دواتریش تیهدا قەتیس مابوو. لەو دەمانەدا کە شاعیری مزەخۆر دیوانی خەلیفە و ئەمیر و وەزیرەکانیان بە شیعری زرینگەدار دەرازاندەوە شاعیری گۆشەگیر زۆر بوون شیعریان بۆ دەروونی خۆیان دەگوت. بێگومان ئەگەر لە کوردەواریشدا بازاڕی شیعری مەدح پەرەو بایە مەحوی هەر ئەوە دەبوو کە دەیناسین. تاکە روباعییەی بۆ شای ئێران بە سێ بەڵگەی مەحکەم نیسپاتی قسەکەم دەکات: بەڵگەی یەکەم ئەوەیە کە تاقانەیە. بەڵگەی دووەم ئەوەیە کە دەست پانکردنەوەی تێدا نییە. بەڵگەی سێیەم ئەوەیە کە ئەویش وەکو حاجی قادر مەدحی دەسەڵاتداری نزیکی نەکردووە خەیاڵی پاداشی لێ بکرێت.

لە نووسینێکی حەفتاکانماندا باییی زانینی خۆم و هۆش پێشکانم دیاردەی کەنارەگیری و خۆ لە دنیانەگەیاندن و وسکتبوون لە ڕووداو و ئەو جۆرە دوورەپارێزییەی شاعیرە ناسراوەکانی لێرە بە پێشەوەمانم شی کردووەتەوە کە وەک بە بیرمدا دێتەوە و پێشی رازیم، دیاردەکە دەچێتەوە بۆ بێ دەسەڵاتی و بەشدارنەبوون لە هەڵسوکەوتی دنیا و ئەوەمانی کاری گرنگ و چارەسەرکردنی گرفت و کۆسپی کۆمەڵ و ئەو تەرزە بێ تەرەفییە ناچارییەی کە دەکێشێتەوە بۆ بەخۆوە خەریکبوونی شاعیر و پەنگخواردنی دەروونی، تا ئەوەی وەک ئەو حەبسانەی کە لە ماوەی ١٠ - ١٢ ساڵدا دەبنە ماهیرترین کەس لە هونەری نەخش، شاعیری بێ بەشیش لە کاری دنیا دەبێتە وەستای نەخش و ئەونی ناو شیعر. بێگومان هەندێ باوەڕی سەر بە قەزا و قەدەریش دەبێتە ڕێ خۆشکەرەوە بۆ پەیکەخواردنی شاعیر و غەیری شاعیریش لە حاڵ و بارێکدا

کە هەرگیز پرسیان پێ ناکرێت و تێ ناخوێندرێنەوە. بەڵام قەزا و قەدەر بە تەنها قەت نەبووەتە هۆی پڕبوون: لە دەمی پێغەمبەرایەتیدا شاعیر هەبوون و پێویستیش پڕبوون بۆ لەسەرخۆکردنەوە و وەڵامدانەوە و بردنەوەی شەڕە دندووکێی وشەیی. من نامەوێ لێرەدا بچمە ناو درێژەی ئەو هۆیانەی وەهایان کرد کۆمەڵایەتیی کورد مریدڵەی ئەزۆک بێت. هەر ئەوەندە دەڵێم ئەمەشیا کورد لەمبارەی تێیدا دەژیا مریدڵە نەبێت و شاعیر و غەیری شاعیری دووڕەهاریز و ڕووەو قەزا و قەدەر نەبن. ئێستا کە لە ساڵی ١٩٨٧ من ئەگەر دووڕەهاریز نابم چیم؟ حکوومەت بە خێری خۆی ڕێ دەدات نووسینم بڵاو ببێتەوە، لەوە بەولاوە چ دەکەم؟ هیچ هەر هیچ.

ئیتر مەحوی و کوردی و وەفایی چییان کردبایە دەبوونە ڕۆڵەی سەردەمی خۆیان. بەشێکی زۆری نووسەری کورد خەریکی بڵاوکردنەوەی حەیرانە و بەستە و باڵۆرەیە کە ئەمانە لە تامی تەرازووی هیچ سەردەمێکدا نایەنە هاوسەنگی شیعری ئەو باسکراوانە نە لە ڕوخسار و نە لە ناوەرۆک وتە لە هێمادا. ئەگەر باڵۆرە بڵاو نەکەنەوە چییان پێ دەکرێت؟ سەقافەتی نوێ وەهای کردووە هەڵگەڕاتەوە هەبێت بەڵام مەرجی زۆرە مەرجیش واز لێ بهێنین بە دەگمەن نەبێ کەس لە ڕابیرە بەسەهووچووەکەی خۆی هەڵناگەڕێتەوە.

کەس بەتەما نییە بە ڕەخنە لە خۆگرتن واز لە باوەڕی پووچەڵ بهێنێت تا ئەوەی کە تەجرەبەش ئەو پووچەڵییە بە ئیسپات دەگەیەنێت وازی لێ ناهێندرێت. ئینجا کە گەنج و خوێندووی ناخەڵیوەی سەدەی بیستەم سوور بێت لەسەر بتپەرستیی مۆدێلی نوێ، بۆچی داوا بکەین لە مەولەوی و مەحوی واز لە (قدرية) بهێنن کە هەر نەبێ (قدرية) بە عەیارەی خۆی ڕاست دەردەچێت و وەک ئەوە نییە کە شێلەم چاند و شێن نەبوو بەردەوام بم لەسەر شێلەمپەرستی.

گلەییم لە مەحوی نییە کە ڕمانی حاکمایەتیی بابان دەنگی نەداوەتەوە لە دیوانی چونکە لە غەیری دیوانی سالم دەنگی لە دیوانی کەسی دیکە نەداوەتەوە، حاجی قادریش پێش ئاوارەبوونی بۆ ئەستەنبوڵ نە باسی ڕمانی ڕەواندز و نە بابانی نەکردووە.

پێم بڵێن شەشی ئەیلوول لە چەند جێگەی کوردستان دەنگی دایەوە؟ سلێمانی کە بۆ شەشی ئەیلوول دەنگی بەرز کردووەتەوە خۆی تازیەدار بوو. لە ١٩٥٧ کە لافاو

زەمەری لە سلێمانی دا چالاکانە هونەرکار و مۆسیقار و گۆرانیبێژیان کەوتنە پێتاك کۆکردنەوە، بەلام چەند ماڵە هەژارێك لە هەولێر ناوبردنی یەك سەلکە پیازیان پێ ڕەوا نەدیترا. بڕین کولاندنەوە خۆش نییە بەلام بێ سوودیش نییە.

شیعری مەحوی دەبێ بە کێش و تەرازووی سەردەمی خۆی هەڵبکێشرێت، ناشێ لە پەنا فکری (نوێ)وە تیری تانە و ڕەخنە بۆ سەد ساڵ بەر لە ئیمڕۆ بەرێ بکرێت.

هەروەك ڕەوا نییە بە خۆڕایی گلەیی ساز بدرێت هەروەهاش ڕەوا نییە لە دەرەوەی شیعری شاعیر واتای بۆ بخوازرێتەوە و لێی بار بکرێت. دۆزینەوەی واتا لە دەقی شیعر جودایە لە بەسەرەوەنان. ناشێ پەرۆشی دەروونی خۆم وەیا باوەڕم بە چاکە و خراپەوە بۆ بە ئیسپات گەیاندنی نیازێکم بمهاوێتە سەر تەئویلی بێ بنگە لە شیعری مەحوی وەیا ئیبن ئەلفارز وەیا نەبونەواس. کە شاعیری کورد گوتی: قەزا و قەدەر حوکمی خۆی دەکات ڕێم نییە بڵێم بەوەدا مەبەستی بزاوتنی گیانی کوردایەتییە گۆیا ویستوویەتی بڵێ خۆمین بەئومێد بن!

لە نموونەی ڕوو بەواتا گۆڕین لە ڕێی تەئویلی بێ بنگەوە ئەم بەیتەی خوارەوە لە لاپەڕە (١٧)ی دیوانی مەحوی دەهێنمەوە:

بۆ دوکانی مشتەری گەر حەول ئەدا کالافرۆش

دێنی وا دێنێتە قیمەت خواجە ئەعضایی بکات

لەو لاپەڕەیەدا شەرحی بەیتەکە وەها کراوە کە مەلایەکی بۆ خواستووەتەوە و ڕیشیشی لە خواجە خواستووەتەوە بۆی..

ئەم تەئویلە هەرگیز لەو دەقە هەڵناستێت چونکە مومکین نییە ڕیشی خواجە لەو دەقەدا بە شەوێلەی کەسەوە بنووسێت چ مەلا و چ غەیری مەلا. ڕیشی خواجە هەر لەشوێنی خۆیدا دەبێت و بە ڕیشی جوولەکایەتییەوە دەبێ بهێنە ئەو ئەنجوومەنەی (ڕەنگە هی دادگا بێت) ئەعزایی تێدا دەکات. کالافرۆشیش کە ئەو دینە ناباوە دێنێتە قیمەت ئەعزایی خواجەی جوو جەربەزەییکە فێڵبازێکە قوڵبڕێکە بێ دینێکە نموونەی نوێنەری بەدایەتییە. ئەگەر بە مل مەلا وەیا شێخ وەیا توجار وەیا والی و قازی و سەرەك وەزیرانیشدا بیبڕێت لە واتای کەم دەبێتەوە و بابەخ دەدۆڕێنێت چونکە لە (مطلق) بێ دین و ساختەچی وێك دێتەوە بۆ (مقید)ی مەلا کە دەزانین زۆربەیان بڕسی و هەژار بوون و دەسەلاتی جوولەکە دامەزراندنیان نەبووە بە ئەندامی دایەرەی

ئەرزی حکوومەت. بەھەمەحاڵ دەسەڵاتیشیان ھەبووبی ئەوان بەر تەعنەی بەیتەکە ناکەون مەگەر وەکو ھەر کەسێکی دیکە بێت لە ھەموو ئەسنافی کۆمەڵ کە توانای دەسەڵاتی ساختەی زڵی ھەبێت.

نموونەیەکی دیکە لە لێککێشانەوەی پەراوێزی واتا بۆ وەبەرخستنی مەبەستێك کە شاعیر نەیویستووە و شیعرەکە ھەڵی ناگرێت:

لە لاپەڕە ٩٠ی کتێبی (لەبارەی مەحویی لوتکەوە) بەیتێکی دیکەی مەحوی کە ئەمە دەقەکەیەتی

قەزا، بێ دەستەلاتت کا، چییە غەیری رەضا چارە
لەبەر دەستی جەلابا رێوییکە شێری پەل بەستە

ماناکەی لە (قضاء)ەوە بۆ (رێکەوت) و لە تەسەوفەوە بۆ کۆمەڵایەتی بادراوەتەوە ئەو تەئویلە نە بەیتەکە قبووڵی دەکات نە مەحوی خۆیشی پێی رازییە چونکە ئەوەندەی لێ شارەزاین کە بەلای ئەوەوە بێ دەسەڵاتیی کۆمەڵیش ھەر دەچێتەوە بۆ تەقدیر ئێمە پێشتر دیتمان تێشکانی رووسیای زل و زەبەلاح لە ئاست ژاپۆنی بچووکی کەم شۆرەت دەداتەوە بە قەزا و قەدەر. ئایا بەکێ دەکرێ ئەم قەدەرەیان ھەڵداتەوە لە خواوە کۆمەلایەتی. مەحوی بەیتی وەھای ھەیە ھەڵبەگرێ دڵدارییەکەی بە دڵداریی راستینە بدرێتەوە ئینجا دەشێ لە دەمی گەنجایەتیدا شیعری وەھای گوتبێت وەیا لە کامڵییش پێرەوی دەستووورانی شاعیرییەتیی ئەو رۆژانەی کردبێت، ھێندەی قەسیدەشی ھەن مزاشە تەسەوف و غەزەلی بێ تەئویل. ئینجا ھەروەك ناشێ شیعری دڵداری بە زۆر ھەڵگێردرێتەوە تەسەوف ھەروەھاش جایەز نییە تەسەوف لە مەعنەوییاتی خۆی رووت بکرێتەوە و بخرێتە قاڵبی کۆمەلایەتی. راستییەکەی لەلایەن بەخۆدا راپەڕموونێشەوە چ شێرنابی ھەست ناکەین لەوەدا کە مەحوی وەھا شاعیر و دەسەڵاتدار لە تەعبیر و تەبیاتخورت خۆ بدزێتەوە لە (صراحة) بۆ ناو تەمی تەسەوف وەیا راستە عەقیدە، بە بەیتی سەرپۆشکراو کۆمەلایەتیمان فێر بکات. ئەگەر (قضا) قەزا و قەدەر نەبێ و کۆمەلایەتی بێ دەبێ مەحوی ترسابێ وەیا نەیزانیبێ ھەستی دەروون بداتەوە بە ھێزی ناھاوتن. لەلایەن ترسانەوە بێ ئەوەی من بڵێم دیوانەکەی شایەدی بۆ دەدات کە چیی ویستووە ئەوەی گوتووە، خۆ نەھاتووە شعر بەم و بەو بفرۆشێت و ناوی خەڵق بھێنێت ئیتر تەقیە لە چی بکات؟ کێ تەقیەی کردووە تا ئەو

بیکات لەلایەن تەعبیر و زمانزانیشەوە هەموومان دەیناسین چ نوستادێکە لە گوتار

گەلێك بەیتی دوای ئەم بەیتەش دوور خراونەتەوە لە مەبەستی خۆیان وەك کە ڕەنگی سووری یاقووت و جلی شینی پیرۆزە لە بەیتی:

لە کێ پرسم دڵی بۆ پڕ لە خوێنی حەسرەتە یاقووت

عەزاپۆشی چییە و کێیە؟ جلی پیرۆزە بۆ شینە

وەها لێك دراوەتەوە کە مەحوی لەم شتە جوانانە «نازار و ژان و فرمێسك و هەنسك و حەسرەت و دڵۆپی خوێناوی و قوڵپی گریانی دەرهێناوە کە گەورەترین شێوەی ئازاردانی مرۆڤی خستووەتە بەرچاو.. ئازارە لەبەر سزادان، لەبەر چەوساندنەوە لەبەر دارکارییی گیان و هەست.» بڕوانە لاپەڕە ۹۱ ، ۹۲ لە (... مەحوی لوتکە).

مەبەستی مەحوی لە سەراپای قەسیدەکە دیارە و تەئویل هەڵناگرێت تەنانەت ئەگەر ڕێی تەئویلیی ماماوەنجیش بدرێت دەبێ لە بەیتی دووەمدا کە دەڵێ:

دەبینی چینێك ئەمڕۆ بەزمی عەیش و بادەنۆشینە

سبەینێ زوو زەمانە وەضعی گۆڕیوە لە نۆ شینە

دەبێ مەبەستی مەحوی شێوەنکردن بێت بۆ ئەو خوا پێداوانەی لێیان تێك دەچێت چونکە (بەزمی عەیش و بادەنۆشین) هی چەوسایەوە و سزادراو نییە.. گلەیی مەحوی لە هەموو وجوودە نەك لە بەشێکی. سەرەتای قەسیدەکەش هەر وەها دەگەیەنێت و وەها دەست پێ دەکات:

لە ڕۆژێ هەڵدرا ئەم کۆنە خێمەی ئان و پۆشینە

لە سایەیدا شەرابی بەزمی عوشرەت گریە جۆشینە

هەروا لە نموونەی زاڵکردنی هەستی دەروونی بێزەر بەسەر دەقی شیعردا زۆربەی ئەو بۆچوونانەی نێوان لاپەڕەکانی ۱۹۷ – ۲٦٦ لە کتێبەکەی (مەحویی لوتکە)دا بە ئاشکرایی ویژدانی نووسەرەکە کە لە هەموو نووسینەکە خۆ دەنوێنێت، تێکەڵ بە دڵ و دەروونی مەحوی دەکەن. لە لاپەڕە ۲۲٦ کە ڕوباعییەکەی (ئەم پارەپەرستانە..) شی دەکرێتەوە، نووسەر پاڵ بەمەبەستە ئاشکراکەی مەحوییەوە دەنێت هەتا بەرابەری خۆیدا دەیگەیەنێتە کۆتایی قەسیدەی:

«لە پڕ یەردی ئەجەل بۆ شیشەیی عومرم ئەوا بێ زووە»

که ئەم بەیتەیە:

دەنی طەبعی بە جاریّ عالەمی داگرت ئەوا مەحوی

دەرەنگە ئیلتیجایە بەر دەری عالی جەنابیّ زوو

ئیتر بە چەند دێرێك لە لاپەڕە ۲۲۷ کار دەگاتە دەرەبەگایەتی و نیمچە سەرمایەداری و چینایەتی...

من ناتوانم لێرەدا بەدوا ئەو تێهێنییە بنچینیانەم بکەوم کەوا لە ئاغڵەبی بیرورِاکانی ئەو لاپەرِانەدا داوای شەرح و کەلێن گرتن و خستنەقاڵب و راستکردنەوە و بادانەوە بۆ رارەوی مەحوی دەکەن چونکە بە نیمچە کتێبێك لێی نابمەوە، هەر ئەوەندە دەڵێم دەبوو نووسەر بۆمان ساغ بکاتەوە کە روباعییەکە زووتر هۆنراوەتەوە لە قەسیدەکە بۆ ئەوە بشێ، هەر نەبیّ رواڵەتی بسەلمێنین کە مەحوی بە پلیکانەی روباعییەکەدا سەرەژوور چووە بۆ قەسیدەکە.

بڕە شیعری (ئەلعەیاذ) کە رووبەرِووی تێکرِای ئەهلی (شار) گوتراوە:

بۆتە مونیس، بۆتە مەئوا قەوم و شاریّ ئەلعەیاذ

دێوی بێتیّ جێبەجیّ دەروا بە باریّ ئەلعەیاذ

هەرکەسیّ ساتیّ لەگەڵ ئەو قەومە بوویّ تا ئەبەد

بیّتەوە فکری لە زاری دادوباریّ ئەلعەیاذ

بادراوەتە بۆ سەر (دەسەلاتدار و دەسترۆیی) – لاپەرِە ۲۲۸ کتێبی مەحویی لووتکە – نە مەحوی و نە بەر لە مەحوی کە گلەییان لە زەمانە و خەڵق کردبێت مەبەستیان جوداکردنەوەی چینی زۆردار بووە لە زۆر لێکراو. ناوناوە لە بەیتێکدا وەیا لە قەسیدەیەکدا ئەم هەلاواردنە هەبوو بێت (منهجیة)ی نەبەخشیوە. هەر لەم شێوازەی مەحویدا بەر لە هەزار ساڵیش گلەیی وەها لە زەمانە و عالەم کراوە تا ئەگەر مەحوی لە قەسیدەکانی هی وەهای هەبووبێت (زهد)ی گرتبێتە بەر. شاعیر هەبوون لە کۆنەوە هەر (زهد)یان کردووە بەرارەو هیچیشیان بە شۆرشی فکری دانانەرێن دژی چین وەیا زرچین و ئیریژ وەك پێشتریش گوتم کەس لەو تەرزە شیعرانە وەتەنگ نەهاتووە چونکە بە هاندان و خەڵق تیژکردن حیساب نەکراوە. لەو ئەلعەیاذانەدا بەیتێك هەیە دەڵیّ:

ئەهلی تەزویر و فەسادن غاصیبی ماڵی عیباد

موبتەلا بن بەم بەلایە ئەهلی شاریّ ئەلعەیاذ

ئیشارەی بۆ (غصب)هەیە، ئەم غەسبە بەر زۆردار و ئەهلی بازاڕیش دەکەوێت کە پێشەیان بەسەرەوەنانی قەرزە بۆ حیسابی قەرزدارەکانیان تاکو وەها دەبێت قەرزەکە دەکرێتەوە سەلەم بۆ کۆزی دانەهاتووی بەرخ و گیسک نیتر لە ناکامدا ڕەنگە لە بری دینارێك قەرز پێنج دیناریش وەرگیرابێتەوە. هەر چۆنێك بێت زۆردار مەلعوونێکی بەرچاوی ئەهلی شارە لێی دەوەشێتەوە ئەوەندە موجامەلەی لەگەڵدا بکرێت. خوا لە ناوی ببات کە مرۆ نەتوانێ لە ناوی ببات. تێکهاوێشتنی جینایەتی و بیری جینایەتی لە کوردستانی خۆماندا هەتا سییەکانیش سەری هەڵنەدابوو، کە سەری هەڵدا لە ئاکامی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بوو نەك لە نمای چینی بۆرجوازی کە تا ئیستاش پەیدا نەبووە گوتوومە و لەم باسەشدا گوتم ئاکە (صراف)ێك لە کورد نەڕسکاوە..

مەحوی بەوەدا پەنجە نیشان ناپێت کە بەسەرووپۆتەراکی خراپە و بێ دینیدا هاتووەتە خوار چونکە تەقلیدێکی کۆتی شعر و ئەهلی (وشە)یە گلەیی لە بەدایەتی بکەن. ئەبونەواس کە بە پارەی پاداش دەژیا خۆگیف دەکاتەوە و دەڵێ:

ومستـعـبـد اخـوانـه بـثـراثـه

لبست له كبرا ابر علی الكبر

مەحوی لەلایەن شعرەوە بە مەتانەتی داڕشتن و نوکتەئارایی و سەرەژوورچوون لە دەستووره سەلمێنراوەکانی شاعیریەتیی سەردەمی خۆی و دەربڕینی هەست بەشێوازی هونەری قەشەنگ و داهێنانی وێنەی زیهنی نوێ و بەجێهێشتنەوەی شاعیرانی تر لەو مەیـەستە شیـعـریـیـە ئـاشـنـایـانـەی هـەموو تێیاندا بەشدارن... لە مانە و لە جۆرە داڕشتنێکی لوغەویی تایبەت بە خۆی کە شەقڵێکی جوداکەرەوەی تەعبیری ئەوە لە شیعری کوردی مەحوی دەچێتە ڕیزی یەکەمی شاعیرەکانمان و لە تەنیشت نالی پاڵ لێ دەداتەوە.

لێرەدا ڕایەك دەردەبڕم دەبێ لە بیستنی و بەلارەنانی پەلە نەکرێت.

هەرچەند جارێ ڕێم نەبووە بە وردی دیوانەکەم مەحوی بخوێنمەوە، بگرە هەوڵی ئەرزدانەوەم بەم گوتارە ماوەی نەدامێ هەمووشی بخوێنمەوە، لەگەڵ ئەمەشدا کە من لە خوێندنەوەی شیعری کوردی سەر بە هۆزوگلیفیدا ئاگرم بەڵکو ئەبزی هەر بەیتێکی لە مامرەدا فڕکە دەکات، سەیر نییە بە زوویی دیاردەی بەرچاو لە دیوانێکدا بەدی

بکەم وەها دەبینم شەیەتگی نالی لە شیعری مەحویدا بزرە و دیاریشە. نەك ئەمە و بەس بەڵکو بوونەکەی لەو شوێنانەدا کە پێویست بوو دەرکەوێت بەڵگەی دیاربوونییەتی لە ویژدانی.

سەرنجێك بگرنە قەسیدەی (بەحری نوور) پاتەویات (معارضە)ی قەسیدەی (ئەلائەی بووم ئاسا هەتا کەی حیرصی ویرانە)ی نالیی پێ کردووە، وەك دەشزانین موعارەزی بۆنینەوەی شیعرە لە قافیە و کێش و ناوەرۆکی شیعرێکی مەشوور، لە موعارەزەدا دوشمنایەتی مەبەست نییە مەگەر هۆنەرەوە بیکا بە دوشمنایەتی. لەم قەسیدەیەدا مەحوی کە بەرێبازی نالیدا رۆیشتووە دێت لە بەرەو کۆتاییی هەڵبەستدا دەڵێ:

کەبرەر بوو قەسیدەی بوردە ئەشئەی عالەمی پڕ کرد
فەرموو بەم قەسیدەی کوردە نۆبەی ئەشئە پێوانە

واتە قەصیدەی (بردە، بردیە) بوسیری کە لە نەعتی پێغەمبەرە (د) زۆر گوتراوە، فەرموو بەم قەسیدەی کوردە دەست بە ئەشئە پێوی بکرێت. مەحوی بە ئانقەست معارەزەی نالی دەکات کەچی ناوی (بردە) دەهێنێت کە کێش و قافیەی جودایە لە بەیتەکەی مەحوی، خۆ مەعلوومیشە قەسیدەکەی (نالی)ی بیستووە و بە دڵیشی بووە و خۆیشی وشك کردووە لە قەسیدەکەی خۆیدا لە نالی دادەماڵێت، بەڵگەش، جگە لە دەلالەتی (معارضە) خۆی، کە بەیتی چوارەمی قەسیدەکەی دەڵێ:

تاریکی شەوی کوفرا یە یەك دەم لە مەعیێکیدا
هەزار و سێ صەد و بیست و دووە، دنیا چراغانە

دیارە لە ١٣٢٢ك. قەسیدەی داناوە. نالی لە ١٢٩٠ك مردووە، تا دەمی قەسیدەکەی مەحوی ٣٢ ساڵ تێپەڕی کردووە، لەوەدا نییە بگوترێ دەشێ مەحوی جارێ چاوی بە دیوان وەیا قەسیدەکەی نالی نەکەوتووە.

لە ناوەرۆکی قەسیدەکەی هەردووانیش بەراوردێك بکرێت گەلێك شوێن پەنجەی نالی لە مەحویدا دەدۆزرێتەوە بە نموونە مەحوی دەڵێ:

چ مەدحێکت بکەم لائیق بە تۆ (یا خیر خلق الله)
منی بێ خێری نالائیق کە جیبریلت ئەنا خوانە

کە لە نەعتەکەی نالی دەخوێنێتەوە:

مرادم زیللەت و پاڕانەوەی حاڵە ئەوەك نەعتە
بە چەند بەیتێکی کوردانە کە قورئانت ئەنا خوانە

هەم بەیتە تازە باسکراوەکەی مەحوی و هەم بەیتی (موکەڕڕەر بوو ..)ت بە بیردا دێتەوە، وشەی کورد لەویاندا و (ئەنا خوان) لە میاندا (قاسمی مشترك)ی هەردوو قەسیدەکەیە..

لەم قەسیدەیە و لە بەیت و دوو بەیتی دیکەشدا نالی بزرێکی دیارە، سەیری بەیتی سێهەم بکە لە لاپەڕە ۱۱۰ی دیوانی مەحوی دەخوێنیتەوە:

(ڕەحە) بەو شێتییە ئەحەق قسێکی عاقلانەی وت
منم عاقل لە بەرگی عارییە خۆمم کە عاری کرد

ئینجا تەماشای ئەم بەیتەی نالی بکە:

من لە بێ بەرگی ئەحەم پرسی کە بۆچ ڕووتی گوتی
یارەبی شێت بم ئەگەر شاد بم بە بەرگی عارییە

وا دەزانم (ڕەحە) و (ئەحە)ش یەك ناو بێت لە نووسیندا بە هەڵە گۆڕاوە یاخود مەحوی بە ئانقەست ئەحەی کردووە بە ڕەحە. لە واتادا هەردوو بەیت یەك شتن.

لەم بەیتەدا، مەحوی، کە دەڵێ:

ئەم قیزاعەت بە دوومە حەققە کە نایرسی چییە
تۆ یەکێ دانیم هەزارێکی وەکو من دوو بە دووت

وەك نالی شاعیرانە و ئوستادانە وشەی (هەزار)ی بە واتای دەجاران سەد و بە واتای بولبولیش لەکار هێناوە. شەرحی دیوانەکە بۆ ژمارەی هەزار نەچووە. لە ئەسڵیشدا عەرەب کە بە بولبولی گوت (هزار – هەزار) وشەی (هزار داستان)ی کورت کردەوە بە واتای (هەزار ئاهەنگ). نالیش گوتوویەتی:

ڕوخی تۆ گوڵێکە سەد بەرگ و هەزاری عاشق ئەمما
لە هەموو چەمەن دیارە بە ئوصولی ناڵە نالی

نالی ژمارەی ئاحاد و میئات و ئولووفی کۆ کردەوە، مەحویش دوو ژمارەی ئاحاد و یەکێکی ئولووفی کۆ کردەوە لە بەیتەکەدا. کورد بە تێکڕایی کە مەبەستی بولبول بوو دەڵێ (هەزار).

زۆری ئەدیبەکانیش هەروەها دەکەن بۆیە لە (هزار - هەزار) هەر بۆ ژمارەکە دەچن

لە دیوانی مەحوی بگەڕێیت نموونەی دیکە زۆر دەبینیت لە حازری و بزربی نالی هەمرویش هەر بە گیانی (تحدی)یەوە هاتوون کەوا بۆ دەربڕینی پاتەوپات بەردە عازەبانەیەك هەڵدەگرێت هەر بە نالی هەڵگیراوە. حاجی قادر لە چەندین جێگەی دیوانەکەی ناوی نالی و شیعر و مەتانەتی دەهێنێت تا دەگاتە ئەوەی کە دەڵێ:

بە «تضمین» بەیتەکی نالی دەهێنم تا ڕەفیقانم
بزانن من بە ئەو ناگەم خەزەف قەت وەك گوهەر نابێ
مەحوی بێ ناوهێنان ملانێی لەگەڵدا دەکات.

ئەو ڕایەی لە لاپەڕە ۲۱۸ی (مەحویی لوتکە)دا کە شیعری مەحوی لە (سبکی هندی) دادەنێت پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە دەبوو نووسەر شەرحی بدات، بەڵام من وەهای بۆ دەچم کە داڕشتنی (سەبکی مەحوی)یە پتر لەوەی چاولێکەری بێت. مەحوی لە هەڵنانی بەیتەکای ئەو مامڵەتە لەگەڵ وشەدا دەکات کە وەستای بەننا دێت بۆ دۆزینەوەی جێگەی لەبار بە دوا بەردی لەباردا دەگەڕێت. گەلێك لە بەیتەکانی مەحوی ئەوەندە سفتە دەڵێی وشەکانی لە پاڵ یەکتر هەڵناوەشێن لەو وەستاییەشدا ناوناوە دەگاتە تۆقەڵانی ئەوتۆ هەر داڕەوان و شاخەوانی مەعلان دەیگاتێ. لەو بڕە شیعرەی کە بەم جۆرە دەست پێ دەکات:

بەبێ یا نەبێ من داد و بێدادێ دەکەم
گوێ بداتێ یا نەداتێ ئاه و فەریادێ دەکەم

چەندی دەگەمە ئەم بەیتە.

بێستوونی عیشقی شیرینێك ئەوا هاتۆتە پێش
گەر لە حەق بێم و نەیەم تەقلیدی فەرهادێ دەکەم
موچرکێك دەمگرێت (وا ئیستە چاوەکانم تەڕ بوون).

نموونەیەکی وردی و مەتانەت لەم بەیتە دەردەکەوێت وەك کە لە سەدان بەیتی ئەوتۆییدا.

زمانت کە ببڕی قسەت دێ بەکار
قەڵەم دادەدەم، پەندی خۆ دادەدەم

ئەم بەیتە لە لاپەڕە (۳٦)ی دیوانی مەحوی وەها شی کراوەتەوە کە مرۆ زمانی خۆی

ببڕێت و قسەی پڕوپووچ نەکات قسەی کاریگەر دەبێت وەک قەڵەم کە داندری ماشتر دەنووسێت، بەڵام شیکردنەکە نە دەڵێ کە زمانت ببڕێت چۆن قسە دەکەیت مە خۆ لە دووبارەبوونەوەی (دادە دەم) دەگەیەنێت

وەک من بۆی دەچم مەحوی ڕواڵەتی زمانبڕینی بەتەمەکە داناوە تەمەکەش وەک (بەرو دوو هۆدە) واتە دەرگەیەک بەلای دوو ژووردا دەکرێتەوە بە شێوە نووسینی سەردەمی مەحوی (ببری) دەنووسرا دوو جۆر خوێندنەوەی هەڵدەگرت. (ببڕی) بۆ کەسی دووەمی تاک و (ببڕێ) بۆ کەسی سێیەمی تاک. ئینجا کە گوتت (زمانت کە ببڕێ) پێکوێنێک قسەت دێتە کار چونکە مانای ڕستەکە ئەوە دەگەیەنێ کە (زمانت بڕندە بێ).

لە (قەڵەم دادەدەم)دا (ببڕی) بەخەیەر دێت کە موناسیبی قەڵەمدادانە. دادانی دووەم (دادانی ناو) وەیا هەر شتێکی دابدات دەگەیەنێ. کە قەڵەم دادرا پەند بە مەرەکەبدا بۆ سەر کاغەز دادەدات، ئەگەر خۆنووسیش بێت پەندەکە بێ مەرەکەب هەر بۆ سەر کاغەز دەچێت، بەڵام گومان نییە، مەحوی قەڵەمی قامیشی مەبەست بوود کە بەمەرەکەب دەینووسی.

ئینجە واتایەکی وەک زێدە پارووش لەوەدایە کە ئەگەر بە ڕێنووسی کۆن بنووسرێ:

(پندی خودا دەدەم) دەشێ بخوێندرێتەوە (پەندی خودا دەدەم) واتە ئەو پەندە دەدەم کەهی خودایە. لەبەر خاتری کێش واوی (خودا) ئەختێک درێژ دەکرێتەوە.

من هەر نالی و مەحویم بەبیردا دێت لە کورد ئەو جۆرە هونەرەیان خۆشەڵەو کردبێت بۆ ناو هەڵبەست.

بەر لەوەی بچم بۆ شیکردنەوەی چەند نموونەیەکی دیکەی کە لە (دیوانی مەحوی)دا پێویستیمان بە تەواوکردن هەیە تێبینییەکی کورتیلە لەبارەی گوزەران و دوورکەوتنەوەی نالی لە وڵات دەکەم کە لە لاپەڕە ۲۱۹، ۲۲۰ی (مەحوی لوتکە)دا بە جۆرێک هاتووە تاریکییەکی خستووەتە سەر نالی کە بە لای منەوە ڕەوا نییە. گۆیا نالی بە دوورکەوتنەوەی لە وڵات و ڕووداو و ئاژاوە و پشێوی کە سەرجەمی ناوچەکەی گرتبوووەوە ئازادییەکی بەخۆی دا کە (بەکەیف و هەوەسی خۆی بدوێ).

ئەوەی من بۆی دەچم، نالی لە دەمی حوکمڕانی ئەحمەد پاشادا چوو بۆ حەج، جارێ حەجی تەواو نەکردبوو یان هەر نەبێ لە حەج نەگەڕابووەوە حاکمایەتیی بابان بەسەر

چوو پاش چەندین ساڵ کاغەزی بۆ سالم نووسی و وەڵامی پەنسی لێ وەرگرتەوە ئیمجا ئەگەر وەها نەبێت و لە پاش تێکچوونی پاشایەتیی ئەحمەد پاشا نالی هەڵاتبێ بۆ دەرەوەی سلێمانی و حەجی ناچاریی کردبێ (کە ئەمە من بۆی ناچم) دەبێ لە ترسی کوشتن وەیا بەندبوونی ڕێی غەریبی گرتبێتە بەر. لە هەردوو حالیشدا نالی بێ ماڵ و حاڵ بووە و بە نەداری سەفەری کردووە نالی لە سلێمانی مزگەوتی نەبوو، هەر هیچی نەبوو بۆیە توانی ئاوارە بێت حاجی قادر و کەیفیی جوانرۆییش بێ ماڵ و حاڵ بۆی دەرچوون. چی لە لاپەڕە ۲۲۱ گوتراوە کە نالی لە سلێمانی و لە غوربەتدا بە ناز و نیعمەتی میرەکانی بابان حەوابووەوە ئاواتێکە لە منەوە بەرەو ئەو سەردەمانە: وەی کاشکی بمانتوانیبایە بڵێین ئەحمەد پاشا و باوکی لە سلێمانی خزمەتی نالییان کردووە بە ناز و نیعمەتەوە، دواتریش ئەحمەد پاشا دریغیی بۆ نەکردووە بەڵام چ فایدە' نالییەك لە سلێماتی نوای نەبووبێت. بەر لە دەوری نواکردنیش بە درێژایی تەمەنی فەقێیەتیی وەکو گەڕیدەیەکی هەژار ئەم دێ و ئەو دێ و شار و ئەو شاری کردبێت چ دەرفەتێکی بووە بە نازەوە لە نیعمەتی پاشاکاندا ژیابێت، لەغەریبیشدا بەپێنەك لە شام دەرسی بە خەڵق گوتووە بۆ نان پەیداکردن. لە ئاخر و ئۆخری ژیانیشی، ساڵی ۱۲۸۸ و بەشێکی ۱۲۸۹ك حاجی مەلا عەبدوڵای جەلی نالیی لە مەکە دیتووە بێ ماڵ و حاڵ، چەند بزنێکی هەبووە پێیانەوە ژیاوە وەك دەبینین تەنها لەو دەمە کە ئەستەنبۆڵ نشیمەنی بووە و ئەحمەد پاشاش تێیدا ژیاوە جێی خۆیەتی چاوەڕوان بین ئەحمەد پاشا خزمەتێکی کردبێت. تێکڕای باری ژیانی مەحوی ئاسوودەتر بووە لە هی لە خۆ هەر نەبێ مەحوی خانەقای هەبووە، بە تەنیشت خانەقاوە ماڵێکیشی هەبووە بحەسێتەوە، منداڵ و وەچەشی هەبووە پێیانەوە ڕوون بێتەوە، سەد جاران لێی پیرۆز بێت بە ئەوەندەشی لایەق بوو. لەلایەن ناڕاحەتیشەوە، تۆ بڵێی ژیانی ڕاستەقینە هەمووی لەگەڵ (ریوایەت) ڕێك ڕۆیشتبێت؟ زۆر جاران ناخۆشیی بێ سنوور بۆی ڕێك نەکەوت بیبەستێ بە ئەبوو بووە، وەهاش بووە بە سەریەوە نراوە بە تێکڕایی ئەهلی خەیاڵ وێنەکێشانی حاڵ و باری خۆیان هونەری تەعبیر تێکەڵ بە واقیع دەکەن. هەروەك لە دڵداریدا بەهەڵپەست خەویان نامێنێت و فرمێسکیان دەبێتە خوێن و وەك حەڵاڵبار دەبن هەروەهاش لە تەسویری تەنگەتاوبوونیان فەلەك لەگەڵ خۆیان بەشەڕ دەهێنن، زۆربەی خەڵق لێیان دەبن بە ڕەقیب و دوژمن، لە جیاتی ناو خوێنی جگەر و لە جیاتی نان گوژاڵ دەخۆن.. وەها دەبێ لە ئاحەزیدا شاعیرییەت بەکار دەهێنن تا ئەو

دوژمنەکەیان لە شەیتان مەلعوونتر دەنوێنن.. لە تەمیاتی بەشەر دەومەشێنەوە دڵی نەماتێ باسی ئەو بێ حورمەتییە بکات کە بە ڕاستی تووشی هاتووە بەڵام لە شیعردا ڕێز و حورمەتی پێی ڕەوا دیتراوە بە شکستی خۆی لە قەڵەم بدات. شاعیرم دیتووە بە حاڵ کنش و قافیە ڕێك دەیەخێت کەچی تف لە زەمانە دەکا کە حورمەتی بلیمەتی وەك ئەو ناگرێت. خولاسە ئەمیناغای حاجی بەکراغای کۆیێ بە ناز پەروەردە کراو بوو لە شیعردا دەڵێت

ئەوەندەم خاك بەسەردا کرد لە هیجرت
زەمین دووی بوو بە تۆز نیستیکە پەنجە

تەقالیدی شیعرمان موبالەغە و بەسەرەومنان و ئارایشتی زیاد و ئەو جۆرە نیگارکێشییەی تێدا باو بووە ئالی بێ یان مەحوی یان هەرکەس دەبێ بێ، حاڵ و باری ناو دیوانەکەی دووکەڵ و ئاگر و تەنگی و تاریکیی تێدا قەڵەمکێش کراوە مەبەستم نییە بڵێم ئازاریان نەبووە بەڵام ئازارێکی کە هەبووە خراوەتە ژێر عەدەسەی زلکەرەوەی خەیاڵی شیعر.

لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ حورمەتی ئەو مەهارەتە بگرین کە لە سەرمنباکردنی ئێش و ئازاردا خزمەتی خەیاڵی ڕەنگین و وێنەکێشی هونەراوی و زاخاوی مێشك، وێڕای دەوڵەمەندکردنی زمان و ئەدەبیان کردووە. چەند شیرینە ئەو بەیتەی تاهیر بەگ لە شکانی پەنجەی بە گوللەی دەمانچە گوتوومتی:

فەلەك زانی کە دەشکێ ڕەونەقی بازاڕی مانگ و خۆر
شکاندی پەنجەکەم تا من نەنووسم وەسفی ڕوخساری

ئێمە ئەگەر تەنها دیوانی مەحوی بکەین بە شایەدی خۆشی و ناخۆشیی ڕۆژگار و بەسەربردنی، هەرگیز ئەو ڕووداوە خۆشکەڵەیەی لاپەرەکانی ٢٤٦، ٢٤٧، ٢٤٨ی (مەحویی لوتکە) ناخوێنینەوە کە هەموو ئاگزووریییەکی گۆڕیوە بە ئیرووبی. بەڵام نەمزانی پێوەندیی چوارینەکەی لاپەڕە ٢٤٦ کە دەرگایە بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکە، بەو خەونە سەیرەی کە نائیبی والی دیتوویەتی و لە ئاکامدا کردوویەتی بە کۆیلەی (مەحوی) چییە؟ بەداخەوە هیچ ئاکێك لەو هەشت نووسراوەی باسکراو لە لاپەڕە ٢٥٥ی (مەحویی لوتکە)دا ئەهانوومتە بەرچاوم کەوا بێگومان گەلێك شتم لێ وەربگرتن لەبارەی مەحوییەوە. ئێستاش مەترسیی ئەوەم هەیە لێرەدا ڕایەك بەناوی

خۆمەوە دەربېرم دواتر دەرچێ کە یەکێك یان پتر لەو سەرچاوانە بۆی چوون.

وەك گەلێ جار گوتراوە و نووسراویشە شیعری مەحوی غەرقی واتا و نوکتە و وێنە و جوانییە، لەوانەیە مرۆ پێی وابێ لە بەیتێکی قووڵ بووەتەوە بۆ تەختی بنی کەچی بەڕووچوونی قووڵتر گەوهەری ئەدۆزرایەوە بەدەستەوە دەدات. بۆ بەسەرکردنەوەی چەندوچۆنی و واتای دیار و نادیاری شیعرەکانی، هەر ئەو دیوانە لەبەردەستدایە کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریم و کاك محەمەد شەرحیان داوە. لێرەدا هانا دەبەمە بەر ئەو دیوانە بۆ مەشقی وردبینی لە چەند نموونە شیعرێکی بابیی ئەوەی تروسکەیەکی زیاد بهاوێژێ بۆ ناو دیوانەکە و بەر نیگای ئەدیبدۆست و ئەدیبان لە قەوارەی گوتاریشدا جێی بێتەوە

دەشێ بڵێم کارێکی من دەیکەم گەلێك ئاسانترە لەوەی مامۆستا و کاك محەمەد کردوویانە چونکە هەمیشە رەخنە وەها بەسەرەوەنان لە بنیاتنان سووکەڵەترە. ئەوان مەیدانیان خۆش کردووە ئینجا من دێم بە وەکازی قەڵەمەوە پیاسەی تێدا دەکەم. ئەو نموونانەش هی بەدوادا گەڕان نین، لاپەڕەم سەیر کردووە و بەیتێکم ڕەچاو کردووە ئینجا دە پەڕەم هەڵداوەتەوە تا لەسەر لاپەڕەیەکی بەند بووم، وەهاش بووە کتێبم داناوە کە بۆی گەڕاوەتەوە لەو لاپەڕانە گیر بووم کە پێشتر پێیاندا تێپەڕی بووم، تا ئێستاش نەگەیشتوومە بەشی فارسییەکەی.

لە لاپەڕە ٦٤ی دیوانەکە هاتووە:

ئەگەر نازانەگیبەك بێ لە عەدەمدا بۆمان
چی هەیە غەیری بەهێنچی پەلەپەل داوی حەیات

لە شەرحدا هاتووە: نەبوون هیچ نەبێ سەربەستییەکی بۆ بنیادەم تێدایە لەم هەموو کۆت و زنجیرە جۆربەجۆرە مادی و ڕوحییانەی بە خۆیانەوەیان بەستووەتەوە.. هتد.

من تەنها دەخلم بەسەر وشەی (بەهێنچی)یەوە هەیە کە وەك بۆی دەچم (بهێنچی)یە واتاکەشی دەبێتە (پەلەپەل، خێرا خێرا بهێنچی داوی حەیات) وەك کە داو بە پێچانەوە هەڵدەکرێتەوە. (بەهێنچی پەلەپەل) لووس و لێك نییە، بەهێنچی داوی حەیات جوملەی تەواو دروست ناکات چونکە (إسناد)ی تێدا نییە وەك کە لە فیعلی (بهێنچی) إسناد پەیدا دەبێ

لە لاپەڕە ٦٦ هاتووە:

خەلاصی بوونی قەت ناوێ تەسیری زولفی زنجیرت
لەبەر تیرت، مەلەك بێ هەڵفرینی نەبووە نەخچیرت

لە شەرحدا هاتووە: دڵی کەمەندی زوڵفی تۆ هەرگیز نایەوێ ڕزگار ببێ و نێچیری ڕاوت ئەگەر فریشتەش بێ هەرگیز لەبەر تیری تۆ هەڵنافڕێ و دەیەوێ و بەو تیرە بپێکرێ چونکە دڵدار دەیەوێ هەمیشە لە یارەکەیەوە نزیك بێ. من وەهای بۆ ناچم، شیعرەکە نەیگوت نێچیر دەیەوێ بەو تیرە بپێکرێ بە پێچەوانەوە گوتی نێچیرت مەلائیکەتیش بێ خەلاسبوونی لە داوی زولفت ناوێ چونکە هەر هەڵفڕێ تیرت دەیکوژێ. مانەوەی لە داوی زولفی چاکترە بۆی.. داوەکە سەلامەتترە لە تیرەکە. وشەی (مەلەك) بەواتای (پەك مەل)یش دێ. مەبەست لە نێچیر نێچیری کوژراوە.

لە لاپەرە (٧٠)دا هاتووە:

لە پێ حەرامە زڕەی سیلسیلەی موقەددەسی عیشق
بەبێ بەشێر و مەگەر هەڵگری لە دنیا دەست

لەشەرحدا دەڵێ:

زنجیری عیشق ناکرێتە پێی هەموو کەس و هەموو کەس شاهانی خەڵاتی وا پیروز نییە. بۆ ئەوەی ئەم زنجیرە بکرێتە پێت و لە پێتدا زڕەی بێ، پێویستە ببێ بە شێر و ئەوەندە ئازا بێ بتوانی دەست لە دنیا هەڵگری.

من وەهای بۆ دەچم، بە ڕێنووسی کۆن وشەکە دەنووسرا (شیر) و بەهەردوو جۆر دەشیا بخوێندرێتەوە واتە (شێر، شیر = اسد، سیف). بۆ شکڵی (شێر) هەر واتایەك لێ بدرێتەوە فەیدی نییە بەمەرجێك لەگەڵ دەقی شیعرەکە بگونجێ نەك بە زۆرەملێ بەسەریدا بسەپێ.

چەندی دەکەم بۆم ناڵوێ بڵێم دەست لە دنیا هەڵگرتن سزای زنجیرکردنی پێوە بێ وا دەزانم ئیوە دێری دووەمی بەمشێوەیە دەبێ بخوێندرێتەوە:

ببی بەشیر و مەگەر هەڵگری لە دنیا دەست

بوون بە شیر (سیف) و دەست لە دنیا هەڵگرتن (تمرد) دەگەیەنێ نەك واز لێهێنان. لە سەیکی بەیتەکە ئەو دەست هەڵگرتنە وەکو ئالا هەڵگرتن و ڕم هەڵگرتنە بۆ جەنگ. تۆ کە خۆت شیر بوویت دەست هەڵگرتنیش دەبێتە شیر هەڵگرتن چونکە شیر دەستی هەڵگرتووە. ئەم سەرکەشییەیە کە موناسبی سزای زنجیرکردنە. چونکە لە واقیعدا دنیا

ئەلاقدانە دەبێتە هۆی حەلاڵکردنی زرەی سیلسیلەی موقەددەسی عیشق

لە لاپەڕە ٧٨ی ئەم بەیتە:

ئیتتیفاقی، ئافتاب ئانێ موقابیل بوو بە ڕووت
ئافەتێکی دی، ئەما تابی، بوەستێ ڕووبەڕووت

لە شەرحدا هاتووە:

بەڕێکەوت جارێکیان ڕۆژ تاوێك لەگەڵ ڕووت ڕووبەڕوو بوو. دەردێکی وای بەسەر هات توانای ئەما لە بەرابەرتدا خۆی بگرێ.

وەك من بۆی دەچم. ڕۆژ خۆی لە ئاوێنەی ڕووی یاردا دیتووە. ڕۆژ بە (افتاب) نووسراوە لە بەیتەکەدا. کە دیقەت بکەی لە وشەی (افتاب) (افت) هەیە کە دەکاتەوە (افە)ی نیوە دێڕی دووەمی شیعرەکە. ئینجا تابی ئەما چونکە لە وشەی (افتاب) کە (افت) لابەریت (اب) دەمێنێ ئەك تاب (اب)یش کە ئاوە ناتوانێ بووەستێ.

لە لاپەڕە ١٥٢ی ئەم بەیتە:

لە زولفیا ونە ڕوو لێوی هەر لە کارایە
ئەو ئافتابە گەر ئاوا بووە مسیحا خۆش

نیوە دێڕی دووەم لەبەرکێش دەخوێندرێتەوە (ئەوا فتابە گەراوا بووە..) لە شەرحدا دەڵێ: ئافتاب: خۆر. مەبەست لە حەزرەتی عیسایە. مەسیحا: عیسا. مەبەست لێوی یارە کە هەناسەیەکی لێ دەردەچێ وەك ئەو هەناسەیەی لە دەمی حەزرەتی عیسا دەردەچوو مردووی پێ زیندوو دەبووەوە.

من وا دەزانم ئافتاب کە ئاوا بووە ڕووی یارە لە زولفدا ون بووە. ئەما لێوی لە کار نەکەوتووە چونکە نەفەسی هەر دێت و خەڵق زیندوو دەکاتەوە وەك مەسیح. نەفەسیش مووی زولفی لادەدا بایبی دەرکەوتنی دەمی.

لە لاپەڕە ٢١٩ی ئەم بەیتە:

لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاە و هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بەردم تێ گرێ من بەرقی تێ دەگرم

لە شەرحدا دەڵێ:

لە تۆڵەی قسەی سارد و ناخۆشی وەك بەردی ڕەقی یارانی بێ بەرەییدا منیش

هەڵکێشانی ئاخ و هەناسەی گەرمم هەیە وەك هەورە برووسکە و بەرقی ئاسمان کاریگەر و سووتێنەرە.

من دوو تێبینیم هەیە: یەکیان ئەوەیە کە مەحوی دەڵێ (بەردم تێ گرێ) ئەم بەردەی لە خۆراییی نەهێناوە وشەی بەرد دەنووسرا (برد) ئەم وشەیە بەعەرەبیی دەکاتەوە (سەرد)ی نیوە بەیتی یەکەم. کەواتە بەواتای (حجر)یش دەروات و لە موناسەبەی قسەی ساردا بە (برد، ساردی)ش دەروات. تێبینیی دووەم ئەوەیە کە وشەی (شێتانە) هەرچەند جێی بووەتەوە بەڵام زێدە لە هەموو وسفێك بۆ (شێتی) پەسەند کراوە؟ بۆچی گێلانە نەبێ؟ وەها دەزانم وشەکە بە رێنووسی کۆن (شیتانە)ی بێ چوکرە دەنووسرا. ئەم شکڵە هەڵدەگرێ (شیطانە) بێت و بە زاری کوردیدا ببێتە (شیتانە) لە هەمان کاتیشدا (شێتانە)ش لە کیسە دەمێنێتەوە:

کەسێ شیطانە بەردم تێ گرێ...
کەسێ شیتانە بەردم تێ گرێ...
کەسێ شێتانە بەردم تێ گرێ...

رەنگە مەحوی لە ئاسۆی وشەی (شیطان)ەوە بە تەماشای بوو بێت خەیاڵ لە (برق) بکەینەوە کە ئەو (شهاب)ە بێ راماڵی شەیاتین دەکرێت وەك لە قورئاندا هاتووە (.. فأتبعه شهاب مبين) ئینجا ئەگەر شریتە بەم خەیاڵە درێژ بکەینەوە دەگەینە رادەی ئەوەی کە وشەی (سەردا) ئەویش (سەر) بێت و تەواوکەری حەرف جەری (لە) کە (دا)یە بەدوایدا هاتبێت وەك کە (سەردا)ش هەر (سەردێدا)یە و دالێکی لێ قرتاوە. ئەوسا (سەر) بەواتای (سەروو، بەرزایی) دێت بەمەبەستی (ئاسمان) چونکە شەیاتین گوێیان لە قسەی ئاسمان رادەگرت و (شیهاب)، بەرقیان تێ دەگیرا. لە پاداشی قسەی ئاسماندا من بەرق دەگرمە شەیتان.. ئەختێك چاوپۆشی و یارمەتیدان پێویستە تا ئەم واتا لێدانەوەی (ئاسمان و برق) لە شەیتانەوە لەبەر تەبیاتماندا دەسازێت.

یارمەتیدان و چاوپۆشیی ئەوتۆیی هەمیشە لەگەڵ لوغز و موعەمادا کراوە بۆ ئەوەی بتوانرێ هونەری وەها سەرکێش رام بێت، هێندێ لە شیعری مەحوی و ئالیش بە وردی و قووڵییاندا خۆیان لە رۆخی موعەما دەخشێنن.

لەم موناسەبەی موعەمادا باسێکی کورتیلە دەگێرمەوە.

عەبدولباقی ئەلعومەری بەشاعیری سەدەی نۆزدەمی بەغدا دادەنرێت خۆی

مووسلیبه هاتوومته بەغدا. دەگێڕنەوه دەڵێ ڕۆژێکیان به عادەتی خۆم دەچووم بۆ لای مەولانا خالید. به بیرمدا هات فیراسەتی تاقی بکەمەوه به ڕێگاوه موعەمایەکم ڕێك خست. که گەیشتمه خزمەتی گوتم. موعەمایەك هەیه بۆم لێك نادرێتەوه. داوای کرد و منیش خوێندمەوه:

بان لام العذار من ألف القد

فتم الوصال في عامين

دەڵێ بێ وەستان گوتی: (ئەفسەنتین) له وڵاتی مووسڵ زۆر هەیه. لێکدانەوەکه بەم جۆره دەبێت:

لام دوور بکەوێتەوه له (الف) دەمێنێتەوه (اف) که ویساڵ له دوو ساڵدا پێك بێت. ساڵ وەك (عام)ی هاتووه (سنة)شی هاتووه. دوو ساڵ دەبێته (سنتین) لەگەڵ (اف) بەیەکتر بگەن (اف سنتین – افسنتین) دروست دەبێت. ئەفسەنتین ڕووەکێکه. واتای بەیتەکەش به کوردی ئەمەیه: لامی بسك له ئەلفی قەد دوور بووەوه. له دوو ساڵدا وصال پێك هات.

له لاپەڕه ۲۹۸ که شەرحی ئەم بەیته دراوه:

ڕوخیشی کرده ئەولا دەیشی پرسی

به شۆخی شاهی من تۆ بۆچی ماتی

دەبوو بگوترێ (ڕوخ و شا) دوو بەردی شەترەنجن هەروەها (مات)یش زاراوەیه بۆ مردنی شا که نیتر یاری دەدۆڕێت. (ڕوخیشی کرده ئەو لا) له نوختەی یاریی شەترەنجەوه دەشێ ئەوه بێ که ڕوخێکی خۆی بەلاوه نا (وەك که له بەیتەکەشدا ڕووی خۆی بەلاوه ناوه) دیسانەوه یارییەکەی بردووەتەوه که مەحویی مات کردووه. دەشێ ئەوەش بێ که ڕوخێکی مەحویشی لاداوه و کوشتوویەتی دەشپرسێ بۆچی ماتی؟ ڕوخ له پاش وەزیر له هەموو ئالەتەکان بەهێزتره.

له لاپەڕه ۳۰۰ی ئەم بەیته:

مەگەر قەطعی نەفەس چاری بکا، وەرنا نییه هەرگیز

له پێوەندی کەمەندی پڕ خەمی طولی ئەمەل چاریێ

شەرح دراوه بەوەدا که له گیان دەرچوون بەولاوه هیچ چاری نەفس ناکا و له کەمەندی ئاڵۆزکاوی هیوادرێژی ڕزگاری ناکا.

ڕاستە قەتعی نەفەس، هەناسە لە خۆبڕین، دەبێتە مردن. ڕواڵەتی بەیتەکەش ئەو واتایە بەدەستەوە دەدات بەڵام وەك من دێتە بەرچاوم. مەحوی ئەمەکەی داناوەتە بۆ خوێنەر، دوای ئەوەی فێڵێ لێ دەکا بەوەدا کە دەڵێ هەر قەتعی نەفەس ئەو پێوەدییە چار بکات. ئینجا ئەگەر زیهنمان مووقەلاشی بکات دەبینین ئەو پێوەندییە بە تولی ئەمەلەوە یەکجار بێ هێزە چونکە مەحوی پێت دەڵێ قەتعی نەفەس بە واتای ئەو قەتعەی کە نەفەس دەیکات وەك (قەطعی شعر، تیغ) پێوەندیی کەمەندی پڕ پێچی توولی ئەمەل هەڵدەبڕێتەوە، واتە ئەمەلی بەو پارە هێندە سست و بێ هێزە کە هەناسەیەك داوەکانی دەپسێنێت. ئەم قەتعی نەفەسەش وەکو (دەرو دوو هۆدە)ی پێشتر گوتمان بەلای دوو ژووردا دەکرێتەوە. جارێکیان بەلای بڕانی نەفەسەوە کە مردنە، جارێکیان بەلای بڕندەیی نەفەسەوە کە خۆی تولی ئەمەل دەپسێنێت.

وشەی (مەگەر) لێرەدا کە وەها دەگەیەنێ هیچ شتێك نییە غەیری قەتعی نەفەس تولی ئەمەل چارە بکات. لە پەنا واتای (بڕندەیی هەناسە)دا تێ دەگەین کە شتێکی دەرەوەی وجوودی شاعیر ئەو داوەی ئەمەلە نابڕێت، چ هەناسەبڕان بێت کە مردنە و چ بڕندەیی هەناسە بێت هەردوویان زمەی عاشقن، لە دەرەوە نەهاتوون. داوە پێوەندییەکانی تولی ئەمەل بەرانبەر کاریگەری دەرەکی پسانیان بۆ نییە ئەو داوە پێوەندییانە هێندە سستن بەبای هەناسەی عاشق دەپسێن.

دەگەڕێمەوە بۆ قسەیەکی زووتر کردم کە ناشێ لەلاوە واتا ڕاگوێزین بۆ ناو شیعر، چی لە شیکردنەوەی ئەم چەند بەیتە کردوومە ڕاگوێستنی واتا نییە بۆ ناو شیعر چونکە لە بەیتەکاندا وشە و تەعبیر و هێما هەن بۆ واتاکان. تا ئەگەر بەسەمەروش چووبێتم و شتێکم هەڵنابێت کە بە خەیاڵی شاعیردا نەهاتبێ هەر نابێتە بەسەرەوەنان بەڵکو وەك ئەوەی لێ دێت تۆ بڵێی ۳۵ درهەمم بزر کردووە من ٤٠ درهەمت بۆ بدۆزمەوە. ئەگەر هاتباماییە (قەطعی نەفەس)م بردبایەوە بۆ خەفەکردنی سوڵتانی عوسمانلی و شای قاجار وەیا خنکاندنی ئەمیر دەریای هێزی دەریایی بەریتانیا دەبوومە قاچاغچی. مەحوی و نالی وەها بە چەرخ و دۆلابن تا لێیان بپێچییەوە حەققە. فەرموو بڕوانە ئەم بەیتەی مەحوی:

ئەگەییە دامەنی، دەستی دوعا، جا دەبمە خاکی ڕێی
تەریقەی گۆشەگیری بەردەدەم ئەمجارە ڕێ دەگرم

لەوانەیت هەموو لایەنێکی وشەسازی و واتانارایی و نوکتە سنجی و. و ی ناو بەیتەکەت بەتەواوی و دروستی لێك دابهێتەوە بەلام بەسەر شتێکی وردیلەی نیگارانەکێشدا تێ پەڕی بیت وەك ئەوەی کە (جا)ی میسرەعی یەکەم وا لە ناو (ئەمجارە)ی میسرەعی دووەمدایە و لە لای خۆیەوە وەك بورغووی مەکینەیەك لەنگەری دوو میسرەعەکەی ڕاگرتبێت، جا، ئینجا، ئەمجا، ئەمجار، ئەمجارە هەمووی یەك واتای هەیە، هێندێکیان لێیان کورت کراوەتەوە بەزۆری و بەکەمی، تا ئەمجارە بووەتە جا.

نالی دەڵێ:

وای فەرموو کە ماچت ئەممێ بووبەشی (تو) بم
ئەمسالە بەجێ دێ ئەسەری وەعدەیی پاری

هەموو ئەدیب و شاعیرەکان دەیانخوێندەوە و دەخوێنەوە (تۆ) کە چی بەمەدا بەیتەکە دەمرێ، نالی (تو – توو)ی گوتووە چونکە لەم شکڵەدا هەم بەواتای (تۆ – أنتّ) دێت و هەم بەواتای (توو – تووك – شەعر – موو) دێت. تومەز لەم ساڵەدا (ڕووبەشی توو – تووك، موو) بووە چونکە ڕیشی ڕواوە. ئەو واتایەی لە (توو – بەواتای تۆ – أنت) دێت ئەویش لە جێی خۆیدا بەردەوامە.

وەك دیارە مەحوی و نالی ناوناوە بەزاری دەرەوەی بابان دواون ئیتر لە وشەیەك، لە تەعبیرەك بێت و مەبەستیان پێ دەربڕیوە.

مەحوی کە دەڵێ:

ئەم عالەمە کە مونتەظیری جیلوەی ئەو مەهن
دەمرن بەو ئینتیظارە هەموولا (بلا خصوص)

بەیتەکەم بە ڕێنووسی دیوانەکەی مەحوی ڕاگوێست

لەم بەیتە سەرم سوڕماوە، لێم سوورە کە لە تەعبیری (هەموولا بلا، همولا بلا، همولا بەلا، همو – لابە...) جارێکیان لە وەرگێڕانی (هەم)ی سەرەتای (هەموولا) وشەی (مەه) پەیدایە کە لە میسرەعی یەکەمدا عالەم مونتەزیری جیلوەی ئەون بەلام نازانم لە کوێوە ئەو وەرگێڕانە دەست دەکەوێ

جارێکی دیکە لە (هەموو لابلا) کە بخوێندرێتەوە (هـ – مو – لابە) ئەو (مو)ە لادەچێت و دەمێنێتەوە (ە – لا)، (لابە – لابەرە دەگەیەنێ) وەك گوتم مەحوی زاری

دەرمووی بابان بەکار دەهێنێت).

ئەوەی دەمهێنێتەوە لە (هەموو لابلا خصوص) تەنها (لا خصوص)ە بە جۆرێکی کە باشی بۆ ناچم لە (لا خصوص) مانەوەی (لا – بە واتای حرفی لام) مەبەستە. ئینجا کە ئەم پەدوا (هـ – لا)دا هات (هلال) دروست دەبێت کە ئەویش مەمەکییە. دەکاتەوە یار.

دەزانم شیکردنەوەکە ناتەواوە بەڵام پەنجەم لێی بەر نابێت چونکە ئاین و ئۆینی مەحوی گاڵتەی لەگەڵدا ناکرێ. بەڵی شیعرەکە لە ڕواڵەتدا تێمان ناگەیەنێ بۆچی عالەم لەو ئێنتیزارەدا دەمرن. بەڵام ئەگەر (مەد – هلال) لە شیعرەکەدا دۆزینەوەیان مەبەست بێ بەبەرییەوە دەبێ چین لە دوا چین بمرن و ئەیدۆزنەوە.

قسە زۆرە. مەودا کورتە. ئەمەل دوورە!

خوێنەرانم! بە خەیاڵی دڵی تەڕی هەموو شاعیرە کۆچکردووەکانمان لەگەڵ مندا ئەم غەزەلەی مەحوی بخوێننەوە، لە هەمووانەوە گوڵاوڕێژێنی یادی باغ و بەهەشتی دڵە بولبولەکەی مەحوی، نامەنگێڕی شەرەف و قودسییەتی کوردستان و کوردزمان بێ:

شمشادە ئەمە یا قەدە یا سەروی ڕەوانە
یا عەرعەرە یا نەخلی مرادی دڵ و جانە
داخۆ ئەمە ئەگریجەیە پەخشاوە بەسەردا
یا سونبولە کردوویە صەبا زولفی بەشانە
ئاهووی خوتەنە جیلوە دەکاتن لە خەطادا
یا چاوی ڕەشی فیتنە گەری سورمە کەشانە
دڵ هایمە دایم کە ئەمە قەترەیە داخۆ
یا جوزئەکی بێ جوزئە موسەممما بە دەهانە
ئەم مەی صیفەتی خوون خورە وا نازک و سوورە
یاقووتی لەبە یا گوڵە یا قووتی ڕەوانە
ئالاندم و فەرمووی کە ئەم ئاوازە حەزینە
یا مەحوییە یا بولبولەکەی فەصلی خەزانە

بەغدا، هەینی ٨/١/١٩٨٨

کاروان، ژمارە ٦٢، ١٩٨٨

# کەوچکێک شەکر بۆ قاوەی تاڵ

بەر لە ماوەیەکی چەند مانگی وە یا پتر لە ساڵێک گوتاری گۆڤارێکی کوردیم سەیر کرد، لە ناو توێژیدا وەها هاتبوو کە شیعری نالی لە چاو هی حاجی قادر هێندە بەرزە، کوردی گوتەنی، ئاسمان و ڕێسمانە کە دیارە ڕیسمان واتە پەت، بەبالآی ئاسمان ڕاناگات.

هەرچەند دەزانم قسەکە لە چەژی موبالەغەدۆستیدا خۆی لەبەر زاری نووسەری گوتارەکە شیرن نیشان داوە، دەشزانم موبالەغە ڕەوایە لە تەقالیدی شیعردا بەتایبەتی شیعری خۆرهەلآت، دیسانەوە لەبەر دوو سەبەب لێم خۆش نەهات. یەکیان ئەوەیە کە شێوازی دەربڕینی قسەکە دۆستانە نەبوو. دووەم ئەوەیە موبالەغەکە خۆی موبالەغەی تێدا بوو، لە هەموو ئەو عەیارانەی لە بەراورددا لایەنێک بەسەر لایەنێکی تردا ڕادەشکێنێ دوو عەیارە ئەوپەڕیان گرتۆتەوە یەکیان ئەم (ئاسمان و ڕیسمان)ەیە، ئەوی دیکەشیان (قەترە بەدەریا)یە کە لێیان تێپەڕ بوویت بەراورد لە نێوان بوون و نەبووندا دەکەیت.

پێی ناوێ بڵێم، لە دەمێکەوە و بەزۆری سەلمێندراوە کە نالی لە مەیدانی شیعری کوردیدا پێشڕۆیە، حاجی قادر خۆیشی لە چەند قەسیدەدا بەنالی هەڵدەڵێت و تەنها شاعیرێکی ئەو سەردەمانەیشە بەتەوازووع و حورمەتەوە خۆی بۆ شکاندبێتەوە تا ئەوەی لە بەیتێکیدا هاتەوەهات دەڵێ:

بە تضمین فەردەکی نالی دەهێنم تا ڕەفیقانم
بزانن فەرقمان زۆرە خەزەف قەت وەك گەوهەر نابێ
(کە مەندی زولفی دوولانە لە بۆ گەبر و مسلمانە)
(دەکێشی بێ محابانە چ لەملا بێ چ لەولا بێ)

دەبینین خۆی بە خەزەف و نالیشی بەگەوهەر داناوە بەوەشدا هەریکە وەك خاوەن گوتارەکە قسە بکەیەنێتە ئاسمان و ڕێسمان.

کە پێویستیش بێ پاکانە بۆ خۆم بکەم لەوەدا کە مەبەستم ڕوونکردنەوە نەبێ هیچی تر نییە. بەبیر خوێنەردا دەهێنمەوە کە چەندین جار لە تەلەفزیۆن و لە چەندین

نووسینمدا پایەی شاعیریەتیی نالیم بێ پەروا لە ترۆپکەی شیعری کوردی داناوە تا ئەوەی لە شیکردنەوەی بەشێک لە بەیتەکانی بۆ قووڵاییەک چووم، بەلای هەندێ کەسەوە، سنوورم بەزاندووە بۆ ئەودیوی مەبەستەکانی نالی. هەڵبەت گۆمی نالی لەوە قووڵترە کەسێک بێت بەخێری خۆی بیری تازە لە تەختی بنیەوە لێ بدات بەرەو قووڵترەوە بەڵام ڕەنگە من پتر لە یەکێکی دیکە بەهەناسەی درێژەوە بناوم لەو گۆمە لێ دابێت بۆ دۆزینەوەی گەوهەرەکانی، بەوەشدا مافی تەواوم هەبێ بیروڕا دەرببڕم لە ئاست هەڵبەستەکانی وە یا لە بەیەکدی گرتنی شاعیریەتیی ئەو بەشاعیریەتیی یەکێکی دیکە چ خۆم بیکەم چ یەکێکی دیکە کردبێتی.

خوار و ژوور نەک هەر لە نێوان دوو کەس و دە کەسدا بگرە لە نێوان دەستی چەپ و ڕاستی تاکە کەسیشدا هەیە... دوو چاوی خۆت و دوو گوێی خۆیشم لە هێزی بیستن و دیتندا بەرانبەر نین. شیعری تاکە شاعیریش هەمووی هەر تا تەرازووی هاوسەنگ نین. ترۆپکەلانەی گردێکی سەد مەتری لە نەوەد مەتری لای دامەنی کەژێکی دوو هەزار مەتری بەرزترە ئینجا ئەگەر سەرووی بەرزاییی شتان و کەسان و هونەران بەیەکدی نەگرین بۆمان ئاشکرا نابێ کام لە کام و کێ لە کێ بەرزترە.

دیوانی نالی بگرە بەشایەدیی ئەم قسەیەم: بەر لەوەی زەینی خۆت بەترخاندن و هەڵسەنگاندنەوە خەریک بکەیت دەبێ لە پێشەوە دان بەم ڕاستییانەدا بهێنیت:

یەکەم ڕاستی ئەوەیە کە شیعری سەرەتای دەمدان لە شیعر لە چاو شیعری تەمەنی ڤاڵبوونەوەدا وەک پلە سەرەتاییەکانی پێپلیکانەن لە چاو پلە ژوورچووەکاندا. کەس لە بڕێ نابێ بەکوڕێ، لەمەوە بەدیهییەیەک تووش دێین لە ئاست هەموو خاوەن مەعارەتێکدا بەڕاست دەگەڕێ. ئینجا سەیر نییە ببینین دیوانی شاعیرێک نموونەی لە یەکدی دووری تێدا بێت کە ئەوانیش لە ڕێی موبالەغەوە هەندێکی لە چاو هەندێکی (ئاسمان و ڕیسمان) بێت.

دووەم ڕاستی ئەوەیە کە بەرهەمی قۆناخی لێکەوتەیی و پەرەووتیی دەمی پیری سەرەژێر دەبێتەوە نەک تێ هەڵدەکشێت. پاش ڤاڵبوونەوەی تەواو قۆناخێکی وەستان دەست پێ دەکات کە لە ئاکامدا وردە وردە دەستەوئاو دەبێت و خورکەی بەوەژێری لێ پەیدا دەبێت. دەشێ مرۆ هەبێ بەو پلەیە نەگات، بەجوانەمەرگی وەیا مەرگی دەمی ڤاڵبوونەوە

ئەم ڕاستییەش لەگەڵ ڕاستیی پێشووتر بەبیژنگی لە یەکتر کردوو بەرهەمی شاعیر و هونەرکار دادەبێژن لەگەڵ تێبینیی ئەوەدا کە دامەزرانی دەمی بیری پێگەیشتوویی قۆناخی قاڵبوونەوەی پێویە هەرچی پلەی سەرەتای مەهارەتە کاڵی و کرچیی ساوایی تێدا دەخوێندرێتەوە

سێیەم ڕاستی و چوارەم ڕاستی ئەوەیە کە لە دەمی قاڵبوونەوەشدا خاوەن مەهارەت بەپێی ڕێکەوت و هەلکەوت و باری نەفسی و دەوروبەر بەرهەمی لەیەکنەچووی دەبێت وەیاخود مەهارەتی گەورە لە هەندێ مەیداندا لە ئاست مەهارەتی مامناوەنجی کە پسپۆری ئەو مەیدانەیە کورت دێنێت. دەبینی پاداشتی گەورە و مزەی ئەرک هەندێ کەس وەها چالاک دەکات پێش لە خۆ مامۆستاتر دەکەوێتەوە کە بۆ ئەو پاداشتە تامەزرۆ نەبووە.

کورتیی قسەی درێژ لێرەدا ئەوەیە کە نرخاندنی شیعر وەیا هونەر گەلێک گەلێک بەرەنگەوە دەگاتە ئەوەی تەعبیری قەترە بەدەریا و ئاسمان و ڕێسمانی تێدا بەکار بێت چونکە لەوانەیە تەنها کەسێش لە دوو بەرهەمی بەرز و نزمیدا بەر ئەو تەعبیرە بکەوێت وەیا بەرهەمی خاوەن هونەری مامناوەنجی لە هەندێ بواردا پێش بکەوێتەوە وەک کە تازە گوتمان... نرخاندن لە نێوان دوو کەسی هاوکەسبدا، چ شاعیر بێت و چ نووسەر و هونەرکار بێت، لە تێکڕای بەرهەمیان و لە ترۆقەڵەکانیاندا دەکرێت دەنا، کەم و زۆر، بەشێکی بەرهەمی ئەو مەهارەتدارانە لە هێز و پێزدا دراوسێن وەک ئەوەی کە سەرمایەی ١٠٠ دینار پێکەڵپێکە لەگەڵ ١٠٠ دیناری یەکەمی سەرمایەی هەزار دیناری وەیا ملیۆن دیناری.

لەو هەڵبەستانەی کە وەپاڵ نالی دراون تێیاندا هەیە کەم شاعیر پێیان ڕازی دەبێ وەپاڵ خۆیان بدرێن تا ئەوەی من لە ئاست هێندێکیاندا هەرگیز نالای سەلماندنم هەڵنەکردووە و بەهی نالییان نازانم، تێیشیاندا هەیە شەقڵی نالییان پێوە ئاشکرایە بەڵام لە لووس و لێکی و گەواراییدا تۆزی هێندێکی دیکە لە شیعرەکانی ناشکێنن.

حاجی قادریش لەلای خۆیەوە ئەم خوار و زوور و نێوداشت و ترۆقەڵانەی هەن لەگەڵ تێبینیی ئەوەدا کە مەراقی کوردایەتیی وەهای لێ کردووە زۆر جاران گوێ نەداتە بەلاغەت و ڕەوانی و جوانی لە هەڵبەستدا تا دەبینین، لە خۆی، پاتەوپات پێمان دەڵێ:

با بڵێن ئەم شیتە قەحبە مردووە
چەند وەریوە چەند وڕێنەی کردووە
حەق تەعالا واقیعی ئەحواڵمە
خالیصەن لیللایە تەرقیمی ئەمە
بەیتەکان عەیبی مەکەن خوار و کەچن
مەقصەدم لەم بەند و باوە دەربچن
وەرنی ئەم دونیایە ئەفسی نەفسییە
گەر لەبەر ئێوە نەبێ باکم چییە
من لە تووفانا بەری خۆم دەردەکەم
وا مەزانە دامەنی خۆم تەڕ دەکەم

حاجی کە لێرەدا دان بەعەیبداریی شیعری خۆیدا دەنێت نەهاتووە لە ڕووتەنی بێ شەقڵ و دروشم و هێمامان سەرگەردان بکات. هەر لەو برە شیعرەدا کە تۆمەتی خواری و کەچییان تێ دەگرێت، ماڵم هەقە، زۆرینەی ئەو ٥٣ بەیتە وەك گەلێك قەصیدەی دیکەی، نموونەی ڕەوانی و بەلاغەتێ بەلام بەشێوازێك کە بۆ (سهل ممتنع) دەچێتەوە. حاجی لە پشت ئەستووریی خۆی بەمەتانەتی دارشتن و ساماتی ناوەرۆکی شیعرەکانیەوە بێ باکانە لە جیاتی خەڵق عەیبیان بۆ ڕەچاو دەکات، ئەم ڕاستییەش نەك هەر تەنیا بەقووڵبوونەوە لە جووت سەرواکانی، کە سهوولەتی قافیەگۆڕییان تێدایە، بەڵکو باشتر بەوەدا دەردەکەوێ کە لە چەند بەیتدا پاتەوپات خۆی هەڵداوەتەوە کە لێرەدا نموونەیەکیان لێ دەهێنمەوە:

خەزنەیێکە بەیتی من دوو میصرەعم داخستووە
کەس تەماعی تێ نەکا ڕێگەی دزم لێ بەستووە
بێکە بەر، دیبایی نەظم، تا قیامەت نادڕێ
چونکە ئەبکاری مەعانی تار و پۆیی ڕستووە
زامیرا بەیتم لە نالی و کوردی زۆر کەمتر نییە
تالعم بەرگەشتییە، بەدبەختە بەختم نوستووە

ڕێکەوتێکی لەبارە بۆ ئەم نووسینە کە حاجی قادر خۆی لە مویالەغەدا بەپێی پێویست ئەم ئاسمان و ڕێسمانەی لە هەڵبەستدا بەکار هێناوە ئەمما لەبەر کێشی شیعر وشەی ئاسمانی تێدا گۆڕیوە بەفەلەك: هەروەك لەو برە شیعرەدا تەفعیلەی بەیتەکان

ـهڵبی خەریکی سەماکردنن و نوستادانەش داستانی مێژووی کۆنی ناو حیکایەتانی کردووە بەناوبارە بۆ واتاکانی، ئەم گۆڕینەی ئاسمانیش بەفەلەك هەم دەسەڵاتی زمانناسی و هەم تیژکردنی ڕەنگی داستانی تەقلیدیشی پێوە دیارە:

پەرچەم و فێسی کەچی تۆ ئەی جەوان
تاجی کەیان و عەلەمی کاویان
من لە غەمت ڕەنگەکەم کەوتە بەر
خوانی بەهەشت و سەفەری هەفت خوان
بێژەنی چاهی زەنەخی تۆیە دڵ
ڕاهی نەجاتی: فەلەك و ڕێسمان
تیری موژەت بۆ دڵی ئەسفەندیار
تیری گەزی ڕۆستەمی سازەندەران
فەرقەتی تۆ لەشکری ئێرانییە
سەبری منیش لەشکری توورانییان
بەسیەتی سا خوێنی سیاوەش نییە
جان و دڵت بردووە هەم دینەمان
حاجییە فیردەوسیی کورد سا ئەتۆش
گوێ وەکو مەحموود مەدە قەولی بەدان

دەمێ بڵێم لەم (ش)ەی دوای (ئەتۆ)ی بەیتی پاینی غەزەلەکە دڵگرانم. باشتر ئەوەیە (ئەتۆ) بێ چونکە ئەم (ش)ە وەها ڕامگەیەنێ کە دەشێ مەحموود گوێی نەدابێتە قەولی بەدان هەروەك دەشێ گوێی دابێتێ بەڵام ئیحتیمالی گوێنەدان بەهێزترە. (ش)ی پێوەندیی وەکو (و، هەم) (معطوف و معطوف علیه) دەخەنەوە سەر یەك ئەك لە یەکدییان دادەبڕن. کە (ش)ە کە هەڵستا و گوترا (ئەتۆ وەك مەحموود گوێ مەدە)... ئەتۆ و مەحموود لێك دادەبڕێن و بەر دوو حوکمی جودا دەکەون. مەحموود گوێی داوەتێ، تۆ گوێ مەدەرێ. ناشزانم ئاخۆ بەئەسڵ حاجی چی گوتووە ئەگەر (ئەتۆش)ی گوتبێ وەك ئەوەیە، پێشەکی، لەبەر زێدە ترسی لەو گوێدانە وەهای دانابێ یار گوێی داوەتە قەولی بەدان ئیتر بەگلەییکردن لەو تۆمەتە مەرھوومە دەیەوێ ڕێی گوێدانی لێ ببڕێتەوە. لەلایەن دارشتنیشەوە (ئەتۆش) تیژترە لە (ئەتۆ) ئیتر ڕەنگە ئەم وردە زێدەتە حاجیی بردبێتەوە بۆ ئیحتیماڵە بێ هێزەکەی باسم کرد.

دیوانی حاجی قادر بەیتی واتا سەختی زۆرن کە جارێ لە کەسم نەبیستووە بەرەهایی و بێ گرفت ساغی کردبێتتەوە. بەر لە بیست سالێك مەرحووم مەلا ڕەئووفی سەلم ئاغا لیستەیەکی ٢٠-٣٠ بەیتیی بۆم هەنارد کە مەباشی لێیان حالی نەبووبوو. بەداخەوە لیستەکەم نایەتەوە بەرچاو، تەنها بەیتێکیم بەبیردا دێتەوە کە دەڵێ:

لێوی وەك قەندە موکەرڕەر لە دەما شیرینە
بۆیە تەکرارە وەکو نالە تەنیسی نەفەسە

لە مەجلیسی خدمە ئەندام بووم، مەلا ڕەئووف هاتە لام و لەو بەیتانەوە دواین و واتای ئەمیانم تێ گەیاند کە شەکر بە (تکریر- دووبارە سافکردن) شیرینتر ئەبێت وەك کە دەگوترێ عەرەقی دووبارە بەدووجار تکاندن پەسەندتر دەبێت. لەبەر ئەم زێدە شیرینییە وەکو نالەکە هەمدەمی داتیمی هەناسەیە لێوەکەش هەمیشە بەسەر زارانەوەیە. حاجی لەم بەیتەدا لێوەکە و وشەی لێوی بەمەهارەتی تەعبیر خستۆتە دەمی خۆیەوە و بەدووبارەکردنەوەی ناوهێنانیشی سات لە سات شیرنتری دەکات، یاخود هەتا دەیمژێ شیرنتر دەبێ. مەلا ڕەئووف لەم (تکریر، تکرار)ەی شەکر بەڵەد نەبوو بۆیە مەعناکەی لێ ڕوون نەبوو. ئێستا لە سایەی تەکریری ئەوتەوە قوتابی سەرەتاییش ئاشنای بووە.

جگە لە ئیشکالاتی واتاداهراوی و نەکراوەیی هێندێك لە بەیتەکانی، گرفتی دیکەش هەن پێوەندییان بەژیان و بەسەربردنی حاجییەوە هەیە کە لە دیوانەکەیدا دێتە بەرچاوی خوێنەر. من لەو سێ بەرگەی (حاجی قادری کۆیی) کە لە سالانی ئەندامەتیم لە کۆڕی زانیاری کورددا نووسیمن نەگەیشتمە شەرحی دیوانەکەی چونکە جارێ زۆرم مابوو لە توێژینەوەی ژیانی بیمەوە، خوا کاری خزمی چاکەخوازم ڕاست بهێنێت ئەو ئەرکەیان لەسەر شانم لادا بەدوورکەوتنەوەم لە کۆڕ. ئێستا لە موناسەبەدا گرفتێکی ئەوتۆیی ناو دیوانەکە بۆ بەرچاوی خوێنەر هەڵدەستێنمەوە.

ئەوە شیعرێکی پێنج بەیتی کە سەرەتاکەی بەم دێرە دەست پێ دەکات:

مەتنی کوتوبی ئەم دەوە با شەرح کرابێ

بەپێی نووسینی مامۆستا گیو موکریانی لە هەجووی قازییەکی سابڵاغی داناوە کە سەروکاری لەگەڵ مروەت ناوێکدا هەبووە.. هتد. لە کۆتایی شیعرەکاندا ئەم بەیتە

دەخوێنێتەوە.

حاجی دەڵێ ئەم میسرەعە تەئریخییە قازی
(انصافی نییە، عاری چییە، مروەتی گابێ)

ئەم دەقە هی دیوانی حاجی، لە لێکۆڵینەوەی سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزایە. مامۆستا گیو نووسیویەتی:

هەر حاجی دەڵێ ئەم قسە تەئریخییە قازی

ئێمە ئیشمان بەمیسرەعی دووەمە کە تەئریخی ڕووداوەکەی تێدایە هەرچەند ڕێم هەیە بڵێم دەقەکەی موکریانی وشەی (دەڵێ) تێیدا بێ گرمت هاتووە... بەحیسابی ئەبجەد ئەگەر (مروت) بنووسین لە جیاتی (مروەت) هێشتان ژمارەی نرخی پیتەکانی میسرەعەکە (ئەگەر بەسەهوو نەچووبێتم) ١٢٨٥ دەگرێتەوە. ئەم ساڵە بەهیچ لێکدانەوەیەك لەگەڵ گەشتی ژیانی حاجی ناگونجێت من لە لێکدانەوەی دوور و درێژ و بەیەکدی گرتنی ساڵ و ڕووداو و کەین و بەینی ژیانی ئەو و باپیرم و کەیفی و شێخ ڕەزا کە لە بەرگێك لە بەرگەکانی (حاجی قادری کۆیی)دا بڵاو کراوەتەوە مانەوەی حاجی قادرم لە ساپلاغ گەیاندە ١٢٧٩. ئینجا ئەگەر لە ١٢٨٥ جارێ لە ساپلاغ بووبێت چۆن دەشێ حاجی پێش کەیفی بەچەند ساڵێك کۆیەی جێ هێشتبێت؟ دەربەدەربوونی کەیفی جێی گومان نییە کە لە ١٢٨٦ ڕووی داوە، ئەویش بەشاهێدی باپیرم کە خۆی لەبەر خاتری شێخ ڕەزا کەیفیی سەرشکێن کردووە و تاراندوویەتی... لە دەقی شیعرەکەدا بەنگەیەك نابینم بۆ داشکاندنی ٥-٦ ساڵێك لەو مێژووە تا بەرەو هەوراز بهێنێتەوە بۆ ١٢٧٩، ١٢٨٠. ناشکرێ خۆم لە ڕاگەیاندنی میسرەعەکە نەزان بکەم و پشتگوێی بخەم. لەلایەکی دیکەشەوە بەزەحمەت بشێ بگوترێ بڕە شیعرەکە هی حاجی قادر نییە چونکە شەقڵی ئەوی پێوە دیارە هەرچەند لە نووسیندا هەڵەی تێ کەوتووە. ئینجا ئەگەر بەکێك بڵێ ئەم مێژووەی ١٢٨٥ بەرەو سەلماندنی ڕیوایەتێکمانەوە دەبات کە دەڵێ حاجی و کەیفی بەیەکەوە بەرەو ئەستەنبوڵ ڕۆیشتن، پێی دەڵێمەوە: باپیرم کە لە ساڵی ١٢٨٨ لەگەڵ باوکیدا بۆ حەج دەچێت لە حەلەب کەیفیی دیتەوە، مامۆستای کوڕانی والی بووە. جگە لەمە، کە لە کۆیەش دەرچوو بەپێنێك لە هەولێر مایەوە بایەی ئەوە بکات کە ڕەشیداغای حاجی بەکراغا بەنامە لێی داوا بکات بگەڕێتەوە بۆ کۆیێ ئەویش وەڵامە ناگرینەکەی.

ئەی نوحی ئەجاتم لە دەستی چەرخی جەفاکار
وەی روح و سەر و ماڵی منت جوملە بە (ایثار)

بۆ دەنێرێتەوە و تێیدا دەڵێ:

بێ عیزەت و بێ عارم ئەگەر بێمەوە کۆیێ

ئەم گلەیی و بەهانانە هەمووی دوای ئاوارەبوونی حاجی بووە..

خولاسە ئەم تێبینیانە هەتا ئێستە بۆ من ساغ نەبۆتەوە کە لە نێشکال و گرفت بدوێین جێی خۆیەتی بڵێم چوارینەیەکی حاجی هەیە لەوانەیە خوێنەری بەپەلە تەڵەزگەی تێدا بکات و واتاکەی بەپەرەوازی بۆ روون ببێتەوە و وەها تێ بگا حاجی لەو چوارینەیەدا نالی شکاندبێتەوە لە ئاست شاعیریەتیی خۆیدا. حاجی دەڵێ:

بەیتی نالی و بەیتی من گەر تێکەڵی یەکدی دەکەن
ئەحمەقی سورەت پەرست و جاهیلی مەعنا نەزان
حاجی لەکلەک لەک بەلەک فەرقی لەگەڵ تووتی هەیە
وەک هەزاری ئەو بەهار و بولبولی فەصلی خەزان

لە وشەی حاجیی لەکلەکەوە دیارە کە حاجی خۆی بەلەکلەک داناوە لە ئاست نالیدا، تووتیی بۆ دەمێنێتەوە لەو میسرەعەدا. من دەقەکەم لە دیوانی حاجی، بەلێکدانەوەی مامۆستایان سەردار و شارەزا، بۆ ئێرە راگواستووە کە خۆشبەختانە وشەی (هزار)ی بەواتای بولبولیان بە(هەزار) نەک بە(هەزار) نووسیوە. خۆزی لە هەندێ هەڵەی بەرچاو و زەقی ناوناوەی دیوانەکە هەمان نیشانەشکێنییان بکردایە وەک کە لە لاپەڕە ٢٧١ هاتوون (کەلبی رەقیب)یان لە جیاتی (کەلبی رەقیبم) نووسیوە و میسرەعەکەی بێ لەنگ بووە ئەمەش تاکە نموونە نییە لە کۆتایی لاپەڕە ٢٧٠شدا میسرەعی یەکەم جگە لەوە کە هەڵە و لەنگە سەرەتاکەشی بەبەحرێک دەست پێ دەکا جودایە لە بەحری میسرەعی دووەم... چەندێکی دیکەش هەن من خەریکیان نابم و زۆریش سوپاسگوزاری ئەو ئەرکەم کە گەلێک لایەنی شیعرەکانی حاجییان پێ روون کردۆتەوە...

تا ئێرە چی نووسیم لە قاڵبی وەلاوەنانی تۆمەت و لەسەر کردنەوەی بەرگیرانە و روونکردنەوەی چەندوچۆنی هەندێ حاڵ و باری حاجی و بەشێک لە مەڵبەستەکانی بوو. کە بمانەوێ، پێویستیشە بمانەوێ بەر مەیدان و بێ تەقیە لە بەرزایی شیعری

حاجی بدوێنێ نموونەی تۆقەڵانەیی زۆرن لە دیوانەکەیدا کە لێیان بووەشێتەوە شەڕی گەرەمنکێڵی بەخەڵق بفرۆشن. جارێ لە پێشەوە با بڵێم گومان ناکەم چ ئەدیبێك ڕێ بەخۆی بدا دوودڵ بێ لەوەی کە قەسیدەکەی (بەهار)ی حاجی لە ڕیزی هەرە پێشەوەی شیعری مرۆڤایەتییەوە دێت نەك هەر هی کورد. لەلایەن دەسەڵاتی هونەری شاعیرییەوە حاجی بەو قەسیدەیە و نموونەی دیکەی کە لە زیندە جوانی و سفتی و چڕی و پتەوییان خەریکن بقڵشن، لەوە دەرچووە شاکارەکانی بدرێنەوە بەکاری ڕێکەوت و تەقڵەی مامە حەمە و هێکانی ڕەشهاوێژ. سەیری ئەم چوارینەیە کە لە وەسفی کابرایەکی تەقتەقیی داناوە:

شەوکەتی جووتەی سمێڵت تاکە مابەندی کەمە
تەرکەشی تیری ئەژاو و شیری دەستی ڕۆستەمە
ڕووی لە تەختی ڕوومەتت هێناوە بۆ شانت دەڵێی
ماری سەرشانی زوحاك و دوشمنی تەختی جەمە

تەرکەش (تیردان) بەمەدا هەر داوە موویەکی سمێڵەکە وەکو تیرێکی تێراوە، تێکڕای مووەکانیش وەکو شمشێری دەستی ڕۆستەمن. ئەمەندەم گوت لە شەرحدا هەتا خوێندەواری ئەوباو بچێتە ناو چوارینەکەوە دەنا داڕشتن و مۆسیقای چوارینەکە مامۆستای شەرحدەری ناوێت.

سەیرێکی ئەم پێنج بەیتە بکە کە لە مەدحی ئەمین ئاغای حاجی بەکراغای حەوێزیی داناوە:

ئەی محەمەد وەی ئەمینودەولە ئیمڕۆ کۆیێی توو
جەننەتێکە کەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوور کەوتەوە
موبەتێکە دەربەدەر گەردی دیاری غوربەتم
بەندە یادی ئاستان بۆسی ئەتۆی کرد هاتەوە
چونکە توحفەی لازمە هەر کەس لە غوربەت بێتەوە
بەم دوو فەردە من قەزای سەد کۆنە توحفەم کردەوە
قاوەچی بەزمی ئەتۆ دنیایە سینی ئاسمان
ئافتابی زەرفە فنجانی مەمە، قاوەی شەوە
ئەو شەوە بۆ هەرکەسێ دونیا بکاتە ڕۆژی ڕوون
شەو لە حیتەی ئەو عەنقایە دەرباتی خەوە

خوێنە سەرنجێك لە بەیتی چوارەمی مەدحەکە بگرێ

دنیا قاوەگێڕی دیوەخانەیە. ئاسمان سینییەکە فنجانەکانی قاوەی لەسەر دادەندرێن. ڕۆژ ئەو ژێر پیاڵەییە فنجانی بەسەرەوەیە، مانگی سپی فنجانی قاوەیە. شەو خۆی قاوەیە.

چ ماوەتەوە بەبەلگەی گەورەیی بخرێتە پاڵ شەو و ڕۆژ و مانگ و ئاسمان و هەموو جیهانەوە؟

بەیتی پێنجەم لە داخراوەکان دەژمێردرێت و ڕەنگە کەم کەس مەتڵەکەی هەڵێنابێ. من لە خۆم گوماناویم بەڵام بەڕێك دەهاوێمە مزگەوت بەو هێندە مەعنایەی کە بۆی چووم.

شەوی ئەو بەیتە دوو مەعنا دەبەخشێت و لە ئاکامدا تێکیش دەکەنەوە. یەکیان ئەوەیە کە شەوی بەزمی دیوەخانەی ئەمیناغا وەك شەوی قدر (لیلة القدر) کەسێك تێیدا بێ تا سبەینە، تاریکایی لە ژیانیدا دەبێتە عەنقا کە هەر ناوی هەیە و ناوکی نییە. مەشوورە دوعای شەوی قەدر قبووڵن ئیتر ژیانی ئەو کەسە دەبێتە بەختیاری و ئاهەنگ کە خەو تێیدا دەبێتە دەرگەوان، دەرگەوانیش وەك دەزانین لە دەرەوەی خانە دادەنیشێ.

ئەوی دیکەیان قاوەکەی تێ دەخوێنێتەوە کە شەوی پێ تەشبیه کرابوو، واتە.

هەر کەسێکی قاوە لە فنجانی مەجلیسی ئەمیناغا بخواتەوە هەتا ڕەشایی قاوەکە سیایی فنجانەکە بەر دەدات وەك کە ڕەشایی شەو بەسەر چوو دنیا ڕوون دەبێت، تا ئەو کەسە شەوی ڕەش لە عومری وەکو عەنقای لێ دێت... خولاسە خۆشییەکی بۆ دەبێ وەك لە شەونخوونی شەوی قەدر دەست دەکەوێت. تەشبیهی فنجان بەدنیا لەم مەعنایەدا لەوەوە دێت، کە قاوەمان دانا بەشەو فنجانیش دەبێتە دنیا چونکە شەوەکەی لە خۆیدا گرتووە، قاوەکەش ناو فنجانەکەی پڕ کردووە وەك کە شەو دنیا دادەگرێت.

غەزەلێکی چوار بەیتیی حاجی هەیە زۆر ئاوکێشە و گەلێك شەنگە و یەکجار وەستایانەش داڕێژراوە، وا بۆتی دەنووسمەوە:

لە ئەزاکەت کەمەری وەك خەتی ئەصلی حیکمە

لە ئەبووندا دەهەنی بێ قسە عەینی عەدەمە

چین پەکێکە لە کەچی زولفی کەچی عاجزە بۆ؟
دڵی سەودایی خەتای کردووە بۆیە تەمەمە
ماچی ئەو غونچە دەمە بێ (حەق)ی جان (مهر)ی دەمە
ساڵێکی راهی عەدەم بێ دەمی ئەطلشی قەدەمە
گەر رەمزا بێ چیبە بۆ ماچی دەمی جانی عەزیز
تەجرویەم کردووە عیشرەت بەدەمە ئەك بە دەمە

شاعیرانی ڕۆژهەڵاتی موسڵمان مەبەستیانە بڵێن کەمەر و دەمی یار لە باریکی و بچووکیدا دەگەنە سنووری نەبوون. ئینجا خەتێکی ئەهلی حیکمەت بیکێشێ دەبێ یەکجار باریك و ڕاستیش بێ وەك کەمەری یار.

دەمێ، واتە زاری، لە نەبووندا، بێ موناقەشە عەدەم خۆیەتی.

(بێ قسە) ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەگەر یار قسە نەکات زارەکە وەك عەدەم دەبێ. (عەینی عەدەم) لە واتایەکیدا (پیتی عەین) کە وا لە سەرەتای وشەی (عدم)دایە، زاری عەینەکە لە شکڵدا وەك دەم، زار دەنوێنێ بەڵام چونکە هی عەدەمە هەر دەبێتەوە نەبوون.

چین کە وڵاتی چینە پێچێکە لە کەچی زولفی چین چینی، کەچی یار عاجز و نارەزایە. چونکە بەدڵ سەودای خەتای کردووە. خەتا وڵاتێکە مەشوورە بەمیسکی بۆنخۆش کە مناسبی زولفەکەیە لەبەر بێن و ڕەشاییش. وشەی خەتا بەواتای (هەڵە)ش دێت، ئیتر سەودا و مامڵەتەکەی کە چینی خستۆتە کەچی زولفی هەڵەیە و یار لێی پەشیمانە. وشەی (ندم- نەدەم) جگە لە پەشیمانی (نە- دەم، بێ دەم)یش ڕادەگەیەنێ کە برێتییە لە زێدە بچووکیی دەمی یار، وە یا قسەنەکردنی. مرۆ کە عاجز بوو قسەش ناکات.

لە بەیتی سێیەمدا (حق) لە شێوە نووسینی کۆن بە(حوق، حەق)یش دەخوێنرایەوە. (حوق) بەواتای قتووی مجەوهەرات دێت. (حەق) نرخ و کرێیە.

وشەی (مەهر)یش هەم بە(موهر، مۆر، خەتم) هەم بە(مەهر- مارەیی) دەخوێندرایەوە ئەگەر لە (حق)دا واتای (حوق) مەبەست بێ (مهر) دەبێتە (مۆر، خەت)، ماچی ئەو غونچە دەمە ئەگەر لە نێو قتووی جاندا نەبێ کە هیچ دەمێکی ناگاتێ، دەبێتە مۆرێکی سووری وەك خوێن بەسەر لێوی عاشقەوە چونکە غونچە خۆی وەك خوێن سوورە. وە یاخود دەبێتە مۆرێکی کە عاشق لە خوێنی خۆی هەڵکێشابێ.

ئەگەر (حق) کرێ و نرخ بێ ئەوە دەگەیەنێ کە ماچی غونچە لێوەکە جگە لە نرخی جان خوێنی عاشقیشی دەوێ بەمارەیی. خوێنەکە چونکە مناسبی ڕەنگی غونچەیە لە هەموو باراندا بەردەوامە.

بۆیە لە میسرەعی دووەمدا دەبینین شاعیر دەڵێ: کەسێکی ڕێگەی عەدەم، نەبوون (کە زاری یارە) بگرێت شوێنپێی لە خوێنی خۆی نەقش بەستوو دەبێت چونکە لە نەبوون و عەدەمدا خوێن بەناچاری دەڕژێت.

مەوسکینە بشڵێین: بێ دەمی، نەقشی قەدەمی ساڵێکی ڕاهی عەدەمە. ئەم شکڵە یەکجارەکی ماندووم دەکا هەتا لە شەرحی دەبمەوە:

بێ دەمی= بێ زاری، بێ وەختی، بێ خوێنی.

بێ دەمییەك بەهەر کامێك لەو سێ واتایەی ببەخشێت شەرحێکی سەربەخۆی دەوێت. سەرێشەکە بۆ خۆت بەجێ دەهێڵم و دوو دانە ئەسپرینیش... سەیرێکی لاپەڕە ١١١ بکە لەو کتێبە یاسکراوەی دیوانی حاجی غەزەلێکی حەفت بەیتی دەبینیت نموونەی زێدە پاراوی و مەتانەتی شیعری تەقلیدیی کوردین.

قافیەکانی لەوانەن زرنگەدار ناو بنرێن، لە هیچیشیاندا کەم و کەسری نییە. لە ڕواڵەتدا هەر بەیتە سەربەخۆ خەریکی مەبەستێکی تایبەتییە بەڵام بەیتی شەشەمی غەزەلەکە تێمان دەگەیەنێ سکاڵا لەگەڵ کێیە:

ئەو ئەوڕەسەی ئەیچارەیی مسکینەکان دەکا
حەجاجە گەرچی سەیدە بەم خورج و هەستەوە

دیارە لاوێکی شلکی خاوەن قەباڵەی حکوومەتی و سەیدیش بووە

چەژی بەیتەکان ئام و شامی وڵاتی خۆمانیان تێدایە بەڵام بەیتی یەکەمی، لە ڕواڵەت، بۆ دەمی پیری دەچێتەوە کە دەڵێ:

دالی قەدم کە ئەلفی عەسای گرت پەیوەستەوە
تیر و کەمانە سەیدی جەوانیم ئەبەستەوە

قەد بوو بەدال و وەك کەمانی لێ هات عەساشی پەیوەستەوە گرت، لە پیری بەولاوەی لێ نافامرێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا بۆزە نیحتیمالێك هەر دەمێنێ کە مەبەستی حاجی داهاتنەوەی خەفەت و کەسەر بێت نەك پیری، بەیتیش هەن لە غەزەلەکەدا بێنی

هەڵبەی لێ بێت وەك بەیتی چوارەم و پێنجەم

بۆ قەسری وەسفی ئەو مەهە میعماری فیکرەتم
وەستاوە کوللی لەحزە بەخۆی و کەرەستەوە
قوربان ڕەقیبی سەگ سەر و چاوی شکاندووم
چۆن بتگەمێ بەپێی شەل و دەستی شکستەوە

قسەی خۆمان بێ، وا نەزانم حاجی لە جیاتی (وەستاوە) گوتوویەتی (وەستایە) لەسەر لەهجەی کۆیی و بەری سۆران، دواتر نوسخەنووسان گۆڕیویانەتەوە چونکە (وەستایە) لەگەڵ (مەعمار)دا ڕێك دێت جگە لەوەی کە (وەستاوە)ش ڕادەگەیەنێت. قسەیەکی کورتم هەیە لەگەڵ قەسیدە مەدحەکەی (شەمسیەی شاهەنشەهی ئەرز) کە لە لاپەرە ١٠٨ و ١٠٩ی کتێبە باسکراوەکەدا نووسراوە:

لە پەراوێزی ژمارە (١)دا هاتووە کە دەقی قەسیدەکە لە بەشی دووەمی کتێبی (حاجی قادری کۆیی) وەرگیراوە. من لە لاپەڕە ٢٨٣ هەتا کۆتایی لاپەرە ٢٤٨ بەو قەسیدەوە خەریك بووم. وەك لەوێشدا نووسراوە قەسیدەکەم دایە خوا لێخۆشبووی مامۆستا هێمن کە بەپێی بۆچوونی خۆی بەیتەکانی بهاوێتەوە سەریەك. من ئەوەندەمیش و ئێستاش لەو باوەڕەدام کە بەیتی کۆتایی ئەو ڕیزکردنە دەبوو ببێتە بەیتی هەشتەمی قەسیدەکە. قافیەی بەیتی حەفتەمی قەسیدەکەش کە (لوغز)ە من بە(لەغەز)ی دەزانم.

کوردەواری هەر گوتوویەتی (لەغەز)، لەم بەیتەدا لەبەر کێش و قافیە کراوەتە (لەغز). وەها پێ دەچێ حاجی قادریش لەو سەردەمەدا هەر بە(لەغەز)ی زانیبێ چونکە چەندی مەلای لێم بیستبێ ئەم وشەیەی گوتبێت هەر (لەغەز)ی بەکار هێناوە وشەکە خۆیشی بابەتی ناو مەلا و فەقێیانە.

پێویست نابینم گوتارەکە درێژ بکەمەوە بەهێنانەوەی نموونەی دیکە بۆ بەئیسپات گەیاندنی شاعیریەتیی حاجی، لەمبارەوە هەر ئەوەندە دەڵێم حاجی قادر یەکێکە لە سێ شاعیری کورد کە بەیتی سەرکەش و داهراویان وەهایە هەموو مەهارەت و شارەزایی بەتەقالەی شیعر و زانستەکانی مزگەوت و تەسەوفیان پێویست بێ، وێڕای زیهنێکی مووقڵاش. دووەکەی دیکە (نالی و مەحوی)ن کە هەریەك لەوان شەقڵ و شێوازی خۆی هەیە. ئەم قسەیەم شێخی خانی و مەلای جزیری ناگرێتەوە چونکە لەبەر کەم شارەزاییم لە زاری کرمانجیی سەروو ڕێ بەخۆم نادەم بڕیاریان لەبارەوە

بەڵام هەرچەند لە خوێندنەوەیان لەزەتێکی زۆر وەردەگرم.

حاجی قادر دوو کاریگەر سنووریان لە دەوری شاعیریەتیی کێشا

یەکیان لە سەرەتای ژیان و شاعیریەتیدا ئەوە بوو کە دووچاری عیشقی ئاگرین نەبوو بەوەشدا مەیدانە هەرە بەرین و مەوداداراەکەی شیعری رۆژهەڵات کە غەزەلە لێی ئەسك بووە تا ئەوەی مەزرایەکی مەیدانەکە بوو بەهی شیعری سەر بەمایە دەرسی مزگەوت، لە غەزەلیشدا حاجی بوو بەنازم. سەیرێکی دیوانەکەی بکەیت لە زۆر بەیتدا تووشی شێوەی کوڕی جوان دەبیت وەك کە دەڵێ:

تا لە مەکتەب ئەو مەهەم دی مەشقی ئەلف و بێ دەکا
چـاوەکـەم بـۆتـە دوێت و گـریـە سورخـی تـێ دەکـا

وە یاخود دەڵێ:

خەتی، دەوری روخی داوە وەکو مووری سولەیمانی

خەت مووی ریشیەتی.

دیسان دەڵێ:

چونکە نرخی ماچی تۆی گۆڕی هەموو دەستە و دوعان
خـەتـی تـەوخـەزت وەکو زولـفـت خـودا پـیری نـەکـا

خـەتـی تـازە دەرچـووی ریشـیەتـی. نـرخـی مـاچـی گـۆڕیوە بـەلای کـەمبوونـەوەدا، هەروەها:

با وجوودی نەوجەوانی، خەتی سەوزی دەرکەوێ
عەهد و پەیمانی نەبوو موو، بۆیە پشتی پێ ئەبەست

دیسان:

ئەمیش جاران نییە قوربان توغەیلی یێمە سەر هوانت
خـەتـت مـیـهـانـیـیـە ئـەمـساڵ ئـەمـاوە لـەزەتی یـارم

واتە: ئەمساڵ موو بۆتە میوانی رووی یار...

دیسان:

یەرچەم و فیسی کەچی تۆ ئەی جەوان
تـاجـی کـەیـان و عـەلـەمـی کـاویـان

نموونەی دیکەش زۆرن، یەک لەوان (ئەو ئەورەسەی ئیجازە ) بوو کە پێشتر لە نموونەدا هات.

نەبوونی عیشقی سووتێنەر وەهای کردووە کە شیعرێکی بۆ منیهێنەشی هەڵبەستبێ لە پەراوێزی دەستوورانی شاعیری و نوکتەبازییەوە تەمای تێ دەکات... من ئەم لایەنەی نەبوونی عیشقی ئاگرین لە تەجرەبەی حاجیدا بەدرێژی لێی دواوم لە بەشێکی ئەو سێ بەرگەی (حاجی قادری کۆیی) لزووم نابینم لێرەدا چی دیکەی لەسەر بڕۆم.

کاریگەریی دووەم ئەوە بوو کە لە پاش ئاوارەبوونی کەوتە سەر خوولیای کوردایەتی و خەریکبوون بەهۆشیارکردنەوەی نووستووان، بەمەشدا دوو ئەنجام هاتنە دی، یەکیان ئەوە بوو، ئاگرێکی لە عیشق هەڵنەبوو لە کوردایەتی بڵێسەی سەند. دووەمیان ئەوە بوو کە پەرۆشی چارەنووسی هەرمشە لێکراوی کورد حاجی قادری خستە جانبازییەک کە زۆر گوێ نەداتە خەریکبوون بەئارایشتی بەیتەکانی. بگرە هەر ئەم هۆیەش بوو وای کرد زۆر لەو بابەتە شیعرەی کوردپەرستی بەقاڵبی (جووت سەروا) داڕێژێت.

لێرەدا قەڵەم رادەگرم، چی پێشکەش کرا، لەم هەڵوەستەدا، بایی مەبەست دەکات، زۆریشی بەداخەوەم نە لە بیرم ماوە ئەو گوتارەی خستمیە سەر نووسینی لە چ گۆڤارێک بڵاو کرایەوە، نەبەتەواویش گوتارەکەم بۆ خوێندرایەوە ئەگەرا شمەوە بۆ سەرەتاکەی تا بزانم نووسەر کێیە، گۆڤارم لێک کردەوە وەک کتێبگرەوە، ئەو شوێنە کرایەوە کە ئاسمان و ڕێسمانەکەی تێدا چەسپ بوو.

گەلێ قسەم لە دڵا بوو حیکایەتم مابوو
کەچی گرێی دڵی پەستم مەجالی بەستی نەدا

بەیان، ژمارە ۱٤۲، ۱۹۸۸

## دەستبژاریک لە کتێبی ئەنجوومەنی ئەدیبان

ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی سەرەتای ساڵی نوێی ١٩٩٣ز. لە دیدەنییەکی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق چەند دانەیەکم لە چاپکراوی هەمەچەشنەی کوردی لەو بەڕێزانە پێ گەیشت. بە دڵخۆشییەوە چاوێکی خێرام بەچەند بابەتێکی ئەو چاپکراوانەدا گێڕا و بووشن بەسەرنج بۆ هەڵەسەنگاندن کە بە عادەت بەرەو ڕەخنە و ڕاستکردنەوە و لێ بەسەر گرتنەوەدا دەڕۆن. وەک لە خۆوە دیارە هەڵەسەنگاندن چەندێکی جۆرنەتێشی تێدا بێت. پاکانە بۆ خۆی دەکات کە بە نیازی خزمەتی ڕۆشنبیرییەوە تەرازووی هەڵبرییێت. دوودڵییەکی بێ هێز شەبەنگی دا و ڕەوییەوە لە ئاست تیشکی ئەمەکداری بۆ ڕاستی و دروستی کە بەبەرزکردنەوەی فتیلەی چرا پتر پرشنگ دەداتەوە.

لە پێشەوە دەستم بۆ (ئەنجوومەنی ئەدیبان)ی ئەمین فەیزی بەگ برد کە بەچاودێریی لیژنەی وێژە و کەلەپووری کوردی، لە ساڵی ١٩٨٢ز. بەچاپ گەیشتووە.

بەر لە هەموو شتێک چووم بۆ لیستەی هەڵە و ڕاست لە کۆتاییی کتێبەکەدا ئەوەک من شتێک بەهەڵە بزانم کەچی خلیسکی چاپ بێت. هەر چارە ئەوەی بە ڕاست دانرابوو لەو لیستەیەدا هەڵەم بێ چارە دەکرد لە شوێنی خۆیدا. کە ویستم هەڵەی دێڕی ١٦ لە لاپەڕە ١٣دا بەو جۆرە چارە بکەم کە لە لیستەی هەڵەکاندا کراوە، دیتم چی لەو لاپەڕەیە و دێڕەدا بە هەڵە دانراوە هیچ هەڵەی تێدا نییە: وشەی (بەدانش) ڕاڤە کراوە (بە زانست، بە ژیری).

لە لاپەڕە ٦٣، دێڕی ٦دا وشەی (وەزنی) ڕاست کراوەتەوە بە (وەزن) کەچی (وەزنی) لە هەموو ڕووییەکەوە بێ عەیبە. دەبوو (یەک بۆ سەد) لەو دێڕەدا بە (یەک بۆ سەوو) ڕاست بکرێتەوە لەبەر خاتری کێشی بەیتەکە. بەر لەمانە دەبوو لە نیوە دێڕی دووەمی بەیتی دووەمدا وشەی (نیشتەرە) نیشارەتی لێ بدرێت کە بە چوار برگەیی و بەقورسکردنی دەنگی (ش) تێیدا بخوێندرێتەوە دەنا بەیتەکە لەنگ دەبێت (نی ش تە رە) لە پەراوێزدا بەیتی کۆتاییی قەسیدەکەی لاپەڕە ٦٣ کە نووسراوە:

وەختی خەندە و نیگەهە و عیشوە و ناز

وا چاکتر بوو بنووسرێ (عیشوەوو) چونکە سەرلەبەری بەیتەکان ١١ برگەیین

نەبوو ئەمەیشیان هەروەها بێت بەتایبەتی لەبەر خاتری مۆسیقای ناو بەیتەکە بەهەرمکە ۱۰ برگەیی هەڵنەگرێت.

بەیتی سێهەمی پەراوێزەکە نیوە دێری یەکەمی نووسراوە:

وەسڵی ئەکسیرە وطیّ زەحمەتە لەلایەکەوە کێشی لەنگە، برگەیەکی کەمە بۆتە دە برگەیی واتاش نیوەچڵە بۆ شیعر. لە خۆمەوە ڕێم نییە وشەیەکی لەبار پەیدا بکەم ئەگا ئەوە ئەبێ سالم گوتوومتی، ئەبوو لیژنە ئەم لاپەنەی ساغ بکردایەتەوە یان پەنجەی بۆ ناتەواویی نیو دێرەکە ڕاکێشابایە. وشەی (ئەکسیر)یش وەک بزانم ئەبێ (ئیکسیر) بنووسرێت.

لە لاپەرە ٦٤، لیژنە ئەختێك پەراوێزی مافی مامۆستایی خۆی فرەوانتر کردووە لەوەی ڕەوایە کە لە خوێنەر ئەگەیەنێ ئەبێ دیوانی نالی، لە ڕاڤەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم و فاتیح سەیر بکرێت بۆ چەندوچۆنی واتای بەیتەکانی نالی. بێگومان ئەو شەرحە کارێکی گرانبەهایە و یەکەم هەوڵی سەرلەبەرە بۆ تێگەیشتنی نالی، بەڵام بێگومان ئەو بێ کەلەبەرە نییە کە ڕێی (نالیناسی) حەرام بکات لە بابایەکی بیەوێت بوارێکی دیکە پەسند بکات، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ شەرحەرانی ئەو دیوانە پڕ بە دەم دەریان بڕیوە کە کارێکی کردوویانە ناتەواوە و بگرە سەرەتایە. لە زۆر شوێنیشدا دیارە ئەو واتایەی بە بەیتەکان دراوە چاوپۆشی لە کەموکەسری و نەگونجانی کراوە بەنیسبەت خۆمەوە ئاگام لە هەموو سەروبەرێکی بەوطەبوونی ئەو شەرحە هەیە و بارەها و جارەهاش پرسم پێ کراوە لە واتا لێدانەوەی شیعرەکان:

هەوڵ جار شەرحێکی کەم قەوارە و سادە هات بۆ ئەنجوومەنی کۆڕی زانیاری کورد کە من ئەندامی کارا و تەرخان و نائیبی سەرۆکیش بووم. مەرحووم فاتیح، داخی بە جەرگم، چەند جاران بۆ لێپرسینەوە دەهاتە کۆڕ و بەزۆریش لای من دەمایەوە. من بێ دوودڵی تێم گەیاند کە شەرحەکە سادە و بێ کیفایەتە و بەو شەرحە ناناسرێت: لە نموونەدا شەرحی چەند بەیتێکم بۆ کرد کە خۆم لە واتایان گەیشتبووم، یەك لەوان ئەمە بوو:

خاو و بێ خاوی دوو زوڵفی خاوم ئەز
چاوەچاوی یەك غەزالە چاوم ئەز

گوتم: سەیرکە لە نیوە دێری یەکەمدا (خاو) و (بێ خاو) دێنێت حاڵی خۆی بێ شەرح

ئەدات بەرانبەر (دوو) زوڵفی خاو. بە لێك ڕژتین (تناظر) هەریەك لە وشەكان ڕوو لە زوڵفێك دەكەن وە یا هەر زوڵفە وەسفێكی بێ دەبرێت. لە ئەوە دێڕی دووەمدا (چاوەچاو)ی هێناوە بەواتای (ترقب) لە لەفزدا دووە لە واتادا یەكە. كەچی (یەك غەزالە چاو) بە ژمارە یەكە لە واتادا (دوو) چاو ڕادەگەیەنێ چونكە مامز دوو چاوی هەیە. بەم پێیە (دوو بەیەك) و (یەك بەدوو) سەرلەنوێ (تناظر) پەیدا دەكەنەوە و لەنگەری ناوەرۆكی شیعرەكە ڕادەگرن.

مەرحووم فاتیح بە تەواوی متمانەی هات كە دەبێ هەوڵێكی زلتر بدرێت بۆ تەواوكردن و قووڵتربوونەوە لە شەرحی دیوانەكە. وا بوو ئەو شەرحە كورتیلەیەی وەرگرتەوە، كەوتە سەر ئەم شەرحەی وا لە بەردەستیدایە، لەوێشدا كاكە محەمەد كە ئەوسا خۆی كاركوزارێكی كۆڕ بوو بەگەڵ باوك و برا كەوت و فەرهادانە تێدا سەرگەرم بوو. وەك لە بیرمە شەرحە كورتیلەكە لە ۱۹۷۳یان ۱۹۷٤ هەرایە بەر نیگای ئەنجوومەنی كۆڕەوە، ئەم شەرحەیان هەتا ساڵی ۱۹۷٦ی خایاند... مەرحووم فاتیحیش لە لاپەرە (٦)ی كتێبەكەدا ئەم لایەنەی بە كورتی باس كردووە كە دەڵێ ( پاش ئەوەی چەند جارێك چوومە- لای فلان و بەركوڵێكی بەردڵگرم سەبارەت بە (نالی) و هەست و چەشنی (نالی) لا كرد...) لە نموونەی بەسەرگرتنەوەی كەلەبەر لەو شەرحە بەهادارەی مامۆستا و كوڕانی بەیتێكی موناجاتەكەی ڕێی حەج لە نالی و شەرحەكەی دەخوازمەوە كە دەڵێ:

لە سەر جێ كلكی ئوشتر گەییە ئەرزی مەعلەكە، هێشتا
بەمی فەجی عەمیقی نالی هەر بێ قەعر و پایانە

لە شەرحیدا وشەی (نال) نووسراوە و هەر بەواتای ڕەنگی ئال لێك دراوەتەوە هەرچەند خۆی لە واتای پاتەوپاتی وشەكە دزیوەتەوە و بەرستەی (هێشتا دەریای شینی ڕێگای دووری....) ڕەنگی نالی بە (شین) گۆڕیوە كە دەزانین لە بەیتەكەدا ئەم ڕەنگە هیچ ناوی لە ناودا نییە. ڕاستی (نال، آل) بەواتای (سەراب) دێت، سەرابیش دەشوبهێنە (یەم، بەحر) چونكە وەك ناو دەردەكەوێت. لە كوردەواریدا كە دەڵێن كلكی وشتر گەیشتە ئەرز مەبەستیان مردنیەتی لەو ڕووەوە گۆیا هەتا نەمرێت كلكی بە زەوی ناگەوێت چونكە كە یەخ دەبێت بەسەر ئەژنۆكانیەوە هەڵدەترووشكێ و پاڵ نادات‌ەوە وەكو وڵاغی دیكە...

لە لیستەی هەڵەکاندا نیشارەت بۆ لاپەڕە ١١٧کراوە کە سەهوێکی تێدایە و ڕاستی کردۆتەوە. بەڵام لە هەمان لاپەڕەدا و لە نیوە دێڕی پێش ئەو سەهوەدا سەهوێکی وەك ئەو هەیە بە زەقی ماوەتەوە. لەو لاپەڕەیەدا بەیتی چوارەمی قەسیدەکەی شێخ ڕەزا بەمەردوو هەڵەیەوە وەها نووسراوە:

طەبعی جەواد و کەریمی هەر وەکو قانانی دەڵێ
زەرەمەی بە قنطار هەمی بەخشەد و نوشتر بە قیطار

هەڵەی نیوە دێڕی دووەمی بەیتەکە کە لە لیستەی هەڵەکاندا نیشارەتی بۆ کراوە ئەو وشەیەی (هەمی) یەکەمە و دەبێ بسڕێتەوە. بەڵام لە نیوە دێڕی یەکەمدا وشەی (هەر) زیادە و شیعرەکەی لەنگ کردووە. ئەگەر (هەر) بمێنێتەوە دەبێ لە جیاتی (کەریمی) بنووسرێت (کەریم) ئنجا (جەواد)یش دەکرێتە (جەرواد) لەبەر خاتری کێش:

طەبعی جەرواد و کەریم: هەروەکو قانانی دەڵێ
طەبعی جەواد و کەریمی وەکو قانانی دەڵێ

لە نیوە دێڕی دووەمی پاش ئەم بەیتە لەتکێیەکی زەق هەیە، نووسراوە:

میثلی بەحرێکە نە ساحلی بێت و نە کنار

ئەم دەقە یەك برگەی کەمە، ڕەنگە بەم جۆرە چارەسەر بکرێت:

میثلی بەحرێکە نە هیچ ساحیلی بێت و نە کنار

لە بەرانبەر ئەم دێرە شیعرانەدا، لە لاپەڕە ١١٦، ئەم نیو دێرە شیعرەی ئاهی:

دەبێ ئاهی لە جەژنی وەسڵی دلبەردا بەقوربان

یەك برگەی کەمە، پێویستە (قوربانی) بێت لە جیاتی (قوربان) هەم لەبەر کێشی شیعر و هەم لەبەر خاتری واتاکەی کە یەکی لەسەر (ی) ئیزافە کەوتووە.

دەچمەوە بۆ لاپەڕە ٧٩ کە لە لیستەی هەڵەکاندا نیشارەت بۆ هەڵە لە نووسینی بەیتێکی (حافظ) کراوە کەوا لە جیاتی (ألا یا أیها) نووسراوە (ألا أیها). دەبوو لیژنە هەڵەیەکی گەورەتر چارەسەر بکات کە بەکۆتاییی غەزەلەکەوە نووساوە و لە جیاتی (امملها) هاتووە (أمهلها)ی پەسند کردووە کەچی لە پەراوێزدا (أمهلها)ی بە (بیخەرە لاوە) ڕاڤە کردووە کە (أمملها) دەبەخشێت. لە جلدی (٢٣، ٢٤)ی گۆڤاری دەستەی کورد ساڵی ١٩٩٢، لە ناو توێژی گوتارەکەی د. ئەمین موتابچیدا ئەم بەیتە بە

(أعملها) كۆتاییی هاتووە لە دیوانە چاپکراوەکانی حافزیشدا هەروەها نووسراوە.

لیستەکە دەمانتنێرێتەوە بۆ لاپەڕە (٨١)ی ئەنجوومەنی ئەدیبان کە وشەی (کڕ) بگۆڕین بە (کز). سەرخواردنەوەیەك لەو لاپەڕەیە چەند هەڵەمان دێنێتە بەرچاو.

وشەی (طورەی) لە یەکەم بەیتی غەزەلەکە دەبێ (طوڕەیی) بێت دەنا کێشی تێك دەچێت، وشەکە خۆیشی (طُرَّه- طوره)یە.

لە پەراوێزدا، دێڕی حەفتەم، وشەی (بیداء) دەکرێتە (بیدار) بەواتای (بەهەیەر، ئاگادار) ئەدیبەکانمان لەم وشەیە و چەند وشەی دیکەشدا کە فارسین هەڵە دەکەن. بەیتێکی حاجی قادر لە مەدحی کردگاردا دەڵێ:

ئەی بێ ئەزیر و هەمتا هەر تۆی کە بەرقەراری

بــێ دار و بــێ دیــاری بــیــدار و پــایــەداری

هەمیشە ئەم (بیدار)ەی دەکەنە (بێدار) وشەی (هەزار) بەواتای بولبول (هوزار) دەنووسن. بەیتی نالی کە دەڵێ:

ڕوخی تۆ گوڵێکە سەد بەرگ و هەزاری عاشق ئەما

لــە هــەمـوو چەمەن دیـارە بـە نوسولّـی نـاڵـە نـالی

جوانییەکەی لەوەدایە کە وشەی (هەزار) هەم بەواتای بولبول و هەم ژمارەی هەزار هاتووە نیتر لە قەتاربوونی ( یەك گوڵ – گوڵێك) و (سەد بەرگ – بەواتای شەستپەڕ) و (هەزار عاشق) سێ پلەی تاك و سەد و هەزاری ژمارەی ڕیز کردووە سەرەڕای واتا گشتییە نازدارەکەی بەیتەکە. لە شەرحەکەی مامۆستای مودەڕیس ئەم بەیتە بەم شکڵە نووسراوە:

ڕوخی تۆ گوڵێکە سەد وەك هوزاری عاشق، ئەما

لە هەموو چەمەن دیارە... هتد

ئاشکرایە کە (سەد وەك) لە جیاتی (سەد بەرگ) نادروستە لە زۆر ڕووەوە، کە یەك لەوان ئەوەیە ئەم نیوە دێڕە تەنها خۆی لە هەموو قەسیدەکەدا دەبێتە ١٥ بڕگە ئەوانی دیکە سەر لە بەریان بڕگەیین و یەك نەفەس و گردن.

وشەیێکی دیکەش لەوانەی بە هەڵەیی لەکار دێن وشەی (نما-ئەما)یە کە کوردەکە دەیکاتە (نوما) و دەڵێن (قیبلە نوما- جیهان نوما) لە جیاتی قیبلە ئەما و جیهان ئەما.

لە موناسەدا دەڵێم لە ڕۆشنبیران تەدەوەشایەوە سێ وشەی (ڕاناو، فرمان، زانکۆ) بە واتای (ضمیر، فعل، جامعە) بەکار بهێنن. لەلایەن (ڕاناو)ەوە ئەم پێشگرەی (ڕا) سەر بە فیعلە نەك ناو نیتر کە ئەمە دروست بێت دەبێ (ڕاماست، ڕاخوری...) و گەلێکی دیکەش پەیدا بن و دەڵێین (ڕاماست) بەواتای (یەنیر)ە و (ڕاخوری)ش لبادە.

فرمان هەمان وشەی (فەرمان)ە بەواتای (أمر). لە گوتەی خەڵقی نەخوێندوو دەبیەیت دەڵێن: فرمانی خۆم جێبەجێ کرد، بەواتای ئەوەی کە بڵێ: ئەوی فەرمان بوو بەسەرمەوە جێبەجێم کرد. هەڵبەت ئەمە بەکارهێنانێکی ڕەمەکی وەك ئەوەی کە بەر لە جەنگی دووەم خەڵقی دەزیبیاتی و دەوروبەری کەرکووك دەیان گوت: زەویەکانم (لابن) کرد، مەبەستیشی ئەسویە بو کە بەینێك کۆلۆنێل (لابن) سەرۆکایەتیی ئەسویەی بەدەستەوە بوو. ئەم فەرمانە ڕەمەکییەش لەلایەن خوێندەواری شارستانەوە فەلسەفەییەکی کاڵ و کرچی تێدا بەکار هات لەوەدا کە (فرمان)ی بە (عمل) لێك دایەوە ئیتر توند دەستی لێ گیر کرد و لە جیاتی (فعل)ی ڕێزمانی عەرەبی بەکاری هێنا، گۆیا (عمل وفعل) یەك شتن. (زانکۆ) دارشتنێکی تێدا بەکار هاتووە پشت لە هەموو دەستورانی کوردییە. من ئەوەی لێ بە عەیب ناگرم کە بە ڕێکەوت (زان) لەگەڵ (ولادة) یەك دەگرنەوە و دەشیا لەم بوارەوە زانکۆ بەجێگەی (منداڵ لێبوون) بڕوات. بەڵام لە دەست مندا نییە کە (زان) کورتکراوەی (زانین) بێ بەناچاری دەبێتە کەرتی ناوی کارای وەکو (زۆرزان، کەمزان، لێزان). لەمەوە هەرگیز ناشێ بچێتە بەرایی وشەوە دەنا دەبێتە (زان) بەواتای منداڵبوون مەگەر بڵێی (زانینگە) وەك کە دەڵێی ئیستگە جۆگە ئەوساش نابێتە (جامعە). ئێمە ئەگەر لە (گەلەفەرمان، گەلەکۆیی)یەوە بۆ زاراوەکە بچین وەك کە لە (کۆمەڵ...)دا بە ڕواڵەتیش بێ ئەو (کۆ)یە لە وشەکەدا هەیە، دیسانەوە بە چاوپۆشی دەبێ زاراوەکە لە چەژدا شیرن نایەت: کۆزانست، کۆزانین، کۆ!بە هەمە حاڵ ئەم بیرگێڕییە زیانێکی تێدا شك نابەم هەرچەند پێوەندیی یەکسەری بە (بێدار)ەوە نییە. دوای (بێدار) لە نیوە دێری یەکەمی بەیتی دووەمدا وشەی (طوره) وەك پێشتر باسی لێ دەکرا دەبێ (طوڕڕە) بێت ئیتر لە هەر شوێنێکی دیکەش هەبێت دەبێ ڕاست بکرێتەوە.

لە بەیتی سێیەمی بەرامبەر (مەشاطە) دەکرێتە (مەششاطە) کە ئەمە ڕاستیی وشەکەیە و کێشی شیعریش وەها داوا دەکات. بەیتی چوارەم لە نیوە دێری یەکەمیدا وشەی (بەرزو) ئەواتای هەیە و ئەکێشی شیعریشی پێی هەڵدەگیرێت. ئنجا دەبێ بڵێین

بەیت دووەم و سێیەم و چوارەمی پەراوێزەکە واتایان دیار نییە ئەبێ لە نووسینەوەدا هەڵەیان تێ کەوتبێت. ئەمەش دەقەکەیانە بە ڕێنووسی ناو کتێبەکە:

سازشی طــورە وە ڕووبــدا بــە فــتــون
بــاری ڕاهـستــووە بــۆ دۆشەکــی یــار
بــەریــدا شانــە بــە دڵ دامــەنــی زوڵــف
شانــی مــەشاطــە جــودا بــێ بــە چــنــار
گــەر تــیــاسەکــەم بــە قــەدت قــەدی بــەرزو
هــەر وەکــو سەرووە مــوقــابــل بــە چــنــار

ئەم (قیاسکەم)ەش ئەبێ (قیاس کەم) بێت.

لە لیستەی هەڵەکانەوە دەچم بۆ کتێبەکە خۆی و چەند تێبینییەکی پێویست هەن ئەیخەمە بەر لیژنە و خوێنەرانەوە:

لە بەڵگەی ڕاستنەبوونی (قیاسکەم) شایەدێك دەهێنمەوە لە نووسینی لیژنە خۆیەوە، دێرە شیعرێك لە ناوەڕاستی لاپەڕە (٦)دا بەم جۆرە کۆتایی دێت (مەگەر خۆم کەم بە قوربانی).

لە سەرەتای دێری سێیەمی لاپەڕە (٧) نووسراوە (سێهەم)، لەوێشدا کێشەیەك هەیە بە کەس چارەسەر نەکراوە بۆچی ئەم دوو (ی)ە لە نووسیندا لێك دەترازێن، خۆ (ی) بە پیتی دوای خۆیەوە دەلکێت؛ ئاخۆ ئەگەر وشەکە (سێسەم) بووایە دەکرایە (سی سەم)؟ زۆر بەسەبری دەنووسرێ: ئەو پارەی پێمە پێمانە پێتە، پێتانە، پێ بەتی، پێ یانە! کە دەگەنە دراوسێیەتی دوو (ی) لێکیان جودا دەکەنەوە. من خۆیشم بە پێرەوی ڕێنووسی باو گەلێك جار گوێ نادەمە مەنتیقی نووسین کە نابێ مامڵەت جودایی تێدا بێت، بە زۆربەی ئەگەر (ی) نیزافە بە دووا وشەیەکی وەك (شووتی)دا هات دەنووسن (شووتیی قلیاسان) ئەگەر بە دووا کاڵەکیشدا هات دەنووسین (کاڵەکی قلیاسان). سەیرە لە کوێی! بگەڕێنەوە بۆ لاپەڕەی سەرەتای کتێبەکە دەبینی لە دێری سێیەمی (گەشەپێدان) کەچی لە دێری نۆیەمی نووسراوە (دەست پێ کردن). هیچ بەهانەیەك بە دەستەوە نییە (پێ کردن، پێدان) بەم شێوەیەی وەها ناجۆر بنووسرێن. بێگومان هەڵە و ناجۆری لە هەر کەسێك ر لایەنێکەوە بێت نادروستە بەلام دەستەی کوردی خۆی خاوەن بڕیارە لەسەر ڕێنووسی کوردی دەبوو ئەو پتر لە پەرۆشی چارەدێریی دەستوورەکانیدا بێت.

لەبەرەو کۆتایی لاپەڕە (٧) وشەی (بەرامبەر) نووسراوە، ئەم وشەیە دوو هاوڕێی دیکەی هەیە (سەرانسەر، دەوراندەور) خۆیشی (بەرانبەر)ە بەڵام لە دەربڕیندا بەپێی داخوازیی فۆنەتێك ئەو نوونە وەستاوە لە بەرایی دەنگی (ب)دا دەبێتە (م) وەك لە وشەکانی (هەنبان، عەنبار، چەنبۆڵە زەنبەرەك...)دا نوونەکان دەکرێنە (م). نەك هەر لە بەرایی (ب) بەڵکو لە بەرایی (پ)یش هەمان مامڵەت لەگەڵ (ن)دا دەکرێت بەڵام وشەی ئەوتۆیی دەگمەنن لە کوردیدا، یەکێیان وشەی (قەنپار)ە بە واتای گاز لێگرتن کە دەکرێتە (قەمپار) و کورت دەبێتەوە بۆ (قەپار). مەرحووم ماموستا زەبیحی (سەراسۆ)یشی بە هۆزمی ئەمانە دانا بەڵام بەوردبوونەوە قەناعەتی هێنا کە (سەراسۆ) ڕاستە نەك سەرانسۆ. بەرانبەر و هاوڕێکانیشی یەك کەرتی دووبارە دەبێتەوە.

(سەراسۆ) ئەوە دەگەیەنێ کە لە (سەر تاسۆ)وە تەماشای شتێك دەکرێت و بەسەح دەکرێتەوە. ئەم (بەسەح)ە ئەسڵەکەی (بەسەهـ)ە لە (سەهینەن)ی پەهلەوییەوە هاتووە بەواتای (نَقَدَ) بەڵام (هـ)کەی گۆڕاوە بە (ح) هۆیەکەشی ئەوەیە کوردی هەموو (هـ)ی کۆتایی وشە تێ دەبات، لێرەدا گۆڕیوەتی بە (ح) وەك کە (پەهـ) دەکرێتە (پەح). لە نموونەی قرتانی (هـ)ی کۆتاییی وشە: پەنا، شا، نەڵڵا، کۆتا... لاپەڕە (١٠٠٩)ی کتێبەکە هەڵوەستێکی گەرمەکە:

لە لاپەڕە (٩)وە هەتا لاپەڕە (١٧) نووسینێکی ماموستا رەفیق حیلمی لە کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)یەوە بە دەقی خۆی بۆ ئەم کتێبە ڕاگوێزراوە، بریتییە لە ناساندنی فەیزی بەگ بە خوێنەری کوردیی سەردەم. لێژنەی وێژە و کەلەپوور زۆر بە زانایی و ناسکییەوە لە ناست گوتەیەکی ماموستا حیلمی کە دەڵێ فەیزی بەگ (عەسکەرێکی عالم و ئەدیبێکی عەسکەر بوو)، لە پەراوێزدا ئەم دوو دێڕە شیعرەی (فەیضی بەگ)ی بەشایەد هێناوەتەوە:

کە جەیشی غەم هجومی کرد نیظامی عومری من تێکچو
نیـتـر مـومـکین نـیـیـە ئـاسایش حـاڵـی پـەرێشانم
بـینـای بورجی بەدەن ڕوخا بە گوللەی حادثان ئیمڕۆ
نــەمــا قــووەت لــە ئــەژنــۆمــا بــرا پشتم شکــا شانم

سەیر دەکەیت دوو بەیتەکە چەند پڕە بە کەرەستەی لەشکر.

چوارینەکەی شێخ ڕەزا لە هەمان پەراوێزدا دەنگی قسەیەکی دیکەی ماموستا

حیلمی دەداتەوە لەبارەی فەیزی بەگەوە کە دەڵێ: لە زەمانی حکوومەتی عوسمانی، کە مەنشا قوڵ ئاغاسی بوو، مودیری مەکتەبی عەسکەریی بەغدا بوو ئەمە دەقی چوارینەکەیە:

چ عجب گر بە وجود تو بنازد بغداد
ای وجود تو محیط دوجهان استعداد
گرو از مهرپرد ذره بدان ناچیزی
اگر از رأی منیر تو کند استمداد

دەنگدانەوەکە لەوەوە دێت کە (بنازد بغداد- بەغدا ناز بکات) وا ڕاەگەیەنێ لەو دەمەدا فەیزی بەگ نیشتەجێی بەغدا بووە. بەداخەوە لە ڕاڤەکردنی چوارینە فارسییەکەدا لیژنە دوچاری یەك دوو خلیسك بووە. دەبوو لە جیاتی (لێ وەشاوی) بەواتای (استعداد) بڵێ (لێوەشاوەیی) وەك کە دەڵێین (سادەیی، ئامادەیی) نەك (سادی، ئامادی). ئەگەر وشەکە (لێوەشاو) بووایە نەدەبوو بەڵام (لێوەشانەوە) وەك بەشێك لە فیعلی دیکەی کوردی ئەم پاشگرەی (ەوە)ی لێ بووەتە کەرتی بنەڕەتی. دەبینین نالی گوتوویەتی:

گەرمی و تەڕیی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە

نەیگوت (کوژاوە) چونکە (کوژانەوە) بنەڕەتە. لە شەرحی دوو میسرەعی دوایی چوارینەکە لیژنە دەڵێ: گەرمو لە خۆر دەهاتەوە (نەرە) بەو هیچ و پیچی وردیلەییە ئەگەر داوای یارمەتی لە بیروڕای تۆ بکات «یاخۆ ئەگەر لە مەزنترین بە شەوق (واتا خۆر) سوود وەربگرێ». جارێ لە پێشەوە دەبوو (نەرە) بە تەواوی خرابایە سەر ڕێنووسی کوردی و بکرێتە (نەبرە) دەنا ئەگەر (نەرە) بخوێندرێتەوە بەبێ گوشینی دەنگی (ڕ) ئەوسا وشەکە واتای نامێنێت و کێشی میسرەعەکەش لەنگ دەبێت. ئنجا نەدەبوو بڵێ «یاخود لە مەزنترین بە شەوق (واتا خۆر) سوود وەربگرێ» چونکە ناشێ نەبرە لە خۆر شەوق وەربگرێت و گەرمویشی لێ بهاتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەگەر نەبرە بە شەوقی خۆر گەرمو لە خۆر و ئەرز و ئاسمانیش بهاتەوە چ مەدحێکی فەیزی بەگ لەوەدا پەیدا نابێت...

لە لاپەڕە (١٠) لیژنە دوو سەرنجی هێناوەتەوە:

سەرنجی یەکەم ئەوەیە کە لە هەندێ سەرچاوەدا لە جیاتی میسرەعی چوارەمی

چوارینەکە نووسراوە (اگر ز تیر اعظم بکند استمداد). هەر سەرچاوەیەکی ئەمەی پەسند کردبێت لە ڕاستەڕێی دەستووراتی مەدحی لاداوە چونکە لە دەقەکەدا هیچ بەنگەیەکی وشەیی وەیا مەعنەوی پەیدا نییە کە مەبەست لە (تەیری ئەعظم) فەیزی بەگ بێت. لە فەیزێ بیگوتبایە لە (از تەیری عوظمات...) تەئویلێکی هەڵدەگرت کە مەبەس لە (تەیری عوظمای تۆ) هۆش و گۆش و بیروڕای مەدحکراو بێت.

والەزانم لیژنە ئەم دەقەی پەراوێزی لاپەڕە ١٠ی لە ئەژمردا بووە کە لە پەراوێزی لاپەڕە(٩)دا واتاکەی بە کوردی لێ داوەتەوە بەڵام ئیشارەتی بۆ ئەم لایەنە نەکردووە.

سەرنجی دووەم ئەوەیە کە دەڵێ: وا بەناوبانگە کە ئەم دوو هەڵبەستە دەربارەی (موفتی زەهاوی)یە.

وشەی (هەڵبەست) کە بەواتای (شیعر، نظم) دێت لەو سەرنجەدا دەچێتەوە بۆ دوو بەیتە کوردییەکە و چوارینە فارسییەکەی لاپەڕە (٩). دیارە مەبەسیش چوارینە فارسییەکەیە چونکە کوردییەکە خاوەنی دیاری هەیە مەعلوومە بۆچی داندراوە کە شەکوای حاڵە و مەدحی کەسی پێ نەکراوە هەرچی چوارینەکەیە مەدحە، ڕێی تێ دەچێ بۆ مەدحی موفتی زەهاوی داندرابێت، هەم لە بەرئەوەی کە لە بەغدا ژیاوە و هەم لەبەر دەلالەتی (محیط دوجهان استمداد) کە لە شان و عیلمی زەهاوی دەوەشێتەوە بەڵێ دەزانین شێخ ڕەزا هەجووی توندوتیژی موفتیی کردووە بەڵام دەشێ ئەم مەدحەی بەر لە هەجووەکان گوتبێت وەک کە لە مەدحدا گوتوویەتی:

موەکین نییە ئیدراکی حەقیقەت بە تەواوی

موەکین نییە ئیدراکی نەکا زیهنی زەهاوی

لەگەڵ ئەمەشدا، چەژی شیعرەکە لەگەڵ ئەو مەدحانەی بێگومان بۆ فەیزی بەگی داناون هێوێنی یەک سەرچاوەی مەدحکراون. بەهەمەحاڵ دەبوو لیژنە لە جیاتی (ئەم دوو هەڵبەستە) بڵێ (ئەم چوارینەیە، ئەم ڕوباعییە...) یان (ئەم دوو بەیتە فارسییە) هەتا خوێنەر حیسابی لێ تێک نەچێت وەک کە من بۆ ماوەیەک لێم تێک چوو. واتای چوارینەکەش وەک من تێی بگەم ئەمەیە: چ سەیر لەوەدا هەیە بەغدا بەبوونی تۆ تێیدا ناز بکات، ئەی ئەو کەسەی وجوودت (محیط)ی دوو جیهانی ئامادەییە. ئەورە بەو هیچییەی خۆیەوە گرەو لە خۆر دەباتەوە لە بیروڕای ڕووناکی تۆ داوای یارمەتی بکات

ئەم (محیط)ە وەك بزانم بەواتای دەریای (محیط)، واتە ئۆقیانووس Ocean هاتووە نەك ئابلۆوقەیەر وەك كەلیژنە بۆی چووە. دوو جیهانەكەش بۆ دنیا و قیامەت دەچێتەوە نەك دوو جیهان وەیا دە جیهان كە ژمارەی خۆرایی پێوە لكابێت و هیچی تێ ناچێت. لەلایەن كێشی چوارینەكەوە جگە لە ژمارە دوو ژمارەی (دە، سێ)ش دەست دەدەن. ژمارە (سە، نە، سێ، نۆ)ی فارسیش دەست دەدن بەڵا هێندەی (دوو، دە، سێ) گورج نین. لەلایەن واتای بەكێش و تەرازووەوە تەنها (دوو) دەست دەدات كە دنیا و قیامەتە.

لە لاپەڕە (١١) وشەی (مشیمە) بەمنداڵدان دانراوە. وەك بزانم منداڵدان رەحمە، هەرچی مەشیمەیە (پزدان)ی پێ دەڵێن. ئەم (پز)ە وەك لە (پسمام، پزمام، كوڕمام)دا دەردەكەوێ هەمان (پسر-پسەر)ی فارسییە لە كوردیشدا هەیە بەڵام بە زاراوە بۆ مشیمە ڕۆیشتووە.

ڕاڤەی بەیتی یەكەم و دووەمی قەسیدەكەی لاپەڕە (١١) بەیەكەوە شیرن دێن. من واتای هەردوو بەیت بەم جۆرە تێ دەگەم. ئەمەش دەقیانە بە ڕێنووسی كوردی.

ز نوطفەیی قەڵەمەت دەر مەشیمەیی قیرطاس
نەتیجە هاست بە قیمەت گرانتەر ئەز ئەڵماس
صەحیفە موعجیزە پیراست بەسكی چون مەریەم
بە بەر گروفتە مەوالیدی عیسەوی ئەنفاس

شێخ ڕەزا دڵۆپی قەڵەمی مەدحكراوەكەی كە دەبێتە وشە لە (قرطاس)دا بە (نطفە) دادەنێ و قیرطاسەكەش بەپزدان. (نطفە) سەرەتای ڕسكانی منداڵە لە پزداندا. نیتر ئەم نوطفەیەی قەڵەمی مەمدووح لە پزدانی كاغەزدا ئاكامی وەهای هەیە گرانتر بێ بە نرخ لە ئەڵماس.

صەحیفە (واتە: ڕووپەڕە كە دەكاتەوە قرطاس) موعجیزە ئەخشێنە چونكە وەكو مەریەم لە هەناوی خۆیدا گەلێك منداڵی عیسەوی نەفەسی هەڵگرتووە. وەك دەزانین هەناسەی عیسا ئیحیاكەرەوە بووە. ئنجا هەناوی مریەم یەك عیسای تێدا بووە (عیساش منداڵی ئەبووە ئەمما دڵۆپی مەرەكەبەكە ئەزۆك نییە) هەرچی پزدانی كاغەزی دزستەكەیەتی چەندان مەوالیدی وەك عیسای تێدایە كە وشەكانی نامەكەن.

لە (معجزە پیرا)دا وشەی (پیرا) كەرتی ناوی كارا -اسم فاعل-ی داڕێژراوە لە

چاوگی (پیراستن)ی فارسی هاتووە کە بریتییە لە جوانکردنێکی عەیبپڕ بێت و دەبێتە تەواوکەری (آراستن ئاراستن) کە زیادکردنە لە جوانی. کورد کە (ئارایشت) بەکار دەهێنێت لە (ئاراستەن)ەوە هاتووە بەڵام کە ئاراستە بەواتای (تێگرتن-توجیه) لەکاردەهێنێت تێیدا بەسەهوو چووە. ئاراستن و پیراستن هەردوویان پێکەوە بەواتای جوانکردن دێن. بە مەجاز دەشێ ئاراستەکردن بە (تەیارکردن) بڕوات کە لەشکر بەچەك ئاراستە دەبێت.

لە دێرە شیعری سێیەمی قەصیدەکەدا کە شێخ ڕەزا لە ڕووی قیاسەوە، ئەی ئەمین فەیزیی بە جوبرەئیلی ئەمینت دادەنێم، پاڵپشتەکەی لەو قیاسەدا ئەوەیە کەوا هەروەك جوبرەئیل هەڵگری وەحیی خودایە و ئەمینی وەحییە، ئەمین فەیزیش هەم ناوی ئەمینە هەم کاغەزیشی پڕە لە موعجیزە. من تەمام نییە بەسەر هەموو کتێبەکەدا بچمەوە و ڕەخنەکاری لەگەڵ ئەمین بەگ و لیژنەدا ساز بدەم چونکە پتر لە کتێبەکە دەخایێنێ. ناوناوەیێك ئەبێ دەست بۆ چقڵێك وەیا قسەڵێك دەبەم ئەویش بە نیازی خزمەتی کتێبەکە خۆی.

لە لاپەڕە (۱۲)دا ڕیاقەی دەقاودەقی (دڕ یتیمی) بە (دوری نایابی) کراوە کە ئەختێك لە ڕاستە واتای وشەی (یتیم) دوورە، بەڵام لە ڕاقەی سەرلەبەردا بە (دوڕییەکانە) لێك دراوەتەوە و جێی خۆیەتی و ڕاستە تەنها زێدە شەرحێك پێویستە بگوترێ: (دڕی یتیم) ئەو دوڕڕەیە کە لە قەپێلکێکدا تەنهایە و دانەی دیکەی لەگەڵدا نییە ئیتر گەورەتر دەبێ لەوانەی بە تەنهایی فرازی نابن. وشەی (نایاب)یش هەرچەند لە واتای زێدە پەسەند بەکار دێت لە حەقیقەتدا بەشتێك دەگوترێ هیچ هاوتای نەبێت بگرە هەر دەست ناکەوێت چونکە (یابیدن) واتە دۆزینەوە و دەستکەوتن. کە گوتت (نایاب) دەست نەکەوتن دەگەیەنێ. لە تەك نایابدا وشەی (کم یاب، کەم یاب) هەیە کە دەکاتەوە کەم مانەند. لە لاپەڕە ۲۲، ۲۳دا لیژنە بۆ ساڵی لەدایکبوون و مردنی نالی هەر ئەو ساڵانەی داناوە کە لە کۆنەوە بێ بەڵگە و لێکۆڵینەوە باوی ستاندووە بێ ئەوەی هێمایەك بکات بۆ ڕایەکی دیکە کە لەو ساڵەی بۆ مردنەکە دانراوە کۆڵیوەتەوە و کۆمەڵێك بەڵگەی لە دیوانەکەی نالی خۆیەوە هەڵێنجاوە کە ناشێ نالی لە تەمەنی ٥٦ ساڵی مردبێت. ئەم ڕایەی من لە کتێبی (چەپکێك لە گوڵزاری نالی) کە لە حەفتاکاندا بڵاو کرایەوە هاتووە سەیرێکی لاپەڕە (۳۱)ی شەرحی دیوانەکەش بکەیت دەبینی مرحووم فاتیح لە پەراوێزدا نووسیویەتی بەڵگەکانی سەر بە ساغکردنەوەی

ساڵی مردنی نالی لە دەستنووسێکی (مسعود محمد) وەرگرتووە. ڕایەکەی من جگە لە لێکدانەوە و شایەدی باپیرم حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادەشی لەگەڵدایە کە گوتبووی کاتێك لە ساڵی ١٢٨٩ک. مەکەی بەجێ هێشت نالی بەر حەیات و زۆر بەساڵدا چوو بوو. تەمەنی ٥٦ساڵی لە چاو ئەو پیرییەی کە حاجی مەلا عەبدوڵڵا دیتبووی و دەلالەتی چەندان شیعری نالیش ڕای دەگەیەنێ تا ئەو تەمەنە زۆر کورت بێنێت. بەهەمەحاڵ ئەو لێکۆڵینەوانەی ساڵەکەی مەرگی نالی بەسەر دەکەنەوە و ئەو پێ داگرتنانەی لەسەر ساڵانی ١٨٠٠و ١٨٥٦ز. بۆ ژیان و مەرگی نالی بە داگەرمییەوە بەرەوامن هەمووی بێ لزووم دەبن پاش ئەوەی مامۆستا عەبدوڵڵا حەداد، دوای گەڕانەوەی لە خوێندنی ئەوروپای لە تەلەفزیۆنی – وا بزانم: هی مووسڵ– باسی کتێبێکی نووسەرێکی فرەنسەیی کێڕایەوە کە دەڵێ لە ساڵی ١٢٩٠ک. نالی لە ئەستەمبوڵ مرد و بە خاك سپێردرا. نووسەرەکە خۆیشی لەوێ بووە. ئەم ساڵەی ١٢٩٠ کە دەوەستێتە ئاست ساڵانی ١٨٧٣–١٨٧٤ی ز. تەمەنی دەگەیەنێتە ٧٣–٧٤ ساڵ کە لە ١٨٠٠هاتبێتە دونیا.

ڕاستییەکەی، ئەو پیرییەی کە باپیرم لە نالیی دەگێڕایەوە و لە باوکم و مامەوە بە ئێمە گەیشتووە پتر لە ٧٣ ساڵ ڕادەگەیەنێت کەوا سەرەتای بوونی چەند ساڵێك دەخاتە پێش ١٨٠٠ز. وە بەلام بەڵگەی مادی بۆ ئەم لایەنە تا ئێستا لە دەست کەسدا نییە هەروەك بۆ ١٨٠٠یش هیچ بەڵگە پەیدا نییە. تۆ بڵێی نووسەران دەست لە ساڵە درۆزنەکەی ١٨٥٦ شل بکەنەوە؟ باوەڕ ناکەم! لە پەراوێزی لاپەرە ٢٣ بە دەم باسی ژیانی نالییەوە، لیژنە بۆ ئەوە چووە کە نالی لە پاش ساڵی ١٨٤٠ز. کە دەوەستێتە بەرانبەر ساڵانی١٢٥٥ – ١٢٥٦ک. بە ناچاری سلێمانیی بەجێ هێشت. هەرچەند لیژنە هۆی ناچارییەکە بەدەستەوە نادات و بەڵگەش ناهێنێتەوە بۆ سەپاندنی ئەو ساڵە بەلام وا پێ دەچێت ئاوارەبوونی نالی بە تێکچوونی حوکمڕانیی بابانەوە دەبەستێتەوە کە بەپێی بۆچوونی خۆی ساڵی ١٨٥٠ ز (بەرانبەر ١٢٦٦–١٢٦٧ک.) دەگرێتەوە. دەبینین ١٠ساڵێك ماوە هەیە لە نێوان ١٨٤٠و ١٨٥٠دا ئیتر مرۆڤ نازانێ چۆناوچۆنی لە ئاست ئەو بیروڕایەدا کەوا لە پەنهانی ماوەتەوە دڵی خۆی تەسکین بکات.

لەدیوانی عەبدولباقی عومەری تێکچوونی بابان بەپێی حیسابی (جمل) بەم میسرەعە دیار خراوە:

که ساڵی ١٢٦١ك. دەگێڕنەوە، لەمەشدا شوبهە نییە هەم لەبەر دەلالەتی شیعرەکە و هەم لەبەر قسەی دەماودەمی کۆیێ کە دەزانین لەشکری ئەحمەد پاشا لە کۆیێ شکستی هێنا لە بەرانبەر نەجیب پاشا والیدا، شکستەکەش هونەری نەجیب پاشای تێدا نەبووە، بێ سەروبەریی لەشکری بابان خۆی سەبەب بووە. باپیرم گێڕابوویەوە کە عومری ١٠ ساڵی بووە شەوێ گوێی لەو تەقوهوڕەی ناو لەشکری بابان بووە کە بۆتە هۆی لێک هەڵوەشانی. باپیرم لە ١٢٥٠ك. بەوطەد بووە بۆ (١٢٦١)١٠ ساڵێك مەودا هەیە. دەگێڕنەوە، نەجیب پاشا زۆر بێ ئومێد بووە لە سەرکەوتن، ڕجاکاران دەنێرێتە لای ئەحمەد پاشا کە ڕێزی نەشکێنێت چی ئارەزوویەتی بۆی بکات.

لە وەڵامدا دەڵێ ئەگەر والی دەعالەتم بێ بکات دەیکەم بە کوێخای قۆزیتان... ئەم قسانە جێی گومان نین هەرچەند مێژوونووسان شتێکی دیکە بڵێن.

ڕاستییەکەی چ هۆیەکی ئەوتۆ نییە وەها لە نالی بکات کە لەبەر تێکچوونی حوکمی بابان لە سلێمانی دەرچێت. ئەحمەد پاشایەکی بە سەلامەتی لە ئەستەمبوڵ بژیت و تورك هیچی لێ نەکەن، بۆ دەبێ نالی لە ترسی دەستدرێژیی ئەو تورکانە ئاوارە بێت؟ ئەحمەد پاشا گەیشت و گەڕانی ئەورووپاشی کردووە، لە ئەستەمبوڵ مەجلیسی ئاوەدان و بەهاتوپاتی هەبووە، هێندەش تێروتەسەل بووە یەکێکی وەکو شێخ ڕەزا بارەها مەدحی دەست و کەرەمی کردووە، ئیتر نالییەکی شاعیر و بێ مایەی دنیایی لە چی بترسێت؟ سالم دووروهاریزیی کردووە کە دەزانین باری ئەو بەهیی پایەیێکی دنیایی تێیدا زیاوە جودایە لە هی نالی، خۆ ئەویش وەها ئاوارە نەبووە کە لە سلێمانی بە تەواوی بتەکێنێتەوە. نالیش لە جێژی دەسەڵاتی تورکاندا ژیا و پەنای بۆ ئێران و توران نەبرد. شتێکی لە بڕیاری واقیعەوە دێتە لێکدانەوەی بێ لایەنەوە ئەوەیە نالی بەر لە ڕمانی بابان بە نیازی حەج سەفەری کردووە هەر بۆیەیە موناجاتەکەی ڕێی حەجی، بە هەرسێ پارچەی یەك لە دوا یەکییەوە باسێکی ئاوارەبوونی تێدا نییە وەك کە دواتر شکات لە دەستی بێ سەنوایی و گەریبیی دەکات. نالی جارێ لەو سەفەرەدا بووە حوکمی بابان هەڵوەشاوە و حاڵی وڵات شێواوە ئیتر دوودڵ ماوە لە گەڕانەوە تا ئەو دەمەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم) بۆ سالم دەنێرێ و پرسی بێ دەکات ئەویش وەڵامی بێ ئومێدیی بۆ بەرێ دەکات. سەیرێکی سەرەتای موناجاتەکە بکە کە دەڵێ:

ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتاکەی حیرصی ویرانە
لەگەڵ ئەم عیشقبازانە بڕۆ بازانە نازانە
موسڵمان لێرە مانی خانمانت هەر نەمان دێنێ
پەشیمان بە کە دەرمانی مایەی ئیمانە

تا لەم موناجاتەدا چ ترس و لەرزێکی ڕووحانی بابان و قەمچیی تورکان دیار نییە. نالی تانووت وەبەر خۆی دەنێ کە بەرەو حەج هەڵقەنێ. تا دەتوانین تارمایی ترس و لەرز بێنینە ناو هەڵبەستەکە دەبێ واتای وشەکانی هەڵگێڕینەوە. حەزم دەکرد لێرە بەڵگەی سەپاندنی ساڵی ۱۸٤۰ ز. ی بەدەستەوە دابایە چونکە ساڵێکی کش و مات و بێ دەنگ و دەلالەت چ فەرقی نییە لەگەڵ ۱۸۳۹ و ۱۸٤۲ و ۱۸٤٥. دوای ئەم تێبینییانە داوا لە خوێنەر دەکەم بە خوێنی سارەوە لەگەڵمدا سەرنجی ورد لە واتای دوو بەیتی سەرەتای موناجاتەکە ڕاگرێت، بە تایبەتی بەیتی دووەم، لە ماوەیەکی کورتیشدا دڵی خۆی بداتە بەیتی شەشەم:

فیداکاری تەن و جان بە لە ئاسانی هەراسان بە
کە داغ و دەردی ڕێگەی مەککە باغ و وەردی مەردانە

نالی لەم بەیتانەدا وەزعێکی نارامی بێ قوڕت و گرێ لەبارەی خۆیەوە باس دەکات کە دەیەوێ ئیمانی خەست و خۆڵی موسڵمانەتیی لێ بەخەبەر بێنێت و باڵی عاشقانە وەکو باز بخوازێتەوە پێی بفڕێت و لەو وەزعە نارامەی هەڵقەنێت. بەخۆی دەڵێ: ئەی موسڵمان! لێرە مانەوەی خانمانت نەمان و فەوتان دێنێت. پەشیمان بە لەو نارامییەت چونکە لێرە (نەمانت و بەرەو حەج ڕۆیشتن) دەرمانێکە دەبێتە مایەی (مان-بقاء) وەها لە مایەی ئیمان. لە بەیتی شەشەمدا ئەم واتایە خەستتر دەکاتەوە کە دەڵێ (لە ئاسانی هەراسان بە) واتە باری وەها ئاسان و هەموار کە تێیدایت خۆتی لێ هەرەسان بکە تا بگەیتە ئەو داغ و دەردەی ڕێی مەککە کە باغ و گوڵی مرۆی مەردە.. ڕەنگە زێدەڕۆیی لە قسەمدا نەبێت کە دەڵێم نالی لە هەموو عومری پێش و دوای ئەم دەمەی کە بەیتەکانی تێدا هۆنیتەوە حاڵێکی هێندە نارامی بەخۆیەوە نەدیتووە ئیتر نازانم چۆن بێ بەڵگە دڵ تەسکین بکەم کە نالی لەبەر ناچاری لە سلێمانی دەرچووە

لە شەرحی دیوانەکە (خان و مان) نووسراوە. وا دەزانم (خانمان) ڕاستە چونکە پاشگری (مان) لەم وشەیە و هی وەک ئەودا دەلالەتی جێگە شوێنی هەیە وەک کە

دەڵێی نیشتمان مەبەستت جێگەی لێ نیشتنە. وەك ئەو (دودمان، گرودمان- بەواتای عەرشی خوا-...) و هی دیکەش. بەلام دەبێ بزانین لە (قارەمان، دوشمان، ئەهریمەن) و هی دیکەشدا ئەو (مان)ە و (مەنش)ە شتێکی دیکەیە لەگەڵ لانشەی ئینگلیزی یەك ریشەن. لە کتێبی سەر بەزمانی کۆنینە خوێندوومەتەوە دەڵێ لە (ئاسمان)دا ئەم (مان)ە جودایە لەوان بەلام نالێ لە چییەوە هاتووە ئەگەر هەڵەم نەکردبێ (هەورامان) دەبێ (هۆرامان- شوێنی لێ هەلاتنی خۆر) بێت.

لە پەراوێزی لاپەرە ٢٥ی ئەنجوومەن سەرنج بۆ مەلایەکی تۆمەرگونبەتیی ولاتی کۆیێ ڕاکێشراوە بە زیرەك و شاعیر لە قەڵەم دراوە و ئەویش وەك (ئەحمەدی کۆر) ناوی مەلا ئەحمەدە کۆرەیە. ڕاستییەکەی ئەم مەلایە کە مەشوورە بە (مامۆستا کۆرە) یەکێك بوو لە دوو کەسی کۆیێ کە ناویان دەرکردبوو بە خاوەن کەرامەت، ئەوی دیکەیان ئافرەتێك بوو هەمیسان لە لادێوە بۆ شار هات، بوو بە بووکی یەکێك لە بنەماڵەی (خادم السجادە)ی کەرتی کۆیێ. ناوی (مامۆستا مەلاژنە عەنبەر بووە جا بە هەر تەئویلێك بێت، چ دینی چ فیزیایی. لە هەردوویان پێشبینی و کەرامەت دیتراوە و بیستراوە. کاك ئەحمەدی شێخ لە هەندێ ئەو نامانەی بۆ حاجی مەلا عەبدوڵڵای ناردووە سەلام بۆ (ئاشەوان) دەنێرێ کە ئەم مامۆستا کۆرەیە دەگرێتەوە. لەو ڕووەوە کە بەینێك مدیری بریفەکانیهان بووە و ئاشەوانیی بۆ کردوون. لەلایەن پایەی مامۆستا عەنبەرەوە ئەوەندە بەسە کە لە دەمی بەخاك سپاردنیدا حاجی مەلا عەبدوڵڵا گوتبووی، یەکێك دەشارینەوە کە هەموومان دەمێنێت. مامۆستا کۆرەش خواناسێك بووە باوکم مەفتوونی بوو، هەتا مەرگیشی لە ساڵی ١٩٤٣ لە زۆر مەجلیسەکانیدا بە سۆز و پەرۆشەوە باسی ئەحواڵی مامۆستا کۆرەی دەگێڕایەوە. باوکم دەیگوت مامۆستا شارەزای (نحو)ی عەرەبی نەبوو بەلام هەر عیبارەتێکی بە هەڵە بۆی خوێندرابایەوە تێی نەدەگەیشت هەتا بۆی ڕاست دەکرایەوە. گوتبووی ئەحو نازانم ئەمما دڵم بۆ مەعنای عیبارەتێك ناچێت هەڵەی تێدا بێت. یەك لە کەرامەتەکانی کە لە شێوەی خەونی ڕاست خۆی نواندبوو ئەوە بوو، بە باوکمی گوتبوو ئەگەر لە خێزانەکانی حەماغا هەر کامێکیان حاملە بێ کوڕێکی دەبێ، ناوی بنێن (حەمە زیاد) ناشبێ لە ماڵی باوکی بەخێو بکرێ. قسەی دیکەش زۆرن ناتوانم دەریان بڕم. حەماغا تا ئەو دەمە وەچەی نێرینەی نەبوو تەمەنیشی پاڵی بە ٨٠ساڵ دابوو. کاکە زیادی ڕەحمەتی مۆژدەی ئەو خەوتە بوو. لە ماڵی حەماغاش بەخێو نەکرا. کاکە زیاد لە

١٩١٤هاتووەتە دنیا. دیارە مامۆستا کۆرە تا ئەو ساڵە و ئەختێکیش دواتر ژیاوە. یەکێکیش لە کەرامەتەکانی مامۆستا عەنبەر ئەوە بووە کە شەوی مەرگی کاك ئەحمەدی شێخ، ئەو خەبەری مەرگەکەی بەخەڵق ڕاگەیاندبوو.

لە پەراوێزی لاپەرە ٣٢دا وشەی (هەڵبەستەر) هاتووە گۆیا ڕیژەی ناوی کارای لێکدراو یان داڕێژراوە لە عەرەبی (اسم فاعل)ی پێ دەڵێن لە کاری (بەستن- هەڵبەستن)ەوە هاتووە. دەبێ خوێنەر و لیژنەش ئاگادار بکەمەوە لە ڕاستییەك پێوەندیی بەم ڕیژەیەی ناوی کاراوە هەیە کە بەهۆی (ەر)ەوە دروست دەبێت. لە پێشەوە دەبێ لە گۆشەنیگای ئەم پاشگرەوە، کاری تێپەر و تێنەپەر لە یەکدی جودا بکرێنەوە. هەرچی تێنەپەرە بەرای بەرای ئەم پاشگرە بە خۆیەوە ناگرێ چ بە سادەیی بێت و چ بە داڕێژراوی و لێکدراوی بێت. ناشێ لە کارەکانی وەك: نووستن، ڕۆیشتن، مردن، هەڵکەوتن، دابەزین، بەدوادا گەڕان، پاشگەزبوونەوە، ڕیژەی ناوی کارایان لێ وەربگیرێت وەك: نووستەر، ڕۆیشتەر، مردەر، هەڵکەوتەر، دابەزەر، بەدواگەڕەر، پاشەگەزبووەر... هەرچی کاری تێنەپەر هەیە لە ڕێی بەکارهێنانی پاشگری (و)ی ئیسمی فاعیلەوە ڕیژەی فاعیلی لێ دروست دەبێت و دەگوترێ نووستوو، ڕۆیشتوو، مردوو، هەڵکەوتوو، دابەزیو، بەدوادا گەڕاو، پاشگەز بوویەوە...

خوێنەر سەری لێ نەشێوێت کە ئەم وشانە بە دوو (و) کۆتاییان دێت، ئەوەی ڕیژەی کارا دروست دەکات دەنگی (و)ی ڕیژەکە بە دوا کۆنسنانتدا بێت و (و)ی کونسنانتیشە کە بە دوا بزوێندا بێت... بەداخەوە ڕێنووسە ڕەسمییەکەمان زۆر بە بێ باکی دوو (و)ی لە بۆ یەك دەنگی (و)ی درێژ هەڵبژارد. کۆڕی زانیاری کورد بۆ واوی درێژ کە شێوەیەکی بەسەر تاکە واوەوە پەسەند کردبوو چونکە هیچ مەنتیق ناسەلمێنێ دوو پیت ببنە نیشانە بۆ تاکە دەنگ مەگەر لە حاڵەتی گوشراندا وەك: کەللە شەممە...

کاری تێنەپەر ڕیژەیەکی سەماعیی هەیە ناوی کارا و ناوی چاوگیشی پێ ساز دەبێت: بەرهەڵست، ڕێکەوت، سەرەڕۆ، خۆشگەڕ... ناوی کاران. [بەرکوڵ، دەمەتەقە هەڵمگرێ ئایا ناوی کارایە یا ناوی بەرکارە هەرچەند (کوڵ-کولان) تێپەڕیش نییە (بەرکار)ی بووێت. سەلیقەش دەزانێت، چەند یەکێکی وشەی کارەکە دەمێنێتەوە ببێتە کەرتی ناوی کارای ئەوتۆیی. ئەم ڕیژەیە لەگەڵ فیعلی تێپەڕدا بە پێی داخوازیی حاڵ ناوی داڕێژراو دروست دەکات ئیتر ناوی کارایە یان ناوی بەرکارە یان ناوی ئالەتە... لە نموونەدا: زۆرخۆر، دووربین، پیاوکوژ... ناوی کاران. دەسکوژ، هەڵبەست، ڕاپەچ

ناوی بەرکارن. دەسگرە، چاپاڵێو، دەستەبەرە . ناوی ئالەتن.

واش دەبێ ناوی واتا لەم ڕێژەیە دروست دەبێت وەك: هەڵسوکەوت، هەڵسووڕوداسووڕ، ئیتر کارەکە تێپەڕ بێت یان تێنەپەڕ فەرقێك ناکات چونکە وشەکان چالاکیی ناوی کارا و ناوی بەرکاریان تێدا پەیدا نابێت وشەکان مەندن چونکە ناوی واتان.

تێبینییەکی مەیلەو شراپەوە هەیە لەوەدا کە دروستبوونی ناوی داڕێژراوی ئەوتۆیی بەهۆی پێشگری (لێ، پێ، تێ) کە بە ئەسڵ لە پریپۆزیشن (بە لە) هاتوون زێدە هێزێك بە وشەکە دەدات لەوانەیە کاری تێنەپەڕ تامی تێپەڕی تێ بگەڕێت. بە نموونە: پێگەیشتن، تێگەیشتن، لێچوونەیێش، پێداچوونەوە تێ ڕاخوڕین.. وەك تێپەڕ دێنە بەرگوێ. ئەم دیاردەیە لەوەوە دێت کە پریپۆزیشن بە بەرییەوە هەیە ببێتە هۆی نەقڵی تاو و تەئسیری کار کە لە عەرەبیدا (تعدية بالواسطة)ی پێ دەڵێن. ئەم سیفەتەی پریپۆزیشنە وەهای کرد کە لە کاری تێنەپەڕی (کۆشان) ناوی کارای داڕێژراوی (تێکۆشەر) پەیدا بێت کە بە خەیلاقی دەستوور (ەر)ی خستووتە دوا کاری تێنەپەڕەوە (لە زاری موکریان و بەشی دیکەش لە کوردستانی ئێران، پریپۆزیشنی «دە» هەیە کە لە دیوی عێراق «لە»ی بۆ بەکار دێت. ئەوان دەڵێن «دە دڵمدا» لە جیاتی «لە دڵمدا» وشەی «لە» لە زاری موکریان جێگەی بەکارهێنانی جودایە لە جێگەی «دە». هەرچی «دە»یە بۆ حاڵەتی بێ جووڵەیی بەکار دێت: دەڵێن «لە منەوە بۆ تۆ سڵاوێك دیاری بێت» «ناڵێن» دەمنەوە– یاخود دەمترا... ئەم باسە درێژەی هەیە...)

کاری تێپەڕ لە ئەسڵدا کەمتاکورتێکی بەهۆی (ەر)ەوە ناوی کارای لێ وەرگیراوە، ئەویش بێ گرفت نییە، بە نموونە دەڵێم (نانکەر) کە بە ڕووالەت ئەم (ەر)ەی پێوەیە دوو تێبینیی گەورەی بە دەورەوەیە، یەکیان ئەوەیە کە وشەکە لێکدراوە و سادە نییە کەس کەرتی (کەر)ی بە سەربەخۆیی لە واتای فاعیل بەکار نەهێناوە هەر نەبێ لە ترسی تێکەڵبوون لەگەڵ وشەی کەر بە واتای (حمار). تێبینیی دووەم ئەوەیە، ئەگەر (ەر) بچێتە سەر فیعلی (کردن) دەبێ بگوترێ (کردەر) وەك کە دەگوترێ (نووسەر، بیسەر، بینەر...). کەواتە ئەم دەنگەی (ر) لە (نانکەر)دا بنەڕەتییەو هی چاوگی (کردن)ە وەك لە (نانخۆر)دا ئەو (ر)ە بنەڕەتییە. لە وشەی (نانەر)دا دەنگی (ر) پاشگرە نەك بنەڕەتی، چونکە لە (دان) دەنگی (ر) پەیدا نییە. پاشگری (ەر) لە ئینگلیزیدا بێ گرفتە چونکە بەهاراوی لە کاردێت.

بەهەمەحاڵ نووسەران، دەستیان خۆش بێت، پەراوێزی بەکارهێنانی پاشگری (ەر)یان لێك کێشایەوە تا ئەوەی بپسەر، گوژەر، بینەر . و چەندین وشەی دیکەش کەوتنە ناو نووسین و سەر زمانانیشەوە بەلام نەمزانیوە (گوتەر) بەکار هاتبێت، هۆیەکەش ئەوەیە کە ڕیژەی ئەو جۆرە ناوی کارایە لە فیعلی ڕانەبردوو و (داهاتوو)ەوە وەردەگیرێت. (گوتن)یش لە داهاتوودا دەبێتە (دەڵێ). ئەگەر (وشی، دەوشێ) بەکار هاتبایە دەگوترا (وشەر) وەك کە دەڵێن (گوشەر) لە بری (عصّارة). سەیر ئەوەیە کە دەڵێن (وتی) بەلام ناڵێن (دەوتێ) وەك کە دەشێ بگوترێ (دەوشێ)... وەك کە گوتەر نەبیستراوە هەروەهاش (ڕنەر، بڕدەر، گرتەر، پێچەر، شووشتەر...) جارێ نەپشکووتوون. بەهەمەحاڵ ئەم ڕوونکردنەوەی وەها کورت و لێقرتاو کە زەرەرێکی تێدا شك نابەم مەبەستی بنەڕەتی نییە لەوەی گوتم و بەتەمام بیڵێم، ئەوەی مەبەستە شتێکی دیکەیە. جایەز نییە ڕیژەی ناوی کارای سادەی وەك (گوشەر، بینەر...) بەگردی بەشدار بێت لە پێکهێنانی ناوی کارای ناسادە، چ دارێژراو بێت و چ لێکدراو لە نموونەدا دەڵێم ناشێ لە جیاتی (نانخۆر، پیاوکوژ، دووربین...) بگوترێ (نانخۆرەر، پیاوکوژەر، دووربینەر...) بۆیە نابێ بگوترێ (هەڵبەستەر) ڕاستە، دەزانین (هەڵبەست) ناوی بەرکاری دروست کردووە بەلام ڕێمان هەیە بچینەوە بۆ بەکارهێنانی (و)ی فاعیل و بڵێین شیعر هەڵبەستوو یان هەڵبەستووی تەنها. لە نووسینی مەیلەو کۆنەدا ئەم لایەنەم ڕوون کردووەتەوە بەلام کێ تاقەتی هەیە شتی وەها شرابەوە و وتوو بە یادی خۆیەوە پلکێنێ لێرەدا دەڵێمەوە کە گوتت: گورگی مەڕخواردوو مەبەستت ئەوەیە گورگەکە مەڕی خواردووە ئینجا بشڵێ: مەڕی گورگ خواردوو، دەیسانەوە هەمان واتات مەبەستە چونکە مەڕ گورگ ناخوات. لە دەستەواژەی (دزی مەڕ بردوو) دزەکە جێگەی کارای گرتۆتەوە لە (مەڕی دز بردوودا) مەڕەکە جێگەی بەرکاری گرتووەتەوە و دزەکەش کارا. کە گوتت (کابرای درۆ هەڵبەست) بە ناچاری وشەی (هەڵبەست) واتای فاعیل بەدەستەوە دەدات، لەمەشدا سەرێنجیی بێ جێیە چونکە کوردەکە کە هاوەن زمانەکەیە وەهای ڕەفتار کردووە. ئەگەر بۆ دەرباز بوون لە تەگەرە بڵێی (کابرای درۆهەڵبەستوو) واتاکە ئەوە نابێ کە مەبەستە چونکە لەم حاڵەتەدا دەستەواژەکە سیفەتێکی کاتەکی (وقتی) و تاکە ڕووداو ڕادەگەیەنێت هەرچی (درۆهەڵبەست، تەلاقخۆر، قۆڵبڕ..) و ئەم تەرزە ڕێژەیە سیفەتی هەمیشەیی و خوو پێوەگرتن ڕادەگەیەنن. تەلاق خواردوو و قۆڵبڕیو سیفەتی وەقتیان لێ دەخەمرێنەوە کە

جارێك درۆ كرابێت و قوڵ ببرابێت..

ئەم باسە درێژەی بە زۆر لایاندا هەیە چی دیكەی لەسەر ناڕۆم. پەراوێزەكانی كتێبی (ئەنجوومەن...) گەلێك شتی سوودبەخش و ئرخدارییان تێدایە بەڕەهەندەی من بابەی سەری دەرزییان لێ كەم نابێتەوە، ڕەخنە تەنها بەر ئەو شوێنە دەكەوێت كە ڕەخنەی لێ گیراوە دەخلی بەسەر شتی دیكەوە نییە بن لێوەخستنیشی چ سوودی تێدا نییە بگرە زەرەربەخشە لەو ڕووەوە كە ڕووناكی دەشارێتەوە.

لە لاپەڕە ٣٩ قەسیدەكەی سالم لە هەموو بەیتێكیدا وشەی (چ) هەیە و لە (ئەنجوومەن...) بە (چە) نووسراوە. لێرە لە ئاست (چە)ی بەیتی یەكەمدا دەری بڕیوە كە (چ) ڕاستە. سەرلەبەری (چە)كان دەبێ بكرێنە (چ) شكڵی (چە) هی زمانی فارسییە. لەمەدا گرفت نییە. بەڵام هەندێ ڕوونكردنەوەی دیكە پێویستن لە میسرەعی دووەمی بەیتی یەكەمدا (غەنی و) دەبێ بكرێتە (غەنی وو) لەبەر كێشی شیعر. بەیتی هەرە دوای پەراوێزی ئەو لاپەڕەیە كە نووسراوە:

شاهـ خـالـتـە تـەصویـری خـەلایـق نـاری

ظاهیرە قودرەتی حەقت چە لەبەرن و چە لە بەر

سەرلەبەری بەیتەكە بەهۆی لێڵی میسرەعی یەكەمی، هیچ واتا بەدەستەوە نادات سەرەڕای ئەوەی كە میسرەعەكە خۆی وەها لەنگە كەڵكی پێوە نەماوە. وەك من بۆی دەچم، دەبێ دەقی بەیتەكە ئەمە بێت:

شاهیدی خالیقە تەصویری خەلایق ناری

ظاهیرە قودرەتی حەققت چ لە بەرنا چ لە پیر

لە پەراوێزی لاپەڕە ٤١ میسرەعی دووەمی بەیتێكی ناو (ئەنجوومەن...) بەو شكڵە هاتووە كە لە دیوانی (ئەحمەدی كۆر-چاپی مەهاباد)دا دەدیترێت:

مەجنون ئاسا غەرقی خوێنم لێم حەرام بوو خورد و خاب

ئەم وشەیەی (خوێن) دەبێ (خوون) بنووسرێت بە پێی ئاهەنگی میسرەعی یەكەم كە دەڵێ:

بوو بە بریان دەروونم چاو پڕ ئەسرین دڵ زەبوونم

لێرەوە دیارە (دەروونم، زەبوونم) داوای (خوونم) دەكات. میسرەعی دووەمی بەیتەكە

له (ئەنجوومەن)دا وەها هاتووە:

مەحبووبا وا بزت جنوونم لێم حەرامە خورد و خاب

ئەمەی (ئەنجوومەن) لەگەڵ ئاهەنگی سەرلەبەری بەیتەکە رێك دەڕوات. وشەی (خوون) کوردیی ڕەسەنە. لە شیعری شێخ رەزادا هاتووە:

«وەکو شەخسێ کە زاری کا لە دەستی دوژمنی خوونی»

پەراوێزی ژمارە (٥) هەر لەو لاپەڕەیەدا میسرەعێکی دیوانەکەی چاپی مەهابادی هێناوەتەوە ئەمەتە دەقەکەی:

«با لە بەین لاچێ حیجابە دلبەر و ئافتابە»

ئەم دەقە نە واتای هەیە و نە کێشیشی دروستە. دەبێ لە ئەسڵدا وەها بووبێ:

«با لە بەین لاچێ حیجابە دلبەری ڕوو ئافتابە»

لە لاپەڕە (٤٤)دا دێڕی نۆیەمی موستەزادەکە (هەر عەفوە خەیاڵی) تێدا هاتووە. دەبوو لێرە هێما بۆ شەرحەکەی دیوانی نالی بکات کە لەوێدا (فیرددوسە مەئالی)یە و هەڵەکەی بێ ڕاست بکاتەوە چونکە وەك بزانم لە هەموو ئەو دیوانانەی نالی کە چاپ کراون هەروەها نووسراوە جگە لەوەی کە (هەر عەفوە خەلاتم) لە میسرەعی چوارەمدا هاتووە ئەم دووبارەکردنەوەی یەك تەعبیر لە نالی ناوەشێتەوە دیارە فەیزی بەگ لە نووسینەوەدا شەبەنگی (هەر عەفوە خەلاتم) خۆی بەسەر زیهنیدا زاڵ کردووە و بە داخوازی قافییە (خەلاتم) بووەتە (خەیالی) کە لەگەڵ (نالی) ڕێك دێت بەو جۆرەی کە لەدوا یەکتردا هاتوون. ئەمەش شتێکە زۆر جاران ڕوو دەدات بە تایبەتی لێرەدا کە (خەلات) و (خەیاڵ) بە دەنگ و بە شکڵ نووسینیش لە یەکتر نزیکن. ئەمە دەڵێم لە حاڵێکدا نوسخەی (ئەنجوومەن..)ەکەی کە لیژنە لە بەردەستیدا بووە دەستنووسی فەیزی بەگ بێت دەنا دەبێ بڵێین لە نووسینەوەی دوا کاتدا هەڵەی تێ کەوتووە هەر لەو لاپەڕەیەدا بەیتێکی موستەزادەکە کەچوارەمین بەیتیەتی و لە شەرحی دیوانی مامۆستای بیارەییدا بەیتی دەیەمینە و ئەمەش دەقەکەیەتی لە هەردوو دیواندا:

قوربانی بلالم کە مەلالانە هەلاتووم

هـــــــەر عـــــــەفـــــوە خـــــەلاتم

لە شەرحی دیوانەکەدا هاتووە کە لە دیوانی نالی چاپی (گم-گیوی موکریانی)دا لە

جیاتی (هلالانه) وشەی (بلالانه) هاتووه و هەر ئەوەندەی لە بارەوە گوتووە کە (بلالانه) بە واتای (وەکو بلال) ئەوە دەبەخشێ. نالی وەك کە (بلال) لە جەور و ستەمی قورەیشییەکان هەڵاتووە، ئەویش، واتە نالیش لەبەر گوناهی زۆر وەیا لە جەور و ستەمی تورکی داگیرکەر بۆ لای پێغەمبەر ڕای کردووە.

من لە دەستووسی دیکەشدا ئەم (بلالانه)م دیتووە. ئەگەر وشەکە ئەسڵ بێت وەیا گۆڕاو بێت مەهارەت و جوانییەکی تێدایە شەرحەکە بۆی نەچووە. (بلالانه) هەروەك دەشێ دووبارەکردنەوەی وشەی (بلال) بێت، بە بەرییەوە هەیە بخوێندرێتەوە (بلا - لانه) واتە ( بەبێ لانە) لە مەیاندا (بلا) عەرەبییە وەك کە لە شەرحی وشەی (مەلەکول مەوت- ملك الموت)، لە لاپەڕە ١٥٤ی شەرحی دیوانەکەدا بە (ملی کەل موت) واتە (ملی وەك مو باریکت) لێك دراوەتەوە... ئەم (بیلا- لانه)یە لەگەڵ (هەڵاتووم) بە واتای فیرارکردن ڕێك دێت. ئێمە نازانین کام جۆرە نووسینی ئەم وشەیە لە دەم و قەڵەمی نالی هاتووەتە دەر ئەمما گومانم نییە هەردوو جۆر بە دڵ و دەمی نالیدا هاتوون هەرچەند نووسین هەر یەك شکڵ هەڵدەگرێت. هێندەش لەبارن و ئەوەندەش مەبەستی قەسیدەکەن دەبێ هەردوو دەق دانیان پێدا بهێندرێت.

شەرحەکەی مامۆستای بیارەیی باش بۆ ئەوە چووە کە دیتنی هیلالی سەری مانگ (بە تایبەتی مانگەکانی ڕەمەزان و شەووال و ذی الحجه و ربیع الأول کە موناسەبەی دینییان تێدایە) حەلات هەڵدەگرێ بۆیە نالی لە حەلاتی دەرکەوتنی خۆی وەکو هیلال دەبێ عەفو بکرێت... ئەمە زۆر جوانە و جێی خۆیەتی، دەمهێنێتەوە من زێدە خزمەتێکی ئەم بۆچوونە بکەم بەوەدا بڵێم کە خۆ بەقوربانکردنی بۆ بیلال وەها ڕانەگەیەنێ بەر لە هەمووان دیتنی مانگی ذی الحجەی مەبەست بێت کە لە کوردیدا پێی دەڵێن (جەژنی قوربان). لێرەدا ئەوەش نابێتە بەرهەڵست کە بگوترێ جەژنی قوربان یەکسەر بە دوور دیتنی هیلالدا نایەت و دە ڕۆژی دەکەوێتە بەینەوە چونکە هەر نالی خۆی لە شوێنێکی دیکەدا گوتوویەتی:

هەر کەسێ ڕووی تۆ دەبینێ خۆی بە قوربانی دەکا

چونکە ئەبرۆی تۆ هیلالی عیدە قوربانی دەوێ

لە لاپەڕە ٦٤ی (ئەنجوومەن)دا قەسیدەکەی (رەفیقان من ئەوا ڕۆیم لە لاتان) چ لەلایەن جەژەوە بێت و چ لەلایەن دارشتنەوە، ماڵی حەڵاڵی کوردییە جگە لەوە کە

ڕۆیشتنی نالی لە سلێمانی چ لە ترسی تورکان بێت و چ بە نیازی حەج بێت ئەم گلەیی و گازاندەیە و پاکانەکردنە هەڵئەگرێت.

لە لاپەڕە ٤٧ میسرەعی یەکەمی بەیتی پێنجەمی دەقی قەسیدەکەی خوارووی لاپەڕەکە کەنووسراوە: (وەرن بنواڕن دوو چاوی پڕ لە خوێنم) هی کەسێك نییە پێی بگوترێ شاعیر وەیا بەئەدەبدۆست بناسرێت. هەرچەند ناتوانم بڵێم ئەسڵەکەی چی بووە بەلام ئاشکرایە ئەمە نە ئەسڵە و نە فەسڵ. هەر ئەبێ لەبەر خاتری کێش ئەبوو نووسرابایە:

وەرن سەیری دوو چاوی پڕ لە خوێنم

لە واتاشدا بێ بەش نییە. داخەکەم، لیژنە هەمان میسرەعی بە دەقی نالەبارییەوە دووبارە کردووەتەوە وەك بەڵگە لەسەر هەندێ کە گۆیا سۆزی مستەفا بەگی کوردیی تێدایە. قورتی لەنگەر بەزێنی کێشی شیعرەکە هەرچی تام و شام هەیە لە شیعرەکەدا کوشتوویەتی ئیتر سۆز لە کوێوە بێت (بنواڕە بەرەو کۆتایی لاپەڕە ٤٨).

قەسیدەی لاپەڕە (٤٩)ی (ئەنجوومەن) پێنج بەیتە. لە شەرحی مامۆستای بیارەییدا هەشت بەیتە.

بەیتی دووەمی ناو (ئەنجوومەن) و شەرحی مامۆستا نووسراوە:

لە ڕووت و قووتی وەك من ڕوو مەپۆشە
کە وەصلی تۆیە قووتی عاشقی ڕووت

من لە نوسخەی دەستنووسی بڵاونەکرایەوەدا دیتوومە لە جیاتی (وەصلی تۆیە) نووسراوە (وەصلی ڕووتە). هەم لەلایەن دارشتنەوە و هەم لەلایەن واتایشەوە (وەصلی ڕووتە) پەسەندترە کە هاوئاهەنگترە لەگەڵ مۆسیقای بەیتەکە و گونجاوتریشە لەگەڵ داواکردنی دانەپۆشینی ڕوو چونکە وەسڵی (ڕوو) بەبیارکەوتنی پەیدا ئەبێ بەلام ئەرکەوتنی ڕوو ناکێشێتەوە سەر وەسڵی یار... ئەگەر لە میسرەعی یەکەمدا داوای گەیشتن بە یاری کردبایە بەجێی خۆی بوو بڵێ (وەصلی تۆیە قووتی عاشق) بەلام کە داواکەی هەر ئەوەندە بێ کە (ڕوو مەپۆشە..) ئەبێ بڵێ (وەصلی ڕووت قووتی عاشقە).

بەیتی سێیەمی (ئەنجوومەن) کە ئەڵێ:

ئەوە لێوی ئەتۆ بوو پڕ لە خەندە
کەوا شەککەر ئەڕیاری گوڵ ئەپشکووت

لە شەرحی دیوانی نالیدا بووە بە بەیتی پێنجەم و ئەمەش دەقیەتی:

لەبەر خەندەی لەبی لەعلی ئەتۆ بوو
کەوا شەککەر دەبارێ گوڵ دەپشکووت

لە تەرجەمەی ئەم دەقەدا شەرحەکە دەڵێ: (... چونکە سەرەرای رەسایی دارشتنەکەشی لێوی یاری بە (لەعل) وەسف کرابوو...) لەلایەن رەسایی و زەوقی شیعرەوە چ گومان نییە لەوەدا کە دەقەکەی (ئەنجوومەن) گەلێک شیرنتر و شاعیرانەترە. ئەو (لەبەر)ەی سەرەتای دەقەکە شەرحی دیوانەکەی داوەتەوە بەر هەڵسەنگاندنی مەنتیقی و ئەو (عفویەت)ەی دەقی (ئەنجوومەن)ی تێدا نەماوە.

لەلایەکی دیکەشەوە وەک من لە شیعر بگەم کە لێو بە (لەعل) تەشبیه کرا بە عادەت تامی خوێنی لێ دەڤامرێتەوە نەک شەکر: لە لاپەرە ٤٩٥ی شەرحی مەلای بیارەییدا ئەم بەیتەی نالی:

شەفیری چاڵی شۆری هەر دەڵێی لەعلی نەمەک پاشە
حەفیری چاهی وشکی هەر دەڵێی چاهی زەنەخدانە

شەرح دراوە و لەعلی (نەمەک پاش)ی بەو لەعلە داناوە (خوێنی لێ وەشێنراوێ کە کینایەیە لە خۆش و بەتام). لەعل لەوانە نییە بخورێت هەتا بەخوێ تامی خۆش بێت، خۆ کە بە (شەفیری چاڵی شۆر) تەشبیه کراوێ هەر بەجارێ لەوە دەشورێتەوە وەکو سەلاتە خوێی بوێت. ئەوەی من بزانم لە رێی خوێندنەوەی شیعری شاعیرانەوە کە لێوی یاریان بە (لەعلی نەمەکین) تەشبیه کردووە، لەعل بۆ خۆی وەک گەوهەرێکی کان خوێ بە دەورییەوە دەبێت هەر بۆیەیە بە (شەفیری چاڵی شۆر.. سوێر) لێک چوێندراوە، شەفیرەکەش خوێی پێوەیە وەک لەعلەکە. نالی کە هاتووە مەدحی شتە ناخۆشەکانی رێی حەج دەکات هەر یەکێک لەوان بەشتێکی سەربەخۆی دیاری ئێسک سووک دەشوبهێنێ وەک لەم نموونانەدا دەدیترێن:

| | |
|---|---|
| سمالی ئەحمەر | یاقووتی رۆح و ئاگری نەفس |
| حەصاتی ئەبیەض | شوهبی نەجم، رەجمی شەیتان |
| مەگەسدار | چەمەنزار |
| لالەیی حەمرا | جگەری (پرداغ)ی خورشید |
| سونبولی تاتا | سەری سەودای پەرێشان |

شەفیری چاڵی شۆر          لەعلی نمەك پاش

لەمەوە دەردەكەوێ، لەعلی نمەك پاش، واتە خوێ دەركردوو، لەعلی ڕاستەقینەیە و بۆ لای لێو ناچێتەوە، لەعلە وەك شەفیری چاڵە، یان شەفیری چاڵە وەك لەعلە خوێناوین.

نالی دۆستان لەم وەسفەی ڕێی حەج دەتوانن خەبەرێكی نهێنی وەرگرن ڕەنگە بایەخێكی مێژوویی هەبێت. وەك دەبینین وەسفەكە هی بیابانی دەمی هاوینە كە هەمووی قرچەقرچی هەڵهرووكانی بەر هەتاوی سووتێنەری پێوە دیارە. ئینجا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو كاتە تەخمینكراوەی كە نالی تێیدا ئاوارە بووە یەكێك لەو چەند ساڵەی ذوا الحجە تێیاندا كەوتووەتە هاوین دەبێتە ساڵی ئاوارەبوونی. من وەهای بۆ دەچم كە سەفەرەكەی لە تەمووزدا بووبێت نەك هەر لەبەر زێدە گەرمای چەمەندەمی ناو بەیتەكان بەڵكو لەبەر زێدە دەلالەتی ئەم بەیتەیان:

قەتاد و عەرفەج و خیطمی، عەضات و عەوسەج و ئەثلی
چ دامـــەن گـــیـــر و شین و دڵ نشیـــنـــی ڕێی غـــەریـــبـــانـــە

ئەم درەختانە لە ڕەملستانی بیابانی بەر هەتاوی هاوین بە شینی نامێننەوە تا دەگەنە ئاب. یا بڵێم ئەو شینە نابن كە نالی وەها بە ڕاشكاوی وەسفی شینییەكان هەست بكاتەوە. ئنجا ئەگەر لە تەمووزدا ڕێی حەجی بڕی بێت دەبێ چەند مانگێك زووتر لە سلێمانی دەرچوبێت چونكە بێگومان لە ڕێی سووریا و فەلەستینەوە بەرەو حەج ڕۆیبوە. ئەوسا بۆ نالی مەیسەر نەدەبوو لە نەجەف و كەربەلاوە بیابانی بێ ئاوی گەرمای هاوین ببڕێت، خۆ مەعلوومیشە بە كەشتی نەچووە دەنا وەصفی بیابانی نەدەكرد. بە پەراوێز وەها هاتووە كە داستانی ئەسكەندەر و خدری زیندە لە سوورەتی (الكهف)ی قورئان و لە تەوراتیشدا هەیە گۆیا ئەسكەندەری ذولقەرنەین بە دوا ئاوی حەیاتدا گەڕاوە و نەیدۆزیوەتەوە سورەتی (الكهف) باسی ئەسحابولكەهف و مووسا و پیاوچاكەكەی كە دەگوترێ خدری زیندەیە دەكات. باسی بەدوادا گەڕانی ئاوی حەیات لەو سوورەتەدا نییە. ئەم حیكایەتەی سەر بە ئاوی حەیات لە بەیتەكەی شێخ ڕەزا سەری هەڵداوە كە دەڵێ:

دیوانەیە شەخسێ كە بە غەیری لەبی لەعلت
وەك شاهـی سكـەنـدەر طـلـەبـی ئـاوی بـەقـاكـا

کۆتـایـیـی غـەزەلـەکـەش بـە هـەڵـمـیـەکـی زەقـەوە کـە کـێشی شیعرەکـەی تێك داوە هێڵراوەتەوە

سەر دانیٚ لە ڕێیی عەشق (ڕەضـا) لازمە عاشق
بۆ یاریٚ سەر و ماڵی هەمەطی تەری قەضاکا

بەیتەکە لە خۆوە چارە دەکرێت کە لە جیاتی (سەر و ماڵی) بنووسرێت (سەروماڵ). وشەی (عیشق)یش دەبیٚ بچێتە جێی (عەشق)ەوە لە پەراوێزدا (تاب) بە گەرما لێك دراوەتەوە دەبوو بە (تاو) لێك درێتەوە کە یەك شتە لەگەڵ (تاب)دا. تەنانەت (هەتاو) کورتکراوەی (هۆرتاو)ە کوردی خوارووی کەرکووك هەر (خۆرەتاو) بەکار دەهێنن.

لە لاپەڕە ٥٢ میسرەعی دووەمی یەکەم بەیتی مەدحەکەی شێخ ڕەزا بۆ بابان لەنگە چونکە لە جیاتی (نالی بەبە) نووسراوە (نالی بابان). لە پەراوێزدا لیژنە نووسیوەتی، دیـوانـی شێخ ڕەزا، چـاپـی بـەغـدا (نـالـی بـەبـە)ی گـوتـووە. نـاشڵێ بـەیـتـەکـە لـە (ئەنجوومەن)دا لەنگە.

هەر لە پەراوێزی ئەم لاپەڕەیەدا باسی کاوەی ئاسنگەر و کوشتنی (ئەژدەها) و هێنانە سەر تەختی فرەیدوون هاتووە لیژنە هەر ئەوەندە دەڵیٚ کە ڕەچەڵەکێکی درۆ بۆ فرەیدوون هەڵبەستراوە کە بە لای لیژنەوە فرەیدوون بە ئەسڵ کوردە ڕاستییەکەی لـیژنـە دەبوو پتری لەسەر بڕوات. بـەش بـە حـاڵی خۆم چەندێکی توێژینەوەی نوێم لـەبـارەی مێژووی ئێرانـەوە خوێندبێتەوە شتێکم نەدیت لەگەڵ داستـانـی (ضحـاك، ئەژدەهاك) ڕێك بکەوێ، تەنها ئەوە نەبیٚ کە گۆیا (ئەزدیاك)ی دوایین شای مادەکان کوڕی وەزیرێکی خۆی بە نهێنی سەربڕی و گۆشتەکەی دەرخواردی باوکی دا، ئەمەیش لە تۆڵـەی بـیٚ ئـەمری وەزیرەکە بوو کە لە دەمی بەوەڵەدبوونی (کۆڕش) لە کچی (ئەزدیاك) ئەستێرەناسان تەئویلی خەونێکی ئەزدیاکیان بەوە کرد کە ئەم ئەوەیەی دنیا دەگرێت ئەویش لە خۆی ترسا و مەلۆتکەی کۆڕشی بەو وەزیرە سپارد کە لە بیاباندا بیکوژێت، وەزیریش نەیکوشت و بە شوانانی سپارد... تا گەورە دەبێت و ئەزدیاك منداڵی ئێرینەی نابیٚ و هەڤت لەوەدا دەخوات ئیتر وەزیرەکە پێی دەڵیٚ کچەزاکەی بەر حەیاتە و بووەتە گەنجێکی لێهاتوو.. کۆڕیش کچەزای ئەزدیاك و کوڕی پاشای پارس بوو کە ئەوسا پارس سەر بە حاکمایەتیی ئەزدیاکی ماد بوو.. ناوی فرەیدوونیش گۆڕاوی (ثرە ئیتە ئوونە)یە کە دەکاتەوە (ماری سیٚ سەر کوژ) و تارمایی

مارەکانی سەر شانی زوحاکی تێرا دیارە. مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی کە ئەندامی لیژنەیە هەموو مێژووی ئێرانی بە ئەفسانە و تووێژینەوەی نوێیەوە وا لە گیرفانەکانیدایە ئیتر بۆچی بەخیلیمان لەگەڵدا دەکات؟ میسرەعی دووەمینی دوایین بەیتی قەسیدەکەی شێخ ڕەزا لەو لاپەڕەیەدا کە نووسراوە:

ئابای فەریدوون فەڕ و جەمشیدی حەشامتان

دەبوو بنووسری:

ئابایی فەریدوون فەڕ و جەمشید حەشامتان

(فەریدوون فەڕ) و (جەمشید حەشەم) تەرکیبی وەسفین، ئەو (ی)ە ئیزافە بە دوا (جەمشید)ەوە وەك لووی زەق بێ جێیە.

لە لاپەڕە ٥٣ لە میسرەعی دووەمی بەیتی یەکەمدا وشەی (کاکەیێکانی) کە ئیمکان نییە قەیزی بەگ وەهای نووسیبێت، دەبێ بچێتەوە سەر ڕێژەی ڕەسەنی کوردی کە بە ئەسڵ (کاکەییەکانی) بەڵام کورت دەکرێتەوە بۆ (کاکەیەکانی) ناشێ (کاکەیی) ببێتە (کاکەیێ)، ئەم گۆکردنە هی ناوچەی سلێمانییە و پشت لە دەستوورە وەك کە (مەند) دەکرێتە (مەنگ) وەیا ڕۆیشت، ڕۆشت - دەروەست، دەرۆست - لە شەرحەکەی مامۆستا بیارەییدا لە جیاتی (گوێدرێژ) نووسراوە (گوێرێژ) دیتوومە قەرەداغ بووەتە قەراغ... ئەم جۆرە بەکارهێنانە لە نووسیندا جایەز نییە هەرچەندە زۆربەی نووسەران خەڵکی سلێمانیش بن و غەیری ئەوانیش لە ڕێی جوزئەتنەکردنەوە پەیڕەویان لێ بکەن. لە نموونەی بەڵگەدا دەڵێم وشەی (سۆماڵی) لە ڕستەدا دەبێتە (ئەم پیاوە سۆمالییە- نەك سۆماڵیە) کەواتە بە خستنەسەری ئەمرازی (ەکان)ی ناساندنی کۆ دەبێ بڵێین (سۆماڵییەکان) نەك (سۆماڵێکان) چونکە ئەمرازەکە (ەکان)ە نەك (ێکان). هێندە هەیە بەپێی دەستووری کورتکردنەوە دەشێ بنووسرێت و بگوترێت (سۆماڵیەکان) لەوەشدا یەك (ی)ت فڕێداوەوە نەك ئەمرازەکەت شێواندووە. لە جیاتی (ئەمینداریێتی) دەبێ بنووسرێ (ئەمینداریەتی). تۆ دەڵێی (فلانە کەس برسییە -نەك برسێیە) هەر بەو پێیە دەبێ بڵێی (فلان برسییەتی-نەك برسێتی) هەروەها لە جیاتی (برسێتی) بۆ (جوع) دەبێ (برسییەتی) بەکار بێت ئیتر حەز دەکەی بە هەڵە دوو (ی)ەکان لێك جوداکەوە و بنووسە (برسی یەتی). (جودا بکەوە) ڕاستە نەك (جودا بکەرەوە) چونکە ڕێژەی فەرمان لەم کارە (بکە)یە نەك (بکەرە) هەروەك (بدەوە) نەك

(بەمرەوە)، ئێمە دەزانین (لەدان، دانەوە)دا دەنگی (ر) پەیدا نییە وەك بە ئەسڵ لە (گردن) پەیدایە. دەشێ بە رێگەیەك لە رێگەکانی قیاسی زمانیدا لە وشەی (خواردنەوە)دا بۆ فەرمان بڵێین (بخۆرەوە) هەرچەند ناڵێین (دەخۆرمەوە) بەلام کە ویستت بە یەکێك بڵێی بۆ جاری دووەم دەرمانەکە بخوات دەبێ بڵێی (دیسان دەرمانەکەت بخۆوە). لەو جۆرە لێکدانەوەیەدا زمانزان و نووسەر دەبێ زاڵ بێت بەسەر عادەتگرتنی نارەوای ناوچەیی چونکە زمان هی هەموو میللەتە و دەبێ دەستووراتی رەسەن و پەسەندی تێدا بەکار بێت. زاری پارس بووەتە قاڵبی ئەدەبی و رەسمیی زمانی فەرەنسەیی بەلام نەهاتوون کە (ر) دەردەبڕن ئەو (ر)ە بە (غ) بنووسن چونکە خەڵقێکی زۆری فەرەنسە هەر بە (ر) لەکاری دەهێنن.

لە جۆری ئەم بەکارهێنانەی نادروستی (بڕسێتی، کاکەیێکان...) ئەوەیە کە وشەی وەك (سوێر، خوێن، دوێنێ...) دوو دەنگی سەربەخۆ و جودای (وێ) تێیاندا دەکەن بە دیفتۆنگ کە بریتییە لە تێکەڵبوونی هەردوو دەنگ. من لە نووسینی حەفتاکانمدا بە ئیسپاتم گەیاندووە کە (سوێر) و هەرچی وەك ئەو هەیە دیفتۆنگی تێدا نییە شایەدیش شیعری نالییە:

هەر جۆگە وو جێگایە کەوا سوور و سوێر بێ
جێی جۆشەشی گریانی منە خوێ نەرژاوە

جا ئەگەر (سوێر)ت کرد بە دیفتۆنگ بەیتەکە لەنگ دەبێت و لە شیعر دەشۆرێت. ئەمەش بەیتێکی دیکەی نالی بڕوانە لاپەرە ٣٦٨ی شەرحی نالی:

بەزارە لە تۆ ئێستە هەماغوشی عەدوتە
دونیا کە دوێنێ حەرەمی موحتەرەمت بو

وشەی (دوێنێ) بە دیفتۆنگ شیعرەکەی پێ دەمرێت.

لە غەزەلەکەی کوردی، لاپەرە ٥٤ی ئەنجوومەن، دوو جاران (عەشق) هاتووە دەبێ (عیشق) بێت ئیتر لە هەر شوێنێکی دیکەش بیبینێ پێویستە راست بکرێتەوە.

لە بەیتی شەشەمی غەزەلەکە (عەرصە) نووسراوە دەبێ (عەرەصە) بنووسرێت و بخوێندرێتەوە دەنا بەیتەکە لەنگ دەبێ. لەم تەرزە شوێنەدا شاعیر رێی بەخۆی داوە هەندێ وشە بەو جۆرە بخوێنێتەوە کە کێشی شیعر دەکات وەك کە نالی دەڵێ:

بنازم بەم تەجەللایە چ خورشید و بلوورێکە

وشەی (تەجەللا) لە (تەجەللی-تجلّی)یەوە گۆڕاوە وەك كە كورد بەشاعیر و نا شاعیرییەوە دەڵێن (تەمەننا، تەوەللا، تەحەددا..) نالی (تەمەنناى مردنی بێزارە)ی گوتووە.

لە پەراوێزی هەمان لاپەڕە لوژنە بەیتێكی لەنگ و لۆری لە دیوانی كوردی (چاپی بەغدا ١٩٣١)وە هێناوە كە لە دەقەكەی ئەنجوومەندا نییە ئەمەش شكڵنووسی بەیتەكەیە:

وەكو طەیرێكم كە گوم بووبێ لە لانەی
هێلانەواز و هەرداو هەردم ئەمرۆ

میسرەعی یەكەمی بەم دەقە كەڵكی پێوە نییە، ڕەنگە ئەمەی لێرەدا دەینووسم ڕاست بێ:

وەكو طەیرێكی گوم بووبێ لە لانە

دەمێنێتەوە میسرەعی دووەم بەخۆی و وشەی (هێلانە)یەوە كە كێشی تەنەڵ كردووە و لەبار تەهیاتی مەدا لە كوردی تاوەشێتەوە. میسرەعی دووەم دەبێتە (خەبەر)ی میسرەعی یەكەم لە بەیتی یەكەم. بەیتی شەشەمی غەزەلی لاپەڕە ٥٥ وشەی (كۆی) تێدا دەبێ بكرێتە (كۆیی) دەنا كێشی لەنگ دەبێت و لە ڕەونەقی ئەو شیعرە نازك و پڕ سۆزە كەم دەكاتەوە.

لە لاپەڕە ٥٦ (سەرگەشتەو) دەكرێتە (سەرگەشتەوو). بەر لەو، وشەی (بوون)یش دەبێ ببێتە بڕگەیی و بنووسرێ (بوو وون) ئەگەر شاعیر گوتبای (بوونەتە) لە جیاتی (وا بوو وون):

گوللی عالەم بوونەتە سەرگەشتەو و حەیرانی عیشق

میسرعەكە بێ عەیب دەبوو. لە بەیتی سێیەمدا (غەواصان) دەكرێتە (غەوواصان).

میسرەعی یەكەمی بەیتی دووەمی لاپەڕە ٥٧ كە نووسراوە:

شەمس و مەولاناو مەنصوور كەی بە سێر مەحرەم دەبوون

دەبوو بنوسرێ:

شەمس مەولانا و مەنصوور كەی بە سیر مەحرەم دەبوون

(ڕێزە)ش لە میسرەعی دووەمدا (ڕێزە)یە چونكە وشەكە فارسییە.

لە پەراوێزی لاپەرە ٥٨ باسی مەنصووری حەللاج هاتووە. لەناو تویژی سەرگوزشتەی ژیانی گوتەیەکی مەشووری لێ دەگێڕێتەوە (أنا الحق) کە بوو بە هۆی هەڵواسینی. لێرەدا جێی خۆیەتی بڵێم (فریدالدینی عەططار) ئەم دوو بەیتەی لە پاکانەی حەللاج بە من گەیشتووە کە ئەمە دەقە فارسییەکەیتی بە ڕێنووسی کوردی:

دەرنا دەروادی پی ئەیمەن کی ئانجا
درەختی گویەدت نیتی نە ئەڵلا
ڕەوا باشەد ئەنەڵڵا ئەز درەختی
چرا نەبوەد ڕەوا ئەز نیك بەختی

واتە: تۆ بگە وادی ئەیمەن کە لەوێدا درەختێك پێت دەڵێ (أنا الله = أنا الحق) کە (أنا الله) لە درەختێك ڕەوا بێت بۆچی ڕەوا نەبێت لە بەختەوەرێك. وشەی (دەرئا) بە (دەرا) دەخوێندرێتەوە.

لە پەراوێزی لاپەرە ٥٨ وشەی (غوطەوەر) بە قووت خواردوو لە گۆما واتای لێ دراوەتەوە. ئینجا ئەگەر قووت خواردوو بە واتای زاد خواردوو بێت؟ شتێکە من نەمبیستووە. وەك بزانم بە واتای مەلەکەر دێت. لە میسرەعی یەکەمی غەزەلی لاپەرە ٥٩ وشەی (شاهی) لەنگی کردووە دەبێ (شەهی) بێت.

لە پەراوێزدا میسرەعی یەکەمی بەیتی دووەم (تەماشای) دەکرێتە (تەماشایی) لەبەر خاتری کێش لە میسرەعی دووەمیشدا (رم) دەبێ (رمُ) بێت. ئەختێك خوارتر (سەودایی عەشق) دەکرێتە (سەودایی عیشق).

میسرەعی دووەمی بەیتی پێنجەم کە دەڵێ:

سەربەستە بێ بە ویصالت سکەندەری

دوو حەرەکەی کەمە بووەتە ١٢ بڕگەیی لە جیاتی ١٤ ناشزانین چۆن چارەسەر دەکرێت و لێرەش بەلایدا نەچووە. بەیتەکە هەمووی تەماوییە و خۆی بە مەعنایێکی ئاشکراوە بەند ناکات. پێشتریش میسرەعی ئەو بەیتەی (رم-ڕەم)ی تێدایە وەها تەماوی بووە ئنجا ئەگەر لە جیاتی (نیکۆڕەم) بڵێین (نیکۆڕەنگ) و بەیتەکە ئەم دەقەی بدرێتێ:

ئەزدیکە بێ بە من لە تەماشایی نایینە
ئەز بە سکی دیدە مەست و نیکۆ ڕەنگ و دلبەری

واتاکەی چی بەدەستەوە دەدات؟ ئەگەر (ڕەم) مایەوە واتای چییە؟ ئایا مەبەستی

ئەوەیە بڵێ: وەختە ئاوێنە وەك مەی لێ بێ بەتەماشاكردنی تۆ [واتە هەستی بجووڵێ] چونكە یەكجار دیمەمەست و جوانرەنگ و دلبەری؛ لەم مەعنایەدا فەرق پەیدا نابێ ئەگەر یار تەماشای ئاوێنەی كردبێ یان ئاوێنە تەماشاكەر بێت. (نەزدیكە بێ) لە جیاتی (نیزیكە ببێ)یە.

وشەی (لەشكەری) لە كۆتایی غەزەلەكەدا بووەتە (لەشكری):

تۆ شاهی حوسنی بۆ (سالم)ی بێ چارە لەشكەری

كورد دەڵێ لەشكر، فارس دەڵێ لەشكەر كە هاوەمۆسیقا و هاوڕەوییەی قافییەكانی سەرلەبەری غەزەلەكەیە. دەبینین گوتی (شاهی حوسنی) نەك (شای حوسنی)... پێشتر گوتی (نەزدیكە) نەك (نیزیكە) خۆ كێشی شیعریشی پێ تێك نەدەچوو:

لە لاپەرە ٦٠ وشەی (طورە)ی كۆتایی میسرەعی یەكەمی غەزەلەكە دەبێ (طوررە) بێت.

میسرەعی كۆتایی غەزەلەكە كە دەڵێ (هەر چ خەیاڵی من هەیە دەیڵێم و وە بەرتەری) لە شیعر شۆراوە بووەتە قسەی بازاڕی، دەبێ بنووسرێت:

هەرچی خەیاڵی من هەیە دەیڵێم وەبەر تەرێ

یاخود:

هەرچی خەیاڵی من هەیە دەیڵێم و بەرتەری

لە پەراوێزی لاپەرە ٦١دا (جیهان ئارا) بە (جیهان ڕازێنەرەوە) لێك دراوەتەوە، ئەم ڕێژەیەی وەك (ڕازێنەرەوە) پێشتر قسەی لێ كرا كە گوتمان لە ناوی كاری داڕێژراو و لێكدراو نابێ سەرلەبەری كەرتی فاعیل لە فیعلەكەوە بۆ ئەو تەرزە وشانە بەشدار بێن، لە نموونەدا دەڵێم كە (گوشەر) بە واتای (عصارە) بوو ناشێ بڵێین (یان گوشەر) دەبێ (بان گوش) بەكار بهێنین. دەڵێین (نانخۆر، پیاوكوژ...) نەك (نانخۆرەر، پیاوكوژەر). لە كاری ڕازاندنەوەشدا دەڵێین (ڕازێنەر، ڕازێنەرەوە) مادەم بە سادەیی لەكار بێت بەڵام ئەویش لە شكڵی فاعیلی داڕێژراو و لێكدراودا دەبێتە (جیهان ڕازێن، جیهان ڕازێنەوە). من گوێبیستی هەردوو ڕێژەی وەك (ڕازێن، ڕازێنەوە) بووم بەڵام بە زۆری شكڵە كورتەكەی بەكار هاتووە لە نموونەدا، كابرایەك قەرز ئەداتەوە پێی گوتراوە (قەرزنەمر). دەڵێن (ڕەحمەت لە ناوخۆر) هەرچەند ڕێژەكە لەگەڵ (نانخۆر)یش تێكەڵ دەبێت. پەتێكی وڵاغی پێ ببەسترێتەوە (پەتی وڵاغ بەست)ی لێ خۆش دێت نەك (وڵاغ

بەستەوە). بەهەمەحاڵ هەردوو ڕیزە دەستووریین هەرچەند کورتترەکە هاراوتریش و ئێستا سووکتریشە. ئەمما ببڕای ببڕای (جیهان ڕازێنەرەوە) و هی وەک ئەو لە کار نایەن مەگەر لە حاڵەتی زۆرە دەگمەن ئەبێ وەک ئەم حاڵەتەی هەر ئێستا ڕوونی دەکەمەوە دەزانین (ڕەز بڕینەوە و مەڕ بڕینەوە) لە کەسب و کاری ڕەزداری و مەڕداریدا ساڵی جارێک لە کۆی خۆیدا دەردێت.

کەسێکی ڕەز دەبڕێتەوە پێی دەڵێن (ڕەزبڕ) هەرچی مەڕ دەبڕێتەوە (مەڕبڕەوە)ی بۆ بەکار دێت. ئەم مامڵەت جوداییە لەوەوە هاتووە کە لە (ڕەز بڕیندا) لکی مێوەکان لە مێوەکان دەبڕینەوە و بەشێکی زیندەڵی بەرهەمهێنی دار مێوەکەن. هەرچی خوری‌یە ئەو بەشە زیندەڵە و بەرهەمهێنە نییە وەک گۆشت و ئێسک و دەست و قا. لکە مێوەکەی دەبڕدرێت و ئەوەی نابڕدرێت وەکو یەکن لەلایەن ئەکوینی دارەکەوە هەر ئەوەندە فەرق هەیە یەکیان بە قوربانی ئەوی دیکە دەکرێت. لەو تەرزە حاڵانەدا ناخێوەری کورد بە سەلیقە ڕەفتاری زیرەکانەی کردووە ئەمما پێویستە شارەزای زمان بە دوا ئەو تەرزە وشانەدا بگەڕێت و جودایان بکاتەوە نەتر لە ژێر هەر یەند و بابێکی زمان بێت. وەها دەبێ لەبەر تەنگانەی بێ دەرفەتی لە ئازادیی تەعبیر یەک ڕیزەی فیعل بۆ دوو واتای لێک جودا بەکار هاتووە لە نموونەدا دەڵێین. ناز و دارا مارەبڕی یەکدین- دەشگوترێ مارەبڕاوی یەکدین. دەشڵێین: مەلای مارەبڕ تەشریفی هێنا. ئنجا لێرەدا بەکارهێنانێکی زمانی ڕێزمانی هەیە هەتا بڵێی ورد و قووڵە. دەڵێین. ناز و دارا مارەبڕاوی یەکترن و مارەبڕی مەلا حەسەنن... ناگوترێ مارەبڕاوی مەلا حەسەنن... بەبەخشن لەم درێژە پێدانە هەرچەند باسەکە زۆری بە بەرەوە ماوە تەنها ئەوەندە دەخەمە سەر قسەکانم کە بڵێم ئێمە دوای ئەوەی وشەی (بزوێن)مان هەڵبژارد و پەسندیشمان کرد بۆچی پەرە بە دەستورەکە نەدەین لە هەموو ئەو کارانەی وەک ئەمیان کە بەهۆی (اندن)ەوە بوونەتە تێپەڕ؟ بۆچی نەڵێین: لکێن، هەژێن، سووڕێن، سووتێن، پسێن، ڕفێن...؟ چییان لە بزوێن کەمە ئەوە نەبێ لەو کورتترن کە دەزانین بزوێن لە بزواندنەوە هاتووە کە وەک برژاندن برگەیەکی لەو چەند فیعلە زیادترە. بزاوتن بزێوی‌یی لێ کەوتووەتەوە وێڕای یەک ڕیزەی دەگمەنی دیکەش کە بریتی‌یە لە (بزۆز) کە چەند تاکێکی وەک خۆی شک دەبەم: (کولۆڵ، فسۆس، شبۆر.[نەک شڕۆڵ]) هەرچی ڕیزەی (شڕۆڵ)ە بریتی‌یە لە (شڕ+ۆڵ). بگەڕێیتەوە بۆ لاپەڕە ٢٢٠-٢٢٢ی (زاراوەسازیی پێوانە)، دەبینی لە (شل) وشەی (شلۆڵ) و لە (کەرت) وشەی (کەرتۆڵ)م

پێشنیاز کردووە (شلۆڵ) بۆ کەسێك کە هەمیشە خاووخلیسك بێ. (کەرتۆڵ) بۆ شتێك بێت کەرت کەرت و بڕ بڕ بێ بەڵام بەیەکدییەوە نووساو بن وەك (بڕبڕەی پشت، هەندێ زنجیری سەعات، هەندێ جۆرە بازن و گەردانە..) زنجیری دەبێتە کەرتۆڵە...

لە لاپەڕە ٦٣ی ئەنجوومەن چەند تێبینی هەیە. میسرەعی دووەمی بەیتی دووەمی غەزەلەکەی سالم دەبێ وشەی (نیشتەر) بە سێ بڕگەیی بخوێندرێتەوە (نی ش تەر) بەقورسکردنی دەنگی (ش) تێیدا دەنا لەنگ دەبێ. میسرەعی دووەمی بەیتی سێیەم (تەرازوویی) نەك (تەرازووی) دەخوێندرێتەوە هەر لەبەر کێش. لە میسرەعی یەکەمیش (بۆ سەوو) نەك (بۆسە) دەست دەدات. لە پەراوێزدا میسرەعی یەکەمی بەیتی سێیەم کە دەڵێ:

ومصلّی ئەکسیرە وەلێ زەحمەتە

دەبێ (ئیکسیر) بنووسرێت. میسرەعەکە یەك بڕگەشی کەمە. لە جیاتی ١١ بڕگە ١٠ بڕگەی هەیە. ئاشکرایە لە کۆتاییدا وشەیەکی بڕگەیی پەڕیوە وە یاخود وشەیەکی درێژتر لە (زەحمەتە) هەبووە لە نووسینەوەدا گۆڕاوە.

لە پەراوێزی لاپەڕە ٦٤ لیژنە بۆ واتای غەزەلەکەی نالی (لە دوگمەی سینە..) حەواڵەمان دەکاتەوە بۆ شەرحەکەی مامۆستای بیارەیی. دەبێ بڵێم بە ڕێکەوت یا هەر چۆنێك بێ من یەکەم کەس بووم کە لە تەلەفزیۆنی کوردی لە ساڵێکی حەفتاکاندا واتای ئەم غەزەلەم لێك داوە بەجۆرێك دەرم خست وشەی (دوێنێ) لە دەستەواژەی (دوێنێ نوێژی شێوان)دا بۆ پڕکردنەوەی میسرەعی شیعر نەهاتووە. ئەم (دوێنێ)یە هەردوو واتای (هەڵات) بە فیرارکردن و دەرکەوتنیش بەدەستەوە دەدات.

لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان
بــەیــانــی دا سفــیــدەی بــاغــی سێوان
لە خەوفی طلعەتت ڕۆژ هەر وەکو شێت
بــەڕووزەردی هــەڵات و کــەوتــە کـێوان

لەلایەن واتای فیرارکردنەوە دوێنێ نوێژی شێوان لە دوگمەی سینەتەوە، سفیدەی باغی سێوان بەیانی دا. لە ترسی ئەو طلعەتە ڕۆژ بەڕووزەردی هەڵات و کەوتە کێوان بەرەو ئاوابوون.

بۆ واتای دەرکەوتن. دوێنێ نوێژی شێوان ڕۆژ لە دوگمەی سینەتەوە دیتی سفیدەی

باغی سێوان بەیانی دا، ئەمڕۆ سبەینەکە دەرکەوت زەردایی ترسی دوێنێی پێوە دیار بوو کە وەکو شێت کەوتە گێژان. لەطاقەتێکی شرایەوەش لەوەدایە کە باغی سێوان (بەیان) بدا واتاکەی ئەوەش هەڵدەگرێ وشەی (بەیان) بریتی بێ لە گۆی وشەی (بەی - بەهێ)، بەو پێیە مەمکەکانی یار بە سێو و بە بەهێش تەشبیه کراون. دوای ئەم واتا لێدانەوەیە چەند ڕۆژێکی پێ چوو نامەیەك لە مامۆستا مستەفا سالح کەریمەوە هات (وەك لە بیرمە) خۆشامەدیی لەو واتا لێدانەوەیە دەکرد.

لە لاپەڕە ٦٥ بەیتی پێنجەمی مەدحەکەی (تاقمی مومتازی شاه) بۆ میسرەعی دووەم دەقێکم دیتووە لە کۆنەوە لە جیاتی (ئەلطاف) وشەی (ئەنوار)ی نووسیوە:

صەحرا بە تەجەللی دەکەنە وادیی ئەیمەن
قامەت شەجەر و مەظهەری ئەنواری نیلاهن

لە دیوانی نالی چاپی عەلی موقبیل و گیوی موکریانیش (ئەنوار) هاتووە. جوانی و لەباریی وشەی (ئەنوار) کە هەم بەواتای جەمعی (نوور - ڕووناکی) و جەمعی (نوور- نەور- غونچە) لێ دەدرێتەوە، لەوەوە دێت ئەگەر (نور) بەواتای ڕووناکی وەرگیرێن دەزانین (وادی ئەیمەن) لە طوور ڕووناکیی لێ بوو لە درەختێکەوە هەڵدەستایەوە. کەواتە ئەو تاقمە مومتازە کە تەجەللی بکەن و خۆیان دەرخەن سەحرای بێ دار و سەوزایی دەکەنە ئەو وادییە ئەیمەنە نوورانییە. کە (نوور) بەواتای (غونچە) وەرگرین ئەوسا تاقمە مومتازەکە کە قامەت شەجەرن هەم حەقیانە دنیا بە تەجەللی بکەنە وادیی ئەیمەنی خاوەن درەخت و هەم دەشبنە دیارگەی (غونچە)ی خودایی کە بەو قامەت شەجەرانەوەیە و بەدرەختەکەی وادی ئەیمەنیشەوە هەیە. وشەی (تەجەللی) ئیشارەتە بۆ ئایەتی (فلما تجلی للجبل...) کە لە وادی ئەیمەنی بوو.

لەو لاپەڕەیەدا بەیتی حەفتەمی مەدحەکە بەپێی دەقی (ئەنجوومەن) بەوشەی (لایق بە بەدەن) دەست پێ دەکات. لە پەراوێزی ژمارە ٤دا ئیشارەت هەیە کە دەقی شەرحەکەی مەلای بیارەیی بە (لالەن بە بەدەن) دەست پێ دەکات. بێگومان دەقی شەرحەکە پەسەندترە.

لالەن بە بەدەن ئەطلەسی ئەخضەر کە لەبەرکەن
ئەورستە گوڵن، بەستە لەگەڵ دەستە گیاهن

ئەو ئەورەستە گوڵ ئەو لالە بەدەنانە دەگرێتەوە. ئەگەر (لایق بە بەدەن) بێت دەبێ

ئێمە لە خۆمانەوە پارمەتیی شیعرەکە بدەین و بڵێین مادەم بە تەورەستە گوڵ تەشبیھ کران لەخۆوە بەبێ دڕکاندن بەدەمیان دەبێتە گوڵ. (لایق)یش جێی خۆی دەکاتەوە بەوەدا کە ئەطلەسی سەوز بە بالاپانەوە وەک ئەو گیایە سەوزەیە لەگەڵ دەستەگوڵ بەستراون.

لە ئەنجوومەندا مەدحەکە (٨) بەیتە، لە شەرحی مامۆستادا (١١)یە. لەمیاندا نازناوی (نالی) دوو جاران ھاتووە. لە ئەنجوومەندا بەیتی تێدا نییە بە نازناوەوە لە پەراوێزی لاپەڕ (٣٤٥)ی شەرحەکەدا ئەم دیاردەیە نامەئلووفە و (ئالۆزییەک لە داوێنی ئەم پارچە شیعرەوە ھەیە ئێمە سەرمان لێ دەرنەکرد – بە تەعبیری شەرحەکە خۆی) بە ئینسافەوە دانی پێدا ھێنراوە لێرەدا پێویستە بڵێم دواپین بەیتی ناو شەرحەکە کە بۆ جاری دووەم نازناوی شاعیر دەھێنێتەوە ھی ئەوە نییە بە ئەزمی نالی وەیا ھەر شاعیرێکی لێوەشاوەی دیکە دابندرێ.

«نالی»! بە خودا حەیفە دەرەنجێنی دڵی خۆت

ئەم طاقمە مەخصوصە ھەموو صاحیبی جاھن

دڵ ڕەنجاندنی چی؟ ھەر چونکە طاقمەکە صاحیبی جاھن دەبێ دڵی شاعیر لە جیاتی گەشە بکات بڕەنجێ؟ من وای بۆ دەچم، کابرایەکی نیمچە شاعیر ھاتووە وشەکانی قافیەی دە بەیتی قەسیدەکەی ڕیز کردووە کە بریتین لە: شاھ، سوپاھ، ماھ، کولاھ، نیگاھ، نیلاھ، سیاھ، گیاھ گوناھ، ڕاھ، ناھ و سەرجومڵەیان پازدەیە بەعزی ئەوەوە کە دوو وشەی قافیەی بەیتی یەکەم ژمارەکە لە دەوە بە پازدە دەگەیەنێ. ئیتر بەدڵی داھاتووە وشەی (جاھ) لەو بەیتەدا مەغدوورە و لە بیر کراوە، بە خێری خۆی ڕوو لە نالی دەکات و بە جۆرێک کە بۆی لواوە بەیتی پازدەمین قەتار دەکات و وشەی (جاھ) بەھاشەڵپیەوە. ئێمە ھەر بۆیە لە نالی دەسەلمێنین کە سەرەتای بەیتی نۆیەم (بۆ سەیری) بێت و سەرەتای بەیتی دەیەم (بۆ زوڵف) بێت چونکە ھاتووە شاعیرانە لە پێشدان تەنھا (صوفی) ھێناوێن لە ططەبدا بێ سەیری سەر و قەدان بکەن. ئەمجار بۆ (زوڵف و ڕوخ و ئەبرووی وەک زوڵفی سیاتان) پەراوێزی مەفتوونانی لێک کێشاوەتەوە تا (عالەم وەکو نالی ھەموو...) بکەونە جەزی بەیتەکەوە نەک ھەر صۆفی... لەمە زیاتر داوا لە شاعیر ناکرێت

بەداخەوە لێژنە لە پەراوێزی لاپەراوێزی لاپەڕە ٦٦ کە لە ئاست میسرەعی یەکەمی ناو پەراوێزەکە ئەمەیە:

تەنهایبی سەمەن بەرگی بەنەوشە کە لەبەر کەن دەڵێ: (تەنهای) ڕاستترە گۆیا (تەنها) کۆی (تەن)ە، بەو پێیە دەبێ بەلای لێژنەوە (تەنهایی) بە (تەنهایی) لێك درابێتەوە لەوەشدا لێژنە بە سەهوو چووە چونکە لە (تەنهایبی سەمەن) هەمان کۆی (تەنها) مەبەستە بەڵام لەبەر کێشی شیعر دەبێ ئەو (ی)ە کەسرەی بدرێتێ، لەوەشدا نالی پێڕەوی یەك لە جەوازاتی هەڵبەستی کوردیی کردووە، چ تێرکردنی (ی) ئیزافە و وەسف بێت و چ تێرکردنی (و)ی عطف بێت بۆ کێشی شیعر مامڵەتی ڕەوا حیساب دەکرێت وەك کە لە کۆتایی مەدحەکەی ناو شەرحی مامۆستادا نووسراوە.

بۆ زوڵف و ڕوخ و ئەبرووی چوون زوڵفی سیاتان
عالەم وەکو نالی هەموو با نالەوو شاهن

جارێکیان (ئەبروی) بە (ئەبرووی) هات جارێکیشیان (نالەوناه) بە (نالەوو ناه) هات ئەگەر (ئەبرووی) بە دوو بڕگەیی بخوێندرێتەوە بەیتەکە لەنگ دەبێت. هەروەهاش (نالەو) لەجیاتی (نالەوو) بەیتەکە لەنگ دەکات. نالی خۆی لە بەیتێکی غەزەلێکیدا دەڵێ:

بەلا گەردانی باڵات بم ئەگەر چووم
فیدای هیندوویی خاڵت بم ئەگەر مام

دەبینی (ی)ی (هیندوویی) تێر کردووە لەبەر کێشی شیعر، نەیگوت (هیندووی). هەڵبەت (تەنهایی)ش هەر لەو بوارەوە هاتووە و جێی ئیشکال نییە. سەیرێکی لاپەڕە (٢٥٩)ی شەرحی دیوانی نالی بکە دەبینی لە میسرەعی دووەمی بەیتی دووەمدا نووسراوە:

با بای دەدات و ماسیی پێدا دێ وەك مەکووك

تا لەم دەقەدا سێ (ی) کەوتوونەتە دوای یەکتر و دەخوێندرێنەوە (ماسیی پێدا دێ) ئەویش لەبەر کێشی شیعر کە من ئەم دەقە بەڕاست نازانم، ڕاستیی بەیتەکە ئەمەیە: با بای دەدات و ماسی پیپا دێ وەکوو مەکووك، حەز دەکەی لەبەر دەستووری ڕێنووسی تازە بنووسە (ماسیی) کە لە گۆکردندا ئەو (ی)ەی دووەم دەرناکەوێ. نالی لە زۆر شوێندا (تیا و پیپا)ی لە جێی (تێدا و پێدا) بەکار هێناوە لە لاپەڕە ٦٧دا دێڕە شیعری پێنجەم کە سەرەتای (بۆتە شاطی)یە من لە دەستخەتی مەرحووم (نهانی) کە نازناوی شێخ محیەدین شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی کۆیەیە و خاڵی مامە دیتوومە

نووسیوەتی (گەشتگاهی) لە جیاتی (بۆنە شاطی) ناو ئەنجوومەن و (بۆنەنشینگەی) ناو شەرحی مامۆستا بیارەیی. هەرچەند بریاردان بە جۆرێکی متمانەبەخش لەسەر هەلاواردنی یەکێك لەو سێیانە کارێکی نەکردەنییە بەڵام بێگومان لەلایەن چەژی شیعرەوە چی (نهانی) نووسیوەتی لەبارترو سازگارتر و شاعیرانەترە نهانی ئەگەر بۆی لوابایە خەریکی شاعیرییەت بێ لە جیاتی (تشێع) تا بڵێی جێی نومێدی (ابداع)ی لێ دەکرا، زۆریش نالی دۆست بوو، لە نموونەدا ئەم مەقتەعەی تەخمیسی ئەو بەسەر شیعری نالییەوە دەهێنمەوە:

بێزار مەبە لێم من سوبەری تیری عەدووتم
بۆ شەمعی جەمالت وەك پەروانە لە دووتم
بۆ ئاگری سەر گۆنە بە سەد گۆنە دەسووتم
هەر چەندە کە ڕووتم بەخودا ماتیلی ڕووتم
بێ بەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە

جوانیی تەخمیسەکە دەچێتە ڕیزی تەخمیسەکەی شێخ ڕەزا بەسەر غەزەلی کوردی:

دڵی بردم بە ناز و عیشوە دیسان شوخی عەییاری
فریبی دام بە چاوی مەستی خۆی مەخموری سەححاری
لە هیجرانی تەقم کرد ئەی ڕەفیقان کوا مەدەدکاری
ئەمان مردم عەلاجێ سالە ڕێی پێغەمبەرا چاری
ویصال یا قەتل یا تەسکین لە هەرسێ بۆم بکەن کاری

قەسیدەکەی شێخ ڕەزا (ڕووم کردە بەزمی خاصی...) کە دەقەکەی لە لاپەڕە ۷۰ی ئەنجوومەن هاتووە و دوو بەیتیشی لە (دیوانەکەی شێخ ڕەزا، چاپی بەغدا ۱۹٤٦)وە بە زیادەوەی خراوەتە سەر، ئا لە بەیتی دووەم کە کەوتووەتە سەرەتای لاپەڕە ۷۱ تێبینییەکی گرینگ هەیە، ئەم بەیتە لەو جێگەیەدا بە مۆلانەتیش جێی نابێتەوە دەبێ بچێتە دوای بەیتی چوارەمی (ئەنجوومەن) کە دەڵێ:

پێم گوت منم فلانە کەسم مامە شێخ ڕەزام
بیلمەزمین میسن تەفەندی مگر بزی

دوای ئەمە ئەم خەمیس ئەفەندییە ئەمجا بە کوردی هاتە تەکەللوم وتی

بەڵێ

هەوەڵ جار خەمیس ئەفەندی بە تورکی لێی پرسی (کیم بلیر سزی؟ کی تۆ دەناسێت؟)

لە لاپەڕە ٧٥، میسرەعی یەکەمی بەیتی چوارەم (سەرم سەمتورە و) دەبێ بکرێتە (سەرم سەمتوورو) دەنا لەنگ دەبێت. وا دەزانم (کوردی) ئەم غەزەلەی (دەروون زامدار و دڵ غەمگینە بێ تۆ)ی بەسەرهێنی گوتووە چونکە قورتی تێدان و لە کوردی ناوەشێتەوە.

لە بەیتی یەکەمی لاپەڕە ٧٦ (باو بارینە) ڕاستە نەك (بار بارانە) چونکە لەگەڵ قافیە و ڕەویەی بەیتەکانی دیکە ڕێك دێت: (ڕەنگینە، ئەسرینە، پەرژینە، ئامینە) هەموو بەیتەکانی دیکەی لاپەڕەی پێشووتریش وەك غەمگینە، بێ تینە، بالینە، ئالێنە... هتد هەروەهان ڕیزپەڕیان تێدا نییە.

لە لاپەڕە ٧٧، پەراوێزی یەکەمدا وشەی (نەقمە) ڕاستە نەك (نەغمە) کە لە دیوانی سالم، چاپی بەغدا ١٩٣٣ بە هەڵە وەها نووسراوە. لیژنەش ئیشارەتی بۆ ئەم لایەنە کردووە. خۆزی لە هەموو شوێنێ وەهادا ئەمەی کردبایە. بەلام نەدەبوو بڵێ (ڕاسترە) چونکە نەغمە هەڵەی رووتە، چون قسە لەگەڵ زوڵفە! لە کۆتایی پەراوێزدا وشەی (سێزە) هەڵەیە (سیرە) ڕاستە.

سەیر ئەوەیە، پەراوێزی ژمارە (٢) دەڵێ وشەی (من) کە لە پێش وشەی (تەشبیهی) هاتووە هەڵەیە کەچی ئەو وشەیە پەیدا نییە و میسرەعەکەی بێ عەیبە.

لە لاپەڕە ٧٨ میسرەعی یەکەم کە نووسراوە:

دەبێ ئەشکی تەراوزی ئارەزوو ئەی دیدە بڕژێنی

وشەی (تەراوز) هەم کێشی لەنگ کردووە و هەم پەکی واتاشی خستووە، لیژنەش لێی بێ دەنگە. وشەیەك هەیە (تەراوز) وا بزانم لەبەر پێوەندیی بە تەڕاییەوە بەو کێڵگەیە دەڵێن دوای بارانی پەڵە بکێڵرێت و تۆو بدرێت. تەرمشقۆ، تەڕمزەن، ئەڕازو هەمووی هەر بەچکەی تەڕایین. ئینجا زۆر بە تەقیە و دوودڵییەوە دەڵێم تۆ بڵێی ئەم تەراوزە ئەبێ لە بەیتەکەدا؟

دەبێ ئەشکی تەراوزی ئارەزوو بشکێنی ئەی دیدە

میسرەعی یەکەمی بەیتی چوارەمی غەزەلەکە یەك برگەی کەمە، ئەمە دەقەکەتی

ڕەها بێ گەر لە بەندی زوڵفی یارا گەردەنی من [گەردەن و شانم. گەردەنی بەندم!]

میسرەعی دووەمیشی تێیدا (بەعدە نەزین) برگەیەکی لە کێشی شیعرەکە زیاد کردووە، یا دەبێ بنووسرێ (بەعدە زین) یان (بەعد نەزین) و دەنگی هەمزەی تێدا سووك دەربپرێت.

لە لاپەڕە ۷۹ وشەی (مەحەبەت) دەبێ (مەحەببەت) بخوێندرێتەوە لەبەر کێش. هەر لەو قەسیدەیەدا. (گیسوی گێسوویی-مەحەلی: مەحەللی موعەطەمەتر: موعەططەمتر) کێشی بەیتەکان ڕاست دەکەنەوە هەر جارە بەزیادبوونی برگەیەك لەو وشانەدا.

لە لاپەڕە ۸۳، بەیتی حەفتەمی غەزەلەکەی نالی من لە دەستنووسی کەشکۆڵاندا دیتوومە:

هەموو ڕۆژم لە تاو هیجرانی ئەمساڵ

ئەمەننای مردنی پێزارە بێ تۆ

دەقی (ئەنجوومەن) ئەمەیە:

هەموو ڕۆژێ لە تاو هیجرانی ئەمساڵ

ئەمەننام مردنی پەژارە بێ تۆ

دەقی شەرحی مامۆستای بیارەیی ئەمەیە:

هەموو ڕۆژێ لە تاو هیجرانی ئەمساڵ

ئەمەننای مردنی پێزارە بێ تۆ

فەرق لە نێوان دەقی کەشکۆڵەکان لەگەڵ ئەم دوو دەقە لەوەدایە کە (ئەمەننای مردن) لە دەقی یەکەمدا بەدرێژایی هەموو ڕۆژێکە. بەڵام (هەموو ڕۆژێ) بەتەنها (یەك ئەمەننا) لە ڕۆژێکدا دەگەیەنێت. نالی وردکارە، بەلای چاوەڕوانکردنی بینەر و خوێنەر و بیسەرەوە قووڵ دەبێتەوە. نموونەیەکی زۆر سادەی ئەم قووڵی و وردییە لەم بەیتەدا دەدیترێت کە دەڵێ:

بەمەرگی تۆ قەسەم، زاهید، هەموو عومرت عوبوورێکە

مەقام و مەنزڵت ئاخر لە کن جەمعی قبوورێکە

نالی بەخۆڕایی سوێند بەمەرگی زاهید ناخوات، لە هیچیش نەهاتووە (عبوورێکە) بە (مفرد-تاك) ئەدا بکات و (قبوورێکە)ش بە (جمع-کۆ) ئەدا بکات. لەلایەن

سوێندخواردنی بەمەرگی زاهید، نالی پێمان دەڵێت و بەزاهیدیش دەڵێت: بەمەرگت عومرت دەبێتە عبوورێك. لێرەدا (بەمەرگی تو) هەم سوێندە و هەم سەبەبی عبووربوونی عومرە. ئەگەر بیگوتبایە بەخوا و پێغەمبەر و بەنازانم چی عومرت عبوورێکە قسەیەکی عادەتی دەردەچوو لە زاری هەموو کەسەوە، ڕۆژانە هەزاران دەردەچێت. عبوورەکەش یەك عبوورە و بێ ئەهمییەتە. بەڵام دوای مەرگ جێگەی عبوورکردو دەبێتە جەماعەتی قبوور واتە کۆمەڵەی مردووان کە زۆرن. (جمعی قبوور) یاتەویاتیش ڕێژەی کۆیە بۆ وشەی (قبر) ئنجا سەیر نییە من لە نالی چاوەڕوان بکەم بڵێ (هەموو ڕۆژم ..) نەك هەموو ڕۆژی.

دەقەکەی شەرحی مامۆستا (ئەمەنناى) تێدا هاتووە لە جیاتی (ئەمەننام) کەچی هەموو بەیتەکانی پێشووتر ڕوویان لە نالییە و ڕاناوی کەسی یەکەمی تاکیان تێدا بەکار هاتووە.

ئەو دەقەی من پەسەندی دەکەم لە سەرەتاکەیدا وشەی (ڕۆژم) دراوەتە ڕاناوی کەسی یەکەم.

لەوە بەولا (ئەمەنناى) دەبێتە مضاف بۆ (مردن) وەك کە دەڵێی (هەموو کاتم دوعای بەرزێتە ..)

لە لاپەڕە ٨٥دا میسرەعی یەکەمی بەیتی چوارەم بڕگەیەکی زیادە کە دەڵێ:

تیپی شکۆفە خەیمەیی هەڵداوە لە هەر طەرەف.

لە شەرحەکەی مامۆستا بهارییدا بەیتەکە کێشی تەواوە، ئەمەش دەقەکەی:

تیپی شکۆفە خەیمەیی هەڵداوە لە هەر طەرەف

دەقەکەی ئەنجوومەن بەوە چارە دەکرێ یان بگوترێ (هەڵدا) لە جیاتی (هەڵداوە) یان ئەو (لە هەر)ە بکرێتە (هەر). ڕەخنەیەك لەم (هەر)ە بگیرێت لەلایەن تەواوی واتای میسرەعەکەوە بەنامەی ئەوەی دەبێ بگوترێ (هەڵداوە لە هەر طەرەف) نەك (هەر طەرەف)، ئەوسا عەینی ڕەخنە لە دەقەکەی شەرحی مامۆستاش دەگیرێ کە دەبوو بڵێ (خەیمەیی هەڵداوە) نەك (خەیمەیی داوە). ڕاستییەکەی لەلایەن واتاوە بەیتی جەولزاتی شیعر هەردوو دەق ڕەوان ئەنانەت (خەیمەیی داوە) جوانییەکی شرابەوەشی تێدایە کە خیوەت و ڕەشماڵ هەمووی (داو)ی چێنراوە من لە بەیتی دووەمی ئەم پارچە شیعرە مەعنایەکی زێدە ناسك و قووڵ دێتە بەر هەستمەوە وابزانم نالی دۆستان بۆی

نەچوون. بەیتەکە ئەمەیە:

لـەم وەعدە خۆشەدا گوڵ و گوڵ چـیـهرە تـێکـەڵن
یەك ڕەنگ و موتتەحید بەدڵ ئەمما بەتەن جوێ

شوێنی سەختی بەیتەکە لەوەدایە چۆناوچۆنی (موتتەحید بەدڵ) لەم دەقەدا جێی خۆی دەکاتەوە. دەزانین گوڵ و گوڵ چیهرە کە تێکەڵن، لەلایەن جوانییەوە (یەك ڕەنگن) بەڵام یەکەش جودان، ئەی بەچی و لە چیدا (موتتەحیدن)؟ ئیتیحادەکەیان لە وشەی (گوڵ چیهرە) پەیدایە کە وەسفێکی تەرکیبییە بەواتای جوانێکی ڕووی وەکو گوڵ بێت، تا ئەم وەسفە تەرکیبییە کە لە (گوڵ) و (چیهرە) پەیدا بووە وەها دەکات گوڵ خزابێتە ناو وشەکەوە بەو پێیە (گوڵ چیهرە) کیژی جوانە و (گوڵ)یش وا لە تەرکیبیدایە و بەیەکەوە (موتتەحیدن) کە موتتەحیدیش بوون یەك دڵیان دەبێت. هەر ئەم مەعنایەشە، بێ ئەوەی هەموو کەس بۆی بچێت، تێکەڵبوونی گوڵ و گوڵ چیهرە خەستتر دەکاتەوە ... ئەم (استخدام)ەی لێرەدا نالی بەکاری هێناوە یەکێکە لە شاکارە هەرە بەرزەکانی ئەم بلیمەتە بێ ڕەزایە. گوڵ و گوڵ چیهرە وا لە دەشت و دەر تێکەڵ بوون، تێکەڵبوونیش یەکجار بەولای جیرانەتییەوە نزیکی لە یەکتر دەبەخشێ، بگرە لەوە پتر لێکتر نزیکبوون هەر پەیدا نییە مەگەر لە تەفاعولی کیمیاییدا، کەچی نالی لە وشەی (گوڵ چیهرە)دا ئەو نزیکییەی گەیاندە (ئیتتیحاد) کە ئیتر یەك ڕەنگا و موتتەحیدبوون بەدڵ دەبێتە تەحسیل حاسل..

لە شەرحەکەی مامۆستادا وای هێناوەتەوە کە گوڵ یاری بولبولە نازدارانیش یاری دڵدارانیانن (لەبارەی دەروونەوە هەموو لەیەك دەچن و بنیادەم ناتوانێ لەیەکیان جیا بکاتەوە) گۆیا ئەمە سیرڕی (موتتەحیدبوون بەدڵ) بەدەستەوە دەدات. ئەو واتایە بولبول و دڵدارەکان لە خەیاڵەوە دەهێنێت و دەیکاتە بەخشیش بۆ شیعرەکە هەتا واتاکە ڕابگەیەنێ کەچی بەم حاڵەتەشەوە ئەوەی دەینە (موتتەحید بەدڵ) گوڵ و نازدارەکان نین یەکۆ بولبول و دڵدارەکانن چونکە ئەوان لە هەستی عیشقدا موتتەحید بەدڵن، گوڵی بەسەرزمان لە کوێ و ئەم هەموو لێبارکردنەی هەست و سۆز لە کوێ، لە حاڵێکدا بولبول بەناسوودەیی ماوەتەوە. لە لاپەڕە ٨٦ی ئەنجوومەندا، دێڕی پێنجەم (بـە ضـەربـە و حـەملـەیی) تێدا هـاتووە ڕاستییـەکـەی (بـەضـەربـەی حـەملـەیێ)یـە. لـە پەراوێزیشدا هاتووە کە دیوانی شێخ ڕەزا (زەربی - ضەربی) تێدا هاتووە.

لە لاپەڕە ٨٧دا (کە عەبدوڵڵا پاشا لەشکری والی سنەی شڕ کرد)

هاتووه میسرەعەکە لەنگ دەبێ:

که عەبدوڵلاهـ پاشا لەشکری والی سنەی شڕ کرد

تەقطیعەکەشی بەم جۆرە دەبێ

(کە عەبدوڵلا) (هـ پاشا لەش) (کری والی) (سنەی شڕ کرد). لە لاپەڕە ۸۸ دیسان تووشی (عەشق) دێینەوە کە (عیشق)ە. هەر لەو لاپەڕەیدا (خۆی بەقوربانی دەکا)ی ئەنجومەن لەبارترە تا (خۆی بەقوربانت دەکا)ی شەرحەکەی مامۆستا چونکە وشەی (قوربانی) یەکەم کە (ی)کەی هی ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە هاوتای (قوربانی) دووەمە کە (ی) تێیدا هی نیسبەتە. یەک وشە دوو واتا ببەخشێت پتر بەلای مجێزی ناڵیدا دەچێتەوە. وشەی (تەننوور)یش لە بەیتی سێیەمی غەزەلەکە دەبێ (تەنور) بێت دەنا کێشی تەنەڵ دەبێت. وابزانم وشەی (بوریان) لە بەیتی چوارەمدا دەبوو (بریان) بێ چونکە نە ناڵی بە (بوریان)ی نووسیوە کە ئەوسا لە جیاتی (ضمە) واو نەدەنووسرا، کوردیش گوتوویەتی (بوریان) ئنجا (بریانی) کە لە شیعرەکەدا ئەو (ی)ەی بە دواوەیە و ڕاناوی تاکە بەڕواڵەت لەگەڵ (بریانی) خواردنە مەشوورەکەی کوردەواری یەک وشەن هەر چەند لەمیاندا (ی)ەکە هی نیسبەتە.

بەیتی سێیەمی بڕە شیعرەکەی لاپەڕە ۹۰ کە (ئەمسەر و ئەمسەر) تێدا هاتووە لەنگ بووە دەبێ بنووسرێت و بخوێندرێتەوە (ئەمسەرەوسەر) بەسوواندنی هەمزەی (ئەوسەر).

وشەی (گوریزان) لە میسرەعی یەکەمی بەیتی یەکەمی لاپەڕە ۹۱ دەبێ (گوریزان) بێت چونکە فارسییە و وەهای دەردەبڕن. میسرەعی یەکەمی بەیتی پێنجەم لەنگە برگەیەکی زیادە لە پەراوێزدا نووسراوە کە لە جیاتی وشەی (واهی)ی ناو دەقەکەی ئەنجوومەن وشەی (ئەو) هاتووە لە دەقی دیوانی کوردی:

لە پەردەی طاهری گەر بێ صەدای ئەو عاشقی یارم

بەمەدا چاری لەنگینەکەی دەکرێ بەلام لەلایەن واتاوە زۆر هەژار دەبێ، یان هەر واتای نابێ. ئەگەر بەیتەکە بەم جۆرەی خوارەوە ئەوە بێ کە کوردی گوتوویەتی:

لە پەردەی طاهری گەربێ صەدای ئاهـ و عەزای یارم

ئیتر حاجەت نییە بێتن مەلا بۆ وەعظ و تەلقیم

[(ئاهـ و عزا)ش هەر باشە] ئەوسا دەڵێین چارەسەر کرا.

بەیتی دوایینی شیعرەکە لە میسرەعی یەکەمیدا (مەلائیك دێن و دەپرسن) واوەکە زیادە.

لە لاپەڕە ٩٢دا (ڕەخنەدەی زێر) دەبێ (ڕەھەندەی زێر) بێ. لە میسرەعی یەکەمی بەیتی سێیەم (موستەحەقی) ھەم غەڵەتە ھەم شیعرەکەی لەنگ کردووە، دەبێ بکرێتە (موستەحیققی).

لە لاپەڕە ٩٦دا وشەی (چەھرە) وەك بزانم (چیھرەیە). لە لاپەڕە ٩٧ (چنگێ) ھاتووە دەبێ (چـنـگـێ) بـێت. لـە ٩٨دا وشەی (بـوڕان) دەبـێ (بـوڕڕان) بـێت لـەبـەر کـێش. (قولابی)ش دەبێ بکرێتە (قوللابی) لەبەر ھەمان سەبەب. لە ٩٩دا (دەردی کارێ) دەکرێتە (دەردی کاری)

ئەی طەبیبی دەردی کاری مەرھەمێ

لە کۆتاییی شیعرەکە (بو بێ غەمێ) دەبێتە (بۆ بێ غەمێ).

یەکەم بەیتی لاپەڕە ١٠٠ لە پەراوێزدا:

صوحبەتی حوری بەھەشت، کەوتەرە
جـوی یـار و لالـەزار و ھـەمـدەمـێ

ئـەم بـەیـتـە مـەعـنـای نـیـیـە میسرەعی یـەکـەمیشی لـەنـگە. (جوی یار)یش (جوێبار-بەواتای جۆگا)یە.

ڕەنگە بەم جۆرەی خوارەوە چارەی بکرێت ئنجا خۆ و تالع، سالم وەھای گوتبێ:

صـوحبەتی حۆری بەھەشت و کەوتەری
جـــوێبـــار و لالازار و ھـــەمـــدەمـــێ

وردە ھەڵەی تریش لە غەزەلەکەدا ھەیە وەك (ماتەمی دەگرێ-دەکرێتە: ماتەمێ دەگـرێ) - (سەحـەرگـە-سەحـەرگـەھـ)، (کـاووس دل- کـاووسی دڵ) (طـەرف باغ-طەرفی باغ)..

لە لاپەڕە ١٠١ دەبوو بەیتی دووەمی قەسیدەی بولبولی طەبعم بخرێتە پێش دواین بەیتەوە بەم شێوەیە:

ھەر کەسێ ئیظھاری دانایی بکات و مەطلەبی
خود پەسەندی بێ یەقین ئیظھاری نادانی دەکا

ئەو کەسە تەحدیثی نیعمەت بێ موراد و مەطلەبی
میثلی نالی ئیمتیھـالی ئەمری یەزدانێ دەکا

بەیتی دوایین ئیشارەتە بۆ ئایەتی (وأما بنعمة ربك فحدث) کەواتە نالی کە خۆی هەڵدەداتەوە لە بەیتەکاندا مرادی (خودپەسەندی) نییە بەڵکو پێڕەویکردنە لە فەرموودەی ئەو ئایەتە. لەو برە شیعرەدا (موحتەشەم دێوانە) نووسراوە، (موحتەشەم دیوانە) ڕاستە.

لە کۆتایی بەیتی پێنجەم (صورەت ئارایی) دەکا غەڵەتە (صورەتی مانی) ڕاستە.

لە بەیتی شەشەم (بێ غەم و جەمعم ھەیە) غەڵەتە (بێ غەم و جەمعم ھەبوو) ڕاستە.

بەیتێکی پڕ لە ئیشکالی ئەم قەسیدەیە لە دەقەکەی ئەنجوومەندا ئەھاتووە، بەیتەکە ئەمەیە:

خەرقە پۆشێ کەی دەپۆشێی جەوھەری ذاتی ئەمن
بێتە نێو جیلوەی بوزوشتی خۆی بە عوریانی دەکا

ئەمە بەیتی دەقی ناو شەرحەکەی مامۆستا کە لە ناو توێژی قەسیدەکەدا ھاتووە بەڵام لە لاپەڕەی دواتردا شکڵێکی دیکە تەرجیح دەکات بۆ ئەم بەیتە لە نێوان ھەموو شکڵەکاندا.

خەرقە پۆشی کەی دەپۆشی جەوھەری ذاتی ئەمن
بێتە نێو جلوەی بڕشتی خۆی بە عوریانی دەکا

من لەگەڵ ئەم دەقەیان پتر دەسازێم بەڵام (ذاتی ئەمن) وەك چەقڵە و دوورە لە چەژی سازگاری شیعر. ئەمە لە بەیتدا نەبێ واتاکە لەوانەیە قبووڵ بکرێت. وەك منیش بۆی دەچم مەبەستی نالی ئەوەیە بڵێ جەوھەری ذاتی بە خەرقە پۆشی ناشرێتەوە، ئەو جەوھەرە کە بێتە نێو جلوەی بڕشتی خەرقەکەوە بەڕووتی دەردەکەوێت. ئەگەر زۆر شارەزای بابا تاھیری ھەمەدانی بوومایە کە نازناوی عوریانە لەوانە بوو حاڵەتێك لە حاڵەتەکانی سۆفیگەریی ئەو مەزنە پیاوە ببینم بۆ ئێرە دەست بدات. دەبێ بڵێم دەستنووسم دیتووە لە جیاتی (ئەمن) وشەی (أحق – ئەحەق)ی ھێناوە لە لاپەڕە ١٠٤ وشەی (ھوزار) کە لە دەقی قەسیدەکە و لە پەراوێزیشدا لێژنە ھەر ھوزاری نووسیوە ھەڵەیە و (ھەزار) ڕاستە. بەیتی قەسیدەکە لە میسرەعی یەکەمیدا کە دەڵێ

ھەر دار و بەرد و ھەر گوڵێ ڕەنگێ خەلاتیە

تێ ناگەم لیژنە وەیا بڵاوکەرەوە لە کوێوە ئەو نیشانانەی سەر دوو (ێ) وشەی (گوڵێ، ڕەنگێ)ی هێنان، خۆ لەو سەردەمەی فەیزی بەگ کتێبی چاپ کردووە نیشانە پەیدا نەبووبوو. ڕاستیی بەیتەکە ئەوەیە لە دەقی ناو شەرحی مامۆستادا هاتووە.

هەر دارە بەرگ و هەر گوڵە ڕەنگێ خەلاتییە

بێگومان لەسەردەمی فەیزی بەگ نیشانەی سەر (ڵ) و ژێر (ڕ)یش پەیدا نەبووبوو، ڕەنگە وەهای نووسیبێ:

هر دار و برد و گلە رنگی خلاتیە

لە لاپەڕە ۱۰٥ی ئەنجوومەن و لاپەڕە ۳۱٦ی شەرحی مامۆستادا ئەم میسرەعەی سەرووی شیعرەکە:

شەقی کە غەیری حوببی تۆی تێدا بێ

بەلای منەوە لە جیاتی (شەقی کە) ڕاستتر ئەوەیە کە بەپەراوێز لە شەرحدا (ئەگەر دڵ) هاتووە چونکە کە (شەق کرا) تازە دەرهێنان و دەرنەهێنان بۆ چی؟

ئەگەر دڵ غەیری حوببی تۆی تیا بێ

بەدەستی خۆت دڵم دەربێنە قوربان

لە شەرحەکەی مامۆستادا هاتووە (وشەی دڵم لە لایێکەوە مەفعولییەیی «شەقی کەیە و، لەلایەکی کەوە موبتەدایە و «غەیری... تادە» خەبەریەتی). وابزانم شەرحەکە بەسەهوو چووە چونکە (شەقی کە) ئەو (ی)ە (شەقی) کە ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە مەفعول بیهیە تێیدا مورەکێنیش نییە بەپێی دەستووری (اشتغال)ی عەرەبی (دڵم) ببێتە مەفعوول وەك کە دەگوترێ (أخاك رأيته) چونکە (دڵم دەربێنە) بریتییە لە مەفعولبەی (دڵ) و فاعیل (ڕاناوی کەسی دووەمی تاك) و فیعلی (بێنە، دەربێنە) ئەوەندە هەیە ڕاناوەکە لە ڕێژەی (ئەمری صریح)ی کوردیدا بۆ کەسی دووەمی تاك دەرناکەوێت و هەر جارە لە شکڵی بزوێنێکدا دەردەکەوێت، وەك : (بگرە، بخۆ، بڵێ، بژی، ....) کە ئەمرەکە بووە ناسەریح ڕاناوی دەردەکەوێت وەك : (بگرێت، بخوێت، بڵێت، بژێت، بدەیت، ...)

ڕستەی (دڵم دەربێنە) موبتەدای تێدا نییە چونکە ئەمرە و ڕستەی (انشائی)یە (دڵ)یش مەفعولبیەی فیعلی (دەربێنە)یە نەك هی فیعلی (کە بکە)، لە ڕستەی (شەقی

...ر گوتوابا (شەقی کە دڵم) و (دەریێنە) لە بەینا نەبایە ئاشکرایە دەبووە ...لی (شەق بکە). ئەوسا ئەگەر (شەقی کە دڵم) هاتبایە دەشیا لە ڕێی (اشتغال)ەوە ...ەم (ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك) و هەم (دڵ) ببنە مفعولوبیەی بەلام لە کوردیدا ناشێ بگوترێ (دڵم شەقی کە، ئانم بیسووتێنە دلرا حەبسی کە) وەك لە عەرەبیدا جایەزە (قلبي شُقَّهُ، خبزي أحرِقه، دارا فاحبسه...) من لە جیاتی (تێدا) هاتم (تیا)م نووسی، ئەم (تێدا)یە لە شوێنی ئەوتۆیی کێشی شیعرەکە تەنەڵ دەکات. (نالی)ش بەپێی داخوازی سەلامەتیی کێش هەر جارە یەکێکیانی بەکار هێناوە وەك:

١- یەعنی ڕیاضی ڕەوضە کە تێدا بە چەند دەمێ.

٢- هەر دەڵێی مانگەشەوە کوڵمی تیا.

وشەی وەك (تێدا، تیا) هەن هەر جارە بە جۆرێك لەکار هاتوون. لە نموونەدا: چونکی، چونکە هەریەکە جێی خۆی هەیە. لەم بەیتەدا

چونکی ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کەمت بوو

وشەی (چونکە) دەست نادات تومەز بزوێنی کۆتاییەکەی (چونکە) لەبەر کێش دەبێ درێژ بکرێتەوە خۆ (فتحە)ش درێژکردنەوە تەحەممول ناکات. لە لاپەڕە ١٠٦ نموونەیەکی ئەم لەکارهێنانەی نابەجێ هەیە کە لە سەرەتای بەیتی چوارەمدا نووسراوە:

چونکە ڕەسەنن ورد و شتیهان هەموو جەنگین
مەی سارییە ئەمشەی چلە دوورِدا چ لە سافا

دەبوو (چونکی) بنووسرابە. وشەی (دوڕدا) لە میسرەعی دووەم هەڵەیە و مەعناشی نییە ڕاستەکەی (دوردا)یە. (دورد) بەواتای خڵتەی شەراب دێت. گەلێك جاران کوردەکە دەڵێ (وێردی شەراب) تومەز (دورد)یان نەبیستووە لە بەیتی پێنجەمدا کە نووسراوە

وا بێ غەم و پەروا دەچنە عەرەصەیی مەیدان

وشەی (عەرصەیی) لەنگی کردووە دەبێ (عەرەصەیی) بێت. لە بەیتی حەفتەم نووسراوە

عوسمان بەگیان میرە کە ئەو وەقتی بڵێ دەی

من بیستوومە و خوێندوومەتەوەش:

وشەی (ئەجنە) لە بەیتی پاینی قەسیدەکەدا دەبێ (ئەجنەنە) بخوێندرێتەوە هەروەهاش وشەی (رفاعی) لە میسرەعی دووەمدا دەبێ (ڕوففاعی) بێت لەبەر کێش لاپەڕە ١٠٨.

لە میسرەعی یەکەمی لاپەڕە ١١٤دا (چ مظلوم) بەحری غەزەلەکەی لە ١٦ برگەوە کردوومتە ١٣. دەبێ بنووسرێ (من چەندە مەظلومم). وشەی (ڕەنجەڕۆم) لە میسرەعی دووەمدا یەکجار بە نالەباری دەخوێندرێتەوە تا کێشی ساز دەبێ. من باوایە دەمنووسی:

چ ماڵ وێران و ڕەنجیدەم چ مەهمومم چ مەغمومم

وشەی (ذمرە) دەبێتە (ذمرە) لەبەر کێش (بەیتی دووەم). نیوەی یەکەمی بەیتی چوارەم دەبێ:

عەلاوەی دەردی دونیایی لە لایێکی کەوە خۆمی

بنووسرێت لە جیاتی (لەلایێکەوە)ە

ئەمما بەیتی پێنجەمی قەسیدەکە بە ڕاستی هەموو کەموکورییەکی تێ هێناوەتە. هەزار جار ڕەحمەت لە گۆڕی ناهی:

هەتا مردن بلا مەشغولی ناهـ و شین و زاری بم

کە دونیا وابێ، طالع وابێ، دوشمن وابێ، مەعدوومم

غەزەلەکەی دیکەی (ناهی) لە لاپەڕە ١١٥دا کەموکوریی لێ پەیدا بووە بەدەست نوسخە نووسانەوە من لێرەدا لەبەر نرخی غەزەلەکە ئەو بەیتانەی هەڵەی کەوتبێتێ بەڕاستی دەیاننووسمەوە

نوکتەی دەمی مەعفی لە فلاطوونی خەیاڵە

سیرڕێکە بە صەد فەلسەفە ئیضاحی موحاڵە

من سەطحییی ئەم عیلمە لەو وەقتەوە قوربان

ئەوخەیزی خەطت حاشیەیی فەننی جەماڵە

پەروانە صیفەت دڵ بەچرای عاریفی پاکت

سەر پاختەو و سووختەیی بێ پەڕ و باڵە

کە)دا ئەگەر گوترابا (شەقی کە دڵم) و (دەربێنە) لە بەیندا ئەبایە ئاشکرایە دەبووە مەفعولی (شەق بکە). ئەوسا ئەگەر (شەقی کە دڵم) هاتبایە دەشیا لە ڕێی (اشتغال)ەوە هەم (ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك) و هەم (دڵ) ببنە مەفعولبیەی بەڵام لە کوردیدا ناشێ بگوترێ (دڵم شەقی کە نانم بیسووتێنە دارا حەبسی کە) وەك لە عەرەبیدا جایەزە: (قلبي شُقَّهُ، خبزي أحرقْه، دارا فاحبسه...) من لە جیاتی (تێدا) هاتم (تیا)م نووسی، ئەم (تێدا)یە لە شوێنی ئەوتۆیی کێشی شیعرەکە تەنبەڵ دەکات، (نالی)ش بەپێی داخوازی سەلامەتیی کێش هەر جارە یەکێکیانی بەکار هێناوە وەك

١- یەعنی ڕیاضی ڕەوضە کە تێدا بە چاند دەمێ.

٢- هەر دەڵێی مانگەشەوە کولمی تیا.

وشەی وەك (تێدا، تیا) هەن هەر جارە بە جۆرێك لەکار هاتوون. لە نموونەدا چونکی، چونکە، هەریەکە جێی خۆی هەیە. لەم بەیتەدا:

چونکی ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کەمت بوو

وشەی (چونکە) دەست نادات تومەز بزوێنی کۆتاییەکەی (چونکە) لەبەر کێش دەبێ درێژ بکرێتەوە خۆ (فتحە)ش درێژکردنەوە تەحەممول ناکات. لە لاپەڕە ١٠٦ نموونەیەکی ئەم لەکارهێنانەی تایبەجێ هەیە کە لە سەرەتای بەیتی چوارەمدا نووسراوە

چونکە ڕەسەنن ورد و شتیان هەموو جەنگین
مەی سارییە ئەشئەی چلە دوڕدا چ لە سافا

دەبوو (چونکی) بنووسرایە. وشەی (دوڕدا) لە میسرەعی دووەم هەڵەیە و مەعناشی نییە ڕاستەکەی (دوردا)یە. (دورد) بەواتای خڵتەی شەراب دێت. گەلێك جاران کوردەکە دەڵێ (ورتدی شەراب) تومەز (دورد)یان نەبیستووە. لە بەیتی پێنجەمدا کە نووسراوە.

وا بێ غەم و پەروا دەچنە عەرەصەیی مەیدان

وشەی (عەرەصەیی) لەنگی کردووە دەبێ (عەرەصەیی) بێت. لە بەیتی حەفتەم نووسراوە.

عوسمان بەگیان میرە کە ئەو وەقتی بڵێ دەی

من بیستوومە و خوێندوومەتەوەش.

عوسمان بەگیان میرە کە وەقتێکی بڵێ دەی

وشەی (ئەجنە) لە بەیتی پاپەنی قەسیدەکەدا دەبێ (ئەجیننە) بخوێندرێتەوە. هەروەهاش وشەی (رفاعی) لە میسرەعی دووەمدا دەبێ (روفقاعی) بێت لەبەر کێش لاپەڕە ١٠٨.

لە میسرەعی یەکەمی لاپەڕە ١١٤دا (چ مەظلوم) بەحری غەزەلەکەی لە ١٦ برگەوە کردووەتە ١٣. دەبێ بنووسرێ (من چەندە مەظلومم). وشەی (رەنجەڕۆم) لە میسرەعی دووەمدا یەکجار بە نالەباری دەخوێندرێتەوە تا کێشی ساز دەبێ. من پاماپە دەمنووسی:

چ ماڵ وێران و ڕەنجیدەم چ مەهمومم چ مەغمومم

وشەی (دەرە) دەبێتە (دەرپە) لەبەر کێش (بەیتی دووەم). نیوەی یەکەمی بەیتی چوارەم دەبێ:

عەلاوەی دەردی دونیایی لە لایێکی کەوە خۆمی

بنووسرێت لە جیاتی (لەلایێکەوە)دا

ئەمما بەیتی پێنجەمی قەسیدەکە بە ڕاستی هەموو کەموکوڕییەکی تێ هێناوەتە، هەزار جار ڕەحمەت لە گۆڕی ناهی:

هەتا مردن بلا مەشغولی شاهـ و شین و زاری بم

کە دونیا وابێ، طالع وابێ، دوشمن وابێ، مەعدوومم

غەزەلەکەی دیکەی (ناهی) لە لاپەڕە ١١٥دا کەموکوڕیی لێ پەیدا بووە بەدەست نوسخە نووسانەوە. من لێرەدا لەبەر نرخی غەزەلەکە ئەو بەیتانەی هەڵەی کەوتبێتێ بەڕاستی دەیاننووسمەوە.

ئوکتەی دەمی مەخفی لە فلاطوونی خەیاڵە

سیرێکە بە صەد فەلسەفە ئیضاحی موحاڵە

من سەطحیی ئەم عیلمە لەو وەقتەوە قوربان

ئەوخێزی خەطت حاشیەیی فەننی جەماڵە

پەروانە صیفەت دڵ بەچرای عاریفی پاکت

سەر باختەو و سووختەیی بێ پەڕ و باڵە

سەرمەست و برینداری مژە و چاوی خومارە
ماتەم زەدەوو شیفتەیی پەرچەم و خاڵە

لە میسرەعی یەکەمی دوایێی بەیتی لاپەڕە ١١٦ وشەی (قوربان) دەبێتە (قوربانی)، ئەم (ی)ە بۆ نیزافەیە بێ ئەو واتا نامێنێ.

(ویقار) لە بەیتی سێیەمی لاپەڕە ١١٧دا دەبێتە (وەقار). وشەی (جەواد) لە بەیتی چوارەمدا (جەوواد) دەخوێندرێتەوە دەنا کێشی لەنگە. (هەر وەکو) هەڵەیە (وەکو) جێی خۆیەتی، ئیوە دێری دووەمی بەیتەکە کە دەڵێ: زەرەمەی بە قنطار هەمی بەخشەد... لە لیستەی هەڵەکاندا ڕاست کراوەتەوە کە دەبێ (هەلی) یەکەم لاچێت

لە لاپەڕە ١١٨ (بێ شەمەو) دەکرێتە (بێ شەمەوو) لەبەر کێش. فەیزی بەگ وای زانیوە (بیشمە) وەک (شاور و شێتنە) ناوی دێیە، لێرەش لێی بێدەنگ بووە. لە ڕاستیدا تووتنی بێ تەمە ئەوعێکە لە هی هەرە چاک کە بێنی خۆشە (بێ شەمە = بیھ شەممە – خۆش بۆن...) وشەی (زۆر) لە بەیتی چوارەمدا دەبێتە (زۆرە) هەم بۆ تەواوکردنی واتا و هەم لەبەر خاتری کێش.

من (بێ شەمەو)م ڕاست کردەوە لەبەر کێش، دەبێ بڵێم ئیوە بەیتەکە بەم جۆرەیە.

بۆ تووتنەکەی بێ شەمەیی شاور و شێتنە

واتە (تووتنی بێ شەمای شاور و شێتنە).

لە میسرەعی یەکەمی بەیتی دووەمی لاپەڕە ١٢٠ (لە بازاڕی غەم و عەشقی کظلەمدا) دوو هەڵە هەیە یەکیان (عەشق) کە (عیشقە)، دووەمیان (کظلەمدا) کە کێشی شیعرەکەی شێواندووە، یا دەبێ (کظلەمدا) بخوێندرێتەوە یا دەبوو شاعیر بڵێ (عیشقی سەرمدا، دڵمدا) وشەی (کورە) دەکرێتە (کوورە)، وشەی (ماھ) دەکرێتە (ماھ و). میسرەعی کۆتایین وەها باشە:

فەلەک دەگری مەلائیک دێنە ناڵین

نەک (دەگرێ، مەلائک) وەك لە کتێبەکەدا نووسراوە.

لە لاپەڕە ١٢١ (لوجەجەی ژەرف) بە (زریەی قووڵ) لێک دراوەتەوە، وەک بزانم (لوجەجە) بەواتای (لووزەو) دێت. لەلایەن (زەرف)ەوە ناتوانم بڕیاری لەسەر بدەم قامووسی فارسیشم لا نییە بۆی بگەڕێم، دەشێ لە (ظەرف)ەوە هاتبێت. لەلایەن

ڕێنووسەوە نموونەی تێکەڵبوونی دوو ڕێنووس لە پەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا لەلایەن لیژنەوە نووسراوە (درگەشت). لە عەینی دەقی غەزەلەکەدا سەرلەبەری دێرە شیعرە فارسییەکە بە ڕێنووسی فارسییە. لێرەدا کوردی و فارسی تێکەڵن، دەبوو بنووسرێ (دەرگەشت) یان بە هەمان شکڵی سەرووتر رای گوێستبایە پەراوێز.

وشەی (کنار) لە پەراوێزدا بە (بەلاًوک) لێك دراوەتەوە. ئەمە دەقی میسرەعەکەیە:

زاشك سرخم شد کنار ازداغ هجران لالەزار

بەپێی بۆچوونی لیژنەکە (کنار) بەلاًوک بێت ئەمە واتای بەیتەکەیە: لە فرمێسکی سوورەوە بەلاًوک لە داغی دووری بووەتە لالەزار. هەڵبەت ئەم واتایە لە نوکتە دەکات ئەك لە شیعر. (کنار) بەواتای تەنیشت و ڕۆخ دێت وەك کە دەڵێی کەناری دەریا. بەو پێیە واتاکەی دەبێتە: (لە فرمێسکی سوورەوە تەنیشت و ڕۆخم، لە داغی دووری بووەتە لالەزار). ئەم شیعرەی مەولانا خالید بەیتێکی (کەلیمەان) بە بیر دەهێنێتەوە کە دەڵێ:

شود دامەنی ئەلوەند کنارەم ز گولی ئەشك

کـردیـم دەوا داغـی فـیـراقـی هـەمـە دانـرا

واتە: تەنیشت ڕۆخم بووەتە دامەنی کێوی ئەلوەند بە گوڵی فرمێسکم. (بەوەدا) داغی فیراقی هەمەدانم دەرمان کرد. مەولانا خالید جارێکی دیکەش کەلیمەان بە بیر دێنێتەوە کە لە بەیتی پێنجەمدا دەڵێ:

(بکرمجو)یی شد زهر چشمم روان از خون دل

عــاقــبـت کــردم دوا داغ فـــراق سرچــنـــار

واتە یەك بەکرەجۆی خوونی دڵ لە هەر چاوێکمەوە ڕەوان بوو. ئاخری داغی دووری سەرچنارم دەرمان کرد. بەیتەکە وەها دەخوێندرێتەوە:

بەکرەجۆیی شود ز هەر چەشمەم ڕەوان ئەز خوونی دل

عـاقـیـبـەت کـەردەم دەوا داغـی فـیـراقی سـەرچـنـار

لە لاپەڕە ١٢٤ ئەم سەهووە بچووکانە هەن. لە میسرەعی دووەمی بەیتی یەکەمدا (دوڕو) دەکرێتە (دوپڕو). لە میسرەعی دووەمی بەیتی دووەمدا (ڕەعیەیەت – ڕەعییەت).

لە میسرەعی سێیەمدا کە پێشتر لە میسرەعی دووەمدا نووسرابوو (موقاجات) دەبێ لەویشدا بنووسرێ (موکافات) نەك (مکافات). لە میسرەعی چوارەمدا (دونیاو) دەبێتە (دونیاوو).

لە مەقتەعی سێیەمدا (نەفسوردەی) دەکرێتە (نەفسوردەیی). لە مەقتەعی چوارەمدا وشەی (ئەوەل) دەکرێتە (ئەووەل). لە لاپەرە ١٢٥ وشەی (لاف) بە (ئیدی) لێك دراوەتەوە. من ئەم وشەیەم بەم واتایە نەبیستووە، ناشزانم (ئیدی) غەیری واتا مەشوورەکەی هەبێ.

(لاف)یش بەواتای دەعیە و کەشوفش ڕۆیشتووە. وشەی (باقل) کە بە (وا دیارە) لێك دراوەتەوە دەبوو بە (بە عەقڵ) شەرح بدرێتەوە کە هەر خۆیەتی بووەتە (باقڵ).

لە لاپەرە ١٢٦، بەیتی چوارەم نووسراوە:

هەم هەمعینانی ئاهم و هەم ڕێکابی ئەشك

دەبێ بنووسرێ:

هەم هەمعینانی ئاهم و هەم هەمڕیکابی ئەشك. دڵنیاش نیم لەوەدا وشەی (عنان) ئایا (عەنان) یان (عەنان) دەخوێندرێتەوە

لە بەیتی شەشەمدا (تۆی طاهیرو) دەبێ (تۆی طاهیر) بێ دەنا کێش دەشێوێ.

نیوە بەیتی دووەمی پێش کۆتایی بەیتەکان لەو لاپەڕەیەدا دەبێ بەو دەقە بگۆڕێ کە لە پەراوێزدا هاتووە «ئاوێکە پڕ لە ئار و چنار و گوڵ و چنوور».

وشەی (فەوەران) لە میسرەعی هەرە دواییدا دەکرێتە (فەوران) لەبەر کێش.

[لە لاپەڕە ١٢٤ بەسەر سەهوێکدا کشیم، لێرە بۆی دەچمەوە، لە مەقتەعی یەکەمی تەخمیسەکە جارێکیان (عومەر) و جارێکیان (عمر) نووسراوە. (عومر) ڕاستە. لە شەرحەکەی مامۆستاش هەردوو (عومر)ن. [ل. ٢٦٧ی شەرحەکە]].

لە لاپەڕە ١٢٧ وشەی (ئاوێنە) وا باش بوو بە (ئاوینە) بنووسرێت و لە شەحدا بگوترێ وشەکە هەردوو شکڵی (ئاوێنە، ئاوینە) هەڵدەگرێت چونکە سەرچنار برێتییە لە (ئاو) و دەشێ وەکو (گلێنە – مەسینە..) بە (ئاوینە – لە ئاو دروستکراو) بڕوات. لە هەمان کاتیشدا دەبێتە (ئاوینە) یەك شکڵی ئاسمان بداتەوە. ئنجا لێرەدا تەڵەیەکی فکری هەیە هەمووی ئالی دۆستان پێوەی بوون، لە شەرحی مامۆستادا دەقی

بەیتەکەداوا هاتووە:

یا عەکسی ئاسمانە لە ناویتەدا کەوا
ئەستێرەکانی ڕابکێشن وەك شەهابی نوور

لەگەڵ بەڵی (ئەنجوومەن) تەنیا (ڕادەکێشن) فەرقە لە نێوانیاندا. شەرحی مامۆستا هاتووە ڕاکشانی ئەستێرەکانی ئاسمانی بە وردە بەردی ناو سەرچنار شوبهاندووە کە ئاوی ڕەوان بە سەریاندا دەکشێت وا دێنە بەرچاو بجووڵێنەوە و بکشێن. ڕاستیی مەسەلەکە شتێکی یەك چار دوورە لەمە (ئەستێرە - ئەستێرەکانی) لە کوردیدا کە (ئەستێرك)یش هاتووە بە عەنباراوی ئەوشۆ دەڵێن بۆ مەبەستی پتر سوود لێ وەرگرتنی، لەو حەوزە هەڵدراوە کۆمەڵ دەکەن تاکو کاتێك کونی مەجراکەی کرایەوە بە غوردەم بڕوات و بگاتە شێناوورد، ئنجا نالی دەڵێ ئەو ئاوە ڕاوەستاوانەی لە سەرچنار پەیدا دەبن هەریەکەیان (ئەستێرە)یەکە و بە شریتە وەك (شیهابی نوور) ڕادەکشێن. (ئەستێرەکانی) بە بەریەوە هەیە بێتە دوو وشەی سەربەخۆ (ئەستێرە - کانی) واتە ئەستێرە و کانی ڕادەکشێن وکو شیهاب «ئەستێرە، کانی ڕادەکشێن وەك شیهابی نوور». وشەی (ئەستێرە، ئەستێرك) لە فارسیدا (استخر) و لە زمانە ڕۆژاوایییەکاندا (Cistern سیستەرن) هاتووە کە هەمووری یەك ڕیشەن. مەرحووم مامۆستا سەجادیش لە شەرحی ئەم بەیتەدا هەر بەواتای ئەستێرەی ئاسمان بۆ (ئەستێرەکانی) چووە.

لە ئاست بەیتی سێیەمی لاپەڕە ۱۲۷ کە دەڵێ:

دەموت دوو چاوی خۆمە ئەگەر بەکرەجۆیی ئەشك
ئەبوایە تیژ و بێ تەمەر و گەرم و سوێر و سوور

پێویستە نیگای خوێنەر بۆ شەرحی بەیتەکە لە (دیوانی نالی) مامۆستای بیارەیی بیەمەوە کە زۆر ئوستادانە گوتوویەتی وشەی بەکرەجۆ لەم بەیتەدا (متنازع فیه)یە، هەم بۆ فرمێسکی چاو و هەم بۆ جۆگەی بەکرەجۆ دەچێتەوە واتاکەشی بەم جۆرە دەبێ: ئەگەر بەکرەجۆی فرمێسکم تیژ و بێ ئەمەر و ئەگەر سوێر و سوور ئەبوایە دەمگوت جۆگەی بەکرەجۆیە.

ئەم (تنازع)ە خزمی ئەو لێکدانەوەیە کە من لە ئاست (گوڵ و گوڵچیهرە)دا کردم بەڵام لەوێدا (گوڵ) کە (متنازع فیە)یە دوو چاران ناوی هاتووە، یەکیان بەشێوەی سەربەخۆ (گوڵ) دەچێتەوە بۆ (بەتەن جۆی) کە لەگەڵ کچە جوانەکانی ئەو دەشتە

تێکەڵ بوون. دووەمیان لە تەرکیبی (گوڵچیهرە)دا گوڵەکە دەچێتەوە بۆ (بەکرمنگ و موتتەحید بە دڵ). لەفزی (گوڵچیهرە) خۆیشی تێکەڵبوونەکە تەئکید دەکاتەوە ئنجا بەوەدا (تنـازع)ێکی دووەم بۆ (تێکەڵ)بوونەکە پەیدا دەبێت کە جارێکیان گوڵ و کچەکان بە لەشی جوداوە تێکەڵن و جارێکیش لە وشەی (گوڵچیهرە)دا تێکەڵی لەش و لەشیش پەیدایە. بەو پێیە دووبارەبوونەوەی ناوی گوڵ واتای بە زیادەوەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

لە لاپەڕەکەدا وشەی (حەتا)ی ئەنجوومەن و (هەتا)ی شەرحی مامۆستا بیارەیی دەبێ (حەتتا، هەتتا) بخوێندرێتەوە بۆ خاتری کێش. لە دەستنووسدا دیتوومە (هەرتا) نووسراوە.

لە بەیتی دواتردا، میسرەعی دووەمی بەیتی پێنجەم، وشەی (کاکۆڵ) کێشی شیعری تەنبەڵ کردووە دەبێ (کاکۆڵ) بنووسرێت و بخوێندرێتەوە.

لە میسرەعی دووەمی بەیتی دووەمی لاپەڕە ١٢٨ (تەفرەقەیی شۆرش و نشوور) دەبێ (تـەفـرەقـەیی شۆرشی نشوور) واتە بڵاوەلێکردن و تێکهـاوێشتنی ڕۆژی زیندووبوونەوەی قیامەت.

لە بـەیتـی پێش کۆتـایی ئەو لاپەڕەیەدا (مونەوەرە) دەکرێتە (مونەووەرە) لە میسرەعی هەرە پایین (صوفیی) دەکرێتە (صوفییی). دەشبوو بڵێم لەلایەن زمانەوە (تفرقە)ی عەرەبی (تەفریقەیە) نەک (تەفرەقە) وەک (تزکیة، ترویة، تهویة، تنشئة...)

لە بەیتی دووەمی لاپەڕە ١٢٩ (دیدەیی) دەکرێتە (دیدەی). لە پاش ئەم بەیتە وشەی (سەبزەی) دەکرێتە (سەبزەیی)، لە بەیتی چوارەمدا (یاری تێدایە) بەیتەکەی تەنبەڵ کردووە دەبێ (یاری تیایە) بنووسرێت. لە دوای ئەمە (توخوا)ی پەراوێز ڕاستە نەک (توخودا) مەگەر بخوێندرێتەوە (تو‌خدا). لە بەیتی حەفتەمدا (خیلال) بطیفترە لە (هیلال) چونکە خیلال جەمعی (خلّ)ـە و بەو پووشکە و دارۆچکەیە دەڵێن ددانی پێ خاوێن دەکرێتەوە، ئەمەیش مناسبی مەعنای بەیتەکەیە کە دەڵێ:

زارم وەکو خیلال و نەحیفم [یاخود: ضەعیفم] وەکو خەیاڵ

ئـایـا دەکـەوەمـە زار و بـە دڵـدا دەکـەم خـوطـور؟

دەبینین (خلال) دەکەوێتە زار و خەیاڵیش بە دڵدا خوطور دەکات.

وشەی (نەحیفم، نحیفم) وا بووە (سخیفم) نووسراوە، ئەویش هەر مناسبە.

بەیتی دوایینی شیعرەکە لە لاپەڕە ١٣٠دا (نەی داری سەنگدل) هەرچەند جوانە لەلایەن جووتە واتای (درەخت و خانوو)ەوە بەڵام چونکە نامەیە و بۆ سالم چووە (نەی یاری سەنگدل) جێی خۆیەتی. لیژنە دژی ڕایەکەی هەوڵێن خۆی (دار)ی پەسند کردووە نەک (یار) کە لە شەرحی مامۆستا بیارەییشدا (یار) هاتووە.

وشەی (شانە زەن)ی ئەنجوومەن لە بەیتی دووەمی لاپەڕە ١٣١دا نادروستە (وەی شانەزەن)ی پەراوێز (٣) ڕاستە. لە بەیتی سێیەمدا (غونچەی دەمی) نالەبارە (غونچە دەمی) ڕاستە.

کەی دێتە هەندە غونچە دەمی بێ وەزیدەنت

بەیتی چوارەمی ئەم لاپەڕەیە کە ئەمە دەقیەتی:

ئیحیا کونی جەمیعی نەباتاتی عالەمی
ڕەعناکەشی لە تەربییەتی قامەتت شەجەر

تا ئەم بەیتە بەم دەقەیەوە غەڵەتە. لیژنەش هەر ئەوەندەی کردووە کە پەراوێزی ژمارە پێنجی هێناوە لە ئاست (ڕەعناکەشی) گوتوویەتی (ڕەعنا گوشا) لە شەرحی مامۆستای بیارەییدا هاتووە. دەبوو ئەوەندەی هەر تێدا بڵێ ناشێ (قامەتت) ڕاست بێ چونکە ڕووی قسە لە بای سەحەرە کە ئەوی نەبێت قامەتە. دەقی ئەم بەیتە لە کتێبی [دوو چامەکەی نالی و سالم]ی مامۆستا سەجادی بەم جۆرەیە:

ئیحیا کونی جەمیعی نەباتاتی عالەمی

ڕەعنا گوشا لە تەربییەتت قامەتی شەجەر

بێگومان ئەمەیان بێ عەیبە هەرچەند ناتوانم بڵێم بێ گۆڕان لە سالمەوە پێمان گەیشتووە.

لە شەرحەکەی مامۆستای بیارەییشدا ئەم دەقە هاتووە. من پێی ڕازیم. بەیتی شەشەم لە کتێبەکەدا نووسراوە:

هیممەت کە کە چاپووکان، بە ئیجرایی مەطلەبم
لێرە بڕۆ وەکو، کە لەوێ هاتی وەک تەتەر

لە لیستەی هەڵەکان ئیشارەت دراوە بۆ ئەوەی (کە چاپووکان) هەڵەیە (چابووکان) ڕاستە بەڵام نازانین بۆچی چاپووکانەی گۆڕیوە بە چابووکان. ئەمە زۆر سەیر نییە

بەلام لە پەراوێزدا دەڵێ نیوەی دووەمی بەیتەکە لە [دوو چامەکەی مامۆستا عەلائەدیندا] بەم شکڵەیە:

«لەم سەر بڕۆ وەکو بەرید و لەوێ بێ وەکو تەتەر» دەبوو هەر ئەبایە بڵێ (لەوێ بێ) هەڵەیە چونکە قسە لەگەڵ کەسی دووەمدایە نەک کەسی سێیەم. لەمانە بترازێین دەگەینە غەڵەتە زلەکەی کە هەر باسی نەهاتووە بیریشی لێ نەکراوەتەوە:

ئەم دەقەی نیوە بەیتی کە لە [دوو چامەکەی مامۆستا سەجادی] هاتووە لە جیاتی ١٤ برگە گەیشتووە بە ١٦ برگە. ڕاستیی نیوە بەیتەکە ئەمەیە:

لەم سەر وەکو بەرید و لەوێ بە وەکو تەتەر

کە دەڵێم (لەوێ بە - نەک لەوێ بێ) لەو ڕوویە، سەرەتای بەیتەکە (هیممەت کە) بە ئەمری سەریح نەک ناسەریح هاتووە لەبەر ئەمە پێویستە ئەمری بەیتی دووەمیش هەر سەریح بێ. ئەگەر لە سەرەتاوە (هیممەت کەی ) کە ئەمری ناسەریحە هاتبایە دەشیا و دەبوو لە کۆتایی بەیتەکەدا (لەوێ بێ) بێت. دیققەت بفەرموون ئێمە دەڵێین: (دەبێ لەوێ بێ) چونکە ئەمرەکە ناسەریحە. هەرگیز ناشێ بڵێین (دەبێ لەوێ بە) چونکە ئەم دەقە بریەی تێدایە هەڵناگرێ زەمینی بۆ ساز درێ بەعیبارەتی وەکو: (دەبێ، پێویستە، وا چاکە، مەصلەحەتە... هتاد)

ئەم سیفەتەی (ناصەریح) وەهای کردووە دەقەکەی بۆ مەرجیش دەست بدات وەک کە دەڵێین:

(ئەگەر لەوێ بێ دێمە لات) ئەم سروشتەی ئەمر لێ ناگەڕێ بە ڕێژەی سەریح بۆ غەیری کەسی دووەمی تاک و کۆ بەکار بێت. باسەکە پتری بە دەمەوەیە لێی کورت دەکەمەوە.

چامەکەی نالی و سالم لە ئەنجوومەندا چەندین بەیتیان کەمترە لەو دەقەیان کە لە شەرحی مامۆستای بیارەییدا هەیە. پاش ئەم دوو چامەیە دەگەینە (شەکوا حاڵ)، (عارف). پێی ناوێ من حەریکی ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی بم چونکە لە لاپەڕەکانی ١٣٤، ١٣٥، ١٣٦، ١٣٧ی کتێبی ئەنجوومەن، لیژنە دەقی هەڵبەستەکەی لە کتێبی (لە خەوما)وە ڕاگوێستووە و زۆربەی هەرە زۆری هەڵەکان لەو دەقەدا ڕاست کراوەتەوە.

لە لاپەڕە ١٤٢ وشەی (موتتەصەف)ی سەرەتای بەیتی دووەم (موتتەصیف)ە. (موشەڕەف)یش (موشەڕرەف)ە (تەجەلا)یش (تەجەڵلا)یە کە ڕاستییەکەشی

(تەجەللی)یە بەڵام گەلێك وشەی دیکەی وەك (تەوەللا، تەمەننا، تەسەللا..) خۆی لە ئەدەبی کوردی جێگیر کردووە

لە لاپەڕە ١٤٦ بەیتی دووەمی لاپەڕەکە کە دەڵێ:

ئەحوەلی تەفرەقی نەظەر تەقویەتی سەبەب دەکا

عاریفی حیکمەت ئاشنا لەم قصەیە ئەدەب دەکا

دەبێ (حیکمەت ئاشنا)ی تێدا بکرێتە (وەحدەت ئاشنا) چونکە یەك بە دوو دیتنی خێل (ئەحوەل) بەتاڵ بکرێتەوە دەبێ (وەحدەت ئاشنا)ی لێ ڕاست بکەیتەوە لە جێلی پێش خۆمم بیستووە [وابزانم لە ساڵی ١٩٣٧ ڕەفیق ئەفەندی خادم السجادە، لە باداوەی مەلا ئەفەندی، بۆی گێڕامەوە] کە موفتی زەهاوی گوتوومتی. مەبەستی نالی لەم ئەحوەلی تەفرەقە نەظەرە من (واتە: موفتی) بووە.

بەیتی دووەم لە ئەنجوومەندا کە ئەمە دەقیەتی:

سەهم و نەصیبی ئەصلییە بەخشی گیاهـ و گوڵ نییە

تووتنە خەرجی سووتنە مۆدنە ماچی لەب دەکا

لە دیوانی نالی، شەرحی مامۆستادا، میسرەعی بەیتەکە وەها هاتووە

سەهم و نەصیبی ئەصلییە بەخشی گیاهـ و گڵ نییە

هەڵبەت (گڵ) ڕاستە نەك (گوڵ) چونکە تووتن گیایە و مۆدنە گڵە نەك گوڵە. لە خوا لێخۆشبووی، شێخ ئەجمەدینی شێخ کەریمی بەرزنجی، کە خاڵی مامم و پیاوێکی موسڵمان و ئەدیب و خاوەن تەکیە بوو لە کۆیێ ئەم بەیتەی دەخوێندەوە بەسۆز و کڵپەی دەروونەوە تا ڕادەی گەرمهاتن، دەیگوت:

سەهم و نەصیبی ئەصلییە بەختی گیاهـ و گڵ نییە

من ئەمەیان کارم تێ دەکات.

لە لاپەڕە ١٤٧دا (لە شکەنجەی شکەنجی زوڵفی) هەڵەیە ڕاستەکەی (لە ئەشکەنجەی شکەنجی زوڵفی)یە.

بەلای منەوە بەیتی پێنجەمی ئەو لاپەڕەیە کە دەڵێ:

فیدای تەشریفی ڕێگەت بێ خەراجات و خەزینەی دڵ

نیثاری خاکی بەرپێت بێ لە چاوما قەطرەیێ مابێ

لە شەرحی مامۆستاشدا مصرەعی دووەمی ئەمەیە:

نیثاری تۆزی بێت بێ گەر لە چاودا قەطرەیێ مابێ

هەردوویان شێواوییان تێدایە. مصرەعی دووەمی بەیتەکە دەبێ وەها بێ:

نیثاری خاکی بەرپێت بێ لە چاوا قەطرەیێ مابێ

لە میسرەعی یەکەم گوتی (خەزینەی دڵ) نەك (دڵم). زەوق وەها دەهێنێ (چاو)یش بەبێ نیزافە بۆ ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك بە ڕەهایی بمێنێتەوە و نەکرێتە (چاوما). لەلایەکی دیکەشەوە بێگومان نالی نووسیویەتی (خراجات و خزینەی دڵ)، لەفزی (خراجات) دەشێ (خوراجات) بخوێندرێتەوە لە (خوڕاج)ەوە دێت کە لە ناکامی برین و هەڵئێشانی دڵ پەیدا دەبێ، (خزینە)ش دەلالەتی خەزنەکردنی برینی پێوەیە. شەرحەکەی مامۆستا بۆ ئەم لایەنە عیشق و خۆشەویستی داناوە بە خەراجات و خەزینەی دڵ حەقیشیەتی بەلام نەك لە پشتگوێخستنی خوراج و خەزنەکردنی شەرحەکەی مامۆستا بۆ ئەوە چووە کە (لە چاودا قەطرەیێ مابێ- بەیتی دەقی پەسندکراو لەلایەن خۆیەوە) ئەو (مابێ)یە دەکرێ بە (مابێ – ماە بێ) واتە (ئاو بێ) لێك بدرێتەوە باشیشی بۆ چووە.

بەیتی کۆتایی ئەم لاپەڕەیە کە نووسراوە:

لە دووریی تۆیە ئەی خورشیدی پرتەوبەخشی شەوگەردان

کە (نالی) وا لە حالاتی محاقی ماهی شەودایە

وشەی (دووریی) تێیدا هەڵەیە و واتای مەبەستی بنەڕەتیی بەیتەکەی کوشتووە، دەبێ (لە دەوری تۆیە) بێت، چونکە مانگ بەدەوری ڕۆژەوە دەکەوێتە محاق هەتا لێی دوور بێ بەرەو (بەدر) دەڕوات. من ئەم مەعنایەم لە کتێبی (چەپکێك لە گوڵزاری نالی)دا بەدرێژی شی کردووەتەوە، لە شەرحەکەی مامۆستاشدا [پەراوێزی لاپەڕە ٥٦١] ئیشارەتی بۆ کراوە بەلام شەرحەکە خۆی هەر لەسەر ڕەچەی کۆنینەی واتا لێدەرەوان دەڕوات کە گۆیا نالی لە (دووری) یاردا وەك هیلالی محاقی مانگی نوێی لێ هاتووە، هەرچەند لەلایەکی دیکەوە دەشڵێ ئەم واتایەی (دەور) لەگەڵ وردەکاریی نالی پتر بەدڵدا دەچێ ئەمما.. هتد

من لە بینینی خۆمەوە و لە زەرووەرتی ڕاگەیاندنی بەیتەکانی ئەم غەزەلە هەر ئەوەم لە بەردەستدایە کە بڵێم غەزەلەکە تەجرەبەیەکی عەمەلیی دەمی گەنجایەتیی نالییە کە بە شەو پاریزی بۆ سەر خەوگەی یاری بردووە تا (هەناسەم زوڵفەکەی لادا...)

بەیتەکان هاواریانە نالی وەسفی یاریکی پەری چیهرەی خەو لیکەوتووی تەنیشت خۆی دەکات. تۆ سەیری لە سیاقی بەیتەکاندا کە جاریکیان لە واتای محاقەوە و جاریکیان لە لاچوونی زولف بە هەناسە و جاریکیان (لە سایەی کوفری زولفت دڵ فەنا، فی نووری ئیمانە، مظلِّۆن ظولمەت خرابە وەسلی پەروانە لە شەودایە) چەند ئاشکرایە قسیدەکە (وحدە)ی هەیە! لە شەرحی مامۆستادا ئەم (یەکیەتی – وحدە)ی قسیدە بەوەندە ئینکار دەکات کە کەس بە مەرجی نەگرتووە. بەڵێ بە مەرج نەگیراوە، بەلام کەسیش نەبوونی یەکیەتیی قسیدەی بە مەرج نەگرتووە. دیوانی نالی بەشێکی بەرچاوی (وحدەی موضوع)ی تێدایە وحدەیێکی کە شیعری کلاسیکیی ئەوان سەردەمانە بە شێوازی کات و شوێن بەخۆیەوە گرتووە. هەموو موناجاتەکانی رێی حەج، ئەی ساکینی ریاضی مەدینە، ئەحوەلی تەفرەق نەظەر، بەھارییەکانی، ئەمردم من ئەگەر ئەم جارە، ماتەم وەکو زولفیەین سیەھ، ئەم تاقمە مومتازە، تا فەلەك دەورەی ئەدا، قوربانی تۆزی رێگەتم، جەنانی وەك جینان کردم بە ماوا... و هی دیکەش یەکیەتیی بابەت و دارشتنیان تێدایە. خۆ لە مەسەلەی «مەستوورە»دا ئەك وحدەیەك بگرە دە وەحدەشی تێدا کۆ بووەتەوە.

لە لاپەرە ١٤٨ (نامی) غەدریکی گەورەی لە خۆی کردووە دەڵێ:

ئەو بەیاضەی لای ملت شەعری سیاهی بێتە سەر

چ دەبوو بیگوتبایە: «ئەو بەیاضەی گەردەنت». بە راستی (لای ملت) کوڵەمستێکە شەویلەی بەیتەکەی خوار کردووە.

لە بەردەوامەنی لاپەرە ١٤٩دا وشەی (زەمزەمە) لە بەیتی حەسەن کەنۆش هاتووە لە پەراوێزدا بە (مزەمزی گۆرانی) واتای لێ دراوەتەوە، شاعیرێکی کۆنی عەرەب لەبارەی ناونانی بیرە مەشوورەکەی (مەککە) بە زەمزەم ئەم بەیتەی گرتووە:

زمزمت الفرس على زمزم

و ذاك في سالفها الأقدم

گۆیا عادەتی زەردەشتییان ئەوەیە لە دەمی نانخواردندا وردە دوعا دەخوێنن وەك مزەمز دێتە بەرگوێ، ئنجا فارسەکان زەمانێك حوکم فەرمای یەمەن و ئەو ناوە بوون رێگەیان کەوتووەتە مەککە و زەمزەمزیان لەسەر ئەم بیرە مەشووره کردووە، لەوەوە ناوی (زەمزەم) پەیدا بووە. بێگومان قسەکە ئەفسانەیە وەك هەزاراتی دیکە.

لە جیاتی میسرەعی دووەمی بەیتی یەکەمی لاپەڕە ١٥٠ کە دەڵێ:

ئەتۆ زەمم دەکەی مەدحت دەکەم من
جەزای قەولی درۆ با هەر درۆ بێ
لە دەستـقـەتـاندا دیتوومە نووسراوە:
موکـافـاتـی درۆ بـا هـەر درۆ بـێ

لە سەرەتـای بەیـتی سێهەم (بێ زەخم) نوخـتـەیـەکی کـەمـە دەبێ (بێ زەخم) بنووسرێت. زەخم فارسییە بەواتای (برین)ە لە (زام)ی هەندێ لەهجەی کوردی نزیکە.

چی لە لاپەڕە (١٥١ ، ١٥٢) لەسەر (سۆنێت) نووسراوە ، دواتریش لە لیستەی هەڵەکاندا جارێکیان ڕستەیەکی دوور و درێژمان بۆ دەخاتە نێوان دێڕی (١٨، ١٩)ی لاپەڕە (١٥١) و جارێکیشیان دوو دێڕی (١٠، ١١)ی لاپەڕە (١٥٢)مان پێ دەگۆڕێ بە دوو دێڕی لەوان جودا، تا ئەم تێکەڵ پێکەڵییە و ڕێنموونییەکی لە شەرحدا بۆی کردووین کە بەسەر هیچ قاعیدەیەکەوە ناوەستێت ئەوە ئەبێ کە قافیەی میسرەعی ئەم سۆنێتانە لە هەر چوارینەیەکیدا قافیەی میسرەعی یەکەم و سێیەمی هاوچوونن هەروەهاش قافیەی دووەم و چوارەمی. لەوە بەولاوە چ نرخێکی تایبەت لەو جۆرە هەڵبەستەدا خۆی نانوێنێت. گۆیا (شێخ نووری و گۆران لە ئەدەبیاتی عوسمانی نوێوە هۆنراوەی کوردییان پێ تازە کردووەتەوە) کەچی نموونەی شیعری مەلای جەزیریمان بۆ دەهێنێتەوە کە لە بابەتی سۆنێتن. مەلای جەزیریش لەو لاپەڕەیەی ١٥٢دا ساڵی مەرگی هاتووە، بەر لە ١٥٢ ساڵ وەفاتی فەرمووە کە دەچێتە پێش شەکسپیر، بێگومان مەلای جەزیریش چ ئاگای لە شیعری ڕۆژاوا ئەو سەردەمە نەبووە لە شەرحدا – لاپەڕە ١٥١ – دەڵێ: (جۆری قافیەی شەکسپیر لە سۆنێتەکانیا بەم جۆرەیە: أب أب ح‌ء ح‌ء هو هو ح ح). گۆیا سۆنێتەکان (دابەش کراون بەسەر سێ چوارینەدا. کە لە هەر یەکەیانا قافیەی یەکەم و سێیەم، دووەم و چوارەم وەك یەکن، کۆتاییەکەی دوو دێری یەك قافیەییە). جارێ با بپرسم ئایا هیچ دەنگێك نەبوو دەنگی (ح) ئەبێ لە نموونەی شیعری شەکسپیر ڕوونکەرەوە بێت کە دەزانین ئەم دەنگە لەو زمانانەی ئاویان لەو دوو لاپەڕەیەدا هاتووە هەر پەیدا نییە؟ ئنجا بۆ بێ ئاڵەی چوار جارانیش لەو نموونەیەدا دووپات بووەتەوە؟ بۆچی لەو ئاوە (هو هو) دوو دەنگی وشەکەی بەیەکەوە نووساون خۆ دەکرا (ح ح )یش بەیەکەوە بنووسێن. ئنجا کە لە سەرەوی شەرحەکەوە دەڵێ:

(لە ڕووی کێشەوە ئیتالی یازدە بڕگەیە، فەرەنسی دوازدە، ئینگلیزی دە ..) لەوەوە دەربەکەوێ کە تەنها جوداکەرەوەیەک هەبێ سۆنێت هەڵاوێرێ لە شیعری دیکە هەر ئەوەیە لە هەر چوارینەیەکیدا میسرەعی تاک ئەژماری وەکو یەکن و هی جووت ئەژماریشی وەکو یەکن، لەمەشدا شتێک نادیترێت هۆی دەمەبەستەکەی خوێنەر بێت چونکە چەندین جۆری ڕازاوەی قافیەدارایی هەیە ج قیاسی لە سۆنێت ناگرێ، یەکیان لە قەسیدەیەکی – وابزانم – صفی الحلی زەمانی عەبباسییەکان بریتییە لە چەندین مەقتەعی پێنج میسرەعی: سێی بەراییان هاوقافیەن و دووی پاییینیان هەریەکە قافیەکی تایبەت بە خۆی هەیە ئەمەش نموونەیەتی

ما لعيني عشيتْ بالنظر
أنكرت بعدك ضوء القمر
واذا ما شئت فاسمع خبري
عشيت عيناى من طول البكا
وبكى بعضي على بعضي معي

ئەم دوو قافیەی کۆتایی لە هەموو مەقتەعەکاندا دێتەوە وەک:

جذب الزقُّ اليه و اتكا
و سقاني أربعا في أربع

برە شیعرەکەی گۆران لە لاپەڕە ١٥١دا قەرزداری ئەوە نییە لەسەر دەستووری سۆنات ڕۆیشتووە ، بەڵکو ویڕای خەیاڵی بەرز و داڕشتنی هونەرەکانە سوودی زۆری لە هەڵبەزەی تەفعیلەکانی ناو بەیتەکان وەرگرتووە کە ١١ بڕگەیین [جگە لە نیوە دێری سەرەتاکەی کە ١٢ بڕگەییە ئەم بەحرەش وەکو هێندێکی دیکە هەڵدەگرێ بەیتەکانی ژمارەیان بەپێی تەفعیلەکان کەم و زۆر بن، تەنانەت میسرەعی سێیەم لەلایەن وەزنەوە هەڵدەگرێ لە جیاتی (ئاهۆ) بە وشەی (ئارەزۆ) کۆتایی بێت. بەیتەکانی (النهر المتجمد)ی میخائیل نەعیمە هەڵدەگرن ٢٠ بڕگەیی و ١٦ بڕگەییش بن. نیوە بەیتی یەکەمی بەهارییەکەی حاجی قادر ١٥ بڕگەیی و نیوەی دووەمی ١٤ بڕگەییە. ئەگەر (خودا)کەی کۆتایی نیوە بەیتی یەکەم بکەیتە (خوا) دەبێتە ١٤ بڕگەیی و کێشیشی دروستە] بەڵام ١١ بڕگەیی بە هەڵبەزە نەک ١١ بڕگەیی وەک:

ئەمردم من ئەگەر ئەم جارە بۆ تۆ

هەڵبەزەی ناو بەیتەکانی گۆران بە جۆرێکی زێتە بەرچاو لە قەسیدەی (نالی)دا دەبینی کە دەڵێ:

برق البصر لەبەر بەرق و تەلەئلوئی لە نالی

ئەم میسرەعە و هەموو غەزەلەکە دەبێ بە تەقتیعەوە بخوێندرێتەوە بەم جۆرە:

بـرق الـبـصـر لـە بـەرق و تـەلـەئـلـوئـی لـە نـالـی
خسف الـقـمـر لـە ئیشراقـی قـیـامـەتـی جـەمـالـی
روحی تو گوڵێکە صەد بەرگ و هەزاری عاشق ئەمما
لـە هـەمـوو جـەمـەن دیـارە بـە ئـوصـولـی نـالـە نـالـی

ئەم شێوازەی سۆنات کە هیچ فەزڵێکی زیادی بەسەر بەحرەکان و شێوازەکانی دیکەدا نییە، دەدرێتەوە بە دەسەڵاتی شاعیر، خۆ هەرچی کاری دنیا هەیە بگرە لە ناڵبەندی و خەرەکرسییەوە هەتا دەگاتە ئاسمانگەردی هەمووی بەندە بە مەهارەتی ئەوانەی تێیدا خەریکن. لەلایەن بوون و نەبوونی لە کوردیدا دیتمان مەلای جەزیری چەندین سەدەیە لەم شێوازەی هۆنیوەتەوە. نموونەکەی مەولەوی خۆی بەڵگەیە لەسەر هەبوونی چونکە بێگومان مەولەوی ئاگای لە شیعری ئیتالیا و فەرەنسە و بریتانیا نییە.

لەلایەن رێزمانەوە تێبینییەکم هەیە لە سێ وشەی دێڕی حەفتەم و هەشتەمی لاپەڕە ١٥١ کە نووسراوە (ئیتالی، فەرەنسی، ئینگلیزی). لەلایەن (ئیتالی)یەوە: میللەتی ئیتالیا ناوێکی تایبەتییان بۆ خۆیان نییە وەك عەرەب، کورد، تورك، ئەڵمان.... هەیەتی، لە بۆیە دەبێ (ی)ی نیسبەت بخرێتە دوای ناوی وڵاتیانەوە تاکو میللەتەکە بگرێتەوە کە بڵێین (ئیتالی) وامان ڕانواندووە کە وڵاتەکە (ئیتال)ە نەك (ئیتالیا) . بە قیاسکردن دەڵێم ئەگەر (ئیتالی) ڕاست بێ، کە ڕاست نییە، پێویستە قبووڵ بکرێ بەخەڵکی (بەغدا) بگوترێ (بەغدی) نەك (بەغدایی) .

جا ئەگەر (بەغدایی) پەسند بکەین کە ڕاست و دروستە دەبێ بڵێین (ئیتالیایی). عەرەب حەقیەتی بڵێ (ایطالی) چونکە بە خەڵکی (بصرە)ش دەڵێ (بصری)... (قاهرە – قاهری). دیارە (ئیتالی) ڕاستەوخۆ لە عەرەبییەوە بۆ سەر زێهن و زمانی نووسەر و ئاخێوەری کورد بازی داوە.

لەلایەن (فەرەنسی)یەوە: میللەتی (فەرەنسە فەرەنسا) پێیان دەڵێن (فەرەنگ) ئیتر

شەخسی ولاتی فەرەنسا دەشێ پێی بگوترێ (کابرا فەرەنگە) وەك کە دەڵێی (کابرا کوردە، تورکە، ئەڵمانە..) کە نیسبەت وەلای ناوی میللەت وە یا عەشیرەت درا و گوترا (کوردی، بڵباسی، عەرەبی..) وشەکان بۆ زمان و نەریت و پۆشاك و خۆراك.. هتد دەچنەوە.

دەبێ بڵێین زمانی (فەرەنگی)، کە لە فەرەنسـاوە بۆ دانیشتووی فەرەنسا بڕۆین دەبێ بڵێین. (فەرەنسـایی) نەك (فەرەنسی)، لە فەرەنسەوە (فەرەنسەیی) دێت، (فەرەنسی) لە عەرەبییەوە بۆ کوردی، بێ لزووم، هاتووە ئینگلیزی بەواتای زمان و نەریت و داب و خۆراك... جێی خۆیەتی چونکە میللەتەکە ئینگلیزە

لە پەراوێزی لاپەڕە ١٥٢، میسرەعی دووەمی چوارینەکەی پێش چوارینی هەرە دوایی برگەیەکی کەمە. دیارە (جاما دل) دەبێ (جاما لە دل) بێ چونکە قافیە و رەویەی دوو میسرەعەکەی یەکەم و سێیەم (بێ حالە دل، نالە دل) هاتوون. بەمەشدا دەردەکەوێ کە ئەم مەقتەعە لە چەشنی سۆنێت نییە. لە مەقتەعی یەکەمیشدا (ئەی شەکرا گەردن ژعاج) دەبێ (ئەی شەککەرا..) بنووسرێت و بخوێندرێتەوە دەنا کێشی تەنبەڵ و ناقوولا دەردەچێت.

لە لاپەڕە ١٥٥ وشەی (ناکین) بە (پەر) لێك دراوەتەوە ڕاستتر ئەوەیە بگوترێ (ناخن)ی کوردی هاوواتا و هاوڕیشەیەتی. وشەی (نیگارین)یش ناشێ (جوانانە، یارانە) بێت چونکی وشەکە ناوەڵناوە ئەم دوو وشەیەش ناوەڵکارن. دەبێ بە (نەخشین، جوان) لێك بدرێتەوە. سەرنج بگرە (نغز و دوشیزە)ش هەردوویان ناوەڵناون. لە کوردیدا دەگوترێ (پیاوانە هاتە پێش، دزانە بۆی دەرچوو، دۆستانە دوا..) لە شیعری نالیدا (... برو بازانە نازانە) هاتوون. حاجی قادر (... نازانە دەستی کردەوە)ی بەکار هێناوە. دەشێ بگوترێ (خۆراکی کوردان، شایی دزەییانە..) و هی ئەوتۆیی چونکە لە وشەکاندا واتای کار (فعل) هەیە. ناگوترێ (بەردی شێتانە، شاخی بڵندانە تریی ترسنۆکانە یان شەرنانە ترشانە...) چونکە واتای کار لە بەیندا نییە.

لە بەیتی دووەمی لاپەڕ ١٥٦ (تا ضرب المثل همی گویند) لەنگەر دەبێ (تا بە ضرب المثل) بگوترێت.

میسرەعی دووەمی بەیتی سێهەم لە لاپەڕە ١٥٨ کە دەخوێندرێتەوە:

چەند باشەم ژ دووریی تو غەمگین

کێشەکەی تەنبەڵ و عەیبدارە یا دەبێ بگوترێ (ز دووریی تو غەمین) یان (ز دووریەت غەمگین).

لێرەدا دەست لە ئەنجوومەنی ئەدیبان هەڵدەگرم مەگەر تێبینی ئەبێ کە بڵێم فەیزی بەگ بەو شۆرەتی عیلم و ئەدەبیەوە چۆن ڕازی بووە لەو هەموو لەنگ و لۆرییەی کە لە دەقی نموونە بژاردەکانی شوعەرای کورد وا لە چاوان دەچەقن. بێ ئەوەی ڕاستیان بکاتەوە وەیا هەر نەبێ پەنجەیەکیان بۆ درێژ بکات یان بۆرە تەنویلێکیان بۆ بهێنێتەوە. ڕەنبوونی لیژنەش لەو هەموو هەڵەیە و هی خۆکردیش ساکەمە عوزر بۆ فەیزی بەگ چونکە هەڵەی کەس بە هی غەیر داناپۆشرێت. ئەندامانی لیژنەش تاکێکیان لەوانە نین خۆی بۆ شیعر ئەرخان کردبێت.

من کە ئەمە دەڵێم لەبارەی فەیزی بەگەوە وەها دادەنێم ناوەرۆکی کتێبەکەی هەر ئەوەیە کە بەنێمە گەیشتووە تەك لە نووسینەوەدا هەڵەی تێ کەوتووە. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕت ئەمین فەیزی بەگ.

خوێنەری بەرێز چاوپۆشیم لە بەشێکی بەرچاوی هەڵەکان کرد لە ترسی زێدە درێژخایێنی. ئەم چەند هەڵەیە نموونەی هی دیکەن کە لێیان تێ پەڕیومەتم:

لە لاپەڕە ١١٠ ، بەیتی دووەم – لە میسرەعی دووەمدا کە نووسراوە: پڕ بە دەم ببیچڕێ هەروەك سەگی هەورامانی. دەبێ و وشەی (هەر) لە (هەروەك)دا بسڕێتەوە دەنا کێشی لەنگ دەبێ و لە شیعر دەشۆرێ.

لە لاپەڕە ١١٢بەیتی دواییینی غەزەلەکە کە دەڵێ:

هەر کەسێ عەبد و مورید مورشیدێکە سا ئەمن

هەروەکو (هیجری) مورید و جانفیدای هاوناوی تۆم

مەبەس لە (هاوناو)ی پاییینی بەیتەکە (عبدالقادری گەیلانییە) کە هاوناوە لەگەڵ ئەو (قادر – قادراغا)یەی کە (هیجری – کوردی) عاشقە جەمالی بووە

دواین بەیتی لاپەڕە ١١٣ (ئەرخەشمە و گەر لوطفە بە هیجری نەظەرێ کە) بەم شکڵەیەوە لەنگە یا دەبێ (ئەرخەشمە و وگەر لوطفە) بنووسرێت و بخوێندرێتەوە یان (ئەرخەشمەوە گەر...)

لە بەیتی شەشەمی لاپەڕە ١١٧ وشەی (دورو..) بکرێتەوە (دوورو..) لەبەر کێش کە

راستیی وشەکەش هەر (دوور)ە.

لە لاپەڕە ١٢٣ میسرەعی دووەمی تەخمیسەکەی سالم بەسەر شیعری مەولانا خالیدەوە کە دەڵێ:

بێ قەرار و ئیضطیرا بە ساڵ و مەه قانونی دڵ

ئەگەر دەقاودەق وەرگێڕین لە عەرەبییەوە بۆ کوردی ئەوسا (بێ قەرار و ئیضطیراب) دەبێتە (بێ قەرار و بێ شێواوی) کە دژ بەیەکترن. تومەز هەندێ وشە بەکار دێن بێ وردبوونەوە لەوەی ئاخۆ وەسفە یان ناوی واتایە وەک کە دەڵێن:

(دڵم تەسکین بوو) ئیضطیرابیش لێرەدا بە (مضطرب) هاتووە. نالی دەڵێ:

خاطرێکی خۆش و شۆخ و بێ غەم و جەمعم هەبوو

لێرەدا (جەمع) بەواتای (مەجموع) هاتووە کورد بە تێکڕایی دەڵێ (خاترجەم - جەمع)

لە لاپەڕە ١٤٩ بەیتی پێنجەم و شەشەم وەها دانراوە کە خاوەنیان نەزانراوە:

وەک من ئاگادارم بەیتی شەشەم کە ئەمە دەقیەتی:

وەکو یەک دێتە بەر گوێی بهاوی ئەحمەق

صەفیری بولبول و ئاوازی لەقلەق!

ئا ئەم بەیتە هی سالمە.

ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٣١، ١٩٩٣

# بژار و گوڵبژێرێك لە هەندێ نووسراوی كوردی

دوای كۆتاییهێنان بە پشكنینەوە لە (ئەنجوومەنی ئەدەبیاتی ئەمین فەیزی بەگ) نیگایەكی خێرام بەبەرگی (٢٣، ٢٤)ی گۆڤاری دەستەی كوردا گێڕا: لە ئاست گوتارەكەی مامۆستا د. موتابچیدا كە لە ژێر سەرناوی (نالی شاعیری غەزەلی كوردی) بڵاو كراوەتەوە دەڵێم. هەرچەند ناو و زاراوەی لەبار بۆ هەر شتێك بێت كارێكی پەسەند و پێویستیشە مادەم ئەمڕۆیینەوە وەیا لە خەرمان زیادكەر بێت، ڕاستییەكەی ئەمێكە لە هەرای (غەزەل، قصیدە). بەپێی ژمارەی بەیت پشتڕێ بۆتم چونكە كورتی و درێژیی هەڵبەست پێناسە بۆ خودی شیعرەكە دانانێت: ئەوەی گرنگە لە ناونانی هەڵبەست بە غەزەل یان شتێكی دیكە بابەتی شیعرەكەیە ئایا حەماسەیە هەجوە، ئەڤینە، وەسفە، مەدحە. ناشێ پێنج بەیت لە (صرف و نحو) غەزەل بێت و پازدە بەیت لە تەعلیماتی شێردۆشین قەسیدە بێت. من گلەییم لە مامۆستا موتابچی نییە لەوەدا كە زاراوێكی ئەدەبی ڕوون دەكاتەوە، زۆریشی لێ مەنەتبارم كە تێمان دەگەیەنێ غەزەل لە پێشەكیی قەسیدەی درێژەوە هاتووە كە هەر جارە شاعیر بەدەربڕینی سۆزی دەروونی خۆی لە چەند بەیتێكدا سەرەتای هەڵبەستی داڕشتووە. من حەزم دەكرد مامۆستا موتابچی ڕەخنەی ناڕەزامەندانە لەو زاراوانە بگرتایە كە هیچ شتێك ڕوون ناكەنەوە، نە لە بابەت و نە لە دانەریان و نە لە كات و شوێنی بەوجلەدبوونیان و نەبارمەتیدەرن لە شیتەڵكردنی واتایان. ئاخۆ ئەگەر قەسیدەیەكی پەنجا بەیتی تەنها حەفت بەیتی لە بەهاران مابێتەوە و ناومان نا غەزەل یان وشەیەكی دیكەمان لێ كردە پێناسە ئاخۆ بەوەدا دەستمان لەم بنچكی لێرەواری شیعر و ئەدەب گیر دەبێ؟ دەمویست مامۆستای هێژا و ئازیز بەدەنگ بێ لە غەزەلەكەی (كوردی) كە لە دامەنی لاپەڕە (٣٠)ی گۆڤارەكەدا نووسراوە و بەیت و نیوێكی پەڕیوەتەوە سەرەتای لاپەڕە ٣١، بەدەنگ بێ لەوەدا كە دوو بەیتی سەرەتای غەزەلە چوار بەیتییەكە ڕەویەیان (اللتزام)ی تێدایە و هاوچوونن، ڕەویەی دوو بەیتەكەی دیكەش هیچ كامێكیان لە یەكتر ناچن كە دیارە دەیارەیەكە جاران شاعیری بێ موفلیس دەبوو. ئەمە غەزەلەكەیە

ڕەنگی گوڵ گیانا وەكو ڕوخسارت ڕەنگین نییە
شەككەری میسری وەكو گوفتارەكەت شیرین نییە

ئەهلی چین نەققاشی چاکن خۆ بەڵان تەسویری تۆ
نەقشی خامەی کردگارە کاری وەستای چین نییە

من کە کوشتەی تیغی عیشقم ڕۆژی دیوانی خودا
بۆچی شاهید بێنم ئاخر کفنەکەم خوێناوییە

من کە ڕیسوا بووم و تەپڵی عاشقیم لێ دا ئیتر
کوردی ئەز پەروام سەر و ئیمان و گیان و دڵ نییە

دەتوانم سوێند لەسەر هەندێک بخۆم کە میسرەعی دووەمی بەیتی سێیەم ئەمەیە:

بۆچی شاهید بێنم ئاخر کفنەکەم خوێنین نییە؟

مومکینیشە وشەی (ئاخر) لە (ئاخۆ)وە گۆڕابێت کە بۆ پرسیارە.

میسرەعی دووەمی بەیتی چوارەمیش بێگومان ئەمەیە:

کوردی ئەز پەروام سەر و ئیمان و گیان و دین نییە

جا ئەگەر بەرهەڵستی لەوەدا هەبێت کە (ئیمان و دین) یەک شتن خۆ (سەر و گیان)یش یەک شتن. بەیتی دووەمی غەزەلەکەش بەناچاری و بێ خۆماندووکردن بەیتێکی ئالیمان بەبیردا دێنێتەوە کە دەڵێ:

مانی نییەتی قووەتی تەسویری برۆی تۆ
ئەم قەوسە بەدەستی موتەئەفیس نەکشاوە

شاعیری دیکەش زۆرن ئەم وێنەیان لە هەڵبەستدا کێشاوە ئیتر هەریەکەیان بەپێی دەسەڵاتی خۆی بەرز و نزم بووە.

حەزم دەکرد مامۆستای هێژا لە غەزەلەکەی مەلای جزیری واتای نیوەی دووەمی بەیتی پێنجەمی ڕوون کردبایەوە کە دەڵێ:

یا من رأی خلی فهلی یشبی بشیء قامتا

وشەی (یشبی) لە چییەوە هاتووە؟ لە (یُشبه)وەیە؟ یان لە (یُشْبُه)وە؟ چ دەبوو ئەگەر (یشبه) مابایەوە بێ بزواندنی حەرفی کۆتایی فیعلەکە هەروەک پێشتر لە میسرەعی دووەمی بەیتی سێیەمدا کردی؟

هل فی ید المفتون شیء ام کیف یصنع یافتی؟

مامۆستا موتابچی و هەموو نووسەرانی سلێمانی بمبەخشن کە دەڵێم بەکارهێنانی (تیادا) وەك لە دێری ۲۲ی لاپەڕە ۲۳دا نووسراوە دەبوو (تیا) بنووسرێت چونکە (تیا) خۆی کورتەی (تێدا)یە بەو پێیە (تیادا) بریتییە لە (تێدادا) کە شتێکە پشت لە هەموو دەستوورێکی ناخاوتنە. ئینجا ئەگەر نووسەری سلێمانی رێی ناچاریەز بۆ خۆی بەرەوا بزانێ باباى دەشتی هەولێر و دانیشتوانی دێیەکانی نێوان هەولێر و کۆیەش دەبێ لێیان بسەلمێنەدرێ بڵێن (الحمدولیلالاهی رەببی لعالەمین). دوای هەشت دێری بەرەوژێرتر دەبینین نووسراوە (حافز غەزەلەکانی تیایدا هەیە) کە دەبوو بگوترێ (تێیاندا هەیە) چونکە ڕاناوەکە دەچێتەوە بۆ (غەزەلەکان) بەڵام وا دیارە زاڵبوونی (تیادا) بەسەر هۆشی وتی ئاخێوەردا خۆی رەپەیش دەیەهێنێت و رواڵەتێکی نەقشبەستووی نادروست دەبێتە کڵێشەی ناسازی مەبەستێکی رەوان. (تێیاندا، تێتاندا، تێماندا، تێیدا، تێتدا، تێمدا) کوردییەکی رەسەنن ناشێ بین بە (تیایان، تیابانیدا... تیاما، تیاتادا.. هتد) نالی هەردوو شێوەی (تیا، تێدا)ی بە لەباری بەکار هێناون.

١- بەعنی ریاضی رەوضەکە تێدا بەچەند دەمێ.

٢- هەر دەڵێی مانگەشەوە کولمی تیا.

ئێمە دەزانین، یان دەبێ بزانین، پرپەوزیشتی (لە) کە دەبێتە پێشگری کار (فعل) بەپێی داخوازی هەڵکەوت دەبێتە (لێ، تێ). دەڵێین.

١- عەیب لە من مەگرە

عەیبم لێ مەگرە

٢- بەرد لە من مەگرە

بەردم تێ مەگرە.

دەبێ بڵێم شێوە ئاخاوتنی موکریانی کە بەشێك لە عەشیرەتەکانی دیوی کوردستانی عێراقیش پێڕەوییان لێ دەکەن دوو پرپەوزیشنی جودایان هەیە: (لە دە) هەریەکەیان بەکارهێنانی تایبەت بەخۆی هەیە. مامۆستا ئەحمەدی قازی لە دەمەتەقە بەدەوری (لە، دە)دا ئەم نموونەیەی هێنابووەوە: (گوێزەکە لە دارەکە کەوتە خوارەوە و دەحەوزەکە کەوت.) لەسەر حەقیش بوو. بەڵام ئێمەش ناچارین بەبەشی خۆمان ڕاری بین هەرچەند لەم مەسەلەیەدا کورت دێنین. ناچارییەکەش لەوەوە دێت کە فێرین بۆ هەردوو حاڵەت هەر (لە) بەکار بهێنین و بەزەحمەتێکی زەحمەت بەڵەدی

شوێنی (دە) دەبین. نالی کە دەڵێ

لە دڵدا ئاتەشی عیشقت بڵێسەی مەسلی تەندوورە

ئەگەر بەشێوە ئاخاوتنی موکریانی دوواپایە دەیگوت (دەدڵدا). کە دەڵێین (لە منەوە بۆ تۆ – لە ڕانیەرا تا دەربەند) موکریانیش هەروەها دەڵێن و بەدڵیاندا نایەت بڵێن (دەبنەوە بۆ تۆ – دەرانیەرا تا دەربەند) چونکە (دە) بۆ حاڵەتی سکون، بێ جووڵەیی بەکار دێت. ئەگەر (لە دە) بەفارسی بگرین (لە) بەواتای (ز، أز) دێت و (دە)ش بەواتای (در) دێت. کرمانجیی سەروو (ژ) لە جێی (ز، أز) بەکار دەهێنێت. کێشەی پرپەوزیشنی (لە) هەر خۆیەتی، بە جۆرێك لە جۆرەکانی، بەدەوری پرپەوزیشنی (بە)شدا قوت دەبێتەوە: ئەم (بە)یەش لە حاڵەتی پێشگریدا دەبێتە (پێ):

١- چراکە بەئاگرکە.

چراکە پێ کە.

٢- بەخەڵق ڕاگەیاندن.

پێ ڕاگەیاندن.

٣- بەشاردا تێپەڕین.

پێدا تێپەڕین.

من لێرە موناقەشەی ئەو لایەنە ناکەم تایا لە هەموو حاڵاندا (پێ) دەبێتە پێشگر یان وەها دەبێ هەر بەپرپەوزیشنی بمێنێتەوە وەك:

١- بەدارام گوت.

پێم گوت (پێگوتن)

٢- بەدارام سەلماند

پێم سەلماند (پێسەلماندن)

مەبەست لێرەدا جیرانەتیی (پێدا، پیادا، پیا) لەگەڵ (تێدا، تیادا، تیا)یە کەوا هەمان گرفتی بەکارهێنان لە هەردوویاندا هەیە. دەبێ دان بەوەدا بهێنین کە (پێدا) دەستوورییە. هەر لەم دەستووری بوونەیەوە دەشێ بەپێی لەهجەی ناوچەیی بگوترێ (پیا). ئەمما (پیادا، پیایا) بیرای بیرای جایەز نییە.

لە نموونەی ڕەوابوون و نەبوونی زاری ناوچەییەوە ئەم نموونەیە دەهێنمەوە وشەی جنێو لە (دژنێو)ەوە هاتووە کە تا ئێستاکەش لە بەشێکی ولاتی مەرگە و دەوروبەری ئەو ناوەدا دەڵێن (دژنێو). فەقێ مستەفایەکی حەبەی ناماں هەبوو کە لەو سالانەی پاش ١٩٦٠ بەهۆزایی و بەزۆلم لە دەست بۆرەبیاوی کرمانج کوژرا هەتا مردنی هەر (دژنێو)ی بەکار هێنا. جنێو، بەلای رای منەوە، دەسکارییەکی ڕەوای لە (دژنێو) کردووە چونکە ڕیزی دەنگەکانی تێك نەداوە. بەلام کە (جنێو) دەبێتە (جوێن، جوون) کارەکە دەکەوێتە سنووری هەڵەوە. (بەعەقل) دەکرێتە (باقل) هەم ڕەوایە و هەم ئێسك سووك. بێگومان دەوری ڕابەرێکی وەکو مامۆستا موتابچی هەر لەوەندەدا ناوەستێ کە داوەتی نووسەرانی کورد بکات بۆ گرتنەبەری یەك ڕێگای تەعبیری ئەدەبی بۆ پێکهێنانی زمانی یەکگرتوو: دەبێ پشتگیری بکات لە وشە و تەعبیری ڕاست و ڕەوان، لەو بوارەشدا دەسەلاتێکی سەلمێنراوی هەیە بۆ دۆزینەوەی بابەتی ڕەسەن لە چاو کەساتی تر کە هێندەی ئەو شارەزای دەرەختی گرووپە زمانێك نین کە زمانی کوردی یەکێکە لە شا لکەکانی.

لە میسرەعی یەکەمی بەیتی دووەمی غەزەلەکەی نالی، لاپەرە ٣٤، (گەمەست) هاتووە دیارە هەڵەی چاپە دەبێ (گەرمەست) بنووسرێت. لە ئاست وشەی (سلوك، سولووك) کە بە واتای مریدی تەریقەت خۆ دەنوێنێ تێبینیم لەوەدا هەیە کە وشەکە بەپێی ڕووالەت (تەریقەت) بەدەستەوە دەدات نەك (مرید). لە شەرحی دیوانی (نالی)ی مامۆستای بیارەییشدا (سولووك) بە(سالیك، مرید) لێك دراوەتەوە. ئەمە دەقی بەیتەکەی دووەمی ئەو غەزەلەیە:

کوشتەی نیگاهی دیدەتە گەر مەست ئەگەر خەراب
بەستەی کەمەندی زوڵفتە گەر شێخ ئەگەر سولووك

بەڕاهیەر وشەکە دەبێ (سەلووك) بێت وەکو (غفور، شکور، لجوج). کە هەمووی سیفەتە لە ڕیزەی (صیغة المبالغة) نەك ناوی واتا. بەداخەوە قامووسم لا نییە بۆ وشەکە و واتای بگەڕێم، چی دەبلێم لێکدانەوەی ڕووالەتی وشەکانە.

بەیتی نۆیەمی غەزەلەکە چ ئەوەی لە شەرحی مامۆستا بیارەییدایە و چ ئەوەی لەم گوتارەی مامۆستا موتابچیدا هاتووە کە وا دەزانم ڕاگوێزراوە لەو شەرحەوە، دوو تێبینی هەڵدەگرێت، ئەمەش دەقی بەیتەکەی هەردوو سەرچاوە:

ڕاهێڵ و تـار و بـۆیـی کـولـووی بـەفـرە ئـابـشـار
با بای دەدات و ماسی پێدا دێ وەك مەکووك

تێبینیی یەکەم ئەوەیە کە وشەی (پێدا) کێشی میسرەعەکە تەنبەڵ دەکات دەبێ (پیا) بنووسرێت و بخوێندرێتەوە. تێبینیی دووەم ئەوەیە کە میسرەعەکە لەم دەقەدا بۆتە سێزدە برگەیی کەچی سەرلەبەری غەزەلەکە چواردە برگەییە دەبێ بەم جۆرە ڕاست بکرێتەوە:

بابای دەدات و ماسی پیا دێ وەکو مەکووك

من بۆ ئەوەش دەچم کە وشەی (پۆ) بەئەسڵ لەلایەن نالییەوە (پۆد) نووسرابێت چونکە لە چەندین شیعری نالی و سالم و شوعەرای ئەو سەردەمەدا دەقی گەلێك وشە لە فارسییەوە هاتووە، هەر لەم دەقەشدا وشەی (تار)ی فارسی هاتووە لە جیاتی (تان)ی کوردی. واش دەزانم دەبێ (ڕاییڵی تار و پۆد) بێت، چونکە مەبەست ئەوەیە کە کولووی بەفر ڕاییڵی تان و پۆی ئابشارە ناشێ ڕاییڵەکە جودا بێ لە تان و پۆ کە هەر خۆی تان و پۆکەیە ئیتر چۆن (واوی عطف) جێی لەوێدا دەبێتەوە لە نموونەدا دەڵێم کە مەبەستت بوو بڵێی (دەستی چەپ و ڕاستم) ڕێت نییە (واوی عطف) بخەیتە جێگەی (ی)ی اضافە و بـڵێی (دەست و چەپ و ڕاستم) چـونـکـە دەستـەکـە خـۆی چـەپ و ڕاستەکەیە.

لە گوتارەکەی د. عەبدوڕەحمانی حاجی مەلا مارفدا ڕوونکردنەوەی پسپۆڕانەی بەنرخ هەیە بەکەڵکی هەموو کەسێك دێت لەگەڵ زمان و ڕێزماندا هەرێك بێت، بەڵام لە گۆشەیەکی بەرتەسکەوە ڕێم هەیە بۆچوونێکی خۆ کە ئەگەر لە زانینی ڕەسمیشەوە نەبێ هی ئێوەڕامان و لێکدانەوەی بێندرێژەوە بخەمە ڕوو.

لە پێشەوە دەبێ بڵێم گوتارەکە لە ڕوانگەی زمانەوان و بیریارە ڕووسەکانەوە سەرنج لە زمان و ڕێزمان و بەشەکانی دەگرێ. سەیرێکی لیستەی سەرچاوەکانی بکەیت دەبینیت پتر لە سەدی ئەوەدیان ڕووسین کە لەمەدا ﭺ عەیبێك پەیدا نابێ بەڵام لەوانەیە تێڕوانینی هەر بابەتێك بێت لە وڵاتێکی وەکو ڕووسیادا کە ئایدیۆلۆجیای سیاسیی فەرمانڕەوا بووە بەسەر هەرچی بەرهەمێکی مادی و مەعنەوییە، بکێشێتەوە بۆ ناکامی ناسان وەیا تەنك وەیا بڕشت کە جۆرێکی ڕەنگدانەوەی سیاسەتە لە بابەتدا. لە نموونەدا دەڵێم بەراوێزی ژمارە ٢٤ لە بەرەو کۆتاییی لاپەڕە ٨٧ی گۆڤارەکەدا

رووبەرووی ئەم بیروڕایەمان دەکات: (پێویستی لێکۆڵینەوەی مێژووی پێشکەوتنی زمان ئەو هەڵوێستە بەناوبانگەی ف. ئینگلیز دیاری دەکا کە وتوویە «کەرەستە و قاڵبی زمانی زگماک تەنیا بەئاگاداری و وردبوونەوە لە پەیدابوونی و پێشکەوتنی لەسەرەخۆی پلە بەپلەی، روون و ئاشکرا دەبێ. ئەگەر گرینگی بەوە نەدری، ئەوە ناتوانرێ قاڵبە مردەکانی ئەو زمانە و زمانە مردوو و زیندووەکانی هاوڕەگەزی بزانرێ». ئەم قسەیەی ئینگلیز ئەگەر لە سایەی پایەی بەرزی سیاسیی خۆیەوە نەبێت بەدیهییەکی سادەیە هی ئەوە نییە بێتە ناو کتێبانەوە. ئینجا چەند چەوتی و هەڵەشی تێدایە یەکجارەکی لە زانستی زمانی دادەبڕێت، یەک لەو هەڵانە ئەوەیە کەوا هیچ زمانێکی زگماک نییە (پەیدابوونی) زانرا بێ هەتا وردبوونەوەی تێدا بکرێت. دەشیا بڵێ وردبوونەوە (لە پێشکەوتنی) بکرێ ئەویش بەمەرجێک شکڵی کۆنینەی بەنووسین پارێزرابێت، خۆ دنیا ڕاست بێتەوە ناتوانێ (ورد بێتەوە) وەیا (ئاگادار بێ) لە زمانێکی کە بەر لە ۲۰ هەزار ساڵ قسەی پێ کراوە. هەڵەی دووەمی کە بریتییە لە ناتەواوی، ئەوەیە کە ئینگلیز بەبیری نەهاتووە حیساب بۆ تاو و تەنیسری زمانی بێگانە لە (زمانی زگماک... و هاوڕەگەزانی) بکات. تۆ بێنە زمانی فارسی پاک بکەوە لە وشەی عەرەبی کە بەئانقەست دەکرێتە ناراپشتی زمانی ئەدەبی یەککرتووی فارسی، چی ئەوتۆی لێ نامێنێتەوە بەکەڵکی ناخاوتن بێت. ئەوەی پێی دەگوترێ زمانی (هزقارش) سەرلەبەری وشەی ئارامییە کە دەترنجایە کلێشەی پەهلەوییەوە بەلام لە خوێندنەوەدا بەدیلە پەهلەوییەکە بەکار دەهات و واش دەبوو وشەی پەهلەوی ئیرانی ئارامیی پێوە دەلکا. زمانی کوردی بکەیتە نموونە دەبینیت لە ڕێی ئاینی ئیسلامەوە زۆربەی زاراوە وشەیە سەر بەئاین و ماطڵەتی شەرعی عەرەبییە بەشێکیشی میراتی عوسمانلییانە و هێندێکی بەمێزانەتی لە فارسییەوە هاتووە و گەلێک وشەی ئەورووپایشی تێ کەوتووە، هی مەغۆلیشی تێدایە. ڕاستیی مەسەلە لێرەدا ئەوەیە بەدرێژاییی ڕۆژگار زمانە دراوسێکان نەک هەر وشە بگرە تەعبیریشیان لێکتر خواستووەتەوە تاکو ئەگەر گۆڕان و شێوانیان بەسەردا هاتبێت ناتوانرێ ڕاست بکرێنەوە مەگەر هانا ببرێتە بەر ئەو زمانەی لێوەی کەوتوونەتەوە: ئینجا ئەگەر بگوترێ ئەو هێندە وشە و تەعبیرانەی لە زمانێکی بێگانەوە هاتوون لە چاو وشەی ڕەسەن وشەی (هاوڕەگەز) ئەوەندە کەمن نرخی ڕایەکەی ئینگلیزی پێ ناشکێ، لە وەلامدا دەگوترێ هەر نەبێ بایبی ئەم کەمبوونە کەلەبەر لە ڕایەکەی ئینگلیزدا هەیە

سەرەڕای ئەوەی کەوا چی گوتووەتی ئەگەر لێتی بێدەنگ بایە زانستی زمان زەرەری نەدەکرد، وەك ئەوەی کە من یان تۆ بڵێین و نەڵێین لەخۆوە ئاشکرایە کەسێکی شارەزای زانستی زمان نەبێت و سەرنجی قووڵی لە بابەتەکانی نەگرتبێت سەرکەوتوو نابێ لە بۆچوون و بیروڕاکانی سەر بەزمانەوانی، چونکە ئەم قسەیەش وەك هێنەکەی ئێنگلیز لە ڕادەی بەدیهییەدا و چ ڕێنموونییەکی تێدا نییە و بەئاسانی دەتوانین لێشی زیاد بکەین و بڵێین: زمانەوان هەتا پتر شارەزای زمانە هاورەگەزەکان و لێك جوداکان بێت باشتر بۆی دەلوێ بیرگێڕی لە تان و پۆی (زمان) بکات. لە پەندی فەلاحاندا قسەیەکی ئەستەق هەیە دەڵێ کابرایەك خۆی کردبووە پسپۆری هەرمان هەڵگرتن و دەغڵ داگرتن، پاڵی لێ دابوووەوە و دەیگوت: گەنم لەسەر گەنم ڕۆ بکەن و جۆش لەسەر جۆ.. ماڵیناوابێ بۆ ئەو نەقڵەی کە ئەگەر لە کاریشی نەهێنابایە گەنم و جۆ جێگەی لەباری خۆی دەدۆزییەوە.

ئەم گرنگییەی بۆ ڕایەکەی ئێنگلیز ڕەوا دیتراوە لە گەلێك حاڵ و باردا بۆ غەیری ئەو و لە مەیدانی زۆر گرنگدا ڕەوا دیتراوە کەوا نەك هەروەك ئێنگلیز بێ لزووم بووە بگرە هەتا بڵێی زەرەربەخش و وێرانکاریش بووە، ڕەنگە لەباری پێچەوانەدا ڕایەکی زێدە ڕووناکی بابایەکی بۆرەپیاو کەس ئاوڕی لێ نەداتەوە حەمدی دەڵێ:

بـازاڕی دەهـرە قـیـمـەتـی ئـەشیـا بـەجـێـگـەیـە
مێشێ بگاتە ڕوویی نیگار هەر لە خاڵ ئەچێ

چ گومانم لەوەدا نییە لە نووسینەکانی د. ئاورەحماندا بیروڕای ئەوتۆ هەیە چەندین ئەوەندەی ڕایەکەی ئێنگلز و ئەو ڕاپانەی بەسەرچاوەی داناون وردبێنتر و نیشانە پێکاوترن، مەبەستیشم لە تێکڕای نووسینەکانییەتی بەتایبەتی ئەوانەی زادەی فکری خۆیەتی. ئایا چەند لەو جۆرە ڕاپانەی دەکرێن بەدروشم؟ کەچی شێخی تەریقەت قرلێنە دەهێنێتەوە سەڵەواتی لێ دەکێشن، لێی موبارەك بێ.

ئەو گۆشە بەرتەسکەی کە گوتم ڕێم نەدا بۆچوونێکی خۆمی تێدا دەربیرم مەنعم ناکات لەوەی بەپێی پێویست لە تاکە مەسەلەی ناو گوتارەکە بکۆڵمەوە. یەك لەوانە سەرتـاوی گوتـارەکـەیە کە لە (بنـەمـا سەرەکییەکـانی زمـان) هـاتووە. بەلای منـەوە پەراوێزی (زمان) لێك دەکێشرێتەوە پتر لە داخوازییەکانی (ڕێزمان) هەر نەبێ لەبەر تیشکی ئەو ڕاستییە زلەی کە زمان دایکی ڕێزمانە- ڕۆژگارێك کە مرۆ دوای پشکووتنی

هۆشی دەستی کرد بەگرۆگاڵی ناخاوتنی سەرەتایی لە تاکە وشە بەولاوە وجوودی نەبووە. کەس نازانێ چەندین ساڵەهای برد هەتا (کار -فعل) پەیدا بوو، ئینجا کاتەکانی کار، ئینجا گەردانی... زمان تەرجومانی هۆشە، تا بتوانێ لە ڕێی ئاخاوتنەوە (کە دەکا ڕستەی خاوەن واتا) تەعبیر لەو وێنە و نیازانە بداتەوە کە بەهۆشدا تێ دەپەڕن. وا دەبێ (وشە)ی قامووسی ولێ لێ دەهێنێت بۆ وشەی دەرەوەی قامووس و ڕێزمان وەک کە (پشە، ختە) بەکار دەهێنێت بۆ بانگهێشتن و دەرکردنی پشیلە کە هەردووکیان دەنووسرێن، واتای کاری فەرمانیشیان تێدایە بەڵام وشەی ڕێزمانی نین کە گەردان بکرێت، جا ئەگەر لە قامووساندا نووسراون بەوەدا نابنە وشەی ڕێزمانی چونکە قسەی وشەکان لەگەڵ مرۆڤ نییە ڕووی لە زیندەوەرە. لەم بابەتە دەنگدان و بانگهێشتنی زیندەوەر دەنگی وەها هەیە نووسینیش هەڵناگرێت وەک کە مەیتەر یان شوان و گاوان لە ئاژەڵەکان ڕادەخوڕن یان بۆ ئالیك بانگهێشتنیان دەکەن. نموونەیەکی مناسبی ئەم جێگەیە لە نووسینەکەی د. ئاورەحمان دەهێنمەوە کە لە بەرەو کۆتاییی لاپەڕە ۷۸دا (ئازاد هات.) و (ازاد هات؟) دەبینین: ئیشانەی پرسیاری شکڵی دووەمی ڕستەکە خۆی لە خۆیدا پێوەندیی بەڕێزمانەوە نییە ڕستەکانیش لەلایەن پێکهاتنەوە یەك شتن و ڕێزمان هیچی پێ ناکرێ لە خودی ڕستەکاندا بنەما بدۆزێتەوە بۆ لێکتر جوداکردنەوەیان کەوا (ئازاد هات) ڕستەیەکی خەبەرییەو (ئازاد هات؟)یش ئینشانییە کەچی (زمان) توانیوەتی بەجۆری گۆڕینی ئاهەنگی دەنگ بۆ سەرباری پرسیار جارێکیان ڕستەکە بکاتە خەبەری و جارێکیان بیکاتە ئینشائی. ئەو جۆرە جوداوازیی ئاهەنگیش لە خەبەرەوە بۆ پرسیار لەوانە نییە بنووسرێت چونکە مۆرفێمەکان لە هەردوو حاڵەتدا یەك شتن. لە پرسیار واز بهێنە و وەرە سەر حاڵەتی لۆمەکردن وەیا شکاندنەوە وەیا هەڕەشە وەیا گلەیی دەبینی لە تەنها وشەی ناوی (ئازاد)دا هەر جارە ئاهەنگێك پەیدایە لەگەڵ مەبەستەکە خزم بێت، تا لەمانەشدا ڕێزمان هیچی پێ ناکرێت مەگەر بەنیشانەدانان وەك ئیشانەی سەر ڕێوبانان کە هەریەکە پێ ئاخاوتن واتایەك ڕادەگەیەنێ وەك: (تێ پەڕە – بووەستە – بەواش کە – بەچەپدا...). لە نموونەدا دەڵێم کە ویستت (ئازاد هات؟) بخەیتە بەر حوکمی ڕێزمانەوە وشەیەکی بچووکی سەر بەپرسیاری بخەرە پێشەوە و بڵێ (ئەرێ ئازاد هات؟ ئایا ئازاد هات؟) هەروەهاش بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مەبەستە جودایانەی وەك لۆمە و هەڕەشە، دەشێ هێندی لەوان بەخستنەسەری زیادییەك ببنە ڕێزمانی،

هێندێکیشیان هیچی لەگەڵدا ناکرێت مەگەر ئاهەنگی دەربڕینی، کە سەر بەزمانە نەک ڕێزمان. بەیتێکی سەرلەبەری صۆفیگەریی مەولانا جەلالی ڕۆمی لە دیوانەکەی ناودار بە(شەمسی تەبریزی) ئەمەیە:

تەنەنەنتەن تەنەنەنتەن تەنەنەنتەن تەنەنەن

تـەنـەنـەنـتـەن تـەنـەنـەنـتـەن تەنەناها یاهو

ئەم وشە بێ واتایانەی قاموسی، وێنەی بەنگکێش نییە، بگرە قسەی سارووسڕی عادەتیش نییە کە مرۆی سادە تێکی هەڵدەشێلێت. لە ڕووی قیاسەوە وەک شیعری ڕەها و تابلۆی سووریالییە کە ژان و ژوواری ناخی دەروون بەوەسیلەیەکی تەعبیری ئەوتۆ وەدەر دەنێ ئاهاوتن و فرچەگێڕی ئاسایی دەرومستی نایەت. (تەنەنەنتەن) بەر دەستووری ڕێزمان ناکەوێت کەچی لە جغزی زماندایە و بەمۆرفیمی عادەتی ڕۆنراوە.

پاش لێبوونەوە لە (ئازاد هات..) لە سەرەتای لاپەڕە ٧٩ بیروڕایەکی ف.م. بیریزین، ب.ن گۆلۆڤین کە ژمارەی ٢ی پەراوێزی دراوەتێ بەم جۆرە هاتووە: (بەم شێوەیە ماکی ڕێزمانی، کە وەسیلەی دەربڕینە، بەتاکە تاکەی وشەوە بەند نییە، بەڵکو بەماکی وشەوە. مۆرفێم و ئەو ئامرازانەی لە ڕووی ئەرکەوە لێیەوە نێزیکن و هەروەها ئاواز و شێوەی ڕیزکردنی وشەکانەوە بەندە).

ڕاستییەکەی من ناتوانم یەک هەنگاو لەگەڵ ئەم ڕایەدا بڕۆم نەک هەر لێڵی و تەماویبوونی واتای سەرلەبەری ڕایەکە کە نازانم بەسەر چییەوە کورک دەبێت. کەی (وەسیلەی دەربڕین) ڕێزمان بووە؟ ئەدی (زمان) وەسیلەی چییە؟ ڕێزمان دەستووراتی ڕوونکردنەوەی تان و پۆی زمانە، خزمەتکاری زمانە، سێبەری زمانە. ڕێزمان هەبێت و نەبێت زمان لە کاردا دەبێت خۆ لە سەدی نەوەد و پێنجی ئاخێوەری جیهان نازانێ ڕێزمان چییە، قوتابیی قوتابخانەکانیش بەزۆری لە ئەزموونیدا دەکەون، زاناکانی زمانیش لەگەڵ یەکتردا نەگونجانیان زۆرە. ئەم باسەش زۆری بەبەرەوە هەیە لێی دەترازێم بۆ تێبینییەکی دیکە لەوەدا کە دەڵێ ماکی ڕێزمانی بەتاکە وشەوە بەند نییە بەڵکو بەماکی وشەوە.. کە مۆرفیم و... ئامراز و... ئاواز و... شێوەی ڕیزکردنی وشەکانەوە بەندە. چەند سەیر و سەمەرەیە کە لە سەرەتای وتاردا وشەی زمان و پێکهاتنی ڕێزمانی دوو بنەمای سەرەکیی زمان بن، لەم ڕایەی بیریزین و گۆلۆڤینیشدا وشە جێ چۆڵ دەکات بۆ مۆرفیمەکانی ئەو ئامرازانەی لێیەوە نزیکن و بۆ ئاواز و

شێوەی ڕیزکردنی وشەکان... مۆرفیم دەشێ بەسەربەخۆیی باس بکرێت کاتێک لە فۆنۆلۆجی و فۆنەتیک بدوێین بەڵام کەی بەبیری کەسدا هاتووە کاری (هات) پێوەندیی بە (ماکی ڕێزمان)ەوە نەبێ ئەمما هەر کاتێک لەو سێ مۆرفیمە یەکسەر بەڕێزمانەوە بەند بێت. ئینجا کە باسی (ئاواز) بەقاچاغ دێنێتە ناو لێکۆڵینەوەوە بەبیریدا نەهاتووە کە قسە لە (ڕێزمان)ە نەک (زمان) یاخود باشتر ئەوەیە بڵێین فەرقی بەوە نەکردووە زمان و ڕێزمان یەک شت نین هەروەک جوغرافیای کوردستان و وڵاتی کوردستان یەک شت نین. . کە دەڵێ (شێوەی ڕیزکردنی وشەکان..) لەوەی تێهەڕ نەکردووە کە بڵێ (شێوەی ڕیزکردنی هەنجیرەکان و سەبەتەکان و ئازانم چییەکان) چونکە لە زمان و ڕێزماندا تێکبەستنی وشە و ڕستە بەهەر هۆیەک بێت، بایەخدارە نەک ڕیزکردنیان. دە هەزار وشە لە قاموسدا ڕیز دەبن بەڵام ڕستەی ئاوێتی لەو ڕیزکردنەدا پەیدا نابێ.. لەمانەش بترازێین ئەمەیوو (ئامراز) بخاتە تای ئەم سێ مادە کەم بایەخەی (مۆرفێم، ئاواز، شێوەی ڕیزکردن)ەوە مادەم قسە لە زمان و ڕێزمان بێت.

سەیرێکی چەند دێڕی خوارەوەتر بکەن لەو لاپەڕەیەدا کە بیروڕای د. ئاوڕەحمانە دەبینن تا چ ڕادەیەک قووڵترە لەو تەنکاوەی دوو زمانەوانە ڕووسەکە. لە دێڕی نۆیەمی قسەکانی د. ئاوڕەحماندا کۆتاییی ڕستەیەک هەیە کە ئەمە دەقی ڕستەکەیە: «ڕستەش لە وشە پێک دێت، کە بەپێی یاسای ڕێزمانی پێکەوە دەبەسترێن». چەند ئوستادانە گوتی: «پێکەوە دەبەسترێن»! هەر دوای ئەمەش دەڵێ «وشەی پچڕپچڕ کە خاسیەت و پێوەندیی ڕێزمانە بەیەکەوەی نەبەستبن، ناتوانن ببن بەڕێک دەربڕین) تا ئەم ڕایەش سەرلەنوێ بەبوارێکی تازەدا بەرەو تەنکیدی (تێک بەستن)ەوە دەڕوات نەک ڕیزکردن. بەداخەوە نازانم ئەو نووسینەی لە دێڕی پێنج هەتا دێڕی بیستی لاپەڕە ٧٩ی گرتووەتەوە چەندیان بیروڕای د. ئاوڕەحمانە و چەندیشیان هی پ. ئا. بۆدلگۆڤە کە پەراوێزی ژمارە ٣ لە کۆتاییی دێڕی بیستەمدا ئیشارەتی بۆ دەکات. ئەوەندە هەیە هەتا بەرەو دامەنی دێڕەکان دەبینەوە تووشی بۆچوونی سەراوی دەبێت. دوای ئەو نموونەیە لە بیروڕای د. ئاوڕەحمانم خواستەوە ئاڵۆزیلۆزی دەست پێ دەکات تا دەگەینە ئەم بۆچوونە سەروینە کە دەڵێ: «پێکهاتنی ڕێزمانی خاسیەتێکی هەرە گرینگی زمانە وە بەبێ ئەو زمان پێک نایەت). لەم قسەیەدا مەحکومبوونی زمان بەڕێزمانە چووەتە پلەی بەندبوونی گەرانی گەرۆک بەبەنزین کە دەزانین بەنزین بەشێکی گەرۆک نییە کەچی ڕێزمان بەشێکی زمانە وەک تایە و مەکینە بەشێکی گەرۆکن تۆ ناتوانیت

ڕێزمان لە جوغزی مان دەرهاوێژێت بەتیازی ئەوەی لێی بکەیتە حاکم و ئاغا. لە نووسینی کۆنمدا گوتوومە: چونکە زمان تەرجوومانی هۆشە هۆشیش قابیلیەتی ڕێکخستن و پێکگرتن و یاسادانانی هەیە بۆیەیە زمان توانیویەتی ببێتە خاوەن (دەستوور) کە زادەی مەنتیقی هۆشە. گوتووشمە: دوای ئەوەی زمان بوو بەخاوەن دەستووراتی تایبەت بەخۆی کەوتە بارێکەوە بتوانێ لە مەنتقی ناوەکیی خۆی، نەک هەر لە مەنتقیی هۆش، دەستووراتی ڕێزمانی هەڵێنجێت تا ئەوەی لە تێک ئاڵقانی هەزاران وێنەی زیهنی لەگەڵ چەندەها یاسای ڕێزمانی دیاردەی (شاز – ڕێزپەڕ) لە ڕێزماندا پەیدا دەبێت کە دژی خورگەی مەنتقی هۆش تێ هەڵدەچێت. لە دیاردەی (ڕێزپەڕ – شاز)دا بۆت دەردەکەوێت کە (ڕێزمان) و یاساکانی لە ئاستیدا پەککەوتەن کەچی (زمان) هەر حاکمە بەسەر شازدا وەک کە حاکمە بەسەر ڕێزمان و کەرەستە و دەستووراتی. هیچ بەرهەڵستێکی عەقڵی لەوەدا نییە کە زمان بێ یاسای ڕێزمانی بتوانێ ڕاگەیەنی بێت: گوایا ئەگەر هەموو فیعلەکانی وەک (گوتم، دەڵێم – بیستم، دەبیستم). لە گەرداندا ڕێزپەڕ بانایە چ دەقەوما، خۆ دەزانین بەشێکی زێدە زێدە بەرچاوی فیعلەکانی زمانی ئینگلیزی لە ڕابردووەوە بۆ ئایندە گەردانی بێ یاسایان هەیە؟ ئەمە دەڵێم ڕەنگە من یەکەم کەسیش بم بۆ ئەوە چووبێ کە بەشی هەرە زۆری فیعلی کوردی گەردانی دەستوورییان هەیە وەک فیعلی ڕوودان (مطاوعی عەرەبی) و کارا نادیار (مبني للمجهول) و ڕێژەی (خشین، دزین، کێلان، ژماردن، پالاوتن، پساندن – بەپاشگری «اندن»). دەبێ بڵێم نموونەی (خشین، دزین)م بۆیە بەدوو ڕێژە دانا چونکە (دزین) تێپەڕە و (خشین) تێنەپەڕە کەچی گەردانیان بۆ ئایندە وەکو یەکە: (خشیم، دەخشم– دزیم، دەدزم). لەلایەکی دیکەوە (خشین) هەرچەند تێنەپەڕە بەڵام فیعلی ئیرادیییە نەک هی ڕوودانە خۆ ئەگەر هی ڕوودانیش بایە وەک (خزین) گەردانی نەدەگۆڕا، مەگەر لە فیعلی زێدە دەگمەن کە هەندێ لەهجە گەردانەکەی دەباتەوە بۆ گەردانی فیعلی ڕوودان و دەڵێ (دەخزێم) وەک کە دەڵێ (سووتام، دەسووتێم).

نەکا لە ئاست ڕێژەی (کێلان، پێوان) کە تێپەڕن، (شێوان، گێژان) بەبیری زمانەوانی شلکدا بێت و وا بزانێ لە ئایندەدا دەبنە (دەشێوێم، دەگێژێم). بەسەدا ڕێژەیان ڕێزپەڕ بووە، دەڵێم هەرچی فیعلی ڕوودان و کارا نادیار هەیە کە کۆتاییان بە (أ) هاتووە لە گەرداندا ئەو ئەلفەیان دەبێتە (ێ) وەک: پسا، دەپسێ– ڕما، دەڕمێ – شکا، دەشکێ –کوژرا، دەکوژرێ – دیترا، دەدیترێ.. هتد. لە ڕێژەی کێلان فیعلی (وێران) لە

گومانداية ئايا تێپەڕە يان تێنەپەڕ، لەلايەكەوە بەشێكي زۆري ناخيوەري كورد وەك تێپەڕ گەرداني دەكات و دەڵێ: (وێرام، دەوێرم) هي واش هەن، بەتايبەتي لە نێوان عەشيرەتدا دەڵێن (دەوێرێم) وەك كە فيعلي ڕوودان بێت نەك تەنها تێنەپەڕ بێت. ئەگەر فيعلي ئيرادي بڕوايە وەك (هەڵستان) دەبوو لە ئاينەدا ببێتە (دەوێرم). هەڵستانيش دەبێتە (هەڵدەستم، نەك هەڵدەستێم). لەگەڵ ئەمەشدا كە (وێران) بەزۆري وەك تێپەڕ مامڵەتي لەگەڵدا دەكرێت و لە گەرداندا دەكرێتە (وێرامان، وێرايان) ديسانەوە دەبێ هەست بەوە بكەين كە بەركار (مفعول) داوا ناكات ئەو دەمە نەبێ كە وەكو چەند فيعلێكي كوردي بۆ (مبادرە) بەكار دێن ئەويش لەو حاڵەتەدا مەفعوولي ناسەريحي دەبێ. سەيري ئەم نموونانە بكە:

هاتم بنووم لێيان تێك دام

وێرامان بنووين

هەستام بڕۆم باران لێ نەگەڕا

دەڵێم بڵێم و ناوێرم

ئەم كارانەي (هاتم، هەستام، دەڵێم). لەم بەكارهێنانەدا واتاي ئەسڵيان مەبەست نييە. (هاتم، هەستام) بەواتاي (خەريك بووم)ە (دەڵێم)يكەش بەواتاي (دەمەوێ، نيازمە)يە. لێرەدا بەركاري (وێرامان) فيعلي (بنووين)ە و لە هەموو ڕستەكانيشدا بەرباري (مبادرە) كە فيعلێكي ئينشائييە وەكو (بنووين). فيعلي (وێران) جگە لەم حاڵەتە كە دەگمەنە، لە حاڵەتي ئينتيقاليشدا تەنيا يەك مەفعوولي دەوێت بارتەقاي فيعلي تێنەپەڕ وەك لەم نموونانەدا دەردەكەوێت:

وێرامە مەحموود، دەوێرمە مەحموود، دەيوێرمێ.

چوومە بازاڕ، دەچمە بازاڕ، دەيچمێ.

كەوتمە باغەكە، دەكەومە باغەكە، دەيكەومێ.

فيعلي ئينتيقالي تێپەڕ لە جێي مەفعوولێك دووي دەوێ، وەك:

بەردم گرتە چۆلەكە [بەرد، چۆلەكە]

دەستي خستە باخەڵم [دەست، باخەڵ]

دارام هەنارە ڕانيە [دارا، ڕانيە]

دەبوو بشڵێم لە ڕێژەي (بژاردن، سپاردن، هەناردن)دا كە هەموو دەستوورين تەنها

فیعلی (خواردن) ڕیزەیەڕە کە لە ئایندەدا دەبێتە (دەخۆم) نەک (دەخوێرم) وەک ئەوانی سەروو دەبینە (دەبژێرم، دەسپێرم، دەهەنێرم، دەنێرم).

ئەم لادانە ناچارییە لە ئەسڵی بابەتی موناقەشە بەتیازی کڵەبەرگرتن و سوودی خوێنەر بوو کە هەموو دەم هەڵی خوێندنەوەی بابەتی ئەوتۆیی چەنگ ناکەوێت.

ڕاستییەکەی، مەبەستی من ئەوە نەبوو لە هەموو ئەو شوێنانەی گوتارەکە بدوێم کە بەلامەوە تێهێبنی هەڵدەگرێت، ئێستاش مەبەستم نییە هەر ئەبێ لەبەر دوو هۆی سەرەکی:

یەکەمیان ئەوەیە کە نووسینەکەم بەجۆرێکی وەرسکەر درێژ دەخایەنێ. دووەمیان ئەوەیە بەشی هەرە زۆری ئەو بیروڕایانەی لە نووسەرە ڕووسەکان وەرگیراوە ئەوەندە کەمبڕشت و سەرەتایین هی ئەوە نین جارێکی دیکەش خەڵق بەخۆیەوە خەریک بکات. شتێکی کە بەئیلحاحەوە خۆی لێ کردم بەئامانجی یەکەمی شەرحدان و ڕوونکردنەوە لەم نووسینەمدا دوو بیروڕای ئا. ن. گۆزدیێف بوون کە لە بەرەو کۆتایی لاپەڕە ۷۹دا ژمارەی ٤، ٥ی پەراوێزەکانیان دراوەتێ. چی لێرەدا کارمان پێیداپە شەش دێری دوایی پەرەگرافەکەیە کە دابڕینیان لە زنجیرەی بابەت خەڵەلێکیان بێ ناگەیەنێت. ئەوەتا دەقی دێرەکان

[وێکچوونیش لە نێوان ئەو دەستەواژانەی «ڕێزمان»یان تێدایە وەک «یاسای ڕێزمانی»؛ «دەستووری ڕێزمانی»؛ دیاردەی ڕێزمانی» ئەوە دەگەیەنن کە: یەکەم – «ئەوەی دەکەوێتە پێکهاتنی ڕێزمانیی زمانەوە، بوونێکی مەوزووعیی هەیە». دووەم – دامەزراندنی زانستی زمان بۆ ئەو ڕێژە مەوزووعییانەی لە زمانەکەوە هەڵدەهێنجرێن، ئەو ڕێژانەش دەشێ ڕاست بن و دەشێ هەڵە بن].

لە پێشەوە دەبێ بڵێم مامۆستا گۆزدیێف دەبوو خۆپارێزی بکات لەو حوکمە موتڵەقەی کە دەری بڕیوە بەسەر (مەوزووعییبوونی هەرچی دەکەوێتە پێکهاتنی ڕێزمانیی زمانەوە). ڕێزمان فەلسەفە و زانستی و بابەتی ئەوتۆیی نییە کە لە خۆوە و بەهێی دەستوورەکانی ناوەکیی خۆی مەوزووعیبوونی کەرەستەی ئاهاوێن دەرک بکات: ئایا دەنگی (ی) لەخۆوە هیچ واتایەکی هەیە مەوزووعی و نامەوزووعی بێت؟ کە خرایە دوای (جوان) و (جوانی) پێک هات، ئەم واتایە تەجریدییە لە کام لەرانەوەی (ی)ەکەوە زایەوە؟ ڕەنگە بگوترێ چونکە بەئەسڵ وشەی (جوان) واتایەکی مەوزووعیی

هەیە کەرەستەیەکی کە پێشیەوە دەبەسترێت ئەو مەوزووعییەتە وەردەگرێت، تا لێرەشدا واتای مەوزووعییەت لە عەینی تێکبەستن و بەستنەکەوە چرۆ ناکات وەک خونچە لە بنە گوڵەوە بەکسەر چرۆ دەکات: ئەوەی ئەجریدەکە لەو (ی)ەوە دەخولقێنێ نەک رێزمان نییە و بەس بگرە (زمان)یش نییە بەڵکو هۆش و مەنتیقی مرۆیە، خواز و ئیرادەی مرۆیە کە دەبینین لە دەریای ئەفسانانەدا مرۆ بەلای ورێنەی وەهادا چووە بەک زەرە مەوزووعییەت و مەنتیقی تێدا نییە کەچی هەموو ورێنەکان بەپێی یاساکانی رێزمان رێکوپێکن و عەیبیان لێ ناگیرێ. مامۆستا گلۆوزدییف ویستوویەتی پارسەنگێکی قسە بێ لەنگەرەکەی بەوەدا بداتەوە کە لە کۆتایی رایەکەیدا دەڵێ: «ئەو رێژانەش دەشێ راست بن و دەشێ هەڵە بن.» بەڵام پێوەی دیارەکە بەرەو قووڵایی مەسەلەکەدا نەچووە چونکە نە چارەیەکی مەوزووعیەتبوونی هەڵەی کردووە و نەزانیوەتی (یان بەبیریدا نەهاتووە) هەڵە پێوەندیی بەرێزمانەوە نییە و نە بۆ شتێکی دیکەی زێدە گرینگیش چووە لەم رایەیدا کە (هەڵە) تاکە شێوەی بێژۆکی ناخاوتنی نادروست نییە چونکە بەلای کەمەوە بە سێ شێوە بێژۆک هەن لە ناخاوتندا کە ئەگەر بەکێشانە و پێوانەی (رێزمان) هەڵسەنگێندرێن راست و دروست دەردەچن:

شێوە بێژۆکی یەکەم هەڵەیە.

شێوەی دووەم درۆیە.

شێوەی سێیەم قسەی بێ واتایە.

شێوەی چوارەم قسەی بێ واتای رێزمانە کە ئەمەیان جودایە لەوان.

شێوەیەکی دیکەش هەیە کە وەک ورێنە جودایە لەو سێ شێوە بێژۆکەی باس کران ئەویش قسەی واتاداری رێزمان چرووک. شێوەی دوایین کە ئەویش نایەتە حیسابی ئەم نووسینەوە، قسەی بێ واتای بێ رێزمانە.

رێزمان دەتوانێ لەلای خۆیەوە بەدەنگ بێت لە یەکێك بڵێ (ئێمە خواردتان) بەڵام هیچی پێ ناکرێ لەگەڵ درۆ و هەڵە و قسەی رێزمانیی بێ واتادا: ئەم بێ دەسەڵاتییە سروشتییەی رێزمان وەك بێ دەسەڵاتیی (باغەوانی)یە لە ئاست بارانی ناوەختدا. بابایەك بەپێی دەستووراتی رێزمان دەڵێ: بروسکە بڵێسەی هەناسەی دێوە. یاخود گاڵتەبازێك دەڵێ: لە بازاڕ شووتی راوی پۆلیسێکی نا. یەکێکی دیکە گوتی: هەتا لای بەهار سەرجەمی پەپووله لە تونێکڵی فیزیابەدەر ئەرێوی دەسمێت و هیچ، مەگەر

لایلایه چاری مەسەلەی سۆماڵی پێوە بلکێت. تا ئەم ڕستانە هەڵەی ڕێزمانییان تێدا نییە و ڕێزمانیش ناتوانێ لێیان بەعەنگ بێت چ جایی ئەوەی کە خاوەن ڕێزمانەکە خۆی نەزانێ ئایا قسەیەکی دەیبییەت ڕاستە یان هەڵە یان درۆ.

مرۆڤ، لە ڕێی کاریگەری هۆشەوە کە ئالەتی تێگەیشتن و (تصور) و بیردۆزی و هەڵسەنگاندن و ڕاستگۆیی و درۆزنی و بەهەڵەداچوون و نیشانە پێکانیەتی، بەناچاری و لە شێوەی حەتمیدا مەخلوقێکی (زاتی)یە و لە هەموو جیهانی زانراو و هەست پێکراودا تاکی خۆی نییە بۆ (زاتیبوون) تەنانەت (مەوزووعیەت)یشی لە زاتەکەیەوە دەزێتەوە، لە پێش هەمووانەوە (زانست)ەکانی کە لە سەرەتادا هەمووی گەلاڵەیەکی پڕ هەڵە بووە، بەلام مرۆڤ بەڕاستی داناوە وەک کە باوەڕی وەها بوو سروشت بریتییە لە چوار عنصر: ئاو، خاک، هەوا، ئاگر دواتر دەرچوو هیچیان (عنصر) نین.

زانستی ئاسماننناسی وەهای دەزانی ئاسمان بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە؛ دەرچوو (ئاسمان) هەر لە بەینیدا نییە. خولاسە زانستی کۆن لە هەر مەیدانێك بووبێت هەر ئەبێ لە چەند ڕوویەکەوە هەڵەی تێدا بووە، هەندێکیشی سەرتاپای هەڵە بوو کەچی بە(زانست) حیساب دەکرا، دەشبوو وەها بێ چونکە ڕێی دیکە نەبوو بەرەو بۆچوونێکی ڕاستتر بڕوات. ئێستاش دینداری حەق و ڕەق هەیە ئەگەر دەستی بڕوات ئاسمانگەردی بەسەر زاناکانیدا دەتەپێنێ. ئێمە کە دەڵێین (مەوزووعی و زاتی) زۆر... ، ئەوەمان لە بیر دەچێت کە مەوزووعییەت لە هەر شتێکدا بێت، بەپێی بڕیار و تێگەیشتنی مرۆیە. هەر بۆیەیە یەکێك مەوزووعیەت لە بوتپەرستیدا دەبینێت و یەکێکیش لە ئیلحاددا. ڕێزمان بگرە بە نموونە دەبینی هەر کۆمەڵەیەك لە زمانناسەکان باوەڕی بەرابەرێك هەیە جودایە لە ڕایەوی دراوسێکەی. هەموورشیان خۆ بەمەوزووعی دەزانن. دە هەزار دین و هەزاران مەزهەبی هونەری و سیاسی و ئابووری و فەلسەفی و کۆمەلایەتی و هەزاران هەزار چەژی ئەدەبی و هەستی جوانی و پێوانەی داد و نەریت و نازانم چی ئەو میلۆنەها مرۆیە بەشەر دەهێنێت و بەزۆریش خۆیان لەسەر حەق دەزانن واتە گۆیا مەوزووعین. ئێیاندا هەیە پەیوەرە لە دۆشینی مەرگەلی مرز خۆی بەگۆل لە قەڵەم دەدات و فۆچەبڕێ بەسەر دیواری لای ڕاستەی دەرگەی ماڵییەوە چەسپ دەکات، بەلام مسڵمان و هیندۆس کە لەسەر گەونە پەرستگەیەك سەدەها کەس لە یەکتر دەکوژن چۆناوچۆنی مەوزووعین. ئەوانەی ڕاناویان پەسەند کرد بەزاراوە و پێشگری کاریان

بەناوەوە لکاند لە کوێوە مەوزووعین؟ ئینجا ئەگەر لەلاپەڕە ٧٩دا قسەیەکی گڤۆزدێڤ بخوێنینەوە کە دەڵێ: (یەکەم – ئەوەی دەکەوێتە پێکهاتنی ڕێزمانیی زمانەوە بوونێکی مەوزووعیی هەیە) چارت نییە دەبێ لێی بێ دەنگت بیت و بڵێیت ئەم ڕایە دەبوو پتر بەلای (وشە)دا بچێتەوە، چونکە لەوانەیە وشەیەکی وەک (بەرد) هەر ئەو واتایەی هەبێ کە (حجر)ی عەرەبی هەیەتی، بەلام دەشێ لە ڕووی ڕێزمانەوە (ئەحمەد ڕۆیشت) جودا بێ لە (أحمد ذهب) چونکە ڕستە عەرەبییەکە (مبتدأ وخبر)ە نەک (فاعل وفعل). دەبێ ئەوەش لە بیر نەکەین وشەی (حجر، بەرد)یش چ حیسابێکی بۆ ئەرکیی فیزیایی مادەکە نەکردووە کە لەوانەیە زۆر لەوانەی بەبەردی دەزانین بەپێی تەکوینیان لێکتر جودا بن. بەهەمەحاڵ چ بەردە، چ تاوێر، چ حجر، چ صخر، چ Stone. هەرچی وشەی وەک ئەوانیش هەن لە مادەکەوە دەنگی ئەداوەتەوە بۆ بەرگوێی بیسەر وەک کە گڤەگڤی با لە ناو گیا و گۆڵدا دەبێ تەمەحوولی مرۆ پەیدا دەبێ هەرچەند ناوێکی هەبێ یان نەبێ. هەرچی وشەکانی مرۆ کرد زاتییە. لە نووسینی کۆندا گوتوومە لەوانەی پەیوەندیی (خالقیة و مخلوقیة)یان بەمرۆڤەوە هەیە هیچ شتێک بەقەدەر (ئاخافتن) مەخلوقی بەشەر نییە: منداڵ کە لە دایک و باوک پەیدا دەبێ لەشەکەی مادەیە هەروەهاش هەرچی دروستکراوی مادیی بەشەر هەیە قاڵبەکەیان مەخلوقی سروشتە کەچی (وشە، ڕستە) هەمووی هەر هی بەشەرە. لەوەوە پەیدا دەبن، بەخوازی ئەو دەبن، ئەو هەڵەیان تێدا دەکات. زمان پتر ماڵی مرۆیە لە بەرهەمی هونەری کە مەهارەتی مرۆ لە مادەدا دەریدەخەن چونکە لەوانەیە بەدرێژایی ڕۆژ وتووێژی دەروونی لەگەڵ خۆیدا بکات کە لزوومی بە (هەوا)ش نییە دەنگەکە بگەیەنێ، وەیا بینووسێت. خولاسە: وشە، ڕستە، زمان عەهدی مرۆیە پتر لە هەموو دروستکراوەکانی. هەر لەو نووسینەدا گوتبووم، زانینی ئەو هۆیەی دەروونی کە وەهای لە کورد کرد ئەداتی پێناسین پاش بیەخێت و عەرەب و ئینگلیزیشی بەوە ڕاهێنا کە پێش وشەی بیەخەن پتر لە دەروونی مرۆمان شارەزا دەکات لەوەی بزانین ورگی مرۆ چۆناوچۆنی خۆراک هەزم دەکات چونکە مەڕ و بزنیش خۆراک هەزم و دەکەن بەلام قسە ناکەن.

زمان خۆی، زانستی زمانیشی لەگەڵدا بێ، لایەنی (ذاتیە)تی لێ ناسڕێتەوە وەها بەڕەهایی و سەراوی کە لە ڕایەکەی گڤۆزدێڤدا دەربڕدراوە: وشە کە (أسناد)ی تێدا نییە و خۆی (تجرید)ی ئەو شتەیە وشەکەی بەسەردا بڕاوە ئیتر خواوڕاستان یا نیشانەی پێکاوە یا لێی بەهەڵەدا چووە وەک کە بەشێکی یان دەڵێ (ئاسمان) و

دەپەرستێت و لێی خەرج دەکات کەچی دەشێیە و نەیانە و نەبەرزە و نەهیچە مەگەر ئەو وەهمەی لە خەیاڵی مرۆڤدا بۆ ئاسمان ساز دراوە بە(مەوزووعی) حیساب بکەین. هەرچی وشەیەکی سەر بەوەهم و ئەفسانەوە بێت ئەویش هەر وڕێنەی (زات)ی مرۆڤە فڕی بەسەر مەوزووعیەتەوە نییە. کە حاڵی گەلێك وشەی بێ دەنگ و دوور ئەو نامەوزووعییە بێت دەبێ (ڕستە) کە پتر لە وشە بەلای تەجریددا دەچێتەوە و (اسناد)یشی تێدایە بەرەو هەڵە و درۆی دەباتەوە و ئامرازی وەهای تێدایە بەتەنهایی هەر واتای نییە و شێوەی دەنگ و ڕەنگی مرۆڤ کە بەشێك نین لە ئاخاوتن و دەوریان هەیە لە تەکوینیدا، ئایا کە حاڵی ڕستە ئەمە بێت چەندی مەوزووعی دەردەچێت و چەندی وەهم و فیشاڵ وڕێنە و هەڵە و درۆ؟ بەڵێ دەزانین شتێك هەیە تا بڵێی گرینگە (ئاخاوتن)ی ناو لێ نراوە، بەلام بڕیاردان لەسەر مەوزووعیبوونی ئاخاوتن بەو شکڵە موتڵەقەی گڤۆزدێیف خۆی لێ بێ خەم کردووە شتێکە بەبڕیەوە هەیە بەشکڵی موتڵەقی لە ڕاستی دوور بێت چونکە هەر لە وشەی سادەوە هەتا سەرلەبەری ئاخاوتنەکە بەڕلست و درۆیەوە. ئەندێشەی مرۆیە، لە هۆش و گۆشی مرۆوە نەك لە (فڕین، برژان، کوشتن)ەوە ڕێژە (فڕی، دەفڕێ، بیرژێ، دەیکوشت، فڕی بابە.) پەیدا بووە. ئەگەر هاتبایە مرۆ بەداخوازیی (فڕین، توانەوە، مردن) ڕێژەی بۆ حاڵەتی جوداجودایان دانابایە لەوانە بوو هەر جارە بۆ حاڵەتی هەریەك لەو سێ کارانە ڕێژەیەکی سەربەخۆی هێنابایە وەك کە بۆ سێ مادەی لێکتر جودا (بەرد، گۆشت، خەنجەر)ی ڕۆنا، لەوانە بوو بڵێ (فڕی)، ئینجا لە ئایندەدا بڵێ: (کەشەت)، بۆ فەرمانیش (تق). هەروەها بۆ هەر کارێکی دیکەی بەخەیاڵدا بێت هەمان ڕەفتار بکات نەك ڕێزمان و دەستووری گشتی بەئەرکەوە دابهێنێت و دەقی (وشە) بکاتە دەسکەلا و هەر جارە بەپێی زەمان و حاڵ ڕێژەیەکی لەبار بدۆزێتەوە کە لە ئاخیەوە، لە هۆشیەوە هەڵدەقوڵێت نەك لە هەڵپڕژانی ئاو و شەقەی باڵی کۆترەوە. ئەو کە کۆتر و ئاو و عەلیشیش و بزن و چنار و پەپوولە...ی دیت نەهات بۆ هەرچی ڕووەکە وشەی لێك نزیك دابنێت. بۆ مەلیش وەهای نەکرد.

هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی دەروونیی مرۆ کە لزوومی نەدیت بەیەکیان بڵێ (کۆترە) و بەهی لەو گەورەتر بڵێ (کۆترەمە) و هی بچووکتریش (کترە). بێ لزومییەکەش لەوەوە دێت کە ئەو مەلانە وەکو (ڕووخاندی، دەڕووخێنێ، بڕووخێنە..) نین بەیەکیان لەوی دیکە بکەوێتەوە. دوای هەزاران ساڵ مرۆ هات (وشتر، مەڕ،

گاجووت)ی خستە بەر دەستووری (کاویژکەر). گورگ و پشیلە و کەمتاری ئاونا (گۆشتخۆر) ومیا (هەمەخۆر) بەتەواوی وەك ئەوەی کە دوای هەزاران ساڵ دەستوورانی رەسمی لە ریی پسپۆری زمانەوە بۆ رێزمان هەڵێنجرا. ئاخێوەرەکە ئەگەر نەیخوێندبێ تا ئێستاش نازانێ رێزمان چییە. ئاخێوەر بەسەلیقە لە ماوەی چەندین هەزار ساڵدا بێ مامۆستا کەوتە سەر باریك رابردوو لە داهاتوو جودا بکاتەوە و تاك لە کۆ هەڵاوێرێ، نا ئەم مامڵەتە هی زاتە نەك مەوزووع. بەڵام زانێکی گەیشتبێتە پلەی هەستکردن بەداخوازیی حاڵەتی بابەت. ئەو لە زووێکەوە زانیویەتی دوێنێ ئەمڕۆ نییە و سبەینێ نییە بەڵام کاتێکی زۆری ویستووە. هەتا بۆ دوێنێ بڵێ رۆیی و بۆ ئێستا و دواتریش بڵێ دەڕوات. مامۆستا پسپۆرەکانی لکە جوداکانی زانست لە ئاست عەلیشیش و ئاو و نەوت و خوێ...دا ئەو کارەیان کرد کە ئاخێوەر لەگەڵ (رۆیی، دەڕوا، برۆ)دا کردی تا ئەوەی لە زانستی کیمیا مادەکان بەرەمز و هێما دەناسرێنەوە، رەمزەکەش هی لێزانانە، هەر یەتێکی هێما بۆ تایبەتییەتێکی مادەکە دەکات... کۆمپیوتەر لە خۆوە نازانێ ئەو رەمزانە دابنێت و لە جیاتی لێزانیان بەسەر مادەکانیاندا بسەپێنێ. کاتێك پسپۆری کۆمپیوتەر بۆ ئەو کارە ئالەتێکی دروست کرد ئەوسا ئەو ئالەتەکە هەزار جار لە پسپۆرەکە خێراتر و راستر کار دەکات.

لەو نووسینە کۆنانەمدا [لەوانە دوو ئالقەی گوتارێك بوون لە رۆژنامەی (الدستور)ی عەممان، ساڵی ١٩٧٨، بڵاو کرانەوە] بۆ روونکردنەوەی دەوری دڵخوازی مرۆ لە واتای وشە نموونەیەکم هێناوەتەوە بەوەدا کە تۆ گوتت (دارا بەتەمایە کیژی پاشا بخوازێت) منیش بڵێم (نەرێ) و تەوازیشم بەدوور زانینی کارەکە بێت. ئا لەم (نەرێ)یەدا مەنتیقی ئاخاوتن کە بە ئەصڵ لە مەنتیقی هۆشەوە زەنەی کردووە، رێی بەو تەعبیرە بردووە کە لە شکڵی ئیجابیدا سلبیەت بەدەستەوە بدات بڕوا دەکەم. گەلێك وشەی بێ سەروبەری وەك (بلەرباقۆ) لەخۆوە بێ سازدانی دوور ئەندێشانە بەسەر زارێکدا هاتووە کە هیچ وشەیەکی حازربەدەستی بۆ ئەو واتایە نەدۆزیوەتەوە ئیتر ئەم وشە ناقۆڵایەی بۆ کەسی شەخسێك رەوا دیتوە کەوا ئەهۆشی تەواوە و ئەلەشی دروستە و ئەرەفتاری ئادەمانەیە.

زۆر شلك بووم، گوێم لە قسەی مەلاکانی مزگەوتی نزیك ماڵی خۆمانەوە بوو دەیانگوت باباپەکی عەرەب بەر لە ١٠٠ ساڵ دەیگوت لە لەرەی وشەی زمانی بێگانەوە بۆ واتاکەی دەچم، ئیتر وشەیەکی رۆمییان لێ کرد بەتاقیکردنەوەی داواکەی ئەویش

گوتی هەستی ڕەقایەتیی تێدا دەکەم، دەرچوو وشەکە بەرد یان ئاسن بوو. ئەم قسەیە لەگەڵمدا ژیا تا گەیشتمە تەمەنێك لەگەڵ خۆمدا گوتم. ئەگەر لەرەی وشە ئەو وانا ڕاگەیەنە بێت ئەدی چۆن لە کوردیدا (ڕەق) سەختە و لە عەرەبیشدا (رق، برق...) ناسکی و نەرمایی دەبەخشێت.

هەرچی سەر بەمرۆڤە هەمووی هەر زاتە چەنداوەکو بشێوێ لەگەڵ بابەت بڕوات. ئەگەر لە جیهانی مرۆڤ کۆمپیوتەر زمان و ئاین و عیبارەی نرخاندنی دانابایە لە هەموو و جیهانی مرۆڤدا یەك زمان و یەك ئاین و یەك جۆرە پێوانە دەبوو، چونکە کۆمپیوتەر زاتی نییە تێکەڵ بەبابەت بێت. تۆ سەیرکە لەو دەستوورانەی پێیان دەگوترێ (پێزمان) چەند ڕێبەر هەیە ئەرکی بەزیادەوەمان لێ دەستێنێت لە چاو یاسای دەستووری. لە پێزمان ڕاگوێزە بۆ کێشەی نێوان میللەتان و بەدڵی ئارامەوە توژینەوەی تێدا بکە دەبینی بەشی هەرە زۆری لەسەر باوەڕ و بۆچوونی جوداوازەوە نەك لەسەر بەرژەوەندیی جوداوازەوە هەڵستاوە. جوداوازیی ئایدیۆلۆجیا کە کاری دەروونە و پێوەندیی بەنان و ماستەوە نییە چ لە سیاسەت و چ لە عەقیدە، ناکۆکیی ئەبەدی دەنێتەوە مەگەر ئایدیۆلۆجیاکە لەبەر یەك هەڵوەشێتەوە. شەڕی خاچپەرستەکان چەند سەد ساڵی دەوام کرد؟ بەهەمەحاڵ باوەش پێداگرتن بەدووری (زات) لە سەروبەری کۆمەڵایەتی بەهەموو لایەنەکانییەوە شتێکە سەرەتای هەیە نەك کۆتایی.

من لەو درێژەپێدانە کە ئەگەر پڕ بەپێستی بابەت بوایە گەلێك درێژخایەنتر دەبوو، ئەوەم مەبەستە سەرنجی هەموو مرۆیەکی (زماندۆست) بۆ لایەنی زیندەگرینگی دەوری دەروونی مرۆ لە پێزمان و غەیری پێزماندا ڕابکێشم چونکە هەرچی زانست و هونەر و داد و ستەم و... و... هەیە لە مرۆڤەوە هەڵقوڵیوە، هەتا ئەو هەڵقوڵینەش بەلای ئەفسانە هەڵە و درۆدا بچێتەوە پتر ڕەنگی (زاتی) وەردەگرێت چونکە (بابەت) نازانێ درۆ و هەڵە و ئەفسانە هەڵبەستێت. ئینجا کە سەیری دامەنی لاپەڕە ٧٩ بکەیت دەبینی د. مارف ڕایەکی ڕاست و دروستی لە گفۆزدیپێفەوە وەرگرتووە کە دەڵێ وشەسازی و ڕستەسازی چەندێکیش خاوەنی کەرستە و مەبەستی خۆی بێت، پێوەندیی هەمەجۆر لە نێوانیاندا هەر دەمێنێت. ڕایەکە زۆر دروستە. هێندە هەیە حەزم دەکرد ئەم (پێوەندیی هەمەجۆر)ە لە شکڵی مەتەڵدا نەمێنێتەوە و بدرایاوە بەو سەرچاوەیەی کە زەنەی لێ کردووە، وا دەزانم هەر چونکە سەرچاوەکە بەناچاری و حەتمی ویژدانی

مرۆیە ئەك بریاری بابەت بەسەر ویژدانی مرۆڤدا [کە ئاشێ لە وەهم و خەیاڵیشدا ئەو بریارە هەبێت] مامۆستا گڤۆزدیێڤ نەیویستووە کاریگەرێکی (نارێزمانی- نامەوزووعی) تێکەڵ بەپێکهاتن و دەوری وشە و رستە بکات یاخود بەلایەوە ناجۆر بووە تێۆمرێخ بخاتە نووسینەوە بۆ دیارکردنی خوازی مرۆ لە کاریگەربوونی وشە و رستە و ئاواز و فۆنێم... و.. و..ئا. من ئەمە دەسەلمێنم بەمەرجێك نووسەر لە سەرەتاوە دەوری بێ برانەوەی مرۆ لە بەگەرهاتنی ماکەکانی ئاخاوتن روون بکاتەوە. بەداخەوە منیش لێرە بەپێشەوە نەکەوتمە سەر بارێك وەیا هەلی تەواوم دەست نەکەوتووە باسی دەوری یەکسەر و راستەوخۆی مرۆ لە زمان و رێزمان و زانست و عەقیدە و چاکە و خراپەی کۆمەڵایەتی... بکەم و بەپێی قەناعەتی خۆم روونی بکەمەوە هەرچەند لە تێکرای نووسینەکانم ئەم لایەنەم پێوە دیارە.

راستییەکەی کە دێین دەڵێین فلانە وشە سادەیە دەبێ بڵێین لە قاڵبی ئێستاکەیدا بەسادە حیساب دەکرێت وەك کە دەڵێین وشەی (ئەمریمەن) بریتییە لە (ئەنگرە + مەینو) بەواتای (ئەندێشەی بەدی) لە فۆرمی ئێستاکەیدا بەسادە رۆیشتووە یاخود (قارەمان) کە لە واتای پاڵەوان بەکار دێت وشەیەکی لێکدراوە بەواتای (کارزان). هەروەها فلانە پێشگر سەربەخۆ واتا بەدەستەوە نادات لەوانەیە سەمور بێن، وەك پێشگری (وەر) لە وشەی (وەرکەوتن، وەرچەرخان...هتد)دا لە (فەر- فەریتەن) بەواتای (سوور- سووڕان)ەوە هاتووە و لە کوردیدا بووەتە (گەڕان) و لە فارسیشدا بووەتە (گەردیدن) و پێشگرەکە هەمان سووڕی تێدایە. دەشێ بزانین دەنگی (ڤ) بە(گ) دەگۆڕێت وەك کە (ڤیشتاسپ) بووەتە (گیشتاسپ) یاخود (ڤەرکە) بۆتە گورگ. وشەی (بەهەشت) لە (ڤەهیشتە) بەواتای (چاکترین) هاتووە کە لە ئینگلیزیدا بۆتە (best) وشەکە بریتییە لە (ڤەهە) بەواتای چاك لە فارسیدا (بە- بیهـ)ە و لە (یشتە) بەواتای (ترین)ی ئەدانی سیفەتی باڵا وا دەزانم هەر (ڤەهیشتە)یە لە کوردیدا بووەتە (باش) و دواتر لە بیران چووەتەوە کە خۆی (چاکترین)ە ئیتر سیفەتی باڵای لێ پێك هاتووە. پاڵیەوە: وشەکە لە ئەسڵدا (نافەنت) بووە خولاسە چی لە زماندا بەکار دێت و بەش بەش دەکرێت بەکار و ناو و سادە و ناسادە و ئامراز... و هتد دەبێ بڵێین لە زمانی سەردەمدا وەهایە. ئینجا ئەگەر فۆرمی ئێستاکەیان بەنووسین لە کۆنەوە پارێزرابێت دەبێ بڵێین لەوەتەی دەیانناسین ئەوەن کە باسیان دەکەین.

لە یەك دوو جێگەی لاپەڕە ٨٠، ٨١دا (وشەسازی و رستەسازی) هاتووە لە زەمینەی

دەرخستنی دەوریان لە دەربڕینی مەبەست و بیر راستییەکەی دەبێ بگوترێ (وشە و رستە) چونکە مرۆڤ بەر لە پەیدابوونی ڕێزمان و مەفهوومی وشەسازی و رستەسازی بەهەزاران ساڵ بیری خۆی بەوشە و رستە دەربڕیوە، دواتر مامۆستایان هاتن بەمەنتیقی زانست وشەسازی و رستەسازییان هێنایە کایەوە وەك ئەوەی کە خەڵك کەڵەکی دروست کرد و لە ئاودا نوقوم نەدەبوو ﭻ ئاگایان لەوە نەبوو لە دوارۆژدا (ئەرخەمیدس)ێك بنەمای دەستووری سەراوبوونی شتان دەدۆزێتەوە.

بەلای بینینی منەوە ئەو بیروڕایانەی مامۆستا رووسەکان کە لە ژمارەی ۷، ۸، ۹، ۱۰، ۱۱ی پەراوێزەکاندا هاتوون شتی زۆر ساکارن... بێ موجامەلە د. ئاورەحمان لەوان پتر بەقوولایی ڕێزماندا چووە، بەلام لە چوارچێوەی بیروڕا تەنگەکانی ئەو زمانناسانەدا تووشی بابەتی وەك هی ئەوان تەنك دێت بەنموونە، لە نیوەی دووەمی لاپەرە ۸۳دا هاتووە «تاکە کەرستەیەکی ڕێزمانی دەتوانێ واتای حالاتی جیاواز بگەیەنێ» و بۆ روونکردنەوە دوو رستەی هێناوە یەکیان (ئێوە هاتن) ئەوی تریان (ئەوان هاتن) کە تێیاندا دەنگی (ن) جارێکیان بۆ کەسی دووەمی کۆ و جارێکیان بۆ کەسی سێیەمی کۆ بەکار هاتووە، ئا لێرەدا دەبێ بزانین کە دەنگی (ن) لە خۆی و چالاکیی خۆیەوە ئەو دوو دەورەی نەبینیوە بەڵکو ئاخێوەری کوردیی ئەم لەهجەیە ﭻ لەبەر ئەفەسکورتی بێت و ﭻ لەبەر لێ خۆش هاتن بێت ئەو (ن)ەی بۆ هەردوو حالەت بەکار هێنا هەم لە ڕابردووی کاری تێنەپەڕ و هەم لە ئایندەی کاری تێپەڕ و تێنەپەڕدا بەلام لە ڕابردووی کاری تێپەڕدا ماڵی ئاوابێ، لێکی جوداکردنەوە و گوتی (خواردتان، خواردیان) لە کرمانجیی سەروودا هەموو کەسەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم یەك فۆرمی بێ ڕاناوی لکاو لە ڕابردووی کاری تێپەڕدا بەکار دەهێنێت. ئینگلیزی یەك فۆرمی هەیە بۆ هەموو کەسەکان و لە هەموو کاتدا جگە لە کەسی سێیەمی کە لەگەڵ کاری ئایندەدا بێت، ﭻ بڵێی (ن)ی (هاتن) دەوری بینیوە لە ڕاگەیاندنی کەسی دووەم و سێیەمدا و ﭻ بڵێی دەنگی (ر) لە وشەی (گەرم، سارد)دا دوو دەوری دژبەیەکتری بینیوە شتێکت گوتووە پێوەندیی بەسروشتی رستەسازی و وشەسازییەوە نییە. ئیرادەی مرۆڤ و ئیوەڕامانی، قاڵب بۆ وشە و رستە دادەنێت و بەدەم ڕۆژگارەوە گۆڕانکاریی تێدا دەکات تا ئەوەی بەپێی رووالەتی حاڵ سەر بەمەڵەوە دەمێنێت. لە نموونەی هەڵەی زیندە ڕاگەیێن و بەلیغ ئەم ڕاستییەت دەخەمە بەرچاو. لە بڵباسانم بیستووە کە ویستوویەتی کەسێکی ئاسراو و بەرچاو بشکێنێتەوە

گوتوویەتی چ ئەحمەداغا هەن؟ ئەم شکاندنەوەیە کە بەرامبەر دەبوو بەهەڵکشاندن حیساب بکرێت [چونکە «هەن»ی کۆی بۆ کەسی تاک- ئەحمەداغا- بەکار هێناوە] بەڵێ، شکاندنەوەکە بەم تەعبیرە ئەبێ زەفەری پێ نابردرێ، زەفەر بێ بردنەکەش لە تەناقوزی نێوان (چ)ی کەم بایەخ و (هەن)ی بایەخدار هاتووە. ڕەنگە لە لەهجەیەکی دیکە یاخود زمانێکی دیکەدا ئاخێوەر جۆرێکی ڕەفتار بکات. زمانی عەرەبی بایەی ئێمچە فەرهەنگۆکێك وشەی هەن پێیان دەڵێن (اضداد) کە هەریەك بەوان دوو واتای دژبەیەکتر ڕادەگەیەنێ، لەوێشدا ئیرادەی ئاخێوەر ئەم کارە سەروبنەی ڕەوا دیتووە

لێرەدا دەبێ بڵێم نیشانەی کۆ (ان) بەئەسڵ (ام) بووە ئەداتی (ان) بەپێوەندیی نێوان کۆتاییی وشە و نیشانەی (ام) هاتووە. دیارە و وردە وردە خەڵقەکە وەڕس بووە لەم (ام)ە و فرتاندوویەتی. ئینجا ئەگەر ئاگاداری بنەمای ڕاستەقینەی زمان نەبین، کە مرۆڤە دەبێ بڵێین کەرەستەی تەعبیر لێرەدا بەمردوویش دەور دەبینێت.

ئەم تێبینییانە بەنیازی فراوانکردنی ئاسۆی تێ ڕوانینە کە پێویستێکی بنجییە لە هەموو مەیدانەکانی ڕۆشنبیریدا چونکە هیچ بابەتێك نییە لەخۆوە بەرەنگ بێت د. ئاورەحمانیش کە بۆتە سەربازێکی ڕێزمانی کوردی پەلەیەتی بایی بۆ لوان مێشکی من و تۆ و یەکێکی دیکە بەسەر ڕوانگەکانی زماندا ڕابشکێنێت. چشمان لێ کەم نابێتەوە لە سنووری دەسەڵاتدا مۆمێك بۆ بەرهەنگاوی لەخۆ بووردووەکانی زمان و کەلەپوور و ئەدەبی کوردی و مێژووی کوردی هەڵکەین، تا لەم کولانەوە دەڵێم گۆشەیەکی ڕێزمانمان بەبەرییەوە هەیە قسەی ڕچە بەستووی تێدا هەڵگەڕێتەوە یاخود هەڵوەشێتەوە چی بێ دەڵێین ڕاناو ئەو وشەیە جێگەی ناوێك دەگرێتەوە، لەو تاقمە وشانەی بەڕاناویش ڕۆیشتوون وشەی (کە)یە بە واتای (الذی) عەرەبی. دەزانین (کە) خۆی لە خۆیدا نە ڕەنگ نە سەنگ نە پێناسە و نە هیچ دیارخەرێکی پێوەیە بیخاتە ڕیزی وشەی واتادارەوە هەر بۆیەشە دەشێ ببێتە ناوڵکار وەك لەم ڕستەیەدا: کە هاتیت پێم بڵێ.

هەروەها لەبەر زێدە بێ هێزیی هەبوونی دەشێ ببێتە ئەداتی پێناسە وەك. براکەم، مەزراکە.. دەشبێتە ئێمچە ئامرازی مەرج وەك: کە شەکر نیت گوزاڵیش مەبە.. ئایا ئەم تەرزە حاڵەتەی بێ نۆقرەیی و ئەسەییوی کە دەشگاتە سنووری تێچوون و سڕانەوە وەك دەڵێین کابرای هاتە لات دارا بوو [ لە جیاتی (کە هاتە لات) - گوتیشمان «وەك دەڵێین» لە جیاتی وەك کە دەڵێین] چەندی لە جڤزی ڕێزماندا دەمێنێتەوە چەندی لە

بەرطڵاییدا؟ دەزانم ڕێ ناگیرێ لە کەسێکی بیەوێت وەڵام ساز بدات بۆ پرسیارەکە و لە هەریەك لەو حاڵەتانەدا بەپسهۆری باری بێ ئۆتۆرەیی و ئەمەیبوی وشەکە ڕاست بکاتەوە. بەڵام هێندە لە پرسیارەکە دەمێنێتەوە تێوەرامانێکی وردتری تێدا بکرێت بۆ پەیداکردنی حاڵەتێکی ڕێزمانی ئەوتۆ لزووم نەهێڵێ بۆ پاڵهێشتێکی سازدراو باڵای لەرزۆکی وشەکە ڕاست بگرێت. دەبێ ئەدات هێندەی لێ دەتەکێنێتەوە وەك فۆنیمێکی عابەتیی لێ بێت بەتایبەتی کە یەك لە حاڵەتەکانی ئەوە بێت بەراناو دابندرێت. هەڵبەت من لێرەدا مەبەستم نییە ڕێزمان ناببوود بکەم: دەمەوێ. ئەگەر بلوێ. کەلەبەرەکانی بگیرێن وەیاخود بنەماکانی مەحکەمتر بێ. تۆ بڵێی ڕێم نەبێ لەبەر تیشکی شلۆکی (کە)ی ڕاناو حیسابێکی ڕێزمانی [نەك وشەسازی] بۆ پریپۆزیشنی (لێ. تێ. پێ. بۆ) بکەم کە بەشدار دەبن لە گۆڕینی سروشتی فیعلی تێنەپەر بۆ تێپەڕ؟ وشەکانی (لێ بوونەوە. تێ گەیشتن. پێ گەیشتن. بۆچوون) چییان تێدایە لە فەیعڵ (کار)یان دەکات؟ (لێ و تێ) گۆڕاوی پریپۆزیشنی (لە)ن. (پێ)ش هی (بە)یەکە دەزانین (بە) بارتەقای (بۆ)یە لە سیفەتی پریپۆزیشنیدا کەچی پتر لە (بۆ) واتای فیعل بەرەو تێپەڕی دەبات. هەروەهاش (لە) کە دەبێتە (لێ. تێ). ئێنجا کە ئێمە دێین (کە) بەراناو دادەنێین لە حاڵەتێکدا چ خزمایەتیی نییە لەگەڵ (من. تۆ... ئەوان... ئێمە)دا بۆچی (لێ. تێ. پێ)ش نەخرێتە ژێر سەرناوێکەوە بابەخێکی لێیان دەوەشێتەوە بۆیان تێ بخوێنێتەوە؟ وشەی (تێ) لەگەڵ کاری (گەڕان)دا جاریکیان (تێ گەڕان) و جارێکیان (تێدا گەڕان) دروست دەکات بەدوو واتای لێکتر جوداوە. (تێ گەڕان)یش تێپەڕترە لە (تێداچوون) داوای وەڵام دەکات لەوەدا کە لەم فۆرمەیدا (پێ چوون) هەر لەگەڵ ناوطکاردا دەبوات (پێداچوون)یش لەگەڵ ناو. هەرچی (پێ چوون) بەواتای (پێ مردن)ە بەتەواوی لەوان جودایە و لایەنی تێپەڕبوونی پێوە دیار نابێت:

دوو ڕۆژم پێ چوو هەتا هاتمەوە
کوێرەرێ بوو ئەوەی پێدا چوون
زەمەری نۆشی و پێ چوو (واتە: مرد)

دەگەڕێمە بۆ تێبینییەکی کردم لەوەدا بابەتی پەراوێزەکانی ژمارە ۷،۸،۹،۱۰،۱۱ زۆر ساکارە. هەمان ساکاری لە بابەتی پەراوێز ۱۲، ۱۳شدا دەدیترێ کە بیروڕای ئا. نی. گزلانۆف و ئا. ئی. سامەرنێتسکی دەڵێتەوە. بیروڕاکان درێژەکێشانی مەزموونی پەراوێز یازدەیە کە قسە لەم دۆکوولیڵ وەردەگرێت و بەتێکرایی خەریکی ئەوەن کە

دەشێ وشەیەکی دیاریکراو لەوانە بێ لە تەك واتای سەرەکیی سەربەخۆیدا چەند واتایێکی تەواوکەری دی هەبێ. نموونەی ڕوونکردنەوەش لە کۆکردنی وشەوە دەهێنین وەك: باخان، شاران، پیاوان، دەڕۆن، دەنووسن، دەفرۆشن. کە واتایان بۆ تاکە وشە نییە بەڵکو بۆ گرووپی گەورە گەورەی وشەیە.

ئەم بیروڕایە دەست دەدات بۆ قوتابیی پۆلی چوار و پێنجی سەرەتایی بەدەرس بگوترێتەوە. بەلام لەو هێندە ڕوونکردنەوەیەی کە ئەو سێ زمانزانە ڕووسە پێمانی دەبەخشن، جگە لە کەمبایەخی، لێڵی و ناتەواویشی هەیە لایەنێکی گرینگی بابەت تەماوی دەکات ئەگەر نەڵێم دەیشارێتەوە.

ئەگەر هاتباپە ئەم نموونانە هەرچی وشەی وەك خۆیان هەن لە زمانەکاندا یاخود لە تاکە زمانێکدا بگرێتەوە دەشیا لێی بێدەنگ بین و بڵێین دەستوورێکە هەمەگیر و خۆی سەپاندووە بەسەر ئیرادەی ئاخێوەردا. بەلام حاڵەتەکە وەها نییە نە لە تاکە زمان و نە لە هەموو زمانەکاندا. لە ئاست تاکە زماندا کوردی دەکەینە عەیارە: دەڵێین: مێگەل هات، لەشکر ڕۆیی.

مێگەل و لەشکر (گرووپی گەورە گەورەی مەڕ و مرۆڤن) کەچی لەسەربنایی تاکبوونی وشەکەوە (گرووپ)مان تێ نەخوێندەوە و ڕێژەی تاکمان بۆ کاری (هات) بەکار هێنا لە جیاتی (هاتن). ئەگەر بمانگوتبایە (هاتن) ئەوسا کارەکە بۆ گرووپی گەورە گەورەی (مێگەل) واتە بۆ (مێگەلان) دەچووەوە هەرچەندە وشەکە خۆی لە خۆیدا تاکە. یا لە مێگەل و لەشکر واز بهێنین کە هەریەکەیان (گرووپ) بەدەستەوە دەدەن و پەخەی وشەی تاکی ئاسایی بگرین. دەڵێین: کچ هاتن. کوڕ نەهاتن مەبەستیشمان ئەوەیە بڵێین گرووپی ئەوەی کچی پێ دەگوترێ و کوڕی پێ دەگوترێ هات یاخود نەهات. فۆلکلۆر دەڵێ:

هەوران کردە گوڵە گوڵ میکائیلا ئەتۆش دەی
توورتن و ماشان بڕشێنە دەبا نۆش بێتە سەر دەی
ڕۆمی ئەوا پەیدا بوون کوتوپڕخانان دەکەن تەی

ئاخێوەر هات (هەوران)ی کردەما هەیە زۆرینەی تاك و (کرد)ی بۆ بەکار هێنا نەك (کردیان). دواتر (ڕۆمی) کە وشەکەی بۆ تاکە خستییە جێی (کۆ) و (بوون، دەکەن)ی بۆ بەکار هێنا. ڕۆمی چونکە بەڕاست دەگەڕێ لە (گرووپی گەورە گەورەی کەسان)، شیا

بەکۆ حیساب بکرێت.

بەرێکەوت لە زمانی کوردیدا فۆرمی (کوران، کچان، هەوران...) بۆ کۆیە بەدەگمەن نەبێ کورینە، کچینە، براینە.. زمانی دیکە هەن ڕێژەی دەستووری و ڕێژەی ڕیزپەری هەیە بۆ (گرووپی گەورە گەورە). لەمانە عەرەبی: (عالمون، عالمین)ی هەیە کەچی (علماء)ی هەیە بەهەمان واتا. زۆربەی زۆری وشەکانی عەرەبی کە بۆ غەیری مرۆڤ بەکار بێت لە ڕێژە و فۆرمی ڕیزپەردا (کۆ) دەکرێنەوە لە نموونەدا (حمیر) کۆی (حمار، حمارین) بەخەیاڵدا بێت. فۆرمی (جمع مؤنث سالم) وەک: عالمات، ساحرات.. بۆ غەیری مرۆڤیش ڕۆیشتووە و دەگوترێ (شجرات باسقات).. لە ئینگلیزیدا بۆ کۆکردنەوەی دەستووری دەنگی (S – س) دەخرێتە کۆتایی وشەوە بەڵام ڕێژەی ڕیزپەری بۆ گەلێک وشە هەیە وەک:

Geese Goose - childrer child دەبێ بزانین ئەو واتایەی لە کۆی دەستووری بەدڵدا دێت و تاک تاکی گرووپی بابەتەکە دەست دەکاتەوە غەیری ئەو واتایەیە لە کۆی ڕیزپەردا جلوە دەبەستی. کە بڵێین: (عالمون) چ لە ئەمەوردا چ وەک کاریگەرێکی ڕێزمانی بێت جودایە لە (علماء)، هەرچی (عالمون)ە وەک کاریش داوای بەرکار دەکات (نحن عالمون امورا وراء الستار) بەواتای (نحن نعلم) هاتووە و ناتوانیت بڵێیت (نحن علماء امورا).

لە ئینگلیزیدا کۆکردنەوەی بەهۆی (S س) بەڕوونی تاک تاکی شتە کۆکراوەکە لە مێشکدا جلوەبەست دەکات وەک dogs, cats, stones... بەڵام لە children دا دڵ بۆ هەموو منداڵەکان (ئێکرا و بەیەکەوە) دەچێت. ئێمە نازانین بۆچی هێندە وشە بەڕیزپەری نەبێ کۆ ناکرێتەوە وەک man کە ناکرێت و هەر menی هەیە بۆ کۆ بەڵام ئەم ڕاستییە کار ناکاتە سەر بابەتی لێ دووانمان ئەمانەت زمانی کوردی لە زۆر باردا پێی کۆکردنی وشەی ئەمچە کوێر کردووەتەوە، لە نموونەدا دەڵێم ناگوترێ: بەردان ڕەقن. لەم بارەدا هەر دەبێ بڵێین: بەرد ڕەقە. تومەز مجێزی کورد بۆ ئەوە چووە گەوا مانەم مەبەست دەربڕینی حەقیقەتێکە پێویست بەڕێژەی کۆ ئەما، ئەما ئەگەر مەبەست چەند بەردێکی دیاریکراو بوو ئەوسا (بەردەکان ڕەقن، دریژن، زلن) دەست دەدات و (بەرد ڕەقە و بەردان ڕەقن) هەر چێ نابێتەوە لە ئینگلیزیدا stones are hard (بەردان ڕەقن) بەمەراوای ڕۆیشتووە وەک ئەوەیە گوتبێتت the stone is hard. بەڵام کە گوتت the stones are hard ئەوسا مەبەستت کۆمەڵە بەردێکی دیاریکراو دەبێت

مەگەر بارێکی تایبەتی حەقیقەتی مەبەست بووبێت نەك ژمارە لە عەرەبی الحجر صلب، الاحجار صلبة، الاحجار صلبات. بەهەموو لایەکدا و بۆ هەموو مەبەستێك نەست نەدەن. لە نموونەدا (وقودها الناس والحجارة) فەرقی نییە لەگەڵ (وقودها ناس وحجارە).. هتد. خولاسە هەر ڕێزمانە تەعبیر لە خوایشتی ناخێوەری زمانێك نەداتەوە نەك لە داخوازی بابەت، یاخود بڵێین چۆنیەتیی تەفاعولی خواز و هۆشی ناخێوەر لەگەڵ بابەتدا بڕیار لە چۆنیەتیی ڕێزمان نەدات. کە ئەم ڕاستییە بەدیهییەمان زانی و لێمان بوو بە زانیارێکی سەرەتایی لزووم نامێنێ هەموو دەم دووپاتی بکەینەوە مەگەر لەباری پێویستدا، وەك کە دەزانین ئەرز لە سووڕانەوەی بەدەوری خۆیدا شەو و ڕۆژ پەیدا نەکات پێویست نامێنێ کۆمە بکەین لەوەدا بڵێین: ڕۆژهەلات. بەر لەوەی خەڵقەکە سووڕانەوەی زەوی بیستبێت وای دەزانی بەڕاستی ڕۆژ لەخۆوە هەڵدێت.. بەڕاست. زمان هەیە زۆریەی ناوی مرۆ بەرسته نەمێنێتەوە نەك بەتاکە وشە- لە ویدا پێویستە تەعریفی ناو لە ناست مروڤدا جودایێ لەچاو هی تێکڕای شتان زۆر بەسەیری، زمانی کوردی کە دیتمان لە هەندێ باردا کۆکردنەوە بێ لزووم دادەنێت، حەز بەوە نەکات (ان)ی کۆکردن بکاتە هۆی بەرچاوبوونی کەسانێك دەوری بەرچاویان بردبێت وەك کە لە نێوان گەلێك عەشیرەتدا دەڵێن: فاتم و شیلانان ناگرەکەیان کوژاندەوە یاخود لە چیرۆکدا دەگوترێ: برایمی مەلا زێندینان. وا بزانم ئەو (ان)ە تەنها بەدوا ناودا دێت کە بوونە سێ و چوار بەکار نایەت، وەك بڵێی زۆربوونی ژمارەی کەسان لە کارێکدا خۆی دەبێتە ئەنجامدەری کارەکە نەك بەرچاوبوونی چالاکیی دوو کەس. دەمێنێتەوە بڵێین ئەم نیازەی دەرخستنی گرنگی، نەمات بۆ تاکە کەسیش ئەداتی کۆ بەکار بهێنێت چونکە بەزاهیر پاراستنی لایەنی ڕێزمان کە نایەڵێ بە (ئەحمەد) بگوترێ (ئەحمەدان) ڕێی نەداوە گرنگیی کارەکە لە ڕێژەی (کۆ)دا دەربپەخشێت. لەم بارەدا جۆری دەربڕینی ناوی کەسەکە نیازی گرنگی، بەگەورەگرتن، گلەیی، بێ ئەهەمیەتی، توورەیی، ڕادەگەیەنێت کە هیچی بەند نییە بەڕێزمانەوە.

دوای بەجێهێشتنی چەندین شوێنی شیاوی لێکۆڵینەوە، لە لاپەڕە ٨٣ هەر لە دێڕی سێیەمیەوە هەتا بەرەو کۆتایی دێری بازدەمینییەوە کە بەژمارەی پەراوێز ١٦ تەواو دەبن بۆ ئێرە ڕادەگوێزم چونکە ناتوانم بێ ئەو ڕاگوێستنە مەبەستی ئۆ دێڕی باسکراو بەئاسانی بیەخەمە بەر زەینی خوێنەر.

ئەمە دەقی دێڕەکانن

«لە لێکۆڵینەوەی حاڵاتی ڕێزمانیدا، هەندێ لە نووسەران ڕووی واتا ڕەچاو دەکەن. لەم بارەدا حاڵاتی ڕێزمانی دەشێ وا دیاری بکرێ، کە وەك تایبەتێتیی زمان، دەربڕینی مانای ڕێزمانی لە کەرەستەی ڕێزمانیی زمانەوە وەردەگیرێ. نووسەرانی دی لە کەرەستەی ڕێزمانییەوە دەڕوانن. لەم بارەدا دەکرێ حاڵاتی ڕێزمانی وەك یەککرتنی کەرەستەی ڕێزمانی بۆ یارمەتیی دەربڕینی واتایێکی ڕێزمانیی ناسراو تەماشا بکرێ. بەو پێیە کە کەرەستەی ڕێزمانی بۆ مەبەستی گەیاندنی واتایە، خاسیەتی حاڵاتی ڕێزمانی لە واتاکانیەوە دەست پێ دەکات. بێ ڕەچاوکردنی واتا تەنانەت ناتوانرێ ئەوە بچەسپێنرێ، کە خاوەنی کەرەستەیێکی ڕێزمانیی ناسراوە». لە پەراوێز ژمارە ١٦ بەرووراکان بۆ ئی. ئۆ گۆستینسکایا و ڤ. ئی کارداشێڤسکی بردراوەتەوە. بەدوا ناوەکانیشدا نووسراوە، ڕێزمانی فرەنسی، چاپی حەوتەم، مۆسکۆ ١٩٧٣.

دەبێ بڵێم دەقەکە تێم ناگەیەنێ دەستەواژەی (خاوەنی کەرەستەیێکی ڕێزمانیی ناسراو) لە کۆتاییی قسەکاندا چ دەگرێتەوە. لە خۆمەوە دەڵێم ڕەنگە مەبەست (زمان) خۆی بێت کە بێ ڕەچاوکردنی واتا نابێتە خاوەن کەرەستەی ڕێزمانی. ئەم گرفتە بچووك بوو، بەڵام گرفتی گەورەتر لەبەرچاو و بۆچوونی مندا ئەوەیە کە ئەو نووسەرانەی دەڵێن (دەربڕینی مانای ڕێزمانی لە کەرەستەی ڕێزمانیی زمانەوە وەردەگیرێ) ئەوان بێ (لە کەرەستەی ڕێزمانییەوە دەڕوانن) نەك ڕووی واتا ڕەچاو دەکەن، بەپێچەوانەوە دەبوو بەشی دووەمی نووسەران کە دەڵێن (حاڵاتی ڕێزمانی لە واتاکانیەوە دەست پێ دەکات، بێ ڕەچاوکردنی واتا.. هتد) خۆیان بێ ڕووی واتا ڕەچاو دەکەن. من ناتوانم گومان لە دروستیی تەرجەمەی د. ئاورەحمان بکەم، لەگەڵ ئەمەشدا کە مەسەلەکە بەئاڵۆزی دێتە بەرچاوم سەرلەبەری قسەکان، بەهەر لایەکدا بکەوێت، (بەپێی تەسەورم لە سروشتی زمان) ڕێنوونیەتی هەڵە و دوور لە حەقیقەت بەحەڵق ڕادەگەیەنن. کە دەڵێ (دەربڕینی مانای ڕێزمانی لە کەرەستەی ڕێزمانیی ڕێزمانی) کە مەبەست لێی دروستبوونی پێکهێنانی ڕستەکەیە بەپێی دەستووراتی ڕێزمانی زمان، ئەما (مانای ڕێزمانی) وەك (ناوی دەستووری) هیچ کامێکیان واتای دروست نابەخشن چونکە نە مانا ڕێزمانییە نە ناویش دەستوورییە. کە دەڵێین (چۆلەکە تووتن دەهێنێ) ڕستەیەکی ڕێزمانیی دروستمان بەکار هێناوە، بەتەواوی

وەك جاران دەیانگوت (جنۆکە هۆی مانگگیران و ڕۆژگیرانن) ڕستەی ڕێزمانیپان بەکار دەهێنا واشیان دەزانی قسەکە ڕاستە. خۆ ئەگەر باباپەك تووتنی نەدیبێت، ئەویش وەك مەسەلەی جنۆکە و مانگگیرانەکە پێی گوترا (تووتن شایی دەکات) باوەڕی بەقسەکە دەکرد

چەندێکی لەو قسانەی سەرەوە ڕادەمێنم ناتوانم بچمە سەر ئەو ڕێبازەی کە دەیەوێ کەرەستەی ڕێزمانی و واتاکەی لێك بترازێنێ و بەدوو شتی جودایان حیساب بکات چونکە بەراستەن وشە و واتاکەی یەك شتن. کە دەڵێم (من) بێ ئەوەی لزووم بەگوتن بکات لەخۆوە ئاشکرایە تاکێکە کە لە ڕێزماندا زاراوەی (کەسی یەکەمی تاك)ی بۆ داندراوە لەم زاراوەیەدا ئەتاکایەتی نە یەکەمی لەلاوە بەزەکات و سەدەقە بۆ وشەکە نەهاتووە، خۆ ئەگەر قسەکەر (کچ) بێ لەوێشدا (مێیینەیی) بۆ نەخوازراپەوە.. ئەگەر منداڵ بێ دیارە چارێ باڵغ نەبووە، ئەباڵغی بەدیاری بۆ وشەکە نەهاتووە ئەگەر جابەز بێ (من) جارێکیان قسەکەر بێت و جارێکیشیان تاك بێت، خۆ هەرچی وشە هەیە لە زماندا جارێکیان وشەیە و جارێکیشیان ئەو شتەیە بۆی داندراوە. ئینجا دەبێ بەپێی داخوازیی حاڵ جارێکیان مێ بێت یان تاك بێت یان کۆ بێت.. هتد. دەبێ بڵێین وشەی (من) کە ڕاناوی پێ دەڵێن (قسەکەرێتە و تاکیشە) چونکە لە ناچارییەوە نەبێ، کە تەعبیر کورت دەهێنێ، (من) هەر ئەو کەسە سەرلەبەرەیە کە ئاخێوەر بەر لە هەزاران ساڵ بێ تێخوێندنەوەی ژمارە و یەکەمی و دووەمی بۆ دەلالەتکردن لە خودی خۆی بەکاری هێناوە، تێتر پاش هەزاران ساڵ پسپۆڕی زمان پەیدا بوون و کەوتنە سەر شیتەڵکردنی (ئاخاوتن) و تاك و کۆیان لێك جودا کردەوە کە بە ئەسڵیش هەر جودا بوون بەڵام ئاخێوەری کۆن نەهات وشە و واتاکەی لێك بترازێنێ. هەروەك کە گوتی (ئاو) مەبەستی ئەو شتە شلە بوو دەیناسین، بێ ئەوەی شیتەڵ بکرێ بۆ ئۆکسجین و هایدرۆجین کە کیمیادان بەرهەمی دەیکات، هەروەهاش چی پێی دەڵێین کەرەستەی ڕێزمانی وەیا وشەی فەرهەنگی (بوونەوەری سەرلەبەر)ن کە جەسەر لە نێوان خۆیان و واتا و ژمارە و زایەند و ئاینده و ڕابردوو... و... و یان نییە زانازان بۆ تێگەیاندن ئاخاوتن پەل پەل دەکات بەڵام ئاشێ هەرگیز لە کارەکەی خۆی بەسەهو بچێت و بێێتە ئەو قەسابەی بەرخ پەل پەل دەکات و گیانی لەبەر دەبڕێت. گۆشتەی پەلپەلکراو نە بەرخە نەبزنە نە مریشك، کۆنە گیاندارێکی لێك هەڵوەشاوی بێ گیانە نەدەخوات و نەزیاد دەکات و نەدەزێت... گوتەیەکی (لینین)م خوێندووەتەوە [وا

بزانم لە چلەکاندا] زۆر زانایانە عوزر دەهێنێتەوە بۆ خوێنەر لەوەدا کە ناچارە لەبەر خاتری تێگەیاندن بابەتی قسە لێکردن ببڕێ دەکات کە لە زاتی خۆیدا بێ برگە و جەمسەرە. هەروەها بەباشی لە بیرمە ئەو هەڵبڕینەوە و کەرتکردنە بە(فصل میتافیزیکی) دادەنێ، لەو نۆ دێڕانەی سەرەوەدا دێڕ و نیوێکی دواییانی کە دەڵێ: بێ ڕەچاوکردنی واتا تەنانەت ناتوانرێ.. هتد لێك ترازاندنی وشە و واتا دەگاتە پلەی گەپ بەهۆکردن. کە واتا لە نێواندا تەنها مرۆ خۆی لە مرۆیەتی دەکەوێت چ جایی کەرەستەی ڕێزمانی. دوای ژمارە ١٦ی کۆتاییی ئەو نۆ دێڕە د. ناوڕەحمان بەتەنیدی ئەو دوو نووسەرە دەڵێ: (بێ تێگەیشتن لە مانای وشە ناتوانرێ بڕیار بدرێ کە ئەو دەنگە ناسراوە [مەبەست (ێ)ی کچێیە) کەرەستەی ڕێزمانییە یان نا) ڕاستییەکەی ئەمە ئەنکاوێکە لە پاشاوی ئەو نۆ دێڕە ئەگینا نەك دەنگی (ێ) بەدوا (کچێ)وە، خۆ سەرلەبەری زمانێك کە نەیزانیت هەمووی لە مەتەڵ داخراوترە. ئەدەبوو لە بواری ڕێزمانەوە بگەینە قۆناغێك کە (واتا)ش بەبەشێکی کەرەستەی ڕێزمان حیساب بکرێت واتا خۆی کە بەرهەمی هۆشە بنەمای زمانە نەك هەر ڕێزمان، چ جایی کەرەستەی ڕێزمان، پێشتریش گوتم ڕێزمان ناتوانێ هەڵەی واتایی بدۆزێتەوە وەك کە هەڵەی ڕێزمانیی پێ دەدۆزرێتەوە زۆربەی مەتەڵ لەلایەن واتاوە شێواویی تێدایە، هەر بۆیەش مەتەڵە کەچی دەستووراتی ڕێزمانیی تەواوە وەك کە دەڵێ: داری شەکراوێ پێنج لکان ڕاداوێ سێ لەبەر سێبەرێ دوو لەبەر هەتاوێ. مەبەستیشی نوێژە. خۆ دەزانین شەکراو درەختی نییە بەڵام لەبەر چەژی دیندار شها نوێژ بەداری شەکراو بچوێنرێت. لێرەدا فەندی مەتەڵ لەسەر ڕێزمان حیساب ناکرێت بەڵام دەڵێی مەتەڵ دێتە جغزی ڕێزمانەوە

لە پاش ٩ دێڕەکە د. ناوڕەحمان بەدەم نموونەی (کچێ)وە دەگاتە وشەی (هەرمێ، مێ، جێ).. کە لەواندا دەنگی (ێ) هەیە جودایە لە هی (کچێ) لە هەڵەی چاپدا لە جیاتی ئەوەی بنووسرێ ئەو (ێ)ی هەرمێ و هەڤاڵەکانی (کۆتاییی وشەن).. نووسراوە (کۆتاییی وشە نین).. دوای ئەمە یەکسەر دەگەینە نموونەی تێپەڕکردنی کار. تا لێرەدا یەك دوو تێبینی و بەسەرگرتنەوە هەیە. لە (مردن، مراندن)دا تێبینییەك ئەوەیە کە کاری (مردن) تەنها کارێکە هاتبێتە بەرچاو و زەینم کە تێنەپەڕ بێت و بەدەنگی (د) کۆتاییی هاتبێت، هەرچی تێنەپەڕی دیکە هەیە (د)ەکەی ئەماوە ڕاستییەکەی دەبێ بڵێم هەموو ئەو کارە کوردییانەی کە کۆتاییەکەی (د) بوو بێت و بەر لەو (د)ەش

دەنگێکی بزوێنی درێژ هەبوو بێت ئەو (د)ەی قرتاوە، ئیتر کارەکە تێپەڕ بێت یان تێنەپەڕ، قرتانەکەش بەبەراوردکردن لەگەڵ کاری بەهەمان واتا لە فارسیدا دەردەکەوێ وەك لەم نموونانەدا دەبینرێ:

دان دادن

فەرموون فرمودن

بڕین بریدن

گەڕان گردیدن

چوون شُدن

دزین دزدیدن

کاری (مان) خۆی لە ئەسڵدا (ماندن) بووە بەبەڵگەی ئەوەی کە لە ئایندەدا دەبێتە (دەمێنێ) نەك (دەمێ) وشەی (ماندوو)ش لەو (ماندن)ەوە ماوەتەوە. ئەوەی یارمەتیی پەیدابوونی (مان)ی داوە بڕینییە لەو (ن)ە کە جێگەی (ن)ی چاوگی گرتووەتەوە. دەنگی (ت) لە بەرایی (ن)ی چاوگدا نەقرتاوە وەك: کەوتن، پشکووتن، نووستن، بیستن، سرەوتن، هاتن... هەرچی کاری تێپەڕە لە غەیری ئەو جۆرە باسکراوەدا دەنگی (د، ت)یان ماوە وەك: گرتن، بەستن، پالاوتن، داشتن، سپاردن، ناردن، کردن، بردن...

تێبینیی دووەم لە کاری (مردن) ئەوەیە کە تێپەڕەکەی (مراندن) دەبوو(مردانْدن) بێت: دیارە لەبەر قورسی دالی یەکەمی سوواوە.

لە ئاست (بران، بردن) کە گوایا یەکەمیان تێنەپەڕ و دووەمیان تێپەڕەکەیەتی، ڕاستییەکەی (بران) ڕێژەی کارا نادیاری (بردن)ە و تا ئێستاش (بردرا) بەسەر زارانەوە زیندووە (برا) بەزۆری لە سلێمانی و لە دەوروبەری بەکار دێت. هەرچی (کرا)یە کە کارا نادیارە هەمەگیرە مەگەر چۆناوچۆنی دەنا ناگوترێ (کردرا). هەرچەند خۆم گوێبیستی بووم بەڵام بێگومان لە ڕێی سەرنجی خۆیشمەوە دەزانم هەمیشە لە کزبووندا بووە. دەگوترێ (کردم و کراندم) بۆ موبالەغە، لێرەدا (کرداندم)ە لێی سواوە نەك ڕێژەی کارا نادیارە چونکە هەرگیز نەبیستراوە گوترابێ: کوژراندم، بیستراندم، دیتراندم.

دواتر کە لە کێشەی (هاتن – نێوە هاتن) و (هاتن –تەوان هاتن) بووینەوە دەگەینە

(ان)ی نیشانەی کۆ و (ان)ی کۆتاییی هەندێ وشەی وەك (زستان، ڕان). کە گۆیا ئەو (ان)ە هەر جارە دەورێك دەبینێت ڕاستییەکەی (ان)ی کۆکردن و (ان)ی نیشانەی جێگە، کە لە فارسی بەتەواتی نیسبەتی دادەنێ لە وشەی وەك (سپاهان – ئیسفەهان – کرمان)... لە کوردیشدا (خوران، حاجی ئۆمەران، کەڵەکان)... تا ئەم دوو (ان)ە چ خزمایەتییان لە نێواندا نییە. خۆ دەتوانین (ان) لە ناو تویێژی وشەشدا بدۆزینەوە نەك هەر لە کۆتاییدا وەك: بەهانە، شانە، مانگ... لە نموونەی ڕوونکردنەوەدا دەڵێم لە وشەکانی: مردن، کردن، بردن...دا ئەو (رد)ە ناچنە ژێر سایەبانێکەوە وەك کە (ن)ەکە لە هەمووان‌دا دەچێتە ژێر زاراوەی (نوونی چاوگ). ئەگەر (ر) بێت و ئەگەر (گ) و ئەگەر هەر دەنگێکی دیکەی ناهاوتن بێت بێ ئەوەی وشە بکات بەخزمی یەکتر بەشدار دەبێت لە پێکهێنانی هەزاران وشە هەروەهاش جووتە دەنگی وەك (ان) یاخود (شت) یا (ست). لە وشەی وەك. گەشت، شت، بست، مەست، ماست، گاوان، زیندان، خرچان... ئەو (ان)ەی کۆتاییی سێ وشەی دوایین هیچ پێناسەی نییە وەك (ان)ی کۆ و (ان)ی ڕاگەیەنی جێگە هەیبوو... لە (نیشتمان)دا (مان) دەلالەتی جێگەی هەیە کە وشەکە دەکاتە (جێگەی لێ دانیشتن یاخود نیشتن). لە ئاست وشەی (سەیران)دا دەبێ بڵێین خۆی کۆی (سەیرە)ە وەك کە بڵێی: دەچینە گەمان... لە زۆر دێی دەشتی کۆیە دەڵێن. گەمانان دەکەن، دووانان، سێیانان باوە بەڵام چی دی تێ هەڵناکشێن، ناگوترێ چوارانان.

وشەی (مانگ) لە ئاڤێستادا (ماونگهە) بووە وا بزانم کورێکی زەردەشت یان خزمێکی ناوی (مەدیو ماونگهە) بووە بەواتای (ناوەندی مانگ) بەبۆنەی ئەوەی لە ١٥ی مانگی کە ئێستا پێی دەڵێن مانگی عەرەبی هاتووەتە دنیاوە. ئەم (مەدیو)یە لە ئینگلیزی سەردەم middle mid ماوە وەك کە دەڵێن mid summer ناوەندی هاوین.

چی دی لەسەر تێبینی و ڕوونکردنەوە ناڕۆم، تەنها لە ئاست ئەو هەڵدانەوە زیاد لە لزووم و خۆڕاییەی کە لە کۆتاییی گوتارەکەدا بەخشراوە بە ئا. مابییە بەرانبەر بەدبەهییەکی کە بایی سێیەکی بگرە دەیەکی ڕوونکردنەوەی مەبەست ناکات لەوەدا کە گوتووەتی «بەراورد تاکە وەسیلەی ڕێخۆشکەری ئۆژمرە بۆ بیناکردنی مێژووی زمان»، دەڵێم دەبوو لەو مەیدانە بەرینەی گوتارەکەدا د. ناورەحمان بەپێی هەڵکەوت ناوی نووسەرێکی غەیری ڕووسی هێنابایە [جگە لە شەخسی خۆی کە لە پەراوێزەکانی ژمارە ١٨، ١٩، ٢٠دا ناوی هاتووە]. ویستم بزانم چی وەرگرتووە لە ذوالنوری فارسی

که لە فەقەرە (د)ی پەراویزی ژمارە ٢٦دا پەنجەی بۆ ڕاکێشراوە ئەم پەراویزە: لە لاپەڕە ٨٩ی گۆڤاردا بەهەڵە ٢٧ نووسراوە، هەر بۆیەشیە دوایین پەراویزە کە لە جەدوەلی سەرچاوەکاندا ژمارە ٢٧ی پێ دراوە، لە بەرەو کۆتاییی لاپەڕە ٨٩دا ژمارەی ٢٨ی وەرگرتووە بەهەمەحاڵ نووسینەکەی (ذوالنور) و هی سێ نووسەرەکەی دیکەی ڕووس کە لەو پەراویزەدا ناویان نووسراوە مەهەلەو کۆنن، ڕەنگە هی نوێتر هەبێ لەوان تێ پەڕیبێت بەلام قسەکەمان هەر لە سنووری نیحتیمالدا دەمێنێت تا بەڕوونی بەزانین ئەو ڕێز لێگیراوانە چییان گوتووە

د. ناورەحمان کە لە بەرەو کۆتاییی گوتارەکەیدا دەڵێ «منیش لەبەر ڕووناکیی ئەم بیرە وردەدا... بەپێی توانا هەندێ بەراوردی مێژووییم کردووە و ئەگەر کەڵکێکی بێ، خۆ بەبەختەوەر دەزانم» خۆ نووسەرانی کورد هەبوون بەر لەم ڕۆژگارەی ساڵی ١٩٩٢ گشتیەکیان کردبێت لەو بوارەدا کەوا ڕەنگە بۆچوونی قووڵتری تێدا بێت، لەو چەند نموونەی بێ خەوشی کۆتاییی وتارەکە. مامۆستا وەهبی نووسینی بایەخداری هەیە ڕێنموونیی تۆژەرەوە دەکەن، چاوێکیش بە (لسان الكرد و بەشی سێیەمی زاراوەسازیی پێوانە)دا بگەڕێت، کە یەکەمیان لە ١٩٨٧ و دووەمیان لە ١٩٨٨دا بڵاو کراوەتەوە، نموونەی وردبێنی و وردبینیی مناسیبیان تێدا دەدیترێت. نووسەرانی دیکەش هەن لە کورد هەوڵێکی بەراوردکارییان لە مەیدانی زمان دابێت. دیارە، کوردی گوتەنی، تالع و بەخت بۆی هەیە کە تەنها ئا. مایییە بەو چەند وشەی نیوەڕاستییەوە بوو بەهاندەری زمانناسێکی لێهاتووی وەکو د. ناورەحمان کە بایەخ بە بەراوردکردن بدات، کە دەڵێم (نیوەڕاست) لەوەوەیە تاکە وەسیلەی ڕێخۆشکەری مەڵنانی مێژووییی زمان نییە تەنها نموونەیەکیش کە لێرەدا بەکافی بزانم ئەوەیە کە زۆرجاران (هۆشی ون دەروون- عقل باطن) بێ ئاگا لەخۆبوونی خاوەنەکەی گرێکوێرەی ئەوتۆ دەکاتەوە، چ لە زمان و چ لە مەیدانێکی دیکەی زانست بێت، لە حاڵەتی ئاگا لەخۆبووندا زەفەری پێ نابردرێت، بەپێی ئەوەی نووسینەکەی ئا. مایییە لە ساڵی ١٩٥٤ دەرچووە کە ئەوسا جارێ ڕووسیا لە سایەی ستالینیزمدا دەژیا، هەرچەند مردووش بوو، گرتنەبەری ڕێی هۆشی ون کارێکی بۆرجوازییانە بوو... لەمەش بترازێ، من بەش بەحاڵی خۆم (بەراوردکردن، هەڵێنجان، بەسەرداکەوتن و هەرچی شێواز و ڕێبازی زانین و دۆزینەوە هەیە) هەمووی لە یەک سەرچاوە هەڵدەقووڵێن ئەویش هۆشی مرۆیە. لێکدانەوەی ڕووت و بەراوردکاریی پێچەڵپێچ کە بەسەرمای زەقەوە خۆ دەگرێ

تەواوکەری یەکترن. زۆرجارانیش (بەراورد) لە تاریکایی هەندێ کێشەی زمان تێ مر ناکات. لە نموونەدا بەڵێم وشەی ئاوێتەی (ترمنیتە نوونە) کە بووەتە (فەرەیدوون) و بە واتای ماری سێ سەر کوژ هاتووە وشەی (نیتە) تێدا (سەر)ی کوردی و فارسییەکە لە هیچ کامێکیان نزیك نییە کەچی لەگەڵ headی ئینگلیزی و tetی فەرەنسەیی خزمە. تا لێرەدا بەراوردکردن ئامانگەیەنێتە ئەو لێك دابڕانەی (سەر)ی کورد لە (نیتە)ی کۆنی ئاڤێستا و خزمبوونی tet, head لەگەڵیدا... توژینەوەی بەرفرەوان ڕێگایەکی بەرینە، بەراوردکردن بەهەکێك لە ڕچە و باریکە ڕێگەکانی حیساب دەکرێت.

گوتارەکەی د. نەسرین فەخری لە ژێر سەرناوی (وەستانێك لە عاستی هەردوو فرمانی (بوون) و (هەبوون) و (هە) و (هی)دا - لێکۆڵینەوە و بەراوردی] هەر لە لاپەڕە ١٥٩ تا لاپەڕە ١٨١ی گۆڤارەکەی پڕ کردووەتەوە. بێ ئەوەی بچمە ناو پانایی و درێژایی ئەو ڕیزەوهۆنی جەدوەلی بێ کۆتایی نموونەکانی گوتارەکە کە زۆر بەدلخەوە چ قووڵایییەکیان نەداوەتە ڕووپێوی باسەکە، هەرئەوەندەیان لەبارەوە دەڵێم کەوا لە بری شیتەڵکردن و پەردە هەڵگرتن لەسەر نهێنییەکی ڕێزمانی تەنهاندا بێت دێن بەناوی شەرحدان خۆیان دووبات دەکەنەوە وەك لەم نموونەیەدا دەدیترێت کە لە لاپەڕە ١٦١ی گۆڤارەکەدا هاتووە:

بوون

کان - اصبح

بۆ - کاتی ڕابردوو

١ - ڕابردووی نزیك

ئەرێ - مثبت - نەرێ - نفی

من بووم - من + بوو + م - من + نە + بوو + م.

تۆ بوویت - تۆ + بوو + یت - تۆ + نە + بوو + یت.

نیتر تا کۆتایی هەر شەش کەسی تاك و کۆ بەئەرێ و نەرێیەوە.

سەرلەبەری نموونەکانی دیکەی ناو گوتارەکەش لەو بابەتەن یەك تروسکەی ڕووناکی ناهاوێژێ بۆ ناو بابەت تا ئەگەر نهێنییەکی ڕێزمانی و وردی ئەوتۆ هەبێت چاوی قوتابیی پلەی ناوەندی ئەیدیتبێت بۆی ڕوون بێتەوە. ئەگەر ئەمە ڕێبازی

شیتەڵکردنی گرێکوێرەی ڕێزمان بێت خۆ هەر چ کەسێکی پەنجەکانی لەڵەمیان گرتبێت دەتوانێ کام شیعری سەخت و داخراوتی نای هەیە بەناسانی لێیان دەرباز بێت و بڵێ واتام لێ داتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

جام + ی تاق + ی مەی + کە دەمیشکات + ی قندیل + ی دڵ + ە

شیشەیر + قەرقەف لە + ڕەفرەف شاه +ی عالی ڕەفرەف +ە

چەند شیرن دەبوو ئەگەر لە جیاتی ئەو ئەرکە بێ لزوومە وەڵامی ئەم دوو پرسیارەی ژێرەوە بدرابایەوە کە لە هەڵنانی نموونەکانەوە دێنە بەر زەینی مرۆڤ

بۆچی لەهجەی کوردستانی ژێروو لە نەفیی کاری ڕابردوودا (نە) بەکار دەهێنێت و لە نەفیی ئاییندەدا (نا) بەکار دەهێنێت؟

بۆچی ئەداتی نەفی لەگەڵ نیشانەی (دە)ی ئاییندەدا کۆ نابنەوە و ناگوترێ: نادەروم، نادەڵێم؟ ئەداتی نەهی لەگەڵ (ب)ی ئەمردا کۆ نابیتەوە و نالێین مەبکە نەبکەیت، نەبکەین؟ تەنضیا (نە)ی نەهی لەگەڵ ئەو (ب)ەدا دێت کە بەواتای nor neither هاتبێت وەك دەڵێین: نەبکەی نەبخۆی تەماشای ئەم دیمەنە جوانانە بکەیت؟ بەهەمەحاڵ من بەتەما نیم لەگەڵ هەڵسەنگاندنی ئەو هەموو نموونانە خەریك بم کەوا هەرچی لەگەڵیاندا بکەم سوودێکی تێدا نابینم هێندەی ئەو سوودە بێت کە لە وەڵامی ئەو پرسیارە وەردەگیرێت کە لەم نموونەی خوارەوە دەردەست دەبێت. دەڵێین:

دەتبینم. لێرەدا ڕاناوی کەسی دووەم بەرکار (مفعول) و هی کەسی یەکەم کار (فاعل)ە

دەتدیتم: لەمیاندا ڕاناوی کەسی دووەم کارایە و هی کەسی یەکەم بەرکارە هەرچەند لە جێگەی خۆیاندا ماونەتەوە تەنانەت نیشانەی (دە)ی ئایندەش بەسەر کارەکەوەیە. ئەم ماملەت گۆڕینە لە چییەوە هاتووە؟ پرسیارەکە بۆ خوێنەر و نووسەر بەجێ دەهێڵم چەند حاڵێك هەیە لە گوتارەکەدا پشتگوێ خراوە بەکورتی، لێیانەوە دەدوێم. لە ئاست نموونەیەکی بەکارهێنانی (بوون) کە لە دێری ٢٩ی لاپەڕە ١٦٨دا بەم شکڵە هاتووە:

نەدەبا بچم = دەبوو بچم (نە + نە) = ئەرێ.

پرسیارەکە هەڵدەستێت و لە گوتارەکەدا ئەسەری نییە. ئێمە دەتوانین بڵێین نە دارا نە براکەی هاتن، دەشتوانین بڵێین. نە دارا نە براکەی نەهاتن.

دەزانین (هیچ کەس) بۆ نەفییە کەچی دەڵێین هیچ کەس نەهات

دەڵێین فلان هیچە. دەشڵێین: فلان هیچ نییە هەردوو ڕستەش یەك واتایان هەیە لە (هیچ کەس)دا هەر ڕێت نییە بڵێیت (هیچ کەس هات).

ئەم (نە + نە)یە بەو شکڵی (مطلق) گەلێك ڕووی زمانی و ڕێزمانیی شاردووەتەوە.

من ئەم نموونانە دەخەمە بەرچاوی خوێنەر و هەموو کەسێکی مەراقی زمانەوانیی هەبێت، بۆ ئەوە ڕامان و قووڵ داگرتن و وردبوونەوەی...

ڕاستییەکەی، لە سوێدەوە کاك حەکیم کاکە وەیس نامەیەکی نووسراوی ڕۆژی ١٦/٢/١٩٩٣ی بۆ ناردووم لەبارەی ئەم (نە + نە)ی بەواتای Nor, Neither وە دەپرسێت کە چۆن دەشێ جارێکیان ئەرێتی ببەخشێن و جارێکیشیان بێ تەنسیر بن؟ لە وەڵامدا بابەی پێویستیی پرسیارەکە لە کێشەی پرسیارەکە دواوم. بەڵام سەرلەبەری پرسیاری (نە + نە) پتری بەبەرەوە هەیە لەو هێندەی بۆم نووسیوە. ڕەنگە لە دەرفەتدا بۆی بچمەوە. دەبوو د. نەسرین چاوێکیش بەو (نە + نە)یانەدا بگێڕێت کە نابنە (نەرێ) و هۆیەکەشی بدۆزێتەوە. لەبارەی (هەبوون) بەواتای (وجود) و (هەبوون) بەواتای (تملك) کە لە گوتارەکەدا بەیەك ڕیشە داندراون کە بۆ دوو مەبەست بەکار هاتبن. دەڵێم ئەو دوو (هە)یە لە دوو سەرچاوەی جوداوە هاتوون:

بەواتای (موجوود بوون)ە بریتییە لە دوو فیعلی (هە) و (بوون). کەرتی (هە) بەئەسڵی درێژتر بووە لێی سوواوە. لە کوردیدا چونکە نووسین نەبووە دەقی کۆنی بپارێزێت دەستمان لە شتێکی ئەوتۆیی گیر نابێت بیکەینە نموونە بەڵام دەقی کۆنی پەهلەوی هەیە [ئاڤێستا و هەخامەنشیش تێیاندایە] تێمان دەگەیەنێ کە ئەم (هە)یەی هەمان (هست)ی ئێستاکەی فارسییە کە لە وتووێژ و نووسینیشدا دەشێ دەربکەوێت و بشفرتێت، دەڵێین: من آزادم، واتە من ئازادم، دەشڵێین: من آزاد هستم، واتە من ئازادم. لەهجەی کوردیش هەیە لەباری وەهادا لە جیاتی بڵێ: فلان کوردە. دەڵێ: فلان کوردەس. لە ئینگلیزی is و لە فرەنسەیی est هەمان (هست)ی باسکراون کە ڕابردووشیان هەیە... لە پەهلەوی پش١دا چەند نموونەیەك دەهێنمەوە بابیی ئەوە بکات دەسەلماندن ڕەت بکاتەوە:

لە کارنامەی ئەردەشیری پاپەکان انتشاران دانشگاه تهران ١٤٩٩ شرح و تۆژینەوەی بەهرام فرەوشی، لاپەڕە ٢ – ٣دا ئەم ڕستەیەی خوارەوە هەیە، ئیپهشت

نیستات بەواتای نووسیبووی.

لەم ڕستەیەدا نیستات estat ڕابردووی فعل الکینونەیە بۆ کەسی سێیەمی تاک. لە لاپەڕە ٦ -٧دا دەخوێنینەوە:

پیرامونی ساسان نیستیند بەواتای. لە نزیك و ڕۆخی ساسانن

لەم ڕستەیەدا فعل الکینونەی حاڵی ئێستاکەیە وەك areی ئینگلیزی بۆ کۆ لە لاپەڕە ١١٢ -١١٣دا دەخوێنینەوە:

نی بریهینیت نیستیت بەواتای. قەزا و قەدەر نییە.

نیستیت فعل الکینونەی حاڵی ئێستاکەیە وەك isای ئینگلیزی بۆ تاکی سێیەم کەس. وەك دەبینیت (نیستات، نیستست). فیعلی یاریدەری (کینونە)یە لەوانەیە لەگەڵ (بوون) و لەگەڵ هەر فیعلێکی دیکەشدا بێت. گوتارەکە (بوون)ی کردووە بەفیعلی یاریدەر کە لەگەڵ (هە)...دا دێت. لە نموونەی کاتی ئێستا (حاضر) ئەم دوو ڕستەیە لە لاپەڕە ٥٥-٥٦ و ٦٨-٦٩ی کارنامە دەخوێنینەوە.

نامەت نیستات امدەست هاتووە

نـامـەت نـیستـەم آمـدە أم هـاتـوە

دەبێ بڵێم وشەی (نیستات) کە تەرجەمە دەکرێت بۆ کوردی، چونکە وشەکەی تێدا فەوتاوە لەگەڵ (است)ی زەمانی حازر تێکەڵ دەبێت، بەتایبەتی کە وشەکە لەگەڵ فیعلدا بێت، فیعلیش خۆی زەمانی تێدا بێ ئیتر دوو زەمان لەگەڵ یەکتردا کۆ دەبنەوە: کە بڵێی (مەرداست) بەتەواوی ئێستا دەگەیەنێ.

بەر لەوەی بچم بۆ (هەبوون - تملك) سەرنجی خوێنەر بۆ ئەم تێبینییە زۆر گرنگە ڕادەکێشم، لە لاپەڕە ١٧٧ی گۆڤارەکەدا نووسەر ٩ حاڵی سەرەکیی ڕەچاو کردووە بۆ گرینگیی دەوری (بوون) لە پێکهێنانی وشە و ڕاگەیاندنی واتا و مەبەست لە زمانی کوردیدا.

ڕاستییەکەی، ئەو دەورە، لە لایێکەوە تا ڕادەیەك، ئاغڵەب فیعلی کوردی دەبینن، بە نموونە: دەزبوون، ڕزگاربوون، بەربوون کە لە گوتارەکەدا بەبەڵگەی گرنگییەکە هاتووە دەشێ بەم نموونانەی خوارەوە بپووچێنێتەوە:

دەرکردن، دەردان، دەرهاوێشتن، دەرچوون.

دەرخستن، دەربەرین... ڕزگارکردن، ڕزگار پاراستن، ڕزگار کوشتن، ڕزگار هێشتنەوە..

بەردان، بەر هەڵداکردن، بەرماوە، لەبەرچوون، بەرموکەوتن...

دەزانم (ڕزگار) کە سیفەتە پتر لەگەڵ (کردن، بوون)دا دەڕوات، بەڵام لەمەدا خەلەل بە قسەکەم ناگات چونکە سیفەت (مادی)یە. هەروەک ناوی مەعنا لەگەڵ (بوون)دا ناڕوات بەڵکو فیعلی تێپەڕی دەوێت هەروەهاش ئەو فیعلانەی داوای (ناوی واتا) دەکەن بەپێی سروشتیان بۆ (ناوی مادی) بووز ناخۆن.

لەلایەکی دیکەشەوە هانابردنە بەر فیعلی یاریدەر بۆ دروستکردنی واتای نوێ پتر هەژاریی زمان نیشان دەدات لەوەی بەهۆی گەردانکردنەوە وەیا لە ڕێی وشەی سەربەخۆوە مەبەست دەرخرێت.

من کە لە (ترس)ەوە (ترسان - ترسام، ترساندم) پەیدا بکەم گەلێک بەخۆڕاپەرموتر دەبم لەوەی بڵێم (ترسم بوو، ترسنۆک بووم، ترسنۆکم کرد)... ئەگەر زمانەکەم وەها ڕەهایێت کە بەئاسایی بڵێم: (ڕەوەندەکانم لە دەشتی پەتوێن نیشتە جێیاند - دەنیشتە جێبێنم)، دەچێتە ڕیزی زمانە پێشکەوتووەکانی دنیاکە دەڵێن orienaliztion وشەکە لە (٥) کەرت جۆشی خواردووە. کە دەڵێن transubstantion مەیەستیانە بڵێن گەڕانی شەراب و نان لە شەوی (عشاء ربانی)دا بەخوێن لە لەشی مەسیح. بێگومان بێ بەپێی پەرەسەندنی سەقافەت و قووڵبوونەوە و تێ هەڵکشان لە نووسینی ئەدەبی و زانستی، زمانی کوردیش، ماوە دەبڕێت و ماوەشی بڕیوە بەڵام نابێ نەخۆشی زمان بەئەنسازی دابنێین.

بەهەمەحاڵ (بوون) و (است) دوو فیعلی جودان، لە کوردیدا پەیتێکە لەبەر بێ نووسینی، فیعلی (است) کۆڵەوار بووە و لە زۆر حاڵدا سوواوە ئەم (ە)یە پاشماوەی (است، هست)ی کۆنینەی زمانەکەمانە کە لە ئاڤێستا و زمانی پەهلەوی و هەخامەنشیدا پاراستراوە، لە فارسیی سەردەمیشدا پاشماوەی بەرچاوی پەیدایە.

لە نموونەکانی لاپەڕە ١٦٥ و ١٦٦دا (بووم بە - دەبم بە - نابم بە) و لە نموونەکانی لاپەڕە ١٧٧یشدا (بوومە - نەبوومە) بەسەردا هاویشتوون و هەرچی هێزوپێزی تێیاندا هەیە نەهووی کردوون. ئەم دەربوونەیەی (بردم بە -کردم بە، بردمێ - کردمێ) بەسەرباسێکی سەرەکی و بنجیی ڕێزمانی کوردیدا دەکرێتەوە هی

ئەوە ببیە چاو نەیبینێت بەڵام وا دیارە عادەتگرتن پەموتالاکردنی ڕێزمانی کوردی لە کولانەی ڕێزمانی بێگانەوە باسەکەی لێ شاردوونەتەوە هەر چونکە لەو ڕێزمانانەدا باسێکی ئەوتۆیی پەیدا نییە.

ئەم بەکارهێنانەی (بووم بە – بوومە)... لە کتێبۆلکەی (چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی) کە لە ساڵی ١٩٧٦دا بڵاوم کردەوە بەدرێژی قسەی لێ کراوە. لەو تۆژینەوەدا ئەو فیعلانەی وەکو ( بوون، کردن) پتر لە جۆرێك بەکارهێنانیان هەیە دابەش دەبن بە ١- فیعلی ئینتیقالی. ٢- ئینتیقالیی پێچەوانە

فیعلی بوون جگە لە شێوەی عادەتی دوو جۆری نائاساییشی هەیە.

دەبم: جۆری ئاسایی

دەبمێ: جۆری ئینتقالی

دەمبێ: جۆری ئینتقالیی پێچەوانە.

ئەم شێوەیەی دواییان کە (دەمبێ)یە ئەگەر بۆ منداڵبوون بێ تێنەپەڕە، ئەگەر بۆ پارە بێت تێپەڕە

چەند فیعلێك لەمانە هەڵدەگرن لەگەڵ (بە) و بێ ئەویش بەکار بێن وەك، کردم بە – گوتم بە – گەیشتم بە – دام بە، کردمە عەمەلە، کردمێ – گوتمە دارا، گوتمێ –گەیشتمە ئاوات، گەیشتمێ – دامە عەلی، دامێ... بەشی هەرە زۆریی فیعلەکان (بە) قەبووڵ ناکەن وەك:

نۆڕیمە خانووەکە – چوومە شار – کەوتمە حەوزەکە – بردمە سەربان – خستمە دەستی – هەڵم دایە کۆڵان – ڕۆیوومە دزەکە [لێرەدا (بوون) ئەو (بە)یە قەبووڵ ناکات] ترنجامە ڕیزیانەوە – خونجامە نوێنەکەم – پەسوامە کەلەبەرەکە – ڕژایە ناو ئاو– خزیمە گۆمەکەوە – هاتمە ماڵەوە – سووڕایە بارێکی دیکەوە – هێنامە ژووری – هەڵمداشتە ئاوی زەلم– دانانە پێکەنین – ڕۆیشتمە باخەکە – دڵۆپەکە تکایە قاپەکەوە – هەڵگشامە سەری – پەڕیمە ئەوبەر. ئەمانە ٢٩ فیعلن، هەمووشی لە شێوەی ئینتیقالی بەکار هاتوون.

یەك لە سیفەتە سەرەکانی ئەم شێوەیە لەوەدایە کە ئەگەر فیعلەکە تێنەپەڕ بێت یەك مەفعول داوا دەکات. ئەگەر تێپەڕ بێت دوو مەفعوول:

چوومە هەولێر – گەیشتمە ئامانج – دارام کردە پاڵە – بەردم گرتە جوبڵەکە – چاوم بڕییە ناوەکە [ئەم فیعلە دەگمەنە] کە مەفعول شرایەوە فیعلەکان (ی) بەخۆیانەوە دەگرن:

دارام کردی نەک ئاراز – دەرمنگ گەیشتمی...

نالی دەڵێ:

وای فەرموو کە ماچت (نەدەمێ) ڕووڕەشی تۆو بم
ئەمساڵە بەجێ دێ ئەمەری وەعدەیی پاری

حاجی قادر دەڵێ:

خانەقاکەی کەنەفتی ئەمنە ئەدەبخانەیی عام
جێی قەزای حاجەتە عالەم بەزەرووری (دەچنێ)

لە حاڵەتی پێچەوانەییدا فاعیل دەکەوێتە جێگەی مەفعول وەک.

دەمبێ، دەمچێ، دەمنێشێ، دەمخورێ، دەمهەڕژێ (لەهجەی سلێمانی) فیعلی (دزان) لە (دزێو)ەوە هاتووە بەواتای حەز لێنەکردن و پێناخۆشبوون هەر شێوەی پێچەوانەی هەیە، دەڵێی: قسەکەتم زۆر دزا – دارام دەدزێ، دەمدزێ... ناگوترێ: دارا دەدزێم، وەک کە دەڵێی: دارا دەبینم.

فیعلی (ویستن) لە ئایندەدا دەبێتە ئینتیقالیی پێچەوانە. فاعیل تێیدا دەکەوێتە جێگەی مەفعول وەک: دەمەوێ، دەتانەوێ. لێرەدا ڕاناوەکان جێی مەفعولیان پڕ کردووەتەوە بەلام چونکە فاعیلی ڕاناوی (تان) بەکار هات هەرچەند فیعلەکەش ئایندەیە. ئەوانەی تازە ڕاهاتووی کوردی دەبن بەزۆری دەڵێن: دەوێم.

وا دەزانم (دەمەوێ – دەتانەوێ) لە (ویستن)ەوە نەهاتووە بەڵکو لە (ئەڤین)ەوە بۆیەیشە بزوێنی (ە) بەدوا ڕاناوەکەدا دێت کە پاشماوەی (ئە)ی (ئەڤین)ە و هەمزەکەی فرتاوە هەرچی (ویستم، ویستت... هتد) لە ویستنەوە هاتووە نەک لە (ئەوێ – ئەڤین) وەک کە (دەڵێم) لە (گوتن)ەوە نەهاتووە. لە فیعلێکی کۆنی کوردیی مردووەوە هاتووە کە ئێستاکە لە زمانی هیندی (سان سکریتی)دا زیندووە.

مامۆستا وەهبی لە کۆنەوە بەکورتی بەسەر ئەم (بووم بە. گەیشتم بە..)یەدا ڕۆیشتووە و هەر بەپێی زاهیری حاڵیش (بە) کەی بە(حرف جر) داناوە [کە لەم شێوەیە

ڕاستە حەرف جرە]، هیچ بەلای (انتقالی)... و داخوازیکردنی مفعول   و...و ئەو لایەنانەدا نەچووم.

(هەبوون) بەواتای (تملك) لە بنەڕەتدا هەرچی بووبێت، جودایە لەو هەبوونەی تازە باس کرا کە دیتمان لە چییەوە هاتووە. بەلای باوەڕی خۆمەوە ئەسڵەکەی (هەڤبوون)ەوە خزمی haveای ئینگلیزی و avoirی فەرەنسییە. بەداخەوە شێوە نووسینی کۆنی کوردیمان نییە بۆی بچینەوە کە دەڵێین: هەمە، وەك ئەوەیە بڵێین: کردوومە، کە بڵێین: هەیەتم – هەیتم، ڕێژەی (کردوومتم، خواردووەتم)مان بەکار هێناوە. لە ڕووی ڕێزمانەوە (هەیەتم) پەسەندترە لە (هەیتم) چونکە بزوێنی (ە) لە وشەی (هە)دا کە ئەم (ی)ە داخوازی کرد بۆیە بوو بزوێنی دوای (ی)ەکە بپارێزێت و وشەکە ببێتە (هەیەتم) ئەگینا دەگوترا (هەتم) واتە دەنگی (ت) بەس بوو بۆ ئەوەی (هە) نەبێتە (هەم) و بەفعل الکینونە حیساب بکرێت.

ئەگەر (هەڤ) مابایە ئەوسا لزووم بەو (ی)ە نەدەما و دەگوترا (هەڤەتم) وەك کە گوترا (کردووەتم، خواردوومتم). لەهجە هەیە لەمانەشدا دەڵێ: (کردۆتم، خواردۆتم، چۆتم و هاتۆتمەوە)... بەلام بێگومان (هەیەتم، کردوومتم)... ڕەسەنتر و پەسەندترە، تەنانەت لە کاری تێنەپەڕدا کە دەڵێین (ئێمە نووستووین) ئەگەر کارەکە تێپەڕ بایە دەمانگوت (ئێمە کردوومانە).

من لێرە بەهێشەوە ئەم بیروڕایەی خۆمم دەربارەی (هەڤ)... بەنووسین بلاو کردووەتەوە بێ ئەوەی هیچ نموونەیەکی کۆنم لە هیچ سەرچاوەیەك دەست کەوتبێت، هەتا لەو ڕۆژانەی دواییدا کە بۆم ڕێك کەوت کتێبی (فقه اللغه ایرانی) نووسینی ای. م. ارانسکی، وەرگێڕانی بۆ فارسی لەلایەن کەریم کشاورزەوە بخوێنمەوە و خۆشبەختانە لە لاپەڕە ٨٦دا ڕستەی (خشایو ثی ت هڤات وو) بەواتای (پادشاهیی هەبوو) [پادشاهی داشت – ی فارسی] هاتووە و بەتەواوی (هڤا) بەواتای (هەڤ) خۆی نیشان داوە، دەقەکەش لە ئاڤێستاوە وەردەگرێت: (هڤات وو) ڕاستەوڕاست دەبێتە (هەیبوو) بەلام لە دەقی ئاڤێستادا ئەم (ی)ی کەسی سێیەمی تاك کە لە (هەیبوو)دا دەردەکەوێت پێشتر دەرکەوتووە وەك کە لە سەرەوە گوتمان (پادشاهیی هەبوو)دا ڕاناوەکە لە شوێنی ڕەوای خۆیدا، دوای بەرکار دەرکەوتووە و (هەبوو) بێ ڕاناو ماوەتەوە.

لەلایەن (هی) کە گوتارەکە بە (ضمیر التملك)ی دادەنێت [ل. ١٧٦] دوای لێکدانەوە و وردبوونەوە لە دوو ڕستەی (ئەم قلمە هی منە) و (ئەمە قلمی منە) دەردەکەوێت کە (هی) خۆیەتی لە ڕستەی دووەمدا (هـ)ەکەی سوواوە و ماوەتەوە (ی) کەوا ئاشکرایە دوورە لە (ضمیر) و ئامرازێکی عادەتی (اضافەیە) و زۆر کەس هەر لەم بارەوە دێن دەڵێن: (هی منە) و (ئەم قلمە هینەکەی منە.) لەمەشدا ئەخنێك سەرپەوی دەکەن کەوا لەبەر لێکترچوونی (هی – هین – هینەکە) دوو وشەی لێکتر جودا تێك دەکەنەوە، چونکە (هین، هەرامە، فیسار)... زەمناون لە بری ناوێکی لەبیرکراو یاخود ژێربەردە خراو بەکار دێن.

دیسانەوە خۆشبەختانە لە هەمان کتێبی فقە اللغەی یاسکراودا جارێکیان لە دەقی ئاڤێستایی و جارێکیشیان لە دەقی زمانی هەخامەنشی (فارسیی کۆن)دا ئەم (هی)یە وەك ئەداتی (اضافە) بەکار هاتوون.

لە لاپەرە ٨٦ لە دەقی ئاڤێستاییدا هاتووە:

بیماهی خشەتر نورڤەهی بەواتای- لە پادشاهیی جەمشیدی بەرز پیما جەمشێد (هی) ئەداتی اضافەیە بەواتای (هی جەمشید) هەروەها هەمان (هی) ئەداتی اضافەیە لە (نورڤەهی) بەواتای (هی نورڤە) لە لاپەرە ١٠٢ لە دەقی هەخامەنشیدا هاتووە:

ڤیشتاسپەهیا بەواتای هی ڤیشتاسپ

ئەرشامە هیا بەواتای هی ئەرشامە

ئەمە و کۆمەڵێك عوزرخوازی دەکەم لە شێوەی نووسینەکەم کە حەزم دەکرد شیرنتر بوایە... بەهەمەحاڵ نیازمکە شیرینە کە خزمەتی سەقافەت و زمانەکەمانە وێڕای ڕێز و ئاواتی سەرکەوتوویی بەردەوامیی د. ئەسرین فەخری.

ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٣٤، ١٩٩٤

# "کۆڕی زانیاری کورد" چۆن ئەم ناوەی وەرگرت؟

کۆمەڵێك لە نووسەران و خاوەن بیروڕایانی کوردەواری، یا بە هەڵسەنگاندنی ئەم ناوەی "کۆڕی زانیاری کورد" بوون، پێش نووسین، یاخود هەر بە قسە، هەریکی ڕەخنە لێگرتن و ئەوانیش ئەندامانی کۆڕ بە تێکڕایی، چەند دانیشتنێکی درێژە پێدراویان تەرخان کرد بۆ دۆزینەوەی ناوێکی ئەوتۆ بەپێی توانایی و لوان لەگەڵ مەبەسی دامەزراندنی ئەم ساختمانە بگونجێ. بێگومان خۆ ماندووکردن بە کارێکی وا گرنگ و پیرۆزەوە، سەرەڕای ئەوە کە نموونەی پێویستییەکی نیشتمانی و کۆمەلایەتی و ئەدەبییە، بە سەرشانی هەموو خاوەن دەسەلاتێکی فیکری و خامەیی کوردەوە، هەر لە خۆیشیدا بەڵگەیە بۆ بوونی گیانێکی بزۆز و پڕ جموجووڵ لە نێوان ئەو کەسانەی پەیوەندیان هەیە لەگەڵ بزووتنەوەی فیکری و ئەدەبی و مژدەدەری ئەوەیە کەوا لە هەموو هەلوێستێکی لەم چەشنەی ئێستاکە و دوارۆژیشدا هەمان گیانی دامێنەر و دروستکەر خۆی نیشان دەدا و بەرهەمی پاکی خۆی پێشکەش بە کوردایەتی دەکا گوتمان "بەرهەمی پاك" چونکە گومان لەوەدا نییە کەوا هەر زمان و خامەی پاکە بتوانێ لە باغی فیکر و خوێندەواریدا، میوەی پاك و پیرۆزی زادەی مێشك و گیان بچنێ و بە هونەری ئینسانانە ئارایشتی بدا و بیخاتە کۆڕی ڕۆشنبیران لە مرۆڤی هاوچەرخ و ئەوەکانی داهاتوو.

ئەندامانی کۆڕ، بەرلەوەی بکەوێن بەدوای ناوێکدا، چەند دروشمی بنچینەییان ڕەچاو کرد تا هەر ناوێك پێشنیهاد بکرێ وە یا بژارە بکرێ، لە چوارچێوەی مەبەس و مانای ئەو دروشمانە دەرنەچێ و لە هەمان کاتیشدا ئەمەیان کرد بە بەرگری دەمەتەقێیەکی بێ پایان و بێ سوود، چونکە دووانی بێ دروشم و سنوور کەم وایە دوایی بێ. دروشمەکانیش ئەمانەن:

(١) وشەی بێگانە بەکارنەهێنرێ لە داڕشتن و دروستکردنی ناوەکەدا.

(٢) ناوەکە جێگەش ڕابگەیەنێ، نەك هەر کۆبوونەوە.

(٣) ئەو وشانەی ناوەکە پێك دێنن لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا بیسراو و ناسراو بن.

(٤) وەرگێڕانی پیت بە پیت لە (المجمع العلمي الكردي)ەوە بۆ ناوێکی کوردی، مەرج

نییە و ناشێ بە کۆسپ لە پێش ناوێکی ڕێکوپێکدا.

(٥) مۆسیقای ناوەکە لە بیستندا خۆش بێ.

ئیتر لەبەر تیشکی ئەم دروشمانە، ئەو پێشنیهادانەی کەوا خرابوونە باس لێکردنەوە وەك (کۆڕ، هۆز، ئەکادیمی، مەکۆ، زانست، زانکۆ) هەڵسەنگێزان و ئەم دیو و ئەودیویان پێ کرا و لە ئەنجامدا:

(١) وشەی (ئەکادیمی) پەسەند نەکرا چونکە کوردی نییە.

(٢) وشەی (زانست) دوور خرایەوە، چونکە لە هەندێ شوێنەکانی کوردستاندا نەبیستراوە (پاشان لە ڕوویەکی دیکەشەوە بەراوردی زانست دەکەین لەگەڵ زانیار).

(٣) وشەی (هۆز) و (مەکۆ) دوور خرانەوە، چونکە یەکەمیان جگە ناگەیەنێ و دووەمیان لەبەر ئەوە کە بۆ شتێك ناوبانگی پەیدا کردووە دوورە لە زانین و خوێندەوارییەوە. بۆیە هەردووکیان خەتیان بەسەردا کێشرا. جگە لەمانەش وشەی دیکە هەبوون و پێشنیهاد کران، بەڵام بەرلەوەی بخرێنە لیستەی لێکۆڵینەوە، سڕانەوە، لەبەر هۆی ئاشکرای ئەوتۆ کە پێویستی نەهێشت بەلێکۆڵینەوە[١].

(١) یەك لەو وشانە وشەی (ئەنجومەن) بوو کەوا لە نامەکەی مامۆستا وەهبیدا (ئەنجەمەن) نووسراوە و لە فەرهەنگەکەیدا (ئەنجومەن). دوو هۆی گرنگ خرایەپیان کرد لە دوورخستنەوەی ئەم وشەیەدا. یەکەمیان ئەوەیە کە وشەی (ئەنجومەن) فارسییە و لای هەموو کەس بەفارسی ناسراوە لێکۆڵینەوەی دوور و درێژی مێژوویی تا سووری دەکاتەوە داخوا ئەسڵی وشەکە کوردییە یا فارسی لەگەڵ فرمانی کۆڕ یەکتر ناگرنەوە، چونکە دەبوا بەزوویی ناوێك بۆ (کۆڕ) دابنرێ. هۆی دووەم ئەوەیە کەوا وشەی (ئەنجومەن) لە باری ماناوە (مجمع) ناگەیەنێ، بەڵکو (لجنة) و (کۆمەڵە)ی سەرپەرشتیکەری ئیشێك دەگەیەنێ. فەرهەنگی مامۆستا وەهبی بۆ مانای کۆڕ council ی داناوە کە هەر دەکاتەوە (لجنة) و کۆمەڵەی سەرپەرشتیکەر. ئێستاش لە زمانی عەرەبیدا (مجلس)ی بۆ بەکاردێنن. (کۆڕ - مجمع) زۆر فراوانترە لە (ئەنجومەن) چونکە کۆبوونەوەی ئەندامانی کۆڕ دەبێ بەئەنجومەن. وا بزانم ئێستا لە تورکیدا (ئەنجومەن) ڕاستەوخۆ بەمانای (لجنة) بەکاردێ.

دوای ئەم دەسەبژاردە، لە پێشنیهادەکان دوو ناوی (زانکۆی[٢] کورد) و (کۆڕی زانیاری کورد) مایەوە. هەردووکیان خرانە دەنگ وەرگرتنەوە. زۆربەی زۆری ئەندامان (کۆڕی زانیاری کورد)یان پەسەند کرد. ئیتر بڕیاری تێکڕایی درا کە ئەمەیان ببێ بەناوی ساختمانەکە.

تا ئەمەی لێرەدا بەچەند دێڕێك نووسین لێی بوومەوە، کاتێکی دوور و درێژی خایاند لە زنجیرەیەك دانیشتنی پڕ لە جۆش و هەندێ جار پڕ لە دڵگەرمی، لەلایەن هەموو ئەندامانی کۆڕەوە، وە بەدەم دووان و دەمەتەقەوە دەربارەی ناوی کۆڕ بەوردی لەوە کۆڵینەوە ئاخۆ دوو وشەی (کۆڕ) و (زانیار) چین و مانایان چییە؟ من لێرەدا ماوەی ئەوەم نییە هەموو ئەو را و باوەڕانەی دەربڕاون لەلایەن نووسەران و خاوەنبیرانی کوردەوە بەرامبەر بەمانای ئەم دوو وشەیە، تۆمار بکەم. رەنگ بێ پێویستیش نەبێ چونکە هەرچی لەلایەن نووسەرانەوە نووسراوە و بڵاوکراوەتەوە لەمبارەیەوە، زۆربەی خوێنەران دیویانە و تێی گەیشتوون. ئەوەندە هەیە نامەی مامۆستا تۆفیق وەهبی کە لە پیرۆزبایێدا بۆ سەرۆکی کۆڕی نووسیوە و تا ئێستا بڵاونەکراوەتەوە، وا لێرەدا دەیخەینە پێش چاوان، تا خوێنەرانی کورد لە هەموو روویەکەوە ئاگادارین لەو رەخنە و دەمەتەقەی کە لەم دوو وشە و تەواوی ناوی کۆڕەوە سەری هەڵداوە و بەدوای ئەم ئاگاداربوونەوەدا رایەکی پوختەی لێ بەرهەم بێنن. بەشێکی ئەوەی لێرە بەدواوە لە بارەی دوو وشەی (کۆڕ) و (زانیار)ەوە دەینووسم، لە دانیشتنەکانی کۆڕدا باسی لێ کراوە و هەندێکیشی بەپێی جێگە و پێویست لە کاتی نووسیندا خۆی سەپاندووە. لەوانەیشە بەراوردکردنەوەی هەندێ وشە لێرەدا درێژە بکێشێت، گەلێ زیاتر لەوەی کە لەلایەن کۆڕەوە بەراوردی لێ کراوە، چونکە ئەو کاتە زووتر لە ئێستە دەگەیشتینە ئەنجام و بڕیاردان. وەك لێرە من خەریك دەبم ئەوسا خەریکی وەرامدانەوەی رەخنەگران نەدەبووین.

---

(٢) زانکۆ: وشەیەکی تێك هەڵکێشە لە دوو وشەی ( زان) و (کۆ) پێك هاتووە. لە کاتی دەمەتەقەی ئەندامانی کۆڕدا مەیلێکی ئاشکرا هەبوو بۆ ئەوەی تا بکرێ وشەی ناك بەکاربهێنرێ نەك تێك هەڵکێش. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ خاوەن رای (زانکۆ)یان بەلاوە پەسەندتر بوو. لێرە بەپێشەوەش ئەم زاراوەیە بەکارهێنراوە و تا رادەیەك پەرەسەندوو بوو. بۆیە تەنها ئەمیان لە نێوان هەموو پێش نیهادەکانی دیکەدا بۆ لێدوان و هەڵسەنگاندن خۆی گرت تا کاتی دەنگ وەرگرتنی دوایی کە (کۆڕی زانیاری) تێیدا زاڵ بوو بەسەریدا.

جا با بێینە سەر مانای دوو وشەی (کۆڕ) و (رانیار).

(کۆڕ) وەك بەلای کورد زمانەوە ئاشکرایە، کۆبوونەوەیە بۆ مەبەستێکی تایبەتی لە جێگایەکدا. خۆ هەر ئەم مانایەشە لە فەرهەنگەکەی مامۆستا توفیق وەهبیدا بۆ کۆڕ نووسراوە(٣). لەهاڵ ئەمەدا با بڵێین وەك نامەکەی مامۆستا وەهبی دەڵێ دەبێ مەبەستەکە کاتی (وقتی) بێ و بەدوایبهاتنی ئەو مەبەسە کۆڕەکەش نەمێنێ. من لێرەدا شتێکی دیکەش دەخەمە پاڵ (جێگە و کۆبوونەوە و مەبەسی تایبەتی و کاتی) تا هەموو مانای کۆڕمان خستبێتە سەر کاغەز، ئەویش ئەوەیە کەوا لە وشەی (کۆڕ)دا خرۆش و جۆشێك هەیە لە هیچ جۆرە جێگە و کۆبوونەوەیەکی تردا هەستی پێ ناکرێ. کەواتە وشەی (کۆڕ) جێگە و کۆبوونەوە و مەبەستی تایبەتی و کاتی و خرۆش دەگەیەنێ.

گومان نابەم هیچ خوێنەر و رایەك رەخنەیەکی هەبێ لە (جێگە و کۆبوونەوە و مەبەستی تایبەتی و خرۆش)، دەمێنێتەوە ئەوە کە کۆبوونەوەکە کاتی بێ کەچی مەبەستەکە هەمیشەیی بێ، چونکە (مجمع) هەمیشەییە. بۆ ئەم رەخنەیە دوو وەرام هەیە.

(١) کورتی و درێژیی کاتی ئەو مەبەستەی کە کۆڕی بۆ دەگێڕێ ئەوە دەگەیەنێ کەوا کۆڕی هەندێ شت لە هەندێکی تر درێژتر بێ. با بڵێین کۆڕی شەڕ لە کۆڕی زیکر و هەڵپەرکێ درێژترە. شەڕ بۆ خۆی هەندێ جار سەعاتێك و هەندێ جار دە ساڵ دەخایەنێ. خۆ جەنگی سطیبی ٢٠٠ ساڵی خایاند. جا کە بلوێ بەپێی داخوازیی مەبەست درێژە بدرێ بەکاتی کۆڕبەستن، هیچ بەرهەڵستێك بۆ ئەوە نامێنێ کە کۆڕی زانیاری ئەو ماوەیە بخایەنێ کە فرمانی ساختمانەکە داخوازیی دەکا. جا ئەو ماوەیە هەرچەند درێژبێ. ئەگەر ئەمەش بەس نەبێ بۆ سەلماندن و دڵنیابوون، وا بزانم وەرامی دووەم رێگای ئەسەلماندن دەبەستێ.

(٢) کەم وایە و رەنگە هەر نەبێ، زاراوەی تازە داهاتوو لە خودی خۆیەوە پڕ بەپێستی ئەو مەبەستەبێ کە بۆی داتاشراوە و ئەگەر ئەم پڕ بەپێست بوونە مەرجێکی

---

(٣) بێ ئەوە وشەی جێگای بەکارهێنابێ، بەلام کۆبوونەوەیەك کە لە (کۆڕ)دا دەبێ بێ جێگە نابێ. بۆیە دەڵێم ئەم مانایە لە فەرهەنگی مامۆستا وەهبیدا بەکارهاتووە سەرەڕای ئەمە لە ناوچەی بادیمان گوندێك هەیە بەناوی (کۆڕی گاڤان) کەوا راستەوخۆ (جێگە) دەگەیەنێ نەك جێگە بەهۆی کۆبوونەوەوە.

بنچینەیی بۆ لە دارشتنی زاراوەدا. لە زۆر شوێندا یەك دەكەوێ و زمان ناتەواو و وەستاو دەمێنێتەوە

لێرەدا چەند میسالێك دەهێنمەوە كە هەزاران هەزاری وەك ئەوان فەرهەنگەكانی جیهانیان پڕ كردووەتەوە

عەرەب كە گوتی (مربع) هەر ئەوەندەی كرد بەم وشەیە شێوەیەكی چوارگۆشەیی هێنایە بەرچاو. نە (زاویەی قائمە) و نە چوونییەكی (ضلع)ەكانی بۆ دەرنەبڕا خۆ لە هەمان كاتدا (مستطیل) و (متوازی الاضلاع) و (معین) و (شبە منحرف) هەموویان چوارگۆشەیین و هیچ كامێكیان بەو وشەی كە بووە بەناو بۆی، مانای مەبەس لە زاراوەكە راناگەیەنێ. (مستطیل) خۆ هەر درێژكار نییە و بەس. ئەوانی دیكەش هەر ئەوە نین كە لە وشەكە دەفامرێتەوە.

یاخود كە بەكتێبی ئاین و ئاسمانیی خۆی گوت (قرآن)، لەم وشە رووتەدا تەنها (خوێندنەوە) راگەیەنرا. دیاریشە نە (قرآن) تەنها خوێندنەوەیە و نە هەر كتێبی (قرآن) دەخوێندرێتەوە. كورد كە بە (رباعی)ی گوت (چوارینە) و بە (مخمس)ی گوت ( پێنج خشتەكی)، لە هیچ كامێكیانا كێش و قافیەی دیاری نەكرد. (هایدرۆجین) كە (ئاو پەیداكەر) دەگەیەنێ، بەتەنها لە خۆیەوە ئاو پەیدا ناكا و جگە لە ئاو تێكەڵی قەوارەی زۆر ماددەی دیكەش دەبێ كە لە وشەكەدا بەهیچ جۆرێك خۆی دەرناخات. كەواتە دەبێ ئەو وشانە و هەر وشەیەكی تری وەك ئەمانە لە هەموو زمانەكانی جیهاندا بسڕێنەوە. جا هەر كاتێك لەگەڵ ئەو تەرزە زاراوانەدا كارێكی وا كرا، با كۆڕی زانیاری ئێمەیش وەك ئەوان ببێتە قوربانی پوختەیی زمان و لە ناو بچێ.

لێرەدا دەمەوێ ئەمە روون كەمەوە كەوا ئەمەندە بەسە بۆ زاراوە شیاوبێ بۆ مەبەسەكەی و لەگەڵ رێزمانی زمانەكەی بگونجێ، كەم و زیادییەك لە دارشتنیدا وەیا ناتەواوییەك لە مانایدا هەبێ دەبێ چاوی لێ بپۆشرێ وەك لە زاراوەی تر پۆشراوە. ئیت دوای بەكارهێنانێكی كەم لە خۆیەوە دەنیشێتە دڵ و مێشكی خەڵقەوە و دەبێتە سامانێكی تازە بۆ زمان و ئەدەب. باوەڕم هەیە زۆربەی زاراوەی هونەری و زمانی و زانستی و ئەدەبی لەو چەشنەن و بەوجۆرە دارێژراون و خراونەتە بەكارهێنانەوە. كەواتە سەیر و جێگەی ناڕەزایی نییە وشەی (كۆڕ)یش وەك زاراوەیەكی تازە

بەراوێزەکەی ئەختێك بکێشرێتەوە تا کەمێك لە مانای خۆی زیاتر رابگەیەنێ تا ئێرە بەلای منەوە لە شیکردنەوەی ناوی (کۆر)دا زەحمەتێکی زۆر نایەتە پێش نووسەر، بەلام وشەی (زانیار) وە یا (زانیاری) لێکۆڵینەوە و هەڵسووڕ و داسووڕێکی گەلێ زیاتری پێ ئەوێ، تاکو بنچینە و مانای بەتەواوی روون بکرێتەوە بۆ خوێنەری بەڕێز.

(زانیار) وشەیەکە لە رواڵەتدا هاوکێشێکی رێزمانییە لەگەڵ کۆمەڵێك وشەی دیکەی کوردیدا کە دواییان دێ بەسێ پیتی (ی.ا.ر) وەك: فرۆشیار، کڕیار، دزیار، پرسیار، بڕیار، جووتیار، هۆشیار، بەختیار، بەلام هەر لە یەکەم نیگادا بۆ زمانزان دیار ئەکەوێ هاوکێشی ئەمانە هەر وشەیی و رواڵەتییە و لەلایەن جۆر و ماناوە دابەش ئەبن بەدوو لەتی تا بڵێی لە یەك جیاواز.

لەم وشانەی کەوا دواییان دێ بەسێ پیتی (ی.ا.ر) و بەدیمەن وەك یەك جۆر دێنە پێش چاو، دوو وشەی (کڕیار) و (فرۆشیار) بێگومان هەردووکیان (اسمی فاعل)ن، ماناکەیان لە عەرەبیدا (مشتری) و (بایع)ە کە ئەوانیش هەر (اسمی فاعل)ن چەند وشەیەکی دیکەش وەك(جووتیار، هۆشیار، بەختیار) هەرچەند (اسمی فاعل)ی راستەقینە نین، چونکە لە (فعل) وەرنەگیراون، بەلام ئەشێ بخرێنە رێزی (اسمی فاعل)ەوە لەبەرئەوە کە هەرسێکیان مانای (خاوەن - صاحب)یان تێدایە کە لە ناوەرۆکدا (فاعیلایەتی) ئەگەیەنێ. (بڕیار) و (پرسیار) و (دزیار) و گەلێ وشەی دیکەش کەوا وەك ئەمان بە (یار) دواییان دێ هیچ کامێکیان (اسمی فاعل) نین، بەڵکو شتێکی دیکەی زۆر جیاوازن کەوا لە کاتی خۆیدا روونی ئەکەینەوە و ناوی لێ ئەنێین. ئاخۆ ئەوەی هەندێکیان ئەکا بە (اسمی فاعل) و هەندێکی دیکەیان ئەکا بە (شتێکی دیکە) ئەبێ چی بێ؟ وردبوونەوەیەك لە وشەی (فرۆشیار) و بەدوا ئەودا لە (کڕیار) و ئەوجا (فرۆشیار) و ( هۆشیار) و (بەختیار) هۆی ئەم جیاوازییەمان بۆ دەرئەخا، وشەی (فرۆشیار) کە لە بنچینەدا لە (فرۆشتن) وەرگیراوە پیتی (ی)ی تێدا نییە، کەواتە وشەکە ئەبێ هەر سێ پیتی (ی.ا.ر)ی لێ زیاد کرابێ و پێوەی لکابێ، کردبێتی بە (اسم فاعل). بەپێی ئەمە کە وشەی (کڕیار)یش وەك (فرۆشیار) (اسمی فاعل)ە ئەبێ ئەمیش وەك ئەو سێ پیتی (ی.ا.ر)ی پێوە لکابێ و کردبێتیان بە (اسمی فاعل).

بەڵێ لە وشەی (کڕین)دا کە بنچینەی (کڕیار)ە پیتی (ی) هەیە، ئیتر رەنگە بگوترێ

دەبوا دوو (ی) لە وشەی (کریار)دا هەبا یەکیان بنچینەیی و ئەوی دیکەیان هی (ی.ا.ر). بەڵام بەپێی ڕێزمانی زمانی کوردی لە جێگایەک کە دوو (ی)[4] لە دوو سەرچاوەی جیاوازەوە هاتن و لەگەڵ یەکدا کۆبوونەوە، یەکیان دەمرێ و دەمێنێتەوە یەک (ی). وەک دەبینین لە حاڵی (اضافە)دا ئەگەر وشە (مضاف)ەکە پیتی (ی)ی بەدواوە بوو (ی)ی (اضافە)ی ناخەینە سەر و ناپکەین بەدوو (ی) و وای دەدرکێنین (تلفظ)کە هەر تاکە (ی)یەکی پێوەبێ[5].

بۆ نموونە هەرچەند لە وشەی (زەوی)دا (ی) یەک هەیە و لە کاتی (اضافە)دا دەبوا (ی)یەکی تریشی لەگەڵدا بگوترێ. بەڵام یەک لە دوو (ی)کە دەمرێ و تەنها یەکێکیان دەمێنێتەوە. ئیتر گومان لەوەدا نییە ئەوەی (کریار) و (فرۆشیار)ی کردووە بە (اسمی فاعل) لێ زیادکردنی سێ پیتی (ی.ا.ر)ە و ئەم ڕاستییە بەهۆی وشەکانی دیکەی وەک (جووتیار) و (هۆشیار) و (بەختیار)ەوە، بەتەواوی سوور دەبێتەوە، چونکە لەم وشانەدا گومانێک نییە کە سێ پیتی (ی.ا.ر) زیادن، بۆیە بوون بەشتێکی نزیک لە (اسمی فاعل). بەمەدا ڕوون دەبێتەوە کەوا هەر وشەیەک (ی.ا.ر)ی لێ زیادکرا دەبێ بە (اسمی فاعل).

کەواتە ئەگەر وشەیەک لە ئەسڵدا پیتی (ی)ی تێدا بوو وەک (ناسیار، پرسیار، بریار) کە بنچینەیان (ناسین) و (پرسین) و (برین)ە و بەسێ پیتی (ی.ا.ر) دوایی هات لەگەڵ ئەمەشدا مانای (اسمی فاعل) نەبەخشێ دەبێ بەحوکمی (منطق و قیاس) بڵێین ئەم (ی)ەی کەوا تێیدا هەیە بنچینەییە، نەک پێوەی لکاوە، وە ئەوەی لێی زیادکراوە دوو پیتی (ا.ر)ە و بەس. بەم جۆرە ئەم وشانە هەرچەند لە ڕواڵەتدا دواییان (یار)ە، بەڵام لە ڕاستیدا دەچنە ڕیزی کۆمەڵێک لە وشەی دی کە دواییان بە (ار) دێ و هیچیان مانای (اسمی فاعل) یان تێدا نییە وەک (کردار، گوتار، کوشتار) و هەمووشیان لە (فعل) وەرگیراون.

کەواتە وشەی (پرسیار) و (بریار) و هاوڕێکانیان هاوکێشی ڕێزمانین لەگەڵ (کردار) و (کوشتار) نەک (فرۆشیار) و (جووتیار)، چونکە وەک بۆمان دەرکەوت جیاوازییەکی بنچینەیی هەیە لە مەبانی هەردوو جۆرە وشەکاندا.

---

(٤) مەبەس (ی)ی تێژە کە تا ئێستا بەدوو (ی) دەنووسرێ.

(٥) لێرەدا مەبەس درکاندنی پیتەکەیە نەک جۆنیەتیی نووسینی، کەوا ڕەنگە نووسەرێک (ی)ی (اضافە)کە دابنێ و یەکێکی تر دایەنێ.

تا ئێستا بەپێی باوەڕی خۆم، سوورمان کردەوە کەوا وشەکانی وەك (فرۆشیار) و (جووتیار) لە جۆری (اسم فاعل)ن. ئەی ئەو وشانەی هاوکێشی (گوتار) و (کوشتار) و (بڕیار) و (پرسیار) کە هەر (ار) یان پێوە لکاوە، دەبێ چی بن؟

ئەمانە، بەپێی ئەوەی من بۆی دەچم، لە زمانی کوردی و فارسیدا جۆرێکن لە (مصدر) کە مانایەکی (مطلق) رادەگەیەنن، بێ ئەوەی روودان (حدوث) وەیا (کات) (زمان) یان لێ بفامرێتەوە.

بۆیە لە کوردیدا دەگوترێ (دار بڕین) و (شیعر گوتن) و (ئیش کردن) بەلام ناگوترێ (دار بڕیار) و (شیعر گوتار) و (ئیش کردار) چونکە لەم (صیغە)یەدا روودان نییە، بەپێچەوانەی (صیغە)کەی دی کە هەر خۆی سەرچاوەی روودانە و (فعل) لەو وەردەگیرێ. لە عەرەبیدا بۆ (مصدر)ی بێ روودان (صیغە)یەکی تایبەتی نییە، بەلام کە ویستیان (مصدر)ێك مانای (مطلق) رابگەیەنێ، دەڵێن (مصدر لا یقصد به الحدوث). هەندێ لە زمانزانانی کورد بەلایانەوە وایە ئەمانە جۆرێکن لە (اسمی مفعول)، بێ ئەوەی جیاوازیی میانی ئەمانە و جۆرەکەی تر کە (اسم فاعل) بوو روون بکەنەوە، وەیا مۆیەك بۆ قسەکەیان بدۆزنەوە بەگوێرەی تێگەیشتنی من ئەم رایە هەر ئەوەندەی پێکاوە کە وشەکانی دەرکردووە لە (اسمی فاعل)، دەنا بەسەرنجێکی کەم دیاری دەدا وشەی (پرسیار) کەم و زۆر (مسؤول) و (پرسراو) راناگەیەنێ، بەڵکو ئەو مانایە رادەگەیەنێ کەوا لە وشەی (مسألة) دەفامرێتەوە و بەمەرجێك (حدوث) و (زمان)ی تێدا نەبێ.

هەروەها (بڕیار)یش (مقطوع) و (بڕاو) نییە بەڵکو مانای ئەو (بڕین)ە (مطلق)ەیە کە باسمان کرد. لێکۆڵینەوەی ئەوتۆیی کە لێرەدا خوێنەر دەیبینێ وا بەکورتی و بەرادەی پێویست لەسەری دەڕۆم، بەلای زمانزانانەوە شتی سەرەتایین بۆ وردبوونەوەی قووڵی (فیلۆلۆجی) کەوا بەناخ و درێژایی و پانایی بابەتدا دەچێ و دێ.

هەرچەند من (فیلۆلۆجست)یش نیم، دیسانەوە تا کۆتایی و ناخی ئەو وشانە ماوەیەکی تەواوم ماوە وا لێرەدا پەلە لە بڕینی دەکەم، تا بگەم بەوشەی (زانیار) و (زانیاری) کە هۆی ئەم دەمەتەقەیەن.

وا بزانم زۆربەی خاوەن رایان لە کوردزمان وشەی (زانیار) لە جۆری (اسمی فاعل)

داسانین و سەلایانەوە (عالم) و (زانا) راساگەیەنێ هەروەك (فروشیار) (بایع) رادەگەیەنێ. مامۆستا تۆفیق وەهبی لە نامەیەکدا دەفەرمووێ خۆی وشەی (زانیار)ی دروست کردووە و بۆ مانای (معلومات) نەك شتێکی دیکە. کەواتە مامۆستا وەهبیش لەو باوەڕەدایە (زانیار) لە چەشنی (اسمی فاعل) نییە. من وەك شاگردێکی ئەو مامۆستایانەی لە زمان و ڕێزمانی کوردی دواون و هەوڵ و زانینی وان هۆیەك بووە بۆ ئەختە شارەزاییەکی کە لەم مەیداندا بۆم بەرهەم هاتبێ، ئا منیش لەو باوەڕەدام کەوا (زانیار) لە چەشنی (اسمی فاعل) نەبێ. بەڵام دوای ئەوە بڕیاربدرا کە (اسمی فاعل) نییە، ئیتر ڕێزمانی زمانەکەمان بەدەنگ دێ و خۆی بڕیار دەدا ئاخۆ کە (اسمی فاعل) نەبوو ئیتر دەبێ چی بێ. مەودای موناقەشە تا ئەو رادەیە کراوەتەوە کە گوترا ئەو وشەیە لە تیپی (اسمی فاعل) نییە چونکە دەرکردنی لەم تیپە راستەوخۆ دەبخاتە تیپەکەی ترەوە و دەیکا بەهاوکێشی ڕێزمانیی ئەو وشانەی دوو پیتی (ار)یان لێ زیاد کرابێ وەك (پرسیار) و (کردار) و (گوتار) و (بڕیار) و دەچێتە پەك لەو (مصدر)انە کە ڕوودانیان تێدا نییە. ئیتر ئەویش ئالکێ بەوشەیەکی دیکەوە و بیکا بە (مفعول) و ناگوترێ (شت زانیار) هەروەك دەگوترێ (شت زانین). کەواتە (زانیار) ئەو مانا (مطلق)ە رادەگەیەنێ کەوا لە عەرەبیدا ئێستاکە وشەی (المعرفة) رای دەگەیەنێ نەك وشەی (علم) چونکە بەهۆی بەکارهێنانەوە وشەی (علم) بووە بەزاراوە بۆ تاقمێکی تایبەتی لە زانین پەراوێزەکەی تەسکترە لە (معرفة). ئێستاکە دەگوترێ (الاعدادية العلمية) جیاوازە لە (الاعدادية الادبية) یا (التجارية) یا (الزراعية) .. تاد. هەروەها (هونەر) بەر (علم) ناکەوێ، بەڵام (هونەر) و (کشتوکاڵ) و (ئەدەب) و (بازرگانی) و هەموو جۆرە زانیارەکانی دیکە لە پەراوێزی (معرفة) دەرناچن. لە کوردیشدا بەپێی بەکارهێنانی سی چل ساڵی دوایی، وشەی (زانیار) ماناکەی فراوانترە لە مانای وشەی (زانست)، چونکە هەروەك لە عەرەبیدا (علم) جۆرە زانینێکی تایبەتییە و خۆی لە (فن) و (ادب) و (صنعة) .. تاد جیا کردووەتەوە زانستیش لە کوردیدا بەهۆی بەکارهێنان وەك وشەی (علم)ی عەرەبی وەیا Scienceی ڕۆژاوایی لێ هاتووە و بووە بەزاراوە بۆ تاقمێکی تایبەتی لە زانین کە هونەر و ئەدەب و پیشەسازی ناگرێتەوە بەڵام وشەی (زانیار) چونکە زانین (مطلق) رادەگەیەنێ سنوور و پەراوێزی نییە و هەموو جۆرە زانینێك دەگرێتەوە، زانست بێ یا ئەدەب یا هونەر یا پیشەسازی یا کشتوکاڵ .. لەم ڕووەوە وشەی (زانیار) بۆ ناوەکەی (کۆڕ) گەلێ لەبارتر و پەسەندترە لە وشەی (زانست)

هەندێ لە تەدیبەکانی کورد (زانیار) بە (اسمی فاعل) دادەنێن. هەرچەند ناوەرم هەیە ئەم رایە لە رووی ئەوەوە هاتووە کە خاوەنەکەی تەبەرژاوەتەسەر لێکۆڵینەوەی تەواوی وشەکە و شیکردنەوەی هەموو ئەو وشانە کە لە رواڵەتدا هاوکێشی ئەمن و لە راستیدا لە یەك جیاوازن وەك لێرە بەپێشەوە باسمان لێ کرد. لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانین بڵێین کە هەر چار نەما و (زانیار)مان کرد بە (زانا – عالم). دیسانەوە لە ناوی (کۆڕی زانیاریی کورد) بەپێی رێزمانی زمانی کوردی وشەی (زانیاری) مانای (علم) و (زانین) هەر دەگەیەنێ. چونکە ئەوساکە لە ناوی کۆڕدا وشەی (زانیاری) نەك (زانیار) بەکارهاتووە و ئەم (ی)یەی کە لێرەدا لکاوە بە (زانیار)ەوە هەمان (ی)ی نیسبەتە کە دەلکێ بە (اسم فاعل) ەوە و دەیکا بە (مصدری صناعی) وەك لە عەرەبیدا دەگوترێ (العالمیة) و (الخالقیة). ئەوسا (ی)ی (اضافە) کە دەبێ هەبووبێ لە میانی دوو وشەی (زانیاری) و (کورد) دا و بەپێی رێزمانی کوردی پەڕیبێ و مابێتەوە (ی)کەی نیسبەت

دوای شیکردنەوەی (زانیار) و هاوڕێکانی و روونکردنەوەی ئەو بنچینەیەی لەسەری دامەزراون، دەردەکەوێ وشەی (دانیار) کە لە نامەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبیدا ناوی هاتووە و دەفەرموێ بۆ مانای (موضوع)ی داناوە، دەبێ ماناکەی هەڵگێڕینەوە لە (اسمی مفعول) و بیکەین بە (اسمی فاعل) و بڵێین (واضع)ە نەك (موضوع) چونکە لە وشەی (دانیار) هەر سێ پیتی (ی.ا.ر) زیادن کە ئەم سیانە وەك لە زمانەکەماندا رەچاو دەکرێ وشە دەکەن بە (فاعل) نەك (مفعول). (دانیار) کە لە (دانان)ەوە هەڵستاوە پیتی (ی)ی تێدا نییە و تا بڵێین تەنها (ار)ی پێوە لکاوە و بووە بەهاوکێشی (گوتار) و (بڕیار) و تەئویلێك لێرەدا پەیدابێ بۆ ئەوە بڵێین (اسمی مفعول)ە یا هەر نەبێ (اسمی فاعل) نییە. جا ئەگەر بمانەوێ لە وشەی (دانان) هاوکێشی (گوتار) و (بڕیار) و (زانیار) و (پرسیار) وشەیەك داتاشین، دەبێ بڵێین (دانار)، ئەگینا هەر کە گوتمان (دانیار) کارەکە لە دەست ئێمە دەترازێ و دەچێتە بەر حوکمی رێزمانی زمانەوە و دەبێتە (اسمی فاعل). لێرەدا جورئەتێکی شاگردانە و نازێکی بچووکانە هانی دام خۆ هەڵقوتێنم لە نهجتیهادی بلیمەتێکی وەك مامۆستا وەهبی.

مایەوە وشەی (کورد) کەوا لە ناوەکەی (کۆڕی زانیاری کورد)دا بەرامبەر وشەی (الکردي) دەوەستێ لە (المجمع العلمی الکردي)دا. مەبەسی ئەندامانی کۆڕ لە وشەی (کورد) و هەڵاویردنی بەسەر وشەی (کوردی)دا ئەوە بوو کە کۆڕ بۆ هەموو کوردێکە

نەك هەر كوردی زمانە. ئێمە با لێرەدا هەر لەو ڕادەی مەبەسەدا نەوەستین و لێكۆڵینەوەیەكی قووڵتر بەكاربێنین لە دوو وشەی (كورد) و (كوردی)، تا بزانین كامیان زیاتر و باشتر و ڕاستتر مانای (الكردی) ڕادەگەیەنن كەوا لە ڕستەی عەرەبیی (المجمع العلمي الكردی) دەقامرێتەوە.

لە عەرەبیدا كە دەڵێن (الكردی، العربی، التركی) ئەم (ی)ی نیسبەتە نەك تەنها بۆ زمان دەگەڕێتەوە، بەڵكو بۆ گەلەكەش. دەگوترێ (انسان كردي) هەروەك دەگوترێ (لسان كردي). ئیتر لە عەرەبیدا كە گوترا (المجمع العلمي الكردي) هەم ئەوە دەگەیەنێ كە زمانەكەی كوردییە و هەم خەڵكەكەی كە پەیوەندییان پێوەی هەیە كوردن. بەڵام لە كوردیدا كە (ی)ی نیسبەت لكا بەمانای گەل یا هۆزەوە، ئەو وشەی لەوەوە دروست دەبێ تەنها زمانی گەلەكە و هۆزەكە ڕادەگەیەنێ و بەس (ڕەوشت و داب و دەستووریشیان ڕادەگەیەنێ كە لێرەدا پەیوەندییەكی بەبابەتەوە نییە بۆیە لێی نادوێین) وە بەهیچ جۆرێك مانای (گەل، مرۆڤ) ڕاناگەیەنێ. ئیتر كە گوتت (كوردی) مەبەست هەر زمانی كوردییە، بەڵام كە ویستت مرۆڤێك بكەی بەكورد دەڵێی فلانەكەس كوردە بێ ئەوەی (ی)ی نیسبەتی پێوە بلكێنی. هەروەها كە ویستت نیسبەتی مرۆڤێك بدەی بۆ هۆزێك دەڵێی (فلان جافە) یا (بڵباسە) یا (خۆشناوە) .. تاد. ئەوەندەی من هاتبێتە پێش چاو و زەینم، لكانی (ی)ی نیسبەت بەمانای گەل و هۆزەوە ماناكە ناگێڕێتەوە بۆ مرۆڤ، مەگەر ناوەكە خۆی دوایی هاتبێ بە (ی)ی نیسبەت وەك (مهراوبطی، سمایل عوزێری، دزەیی). لەم حاڵانەدا دەگوترێ (فلانەكەس دزەییە) یا (مهراوبطییە). جا ئەگەر (گەل)یش (ی)ی نیسبەتی لە دواییەوە هەبێ دیارە بۆ تاكە مرۆڤێكیش (ی)یەكە هەر دەمێنێ. با ئەوەندەش لێرەدا بڵێم (ی)ی نیسبەت كە لكا بەمانای نیشتمان وەیا شار وەیا جێگایەكەوە، ئەوسا مرۆڤی ئەو نیشتمان یا ئەو شارە یا ئەو جێگایە دەگەیەنێ. كە گوتت (كوردستانی) یا (هەولێری) یا (ناسیابی) مەبەستت خەڵكی كوردستان و هەولێر و ناسیابە.

كەواتە (كۆڕی زانیاری كوردی) لە باری كوردایەتییەوە هەر زمانی كوردی بۆ كۆڕەكە دەستەبەر دەكا، بۆیە دەلوێ لە ژاپۆن وەیا بەرازیل وەیا جاوەش كۆڕ هەبێ بەناوی (كۆڕی زانیاری كوردی)یەوە و مانا و مەبەستەكە ئەوەبێ كۆڕەكە خەریكی زمانی كوردییە و بەس. ئیتر لە تەك ئەودا كۆڕ هەبێ بەناوی (كۆڕی زانیاری عەرەبی) یا (توركی) یا هەر زمانێكی دیكەوە. ئەم وردبوونەوەیە بۆمان دەردەخا (كۆڕی زانیاری

کوردی) هەم ناتەواوە لە رووی مەعناوە کە بیوەستێنێ بەرامبەر بەرستەی (المجمع العلمي الكردي)، وە هەم لە پەیوەندی بەکوردەوە کەم دەکاتەوە تا رادەی نەهێشتن. بەپێی رێزمانی زمانەکەمان چارمان ناچارە دەبێ بڵێین (کۆڕی زانیاری کورد)، ئەگینا کەلەبەرێکی زل دەکەوێتە مانا و مەبەستی ناوەکە.

خوێنەری بەرێز!

ئەوەی لەو نووسینەمدا خستمە پێش چاوت، بەپێی تێگەیشتنی خۆم هەمووم لە رێزمانی زمانی کوردییەوە دەرهێناوە، نەک لە گیرفانم. جا کە شتێکت لێرەدا خوێندەوە و لەگەڵ بیروباوەڕی تۆ رێک نەکەوت، گورج بڕیاری لەناوبردنی مەدە و لێی هەڵمەقرچێنە، هەلێکی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی بدەیێ و بەچاوێکی وردی رەخنەکارانە و دڵسۆزییەوە سەیری بکە و، ئەگەر لە هەندێ شوێنی نووسینەکەمدا ناتاشکراییت هەست پێ کرد مەودای ئەوەم بدە لە دەرفەتێکی ئایندەدا بەپێی پێویستی باسەکە و دەسەڵاتی خۆم مانا و مەبەسەکەت بۆ روون کەمەوە. ئیتر ئەوسا چی مەراست و بەرژەوەند دەزانی ئەوە دەیبرە بۆ خزمەتی زمانەکە و ئەدەبیاتی. ئێوە و منیش لەگەڵ ئێوە، هەموو دەزانین تا چ رادەیەک باسی فیلۆلۆجی لە کوردیدا تازە و سادە و ساقیلکەیە. هەڵبەت بەوپێیە نووسەر تووشی قوزت و هەڵە دێ. جا ئەگەر هەڵە لە نووسینی یەکێکمان نەدیترا، دەبێ ئەم بێ هەڵەییە کاری (معجزه) و (سحر) بێ! بۆیە تۆ و من و هەموومان لە کاتی رەخنەگرتندا دەبێ لە گۆشەیەکی دڵمانەوە تارماییەکی بەهێتە خۆشەکەی (نالی)مان بەبیر بێتەوە کەوا هەر وشەیەکی وەک دڵۆپێکی ئاوی کەوسەر دەتکێتە ناو دڵی مرۆڤی هەستیار و بەسۆز:

لە جگەر گۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراب
کەس نییە رازی بێ خەتا کە لە ئەولادی درێ.

گۆواری زانیاری، ژمارە ٤، ساڵی ١٩٧٦

# گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی

بەر لە هەمو شتێك دەبێ بڵێم پێویست نابینم وشەی (گیروگرفت) کەوا لەبەر گوێ و زمان، دەنگ و تامی ناسازە، دڵشکستمان بکا و زیاد لە مافی خۆی نرخی بێ سەغڵەتبوونمان لێ وەرگرێ، چونکە گیروگرفت بەشێکی پێکهێنەری هەمو کارێکی ئەم جیهانەیە کە بزووتنەوە و پێشکەوتن و گۆڕانی تێدایێ: با بڵێم ژیان بەتێکرایی و ژیانی ئادەمیزاد بە تایبەتی زنجیرەیێکی بێ پچڕانەوەی گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەیە و مرۆڤ لە سەرەتای مێژوی مرۆڤایەتییەوە هەر خەریکە گرێ و ئاڵقەکانیان بکاتەوە و زۆر جارانیش بۆی ناکرێتەوە بە نیسبەت گەلی کوردیشەوە ڕەنگە تەگەرەکانی ڕێنووس لە چاو تەگەرەی مەیدانەکانی تری ژیانی کوردەواری، لە هەردوو لانی ماف و ئەرکەوە، لە جۆری تەگەرە خۆشکەڵە ڕوح سووکە ژیکەڵەکانی بێ، نەك جۆرێکی تر، لەو ڕووەوە کە هیچ میللەتێك نییە خاوەن نووسین بێ و تەگەرەی ڕێنووسی نەبێ. کەواتە لە نێوان چفزی ئەم موشکیلەیەدا، ئێمەی کورد، دەتوانین خۆمان بە خزم و هاوڕێی میللەتانی تر حیساب بکەین و بێ پەروا بچینە ڕیزیانەوە

شاعیری خۆمان، تاهیر بەگ، پێشبەینییەکی باشی بۆ کردووین لە دۆزینەوەی مەیدانی خۆ بەخزم زانین لەگەڵ جیهاندا بەم بەیتە ژیر و ناسکەی کە دەڵێ:

صەد شوکری خودا مەرکەزی صەد میحنەت و دەردەم

واتێ مەگە لەم دائیرەیی چەرخە بەدەروونم

بەڕاست ئەگەر لە ڕێی تەنگ و چەڵەمەوە ئەچینە ناو کۆڕی میللەتان کە تێدا حازربوونی بێتاقە و بانگهێشتنی ناوێ، لە چ مەیدانێکی تردا دەمانتوانی بێ ترس و شەرم و بێتاقە و بانگهێشتن خۆیان تێ هەڵقوتێنین و داوای خزمایەتییان لەگەڵدا بکەین؟

سەرەڕای ئەم دەسکەوتە زلەی هاودەردیمان لەگەڵ میللەتان. لایەنێکی تری زۆر خۆش و دڵدەرەوە لە گیروگرفتی ڕێنووسمان ئەوەیە کە فەرمانی ڕەواندنەوە و چارەسارکردنی، زیاتر لە گرفتەکانی تری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری ڕۆشنبیری، لە بەردەست و خواهشتی کوردایە و کەمتر غەیری کورد تێیدا خاوەن پشکە.

ڕێم هەیە بڵێم ئیشکالی ڕێنووس ئەوەندە ملکەچە بۆمان دەتوانین تۆڵەی ئەو ئیشکالانەی دەستیشمان ناگاتە ڕەواندنەوەیان لەوی بسێنینەوە. وەك کابرای نان و ماستی لە ماڵی خۆیدا شك دەبرد، هەر جارە لە دەرەوە خواردنێکی خۆشی دەدیت و دەستی نەیدەگەیشتێ، ڕای دەکردەوە بۆ ماڵێ و بەردەبووە نان و ماست خواردن.

هەر ئەو هۆماڵەتییەی ڕێنووسەکەمانە هۆی زۆربوونی چارەسەرکردن و پێشنیاری هەمە چەشنەی نووسەران و زمانەوانانی کورد تاکو حاڵ گەیشتووەتە ئەو ڕادەیە کە پێشنیارەکان بۆ خۆیان بوونەتە ئیشکالێکی نوێ و سەختتر لە گرفتی ڕێنووسەکە خۆی. هەرپێشنیارێکی کە تا ئێستا پەیدابووە و لە دوا ڕۆژدا پەیدادەبێ لەگەڵ چەندین پێشنیاری حارز بەدەستدا پێك دەکەوێتەوە کە هیچ کامێکیان خۆ بە کەمتر ناگرێ لەدراوسێکەی و بایی تۆسقاڵێك ئامادە نییە بەخۆشی هودنەی لەگەڵدا بکا

بە نموونەی سووربوونمان لەسەر بیروباوەڕی تایبەتیمان حیکایەتێکی کورتیلەی تەجرەبەی خۆم دەگێرمەوە لەم مەیدانەی ڕێنووسەدا:

لە هەڵکەوتێکی وتوویژ لەسەر دەنگەکانی زمانی کوردی هەندێك لەو بەشدارانەی وتوویژەکە ئەو ڕایەیان هێنایە پێش کە ئەو دەنگەی لەناو وشەکانی وەك (نوێژ، شوێن، دوێنی)دا هەیە و لە سلێمانی و هەندێ ناوچەی تری کوردستاندا بە دەنگی (ئەواو ئەبێ) دەبیدرکێنن ئەمە دەنگێکی ڕەسەنە و دەبێ پیتی سەربەخۆی بۆ دانرێ لە نووسیندا. من یەکێك بوم لەوانەی دژی ئەم ڕایەبوون و ئێستاش بۆ خۆم وا تێ دەگەم ڕاستییەکەی ئەمەیە کە دوو دەنگی بێگومانی (واو و یێ) لەو وشانەدا هەیە و ج فەرقێك نییە لە ڕووی (چەند و چۆن)ەوە لە میانی (سرێژ و نوێژ)دا. هێندە هەیە خەڵقی ناوچەیێکی کوردستان بە جۆرێك کە زمانیان پێ ڕاهاتووە دوو دەنگی (واو و یێ)یەکە تێکەڵ دەکەن و دەیکەن بە دەنگێکی تایبەتی ناوچەیی نەك دەنگێکی ڕەسەن. بەرێیە، بەلای قەناعەتی منەوە، دەبێ لە نووسیندا وشەکانی (نوێژ، نوێ، نوێ، نوێن... هیی تر) بە دوو پیتی (واو و یێ) بنووسرێن. لەوە بەولاوە هەرکەس ئازاد بێ لە چۆنەتیی خوێندنەوەیان. بۆ سەلماندنی ڕایەکەی خۆم و هاوباوەڕانم چەند بەڵگەیێکم هێنایەوە وەك:

یەکەم. بەشی زۆری کورد وشەکان بە دو پیتی (واو و یێ) دەخوێننەوە. لەمەڕا دیارە

دەبێ ڕاستیی وشەکانیش هەر وابێ، دەنا چۆن زۆرینەی کورد بەو هەڵەیەدا دەڕوا و بێ لزووم پیتێك بە زیادەوە دێنێتە ناو وشەوە؟

ئەم بەڵگەیە ڕەد کراپەوە بە وەرامێك لەو بابەتانەی کە خۆیان لە خۆیاندا بەڵگەنین بەڵام لەبەر نەبوونی چ مانەعێك لە گوتنەوەیان دەگوترێنەوە و دەوامیشیان لەسەر دەکرێ.

دووەم. ئەگەر ئەم دەنگە (واو و یێی تێکەڵ) لە لەهجەی سلێمانیدا ڕەسەن با بۆ دەبێ هەر لەو وشانەدا بەدی بکرێ کە لە لە هجەکانی تردا دەبێنەوە (واو و یێ)؟ دەزانین لە لەهجەی بادینی و زمانی فرمنسیدا ئەم دەنگە ڕەسەنە، بەوەدا لەوشەی بێ گومان و بێ تەئویل خۆ بەدەر دەخا وەك ئەوەی کە وشەی (دور، بەعید)ی سۆرانی لە بادینیدا بە دەنگی (واو و یێی) تێکەڵ تەلەفوز دەکرێ.

لە بیرم نەماوە وەرامی ئەم بەڵگەیە چی بوو.

سێیەم: لە نووسینەدا ئێستاش و لەمەوپێشیش خەڵقی سلێمانی ئەم و شانەیان بە دوو پیت دەنووسی وەك خەڵقی ئەو جێگایانەی بە دوو دەنگ دەیخوێننەوە، دەوجا ئەگەر خەلقەکە بە دوو دەنگیان دانەنابا بۆ بە دوو پیتیان دەنووسی؟

لە وەرامدا گوترا نووسین نابێتە بەڵگە چونکە لەسەر دەستوور و زانستی فۆنێتیك نەهاتووە.

چوارەم. شاعیرە زلەکانی سەدەی نۆزدەمی بابان ئەم وشانەیان بە هەر دوو دەنگەوە لەکارهێناوە و نەیانکردووە بە (دیفتۆنگ) خۆ ئەگەر وایان کردبا شیعرەکانیان لەنگ دەبوو. نالی دەڵێ:

هەر جۆگەو و جێگایە کەوا سوور و سوێر بێ
جێی جۆششی گریانی منە خوێنە ڕژاوە

وشەی (سوێر) بکەی بەو وشەیە کە (واو و یێی) تێدا تێکەڵ دەبێ وەزنی شیعرەکە تێك دەچێ. هەروەها نالی دەڵێ:

بولبول کە گەرمی نەغمەیە ئاور دەکاتەوە
غونچە حەزینە جەرگ و دڵی بۆ دەکا توێ

لێرەشدا وشەی توێ قافیەی وشەکانی (هەوردوێ و نادوێ و ناڕوێ)یە دەبێ

هەردوو دەنگی تێدا بخوێنرێتەوە دەنا نابێ بەقافیەیان و کێشی شیعرەکەش تێك دەچێ. وەك ئەمانەش شیعری تر زۆرن لە شیعری بوێژەکانی سلێمانی کە ئەمە بەڵگەی قەتعییە بۆ سەپاندنی رایەکەی من و هاوبیرەکانم.

لە وەرامدا گوترا، وا دەزانم وەرامەکەش زادەی ئەو لە حزەیە بوو پێشتر فکری لێ نەکرابۆوە، چونکە ئەم دەنگەی (واو و یێی تێکەڵ) لە بنەڕەتدا لە دوو دەنگ پێك هاتووە شاعیر رێی داوە بە خۆی بۆ زەروورەتی شیعر هەڵیان وەشێنێ و دەنگەکان بە پێی داخوازی قافیە بکاتەوە بە دوو دەنگ.

گوتم کە ئەمە وابێ ئەدی بۆ دەبێ جارێك لە جاران هیچ شاعیرێك لەو هەڵوەشاندنەیەدا ئەمەات دەنگی (بێ) پێش خات و بڵێ (خێون، تیو، سیوێر، نیوۆژ)؟ کە ئەسڵی وشەکان (خوێن و سوێر و نوێژ) ئەبێ دەبوا هەر دوو رێگە لە پێش زمانی شاعیر بکرێنەوە و بە شیعر بگوترێنەوە.

لێرەدا چ وەرام پەیدا نەبوو لەوە زیاتر کە بێ وەرامیی خاوەن رایەکانی سوورتر کرد لەسەر هەڵوەستی خۆیان.

ئەمە نموونەیێکی بێ داگرتنمانە لەسەر بیروباوەڕ. لە فەرزی ئەگەر خاوەنەکانی ئەو رایە نیشانیان بێکابێ و من و هاوباوەڕەکانم بە هەڵەدا چووبین ئەوا بێ داگرتنەکە هەر هەیە و چ فەرقێك نییە لەوەدا من لەسەر غەڵەتی خۆم سوور بم یا ئەوان. بێگومان لە دڵی خۆیدا ئەوانیش دەڵێن سەیری فلانەکەس چەند ئەسەلمێنە، هەرچی بەڵگەیێکی بۆ رەد کرایەوە کەچی هەر پێی چەقاند لەسەر چەقی هەڵە.

بەسەدا دەسەوێ بڵێم تەگەرەیێکی سەرەتایی و گرنگ لە رێنووسی کوردیدا خۆمانین، واتە زەحمەتی رێککەوتنمان لەسەرێك باوەڕ و تەعەسوبی هەریەکەمان بۆ بیرورای خۆی رێمان پێ دەگرێ و لێمان دەبێتە لەمپەر بەر لەوە هەنگاومان هەڵێنابێ بۆ نەهێشتنی کێشەکە خۆی. ئەوەی راستی بێ نەك هەر لە بارەی رێنووسەوە بەڵکو لە بارەی هەمو کارێکەوە پێویستی هەیێ بە هاریکاری و یارمەتیدانی یەکتری ئیمەی کورد گیانی لاساریمان، یاخود با بڵێم مەیلی تاك رەفتاریمان رێی هەموو هاریکارییێکمان لێ دەبەستێتەوە، ئەمەش ئەنجامێکی عادەتی و چاوەڕوانکراوە لە میللەتێکی وەك کورد کەوا لەبەر نەبوونی کیان و حکومەتی خۆی لە مێژوویێکی کۆنەوە، رانەهاتووە بەکاری گەلەکۆیی، هەزاران ساڵە ئەم میللەتە هێزێکی ناوەندی و دەسەڵاتێکی رێکخەری لە ناو

خۆیدا نەبووە تاکەکانی باوێتە سەر ڕێبازی کاری تێکڕایی و فێری یارمەتیدانی یەکتریان بکا.

هەموومان لە کۆنێکی کۆنەوە فرچکمان گرتوە بە شێوازی (کردەوەی تاکەکەس)و ڕا نەهاتووین لەگەڵ یەکدیدا هاوبەشی کردەوەیەك بین.

لەگەڵ ئەمەشدا، بەرە و تاقمی خوێندەوار دەبێ بەخۆی بوێرێ و مل بنێتە کاری کۆمەکۆیی، کە بەرژەوەندی گشتی لێی داواکرد ولێ لەو مەیلە میراتییەی (تەنهاکاری) بێنێ، کە ئەمە نەکەین هیچ کۆبوونەوەیێکمان سوودی نابێ ئەو سوودە نەبێ بەگژیەکدیماندا بێنێ. هەر یەکێ بیەوێ لە کاری کۆمەڵدا بەشدار بێ دەبێ خۆ لە بیربکا و سوودی گەل لەو کارەدا بکا بە تاکە ئامانج، کە ئەمە نەکا و بیەوێ خەریکی نمایشاتی خۆی بێ تۆیاڵی میللەتەکەی دەکەوێتە ئەستۆی. هەزار بەڵگان بێنێتەوە بۆ سۆز و بەرۆش و چاکەخوازیی خۆی یەکێکی ڕاستی تێدا نییە و هەمووی چەشمبەندییە و پەردەی عەیب پۆشییە.

قسەکانم خۆی دەگرێتەوە بەر لە هەمووکەس: بابیی ئەوەی کە گیانی کۆمەڵدۆستی بمبزوێنێ کەڵکی کاری کۆمەکۆییم پێوە دەبێ، کە ئەو گیانەم نەبێ بە تەنها کاربکەم، نەك هەر باشترە، بەڵکو تاکە ڕێگەیێکی پەسندە بۆ من لە کارکردندا، خۆ هەر نەبێ نیش لە حەلق تێك نادەم.

لەبەرتیشکی ئەم ڕاستییەی خۆ لەبیرکردنەوە و لکان بە مەوزووعەوە، هێندەی کە من تێی بگەم، گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی چەند جۆرێکن.

یەکەمیان ئەو ئیشکالانەی کە لە خودی ئەو ئەلفبێیانەدا هەیە کوردییان پێ دەنووسرێ:

ئەلفبێی عەرەبی دوو ئەرکی زۆر گەورە داوێتە سەر ئەستۆی کەسانێك لە نووسیندا بەکاری دێنن،

ئەرکی یەکەم لەوە وە دێ پیتەکانی (ا، د، ذ، ر، ز، و)بە پیتی دواخۆیانەوە نالکێن و نووسەر ناچار دەبێ چەندین جار لە نووسینی یەك وشەدا دەست هەڵگرێ و خامە هەڵەنگێوێ. بەراستی نووسەر بەئەلفبێی عەرەبی هێندە قەڵەمەکەی هەڵدەگرێ و بۆ پێشەوە و سەرەوە و ژێرەوە و دواوەی دێنێ و دەبا هەر دەڵێی ڕەسامە و فرچەکاری دەکا لە تابلوی ڕەسم. ئەم کەرتکردنەی وشە کە بۆ خۆی لە ئەسڵدا یەك پارچەی سەرانسەرە

کارێکە دژی داخوازی (سروشت) و خۆ ڕاهێنانە بە پیشەیێکی درۆزن. لەوەش زیاتر، ئەو هەموو دەست هەڵگرتنە و خامە هەڵمنگاوتنە یەکجار یەکی نووسەر دەخەن لە خێراکردن و ڕەوانی لە نووسیندا و نرخێکی گەورەش لە فکر و زیهنی وەردەگرن بەوەدا کە هەموو دەم، وەك سواری وڵاغ، دەبێ لە جڵەوی خامەکەی بداتەوە و لە ساتمەی بگێڕێتەوە.

لە کوردیدا هەرچەند پیتی (ذ) نییە ئەگەر لەهجەی هەورامانی لێ دەرکەین بەڵام چەندین فەلاکەت هەیە دە جاران زیاتر تۆڵەی نەبوونی (ذ) دەکەنەوە.

جارێ لە جیاتی (ذ) پیتی (ژ) هەیە بەخۆی و سێ نوقتەوە لە جیاتی نوقتەیێکی (ذ).

ئینجا دو جۆرە (ر) هەیە قەڵەو و لاواز.

ئینجا سێ جۆرە (و) هەیە واوی لە جێگەی (ضمة) و واوی قوچاوی (موو) و واوی کرایەوەی (بۆر).

دوای ئەمانە ئەو پیتە مەلعوونەی (ە) کە لە جێگەی (فتحة) بەکاردێ و وەك موی لووت وایە لەویش زیاتر و ناقۆڵاترە. ئەمانەمان با لەبیر بێ تا باسی ئیشکالی دووەم دەکەین لە ئەلفبێی عەرەبیدا.

ئیشکالی دووەم پیتی نوقتەدارە. لە عەرەبیدا ١٥ پیت لە ٢٨ پیتان نوقتەیان هەیە.. دەك ماڵت شێوێ دانەری ئەلفی بۆ ئەو هەموو حەزکردنەت لە گرێ و گاڵ.

چ موبالەغە نییە لەوەدا کە بڵێم نوسەری عەرەبی چەند خەریك دەبێ لە باری دەستووری (قواعد)ی زمان هەڵە نەکا هێندەش لەباری ڕێنووسەوە خۆ بە دانانی نوقتانەوە دێنێ و دەبا. لە ڕێنووسی عەرەبیدا جارێکی دیکەش بوون و نەبوونی نوقتە خۆ دەکاتە ئیشکال کە زۆرینەی پیتەکانی شکڵیان بەیەکدی دەچێ بە نوقتە و بێ نوقتە: ف ق– ر ز– س ش– ص ض– ط ظ– ع غ– ب ت ث– ج ح– د ذ– ئیتر وا دەبێ هەڵەکردن لە دانان و دانەنانی نوقتە وەیا زیاد و کەم کردنی یەکجاری واتا و مەبەس دەگۆڕێ یا تێکی دەدا یا نایهێڵێ.

ئەم ئیشکالە لە کوردیدا هێندی عەرەبی بەملەوەیە:

پیتی نوقتەداری کوردی بەقەدەر هی عەرەبی دەبێ پ، ژ، چ، ڤ. دەچنە بەرابەر ث، ذ، ظ، ض و کەلێنیان پڕ دەکەنەوە خۆ ئەگەر (ذ) لەهجەی هەورەمان بێنینەوە ڕیزی پیتەکانی کوردی ئەوا ژماری پیتی نوقتەدار لە کوردیدا پتر دەبێ لە هی عەرەبی. بەڵام

## نیشکاڵەکە بەوەندە کۆتایی نایێ

نیشکالی دانانی نیشانە لەسەر پیتان لە کوردیدا دوو جاران لەهی عەرەبی زیاترە، لە عەرەبیدا ۳ نیشانە هەیە (ضمه، فتحه، کسره)، لە کوردیدا (ێ، ێ، ۆ، ۆ، ڕ، ڵ) نیشانەدارن.

تۆ سەیرکە ئەو چوکڵەی پیتی (ت)ی ناو وشەیێکی وەک (دیتن) بۆ ٦ ئیحتمال دەست دەدا (ب، پ، ێ، ی، ت، ن) لەوانەیە هەڵە لە نوقتەکان یا نیشانەکاندا بێتە هۆی گۆڕینی واتا یا نەهێڵانی واتا هەر بەجاری.

وشەی (تەلەفۆن) کە خۆی سێ بڕگەیە ۸ جاران خامەی تێدا هەڵدەنگێوی.

وشەی (وەرە) کە تاکە وشەیێک و دوو بڕگەیە چوار جاران دەستی تێدا هەڵدەگری، خۆ ئەگەر نوقتە و نیشانە هەبێ لەسەر پیتەکانی وەک وشەی (زەرە) دەبێ شەش جاران دەست هەڵگری.. وشەی (زۆر) خۆی بڕگەیێک و سێ پیتە بەڵام ٥ جاران خامەی تێدا هەڵدەقورێتەوە. ئەم وشەی (دەقوڕێتەوە) ۱۲ جاران خامە تێیدا جێگۆڕکێ دەکا (د، ە، قو، ڕ، یتە و، ە، دوو خاڵی قافەکە، نیشانەی سەر واوەکە، خاڵی ڕێیەکە، دو خاڵی بێیەکە، نیشانەی سەر بێیەکە، دووخاڵی تێیەکە).

وەک گوتم دانانی نیشانەیێکی نەلکاو بە دوا خۆیدا لەجیگەی (فتحه) ئەم ئیشکالەی دەست هەڵگرتن و قەڵەم بڵندکردنەوەی بە جاریێ بێ سنوور کردوە لە کوردیدا. دەتوانی ڕستەی وەها پەیدا کەیت نیوەی پیتەکانی ئەم (ە)یە بێ وەک (وەرە دەرەوە) یاخود (زەرەرەکە کەمە) یاخود (گەمە مەکە – کەوەکە بەڵەکە – ڕەشە لە دەرەوەیە..) دەوجا تا بکەوێتە میانی پیتانەوە لەپاڵ یەکیان هەڵدەوەشێنێ و نووسین پچڕ پچڕ دەکا.

ئەم هەموو پیتی نەلکاو و خاڵ و نیشانەیە نووسین و خوێندنەوەی شێواندوە و ڕێگەی داوە بەهەڵەکردن تێیاندا، شتێکی خراپتریشی کردووە بەوەدا کە هەڵوەشاندن و کەرتکردنی تاکە وشە، نووسەر ناچار دەکا بۆ ئاگادارێونی هەمیشەیی لە جیاکردنەوەی مەودای بەینی کەرتەکانی یەک وشە لە مەودای بەینی دوو وشەی سەربەخۆ. تۆ کە دەنووسیت (وەرە لام) ئەگەر ئاگاداری خۆت نەبیت مەودای میانی چوار کەرتی وشەی (وەرە) لەگەڵ مەودای میانی وشەی (وەرە)و وشەی (لام) لەیەکتر جیا ناکرێتەوە و تێکڕای ڕستەکە وەک یەک وشە خۆ دەنوێنێ لەوانەیشە هەندێکی وشەی یەکەم لە نوسیندا خۆ نزیک کاتەوە لە وشەی دووەم و بنووسیت (وە ڕەلام)

یاخود (وەر- ەلام) یاخود (و ەرەلام- و ەر ەلام . هتاد) خولاسە ئیحتمالی هەڵە لە نووسینی کەرتەکانی وشە سەروبنی نییە تا بڵێی فراوانە.

نووسینی کوردی بە رێنووسی لاتینی بابیی ئەوە کە هەموو پیتەکانی دەلکێن بەدوا خۆیانەوە و تێکڕایان خاڵ و نیشانیان لە رێنووسی عەرەبی کەمترە، بێ گرفتترە، کە دەکا فەرقێکی تا بڵێی زۆر، هەم لە رووی ئەوەوە کە هەڵە تێداکردنی کەمتر دەبێ و هەم لە رووی ئەوەوە زیهن هێندە هەریك نابێ بە نەقش و نیگاری خاڵ و نیشانەکان و جیاکردنەوەی مەودای میانی کەرت و برگەکانەوە سەرەرای ئەمانەش، کە دەست هەڵگرتن لە نووسینی رستە کەم بۆوە مێشکیش کەمتر رچەی فکرەکانی لەیەکدی دەپچرێنەوە.

لەو پیتانەی لاتینی کە ئێمە شارەزایان هەین دو پیتی (I-İ) خاڵداران و پیتی (Â)ش هێتەکەی سەرەوەی قەڵەم بەرز دەکاتەوە. بەلای منەوە پیتی (X) وەك (لا)ی عەرەبی وایە، بریتییە لە دوو پیتی سەربەخۆ نابێ بخرێتە ئەلفباوە.

بەراخەوە خاوەنەکانی ئەم ئەلفبایە، کە ئەورووپایین، تا بڵێی غەدریان لێ کردووە چونکە لە نووسیندا وای بەکاردێنن هەندێ جار هەر دەڵێی نوسینی هیرۆگلیفییە. پیتەکان دەنگی خۆیان نادەنەوە لە وشەدا بەڵکو وێنەیێکی سەرلەبەر دەبێتە نیشانە بۆ وشەیێکی سەرلەبەر، یار رستەیێك. لە وشەی Leigh Thigh, maugham و گەلێکی تری وەك ئەمانە پیتەکان کەمێك نەبێ ئەو فەرمانە نابینن کە لە بنەرەتدا بۆیان دانراوە. فرەنسیش وەك ئینگلیزی ئەم بێ ئینسافییەی کردووە لەگەڵ پیتەکان و ناغڵەب وا نەبێ بەپێی جێگە دەنگیان دەگۆڕێ.

وەنییە ئەم کارەی ئینگلیز و فرنسە لەگەڵ پیتی لاتینیدا نرخی رێنووسەکە کەم کاتەوە بەلام بەهۆی ئەوەوە نووسەرانی کورد چاویان راهاتووە لەو نووسینانە، ئەوانیش لە هەندێ جێگە و هەڵوەستدا شوێنیان گرتوون و هەڵەی وان دووبارە دەکەنەوە وا بووە لەگەڵ خاوەن شعەدەی بەرز لە زماندا دووچاری موناقەشەی ئەو بەدیهییە بووم ئاخۆ (ئۆ، ئا، ئێ)کە لە لاتینیدا هەریەکەیان بەپیتێك دەنووسرێن لە حەقیقەتدا یەك دەنگیان هەیە یا زیاتر؟ هەڵبەت (ئا- هەمزە و ئەلفە، ئۆ- هەمزە و واوە)، (ئێ- هەمزە و یێیە) کەچی خاوەن شعەدەکە سوور بووە لەسەر هەندێ کە ئەمانە یەك پیتن و یەك دەنگیش: بێ گومان سەهووەکەی لەوەوە هاتووە کە چاو و

مینتکی راهاتووه بە جۆری لەکارهێنانیان لە زمانەکانی ئەورووپادا.

ئەم هەمزەی سەرەتای وشەکان کە لە نووسینی ئێستاکەی لاتینیدا تێ دەچێ و لەگەڵ بزوێنی دواخۆیدا دەکرێ بەیەك پیت پەکێکە لە گیروگرفتی ئیملای کوردی بەلاتینی، لەوەشدا سووچی پیتەکان نییە ئێمە خۆمان رەفتارمان نادروستە لەگەڵیاندا. تۆ کە بڵێی (ئا) و لە لاتینیدا بە یەك پیتی Aوە یا شکڵێکی تر بینووسی ئەوسا مەنتیق لێت داوا دەکا وشەی (یا)ش بە یەك پیت بنووسی هەروەهاش.. دا، را، تا، پا، ها... هتد چونکە هەموویان وەك (ئا) دوو دەنگن ئیتر کە (ئا) بەیەك پیت بنووسرێ ئەوان تاوانیان چییە بکرێن بە دوو پیت یاخود ئەگەر ئەوان بە دوو پیت نووسران (ئا)ی بەستەزمان بۆ کورت بکرێتەوە.

ئەگەر یەکێك بڵێ تازە ئەم نووسینەی هەمزە و بزوێن بە یەك پیت بۆتە دەستوور لە رێنووسی لاتینیدا و پێی تاوێ ئیشکالێکی نوێ دروست بکەین بە تێکدانی دەستوورەکە من لەلای خۆمەوە بە تەنها نایەمە بەرهەڵست کە بڕیاری گشتی یا زۆرینەی نووسەران و خاوەن رایان دەستوورەکەی پەسند کرد، هێندە هەیە وەك بەدیهییە ئاشکرایە بە یەك پتیش بنووسرێ لە حەقیقەتدا دوو دەنگی سەربەخۆی بێ فێڵی تێدایە وەك (لا)ی عەرەبی کە بریتییە لە (لام و ئەلف) یا لە ئەلفبێی کۆنی عەرەبیشدا بە یەك پیت حیساب کرابێ. ئێمە راستییەکە دەبێ بزانین بە دوا زانینی راستیدا چی دەیکەین. ئەگەر غەڵەتیش بێ، بە چاوی کراوەوە دەیکەین و دەڵێین بەرژەوەند وای داواکرد.

وەك مەسەلەی ئەم (هەمزە و بزوێن)ە مەسەلەیێکی تریش هەیە دەبێ مرۆڤی شارەزای رێنووس لێی بە سەهوو نەچێ. ئەو سێ بزوێنی (سەر و بەر و ژێر) کە لە لاتینیدا بە پیتی سەربەخۆ دەنووسرێن لە حەقیقەتدا ئەمانە پیتی سەربەخۆ نین.. بەڵێ مەعلوومە دەنگن و دەنگی کورتیش بەلام وەك پیتەکانی رەسەن ئێمکان نییە بە تەنها تەلەفوزیان پێ کرێ، تا بەدوا پیتی تردا نەیێن دەربڕینیان مومکین نییە. تۆ دەتوانی هەمو پیتەکانی هیجا (غەیری بزوێنی ئەلف کە هێکایەتێکی فۆنۆتێکی درێژی بەدوادا دێ) بەتەنها بڵێیتەوە و دەنگەکانیان لە مەخرەجی خۆیان بهێنیتە دەرەوە بەلام بزوێنە کورتەکان (سەر و بەر و ژێر) وجوودی سەربەخۆیان نییە و بە تەنها ناگوترێن واتە خزمەتکاری پیتە رەسەنەکانن. لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێم پیتی (ی، و) هەرچەند دەبن بە بزوێنی درێژ (وو، ۆ-ێ، یی) بەلام بە ئەسڵ هەریەکە یان بە هەموو

جۆرەکانیەوە چ بزوێن چ دەنگدار هەر یەک پیتن. وای وەستاو (ساکن) و پیی وەستاو کە درێژت کردەوە دەبێتە واو و پیی بزوێن. واوی وشەی (راو) و پیی وشەی (دایک) درێژ کەوە دەبنە واو و پیی بزوێنی قوچاو. ئەم درێژکردنەوەیە نەک هەر بۆ واو و پیّ دەبێ بەڵکو پیتی تریش هەن وەک (س، ز، ر، ل، م، ن..) ئیمکانی درێژکردنەوەیان هەیە.. ئەمە بۆیە دەڵێم تا سەیرت بەو قسەیەم نەیێ کە گوتم واو و پیّ درێژکەوە. بۆیەشمە کە مەعلووم بکرێ هەروەک درێژکردنەوەی س، ز، ر، ل ناپانکا بە پیتێکی تر هەروەهاش درێژکردنەوەی و، ی کە دەپانکا بە بزوێن نەیگۆڕیون بەوەشدا مەعلووم دەکرێ واو و پیی بزوێن و دەنگدار یەک شتن.

قسەکردن لەبارەی ئیشکالات و چاکە و خراپەی پیتی عەرەبی و لاتینی کە کوردیەیان پیّ بنووسرێ گەلێک لەمە زیاتری بە بەرەوەیە بەلام لزووم نابینم لە باسێکی وا کورتدا رووپێویکی پانی پێ بگرمەوە ئیمە کە هەموو چاکە و خراپەکانمان زانی و هەموو راستییەکمان ئاشکرا کرد ئایا ریمان هەیە بەپێی سوودی زمانی کوردی چیی چاکە ئەوە هەڵبژێرین؟ تۆ بڵێی ئیمکان هەبێ پیتی لاتینی بێنینە کایەوە و واز لە پیتی عەرەبی بێنین لە وەزعی ئێستاکەماندا؟ لە فەرزی بۆشمان بلوێ وا بکەین ئایا ئەمە کارێکی پەسندە لە حالێکدا هەموو کوردێکی عێراق بەپێی داخوازی بەرژەوەندی بە یەکەوە ژیان لەگەڵ عەرەبدا ناچارە دەبێ ئیملای عەرەبی فێربێ ئەوساش ئەرکەکەی لیّ دەبێتە دوو ئەرک؟

وا بزانم قسەکردن لە بەکارهێنانی ئیملای لاتینی لە زەرفی ئێستاکەماندا زەحمەتی بێهودەی پیّ دەڵێن. ئەوەندەی کە لەسەر مەوزووعیشم ئەروسی لەوەوە هات کە نووسینی کوردی بە رێنووسی لاتینی کارێکە لەبەرچاوان و لە ناو دلان، زۆریش نووسینی کوردی هەیە بە پیتی لاتینی، هەڵبەت پێمەنگبوون لە روالەتێکی فراوانی ئیملای کوردی کاری کردن نییە.

تو بڵێی دوای زانینی عەیب و عاری ئیملای عەرەبی، بە تایبەتی دوای ئەوە کە لە چەرخ بدرێ بۆ نووسینی کوردی، هیچ رێگە و توانا و ئیمکانێک هەیە بۆ لێهەوتار بوونی؟ کەس دەتوانێ یا دەوێرێ پیتی ئەلکاو لەناو ببا یاخود پیتی هاڵدار بگۆڕێ بە پیتی بێ هاڵ یاخود نیشانان نەهێڵێ؟ کەس حەدی ئەوەی هەیە پێشنیار بکا بۆ گۆڕینی پیتە بزوێنی (سەر) بە شکلێکی ئەوتۆ بلکێ بە پیتی دوا خۆیدا؟

تا ئێستا، بەقەدەر ئەوەی من بزانم و ئاگاداربم، تاکە یەک ئیشك لە چ لایێکەوە دیارنییە ڕێبازی چارەسەرکردنی ئەو تەگەرە زلانەمان بۆ روون کاتەوە. هەروەك ئاگری نوێژی عەسر بیێتە سێ ڕکعەت هەروەهاش ئاگری خاڵەکانی (ت، ن، ژ، چ) بفۆتێن یان بگۆڕێن، بە کەسیش ئاگری پێتە بزوێنی سەر (ـە) دەست لێ بدا و (حجر الاسود)ی ئیملای کوردی بلەرزێنێ.. کەواتە ئێمە کە بمانەوی چارەسەری گیروگرفتەکانی ڕێنووسمان بکەین هەر دەبێ حەرەکی ڕێکخستنی ئەو کۆت و زنجیرانە بین کە لە بەندیخانەی ڕێنووسی کۆن بە ناپێکی لە خامەمان ئالاون.

بەلام بەرلەوە یەخەی نەقفوینێ و برگە و نیشانە بگرین ئیشکالێکی گەورەتر لەخودی (ڕێنووس)ەکە دێتە پێشمان لەوەدا کە زۆر لەهجەیی زمانی کوردی ڕێ نادەن بۆ قەراردادەکردنی یەك (ڕێنووس). قسەکردن لەبەیەك ڕێنووس بۆ کۆمەڵێك لەهجە خۆتەفرەدانە هەر نەبێ بەنیسبەت ئاکێکی وەکو منەوە کە بەهیچ جۆر دەسەڵاتی ئەوەم نییە ڕێنووسێکی گونجاو لەگەڵ یەك لە لەهجەکانی کوردیدا بکەم بەدەستوور، دەسەڵاتی ئەوتۆیی، وەك بزانم، بەخشراوە بە کۆڕی زانیاری کورد. کۆڕیش مەیدانێکی باشی بڕیوە لە قەراردادەکردنی جۆری نووسینی بەشێکی تەواوی ئەو شوێنانەی تەگەرەیان تێدایە بەشکڵی پێشنیار بڕیارەکانی کۆڕ لە یەکەم ژمارەی گۆڤارەکەیدا بڵاوکراونەوە و تکای دەربڕینی بیروباوەڕیشی کردووە لە نوسەرانی کورد بەرامبەر ئەو پێشنیارانەی. کەواتە شتێك من لێرەدا بیڵێم دەبێتەوە پێشنیارێکی شەخسیی خۆم لە ئاست ئەو بڕیارانەدا کە خۆم یەکێك بوم لەوانەیە تێیدا بەشداربوون، بەلام مەرج نییە بەشداربوونی من یا غەیری من بکرێتە بەڵگەی لێ ڕازی بوون، هێندە هەیە بەش بەحاڵی خۆم شتێك کە بووە بڕیاری نیهائی لەلایەن کۆڕەوە من پەیڕەوی دەکەم.. بۆ دەربڕینی بیروباوەڕیش ماوەی ٦مانگ دانراوە من و نوسەرانی تری کورد ڕێمان هەیە چیی بەچاك دەزانین بیخەینە ڕوو.

وێنەی دەنگەکانی کوردی وەك ا، ز، هـ، م، د... هتاد لەلایەن کۆڕەوە بۆتە بڕیارێکی نیهائی، ژمارەی یەکەمی گۆڤارەکەش هەر بەو وێنانە نوسراوە تەنانەت ئەو گوتارانەی بۆی هاتن لەلایەن نووسەرانەوە چ لەدەرەوە چ لە ناوەوەی وڵات هەموویان خرانە سەر ئەو نەقفوینییە. بەلای منەوە نەهێشتنی دوو (واو) و دوو (یێ) و دوو (ڕێ) لە نووسیندا کارێکی هێندەی بڵێی پەسند بوو چونکە سەیرێکی گەلێك سەیرە یەك دەنگ بە دوو پیت بنووسرێ. تۆ کە دەڵێی دەڕۆم یەك دال و یەك ڕێ و یەك واو و یەك میمت

گوتروە بۆ دەبێ لەنێو هەمواندا (ڕێ)یەکە لە نووسیندا دووبارە بکرێتەوە؟ هەر بۆ خاتری ئەوە لە (ر)ی لەری جیاکەیتەوە؟ جیاکردنەوە ڕێبازی تری هەیە کە عەلەتیش نییە وەك ئەوەی وێنەیەکی تایبەتی بۆ دانێی یاخود نیشانە بخەیتە سەر یەکێکیان.

لزووم نییە لەسەر ئەم باسە قسە درێژ کەینەوە. لێرە بەهێنشەوە خەلق زۆری لەسەر ڕۆیشتووە، بەنیسبەت منیشەوە بڕیاری نیهانیی کۆڕ ڕێگەی موناقەشەی بەستووە هەر ئەوەندە دەڵێم ئیعتیرازکردن لە دانانی نیشانەی (٧) لەسەر ڕێی قەڵەو (ڕ) لەو ڕووەوە کە شکڵەکەی نزیك دەکاتەوە لە پیتی (ژ) ئەم ئیعتیرازە کە خراپە بەرتیشکی لەیەك چوونی (ب، ی، ن، ت، پ)ی ناوەراست هێزی کەم دەبێتەوە چونکە لەوانەیە بێ بە پێ بخوێنرێتەوە یا پێ بە بێ یا نوون بەتێ بخوێنرێتەوە. هەر پیتی (ژ) لەوانەیە ببێتە (ز) جیمیش براجمرانەی (چیم)ە کەواتە موبالەغە کردن لەو نیشانەیەی سەر (ڕ)، بە ئانقەست یا بە سافیلکەیی، کۆمەڵێك موشکیلەی وەك ئەو لەبیر خۆی دەباتەوە و پێ دادەگرێ لەسەر تاکە شتێك کە برانەری زۆرن.

پێشنیارەکانی کۆڕ هی وایان تێدایە بەتێکرای دەنگی ئەندامەکانی پەسندکراوە، هەندێ جاریش وا بووە زۆریتەی دەنگی ئەندامان پەسندی کردووە. من لەو باوەڕەدا بووم ئیسمی فاعیلی (مرکب) سەرلەبەری هەردوو کەرتی بەیەکەوە بنووسرێن با واتایەکی تایبەتیش ڕانەگەیەنن وەك ئەوەی بنووسرێ (نانخۆر) هەرچەند ئەشبووبێ بە ناوی (حرفە)ی وەك (جلدروو یاخود سەرتاش). هەم لەبەرئەوەی کەرتی دووەمی وشەکە سەربەخۆ واتا ڕاناگەیەنێ هەم لەبەر هێندی کە ئەم کەرتەی دووەمە بۆتە (عامل)ی کارتێکەری وشەی پێشەوە (لە ڕاستیدا وشەی پێشەوە مفعوولە) و وای پێوە نووساوە لێی ناپچڕێتەوە. بەڵام کۆڕ بڕیاری وا بوو تا بەهەردوو کەرت وشەیەکی نەرمەنگی پێك نەهێنن و واتایەکی تازە دانەهێنن بەیەکەوە نەنووسرێن.

من مەیلم بۆ ئەوە دەچوو ڕاناوی لکاو کە هاتە ناو وشەوە بێتە دابەشکەری وشەکە واتە ڕاناوەکە بە کەرتی پێش خۆیەوە بلکێ و لە کەرتی دوا خۆی جیابێتەوە وەك (دەم بینە، دەت بینم، ئەمان دیتی) بەڵام کۆڕ ئەم بڕیارەی هەر بۆ ئەو حاڵانە بوو کە ڕاناوە کە دەکەوێتە دوای پێشگرەوە وەك (هەڵم گرت، داسان گرت، پێمان کرد..)

وا بزانم ئەوسا کە لیژنەی ئیملا خەریك بوو گیروگرفتەکان یەکلا بکا لە بیری چوو باس لەوە بکا کە حەرفی (نە) نەفی بە واتای rehtien و nor بەکار دێ دەکەوێتە پێش فیعلەوە چۆن بنووسرێ؟ بلکێ یا نەلکێ؟ تۆ دەڵێی نەدەخوا نەدەخواتەوە. دەبینی ئەم

(نە)یە لێرەدا وەك (نە)ی نەفیی عادەتی حەرفی (دە) مضارعی لەناو نەبردووە. نەفی عادەتی (دە)یەکە تێ دەبا و دەڵێ (ناخوا و ناڕوا و ناچێ.. هتد). بڕیاری کۆڕ ئەوەیە ئەمرازەکانی (نەفی و نەهی و ئەمر و مضارعە) لە هەموو حاڵدا بلکێن بە فیعلەوە. تەنانەت کە دوو ئەمرازیش بەیەکەوە هاتن. راناوی لکاویشیان لەگەڵ دا بوو هەر بلکێن وەك: (نەیاندەگرتین– مەمبینە– بتانگرم..). بەلام وا دەزانم (نە)ی بە واتای neither و nor هەڵناگرێ بلکێ چونکە وەك ئەمرازەکانی تر نییە حیساب بکرێ بەگەرتی ئەسڵیی فیعل. ئەم راستییە جارێکی دیکەش بەوەدا دەردەکەوێ کە (نە) بە واتای rehtien و nor لەگەڵ (ب)ی ئەمرازی ئەمریش کۆ دەبێتەوە و دەگوترێ (نە بکەی نە بخۆی..) ئەگەر نەهی عادەتی با دەگوترا (نەکەی نەخۆی). لەبەر ئەمە مەعقوول نابینم مامڵەتی ئەمرازەکانی تری لەگەڵدا بکرێ. بەو پێیە نەلکانی لەگەڵ سروشتیدا زیاتر رێك دەکەوێ و دەبێ بنوسرێ (نە دەچێ و نە دێ).

بەلام دەبێ تێبینیی ئەوە بکرێ لە صیغەی (ماضی استمراری) ئەمرازی (نە)ی نەفی عادەتیش (دە)ی نیشانەی (مضارع) تێ نابا: دەڵێی (نەدەرۆیشت). لەبەر ئەمە لە ڕواڵەتدا وەك (نە)یneither خۆ دەنوێنێ. بەلام لە لایەن واتاوە وەك دەزانین زۆر لەیەکدی جودان[1] بەلای منەوە لەم حاڵەشدا دەستوورەکە نەگۆڕێ باشە. واتە کە ویستت (نـە)ی وشەی (نـەدەرۆشت) بـە واتـای neither بێ ئەوسا مەیلکێنە کە ویستیشت (نە)ی نەفی بێ بیلکێنە. ئەم لکان و نەلکانە لە تەلفیزی ئێستاکەمان زۆر باش دەرناکەوێ چونکە پیتە بزوێنی وشەی (نە) کە نیشانەکەی (ە)یە بەدوا خۆیەوە

---

(١) تەنانەت لەم صیغەیەشدا کە (کار– فعل)ەکە تێپەر (متعدی) بوو (نە)ی بە واتای nor سەربەخۆیی خۆی رادەگەیەنێ. بە نموونە دەڵێم کاری تێپەری (خواردم) با بکەینە رابردووی استمراری کە دەبێتە (دەمخوارد). ئینجا با بیکەینە (نەفی)ی عادەتی: دیارە دەبێتـە (نـەمدەخوارد). کـەچی (نە)ی بـە واتـای nor کـارەکـە وەك خۆی دەمێڵێتەوە و تەرکیبی ناگۆڕێ و دەگوترێ (نە دەمخوارد نە دەمخواردەوە). هەمان شکڵ ئەم (نە)یەی nor لەگەڵ صیغە (انشائی)یەکانی کاری تێپەڕیش خۆی جیا دەکاتەوە لە (نە)ی نەفی. دەگوترێ (نەمخواردبا. نەمخواردبێ. نەمخواردبوویا) ئەمە لە حاڵی نەفیی عادەتی بەلام لـەگـەڵ (نـەی) nor دەگوترێ (نـەمخواردبـا نـەکردبـام. نـەخواردبێتم نەکردبێتم. نـەخـواردبـووبـام نـەکـردبـووبـام– لـە سلێمـانـی بـۆ ئـەم صیـغـەیـەی دوایـی دەڵێن نەخواردبوومایە نەکربوومایە).

ئالکێ. بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەوەمان مەبەستە کە بێتە کەرتێکی وشە ئەوسا لە نووسیندا ئەودا ناکەوێتە مەودای ئەو و بڕگەکانی تری وشەوە. بە نموونە دەڵێم کە ویستت neither بەکاربهێنی دەنووسی (نە دەڕۆیشت و نە دەهات) کە مەبەستیشت نەفیی عادەتی بوو دەنووسی (نەدەڕۆیشت، نەدەهات).

یەکێک لە گرفتەکانی نووسینمان هاتنی (کسرەی مختلسە)یە بۆ ناو وشەی کوردی. من ئەو بزوێنە یەکجار بێ هێزە ناو دەنێم بزوێنی بێ تەرەف (محاید) چونکە کە دەیهێنییە ناو وشەوە مەبەستت نییە بەرەو هیچ یەکێک لە بزوێنە کورتەکان بیدرکێنی، وەک ئێستاکە باسی لێ دەکەم ئاغڵەب وا دەبێ زەروورەت دەیهێنێ و کە زەروورەت نەما لە خۆوە لادەچێ. با میسال بێنمەوە: تۆ دەڵێی (گەنمەکەم کڕی) لێرەدا پیتی (ن) وەستاوێکی تەواوە، بەڵام کە وشەی (گەنم) بە تەنها بڵێی ناچاری قورسایی بخەیتە سەر پیتی (ن)ەکە و بەدوا ئەودا (م)ەکە بووەستێنی. ناچارییەکە لەوەوە دێ بە جارێ بۆت ناکرێ هەردوو پیتی (ن، م) لە وشەی (گەنم)دا بووەستێنی واتە لێرەدا وەستاو بەدوا وەستاودا نایێ مەگەر خۆتی تێدا سەغڵەت کەی بۆیە (ن)ە کە قورس دەکەیت و بزوێنێکی سووکی بێ هێزی بێ تەرەفی دەدەیتێ تا بتوانی (م)ە وەستاوەکە بدرکێنی.

ئیشکال لە دۆزینەوەی زاراوە نییە بۆ ناونانی ئەو بزوێنە با پێی بگوترێ بێ تەرەف، کسرەی مختلسە Stress یا هەرچی بێ. ئیشکال لەوەدایە ئاخۆ ئەم بزوێنە پشتگوێ بخرێ، یەکجارەکی، یاخود نیشانەی بۆ دانرێ؟ کە پشتگوێتی هەیت ئینکاری بوونی شتێکی هەبوویت کردووە. خۆ لە شیعردا وا دەبێ ئەگەر ئەم بزوێنە مافی تەواوی خۆی نەدرێتێ شیعرەکە لەنگ دەبێ. واش دەبێ کە تێی ئەیەی و ئەیکەی بە وەستاوی تەواو ئەوسا لەنگی پەیدا دەبێ. من مەبەستم ئەو شوێنانە نییە کە بزوێنە بێ تەرەفەکە هەمیشە تێیاندا دەردەکەوێ وەک کاف و دال لە وشەی (کردن)دا یاخود پیتی تێ لە وشەی (بەستن)دا. بڕیارێک کە بۆ ئەو تەرزە شوێنانە بدرێ تەگەرەی تێدا نییە بەڵام لە زۆر وشەدا ئیمکان هەیە ئەم بزوێنە بێ تەرەفە هەبێ و نەبێ. ئاخۆ پەسەند دەکرێ هەمان وشە جارێکیان ئەم بزوێنەی تێدابێ بنووسرێ و جارێکیان نا؟ مەعقوولە دوو جۆرە ڕێنووس بۆ یەک وشە؟ دەزانم ئێستاکە بڕیاری گشتی، بە کردەوە نەک بە (تصویت)، لەسەر هێندییە ئەم بزوێنە لە ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی نیشانەی بۆ دانەنرێ و دەرخستن و دەرنەخستنی بدرێتە بەر زەوقی خوێنەر و پێویستیی جێگە بەڵام لەو باوەڕەدام ئەم خۆ بێدەنگکردنە لە ئاست ڕێنووسی لاتینی بە زەحمەت

بچێتەسەر هەم لەبەر ئەمە کە لاتینی پیتی حازر و بزری هەیە بۆ هەموو دەنگێك. تا وا دەبێ لە هەندێ ڕێنووس چەند پیت بە زیادەوە دەنووسرێن لە بریتی یەك دوو دەنگ لە وشەدا. هەم لەبەر ئەمەش ڕێنووسە لاتینییەکانی تا ئێستا بۆ کوردی دانراون غاڵیبیان نیشانەیان بۆ ئەم بزوێنە داناوە ئەوەی ڕاستی بێ دۆزینەوەی ئەو پیتانە کە دەگونجێن بەدوایەکیدا بێن بە سکوونی تەواو. کارێکە تا ئێستا نەکراوە لە کوردیدا، ئەگەر کەسیش کردبێتی من نەمدیوە. بۆ نموونە دەڵێم نوونی وەستاو دێتەپێش گافی وەستاوەوە وەك لە وشەی (دەنگ، ڕەنگ، شەنگ، پەنگ، دونگ... هتاد)دا دیاری دەکرێ هەرگیزیش زەوقی کوردی قەبووڵ ناکا نوونەکە ئەم بزوێنە بێ تەرەفەی بدرێتێ لەو وشانەدا، کەچی هەمان پیتی (نون)ی وەستاو کە هاتە پێش کافی وەستاوەوە هەر دوو جۆرە تەلەفوز قەبووڵ دەکا. دەتوانی بڵێی (دەنك – بە وەستاندنی نوونەکە دەشتوانی بڵێی دەنك– بە قورسکردنی نوونەکە. من نیشانەی زەنەی لەسەر دادەنێم) نموونەیێکی تر پیتی (س)ە. ئەم پیتە زۆر ئامادەیە بە وەستاوی بێتە پێش ئاغڵەب پیتەکانەوە هەرچەند لەگەڵ هەندێکیان خزمایەتیی خۆشترە وەك پیتی (ت). تۆ دەڵێی (دەست) بە وەستاندنی سینەکە و هەرگیز ناڵێی (دەست– بەقورسکردنی) بەڵام کە دەڵێی (دەسك) هەردوو جۆر تەلەفوز دەگونجێ. کەچی لەگەڵ پیتی ز، ش هەر کۆ نابێتەوە نە بەسکوونی تەواو نە لەگەڵ بزوێنی بێ تەرەفدا. حەز ناکەم کاتێکی زۆر بخایێنم لەگەڵ ئەم تەگەرەیەدا کە تەگەرەی stress کسرەی مختلسە، بزوێنی بێ تەرەفە، نەك لەبەر کەم بایەخیی تەگەرەکە لە ڕووی لێکدانەوەی فۆنێتیکییەوە بەڵکو لەڕووی ئەوەوە تەگەرەکە لە ڕێنووسی پیتی عەرەبیدا کەمتر هەستی پێ دەکرێ، خەڵقیش چاوی ڕاهاتووە لە تێ نەخوێندنەوەی ئەم بزوێنە. بەڵام پێویستە زمانەوانانی کورد لە ماوەی درێژدا دیراسەیێکی تەواوی هەمو دەنگەکانی ئاخافتنی کوردی بکەن و لەو دیراسەیەدا قابلییەتی وەستاندنی هەر دەنگێك لەپێش دەنگێکی تری وەستاودا دەربخەن. یەکێك لەو پرسیارانەی داخوازی وەرامدانەوە دەکا چۆنەتیی نووسینی وشەی (مرکب، لێکدراو)ە. پرسیارەکانی کۆر هەندێ جۆری ئەو تەرزە وشانەی گرتۆتەوە وەك ئەوەی لە (فعل)دا پێشگر تەرکیبەکە پێك بێنێ (هەڵگرتن، ڕاکردن، تێ دامان) یاخود جووتە وشەیێك بەیەکەوە واتایێکی تازە ببەخشن (سەرتاش، جلدروو..) بۆ ئاگاداربوون لە بارەی پرسیارەکانی کۆڕەوە تەماشاکردنێکی یەکەم ژمارەی گۆڤارەکەی لزووم بە کوتانەوەیان ناهێڵێ لێرەدا. من ڕێ بە خۆم دەدەم ڕایەکی گشتی

لەو مەوزووعە دەربڕم: من دەڵێم هەر وشەیێکی لێکدراو کە لەوانە بێ ببێتە وشەی فەرهەنگی و واتایێکی تازەی ئاشکرا بە دەستەوە بدا کە لە کەرتەکانی ترکیبەکە نەفامرێتەوە بەڵکو لە کۆبوونەوەی هەموان پێك هاتبێ، ئەو وشەیە هەمو کەرتەکانی بەیەکە بنووسرێن جا بە هۆی پێشگر و پاشگرەوە یا لە دوو وشەی سەربەخۆوە یا لە نیمە جملە phrase وە پەیدا بووبێ فەرقێك نەکا. هەڵبەت ئەم پێشنیارە ناو و کار و ناوەڵناو و ناوەڵکار و هیچ بەشێکی ناخاوتن جودا ناکاتەوە و هەموان دەگرێتەوە و یەك بڕیاریان بۆ دەدا. بە نموونە دەڵێم کە قەناعەتمان کرد (سەر لێ دان) بخرێتە قاموسەوە لە بەرامبەر وشەی (زیارة، visit)یا بەیەکەوە بنووسرێن (سەرلێدان).

لەمەدا، دەبێ بڵێم، جیاوازیێك دێتەپێش لەگەڵ یەکێك لە بڕیارەکانی کۆڕ، چونکە ئەو وای پەسندکردوە کە دوو پێشگر، یا زیاتر، هاتنەپێش وشەوە تەنها ئەوەی راستەوخۆ دەگاوێتە پێش وشەکەوە هەر ئەویان پێوەی بلکێ، واتە لە نووسینی وشەی (تێ هەڵ ئەنگوتن) یەکەم پێشگر (تێ) دەبێ بەجودا بنووسرێ، تەنها پێشگری (هەڵ) بەفعلەکەوە بلکێ: (تێ هەڵئەنگوتن). دەوجا کە پێشنیاری کۆڕ ئەمەبێ و ئەمێلێ یەکەم (پێشگر) بلکێ دیارە رێ نادا وشەیێکی سەربەخۆی وەك (سەر) بە نیمچە جوملەی (سەر لێ دان)دا بە دوا خۆیەوە بلکێ، هەر (لێدان)ەکە بە یەکەوە دەلکێنێ.

دەبێ ئەوەش بڵێم کەوا لە فەرزی پێشنیارەکەی من پەسەندیش بکرێ، کەهات و وشەی وەها لێکدراو چووە ناو ڕستە و داخوازی جێگە لەبەر یەك هەڵوەشا و تێك چرمسانەکەی (التحام) ئەما دەبێ کەرتەکانی بە جودا بنووسرێن بە پێی ئەو دەستوورانەی کە بڕیار دەدرێن بو لەیەکتر جوداکردنەوە، واتە کە (سەرلێدان) خرایە جوملەوە و بوو بە (سەرم لێیان دا– سەرم لێ دان) ئەوسا وەك جملە مامەڵەتی لەگەڵدا بکرێ نەك تاکە وشە، چونکە دەبێتە جوملەیێکی عادەتی وەك (گۆشتم پێ فرۆشتن، دەستم بۆ هەڵبرین، نامەم بۆ خوێندنەوە).

بەپێی بڕیاری کۆڕ ئەمرازی (لە) نالکێ بە دوا خۆیەوە و دەنووسرێ (لە شار بووم) هەر ئەمەیشە ڕچەی نووسینی هەموو نوسەرانی کوردی. نووسینی ئەمرازی (لە) بە تەنهایی نیشکال دروست ناکا ئەگەر تەواوکەری (وە، را، دا)ی لەگەڵدا نەبێ. بەڵام کە ئەم تەواوکەرانە هاتن ئیشکال دێتە ناوەوە. فەرمو قەڵەم بگرە و بنووسە.

لە کەرکووکەوە – لە کەرکووك وە؟

لە کەکووکرا – لە کەرکووک را

لە کەرکووکدا – لە کەرکووک دا

بریاری کۆڕ ئەوەیە تەواوکەرەکان بلکێن

بەشی زۆری نوسەران (لە کەرکووکەوە و لە کەرکوکرا) بەیەکەوە دەنووسن بەلام (لە کەرکووک دا) جیا دەکەونەوە.

هەر بریارێك بدرێ دوای لێکۆڵینەوە و سرنجدانی قووڵ تا ئەو رادەیە بەلای کەمەوە قەناعەت بەخاوەنەکانیان بێنێ باشترە لە بریاری سەرپێیی.. هەرچەند خۆم ئەندامی ئەو کۆڕەم پێشنیاری کردووە (لە) نەلکێ و تەواوکەرەکانی بلکێن، خۆم پێ ناگیرێ لەوەدا کە بڵێم دو جۆرە رەفتار لەگەڵ دو کەرتی یەك شت کارێکە پرسەك (علامە استفهام)ی بەسەرەوەیە.

ئەمرازی (بە) ئەویش لە هەندێ رووەوە وەك (لە) وایە، وا دەبێ تەواوکەری بە دوادا دێت، دەڵێی (بە پێوە، بە ماڵ و منداڵەوە)

بە نیسبەت (لە) و (بە) قسە درێژەی پتری هەیە هەندێکی نیزافەی سەر ئەوەندەی دەکەین تا ئێستا گوترا:

(لە) وا دەبێ دەکرێ بە (لێ) واش دەبێ دەکرێتە (تێ) و دەبێتە پێشگری (کار – فعل) و بە پێی پێشنیاری کۆڕ بە کارەوە دەلکێنرێ، دەڵێی (بەردێکم تێ گرت، رەخنەم لێ گرت – کە بە ئەسڵ بەردێکم لە نیشانە گرت، رەخنەم لە مامۆستا گرت) بووە و (لە)یەکە کراوەتە (تێ، لێ)، بەنیسبەت (بە) دەگوترێ (قسەم بە دارا گوت – قسەم پێ گوت).

دەبینی دو ئەمرازی (بە لە) کە دەچنە سەر کار یا راناوی لکاو یاخود کە دەبنە کەرتی چاوگ وەك (تێگرتن، لێگرتن، پێکردن، پێکردن) دەگوترێن و دەلکێن بەدوا خۆیانەوە لە نووسیندا. دەوجا کە ئێمە بریار بدەین (لە بە) بۆ خۆیان نەلکێن دەبێ ئەوەمان لە بیربێ کاتێك کە دەبنە (لێ، تێ، پێ) دەلکێن، سەرەرای ئەوە کە هەموو تەواوکەرەکانیشیان هەر دەلکێن (هەمو تەواوکەرەکان بەپێی پێشنیاری کۆڕ دەلکێن، هەمو نووسەرانیش تەواوکەری (وە) دەلکێنن لەغەرزی تەواوکەری «دا، را»ش نەلکێنن). من ناسەوێ لە خۆمەوە لکان و نەلکانیان تەرجیح بکەم، خۆم ئەگەر تەرجیحیش بکەم چ کارێکی بەدەم نەکردووە، هەر ئەمەم مەبەستە ئیشکالەکە بە روونی و بە تەواوی بخرێتە بەرچاوان.

گرفتی نووسین و تەتروسینی (ی)ێکی زیاد لە حاڵی وەصف و ئیزافەی ئەو وشانەی کۆتاییان (ی)ی درێژ و تیژە (وەك ترۆزی، سپی، پیاوەتی) یا بەدوا کاری رابردوودا کە بە ئەسڵ کۆتاییەکەی (ی)ی تیژی درێژین و بخرێتە پاڵ کەسی سێیەمی تاکەوە (وەك نووسی، بڕی) بە درێژی لە گوتارەکەی خۆمدا لێی دواوم، ئەو گوتارەی لە ژێر ناونیشانی (بەکارهێنانی-ی لە ڕێزمانی کوردی) لە یەکەم گۆڤاری کۆڕدا بڵاو کرایەوە. لزووم نابینم لێرەدا تێ هەڵچمەوە. ئاخۆ بنووسرێ (ترۆزیی ناسك یاخود ترۆزی ی ناسك- ئەخۆڵ نووسی یاخود ئەخۆڵ نووسیی).. وەك ئەم باسە هەموو باسەکانی تریش کە لە گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکراوەتەوە لە باری (ڕێنووس)ەوە پێویست نییە لێرەدا دووبارە بکرێنەوە بە نووسین، ئیمکان هەیە وتوویژیان لەسەر بکرێ و لایەنی پەسند و نا پەسندیان بخرێتە بەر سرنج لێگرتن و لێکدانەوە. هەموو ئەو گرفتانەش کە لە گۆڤارەکە یا لێرەدا باسیان ئەکراوە دەشێ باس بکرێن و بەپێی بیروباوەڕی خاوەن رایان پێشنیاری مناسبیان بۆ دانرێ.

گۆواری پەروەردە و زانست، ژمارە ٦ ساڵی ٢، ١٩٧٢

# ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە

لە ژمارەی (٧٦)ی (ڕۆشنبیری نوێ)ی ئەیلوولی ١٩٧٩ گوتارەکەی د. ئاورەحمانی حاجی مارف بەناونیشانی (با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین) گەلێک بیروڕای ئەوتۆی تێدا هەن کە نووسەران و خاوەن ڕایان بخەنە سەر لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە و ئەندێشەش. لێرەدا من بەپێی بۆچوونی خۆم و لە ڕوانگەی ڕووناککردنەوەوە دوو خاڵی ئەو گوتارە سوودبەخشە دەدەمە بەر لێدوان. ئەوەندەی بشتوانم پێڕەوی ئامۆژگارییەکەی نووسەر دەکەم لەوەدا کە دەبێ لێکۆڵینەوە بەڕێبازی ڕاست و ڕەوانی زانستکارانەدا بڕوات. هەر ئەبێ بایبی ئەوەندەی کە دڵگەرمی و عاتیفەی تێدا بەکار نەیەت.

خاڵی یەکەم ئەوەیە کە لە لاپەڕە (١١)ی گۆڤارەکە لەبارەی وشەی (انعدام)ی عەرەبییەوە هاتووە کە گۆیا کاتی خۆی کۆنە ئەنجوومەنی کۆنە کۆڕی زانیاری کورد بەهەڵە وشەی (نەمان)ی بۆ پێشنیار کردووە.

وشەی (انعدام) ئەوە دەگەیەنێ کە نەبوون بەسەر بوونەوەرێکدا بێت ئیتر مادی بێ ئەو بوونەوەرە یا مەعنەوی، وەک کە دەگوترێ (انعدام الوزن) دیارە (وزن) لەسەر زەوی هەیە و هەبووە بەڵام لە دوورایی هێندە کیلۆمەترە (انعدام) دەکات کە ئەمە پاتەوپات (نەمان) دەگەیەنێ.

ئەوەی ئاشکرایە لە (فقة اللغة) ئەوەیە کە فیعل لێی زیاد کرا پتر بەرەو تەنگیدی (ڕوودان) دەڕوات و لە ئیحتیمالی واتای (مطلق) دوورتر دەکەوێتەوە فیعلی (انعدام)یش کە (مطاوع)ی فیعلی (عدم)ە دەرەنگتر خۆ بەدەست ئەو واتا موتڵەقەوە دەدات کە لە وشەی (عدم) وەردەگیرێت، دیارە لە کوردیشدا (نەمان) پتر خزمە لەگەڵ ڕوودان هەرچەند فیعلەکەش لێی زیاد نەکراوە، بۆیە نەمان ڕێکتر دێت بۆ (انعدام) وەک کە (نەبوون) بۆ (عدم) دەست دەدات. وشەی (نەبوونی)ش هەر ئەو واتایەی (فقر، عوز)ی هەیە کە د. ئاورەحمان بۆی چووە، وشەکەش لە ڕێی ڕاستە دەستووراتی وشەسازییەوە پەیدا نەبووە بەڵکو داڕشتنێکی ڕەمەکییە کە هاتووە (ی)ی ئامرازی ئەبستراکتی خستۆتە پاڵ (نەبوون)ەوە کە ئەویش هەر ئەبستراکتە. ئەم داڕشتنە ڕێزپەڕە (شاز)

ناشێ ببێتە بنەمای دەستووری زاراوەسازی. ئەگینا سەد وشەی وەکو (نەخوێندنی، نەچوونی، نەبیستنی ...) دەھاتە ناو ئاخاوتن و نووسینی کوردی و رەمانەکەی دەشێواند. وشەی ڕیزبەڕ لە کوردی و غەیری کوردیدا زاوزێ ناکات. ئەگەر بکات زۆڵ دەھێنێت.

لەبارەی (نەبوونی)یەوە ئەک ئەوەندە و بەس، بگرە جارێ ھۆی ھەرە گەورەی دەستنەدانی لە بری (انعدام) ماوە ڕوون بکرێتەوە.

وشەی (نەبوونی) لە فیعلی (بوون) بەواتای (وجود)ەوە نەھاتووە بەڵکو لە (ھەبوون)ی بەواتای (تملك)ەوە وەرگیراوە. (ھەبوون) بەواتای (تملك) چونکە تێھەڕە لەگەرداندا ھۆی لە (ھەبوون)ی بەواتای (وجود) جودا دەکاتەوە ڕاناوی تێپەڕیش لەگەڵ ھۆیدا دەھێنێت. لە پێشەوە لیستەی گەردانی (ھەبوونی)ی بەواتای (وجود) دەنووسم

| | |
|---|---|
| من ھەم | من ھەبووم |
| تۆ ھەیت | تۆ ھەبوویت |
| ئەو ھەیە | ئەو ھەبوو |
| ئێمە ھەین | ئێمە ھەبووین |
| ئێوە ھەن | ئێوە ھەبوون |
| ئەوان ھەن | ئەوان ھەبوون |

ئنجا لیستەی (ھەبوون)ەکەی (تملك):

| | |
|---|---|
| من ھەمە، ھەیەتم | من ھەمبوو |
| تۆ ھەتە، ھەیەت | تۆ ھەتبوو |
| ئەو – ھەیەتی | ئەو ھەیبوو |
| ئێمە ھەمانە ھەیەتمان | ئێمە ھەمانبوو |
| ئێوە ھەتانە ھەیەتتان | ئێوە ھەتانبوو |

ئەم ڕیزەیەی (ھەمە ھەیەتم ..)ی (تملك) کێشەی زۆر بەدوادا دێت بەنموونە کە دەڵێت (ھەیەتم) مەبەستت کاتی ئێستاکەیە کەچی ڕیزەکەی وەك (خواردوومە، کردوومە)ە کە جۆرێکە لە ڕابردوو. دیسان (ھەمبوو، ھەتانبوو ..) کە لە ڕیزەی

رابردووه جودا بۆ ئەوە لە ڕێژەی ڕابردووی تێپەری عادەتی کە دەڵێ (خواردبوومان، کردبوومان..) هەر بۆیەیە ئەوەی تازە کوردی فێر دەبێ دەڵێ (هەبوومان..). ئنجا موزاریعی (هەبوون)یش بەهەردوو واتا کێشە هەڵدەگرێ کە دێت ڕێژەی موزاریعی (بوون)ی سادە وەردەگرێ: من هەم، من دەبم) لە موزاریعی (هەیە هەیەتم)دا کێشەکە گەورەتر دەبێ کە دێت و ڕێژەی (انتقالی پێچەوانە) وەردەگرێ (من هەمە هەیەتم، من دەمبێ) ئەم (ئینتیقالی پێچەوانە)یە لە کتێبۆلکەی (چەند حەشارگە..)دا بۆ یەکەم جار باس کراوە، بەڵام زۆر پێویستی بەشەرح و ڕوونکردنەوە هەیە، ئێرەش جێگەی نییە.

وا دەزانم کەرتی (هە) لە وشەی (هەبوون)ی بەواتای (تملك) خزمی (avoir)ی فەرەنسی و (have)ی ئینگلیزییە بەو پێیە ڕەنگە لە کۆندا (هەف بوون) بووبێت. بەواتای (وجود)یش لە (هست)ی فارسی و (est)ی فرەنسی و (is)ی ئینگلیزییەوە نزیکە. لەمەچە هەیە لە کوردیدا لە جیاتی (هەیە) دەڵێ (هەسە).

بەهەمەحاڵ (نەبوونی) لە بنەڕەتدا (نەهەبوونی) بووە و لێی سواوە، ئێستاش دەگوترێ (هەبوونی و نەبوونی – کابرا باباپەکی هەبووە..).

لەمەوە دەردەکەوێ کە بەهیچ کلۆجێك ناشێ (هەبوونی) بۆ لای (وجود) ببرێتەوە، ئەم ڕواڵەتە چاوغەڵەتێنەی لەیەکچوونی دوو وشەکەش ناشێ تەلەزگە بەبیرمان بکات و لاترێزەمان پێ ببەستێ بۆ دەرەوەی ڕاستە ڕێگەی زمانناسی و زاراوەسازی.

هاڵی دووەم ئەوەیە کە لە لاپەڕە (١٤)ی گۆڤارەکەدا وا ڕانوێنراوە کە (ن)ی چاوگ بەکۆتایی فیعلی وەك (کردن، ڕستن)ەوە نانووسێت، گۆیا کورتە بزوێنێکی ورد دێتە نێوان کۆتایی فیعلەکان و نیشانەی چاوگەکەیانەوە بەڵام لە ڕێنووسی کوردی کە بەپیتی عەرەبی دەنووسرێ بزوێنەکە وێنەی بۆ دانەندراوە ئێتر زمانناسان هەڵەی تێدا دەکەن، یانی ئەگەر کوردی بەپیتی لاتینی بنووسرێ نیشانە بۆ بزوێنەکە بەکار دێت و هەڵەی تێدا ناکرێ.

با لە پێشەوە ئەوە بڵێم، نووسینی لاتینیش وا دەبێ سەر لە نووسەر و لێکۆڵەرەوەی کورد دەشێوێنێت وەك کە دێت و لە بری (نا، نۆ، نی..) تەنها یەك پیت دەنووسێت کەچی هەریەکەیان برێتییە لە دوو دەنگی سەربەخۆی تەواو و چ فەرقێك نییە لە نێوان (دا، دۆ، دی) و (نا، نۆ، نی) لە ڕووی ژمارەی دەنگەکانیانەوە، نووسینی لاتینی کە

بایەخی بەدەنگی (همزە) نەداوە و لەوەشدا سەھوویکی زلی کردووە. کێشەی بۆ ئێمەش ناوەتەوە کە بەشێکی بەرچاوی لێکۆڵەرەوەی کورد بەشوێن هەنگاوی ئەم سەھووەدا دەرۆن و دەمەتەقە لەسەر بایەخی دەنگی (همزە) هەڵدەستێنن و دانەنانی نیشانە بۆ هەمزە لە نووسینی کوردیدا بە ڕاست دەزانن کەچی دەنگێکی زیندە ڕەسەن و کۆنی زمانەکەمانە. هەر ئەوەندە هەیە لە ئاخاوتنی ئێستاکەماندا هەمزە لە ناو توێژی وشەدا نەماوە و بەزۆری لە بەرایی وشەوە دێت، تەنها لە ڕێژەی موزاریع و ئەمر ئەبێ وەک: دەئاخێوێ، دەئەنجنێ – بئاخێوە، بئەنگێوە، دەتئەزمرووم .. لە کوردیدا دەنگی لامی قەڵەویش لە بەرایی وشەوە نایەت کەسیش ناڵێ با نیشانەی بۆ دانەندرێت. دەنگی (هـ)ش بەدەگمەن لە ناو توێژی وشەدا (دەبیستری) [ئەهۆم، ئەهۆ .. ].

ڕەنگە لە ئاخاوتنی ئێستاماندا هەرگیز نەچێتە کۆتایی وشەوە. مەشوورترین وشەی کۆنمان (دناك) هەمزەی لە هەناویدا هەیە ـ نووسینی لاتینی کە نیشانەی بۆ ئەو دەنگە کز و بێ هێزەی نێوان فیعل و (ن)ی چاوگ داناوە سەرلەنوێ وای کردووە بایەخەکی لە ڕادەبەدەر بەو دەنگە بدرێ، ڕەنگ بوو ئەگەر نووسینی لاتینی لێی بێدەنگ بایە ئەویش وەک (همزە) پشتگوێ خرابایە. هەر چۆنێك بێ ئەم دەمەتەقەیە لەسەر (تاوانی ڕێنووس) مەبەستی ئێرەکانە نییە، ئەوەی من بەچاوی خۆمەوە گرتووە لێرەدا شتێکی دیکەیە: ئایا ئەو دەنگە کزەی کە لە نێوان (ت-ن) و (د-ن)ی دوو فیعلی (بەستن، کردن)دایە ئەویش وەک دەنگەکانی دیکەی فیعلەکان (ب، ە، س، ت، ك، ر، د) بەشێکی بنجی و پێکهێنەری وشەیە یاخود شتێکی دیکەیە؟ هەڵبەت هەموو کەس هەست بەو دەنگە کزە دەکات لەو شوێنە و لە گەلێك شوێنی تریشدا. کەواتە بابەتی لێکۆڵینەوە لە بوون و نەبوونی دیاردەکە نییە بەڵکو (ماهیة)ی دیاردەکەیە: پرسیارمان لێرەدا (ئایا هەیە؟) نییە بەڵکو (ئایا چییە؟)یە.

بەنیازی خۆ ڕوونکردنەوە و گوتار کورتکردنەوە وشەی نموونان کە بەپیتی لاتینی بنووسم لە بری ئەو بزوێنە بێ هێزە (ı)ی بێ نوختە دادەنێم، بۆ کورتە بزوێنی (ی – کەسرەی عەرەبی)ش پیتی (i)ی نوختەدار دادەنێم، لە جیاتی کورتە بزوێنی فەتحەش (e) دەنووسم بۆ (ی)ی درێژیش، لە هەر کوێیەك بێت (y) دەنووسم، لە جیاتی (کورتە بزوێنی بێ هێز)یش تەنها وشەی (بێ هێز) بەکار دەهێنم، هەر جارەش بەپێی پێویست برگەی وشان لە یەکدی جودا دەکەمەوە تاکو دەوری ئەو بێ هێزە لە پێکهێنانی برگە و کەرتکردنی وشە ئاشکراتر بێت.

له چاوگی (ڕستن، کردن)دا ئەگەر بڵێین ئەو بێ هێزەی پێش (ن)ی چاوگەکان بەشێکی پێکهێنەری وشەکانە ئایا دەبێ بە (ن)ی چاوگی بدەین یا بەقەدی فیعلەکە؟ دیارە ئەو بێ هێزە هی قەدی فیعل نییە چونکە لە چاوگی تێنەپەڕدا بەلادانی (ن)ی چاوگ قەدی فیعلەکە دەمێنێتەوە بێ ئەوەی هیچی بێ هێز و بەهێزی بەدواوە بێت وەك:

مردن mir-din mird

ڕۆیشتن ro-yisht ro-yish-tin

نموونەی تێپەڕم نەهێنا چونکە بەلادانی نوونی چاوگ ڕاناوی فاعیل دێت و مەسەلەکە ڕوون نابێتەوە.

کەواتە دەمێنێتەوە (ن)ی چاوگ بێ هێزەکەی لە قەبڵ بکەین. ساغکردنەوەی ئەم لایەنە ئەختێك پشووی درێژی دەوێ.

(ن)ی چاوگ هەر لە دوای (د، ت)وە نایەت، بەدوای (ا، و، ی)شدا دێت وەك (فەرموون، زانین، کێڵان).

لێرەشدا ئاشکرایە هاتنی ئەو بێ هێزە لە دوای بزوێنەکانی (و، ی، ا) موستەحیلە چونکە بزوێن هەر کۆنسنانتی بەدوادا دێت، بێ هێزەکەش کۆنسنانت نییە. کەواتە دەرکەوتنی ئەو بێ هێزە لە چاوگاندا هەر لە چاوگی دالی و تێ یی دەوەکینە. ئێستا قەدی فیعل دەدەینەوە ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی کۆ دەڵێین: (کردمان، kir-di-man) دەبینین هەمان بێ هێز لە بەرابیی ڕاناوەکەشدا هات، وەك کە لە پێش (ن)ی چاوگدا هات، ئیتر هەمان پرسیار هەڵدەستێ لەوەدا ئایا ئەو بێ هێزە بەشێکی ڕاناوەکەیە؟ خۆ زانیمان ناشێ بەشێکی فیعلەکە بێت؟ یەکلاکردنی پرسیارە لە ئاست ڕاناودا کارێکی ئاسانە چونکە دەتوانین جێگۆڕکێ بە ڕاناو بکەین و بزانین بێ هێزەکە چی لێ بەسەر دێت.

با بێنین پێشگری (هەڵ) بخەینە سەر فیعلەکە بۆ ئەوەی ڕاناوەکەی لێ بستێنێ. دەڵێین (هەڵمان کرد، hel-man kird) لێرەدا هیچ بەهێز و بێ هێز لە بەرابیی ڕاناوەکە دەرنەوت، کەواتە بێ هێزەکە بەشێکی ئەویش نییە ئەدی چییە؟

ڕاستیی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەم بێ هێزە پێداویستێکی فۆنەتیکی ناچارییە کە لە هەندێ وشەدا دێتە دوای یەك لە دەنگەکانی وشەکە بۆ ئەوەی بتوانرێ تەلەفوزی بێ

بکرێ، کە پێویستیش نەما بێ هێزەکە لە خۆوە دەرەوێتەوە. ئێمە دیتمان لە فیعلی (-kir
di-man)دا بێ هێزەکە هاتە دوای فیعلی و بوو بەبەشی یەک لە برگەکانی، بەڵام لەگەڵ پێشگری (هەڵ) ئەوە ناچاری و پێویستییە نەما چونکە بەبێی داخوازیی دەنگسازیی کوردی وشەی وەک (هەڵ) لە بەرایی وشاندا پێویستی بەو بێ هێزە لکێنەرە نییە بەڵام کە تاکە یەک دەنگی بەدوادا هات پێویستەکە پەیدا دەبێ. تۆ سەیری وشەی (بەد) هەرچەند وەک فیعلی (کرد) بە (د) کۆتایی دێت [چونکە لە کێشی (هەڵ)ە پێویستی بەو بێ هێزە نییە لە بەرایی راناوەکەدا وەک کە دەڵێی (بەدمان کرد bed-man kird )
بەڵام کە هاتی یەک تاکە دەنگ بەدوا (هەڵ، بەد)دا هێنا ناچاریت بەو بێ هێزە لکێنەرە لە پەکیان ناشنا بکەیت وەک:

هەڵم گرت he-lim girt

بەدم کرد be-dim kird

تەنانەت حوکمی ئەو دەستوورەی دەنگسازییە وای کردووە بەشێکی وشەی (هەڵ، بەد) لەگەڵ راناوەکەدا ببنە برگە و لە بەشی سەرەتای وشەکان جودا ببنەوە.

یەک لە دەستوورە هەرە بەرچاوەکانی فۆنەتیکی کوردی ئەوەیە کە ئەگەر بزوێن بەدوا ئەو دەنگەدا هات کە بێ هێزەکەی لە پێشدایە بێ هێزەکە تێ دەچێت وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

وشەی (گەنم، ge-nim) بەناچاری ئەو بێ هێزەی تێدا هاتووە تا مومکین بێ (م)ەکە بەدوا (ن)ەکەدا بێت، بەڵام کە هاتی بزوێنێ خستە دوای (م)ەکە ئەو بێ هێزە دەرەوێتەوە وەک کە دەڵێی:

گەنمەکە gen-meke

هەروەها وشەی (کرم)یش کە بوو بە (کرمان) بێ هێزەکەی پاش (ر)ەکە تێ دەچێت.

ki-rim

kir-man

هەرچەند ئێمە ناتوانین جێگۆرکێ بە (ن)ی چاوگ بکەین بەڵام دەتوانین وەک کارێکی بەدیهی چی لە راناوەکان و وشەکانی دیکە بەدیاری دا، بۆ (ن)ی چاوگی بکەین بەدەستوور چونکە ئەویش دەنگێکە وەک ئەوان.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کە جێگۆڕکێی بۆ (ن)ی چاوگ مومکین نییە، دەتوانین بیخەینە بەر دەستووری هاتنی بزوێن بۆ دوایەوە چونکە، خوا و تالع، پاشگر هەیە ئەم کارەمان بۆ بکات:

دوو فیعلی (بەستن، کردن) کە پاشگری (ەوە)یان بەدوا داهات باری ئەو بێ بزوێنیان شلۆق دەبێ چونکە ئەوسا دەتوانی تێی بپەیت و بڵێیت:

best-newe

kird-newe

وەك هەست دەکەیت تێپەڕدنی بێ بزوێنەکە لە (بەستنەوە)دا خۆشترە، کە ئەمەش هەر بڕیاری خۆمایەتیی نێوان دەنگەکانی کوردییە، خۆ ئەگەر (ن)ەکە بەدوا (و)ی کۆنسنانتدا هاتبایە تێپەڕدنی ئەو بێ بزوێنە دەبوو بەکارێکی ناچاری وەك لەم نموونەیەدا دەیبینی:

وشەی (کەون، ke-win) کە بێ بزوێنەکەی تێدا لە تەرکیبی خوارەوەدا بەتەواوی دەیدۆڕێنێت:

kew-ne zam فیعلی (فرۆشتن) لە هەندێ بەکارهێنانێدا دەبێتە (فرۆتن) هەروەك کرۆشتن دەبێتە (کرۆتن- لە شیعری مستەفا بەگی کوردیدا هاتووە) جا ئەگەر بزوێنیان بخەینە کۆتاییەوە تێپەڕدنی بێ بزوێنەکە لە (فرۆتن، کرۆتن)دا لەبارترە تا (فرۆشتن، کرۆشتن) دیارە هەستکردنیش بەم ڕاستییە کاری سەلیقەیە fi-rot-ne-ke

ki-rot-ne-ke وشەی (تووتن) کە ئەویش وەك (ڕستن) دەنگی (ت)ەکەی کەوتۆتە پێش (ن)ەکەیەوە و ئەو بێ بزوێنەشیان لە نێواندایە بێنە بزوێنی بدەیێ و سەیری بکە چۆن بێ بزوێنەکەی دەڕەوێتەوە:

too-tin

toot-ne-kem من لە نووسینی لێرە بەپێشەوەی خۆمدا ناوی ئەو بێ بزوێنەم ناوە (قورسکردن- قورسایی) چونکە نە بزوێنی درێژە و نە کورتە [واتە نە ئەلف و ئەواو نە یێ و نە کەسرە و نە فەتحە و نە بۆر] ئەمەشتەوێ بزوێن لەو شوێنەدا بەکار بهێنێت. ناچارییەکی دەربڕینی دەنگی بێ بزوێنە لە حاڵەتی تایبەتیدا ئەم قورسکردنە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ و هەرکە ناچارییەکەش نەما قورساییەکە تێ دەچێ، وەك ئەوەی پاسەوانی شەوانەی خانوو لەگەڵ گزنگی خۆر بزی دەردەچێت و هەرگیز بە بەشێکی

خاتوومکە حیساب ناکرێ، یاخود ساردی و گەرمیی ئاو و هەوا بەشێکی پێکهێنەریان نین وەك کە ئۆکسجین بەشێکیانە.

ئەم دیاردەیەی قورسکردنی دەنگ و تێپەردنی لە زمانی کوردیدا تا بڵێی بەکێشەیە بەلام کورد هەستی پێ ناکات چونکە بەسەلیقەی زگماك دەزانێ لە کوێ دەنگەکان قورس بکات و چۆنیان رەها بکات کەچی بێگومان غەیری کورد زەحمەتی تێدا دەکێشێت و رەنگە هەر تێی بڕ نەکات. لە گوتارێکی خۆمدا (فۆنەتیك چیمان بۆ بکا؟) کە لە بەشی یەکەمی بەرگی سێیەمی (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد-١٩٧٥)دا بلاو کرایەوە مایلەو بەدرێژی ئەم دیاردەیەم باس کردووە لەو نووسینەدا روونم کردۆتەوە کە دەنگەکانی زمای کوردی لە ڕووی گونجان و حەز لە یەکدی کردنەوە چوار پلەیان هەیە وا لێرەدا بەکورتی باسیان دەکەمەوە:

پلەی یەکەم: گونجانی تەواو. لەم پلەیەدا دەنگەکان کە بەدوا یەکدیدا دێن قورسکردن هەڵناگرن وەك کە (د) بەدوا (ر)دا دێت وەیا (ت) دەکەوێتە پاش (س) و هی تریش:

gu-ling, deng, shest, mast, merd, kurd, rend, mend, khurt, kert, khu-
-risht, gesht

پەلەی دووەم: گونجان. لێرەدا دەشێ قورسکردن هەبێت و دەشێ نەبێت وەك دەنگەکانی (ر، گ) (ن، ك):

be-rig, berg

de-nik, denk

بەرگ

دەنك

پلەی سێیەم: نەگونجان. بریتییە لەوەی کە پێویستە قورسایی بخرێتە سەر دەنگی پێشەوە وەك:

he-le-din

che-shin

پلەی چوارەم: دژایەتی ئەویش نەهاتنی دەنگێکە بەدوا دەنگێکی دیکە مەگەر بزوێنی ناشکرایان لە نێواندا بێت وەك (ر، ل) و (ل، ر) بەهەردوو شێوەی لاواز و قەڵەویانەوە

و (ق، ك– ك، ق) و (س، ز– ز، س– ش، ژ ..) [تەنها وشەی «مسژ»م بەبیردا دێت کە «س» تێیدا هاتۆتە پێش «ژ»ی خزمی «ش»]

زمانەوان و دەنگناسی کوردی لەسەریەتی ئەم بەدیهییانە بەمەند هەڵبگرێ وەك کە دێت دەستوورە ناسراوەکانی ڕێزمان و فۆنەتیك ئەزبەر دەکات و دەیانڵێتەوە، هیچ لە بایەخی ئەم دیاردە گرنگەش کەم نابێتەوە بەوەدا کە جارێ بیری لێکۆڵەرەوەی کوردی بۆ نەچووە ئینجا کە ئێمە بێین ئەم دەستوورانە و دەستوورەکانی دیکەی (دەنگ)ی کوردی بەسەر پێکهاتنی چاوگی وەك (ڕستن، کردن)دا بهێنین و یەکێك لە دەستوورەکانی وشەسازیشی بدەینە پاڵ دەبینین لەبەر سێ هۆی زۆربنجی ڕێگە نییە بۆ تێبردنی ئەو قورساییەی سەر (ت، د)ی پێش (ن)ی چاوگ:

یەکەم: (ن)ی چاوگ لە لاوە دێتە کۆتایی وشەکان، بەپێی ئەوەی کە لە کوردیشدا دەنگی لاوەکی بەعادەت داخوازی قورسکردن لە دەنگی پێش خۆیەوە دەکات، ناچارین دەبێ ئەو (ت، د)ە قورس بکەین. ئەم دەستوورەش هێندە بەهێزە خۆی زاڵ دەکات بەسەر دەستووری (پلەی گونجانی تەواو)دا. بەنموونە وشەی کەس بدە بەکەسی دووەمی تاك، کە (ت)ە، دەبینی پێویستە قورسایی بخەیتە سەر (س)ەکە هەرچەند دەنگی (س) لە پێش (ت)دا قورسایی قبووڵ ناکات: ke-sit وەك کە لە ڕستەی (من کەسم نەدیتوە، تۆ کەست دیتوە؟)دا هەست بەقورسکردن دەکەیت لەو (س)ەی پێش (ت)دا بەڵام کە هاتی (ت)ەکەت بزاوت خێرا قورساییەکە هەڵدەستێ وەك: kes-lan (کەستان چۆتە شار؟)

ئەم دەستوورە بۆ خۆی بەسە بۆ ئەوەی (ن)ی چاوگ بەهۆی ئەو قورسکردنە لە دەنگی پێش خۆی دابڕێت، بەڵام دوو دەستووری دیکەش پاڵپشتی لێ دەکەن کە دەبنە هۆی دووەم و سێیەم:

دووەم: (ن)ی چاوگ بۆ خۆی لە پلەی نەگونجاندایە لەگەڵ هەردوو دەنگی (ت، د). گونجانی (ن، د) لەو حاڵەتەدا دەبێ کە (ن)ەکە لە پێشەوە بێت لێرەدا (د)ەکە لە پێشەوەیە هەروەها بەنیسبەت (ت، ن)یشەوە. گونجانی (س، ت) و (ن، گ) و (ر، ت)یش هەمووی هەر وەهایە، کە جێگەی دەنگەکانت گۆڕی گونجانیان نامێنێ. بەو پێیە ئەگەر (ن)ی چاوگ لە لاوەش نەهاتبایە و بەشێکی پێکهێنەری ئەسڵی وشەکە بایە هەر داخوازی ئەو بێ هێزەی دەکرد بۆ دەنگی پێش خۆی.

سێیەم. ئەو دەنگانەی لە فیعلی کوردیدا دەکەونە پێش (ت، د)ی کۆتایی فیعلەکانەوە هەموویان لە پلەی گونجانی تەواودان لەگەڵ (ت، د)دا. دەنگی (د)ی چاوگی تەنها دوو دەنگی (ر، ن) لە پێشیەوە دێن وەک:

کردن، بردن، خواردن – ستاندن، کەندن، خوێندن . هتد. دەنگی (ت)ی چاوگیش دەنگەکانی (ر، س، ش، ف، و) لە پێشیەوە دێن وەک (گرتن، بەستن، مشتن، گۆفتن، کەوتن – مەبەست «و»ی کۆنسنانتە). دەنگەکانی (س، ش، ر) گونجانیان لەگەڵیدا تەواوە. دوو دەنگی (و، ف)یش وەک تەواو وەهان [شەرحی ئەمە لێرەدا جێی نابێتەوە بەهەمەحاڵ گونجانیان لەگەڵ «ت»دا زۆر بەهێزترە لە گونجانی (ن) لەگەڵیدا]. ئنجا کە حاڵ وەها بێ، ئەو (ن)ە چاوگییە کە لە لاوە بۆ وشە بێت و لەگەڵ کۆتایی وشەکەش نەگونجێت چۆن دەتوانێ گونجانی تەواوی پێش خۆی هەڵوەشێنێت؟ بەسەرنج گرتن لە (وشەی کوردی) دەردەکەوێ ئەم دیاردەیەی گونجان و نەگونجانی (دەنگەکانی کوردی) لەگەڵ یەکدیدا هەروەک کاری کردۆتە سەر ئەیوونی وشەی وەک (کارل، مێلڕۆز.) دەخلی زۆریشی بووە بەسەر شێوە و شکڵی گەلێک لە وشەکانی کوردی، بەنموونە وشەی (پڵنگ، pi-ling بڵند bi-lind هەرگیز نەدەشیا (pil-nig, bil-nig) بن چونکە خزمایەتی و گونجانی نێوان (ن، گ) و (ن، د) ڕێ نادات قورساییەکە بچێتە سەر (ن)ەکە. کەچی وشەی (فرمێك، fir-tik) ئەو شێوەیەی وەرگرتووە کە (پڵنگ، بڵند) وەریان نەگرت چونکە دەنگی (ر) لە پێش (ت)دا قورسایی هەڵناگرێ لەبەر ئەمە پێت ناکرێ بڵێی (fi-ritk) وشەکانی (فرشتە (fi-rish-te) کەرستە ke-ris-te)ش ناشێ بکرێتە (ker-si-te ..... fir-shi-te) چونکە گونجانی نێوان دەنگەکانی (ش، ت–س،ت) نامێڵێ لەو شوێنەدا قورسایی بچێتە سەر (ش، س). لە وشەی (برشت، bi-risht)دا سەرەڕای ئەوەی کە (ش، ت) لە لاوە هاتووە بۆ وشەکە، گونجانیشیان لەگەڵ یەکدیدا تەواوە کە نامێڵێ بەقورسکردن لە یەکدی دابڕێن، ئنجا (ر، ش)یش لە پلەی نەگونجاندان .. کەواتە ئەم وشەیە هەر دەبێ ئەم شکڵەی هەبێ.

بەڕاستی ئەم دیاردەیە لە کوردیدا کارێکی وەهای کردووە کە لە هەندێ زمانی دیکەدا نەیکردووە. لە عەرەبیدا هەر بەجارێ هیچ بایەخێك بەو قورسکردنە نەدراوە ناشکرێ پێی بدرێ، چونکە سەرلەبەری داڕشتن و (صرف) و دەنگسازیی عەرەبی لەسەر تێ نەخوێندوەی ئەو قورسکردنە هەڵستاوە. تەنانەت لە عەرەبیدا کورتە بزوێنی (فتحة، ضمة، کسرة)ش بایەخی دەنگەکانی دیکەیان نییە چونکە، بەتایبەتی لە فیعلدا،

ئەو کورتە بزوێنانە لە (تصریف و اشتقاق)دا دێن و دەڕۆن و تێ دەچن و دەگۆڕێن وەك (قتل، قتل، قاتل، استقتل، یقتل، مقاتلة) ئەوەی ناگۆڕێ و تێ ناچێ هەر دەنگە کۆنسنانتەکانی (ق، ت، ل)ە. بزوێنە درێژەکانیش بەقەدەر کۆنسنانت هەمیشەیی و نەگۆڕاو نین بۆیە پێیان گوتوون (حروف العلە) لە وشەی وەك (علم) کە چاوگە ئەو قورساییەی سەر (ل)ەکە نرخی نییە چونکە وشەکە دەبێ حەرەکەی بدرێتێ یا بەفەتحە یا بەکەسرە یا بە (ضمە) هەرکە حەرەکەشی دراپێ قورساییەکە نامێنێ.

ناخێوەری عەرەب لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێك، مامڵەتکۆڕی لەگەڵ ئەو قورسکردنەدا دەکەن. میسرییەکان، بەپێچەوانەی عێراقییەکان، لە حەربەدەر دژی قورسکردنن، بەنموونە لە وشەی (قلب «ثعلب»، شمس)دا هیچ قورسایی ناخەنە سەر (ل، م) وەیاخود دێن ناوی (جیمس بۆند) دەکەن (جیمسی بۆند) تاکو (م)ی (جێمس) لەم قورسکردنە ڕەها بکەن. کەچی عێراقی دەڵێن (دەرووب، گەلووب) لە جیاتی (قلب، درب) تەنانەت لە قسەکردندا (ر)ی پێش (د)یش قورس دەکەن، بەپێچەوانەی کورد، وەك کە دەڵێن (لێلیت الفرد «لیلة الفرد» fe-rid) (فرید الاطرش) چونکە بەئەسڵ میسری نییە لە گۆرانی (احلی همسه)دا دەنگی (ش) لە وشەی (الشجان) وەها قورس دەکات بەدرێژایی ئەلفێکی تەواو لە (ج)ەکەی دادەبڕێ. هەر هۆی ئەوتۆیش بوو وای کرد جارێکیان عەبدولوەهاب بڵێ (فەرید ناتوانێ خۆی لە شامیەتی ڕزگار بکات). لە کوردەواریشدا مامڵەت گۆڕی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە لەگەڵ دەنگەکاندا دەکرێ. لە بەری بادینان هەندێ وشە هەن بەسکوونی تەواو دەست پێ دەکەن، واتە بێ قورسکردن، کە ئەمە لە سۆران و باباندا مومکین نییە. ئەورووبەری هەولێر پتر حەز لە قورسکردن دەکەن تا وڵاتی کۆیە و پێشمانی و ڕانیە و سابڵاغ، تەنانەت ئەسڵە هەولێری وشەیێکی وەك (چی) دەکەن بە (چ)ی قورسکراو.

لە ئینگلیزیدا ئەم قورسکردنە بایەخی پێ نەدراوە لە نووسینیشیایدا دەرناکەوێ هەرچەند بەهێتی لاتینیش دەنووسن، بەنموونە وشەی (film) ئەگەر بەهێزی ئەو داخوازییە بنووسرێت کە بۆ (ڕستن، کردن) کراوە دەبێ (fi-lim) بنووسرێت، بەڵام دیارە لزووم نییە بەو قورسکردنە چونکە کە گوتت (filming) قورساییەکە هەڵدەستێ، خۆ ئاشکرێ یەك وشە بەدوو جۆر بنووسرێت ئەخۆ هەرچی ڕێنووسی هەیە دەشێوێت. سەیرێکی ڕێنووسی ئینگلیزی بکەیت دەبینی لەوێدا ئەو بێ هێزە لە وشەی وەك (rspar row, drill, try, snow, clean)یشدا دەرناکەوێ هەرچەند هەموو دەنگەکانی

پیشەوەشیان کەوتوونەتە پێش کۆنسنانت، خۆ دیاریشە دەنگی سەرەتای وشە کە بزوێنی ئاشکرای بەدوادا نەهات، بەناچاری قورس دەکرێ. هیچ وشەیەکی ئینگلیزی نییە لەم جۆرە بێت و نیشانەی قورسکردنی تێدا بنووسرێت.

لە فارسیدا کێشەی قورسکردنی دەنگی پێش (ن)یش چاوگ بەوەدا هەڵستاوە کە فەتحەی خراوەتە سەری وەک: رەفتەن، کەردەن، ئامووختەن . ئەنانەت ئەم فەتحەیە لە وشەی ئیزافەکراو بۆ هەندێ ڕاناویش هەر بەکار دێت وەک: دەستەت، نامەش، پدەرەم .. جا ئەگەر بشڵێین لە کوردیدا قورساییەکە پاشماوەیەکی ئەم بزوێنەیە هەر دادمان نادات چونکە هەرکە بزوێن نەما دەستوورەکانی دەنگسازی و وشەسازی خۆیان دەسەپێنن چ لەم کێشەیەدا بێت و چ لە شتێکی دیکەی سەر بە ئاخاوتندا بێ.

ئەم باسە گەلێکی بەبەرەوەیە، هەم لە تەرکیبی ناوەکیی وشە و ڕستە کوردی و هەم لەرووی لێکۆڵینەوەی بەراوردی نێوان زمانانەوە، بەتایبەتی چونکە هەر دەنگێک لە دەنگەکانی کوردی وەک ئەوەی لە زاری کوردەوە دێتە دەرێ، نەک لە زاری یەکێکی دیکە، خاسیەتی خۆی هەیە و بەپێی ئەو خاسیەتەش حوکمی تایبەتی لە وشەسازی و دەنگسازی کوردی دەکات.

لە کۆتایی ئەم گۆتارە ناتەواوەدا دەڵێم: قورسکردنی کۆنسنانتی پێش (ن)ی چاوگ بەشێکی بنجیی وشە نییە، نەمی فیعل و نەمی (ن)ەکە ناچارییەکی فۆنەتیکی دەیخاتە کۆتایی فیعلەکانەوە وەک کە دەیخاتە شوێنی دیکە لە هەزاران وشەی کوردیدا، هەرکە ناچارییەکەش نەما قورساییەکە یا دەشێ هەڵستێ لەبەر ئەمە پێویست نییە لە جێگەی وەک (ڕستن، کردن)دا نیشانەی بۆ دابندرێ چونکە نە لە واندا و نە لە شوێنی دیکەدا بەردەوام نییە و ئەمانی بەسەردا دێت، خۆ جابەزیش نییە نیشانە بۆ دەنگی ئەبوویی دابندرێ. هەر چۆنێک بێ دەبێ لە ئەمانیدا نیشانەکەی لابدرێ ئەخۆ ئاخاوتنی کوردی دوای بەهێنێک گۆڕانێکی گەورەی نارەوای بەسەردا دێت چونکە لەم سەردەمەدا (زمان) بە دانیمی دەخوێندرێتەوە ئیتر چۆنی بنووسیت وەهای لێ دێت بەتایبەتی چونکە لە سەدی نەوەد و پێنجی منداڵان دەچنە مەکتەب و (نووسین) دەخوێنن و دەڵێنەوە، مامۆستاکانیشیان هەر ١٠–١٥ساڵێک دەتوانن لە گوتنەوەدا هەڵەی ناو نووسینەکە ڕاست بکەنەوە، وردەوردە مامۆستا و قوتابی دەنووسن و دەڵێن se-ri-man, si-pi-lim.

bes-ti-ne-we

بەستنەوە، سیلم، سەرمان .. تکا و ئامۆژگاری- ئەگەر خوێنەرێك بەبیریدا هات ڕەخنە بگرێ لەوانەی گوتوومن، وەك ئەوەی لە وشەی (بریندار، بەدکار، بەرچنە، بەرگر .. )دا دوا پیتی (برین، بەد، بەر .. ) قورس ئەکران هەرچەند لە لاوەش (.. دار، کار، چنە، گر .. ) بنیادنەوە نووساون باخێرایی ئەکا لە بڕیاردان لەسەر هەڵەبوونی ئەو دەستوورانەی دەنگسازی و وشەسازی کە لەم گوتارەدا باسیان کراوە چونکە باوەڕم هەیە بەشی زۆری ڕەخنەکان وەرامی ڕێکوپێکیان هەبێت، بەداخەوە ئەم گوتارە بەشی ئەوەی نەکرد کە بەشی زۆری تێبینی و بیروڕاکانی خۆشم بگرێتەوە.

ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ٨٠ ، ١٩٨٠

# لەگەڵ دەنگسازیی کوردیدا

لە ژمارەی ٩١ی ساڵی ١٩٨٢ی (ڕۆشنبیری نوێ)دا برای لێهاتوو و دڵسۆزی زمانی کوردی د. ئاوڕەحمانی حاجی مارف بەگوتار لە ژێر سەرەناوی (پێداچوونەوە .)دا چەند ڕەخنەیەکی لە هەندێ بیروڕای من دەربارەی یەک دوو بارێکەڕێی سەر بەفۆنەتێك و ڕێنووس کە لە شەقامەڕێی زمانی کوردی دەکەنەوە گرتبوو، هەندێکی دیکەشی بەهێی بەڵێنی خۆی هێشتبۆوە بۆ گوتارێکی دیکەی. بەر لەوەی چاوەچاوی گوتارەکەی دیکەی بم وام بەپەسەند زانی هەر لە ئێستاوە دەست بەرم بۆ شیکردنەوە و گرفت ڕەواندنەوەی ئەو حاڵانەی کە نووسەری بەڕێز بەلای قەناعەتی خۆیدا شکاندبوونیەوە چونکە دەشێ ئەو سەرسووکییە و دەست و قەڵەم ڕەهاییەی ئێستا کە لە خۆمیدا شك دەبەم لە ماوەدا وێی بکەم و لایەنی خۆ ڕوونکردنەوە و بیروڕا دەربڕینم لێ وەتەنگ بێت. ئەوەی ڕاستیش بێ چەندێکی بڵێی بەدەست ئەم نووسینەمەوە ناڕاحەتم چونکە مخابنە دوو کەسی هێندەی د. ئاوڕەحمان و من لە یەکدی نزیك ڕووبەڕووی یەکدی بن لەو باسانەدا کە دەبوو بەگفتوگۆ و لە یەکدی حاڵیبوون تێیاندا بگەنە ڕایەك کە هەردوولا لێی ڕازی بن وەیا هەر نەبێ بەڕاوێژی جوداییی بیروڕا لە نێوانیاندا تا ڕادەی لوان و ئیمکان وێك بێتەوە. ڕەنگە هۆی ئەو لێك ترازانەمان ئەوە بێ کە د. ئاوڕەحمان خوێندنی زمانی لەسەر دەستی پرۆفیسۆر و بەپێی بەرنامە و هەلومەرجی سەلمێندراوەوە تەواو کردبێ منیش لە ڕێگەی لێکدانەوەیەکی خود بەسەرەوە بێ ڕابەر بەرەو ناو توێژەکانی زمانێکەوە چوویێتم کە هەر بەقەدەر دەنگدانەوەی وشە و دەستەواژە و ڕستەکانی لە هۆش و دەروونمدا سەرەدەری لە دەستوورەکانی بکەم، کە لەوێدا د. ئاوڕەحمانیش وەك من خاوەن پشکە هەرچەند دەشێ دەستووری دەنگرتووی ناو بەرنامە ڕووپێوێکی ئەو پشکە لە مرۆڤ گل دەنەوە بۆ بڕیارە یەکجارەکیانی خۆی وەیا، لە بارێکی دیکەدا، بەشێکی ئەو هەلانەی کە گەشتی بێ ڕابەر بەمرۆڤی وەکو منی دەکات بەڕۆشنایی ئەو دەستوورانە ساغ بکرێنەوە.

لە پێشەکییەکانی گوتارەکەدا یەك دوو حاڵی سەرەتایی فۆنەتیکی سەر بەڕێنووس لەوەوە نەختێك بەهەڵە بەر حیساب دەکرێن کە هاتوون بیهێنی من وەیا غەیری منیان

لە بەڵگەکانی دابڕیوە و بەسەھووی رووتیان لە قەڵەم داوە وەك کە لە ستوونی یەکەمی لاپەرە (١٢) دەخوێنینەوە (..... چونکە ئاشکرایە (ن)ی چاوگی هیچ کاتێك دەنگی کۆنسنانتی ناکەوێتە پێشەوە و رواڵەتی نووسینی کوردی بەئەلفوبێی عەرەبی و نەبوونی وێنەی (أ) تێیدا، بووەتە هۆی ئەوەی هەندێ لە نووسەران هەڵەی تێدا بکەن). ئەم نیشانادانە وەها رادەنوێنێ کە ئەوانەی قورسکردنی دەنگی پێش نوونی چاوگ بەمزوێن دانانێن هەستی پێ ناکەن هەر لەبەرئەوەی کە لە رێنووسی کوردیدا نیگار بۆ ئەم قورسکردنە دانەندراوە. بەلام خوا و راستان، لە دواتردا بۆ منی تێ دەهێنێتەوە کە دەڵێ (.. هەرچی مامۆستا مەسعوودە بەقورسکردنی دادەنێ).

من لە نوسینی لێرە بەپێشەوەمدا بەولای نوونی چاوگەوە بۆ راستیەکی گەلێك وتتر لە نوونی چاوگ، کە زۆر بەرچاوە، رۆیشتووم کە لە لێکدانەوە و سەرنج راگرتندا دیاردەیەکی دیکەی (چاوگی)م دۆزییەوە لەوەدا کە دەبێتم ئەو دوو کۆنسنانتەی (د، ت) دەکەونە بەرابیی نوونی چاوگ، ئەوانیش بەفەرمانی فۆنەتیکی زمانی کوردی چەند کۆنسنانتێکی دیارکراو دەهێننە پێش خۆیان. هەرچی (د)ە یا دەنگی (ن) یا دەنگی (ر) پێش خۆی دەیەخێت وەك (بەرزاندن، چاندن، کردن، مردن....) لەوە بەولاوە هیچ کۆنسنانتێکی دیکە قبوول ناکات. دەنگی (ت)ش هەر بەحوکمی سروشتی دەنگەکان (س، ش، ر، ف، -، و) لە پێشەوەی دێن.. هۆی دیاردەکەش دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی ئەو گونجان و نەگونجانەی دەنگەکانی کوردی کە چەند جارێك باسم کردووە و ساغم کردۆتەوە کە گونجانی (ن، د–ر، د) لەوانەیە رێ نادات قورسکردن بخرێتە سەر دوو دەنگی (ن، ر) لە بەرابیی (د)، رێش نادا قورسایی بخرێتە سەر (س، ش، ر) لە بەرابیی (ت)دا هەرچی دەنگی (ف) کەمتر لەوان گونجاوە بەلام ئەویش لە دەنگەکانی دیکە پتر حەز بە(ت) دەکات، واش دەزانم کە بەشێکی کورد ئەم دەنگەی لە بەرابیی (ت)ی چاوگدا گۆڕیوە بە(د) هەر لەبەر پتر گونجانی (د)ەکەیە لەگەڵ (ت)دا. نموونەکانی خوارەوە قسەکان روون دەکەنەوە:

بەستن، رستن

کوشتن، مشتن

گرتن،

کەفتن، هەفتن (کەوتن، حەوتن)...

بەلام دەبێ بڵێین دەنگی (ن)یش لەگەڵ (ت)دا گونجاوە کەچی لەپێش (ت)ی چاوگەوە نایەت. کاتێ خۆی بۆ ئەوە چوو بووم کەوا ڕەنگە زێدە گونجانی (ن) لەگەڵ (د)دا وەهای کردبێ بەتەواوی بۆ خۆی بدزێتەوە.

ئەم ڕایەش لە دوو ڕووەوە پتر خۆی لە قەناعەت نزیك دەکاتەوە.

یەکیان ئەوەیە کە گونجانی (ن) و (د) وەهای کردووە لە سلێمانی منگە و (غنە)یەك لە نێوانیاندا پەیدا بێ کە (د)ە کە بکات بە(گ) و بگوترێ (دەربەنگ، مەنگ، نەفەنگی..)

دووەمیان ئەوەیە بەشێکی ناخێوەری دەوروبەری مەرگە و باشووری ڕانیە هەموو (د)ەکانی پێش نوونی چاوگ دەکەن بە (ت) و دەڵێن (کرتن، مرتن، برتن – لە بری کردن، مردن، بردن) کەچی (د)ی پاش (ن) وەك خۆی دەهێڵنەوە و دەڵێن (چاندن، ستاندن...)

تا ساڵی ١٩٧٥یش ئەم دیاردەیە هەر ئەدیتن ئەبوو، لەوە بەولاوە بە هۆی پەیدابوونی گۆمی بناوانی (دوکان) و ژێر ئاوبوونی بەشێکی زۆری ئاوایی ئەو ناوچەیە خەڵقەکە بڵاوەیان لێ کردو لە نیشتەجێبوونی دواتردا تێکەڵ بە ئاخێوەری جۆرجۆری زارەکانی کوردی بوون، منیش لەو ساڵەوە پێوەندیی هاتوچۆم بەو ناوەوە کەم بۆوە کە ئیتر نەتوانم گوێبیستی ئاخاوتنیان بم، بایی ئەوەی بیروڕای لێ هەڵێنجرێ.

دواتریش گوتارەکە لە بەرەو کۆتاییی ستوونی سێیەمی لاپەڕە (١٣) و ستوونی یەکەم و دووەمی لاپەڕە (١٤)دا کە ئەختێك دەوری (دەنگ، پیت، فۆنیم) هەڵدێت پارمەتیی ئەو خوێندەوارانە دەدات کە بەتەواوی لە باسی فۆنۆلۆجی و ڕێنووس نابەڵەدن بەلام کە دەڵێ (فۆنیم... بە تەنیا خۆی هاوەتی مانا و واتا نییە) لێرەدا ڕوونکردنەوەیەك هەڵدەگرێ:

فۆنیم، دەنگی لغوی – ئەلفوبێ، لە ناو توێژی وشەدا بە تەنها واتا نابەخشێت وەك ئەوەی سێ دەنگی (د، ا، ر) لە وشەی (دار) دا هیچیان خۆی لە خۆیدا واتای نییە بەلام کە بڕیارمان دا دەنگی (م) وەیا (ت) وەیا (ی) فۆنیمە چارمان ناچارە دەبێ بڵێین لە (برات)دا ئەم (ت)ە واتای هەیە چونکە ڕاناوە و دەلالەتی (تۆ) دەبەخشێت. لە (برام)دا دەنگی (م)یش کە فۆنیمە واتای (من) دەبەخشێت ... (برای)...

ئەختێکی دیکەش ماوە لەبارەی واتاداری و ئەداریی فۆنیمەوە بدوێین. زمانزانانی

عەرەبی بەر لە ١٠٠٠ ساڵ پتر، لە (فقه اللغة) بۆ ئەوە چوون کە هەر فۆنیمە (لە تەعبیری ئەواندا «حرف») لە وشەدا دەلالەتێکی هەیە. ئەم باسەش لە ژێر سەرناوی (الأشتقاق الکبار) لێی کۆڵراوەتەوە. یا هەر نەبێ من لە ژێر ئەم سەرەناوەدا خوێندوومەتەوە. لەم مەیدانەدا (أبن جنی و أبوعلی الفارسی) بەتایبەتی یەکەمیان، کە وابزانم قوتابیی دووەمیشیان بووە، دەستی باڵای هەبووە.. بەهەمە حاڵ ئەوانیش ناڵێن هەر حەرفە مەعنای مەفهوومی هەیە، تەنها ئەوەندە دەڵێن کە هێمای بەرەو راگەیاندنی واتا هەیە.. لێرەدا ئەگەر سەرڕەوی و درشتییەك لە نووسینەکەمدا هەبێت بە بەخشینی خوێنەری دەدەمەوە چونکە دەمێکە ئەو باسانەم بەسەردا تێپەڕیوە ڕێشم نییە بگەڕێمەوە بۆ سەرچاوەکانیان، گوتنیشیان بێ زەرەرە، مەگەر کەم و کەسرییەکی تێیاندا بێت لەسەر من حیساب بکرێ و بەزەرەری خۆم تەواو بێت.

بەر لەوەی بێمە سەر خۆ روونکردنەوە لەبارەی ئەو نوختە تێگایانەی تێیاندا یەکدی ناگرینەوە، تێبینییەکی گشتی هەیە چاکە بگوترێ.

ئێمە، نووسەرانی کورد، بە زۆری (Phonology – فۆنۆلۆجی) و (Phonetic – فۆنەتیك) تێکەڵ دەکەین و باسی ناو یەکێکیان بۆ ئەوی دیکەیان رادەگوێزین. بەلای منەوە هەرچەند وا باشە باسەکانی یەك بابەت لەو بابەتەدا لێی بکۆڵرێتەوە، وەها هەر نەبێ کە پەڕییەوە بۆ ناو بابەتێکی دیکە ئەنگوستێکی بۆ رابکێشرێ، دیسانەوە بەمەرجێکی هەڵە و پەڵەبردن لە بەینێدا نەبێ کەس لەو راگوێستنە و تێکەڵکردنە زەرەر ناکات.

من هیچ رەخنەیەکم نییە لەوەدا لە ناو توێژی (جیۆگرافی)دا راستییەکی گرنگی (دیمۆگرافی) بخوێنمەوە، بە نموونە، لێکۆڵینەوە لە سروشتی دەنگی هەمزە خۆی لە خۆیدا سەر بە فۆنۆلۆجییە بەڵام دۆزینەوەی دەوری هەمزە لە ئاخاوتنی کوردیدا سەر بە فۆنەتیکی کوردییە، کەچی هیچ بەرهەڵستیم نییە لەوەدا کە نووسەرێك بێت و لە دەمی دەرخستنی سروشتی دەنگەکەدا بابداتەوە سەر هەمزەی کوردی و رایەکی رابەری تێدا دەربڕێت. ئێمە هەرچەند کە دەبێ رێکوپێکیی بەرنامەی زانستی لە توێژینەوەدا رەچاو بکەین، نابێ وەتەنگ بێین لەوەی کە سەرەتاییمان لەو ئەرزە باسانەدا سنووری دوو دراوسێی هێندە بێ سنووری وەك فۆنۆلۆجی و فۆنەتیکمان بێ ببەزێنێ. ئەوەی راستیش بێ فۆنۆلۆجی لەوەدا بایەخ پەیدا دەکات کە ببێتە چرای

مەڵبەندی فۆنەتیك. دەنا بۆ خۆی بە تەنها و دوور لە فۆنەتیکی زمان و ئاخاوتنی سەرزاران لەوە تێپەڕ ناکات کە ئارایشتی ئەزۆکی رۆشنبیری بێت بە تایبەتی لە ئاست زمانی کوردیدا کە پێویستی بەئاوکێڵکردنی ریزی وشەکانی و لەراندنەوەی داوی تەعبیرەکانی هەیە نەك بە تێوەرامانی لەسەر بەرزایی زمانناسییەوە بە دووربینی فۆنۆلۆجی. لەگەڵ هەموو رێزێکم بۆ ئەو بەرزایی و ئەو دووربینەدا.

بەتەما نیم لەم گوتارەدا وردورد شوێن هەنگاوی نووسینەکەی د. ئاورەحمان هەڵگرمەوە و پێبەپێ رەخنە و بیروڕاکانی جوابەجێیی لەگەڵدا بکەم چونکە ئەم کارە لە رادەبەدەر درێژەدایێنە. لە تێکڕای نووسینەکەیەوە چەند خاڵێکی بنجی دەکەمە روانگەی سەرەتاکە بەملا و ئەولای باسەکاندا. لەوەشدا بەناچاری لێکدانەوەی ئەرتۆ دەخەمەوە بەر سەرنجی خوێنەر کە لە نووسینی دیکەمدا پێیاندا تێ پەڕیومتم، بەڵام بەدەم گوتانەوەی کۆنە خەرمانی وشەکارییەوە گوڵ و دانەی نەکوتراو و دیتراویش رەگەڵ پێ گێرەی ئەمجارەیان دەکەوێت.

خاڵی یەکەم ئەوەیە لەبارەی (کسرة مختلسة)وە بگوترێ. ئەو کەسرەیەی فۆنۆلۆجیستەکان بە بزوێنی دادەنێن و منیش بەقورسکردن:

ئەم دیاردەیە لە ئاخاوتندا شتێك نییە هەستی سەرنجدەری بەسەردا بکشێت و تێی هەڵنەنگوێت. تەنانەت هێند زەق و بەهێزە زمانزانانی عەرەب بەر لە ۱۰۰۰ ساڵ پتر ناوی (کسرة مختلسة)یان لێ ناوە بە پێتۆڵیش لە بارەیەوە دواون هەر بەپێ سروشتی زمانەکەشیان لە نووسیندا نیگاریان بۆ دانەناوە وەك کە بۆ کورتە بزوێنەکانیان داناوە چونکە ئەم (کسرە)یە لە عەرەبیدا تەنها لە دەنگی پێش دەنگی کۆتایی وشەدا دەردەکەوێ کە هاتیت و بێ (اعراب) وەستاندت. وشەی عەرەبیش لە رستەدا بێ (اعراب) نابێ. بە نموونە رستەی (هذا بکر) دەبێ (ر)ەکەی کۆتایی (بکر) تەنوینی بدرێتێ کە دەکاتە (ضمە و نون) و دەگوترێ (هذا بکر،- بەکرون) کە هاتیت تەنوینەکەت بۆ مەبەستی ئاسانی، تێ برد ئەوسا قورسایی وەیا (کسرة مختلسة) دەکەوێتە سەر دەنگەکەی (ك) - لەگەڵ ئەمەشدا رەخنەیەکم هەیە لەو ناوەی (کسرة مختلسة) بە تایبەتی کە وەیال دەنگی واو بدرێت چونکە ئەم دەنگە خۆی (ضمە)ی درێژە، کە بە کۆنسنانتیش دەردەبڕێ تامی (ضمە)ی هەر تێدا دەمێنێ کە ئیتر دەنگی (کسرە) قبووڵ ناکات. لە وشەی (دور - دەور)دا قورسایی سەر (و)ەکە دەنگی (ضمە)یە نەك (کسرە) هەر ئەم خەسڵەتەی بوونی دەنگی (ضمە) لە (و)دا وای لە

نووسەری کورد کردووە کە وشەی (وورچ، ووزە ..) بە دوو (و) بنووسێت کە یەکێکیان واوی کۆنسنانت و ئەوی دیکەشیان کورتە بزوێنی (ضمە)یە.

ڕێکەوت وا بوو مامۆستا تۆفیق وەهبی لە ١٩٢٩ بە نووسین باسی ئەم دیاردەیەی کردووە. نیگاری بۆ داناوە دەنا مەلاکانی کورد لەوەتەی دەخوێنن و دەرس دەڵێنەوە ئەم (کسرة مختلسة)یان بەسەر زمانەوەیە. مامۆستا وەهبیش لەوانەوە سروشتی کورتە بزوێنی (ی)ی بۆ قەرارداده کرد بەچکەی (ی)ە بەڵام لە خوێندنەوەی نوێیەوە بۆ ئەوە چوو کە نیگاری بۆ دابنێت. ڕۆژئاواییەکان لە نووسینی ئێستاکەیاندا لە زۆر حاڵ و باردا گوێ نادەنە ئەم (کسرە ..)یە تا هەموو جارێك نیگاری بۆ دابنێن. بە نموونە کە دەنووسن (burn,turn,Worn) نیگار بەدوا پیتی (آ)دا نانووسن هەروەهاش نیگار نایەخنە دوای ئەو پیتەی کە لە سەرەتای وشەوە بێ بزوێنی ئاشکرا دێت وەك (Crow,Screen,please,bring) و هی تریش... وەك د. ئاورەحمان نووسیوەتی، ئەم دەنگە بارتەقای بزوێن برگە لە وشەدا دروست دەکات. بەڵام شتێك ماوە لێرەدا د ئاورەحمان نەیگوتووە دەبوو بڵێ ویرای برگە دروستکردن ئاوازەش پەیدا دەکات لەو دەنگە کپانەدا کە لەگەڵیاندا دێت، لەویشدا هەر بارتەقای بزوێن کار دەکات بەڵام دوو تێبینی گرنگ و گرنگتر هەن نابێ پشتگوێ بخرێن چونکە ڕووناکی دەخەنە سەر سروشتی دیاودەکە:

یەکەم: ئەوەیە گەر ئەم دیاردەیە بزوێن بایە و بەرەو کەسرەش بایە دەبوو لە دەربڕینی کاف و گافی سەرەتای وشەی کوردیدا ئەو کلۆرییە پەیدا بکات کە بزوێنی کورت و درێژی (ی) پەیدای دەکات. دەبوو کافی (کردن) و گافی (گرتن) کلۆر کرابایانە. جا ئەگەر بگوترێ بزوێنەکە هێندە بەهێز نییە ئەو کارە بکات دەڵێم منیش لەوە پتر داوا ناکەم کە دیاردەکە بایی بزوێنی کورت کاریگەر نەبێ. کاف و گافی ئەوتۆیی ئاوەندی وشەش هەروەهایە (شەکر، سەگرمە).

تێبینییە گرنگترەکە ئەوەیە کە سەرنجی ورد دەری دەخات ئەم قورسکرنە لە هەموو حاڵدا ئاوازە پەیدا ناکات، هەرچی بزوێنە، کورت و درێژی، هەمیشە ئاوازەدارە. لەگەڵ خۆتدا بێ تەرەفانە وشەی (ستاندن) بڵێرەوە دەبینیت ئاوازە بەدوا دەنگی کپی (س)دا نایەت هەرچەند قورسکردنی بەسەرەوەیە . بەڵێ دەزانم کە بتەوێ دەتوانیت ئاوازە پەیدا بکەیت بەڵام کاری ئانقەست جودایە لەگەڵ فەرمانی فۆنەتیك. لە وشەی (شت)دا ئاوازە بەدوا (ش)دا دێت بەڵام کە گوتت (شتەکان) ئاوازەکە لە دەنگی (ش)ەوە نایەت.

وشەی (قت) ئاوازەی هەیە بەڵام کە گوتت (قتار) ئاوازەکە لە (ق)ەوە دەڕوات بۆ (تا). دیارە دەنگی (ر)یش هەر ئاوازەی هەیە هەرچەند وەستاویشە چونکە دەنگێکی ئاوازەدارە.

فۆنەتیکناس کە بۆی ئاشکرا بوو ئەم دیاردەیە لەو بارانەدا ئاوازە پەیدا ناکات دەبێ بسەلمێنێ بزوێن نییە و شتێکی دیکەیە بە نیسبەت دەنگناسی کوردەوە تێبینییەکی تاقیکەرەوە هەیە کە بۆ غەیری کورد دەست نادات.

دەزانین لە زۆر شێوە ئاخاوتنی کوردیدا کە (ل)ی وەستاو کەوتە بەرایی (ت)، دەنگەکەی (ل) بۆ خۆی دەبێتە (ڵ)، لامی قەڵەو، دەنگەکەی (ت)یش وەك (ط)ی عەرەبی لێ دێت، بەڵام کە بزوێن کەوتە بەینیانەوە وەکو خۆیان لاواز دەمێننەوە. دەگوترێ (قەلتارە – قەڵطارە، پاڵتۆ – پاڵطۆ، پالتە– پاڵطە .. هتد).

جا ئەگەر ئەم دیاردەیە لە تاقیکردنەوەدا بدەینە بەر سەلیقەی دەنگناسمانەوە ئاخۆ بەچ ئاکامێك دەگەین؟

با بهێنین وشەی (خلت، خلط) کە (ل)ەکە تێیدا بەوەستاوی دەکەوێتە پێش (ت، ط)ەکەوە و بە هەموویان یەك بڕگەن، بیکەین بە دوو بڕگە و بڵێین (خ–ل–ت) ئایا لامە قەڵەوەکە لاواز دەبێتەوە یا هەر بە قەڵەوی دەمێنێتەوە؟ ئەوەی من وەك بەدیهییەی دەزانم ئەوەیە کە لامەکە بە قەڵەوی دەمێنێتەوە و بە دوا خۆیدا (ت)ەکەش قەڵەو دەکات.

ئایا ئەگەر (کسرە مختلسە)ی سەر (ل)ەکە بزوێن بێت ڕێ دەمێنێ لامەکە قەڵەو بکرێ؟ دەزانم لە کوردیدا لامی پێش تێ هەمیشە بەوەستاوی و بێ قورسکردن دێت بەڵام بۆ مەبەستی تاقیکردنەوە مانیع نییە قورسایی بخەینە سەر (ل)ەکە هەروەك مانیعیش نییە بە نیازی تاقیکردنەوە بڵێین (کڤ) کە دەزانین هەرگیز دەنگی (ك) لە کوردیدا پێش (ق)یش نایەت. بەهەمە حاڵ ئەم تاقیکردنەوەیە دەڕژێتەوە بە بڕیاری سەلیقەی دەنگناسی، یەکێکیش بەوێ ئەنجامەکەی نەسەلمێنێ دەتوانێ پێ لەسەر ئەو شتە داگرێ کە خۆی ئارەزوویەتی. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بڵێم ئەگەر تاقیکردنەوەکە لامە قەڵەوەکەی پاراست، ئیسپاتی بزوێن نەبوونی (کسرة مختلسة)کە دەکات. ئەما ئەگەر قەڵەوییەکە هەڵستا ئیسپاتی بزوێنبوونی کەسرەکە ناکات چونکە ئەوسا ڕێ هەیە بڵێین ئەو قورسکردنە هەروەك ئاوازەی پەیدا کرد، بووە لەمپەریش لەنێوان (ل) و (ت)دا. جگە لەوە بەڵگەیەکی دیکە هەیە لە نووسینەکەی د. ئاورەحمان حزیەوە

هەڵبەستێ هیچ کەلەبەر لە باسەکەدا ناهێڵێتەوە و بزوێنەبوونی ئەو دیاردەیە بە نیسبەت دەنگەیەتی بە مەرجێك بەڵگە سەلمێن بێن.

ئەم بەڵگەیە لە دراوسێیەتیی باسی بزوێنەکە لەگەڵ باسی فۆنیمدا خۆی دەسەپێنێ. وا بەباشی دەزانم لێرەدا بەدەم ساغکردنەوەی حاڵ و باری (کەسرە)وە چەند شیکردنەوەیەکی ڕوونترکەرەوەش لەبارەی فۆنیمەوە بهێنمە ناو نووسینەوە، کە ئەویش لەلای خۆیەوە بە تێکڕایی هەم یارمەتی ئەسڵە باسەکە دەدات و هەم پتریش نیگای خوێنەر بۆ بینینی کێشەی فۆنیم فروان دەکات.

فۆنۆلۆجیستەکان، کە د. ئاورەحمان لەوانەوە باسی فۆنیممان بۆ دەگێڕێتەوە ئەوە دەڵێن کە لە گوتارەکەدا بە کورتی نووسراوە، واتە (فۆنیم بەو دەنگانە دەگوترێ کە لە زماندا وشە پێك دەهێنن و بە گۆڕان و نەمانیان واتا دەگۆڕێن)

لێرەدا دەق تەعریفەکەی د. ئاورەحمانم نووسییەوە تاکو ئەگەر ڕەخنەیەکم هەبوو خۆی بکەم بەشایەدی جوداوازیی بیروڕای هەردووومان.

کە تەعریفەکەی سەرەوە بکەینە کێشانەی لێکدانەوەمان دوو ناکامی لێ پەیدا دەبێ لەگەڵ هەندێ لە ڕایەکانی د. ئاورەحماندا ڕێك ناکەون:

یەکەم: نابێ فۆنیم لە دەنگ گرنگتر بێ چونکە فۆنیم خۆی دەنگە و هەرچی بایەخ و گرنگییەکی هەبێت بەر دەنگیش دەکەوێت. بەڵام بایەخی ئەو دەنگە پارچەدەرانەی کە فۆنیم نین هەر بۆ دەنگ دەمێنێتەوە وەك کە دەڵێن هەموو ئادەمیزادێك گیانلەبەرە چی لە نرخی مرۆڤایەتیدا هەیە لە جنسی (گیانلەبەر) دەرناچێ. بەڵێ، ڕاستە بگوترێ ئەو دەنگانەی فۆنیمن گرنگترن لەو دەنگانەی فۆنیم نین.

دووەم: بەدوا ئەو تەعریفەدا باوەڕ بەو بەدیهییە دەکەین کە هەر دەنگێکی (لغوي) لە پێکهێنانی وشەدا بەشدار بێت و بە نەمان و گۆڕانی واتا بگۆڕێت ویا نەمێنێت فۆنیم بێ، بەو پێیە دەبێ دەنگی هەمزەش فۆنیم بێت چونکە هەموو مەرجەکانی تێدا هاتۆتە جێ کەچی گورج لە فونێمی دەخرێت... بەڵام با جارێ واز لە هەمز بهێنین و لەگەڵ فۆنیم خەریك بین.

تەعریفەکە هەموو ئەو دەنگانەی لە پێکهێنانی وشە بەشدار نین لە جنسی (فۆنیم)یان دەردارێت وەك لرفە و فیکە و کۆکە.. و هتاد ... هەروەهاش ئەو هێز و سستی و بەرزی و نزمی و توندی و شلکییەی کە بە پێی داخوازی دەربڕینی توورەیی

و ڕەمزامەندی ... و.. ئەو جۆرە هەستانە تێکەڵ بە دەنگی وشە و ڕستە دەبن ئەوانیش فۆنیم نین. ئەوەندەی بزانم دەنگناسان لەبارەی فۆنیمنەبوونی دەنگ دوابن هەر ئەوەندەیە کە د. ئاوڕەحمان لە گوتارەکەیدا باسی کردووە منیش ڕام گوێستە نێرەکانە بەڵام لە هەڕێکبوونی خۆمەوە بەو تەرزە باسانەی هۆش و دڵ دادەگرن بۆ فۆنیمنەبوونی هەندێ دەنگی دیکە چووم کە وەک دەنگی (الغوي) دەبیسرێن بەڵام لەبەر جۆری دەربڕینیان و تێکەڵنەبوونیان لە پێکهێنانی وشە ناشێ فۆنیم بن

زۆربەی دەنگە کپەکان بەهەریانەوە هەیە لە ڕێی بردنە ژوورەوەی هەناسە بۆ ناو دەم و سی، نەک هەر بە هێنانەدەری، پەیدا بێن. هێندێک لەو دەنگانەش وەک (ف، ث، هـ) بە ئاسانی لەو بەرەوازییەوە پەیدا دەبن، تۆ بینە زمان و لێوت بۆ دەربڕینی دەنگی (ف) وەیا (ث) ئامادە بکە و لە دەرەوەی زارتەوە بەرەو ناوەوەی هەوا هەڵمژە دەبیەیت دەنگی (ف، ث) پەیدا دەبێت. دەنگی (هـ) لەوانیش لەبارترە: هەر ئەختێک خۆت هەناسەسوار بکە و زارت بکەرەوە بۆ هاتوچۆی هەناسەت، دەبیەیت بە درێژایی هەناسەسواریت دەنگی (هـ) بەرەو دەرەوە و بەرەو ناوەوە پەیدایە. دوور نابینم لە کوردیدا وشەی (هەناسە) بە ئەسڵ لەو دیاردەوە ساز درابێ کە لە پێشەوە بە(هە) دەست پێ دەکات، ئینجا ناشزانم کەرتەکەی دیکەی (.. ناسە) لە چییەوە هاتووە وەیا وشەکە بەدرێژبوونەوەی ڕۆژگار چەند دەنگی لێ سواوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەو تەرزە دەنگانە کە برای دەنگی سروشتین هیچ کاتێکیان نابنە فۆنیم چونکە ناتوانێ دەنگی دیکە بەدوا خۆیدا بهێنێت و وشە دروست بکات، جگە لەوەی کە هەرگیز ناتوانێ ئاوازە پەیدا بکات چونکە ئاوازە لەپێکی قوڕگەوە بەرەو دەرەوە دەردەچێت هەر بۆیەشە دەنگی ئاوازەدار بەرەو ناوەوە پەیدا نابێت.

جگە لەم دەنگانە دەنگی (کسرة مختلسة)ش هەر بەپێ تەعریفەکەی د. ئاوڕەحمان بۆ (فۆنیم) ناشێ فۆنیم بێت. ئەمەش بەڵگەی قسەکەم:

وشەکان (shetil, bizin, bezim, golim, genim, kirim, merij) لەم جێگەیەدا تاقی دەکەینەوە دەبینین هەموویان (کسرة مختلسة)یان لە دەنگی پێش کۆتاییاندا هەیە، ئنجا با بڵێین:

bezmurezim - golme sawar - genmit bird - kirmeke - merjit girt -
shetle gul - bizne merez

له هەموو وشەكاندا دەنگەكەی كەسرە موختەلەسەی برگەی دووەمی وشەكان نەما. ئەگەر فۆنیم بوایە دەبوو واتای وشەكان گۆڕانیان بەسەردا بێت وەیا واتاكەیان تێ بچێت كەچی وەكو خۆیان ماونەتەوە (genim) بوو بە( genm) هەروەهاش وشەكانی دیكە لە هەمان شوێندا (كسرة..)كەیان دۆڕاند و واتایان نەدۆڕاند. تۆ بڵێی بەرانبەر ئەم ڕاستییە پرۆفیسۆرە زلەكانی فۆنۆلۆجی چیمان جواب بدەنەوە؟ هەرچی بیڵێن بایی فلسێك ناكات چونكە بەو تەعریفەی ئەوان بۆ فۆنیمیان داناوە دەنگەكە فۆنیم نییە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ بەر لەوەی ئەم تاقیكردنەوەش فۆنیمنەبوونی دەنگەكە بەنیسبەت بگەیەنێ، هەر چونكە دەنگەكە پێداویستێكی فۆنەتیكییە و لە دروستكردنی وشەدا دەوری نییە نابێ بەفۆنیم دابندرێ.

ڕەنگە بگوترێ لەو تاقیكردنەوەیەدا هەرچەند دەنگەكەی بەرەو كۆتایی وشەكان تێ چوو بەلام لە برگەی دواتردا بەدەركەوتەوە. لە وەرامدا دەڵێم

١- ئێمە قسەمان لەمان و نەمانی فۆنیمە یەكەیتەرەكانی ئەو وشانەیە. چ هەقێكمان بەسەر ئەو دەنگانەوە نییە كە لە وشەكانی پێشووتر هەبووبێتن وەیا لە برگەی دواتر پەیدا بېن.

٢- ئەو (كسرة مختلسة)یەی دواتر لە برگەیەكی دیكەدا پەیدا دەبێ یەكێ لەسەر تێچوونی (كسرة..)ی پێشووتر نەكەوتووە چونكە خۆی دەبێتەوە پێداویستێكی فۆنەتیكی بۆ ئەوەی بتوانرێ وشە وەیا كەرتی وشە دەربېردرێ.

گوتارەكەی د. ئاورەحمان لە مامۆستاكانی فۆنۆلۆجییەوە بڕیارێكی یەكجارەكیمان پێ ڕادەگەیەنێ كە دەڵێن برگە بێ بزوێن نابێ، بەمەشدا (كسرة مختلسة) لە خۆوە و لە پەنا ئەو بڕیارەدا دەبێتە بزوێن، كە بوو بەبزوێن یەكسەر دەشبێتە فۆنیم. ئەم بڕیارە لە مامۆستاكانەوە پێی دەڵێن (مصادرة على المطلوب – دزینەوەی مەبەست) چونكە بەر لەوەی بزاندرێ ئایا ئەو (كسرە.)یە هێز و قورسكردنە وەیا بزوێنە لە ڕێی ئەو بڕیارەوە دەبێ بەبزوێن. ئێمە دەزانین بزوێن برگە دروست دەكات بەلام هەر چونكە قورسكردنیش برگە دروست دەكات مەرج نییە بزوێن بێت، بەتایبەتی پاش ئەوەی دیتمان ئەو قورسكردنە لە هەندێ حاڵدا ناوازە پەیدا ناكات، ئینجا زانیشمان بەتێچوونی واتای وشە ناگۆڕێت. هەرچۆنێك بێ بامزانین برگە لە ناخاوتندا چەند پلەی هەیە:

١- برگەی هەرە کورت لە کۆنسنانتێك و قورسکردن پەیدا دەبێ وەك وشەی (چ)

تۆ کە حۆری وەرە نێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی
لـەم دڵـەی پـڕ شەرەر و سینـەیی سووزانەدا

٢- برگە هەیە لە کۆنسنانتێك و کورتە بزوێنێك پێك دێت وەك (دە، تە، مە..)

٣- برگە هەیە لە کۆنسنانتێك و بزوێنێکی درێژ پێك دێت وەك (با، دۆ، سێ)...

٤- برگەی دوو کۆنسنانت و قورسکردن وەك (مز، دڕ، گل...)

٥- برگەی دوو کۆنستانت و بزوێنێك وەك (مەڕ، کەس، کوڕ)...

٦- برگەی دوو کۆنستانت و بزوێنێکی درێژ وەك (مار، تیژ، خۆش..)

٧- برگەی سێ کۆنسنانت و قورسکردنێك وەك (بست، مشت، مرد، بنج)

٨- برگەی سێ کۆنسنانت و کورتە بزوێنێك وەك (بەست، کورد، بیست .)

٩- برگەی سێ کۆنسنانت و بزوێنێکی درێژ وەك (کارد، ماست، دانگ. )

ئەم برگانە پێیەم‌ێ درێژ دەبنەوە لە پلەی یەکەمەوە تا پلەی نۆیەم، نە لە یەکەم بەولاوە و نە لە نۆیەم بەملاوەشەی یەك برگەیی پەیدا نییە. دەمەتەقەیەك هەڵدەستێ لەسەر ئەوەی ئایا لە دەربڕینی دەنگی وەکو (س، ش، ژ، ز..)دا بێ ئەوەی هیچی دیکەیان بەدوادا بێت برگە پەیدا دەبێ؟ ئەگەر برگە نییە ئەدی چییە؟ دەنگی وەکو (د، ك، ت، ب..) دەرنـابڕدرێن ئەگەر قورسکردنیـان لـەگەڵدا نـەبێ چونکە درێژکردنـەوە هەڵناگرن هەرچی ئەوانی دیکەن درێژکردنەوە هەڵدەگرن.

بەهەمە حاڵ ئەم وردەبێژییە لێرەدا لزوومی نییە و دیاریەکە بۆ بینینی خوێنەر بـەجێ دەهـێڵم و دەچـمـەوە سەر ڕچـەی بـاسـەکە. بـەلای بـاوەڕی خـۆمـەوە، کـە لـە تاقیکردنەوەشدا باوەڕەکەم پتەوتر دەبێ، برگەی یەکەم (دەنگێك و قورسکردن) بزوێنی حەقیقیی تێدا نییە بەڵکو جۆرێك لە هێز پێدان وەیا قورسکردنی تێدایە کە پێداویستیی ناچاری بۆ ناو وشە وەیا ناو ئۆرێژی ڕستەی دێنێت. هەر ئەم هۆیەشە وا دەکات (کسرة مختلسة) بەفۆنیم حیساب نەکرێ چونکە بەشێکی بنجی و سەربەخۆ و بەردەوامی وشە نییە و بەتێچوونی واتا ناگۆڕێ و نادۆرێ. هەرچی بزوێنە بەشێکی بنجییە لە وشەدا. هەرچەند کورتە بزوێنەکانی (ضمة، کسرة، فتحة) لە ڕووی نرخی دەنگەوە ناچنە ڕیزی کۆنسنانت و بزوێنە درێژەکان چونکە وجوودی سەربەخۆیان نییە و لە دوا

کۆنسنانت نەبێ دەرناکەون، بەڵام دەوریان لە پێکهێنانی وشە و ڕستەدا وەك دەوری دەنگە تەواوەکانە بەنجی و بەردەوامە. تەنانەت کەمتر لە کۆنسنانتەکان سوانیان بەسەردا دێت. بەنموونە لە وشەی (بەستریەتری)دا دەنگی (س) دەسوێت و وشەکە دەبێتە (بەتریەتری) وەیا (ت)ەکە دەسوێت و دەبێتە (بەسریەتری) بەڵام کورتە بزوێنی (فتحة) بەدوا (ب)ەکەدا هەر دەمێنێ. کاتێك کە وشەکە تەرکیبی گۆڕا و بوو بە(پتریەتری) دەنگەکەی (فتحە) تێ دەچێ لەگەڵ تێچوونی خۆیدا (ب)ەکەشی کرد بە(پ) و (س)ەکەشی تێ برد.

کورتە بزوێنی ڕاستەنە پێداویستی دەنگ دەربڕین نییە کە بەهێ داخوازی جێگە بێت و بڕوات چونکە لە شیرازەمۆنی وشەدا بەشدارە و بەردەوامە. دەوریشی لە ڕستەسازی و تێکبەستنی دەستەواژە و وشەی نامێتەدا وەك دەوری هەموو دەنگەکانی زمانە چ بزوێنی درێژ بێ و چ کۆنستانت. بەنموونە لە وشەسازیدا.

دەست: دەستە

ئە(دەست) واتای هەیە ئە(دەست)یش جێی (دەستە) دەگرێتەوە. هەرچی (کسرة مختلسة)یە پێداویستی دەربڕینی دەنگەکانە بەهێی مان و ئەمانی پێداویستەکە. ئەو (کسرة..)یە لە ئاخاوتندا دەمێنێتەوە وەیا جێگۆڕکێ دەکات وەیا تێ دەچێت، لەوە هەرگەرێ کە پتریش لە کورتە بزوێن بێ وجوودی سەربەخۆیە. بانەختێك سەرنج لەم نموونانە بگرین:

وشەی (سەر) یەك برگەیە بەڵام کە داتە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك وەیا دووەمی تاك دەبێتە دوو برگە (سەرم سەرت). لە خۆوە دیارە برگەی دووەم ئەم (کسرة مختلسة)یە پەیدای کرد کە هاتە سەر (ر)ەکە. تۆ بڵێ ئەمە لە کوێوە هات؟

وەك بەدیهییە ئاشکرایە هی کۆتایی (سەر) نییە هەروەها وەك بەدیهییە دیارە هی ڕاناوەکانیش نییە. کەواتە دیسانەوە وەك بەدیهییە دیارە کە پێداویستێکی ئاخاوتنە. لەم حاڵەتەدا کە تاکە دەنگێك لە دەرەوە بۆ کۆتایی وشە دێت دەبێ بەهۆی قورسکردنەوە لە یەکەی جودا بینەوە هەرچەند بەهێی داخوازی دەنگسازی لەوانەش بێ دەنگەکەی کۆتایی وشەکە بەسکوونی تەواوەوە بکەوێتە بەرایی ئەو فۆنیمەی لە دەرەوە دێت و پێوەی دەلکێت. لەم نموونەیەی (سەرت)دا دەنگی (ر) لەلایەن فۆنەتێکەوە مەسکوونی تەواوەوە دەکەوێتە بەرایی (ت) وەك کە دەڵێ (کەرت، مارت) بەڵام (ر)ەکە

قورس کرا لەبەر ئەو دەستوورەی تازە باسم کرد. هەروەهاش کە راناوی (ت) هاتە دوای (کەس) لەوێشدا قورسایی دەخرێتە سەر (س)ەکە هەرچەند(س) لە رووی فۆنەتیکی کوردییەوە دەبێ لە بەرایی (س)دا بەتەواوی بوەستێ بۆ قورسکردن (کەس، کەست).

بەڵام کە گوتمان (ئەمە سەرمە لەسەر سەرتە، ئەشەرمێك هەزم و کەسنە..) لە هەموو حاڵدا قورسایی، سەر (ر، س) هەڵدەستێ هەر چونکە بەهۆی هاتنی بزوێنێك بۆ سەر (م، ت)ەکە قورساییەکەی بەرایی، شوێنی تەما. کورد ناڵێ (سە – رمە Se - rime کە – ستە Ke - site، سە – رتـــە Se - rite ) لەمەشدا دەستووری فۆنەتیك بەسە ردەستووری رستەسازیدا زاڵ بوو. من و تۆش بەرپرسی ئەو جێگۆرکێیە و لەناوچوونە بین لێشمان داوا ناکرێ بێ قووڵبوونەوە بزانین بۆچی حوکمی (دەنگ) بەسەر حوکمی (رستەسازی)دا زاڵ دەبێ بەڵام لێمان داوا دەکرێ دیمەنەکە ببینین و نرخی راستینەی ئەو قورسکردنە بزانین تاکو لە پێویستبەمەر بایەخی پێ نەدەین. زاڵبوونی دەستوورەکەی فۆنەتیك بەوەدا باشتر روون دەبێتەوە لە جیاتی (کەست) بڵێین (کەستان) چونکە یەکسەر قورساییەکە هەڵدەستێ بێ ئەوەی هیچ بزوێنێکی دەرەکی بەدوا راناوەکەدا بهێنین، هۆیەکەش ئەوەیە کە راناوی (تان) خۆی بزوێندارە.

لەو نموونە مەشوورەی (نووستن، مردن)دا کە نوونی چاوگ بەدوا کاردا دێت و کەسرە موختەلەسە بە مل دەنگی کۆتایی کارەکەدا دەبڕێ، ئایا قورساییەکە هی چییە؟ دەزانین هی کارەکە نییە چونکە کە (ن)ی چاوگت لادا کارێکی رێکوپێکی بێ قورسایی دەمێنێتەوە (نوست، مرد). دیارە هی (ن)ی چاوگیش نییە چونکە تاکە دەنگ لە خۆوە قورسایی بە پێش خۆیەوە ناگرێ، جگە لەوەی کە لەو کارانەی کۆتاییان (ا، و، ی) بێت قورساییەکە وجوودی نییە هەر چونکە لە بنەڕەتدا وجوودی نییە و بە دوا بزوێنیشدا هەبوونی نامومکینە. (سووران، بەزین، ئەزموون...).

بێگومان زمانی حاڵی ئەو پرۆفیسۆرە زمانناسانەی نرخ بەو قورسکردنە دەدەن دەڵێ هەقمان بەسەر ئەو لێکدانەوەیە نییە بەرانبەر شتێك کە هەست بە هەبوونی دەکەین، چونکە مادەم ئەو شتە هەیە دەبێ لە نووسیندا تێ بخوێندرێتەوە بەڵام ئەوان پرۆفیسۆرانە بایی سەری دەرزی مافی قسەی ئەرتۆییان نییە، ئەویش لەبەر دوو هۆی گرنگ و گرنگتر.

هۆی گرنگ ئەوەیە کە هات و لێکدانەوە بەڵگەی بەدەستەوەدا نابێ پشتگوێ بخرێ دەنا دەبێ لە ئاست سەرابیش بەڵگەی هەڵوەشاندنەوەی بپێچینەوە و بە ئاوی دابنێین. دەزانین سەراب دیاردەیە و چاو دەیبینێت، بەڵام دەشزانین ئاو نییە لە کەسیش ناسەلمێندرێ بڵێ دەبێ نرخی ئاوی پێ بدرێت.

هۆی گرنگتر لە هەڵوەستی پرۆفیسۆرەکان خۆیانەوە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە: ئەوان هەر لە ڕێی لێکدانەوەوە دەیانەوێ بسەلمێنن دەنگی هەمزە بەخۆی و ئاوازە و زەق و زۆپییەوە فۆنیم نییە و یاریدەدەرە و نابێ نیگاری هەبێ. ئنجا بۆ دەبێ لە ئاست ئەو دیاردە زیندە کز و بێهێز و بێ دەوامەدا کە (کسرة مختلسة وەیا قورسکردنە) نابێ بایەخ بە لێکدانەوە بدرێ، خۆ ئێمە هەرای ئێوان زۆردار و زۆر لێکراو نابڕینەوە تاکو بەزەیی بە بەڵگە و بێ بەڵگە بەلای زۆرلێ کراوماندا بشکێنینەوە لە ڕێنووس و ڕێزمان و فۆنەتیک و ئەوان کارانەدا شکانەوەی توێژەرەوە بەلای خاوەن هێزدا دەبێت.

ڕاستییەکەی، هەڵوەستی ئەو پرۆفیسۆرانە لە ئاست هەمزە و (کسرة مختلسة)دا ئەشقەڵەکردنە بە ڕێنووس و بە سەرجوملەی لایەنی دەنگ لە باسەکانی زماندا و چ مانای شیرنتری تێدا نییە، ئۆباڵی من و تۆ و قوتابییەکانیشیان دەچێتەوە ئەستۆی ئەوانەوە کە ساڵەها بە گوێماندا دەچرپێنن و چی دەڵێن بە بەدیهییەمان لەسەر دەسەپێنن، قوتابیش بێت و بەرهەڵستی لە بیروڕایاندا بکات نەوەی عومری لە دەست دەچێت.

ڕەنگە بەلای خوێنەرەوە منیش لە ئاست دەنگی هەمزەدا دەستبەتاڵی بەڵگە و بنۆس بم وەک کە پرۆفیسۆرەکان لە قسەکانی مندا دەستبەتاڵ نیشان دران. کاتێک گەیشتینە باسی دەنگی هەمزە ئەم لایەنەی دەستپڕی و دەستبەتاڵی خۆ بەدەر دەیەخەبت. دانانی نیگار بۆ ئەو قورسکردنە لە ڕێنووسدا بەرەنگاری کێشەیەکمان دەکات بەقەدەر فەلاقەتی زمانی کوردی، ئەمەش نموونەی کێشەکە:

کە وشەی (ڕانک)مان لە فەرهەنگدا بە (ranik) نووسی ئەوسایا دەبێ لە هەموو حاڵ و باریندا ئەو نیگارەی (کسرة مختلسة) لە دوا (ن)ەکەوە بێت، یا دەبێ لە حاڵی تێچوونیدا نیگارەکەی ڕەش بکەینەوە:

(١) ئەگەر نیگارەکەمان لە هەموو حاڵدا نووسی شێوەی ناخاوتنمان دەبێتە ئەسیری ڕێنووسەکە و لە کوردیی ڕەسەن دەشۆرێت چونکە لە ڕێنووسدا قورسکردنێک

بەسەر وشەدا دێنین کە لە ئاخاوتندا تێ چووە وەك ئەوەی کە گوتت (رانکەکە) نالێیت (ranikeke) بەڵکو دەڵێیت ( rankeke ) هەروەهاش لە زۆربەی هەرە زۆری کوردیدا قورسکردنەکەیان بە پێ جێگە و مەبەست دێتە ناو ئاخاوتن وەیا تێ دەچێت ئیتر دەبێ رستەی وەك (کرمەکە گرژە) بخوێندرێتەوە (kirimeke girizhe) چونکە لە وشەی (کرم، گرژ)دا قورسکردن هەیە). هەر ئەمەش دەبێتە ناکامی ناچاری بەملدا بڕینی (کسرة مختلسة) چونکە قوتابخانەکان سەرلەبەریان وەهای دەنووسن، هەرچی منداڵیش هەیە بە قوتابخانەدا تێ دەپەڕێت و زمانی کوردی لەو رێنووسەوە فێر دەبێت، مادەم نیگاریش بۆ (کسرة مختلسة) دانەنرا دەبێ بخوێندرێتەوە وەك کە هەموو نیگارێکی دیکە دەخوێندرێتەوە، دەبێ (فکرم پەرشە) بخوێندرێتەوە (fikirim perishe)... ئنجا ئەگەر لە وەرامدا پێم بڵێیتەوە ئەم کێشەیە دەدرێتەوە بە سەلیقەی خوێنەر کە خۆی دەزانێ قورساییەکە ماوەتەوە یا هەڵستاوە، منیش پێت دەڵێمەوە کە سەلیقە بەرەوان بێ بۆچی لێ ناگەرێی لە سەرەتاوە بڕیاری مان و نەمانی قورساییەکە بدات؟ بۆچی دوو جاران ئیمتحانی سەلیقە دەکەیت، جارێکیان بەوەدا کە دەبێ بزانێ قورسایی هەیە یا نییە، جارێکیشیان بزانێ گوێ نەداتە ئەو نیگارەی لە نووسیندا بۆ قورسکردنەکە هەیە و لە ئاخاوتندا تێ چووە، چەند سەیرە تۆ رازی ئەبیت بنووسرێ (کرمەکە) و بخوێندرێتەوە (کرمەکە) و پێ لەسەر ئەوە داگریت کە بنووسرێ (kirimeke) و بخوێندرێتەوە (kirmeke)....

لە زمانی کوردیدا بگەرێیت دەبینیت ئەم هاتن و چوونەی (کسرة.....) بەقەدەر دەمارەکانی لەش تێکەڵ بە شیرازەهۆنی زمانەکەیە و هێندەی کە چیوەش لەبەر پەنجەکانت هەڵدێت ئەویش لە ئاخاوتندا خۆیت لێ دەشارێتەوە.

(٢) ئەگەر نیگارەکەمان لە کاتی هەبوونی قورسکردنەکەدا نووسی و لە کاتی نەمانیدا رەشمان کردەوە ئەوسا بەشێکی بەرچاوی وشەی کوردیی دوو بڕگەیی دوو شێوە نووسینی دەبێ، لە فەرهەنگیشدا پێویست دەبێ بەوەی خوێنەر ئاگادار بکرێ کە (کسرة)ی فلانە شوێنی وشەکە هەمیشەیی نییە، ئەم ئاگادارکردنەوە و دوو جۆر نووسینەش بۆ وشەی فەرهەنگی لە ئیمکاندا دەبێ بەلام (کسرة...)ی کە لە تێکبەستن و دارشتنی وشە و رستە دێن و دەچن بێ چارەسەرکردن دەمێنێتەوە، بە نموونە وشەی (گرتن) دەنووسرێ (girtin) بەلام لە رێژەی فەرمان و نەهی و

ئاینەدا قورساییەکەی سەر دەنگی (گ) تێ دەچێت و وشەکە دەبێتە (bigre,megre, bigrim)، وشەی (دیتمت) دەنووسرێ (deetimit). کە بوو بە (دیتمتەوە) دەبێتە (deetimtewe). ئیتر بەو پێیە هەزاران تێکبەستن و تێك هەڵکێشان و لێکترازاندن کە ئیمکان نییە لە پێشەوە فەرهەنگی بۆ دابندرێ وەیا پێشبینیی تێدا بکرێ، هەرچارە لە نووسیندا نیگاری ئەو قورسکردنە تێیاندا دەربکەوێت و ون دەبێت، کە ئەمە خۆی عەیبێکی گەورەترە لەوەی پێشەکی بڕیاری نەنووسینی نیگاری ئەو قورسکردنە بدرێ. ئەوەندەی زمانی بێگانەم خوێندبێتەوە نەمدیتوە وشە و دەستەوشە و رستەکانی جار لە جارێ چۆنیەتیی نووسینیان بگۆڕێ. ئێمە لەو نموونانەی شکل بەدیهیدا دیتمان قورسکردن لە وشەدا تێ چوو و واتاشی نەگۆڕا، بەمەشدا هەر بەپێی تەعریفی پرۆفیسۆرەکان نرخی فۆنیمی نەما، ئیتر ئەگەر هەر، پێ داگرین لەسەر پێویستبوونی نووسینی، دەبێ نیگار بۆ دەنگی تووڕە بوون و لاواندنەوە . و ...ش دابنێین چونکی ئەوانیش جۆرێکن لە دەنگ و بۆ مەبەسی تایبەتیش دێتە ناو ئاخاوتنەوە. وا دەبێ نارەزامەندی دەنگێکی وشە دەگرێت و بڕگەی تێدا پەیدا دەکات وەك کە دەگوترێ (فلانە شت؟ دەسا فللسێك ناهێنێ!) لە جیاتی (فلسێك..) یاخود لە ئەعیکردندا دەگوترێ (ئەککەی بچیت بۆ لای...).

دەبێ بزانین مومکین نییە رێنووس هەموو دەنگێکی ئاخاوتن شکڵنووس بکات. هیچ رێنووسێکی ئەم جیهانەش نییە هێندەی ئێمە مەراقی خوردکردنەوەی ئاخاوتنی هەڵگرتبێ. من لە گۆشەنیگای خۆمەوە چ دوشمنایەتیم نییە لەگەڵ ئەو قورسکردنەدا هەروەکو دۆستایەتیشم لەگەڵیدا نییە، تەنانەت ئەگەر بە کۆمپیوتەر زانرا کە جۆرێکیشە لە جۆرەکانی بزوێن لێی وەتەنگ نایەم، هەر ئەوەندە حیسابەی بۆ دەکەم کە بزوێنی یەکجار کورت و بێهێز کاری بزوێنی عادەتی ناکات و تێ دەچێت و واتا ناگۆڕێت و فۆنیم نییە، خۆ ئەگەر بە بڕیاری گوتەکەم حەقی چن نیگاریشی بۆ دابندرێ سەغڵەتم ناکات، ئەویش لەبەر دوو سەبەب (١) یەکێکم لەوانەی دەزانن کەی دێت و کەی دەچێت (٢) بەشی هەرە زۆری عومرم رابوارد بێ ئەوەی ناچار بم نازی خۆڕایی بکێشم.. من پەرۆشی دوو شتمە:

یەکەمیان ئەوەیە کە بەخۆڕایی نرخێکی لە پێویست زیادی گرنگی و بایەخ بۆ خۆی دابڕیوە و گەلێك بەولای ئەرزەوەندەوە زەینی نووسەرانی کوردی بەخۆیەوە خەریك

کردووە لە حاڵێکدا ئەو قورسکردنە بریتییە لە پێداویستی تایبەربەوامی رستەسازی و وشەسازی، هەر بە نەمانی پێداویستەکەش قورسکردنەکە دەڕەوێتەوە. جا ئەگەر پێم بڵێیت ئەم مەبەسانەی قورسکردنەکە پێکیان دێنێت چشتی بێ بایەخ نین لە وەرامدا دەڵێم پێکهاتنی ئەو مەبەسانە بێ ئەوەی نیگار بۆ قورسکردنەکە دابندرێ دێنە جێ، چونکە وەك بزوێن و کۆنسنانت نییە بە نووسینی کەلەبەر بکەوێتە وشە و رستەوە وەیا واتایان بگۆڕێ وەیا بێ واتا بێ. هەر چۆن بە سەلیقە دەزانین بەپێی پێویست دەنگی پاراتەوە لە حاڵی پاراتەوەدا بخەینە ناخاوتنەوە بێ ئەوەی نیگاری بۆ دابنێین هەروەهاش بە سەلیقە دەزانین قورسکردن لە کوێ دەبێت و کەی هەڵدەستێت.

دووەمیان ئەوەیە کە تێخوێندنەوەی قورسکردن ئەرکێکی بێ سەروبن دەخاتە بەر رێنووس و نووسەر و خوێنەرەوەی کوردی چونکە نووسەر دەبێ هەمیشە بەپێی هاتن و نەمانی قورساییەکە خەریکی گۆڕینی رێنووسەکەی بێت. ئێمە وەتەنگ دێین لەو رێنووسەی ئێستاکەمان لەبەر زۆریی خاڵ و نیشانەی سەروژێری پیتەکانی، ئەم جارەیان سەربارێکی قورستر لە بن بارەکە سواری دەست و قەڵەممان دەبێ کەچی کەمیش هەستی بە نوقسانیی رێنووس نەکردووە لەبەر نەبوونی نیگاری قورسکردنەکە ناچاریش نەبووە بپرسێ ئایا قورساییەکە بۆ کوێ بهێنێت و کەی تێی بەبات.

د. ناورەحمان لە ستوونی یەکەمی لاپەڕە (١٣)ی گۆڤاردا بەسەر (گەنم گەنمەکە)دا دەچێتەوە خۆی لەوە ناگەیەنێ کە نووسینی (genmeke) لە چاو (genim)دا شکلێ کۆنی دۆڕاند و نیگارێکی (أ)ی سەرلەبەری لێ کەم بۆوە خۆ هەردووکیشیان هەر (قمح)ن و هەمان وشەن، هەر ئەوەندە دەڵێ لە بری بڕگەیەك بڕگەیەکی دیکە پەیدا بوو، لەمەشدا هیچ دڵدانەوەیەك شك نابەین چونکە سەرەڕای ئەوەی کە بڕگەی دووەم لە دەرەوەی وشەی (گەنم) پەیدا بوو بەهاتنی بزوێن وەیا قورسکردن بۆ کۆتایی وشەکە، کێشەمان کێشەی تێچوونی دەنگ و نەمانی نیگارەکەیەتی نەك (بڕگەسازی) چونکە وشە و رستە هەر دەبێ بڕگە و کەرتیان هەبێ، ئەوەی نەخوێندووشە دەنگ و وشە و کەرت و رستە دەردەهێنێ بەڵام کە بوو بە نووسەر چاوەکانی دەبینن جارێکیان نووسرا (Genim) و جارێکیشیان نووسرا (Genm) کە بوو بە فۆنیمناسیش دەبینێ ئەو دەنگ و نیگارەی بە فۆنیم داندرابوو هەڵستا و واتاشی تێك نەدا.

ڕاستییەکەی ئەم تەرزە ڕێنووسە ڕێ دەدات داوا بکرێ، وەك کراوە، فەرق لە نێوان نووسینی (کا) و (کێ)ش بکرێ. داڵە گلۆرەکەی سلێمانییش نیگاری بۆ دابندرێ – وەك کە مامۆستا وەهبی بە (ڽ)ی دەنووسی – دەنگەی نێوان (ن، گ)ی دەربەنگ)یش لە نووسیندا تێ بخوێندرێتەوە. بەڵێ دەزانم کێشەی ئەمانە هاوچوونی تەواوی کێشەی (کسرة...) نییە بەڵام خۆ کێشەن؛ (کسرة مختلسة)ش هاوتای بزوێنی کورتی ئاشکرا نییە کەچی دەڵێن دەبێ وەك ئەو بایەخی پێ بدرێ، بەهەمە حاڵ کێشەی (کا، کێ) و دەنگی داڵی گلۆر و (ن، گ) پتر لە کێشەی (کسرة... )نرخ پەیدا دەکات لەوەدا کە هەمیشەیی و بەردەوامن و ناڕەوێنەوە وەك کە قورسکردن کاتی و نابەردەوامە و تێ دەچێت.

د. ئاوڕەحمان چەند ڕستە و دەستەواژەیەکی هێناوەتەوە بە نموونەی ناقۆڵایی نیگار دانەنان بۆ ئەو قورسکردنە، وەك (جلم برد شتم – من کرمم گرت– من پرشنگم گرت. ) لە ڕاستیدا نموونەکان ڕەخنە هەڵدەگرن بەڵام بە لێوردبوونەوە مەسەلەکە دەگۆڕێ:

ئێمە دەزانین هەردەنگێکی لە بەرایی وشەوە بێت و بزوێنی ئاشکرای لە دواوە نەبێت بەناچاری قورس دەکرێ ئیتر نیگار دابندرێ وەیا دانەندرێ قورسکردنەکە لە خۆوە بەسەر زاری مرۆڤدا دێت. جا ئەگەر لە پێشەوە بڕیارمان دا، وەك کە ڕێنووسی ئینگلیزی بڕیاری داوە، ئەم شتە ناچارییە بدەینەوە بە فەرمانی واقیع و ڕەنجی نیگارکێشانی تێدا نەهەین شتێکمان کردووە لە بڕیاری هۆش پێشکان و ژیرێژی بومشێنتەوە هەروەك لە جودانەکردنەوەی کاف و گافی گلۆریش هۆشمان بەکار هێناوە و عەزابێکی بێ لزووممان لە کۆڵ نووسەری کورد و کوردی کردۆتەوە، هەرچەند لە ئاست ئەو کاف و گافەدا هەموو کورد لە هەموو حاڵ و باردا یەك مامەڵە ناکات چونکە کوردی بەری سۆران لە وشەی وەك (دەپشکوێ، دەنەنگوێ... )دا گلۆریان ناکەن چونکە لە ئەسڵدا کاف و گافی (پشکووتن، ئەنگووتن..) گلۆر نین، هەروەها (مەرەکەبی کوینك و دەوڵەتی کوێت و کوین ئەلیزابێت...) کاف و گافیان وەك خۆیان دەمێننەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئاسانکردنی ڕێنووس و یەکچوونکردنی لە زمانێکدا ئەوە دەهێنێت ئەبیبییی وەها بەرتەسك لە بیر بکرێ. تائێستاش ڕێنووسی لاتینی کە من دیبێتم قورسکردنی بەرایی وشە تێ دەبات و نیگاری بۆ دانانێت و کەسیش تێیدا نەشێواوە. ئێمە لە ڕێنووسی ئێستاکەماندا کە بە پیتی عەرەبی دەنووسرێ گرفتێکمان نەهاتۆتە بەر لەو تەرزە ڕستە و دەستەواژانەدا کە د. ئاوڕەحمان نموونەی لێ

هێناوەتەوە، بڕواش دەکەم (فرچکم گرت) گەلێک خۆشخوێن و ئاسانترە لە وشەی وەک (تێ هەڵ چوومەوە – تێهەڵچوومەوە – تێ هەڵچوومەوە).

د. ئاورەحمان دەیتوانی ئەو نموونانە بهێنێتەوە بۆ بەنیسبەت گەیاندنی کەم بایەخیی ئەو قورسکردنە لە نووسیندا بەوەدا بڵێ ئەری خوێنەری کورد کامتان هەڵە دەکەن لە خوێندنەوەی (لنگم بلند کرد)؟ بەڕاستی کەسیش هەڵەی تێدا ناکات هەرچەند وشەی (لنگ) بزوێنێکیشی لێ قرتاوە چونکە ڕاستییەکەی (لینگ)ە.

لەو رستەیەی (لنگم بلند کرد)دا بەرێکەوت وشەکانی (لنگ، بلند، کرد) بەفەرمانی دەنگسازیی کوردی لە خۆوە گرفتیان ڕەوینەتەوە چونکە دەنگەکانی (نگ، ند، رد) لەو دەنگانەن کە بەدوا یەکدیدا قورسکردن هەڵناگرن ئنجا ئەگەر قورسایی سەر (ڵ)ەکەت هەڵگرت دەبێ (ن)ەکە قورس کەیت و لە (د)ەکەی دابڕیت، ئەمەش دژی دەنگسازیی کوردییە چونکە (ن)ی وەستاو لە بەرایی دەنگەکانی (گ، د، ت)دا قورسکردن هەڵناگرێ. ڕاستییەکەی ئەو دەنگەی (ن) لە وشەی کوردیدا لە بەرایی (ج)شدا قورس ناکرێ وەک (بنج، ڕەنج، کونج..) بەڵام گوێم لێ بووە هەندێ کورد لە وشەی (بەنج)دا قورسایی دەخەنە سەر (ن)ەکە، دەبێ ئەوەش بڵێم لە دەنگسازیی کوردیدا هاتنی بزوێن لە بەرایی دەنگەکانەوە داخوازی قورسکردنیان دەکات بەپێچەوانەی ئەوەی بەدوایاندا بێت، بەنموونە وشەی (دنك) ئاسانتر نوونەکەی دەوەستێندرێ لە (دەنك) کە بزوێنەکەش بوو بەبزوێنی درێژ وەستانەکە مومکین نابێ وەک لە وشەی (ڕانك)دا دەبێ نوونەکە قورس بکرێ بەڵام کە بزوێن بەدوا وشەکەدا هات قورساییەکە دەڕوات وەك کە دەڵێی (ڕانکەکەم) نوونەکە دەوەستێندرێ. هەر لەبەر فەرمانی ئەم جۆرە دەستوورانەی دەنگسازییە کە گوتت (پڵنگ، بێژنگ، ڕەوشت) چارت ناچارە دەبێ دەنگەکانی (ڵ، ژ، و) قورس بکەیت چونکە (نگ، شت) لە کوردیدا بێ قورسکردن بەدوایەکدیدا دێت، کەسێك وەهایان دەرنەبڕێ کورد نییە و کوردی فێر نەبووە.

مایەوە لەگەڵ ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك بەدوای وشەی (لنگ)دا (لنگم): تۆ کە بەخەڵقت ڕاگەیاند هەر تاکە دەنگێکی کۆنسنانتت لە دەرەوەی وشەوە هێنا و بەوشەکەوەت لکاند قورسایی دەخاتە سەر دوایین دەنگی وشەکە عوزری هەڵەکردنت بەدەست کەسەوە نەهێشتووە، ئەوساش نەك هەر لە ئاست ڕاناودا، بگرە لە ئاست هەموو پاشگرێکیش چاوی خوێنەرانت کردۆتەوە وەك (کوڵك، کوڵکن – دەست، دەستك: Destik, Kulkin). دەستووراتی دەنگسازی کە خەڵق لە خۆوە بێ ئاگاداری و

لێوردبوونەوە بەکاریان دێنن گەلێك باری ئەو قورسکردنەی نەرم کردووە، بەنموونە دوو وشەی (فرچك، گرفت) دەدەینە بەر دەستووراتی دەنگسازی

دوو دەنگی (ف، گ) لە بەرایی وشەکانەوە بەفەرمانی ناچاری قورس دەکرێن کە دەکاتەوە فەرمانی دەنگسازی. لە وشەی (فرچك)دا دیسانەوە بەناچاری دەبێ دەنگی (ر) لەگەڵ دەنگی (ف) ببێتە برگەی یەکەم چونکە هاتنی (ر)ەکە بەدوا دەنگێکی قورسکراودا دەبێ برگە دروست بکات مەگەر داخوازییەکی بەهێز وەها بکات سەرلەنوێ (ر)ەکە قورس بکرێت، وەك ئەوەی لە جیاتی (فرچك) وشەی (فرشتە) بایە دەبوو (ر)ەکە قورس بکرێ بۆ ئەوەی (ش)ەکە بەبێ قورسایی بکەوێتە بەرایی (ت)ەکەوە هەر هۆیەکی ئەوتۆییشە وەها دەکات لە وشەی (گرفت)دا (ر)ەکە قورس بکرێت چونکە ئەگەر قورس نەکرێت دەبێ (ف)ەکە قورس بکرێت دەشزانین (ف) حەز لە (ت) دەکات.

ئێمە کە ئەم دەستووورە فۆنەتیکییە سروشتییانەمان لە دەنگسازیی کوردیدا هەست پێ کرد سەیرمان نایەتەوە لەوەی کوردەواری لە خۆوە بڵێ:

بێ – ژنگ

ب – ڕشت

گ – رفت

پ – ڵنگ

پر – شنگ

کە – نشت

د – روست

ب – نێشت

شاهی (سگرمە – (س – گر – مە) ئەگەر بزوێنی بەدوادا نەهاتبایە دەبوو بگوترێ (سگ – رم) بەڵام ئەگەر (سگرت) بایە دەبوو بگوترێ (س – گرت) وشەی (باڵندە)، ئەگەر پێداویستی فۆنەتیکی نەبووایە دەبوو وشەی (باڵ) کە بنچینە برگەیەك بێت و (ندە)ش کە پاشگرە برگەی دووەم بێت بەڵام چونکە (ن)ی پێش (د) دەبێ وەستاوی تەواو بێ (ڵ)ەکەی بەقورسکراوی بۆ خۆی ڕاکێشا و لە ئەسڵی وشەکەی سەتاندەوە.

کەچی (بالگرە) دەبیّ (باڵ – گ – رە) بخوێندرێتەوە چونکە وشەی باڵ کە بنچینەیە هیچ ناچارییەکی دەنگسازی (ڵ)ەکەی لیّ ئاستێنێ بۆ سەرەتای (گرە) کە لە وشە لێکدراوەکەدا پاشگرە، ئینجا ئەگەر بێم بڵێیت ئەم دەستوورانە کەی بەبیری خوێنەردا دێت تا لە خوێندنەوەدا بەپێی دەنگسازی بەبیّ نیشانە و نیگار پێڕەوییان بکات، لە وەرامدا دەڵێم:

١– نووسەر کە بیەویّ نیگار بۆ قورسکردن دابنێت دەبیّ بەسلیقە یا بەفێربوون شوێنی ئەو قورسکردنانە بزانیّ دەنا لە ئاخاوتندا هەڵە دەکات و قورسکردنەکە لە شوێنی نالەباردا دادەنێت. ئنجا کە حاڵ وەها بیّ نووسەر و خوێنەر هەروەك لە ئاخاوتندا بەرەهایی و بیّ نیگار وشە دەردەهەبڕێنیّ لە خوێندنەوەشدا هەروەها دەکات چونکە شتێك دەخوێنێتەوە کە پێشتر لە گەرووی خۆی دەرهاتووە و دواتر بەسەر نووکی قەڵەمەکەیدا تێپەڕیوە، نووسەر و خوێنەریش لە یەك خوکمدان چونکە خوێنەریش وەك نووسەر ئاخێوەر و سەلیقەدارە. بێگومان سەلیقەی ڕاست و ڕەوان بیّ ئەدەخولی ڕێنووس و نووسەر لە ئاست ئەو قورسکردنەدا ئازادتر و ڕەهاتر دەبیّ لەوەی بێین دەستووری مامۆستا وەهبیی بەسەردا بسەپێنین بۆی بنووسین (فێرچێکم گیرت، دەستیم بەڵێند کیرد..)

٢– ئەگەر ڕەوا بیّ ڕەخنەی ئەوتۆیی لەو قسانەی من بگیریّ دەبیّ سەرلەبەری زانستەکانی زمان یاساغ بکرێن چونکە هەموویان شیکردنەوە و وردەکاری و دەستوورسازی و کێشانە و پێوانەی بەنامەکی لە شتی ئەوتۆدا دەکەن کە زۆربەی بابەتیان لەوانەن کاری سەلیقە بن. کام ئاخێوەری ڕەوانە بێنە لە ڕێزمان و سینتاکسی تاقی بکەوە متعق ناکا. قسەی من وەها هی د. ئاورەحمان بۆ ئەو کەسانەیە کە لەبەر تیشکی لێکدانەوەدا سەیری دیاردەی ئاخاوتن و نووسین دەکەن. ئاخێوەری عادەتی ئەبابەتی ئەوتۆیی دەخوێنێتەوە و نەتنی دەکات و نەبەتەماشە ڕۆژەك لە ڕۆژان پەنگ بەقسەکانی دەروونی بخواتەوە تا دەهانخاتە بەرانبەر ئاوێنەی ڕێنووس و ڕێزمان و زمانناسی و وشەسازی و دەنگسازییەوە.

بەڕاستی ئەم کێشەیەی (کسرة مختلسة) لە ڕێنووسی ئێستاکەی کوردی عێراقدا هیچ گرفتی دروست نەکردووە و خەڵقەکە بەهۆی نەبوونی نیشانە ئەو (کسرة.)یە دەتوانن لووستر و ڕێکتر نووسینی کوردی بخوێننەوە تەنانەت نموونەکانی د. ئاورەحمان بۆ خۆیان شایەدی ئەم ڕاستییەن چونکە هیچ خوێنەرێك هەڵەیان تێدا

ناكات. كاتێك كەوتینە سەر نووسین بەلاتینی، گرفتەكە سەر بەرز دەكاتەوە چونكە لە لاتینیدا چاومان بەجۆرە نووسینێكی دیكە فێر بووە، هەرچەند دەزانم زمانناسی كورد پتر لە هی ئینگلیز و فرەنسە بایەخ بەو قورسكردنە دەدات، تەنانەت ئەگەر ڕێی هەبێ نووسەری ئینگلیزیش ناچار دەكا لە جیاتی (Bring, Turn) بنووسێت (Biring, Turin)

ڕاهاتن و ئۆگرگرتن لە سەرجوملەی چالاكیی مرۆڤی عادەتیدا كاریگەرێكە بارتەقای ڕۆشنبیری و زانست و خوێندن جلەوكێش و پاڵ پێوەنەرە تۆ بێنە ئینگلیزێك ناچار بكە وشەی (neighbour – دەخوێندرێتەوە «نەیبەر») وەها بنووسێ وەك لە زارەوە دەردێت (nyber) دەبینێت دەست و قەڵەمی دەشێوێن، وشەی (archive) بەفرەنسەییەك نیشان بدە دەخوێنێتەوە (ئەرشیڤ) كەچی ئینگلیزێك دەخوێنێتەوە (ئاركیڤ .). ئینگلیزێك كە بنووسێت (ئای) ئەگەر بەواتای (چاو) بێت دەنووسێت (eye) بەواتای (من)یش دەنووسێت (I). چ سەیریشی بەو كارەی نایەت.

دەبێ بزانین ڕێنووسی لاتینی بەتێكڕایی، پاشماوەی بەرەوپێشچووی و بەعەیب و ماری ڕێنووسێكی چەند هەزاو ساڵەییە كە لە بنەڕەتدا هیرۆگلیفی بووە و دواتر ەگۆڕانەوە بۆتە ڕێنووسی ئەلفوبێی سامییەكان و لە ٧٠٠ ی پێش زایینیدا پەڕیوەتەوە بۆ ۆنانییەكان (بنۆڕە: فرهنگ ایران باستان، پورداود – العلاقة بين النطق والكتابة في علیم العربیة – محاضرة مجید الماشطة، نیسان ١٩٨٢) لەوێشەوە وردە ولاتانی ئەورووپادا بڵاو بۆتەوە. یۆنانییەكانیش بەشێك لە كۆنسنانتەكانیان كردووە ەبزوێن كە لە نووسینی ئارامیدا كۆنسنانت بووە بەڵام بەشێوەیەكی لێڵ بەبزوێنیش ەكارهاتووە (مجید الماشطة – العلاقة بين النطق والكتابة..) ڕێكەوتێكی سادەی ەرەتایی بوو كە لە نووسینی لاتینیدا دەنگی هەمزە نیگاری بۆ نەكێشرا و لەگەڵ ێگاری دە نگی دیكەدا تێكەڵ كرا، ئەوساش پتر لە ٢٧٠٠ ساڵ ئەفۆنۆلۆجی هەبوو ەفیلۆلۆجی ئەسپنتاكس و ئەتیمیۆ، هەرچی دەستكارییەكی لە ڕێنووسدا كرابێ ەچكەی نابەڵەدی و سەرپێی و پەلە بووە بێ مامۆستا و بێ ڕابەر. گەلێك باری ووسینی ئینگلیزی و فرەنسەیی تامی (هیرۆ گلیفی) دەدات كە لەوێدا وشە نیگاری ەبووە نەك دەنگ ئەگەر ڕێنووسی ئێستاكەی كوردی ئەو هەموو دەست هەڵبڕینەی ێدا نەبوولیە لەبەر زۆریی خاڵ و نیشانە و ئەلكانی بەشێكی پیتەكانی بەهێتی دوا زیانەوە، سەد جاران لەلایەن كێشانە و پێوانەوە لە هی لاتینی (وەك فرەنسەیی و

ئینگلیزی) زانستیتر دەبوو چونکە چی دەنووسرێ خزمە لەگەڵ ئەوەی دەگوترێ، تەنانەت ئاوناوە وردەبێژیی وەهای تێدا کراوە زۆر ژیرانە رێنووس و رێزمانی لە یەکدی گرێ داوە وەک کە فەرق کراوە لە نێوان تاکە پێشگر و دوو پێشگردا لە رووی لکاندنیان بەکارەوە وەیا پێشنیار هەبووە بەفەرقکردن لە نێوان نیشانەکانی فەرمان و نەهی و نایندە و نەفی لەگەڵ پێشگر وەیا راناوێکی کە دەکەوێتە پێش کارەوە لەو رووەوە کە ئەو نیشانانە پتر تێکەڵ بەتەکوینی تاکە (کار) دەبن بێ ئەوەی بیانکەن بەلێکدراو. جوداوازیی نێوان (نە)ی بەواتای (no) و (نە)ی بەواتای (neither, nor) لە رێنووسدا ئەویش هەر وردەکارییەکە کوردیناسەکان لە ئاکامی تێکڕای پێشکەوتنی زانستەکانەوە بۆی چوون دەنا بەر لە ٥٠ ساڵێک کە کوردی دەنووسرا کێشانە و پێوانەی تێدا بەکار نەدەهات.

بڕوا دەکەم هەر جۆرە رێنووسێکی بۆ کوردی بەپیتی لاتینی قەرارداد بکرێ بەهۆی راهاتنەوە لە ئاکامدا بەخووسی دەخوێندرێتەوە، بەتایبەتی چونکە پیتەکانی دوو جۆر نین کە بلکێن و نەلکێن، خاڵ و نیشانەشیان وەک ئەبێ وەهایە ئینجا ئەگەر رێنووسەکە تا ئەو رادەیەی ناقۆڵاییی تێدا پەیدا نابێ، لەو قورسکردنە رەها بکرێ بەقازانجی زمان و رێنووسی کوردی تەواو دەبێ. بەلای منەوە ناشێ قورسکردنێکی بەردەوام نەبێ نیگاری بۆ دابندرێ. قورسکردنی دەنگی سەرەتای وشە نیگاری ناوێ. کورتی رای من ئەوەیە. هەتا بکرێ پێویستە لەو نیگارە خۆمان بدزینەوە چونکە فۆنیم نییە بەردەوام نییە و داخوازی دەنگسازییە. لەوەشدا زۆرم بۆ ئەو قورسکردنە بەجێ هێشتووە چونکە بەپێی تەعریفی فۆنۆلۆجیستەکان فۆنیم نەبێ مافی نیگار بۆ دانانی نابێ.

## دەنگی هەمزە:

گوتارەکەی د. ئاورەحمان کە بیروڕای فۆنۆلۆجیستەکان لەبارەی هەمزەوە پەسەند دەکات و لەوانەوە بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ فۆنیم نەبوونی ئەو دەنگە، بەرەو لێکدانەوەیەکەوە دەڕوات کە لە پێشەوە بڕیاری خۆی داوە بەئیبعادکردنی هەمزە تەنانەت هەبوونی لە بەرایی وشانەوە بەبەڵگەی نەبوون دادەنێت. ئەو مامۆستایانە دەیانەوێ بسەلمێنین کە هاتنی هەمزە لە بەرایی وشە تەنها بۆ دەربڕینی ئەو قاولانەیە کە بەدوایدا دێن.

د. ئاورەحمان دەنووسێت: (هەمزە... دەنگێکی یاریدەدەرە لە سەرەتای ئەو وشانەوە وەیا ئەو برگانەوە پەیدا دەبێ کە بەیز وێن دەست پێ دەکەن).

جاریٚ دەبێ وەکو بەدیهییە بزانین کە دەست پێکردنی وشە وەیا برگە بە(بزوێن) لە بنەڕەتدا موستەحیلە. بزوێن هەمیشە بەدوا کۆنسنانتدا دێت. تەنها لێرەدا تێبینییەك هەیە دەبێ بیڵێو ئەخرێ. دوو دەنگی بزوێنی (و،ی)ی درێژ شێوەی کۆنسنانتیشیان هەیە، ڕاستییەکەشی دەبێ بڵێین (و، ی) بە بەرپانەوە هەیە بینە بزوێنی درێژ.

لە وشەی (یار، پایز، وەشت، دەروازە)دا هەردوو دەنگی (ی، و) کۆنسنانتن هەرچی دەنگی ئەلفە هەر بزوێنە و نابێتە کۆنسنانت. هەندێك لە زمانزانانی کۆنی عەرەبی کە هەمزەیان بەئەلفی کۆنسنانت داناوە زۆر لە سەمووردان ئەمانەت پەکێکی وەکو (ابن درستویە) لە کتێبی (تصحیح الفصیح)دا هەمزە بەدەنگێکی سەربەخۆ دادەنێت. بزوێنی کورت لە دەنگی ئەلفیش پتر پابەندی کۆنسنانتە چونکە هێندەی ئەو وجوودی سەربەخۆی نییە: تۆ بێنە وشەی (گە، گا) لە ڕیکۆردەردا تۆمار بکە و دواتر دەنگەکەی (گ) لە هەردوویاندا بسڕەوە و گوێ بگرە لەوەی بەبزوێنی دەمێنێتەوە دەبیەیت دەنگەکەی ئەلف دەناسرێتەوە باشتر لەوەی کورتە بزوێنی (فتحة) بناسرێتەوە بەهەمەحاڵ ئەم لایەنە سەرێشەی کێشەی هەمزە نییە.

ئاخێوەر کورد بێت و عەرەب بێت و رووس بێت ناتوانێ دەنگی بزوێن لە بەرایی وشە بدرکێنێت. ئنجا کە هاتنی بزوێن لە بەراییدا موستەحیل بێت چۆن بسەلمێنین مام (بارام)ێکی بەر لەوەندە هەزار ساڵە بیری بۆ ئەوە ڕۆیشتووە هەمزە بخولقێنێ هەر بۆ ئەوەی موستەحیلەکە بکات بەمومکین. بۆچی ئەمەت دەنگی کۆنسنانتی دیکەی حازربەدەست بخاتە پێش ئەو بزوێنانەی هەمزەی خستنەپێش، خۆ لە هەزاران هەزار شوێنی دیکەدا وەهای کردووە کە هەمزە فۆنیم نەبێت و مەوجوود نەبێت بۆچی لەجیاتی (ئێرە ئاو..) نەگوترا (فێرە، ژاو). ئنجا ئەگەر بڵێ چ قەیدی هەیە هەمزەیان تێدا بەکار بهێنێت منیش دەڵێم چ قەیدی هەیە دان بەوەدا بهێنێت کە هەمزەش وەك (ف، ژ) فۆنیمە و دەنگە و پێکهێنەری وشەیە و بەلادان و گۆڕانی واتا یا نامێنێ یا دەگۆڕێ؟ ئەم ڕاستییانە بۆچی بکوژرێن؟ هەر هەتا هەمزە بکوژرێ؟

چەندێکی فکرم دێنم و دەبەم بۆ ئەوەی هۆیەك بدۆزمەوە فۆنۆلۆجیسی ڕۆژئاوای ئیقناع کردبێت بەوەی هەمزە فۆنیم نییە هەر ئەوەندەم بەبیردادێت کە لە کۆنەوە

نیگاری بۆ دانەندراوە نیتر چاوی بەنەبوونی ڕاهاتووە، دواتریش دەرکی کرد کە بەزۆری وەیا هەمیشە بزوێنی بەدوادا دێت لەوەڕا یەکەتەوەردوو دڵی تەسکین بوو بەوەی کەوا هەمزە هەروەک نیگاری نییە فۆنیمی ڕەسەنیش نییە... جا ئەگەر ئەمەش سەبەب نەبێ هیچ سەبەبێک نامێنێتەوە لە ڕووبەڕەی زمانناسی و دەنگسازیدا بەبۆرە ئەتویلیش پشتگیری لەو ڕایە بکات چونکە دەنگی هەمزە نەک هەر هەیە و بەس، بەڵکو لە دوو ڕووەوە پێش دەنگەکانی دیکە دەکەوێتەوە:

١- دەنگی هەمزە یەکەم فۆنیمی ئاوازەدارە (دواتر لەسەر ئەم حاڵە دەدوێین).

٢- لە هەموو زمانانادا هەیە کە دەزانین فۆنیمی دیکەی وەک (چ، ژ، ط، ص، ڤ، ث، غ، پ، گ، ڎ، گە، ذ، ڵ، ح، خ، ض، ظ، ع) هێندەی هەمزە پەرەسەندوو نین.

لە دیاردەی پێشکەوتنەوەی هەمزە لە بزوێن ڕاستییەکی فۆنۆلۆجی هەیە زۆر بەسەیری سەردوێن کراوە: هەمزە بزوێن بەدوا خۆیدا دەهێنێت نەک بزوێن لە هیچەوە هەمزە خەلق دەکات و دەیخاتە پێش خۆیەوە. لەو دێڕانەی دواتردا ڕاستیی مەسەلەکە ڕوون دەکەمەوە بەداخەوەش کەس لەسەری نەنووسیوە وەیا بۆی نەچووە تا سەرچاوەیەک یارمەتیی نووسینەکەم بدات چی لێرەدا دەیڵێم شتێکە یەکەم جارە بەگوترێ یاخود هەر نەبێ بەلای خۆمەوە یەکەم جارە، چونکە نە لە کەسم بیستووە و نە لە کەسیشم خوێندۆتەوە:

ڕۆشنبیری کورد، دەنگناسان بەتێکڕایی!

نەک تەنها هەمزە بەڵکو سێ دەنگی دیکەش لەوانەی پێیان دەڵێن (حروف الحلق) لە کوردیدا بەدەگمەن نەبێ بێ بزوێن نایەن. دەنگەکانی (ء، هـ، ح، ع) هەمیشە لە سەرەتای وشەدا بزوێنی ئاشکرا لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن.

دەنگی هەمزە بەرمۆوورترین دەنگی ئاوازەدارە، هێندێش بەرمۆوورە لە عەینی ژێ دەنگەکانەوە، کە ئاوازە پەیدا دەکەن، دەردەچێت.

دەنگی (هـ) بەرمۆوورترین دەنگی کەیە کە ئەگەر هاتبایە بەژێ دەنگان بکەوتبایەوە دەبوو بەهەمزە. هەر ئەم نزیکاییی شوێنی لێوە هاتنیانیشە دوو ئەنجامی بەخشیوە.

ئەنجامی یەکەم ئەوەیە کە دەنگی (هـ)ش بەزۆری وەک هەمزە لە نێو توێژی وشەدا تێ دەچێت بەنموونە کاری (هات) لە ئایندەدا دەبێتە (دێت) و بەدەگمەن نەبێ ناگوترێ (دەهێت)، لە سلێمانیش بۆتە یەت. لە ڕێژەی فەرماندا دەبێتە بێ

گێل ئەگەر توركی تعال ئەر عەرەبی

بێ ئەگەر كوردی وەگەر فارسی بیا

كاری هێنام دەبێتە دێنم. هەرچەند دەشگوترێ (دەهێنم)، بەڵام لە فەرماندا بەزۆری (بێنە) لەباوە چونكە نیشانەی (ب) بزوێنی نییە وەك كە نیشانەی نابندە (نە) بزوێنی هەیە. (هارین) لە وشەی لێكدراودا دەبێتە (دەستار) نەك (دەستهار). (هاویشتن) لە لێكدراودا دەبێتە (ڕەشاوێژ) نەك (ڕەشهاوێژ).

ڕاهەژاندن بۆتە ڕاژاندن

ڕاهێڵ بۆتە ڕایەڵ

هەڵهاتن بۆتە هەڵاتن

هەڵهێنان، هەڵێنان

لەمەوە دەردەكەوێ، تێچوونی دەنگی هەمزە لە ناو تویژی وشەدا وەك تێچوونی دەنگی (هـ) هیچ پێوەندیی بەقۆنهم نەبوونەوە نییە: دیاردەیەكە دەچێتەوە بۆ سروشتی هەردوو دەنگ كە لە ژووررووی هەموو دەنگانەوە دێن. هەر بەهێی داخوازی فۆنەتیكیش وا چاوەڕوان دەكرێ دەنگی هەمزە كە ئاوازەدارە ئامادەتر بێ لە دەنگی (هـ) بۆ ئەوەی لە ناو تویژی وشەدا خۆی بەدەنگی ئاوازەداری بزوێن ببەخشێت.

ئەنجامی دووەم ئەوەیە كە لە زۆر وشەدا هەمزە و هێ بەیەكدی دەگۆڕدرێنەوە:

لە فارسی: أنار، أنجیر، أنگبین، أنبان، أبر، آوردن

لە كوردی: هەنار، هەنجیر، هەنگوین، هەنبان، هەور، هاوردن

ئۆنە بۆتە هۆنە

ئەیوان بۆتە هەیوان

ئەڵووژە بۆتە هەڵووژە

ئاسان، هاسان

ئێسك، هێسك

چونكە دەنگی هەمزە و (ع) ئاواز مدارن بەیەكدی دەگۆڕدرێنەوە

(ئاسمان – عاسمان)، (ئەرز – عارد)، (ئەزیەت – عەزیەت)، (ئەژدەها – عەزیا)، (ئەبابەیلێ – عەبابەیلێ)، (ئەستەم – عاستەم)، (علیق – ئالیك)، (عومەر – ئۆمەر – هۆمەر)، (ئەنتیکە – عەنتیکە)، (ئەلەتریك – عەنەتریك)، (ئەنەدۆل – عەنەدۆل) هەر چوار دەنگی (هەمزە، هـ، ح، ع) کە لە قورگەوە دێن بزوێن بەدوا خۆیاندا دەهێنن. دوو دەنگی (ح، ع) کە کوردی رەسەنیش نین دوای ئەمەی پەرینەوە بۆ ئاخاوتنی کوردی هەمان دەستووری (هەمزە، هـ)یان بەسەردا دێت. لە عەرەبی هەردوو دەنگ دەشێ بوەستێندرێن وەك (رعب، نبع، سعی – رحب، نحو، رمح – بەلام لە کوردیدا وشە نییە ئەو (ح، ع)ە تێدا بێ بزوێن بێت وەك عیو، عەزیا، حوشتر، حەفت..) ئاوناوەیەك نەبێ کە بەدوا بزوێندا دەوەستن وەك (پەح، تەح – دەعبا «لە دابەوە هاتووە – مەعیەن «لە معینەوە هاتووە..)

ئاشزانم وشەی (بلَم) لە کوێوە هاتووە بەخۆی و (ح)ی بێ بزوێنیەوە.

قسە لێرەدا لەگەڵ ئەو وشانەیە کە شکڵی کوردییان وەرگرتووە نەك وشەی عەرەبی کە وەك خۆی ماوەتەوە وەك (بەحر – بحر). لە ئینگلیزیشدا دەنگی (هـ) وەك دەنگی (هەمزە) هەم لە بەرایی وشەوە دێت هەم بزوێن بەدوا خۆیدا دەهێنێت. وشە هەیە وەك (Re - hearsal) بەهۆی پێشگرەوە دەنگەکەی (هـ) تێیدا ناو تویژ بکا لەوانە بەولاوە زۆربەی هەرە زۆری دەنگی (هـ) لە فەرهەنگی ئینگلیزیدا دەکەوێتە بەرایی وشەوە

وشە هەیە شکڵی (هـ)ی تێدایە بەلام ناخوێندرێتەوە وەیا دەنگەکەی (هـ) پێش دەیەخرێ وەك (When, Where) وشەی (Who) بە (هوو) دەخوێندرێتەوە. سەرەتای ئەو وشانەی بە (هـ) دەست پێ دەکەن وەهان:

(hy. hu, ho, hi, he, ha) واتە بزوێن دەکەوێتە پاشیەوە وەك هەمزە.

ماملەی فارس لەگەڵ (هـ)دا جودایە چونکە لە ناو تویژ و کۆتاییی وشەدا دەردەکەوێ وەك (ئەهرەمەن، نهادن، بەهرە، شاه، ماه، کوتاه، ستوه)..

بەهەمەحاڵ لەوێشدا دەکەوێتە دوای بزوێنەوە، لە سەرەتای وشەوەش هەر دەبێ بزوێنی بەدوادا بێت وەك دەزانین زمانەکان هەموویان یەك دەستووری دەنگسازییان نییە بۆیە ناشێ دەستووری ئەمیان بەبەڵگە دابندرێ بۆ ئەویان وەیا حوکمی دەنگسازیی غەیری خۆی هەڵوەشێنێتەوە

ئاوناوەیەك لە کوردیدا (هـ، ح) بەیەکدی دەگۆردرێتەوە وەك (هفت، حفت – هەوا

حەوا هونەر، حونەر..).

لە کوردیدا ئەوەندەی سەرنجم گرتبێ تەنها لە دوو وشەی (ئنجا ئەم)دا دەنگی هەمزە لە بەرایی وشەدا بێ بزوێن ئاشکرا هاتووە دیارە (ئنجا)ش بەئەصل (ئەم جارە)یە لە کۆتایی وشەی کوردیشدا دەنگی هەمزە لە (نەء، بەء)دا هاتووە کە گۆڕاوی (نا، با)یە.

دەنگی (ھ) لەبەری سۆران و تێکڕای کوردستانی خوارووا بەدەگمەن نەبێ لە ناو توێژی وشەدا نەهاتووە وەک (نهوم، سەریهوردی -) هەرچەند بەئەواوی لە زاری کرمانجیی سەروودا دەنگی (ھ)م بەتاقی نەکردۆتەوە بەڵام وایزانم لەوێدا پتر دەنگی (ھ) هەم بەوەستاوی و هەم لە ناو توێژی وشەدا دێت لە کرمانجیی سەروودا مەیلێک هەیە بۆ وەستاندنی دەنگی بەرایی وشە ئەنانەت (لە) دەکرێ بە (ل). ئەمەش تا ڕادەیەک لەو دەستوورانەی دەنگسازیدا بەدەر دەداتەوە.

بەهەرحاڵ ئێمە خەریکی دۆزینەوەی سەرجوملەی دەنگسازیی کوردی نین، خەریکین بزانین ئایا دەنگی (هەمزە) لە کوردیدا فۆنیمە یان نا؟ لەو نموونانەی کە دەشبەنە ناو نووسینەوە ئەم مەبەستە ڕوون دەبێتەوە. نموونەکانی زمانێکی وەک ئینگلیزی باشتر لە هی کوردیش وەڕاسی ماموستا زلەکانی فۆنۆلۆجی دەدەنەوە چونکە بەلای ئەوانەوە بەرچاوترن، ئنجا لە زمانێکیشدا هەڵدەهێنجرێن کە گوایا دەنگی (هەمزە) تێیدا فۆنیم نییە. یەکچوونی دەنگی (ھ) و هەمزە لە ڕووی هاتن و نەهاتنیان لە ناو توێژی وشەی ئینگلیزیدا و هاتنی بزوێن بەدوایاندا پتر یارمەتیمان دەدەن بۆ نزیکخستنەوەی دیاردەی (حروف الحلق) لە بەرچاوی ئەواندا چونکی لە زمانی ئینگلیزیدا تەنیا ئەم دوو دەنگە هەنە لە گەرووەوە دەربچن پێنجەکەی دیکە لەوێدا پەیدا نین، هەر شتێکی لەبارەی (ح، ع)ەوە بیڵێم ناگاتە بەر چەژی دەنگناسیی ئەوان. بەهەرحاڵ ئەو ماموستایانە دەنگیشمان ئەبیەن خۆ دەنگی ئەوان دەبیەین و زمانەکانیان تا ڕادەیەک دەبنە کێڵگەی تاقیکردنەوەی بیروڕاکانیان لەبەر ڕووناکیی ئەو توێژینەوەی کە ئێمە بەبەڵگە تێیدا دەیکەن بەو پێیە لە نێوان خۆماندا ڕێمان هەیە دەنگی یەکدی ببیەین و ئەگەر شتێکی قەناعەتپەخشمان لەو مەسەلانەدا گوت لە یەکدی بسەلمێنین. من کە لەبارەی هاوچوونی هەمزە و (ھ)ەوە دەستوورێکی دەنگسازیی کوردیم ڕەچاو کرد دواتر زانرا بەڵگەی ئەو دەستوورە لە زمانی ئینگلیزیدا پتر دەست دەکەوێ ڕێم هەیە داوا لە دەنگناسی کورد بکەم چاو بەبڕیارەکانیدا بگێڕێتەوە کەوا بەئەسڵ لە دەنگناسی و دەنگسازیی ڕۆژئاوای وەرگرتوون.

سەیری فەرهەنگی (المورد) بکە دەبینیت لە ئینگلیزیدا دەنگی هەمزە فۆنیمێکی وەهایە کە ئەژماری ئەو وشانەی بەهەمزە دەست پێ دەکەن پترە لە وشەی هەریەکێك لە دەنگەکانی دیکە. هەموو ئەو وشانەی بە (o, i, a) و ئەوانی بە (e) دەست پێ دەکەن (جگە لە ٥٠ وشەیەکی eu کە دەبێتە «یو») سەرلەبەریان هەمزەیین، بەشێکی زۆری ئەو وشانەی بە (u) دەست پێ دەکەن ئەوانیش هەمزەیین. بەحیسابێکی سەرپێیی پتر لە (٤٠٠٠ چوار هەزار) وشەی (المورد) هەمزەییە ئنجا چەند موعجیزەیەکی گەورەیە کە بسەلمێنین ئەو میللەتە لە کۆنەوە حەزی دەکرد وشەکانی بە بزوێن دەست پێ بکەن، کە دیتی هاتنی بزوێن لە بەرایی وشەدا موستەحیلە هات و ئەم هەمزەیەی بەچوار هەزار وشەوە ناو بزوێنی بەدوادا ڕاکێشا و موستەحیلەکەی پێ سەرنەرم کرد. عاجباتیی هەرە عاجباتیش لەوەدا ئەوەیە کە جارێ نەیدەزانی دەنگسازی و بزوێن و کۆنسنانت چین چونکە ئەوسا نەخوێندەوار و کەرەوار بوو. دەبێ جارێکی دیکەش جۆرە موعجیزەکارییەکی کردبێ کە هەمان ڕەفتاری لەگەڵ دەنگی (هـ)شدا کرد خۆ نەشیدەزانی هەمزە و (هـ) لە (حروف الحلق)ن!

دوو دەنگی (غ، خ) کە ئەوانیش بە هی گەروو داندراون، چونکە لە ڕۆخی بەرەو دەرەوەی گەرووەوە دەردێن و لە پێکی قورگەوە دوورن مامەڵەتی کۆنسنانتی (ك، گ)یان لەگەڵدا دەکرێت و لە بەرایی وشەوە بەوەستاوی (بێ بزوێنی ئاشکرا) دێن وەك (خزین، خزم، خز، غریوە، غزە، غلۆربوونەوە..) بەلای باوەڕی منەوە دەنگی (غ) بەحاڵ هی گەرووە چونکە خۆی لە دەنگی (ك) دەخشێنێت، تەنانەت بەهەوڵدان دەشێ دەنگی (ك) پشت (غ) بخرێتەوە ویا (خ) بهێندرێتە وارەی (ك).

هەردوو دەنگیش بەیەکدی دەگۆڕدرێنەوە لەناو تووێژ و کۆتایی وشەوەش دێن وەك (ئاخ، ئاغ، ڕۆخ، بوخت، سیخوڕ – داغ، باغ، ڕاغ، جغز شەغەڵ..).

د. ئاوڕەحمان کە دەڵێ هەمزە فۆنیم نییە دەبوو ئەو زمانانەی بەلای خۆیەوە هەمزە تێیاندا فۆنیم نییە دەستنیشانیان بکات چونکە دەشێ دەنگێك لە زمانێکدا فۆنیم بێت و لە یەکێکی دیکە هەر پەیدا نەبێ. بەنموونە دەنگی (ض) هەر لە عەرەبیدا فۆنیمە. وەك دەزانم لەلای مامۆستاکانی ڕۆژئاواش هەمزە لە عەرەبیدا فۆنیمە. لێرەدا جیاوازییەکی بنجی هەیە لە نێوان فۆنیمبوونی (ض، هەمزە) لە عەرەبیدا: هەرچی دەنگی (ض)ە تایبەتی عەرەبییە، بەڵام کە هەمزە لە عەرەبیدا فۆنیم بێ و هەمان دەنگیش لە کوردی و غەیری کوردیدا هەبێ بۆچی لەوانیشدا فۆنیم نەبێ؟

د. ئاورەحمان لەو بەڵگانەی بۆ فۆنیم نەبوونی هەمزە هێناوینەوە گۆڕانی دەنگی هەمزەیە بەبزوێن وەیا تێچووینەتی.

ئەم بەڵگەیە لەجیاتی من وەرامی خاوەنەکەی دەداتەوە نەك پەخەی من و هەمزە دەگرێت چونکە لە کوردیدا کە دەماودەم بەلێژگەی مێژوودا بێ تۆمارکردن هاتۆتە خوارێ سوانی دەنگ و گۆڕانی بەدەنگێکی دیکە دیاردەیەکە زەق زەق لە چاوان دەچەقێ. ئەو زمانانەی نووسینی کۆنیان هەیە دەقی وشە و ڕستە و ئامێر و ئامرازەکانیان پارێزراون و دەبنە پێوانەی گۆڕان و سوانێکی لە ئاخاوتندا بەسەریاندا هاتووە ئاخاوتنی ئێستاکەی فارسی کە بەسەر زاری فارسەکانەوەیە زۆر دوورە لە شێوە ئەدەبی فارسی (دەری) کە لە هەزار ساڵەوە پێی دەنووسرێت و پێشتریش لە سەردەمی ساسانییەکاندا پێ دەنووسرا زۆریش لە دەقەکانی ئەوسای ماون. جا ئەگەر بەراوردێك لە نێوان فارسیی ڕەمەکی و ئەدەبی وەیا عەرەبیی ڕەمەکی و ئەدەبی بکەیت دەزانیت چۆن تا ڕادەی سەرەوێن بوون لە یەکدی دوورن هەرچی کوردییە تەنها شێوە ئاخاوتنی بەمیرات ماوەتەوە، لە شێوەی کۆنی کەمتاکورتێکی بێ بایەخ نەبێ بەدەست ناکەوێت. ئاوناوە لە ئاڤێستا و پەهلەوی وشەی ئەوتۆ دێت لە کوردی ئێستاکەدا هەیە و لە فارسیدا نەماوە یا هەر نەبووە وەك وشەی (گوشن نەسپ) بەواتای (نێرە ئەسپ) کە لەوێدا وشەی (گوشن) بەواتای نێر لە شکڵی (گون) لە کوردیدا بەردەوامە و لە فارسیدا نییە. لە فرێزی (ئەنووشە ڕەوان) بەواتای (بێ مردن گیان - ئەمر-) وشەی (نووشە) کە بەواتای (مردن)ە لە کوردیدا بۆتە (نووستن) کە برای مردنە و لە فارسیدا وێنەی نییە. لەو تەرزە کەمتاکورتە بەولاوە کوردیی کۆن وەجاغی کوێر بۆتەوە ئنجا کە بێینە سەر باسی قرتان و گۆڕانی دەنگ لە کوردیدا هەمزەی بەستەزمان تێدا ون دەبێ چونکە هەتا بڵێی دیاردەیەکی بەرفراوانە:

یەکێك لەو دەنگانەی بۆ سوان و تێچوون خۆش جڵەون دەنگی (ت) و دەنگی (د)ە. لە کرمانجیی سەروودا هەموو (د)ی دوای (ر) تێ دەچێت وەك (مرن - مردن، کرن - کردن..) لە سلێمانی ئەو دەنگە بەزۆری گلۆر دەکرێت واش دەبێ بەدوا (ن)دا دەبێتە (گ) هەندێ جاریش پێستوومە دەیکەنە (و) وەك کە دەگوترێ (کاك ئەحمەو - لە جیاتی ئەحمەد-). وشەی (مرۆ) و (مەرد) لە بنەڕەتدا یەك شتن.. دەنگی (ت) لە (د)یش خۆش جڵەوترە بەتایبەتی لە دوا دەنگی (س)دا وەك: (دەستگا - دەزگا، دەستك - دەسك، دەستێنێ - دەسێنێ (دەسەنێ)، دەست - دەس، ڕاست - ڕاس..).

وشەی (هەڵ بستە) بۆتە (هەستە) بەتێچوونی (ڵ. ب) وەیا (هەڵسە) بەتێچوونی (ب. ت).

وشەی (ئێسقان)ی سلێمانی کە لە (استخوان)ی فارسییەوە نزیکە لەبەری سۆران بۆتە (ئێسك). (هشەترە پاوانە)ی سەردەمی هەخامەنشی بۆتە (شارەوان). لە زۆر باردا (فرۆشتن، کرۆشتن) دەبێتە (فرۆتن، کرۆتن). لە نموونەکانی پێشووتردا دیتمان چۆن دەنگێك بەدەنگی نزیکی خۆی دەگۆڕێت، یەکێك لەوانەش دەنگی هەمزە بوو.

بێگومان مەیلی مرۆڤ بۆ ئاسانکردنی ئاخاوتن، بەرەو سواندنی دەنگ و سووکتر دەربڕینەوە دەبات هەر ئەم هۆیەیشە وەها دەکات ڕێژەی ناوی کارای تێنەپەڕ لە زۆر شوێنی کوردەواریدا لەجیاتی (و) کە دەنگێکی قورسە (ی) بۆ بەکار بهێنن کە لەو سووکترە نیتر لە جیاتی (نووستوو، ڕۆیشتوو، هەڵستاو) دەڵێن (نووستی، ڕۆیشتی، هەڵستای-). بەری سۆران کە لامی قەڵەو دەکەن بە (ر)ی لاواز لەبەر ئەم هۆیەی سووککردنی دەربڕینە. هەڵبەت دیارە (داخێوێ) لە (دەناخێوێ) سووکترە هەروەهاش (بەرداش) لە (بەردەئاش) و (سەراو) لە (سەرئاو) هەروەك (هەستە) لە (هەڵبەستە) سووکترە.

ئەم تەرزە بەڵگەیە کە لە ئاست هیچ دەنگێکدا نەکراوەتە هۆی بڕیاردان لەسەر فۆنیمنەبوونی هەر بۆیە دێتە حیسابەوە کە لە سەرەتاوە بڕیار دراوە هەمزە فۆنیم نییە، سەرەڕای ئەوەی کە بەدەنگی وەك خۆی (هـ) نەگیراوە تا یەکچوونیان نیگا ڕابکێشێت و هەنگاوی دوایین بۆ بڕیاری ئیعدامکردنی ئەختێك بوەشێ.

بەڵگەی گۆڕانی دەنگ وەیا تێچوونی بۆ ئیسباتکردنی فۆنیمنەبوونی ئەو دەنگە بەتایبەتی لە کوردیدا کە زۆر لە دەنگەکانی دەسوێن و تێ دەچن، دەبێتە هۆی ئیعدامکردنی زۆربەی فۆنیمەکانی چونکە ناب (قیامەت هەر لە بەرخی مەلا ڕابێ) و تەنها هەمزەی پێ ئیعدام بکرێ. بەشێك لە زمانەوانی کورد لە زاراوەی هەمزەش وەتەنگ دێن هەروەك لە زاراوەی (کسرة، ضمة، فتحة)ش قەڵسن، گۆیا ئەمانە پاشماوەی سەردەمی دواکەوتنن، کەچی هەر چوار زاراوە وێڕای ئەوەی کە مەبەست دەیێکن قسەش کورت دەکەنەوە. لە زمانەکانی ڕۆژاوادا وشەیەك نییە (هەمزە)ی پێ بناسرێ، لە هیچ زمانێکی غەیری عەرەبیشدا زاراوەی هێندە کورت و سووك نییە کە کورتە بزوێنەکانی پێ بناسرێتەوە. ئێمە دەڵێین (کورتە بزوێنێ واو بێ) بۆ ئەتەمش

هیچ زاراوەمان نییە چونکە فەتحە کورتکراوەی ئەلف نییە. ئەمانە دەڵێم بۆ ڕاگەیاندنی دەوری لایەنی نەفسیی مرۆڤ لە باسەکانی زانستی ڕووتدا.

ئەو بەڵگەیەی گۆڕانی دەنگی هەمزە لەو وشە عەرەبییانەدا کە دێنە ناو ئاخاوتنی کوردییەوە کە گۆیا ئەویش فۆنیمنەبوونی هەمزە نیشان بدات تەنها لەو حاڵەدا قبووڵ دەکرێ کە دەنگی هەمزە لە کوردیدا نەبێت چونکە ئێمە کە لە ئاخاوتنی خۆماندا دەنگێکمان هەبوو و لە وشەسازیدا بەکار هات و بووە پێکهێنەری وشە و دەستەواژە و بەئەمانی واتا ئەما، چ پایەی کەم ئابێتەوە بەوەدا کە لەبەر قورسایی دەنگەکە وەیا لەبەر شوێنی لە وشەدا بسوێت و بگۆڕێت چ لە وشەی کوردی بێت و چ لە وشەی بێگانە بێت. نموونەکانی کە د. عەبدوڕەحمان لە عەرەبییەوە وەری گرتوون (دائم – دایم، دائرة – دایەرە، مسئلة – مەسەلە، بئر – بیر) هەموویان هەمزەکەیان لەناو وشەدایە کە ئەمە هۆیەکی کافییە بۆ گۆڕینی دەنگەکەی هەمزە وەیا سواندنی چونکە لە کوردی خۆیدا هەمزە لە ناو وشەدا دەرناکەوێ. ئنجا دەشزانین دەنگی (ی) سووکترە لە هەمزە، بەڵام چونکە لە وشەی (مسؤول)دا دەنگی (و) بۆ خۆی قورسە ڕۆشنبیری کورد هەمزەکە دەهێڵێتەوە و نایکا بە (و) هەرچی نەخوێندەوشن بەزۆری دەڵێن (مەئسوول). لە وشەی (مەئیووس)دا هەمزە تێ ناچێ لە (رەئیس و مەرئووس)یشدا هەروەها..

ڕاستییەکەی هەموو کوردێکیش ناڵێ (دایەرە، دایم) بەڵام بەتێکڕایی دەڵێن (قایمەکاری..). ئەمانە هەموو واز لێ بێنە و سەیرێکی ئەو وشە عەرەبییانە بکە کە بەهەمزە دەست پێ دەکەن وەك (ئەمیر، ئەسیر، ئیسهات، ئیستراحەت، ئەحەی ئاسر، ئوستاز، ئومەت..) لە هیچیاندا دەنگی هەمزە ناسوێت و ناگۆڕێت چونکە لە بەرایی وشەوە دێت کەچی چونکی دانیشتووی سلێمانی حەز لە (یۆ..) ناکەن بەزۆری دەڵێن (وێسف، وێنان، وێنە ناوی گۆڕاوی – یۆنە –) دوور نییە وشەی ( وێڵ و تەرتیب)یش لە (یۆڵ و تەرتیب)ەوە هاتبێت کە وشەکە تورکییە بەواتای (ڕێگە). ئەو وشە عەرەبییانەی هەمزەیان لە کۆتاییەوە دێت، بەسەر زاری کوردەوە هەمزەکەیان لێ دەسوێت وەك (رجاء، وفاء، بریء، ناشیء) کە دەبنە (ڕەجا، وەفا، بەری، ناشی) چونکە ئەگەر کوردیش بانایە بێ هەمزە دەبوون.

سەیر لەوەدایە ئاخێوەری ڕەسەکیی عەرەب لە هەندێ ناودا (هەمزەکاری) دەکات و دەڵێت (ئەحمەد، ئەحسین، ئستیڤن) کە لەمانەدا هەمزەکە زیادییەکە دەوری فۆنیم نابینێت وەك کە لە کوردیشدا دەگوترێ (عەولای عومەران) ئەو (ب)ە لە ناوی (عمر)دا

فۆنیم نییە چونکی واتا ناگۆڕێ یاخود کە (کسارە) دەکرێتە (کەستارە) دەنگی (ت) لەویندا فۆنیم نییە.

ئنجا ئێمە لەبەر ڕۆشنایی واقیع و بیروڕای ئەو پرۆفیسۆرانەی هەمزە بەفۆنیم دانانێن و قورسکردن بەفۆنیم دانەنێن دەتوانین پرسیار و وەرامی ئەوتۆیی تەرتیب بدەین:

ئایا لە کوردیدا هەمزە دەنگە؟

بەڵێ دەنگە.

ئایا کە تێ چوو واتای تێ دەچێت؟

بەڵێ تێ دەچێت.

ئایا کە بەدەنگێکی دیکە گۆڕدرایەوە واتا دەگۆڕێت؟

بەڵێ دەگۆڕێت.

ئایا بەسڕانەوەی ئەو دەنگە کوردی ناتەواو نابێ؟

بەڵێ ناتەواو دەبێ.

کەواتە ئەویش فۆنیمە وەك پ.ف.ل!

نەخێر فۆنیم نییە

با بێینە سەر قورسکردن:

ئایا ئەو قورسکردنە بوونی سەربەخۆی هەیە؟

نەخێر.

ئایا مومکینە تێ بچێت؟

بەڵێ تێ دەچێت

کە تێ چوو واتا تێ دەچێت؟ دەگۆڕێت؟

نەخێر نە تێ دەچێت نە دەگۆڕێت.

ئایا کە زەروورەتی مانەوەی بەسەر چوو تێ دەچێت؟

بەڵێ لە زۆر باردا بەناچاری تێ دەچێت.

کەواتە فۆنیم نییە؟

بەڵێ فۆنیمە و دەبێ نیگاریشی هەبێ!

تێبینی:

لەبارەی وشەی (هەناسە):

دوای لێبوونەوە لە نووسینی ئەم گوتارە ڕێکەوت گێڕامیەوە بۆ کتێبەکەی (فرهنگ ایران باستان) و لەوێدا بەسەر وشەی (أن - ئەن)دا کەوتم کە لە ئاڤێستادا بەواتای ئەنفەس هەڵێنان هاتووە، لەوەوە زانیم کەرتی (هەن) لە وشەی (هەناسە)دا ئەو (ئەن)ەیە و هەمزەکەی گۆڕاوە بە (هـ) ئەک وەک من بەمەڵە بۆ شیکردنەوەی چووم... دەمێنێتەوە کەرتی (اسە) لە وشەکەدا کە نازانم لە چییەوە هاتووە.

ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ۹۵، ۱۹۸۲

# تیر و پشکێ لە دەنگسازی

ڕۆژی دووەمی جەژنی قوربانی رابوردوو، دۆستە بەڕێزەکانم د. کەمال مەزهەر و د. ئاورەحمانی حاجی مارف سەریان لێ دام. لە لاڕێیەکی ئاخاوتنەوە تاسەیەکی دەروونم سەرکەڵ کرد و گوتم: لەو جوداییی بیروڕای نێوان د. ئاورەحمان و مندا هەیە لەبارەی هێندێ لایاسی سەر بە فۆنەتیک، کە دەکێشێتەوە بۆ لای ڕێنووسیش زۆر دڵ ناڕاحەتم. هەردوویان گوتیان دەربڕینی بیروڕای جودا کە بنیاتنەر و ڕوونکەرەوە بێ چالاکیی پیرۆز و سوودبەخشە. هەڵبەت منیش لەو باوەڕەدام کە پێویستە بیروڕا سەر وەدەر بنێ بۆ بەربیستن و دیتن، بە هەموو عومریشم پشتگیریم کردووە لە ئازادیی بیروباوەڕ هەر نەبێ لەبەرئەوەی بەزۆری خۆم لە بارێکدا دیتووە یەکێ لەسەر ئازادیی بیروباوەڕ کەوتبێ بەڵام ئەگەر بلوێ و بشێ خاوەن ڕایەکان لەسەر یەک باوەڕ کۆ ببنەوە دەتوانن سوودی ڕوونکردنەوە و بنیاتنان پێکەوە بگەیەننە خەڵق، چەند سوودی دیکەش بخەنە پاڵ ئەو دووەوە یەکیان کەمکردنەوەی ئەرک و کاتە. دووەمیان سوود وەرگرتنە لە ئەرک کاتی پاشکەوتکراو لە مەیدانی دیکەدا. سێیەمیان چەپارەدانی ئاپۆرەی خوێنەرانە لە سەرسووڕکێی نێوان بیروڕای جودادا. چوارەمیان سەرنج ڕاگرتنێکی خۆمە لە کێشەی جوداییی بیروڕا بەولای هەنگاوی تێ خوێندنەوەی سوود و زیانەوە دەڕوات دەچێتە ڕادەی ئەوەی بڵێم تەنساغی و خۆ بەدەست نەخۆشییەوە نەدان ڕاستییەکی وەها بنەڕەتییە پێی ناوێ بەراوردی بکەم لەگەڵ دۆزینەوەی دەرمان بۆ نەخۆش. گەڕان بەدوا دەرماندا ناچارییەکی ڕەزاگرانە لە نەخۆشییەوە بە ملماندا دێت: هەرگیز ناشێ حەز بەنەخۆشی بکەین هەر چونکە دواتر بۆ دەرمان دەگەڕێین. من لە گولانییەکی هاراوتر لە زمان و باسەکانیانەوە نیگام بۆ کێشەی جوداییی بیروڕا دەکشێ وەک لە ڕووداوی ڕۆژانە و دەنگوباسی مێژووش دەدیتری لێک تۆران و ترازانی خەڵق خۆش جڵەوترە لە تەبایی و ڕەبایییان چەندین هۆی بایەخداری یەکبوون دەپێچرێتەوە بەرانبەر یەک هۆی کەم بایەخی لێکترازان. بەدەوری خۆتدا بنۆڕە و بپرسە بۆچی ئەو خەڵقولایە وەها دەستەوپەخەی یەکدی دەبن کە دەبوو لە ئاست هەڕەشەی ترسناکدا وەکو دەستەبرا بن.

ئەم تێبینییە پێشەکییاتەم بۆیە بوو کە بزانرێ من لە مەسەلەی جوداییی بیروڕادا

بەسەر بابەتێکی تازەدا ناکەوم: پێشتر تێوەی ڕاماوم و بە زۆر لادا هەڵم گێڕاوەتەوە. ڕەنگە بەرەو دۆزینەوەی بنەمای خۆشجڵەویی لێکترازانیشەوە مارەم بربێ و پتر لەو کەسەی سەرنجی نەداوێتێ خۆمم زاڵ کردبێ بەسەر بڕیارە ناڤرەجایەکانیدا.

دوو ڕۆژ دوای ئەو سەردانە ژمارە (٩)ی گۆڤاری بەیانم چەنگ کەوت و دیتم گوتارێکی د. ناورەحمانی تێدایە لە ژێر سەردێری (چەند وشەیەك دەربارەی وتاری «لەگەڵ دەنگسازی کوردیدا») بەسەر بیروڕاکانی مندا دێتەوە کە پێشتر لە ژمارەی (٩٥)ی ساڵی (١٩٨٣)ی ڕۆشنبیری نوێدا بڵاو کرابوونەوە بەدەوری نووسینێکی د. ناورەحماندا دەخولانەوە. لەوانیشدا گوتبووم ناڕاحەتم بەدەست جوداییی بیروڕا لە نێوانماندا. کە سەرەتاکانی گوتارە تازەکەی د. ناورەحمانم خوێندەوە یەکسەر قسەکەی یەك دوو ڕۆژ پێشتری خۆمم بەبیردا هاتەوە و دەرلەحزە بڕیارم دا کۆنە قەناعەتەکەم لە پووچاندنەوەی کاری سەلبیی جوداییی بیروڕا بەگەڕ بێنم و بەنیازی مشتومالدانی ڕووبەڕەی بێگەردی برایەتیمان پاکانەیەك بۆ نووسینەکەی خۆم بکەم، لەبەر تیشکی ئەم نیازەدا خەریکی ڕوونکردنەوەی ئەو شوێنانەی کۆنە گوتارەکەم دەبم کە بەخت یاریدەی نەدان بەشێوەیەکی وەها ڕاگوێزرێنە ناو گوتارەکەی د. ناورەحمان کە ئیتر لە منەوە ڕوونکردنەوەیان بۆ ئەوێ لەگەڵ ئەوە و بەدەوری ئەویشدا تێبینییەکی خزمەتی بابەت بکات بە کاغەزی دەسپێرم.

لە کۆتاییی ستوونی یەکەم و سەرەتای ستوونی دووەمی گوتارەکەی د. ناورەحمان، لاپەڕە (٦٢) ڕەخنەیەکی من لە دەستووری دەقگرتووی بەمەلومەرجی ناو کتێبان و بڕیاری یەکجارەکیی بەرنامان نیوانیو ڕاگوێزراوە و لەسەری نووسراوە. بۆ ئەوەی تەواوی هەڵوەستم ڕوون بێ ئەم یەك دوو دێڕەش دەخرێنەوە سەر قسەکانی ئەو شوێنەم. «وەها لە بارێکی دیکەدا بەشێکی ئەو هەڵانەی گەشتی بێ ڕابەر بە مرۆڤی وەکو منی دەکات بە ڕۆشنایەیی ئەو دەستوورانە ساغ بکرێنەوە». من مەترسیی دەستووری قەراردادە و گەشتی بێ ڕابەر، وێکڕا لە حیسابمدا بوون، پاڕانەوەشم بۆ گەشتی بێ ڕابەر لەوەوە دێت کە بیروڕای ئەو تەرزە گەشتە، بەعادەت، دەبڕێتەوە بۆ بەر ڕووناکیی دەستووری ناو کتێبان.

لە ئاست ئەو وەرام و بەسەرداچوونەوانەی کە د. ناورەحمان لە ستوونی سێیەمی گوتارەکەیدا دەیانخاتە ڕوو دەبێ بزانرێ هەرچی ڕایەکی من لەوێدا وەرامی درابێتەوە بە ئەسڵ لە نووسینەکەمدا ڕووی لە ڕابەرە فۆنۆلۆجیستەکانی ئەورووپا بووە. لەو

باسانەدا کە شێوەی عومومییان هەیە موناقەشەی سەرچاوەکانیان دەکرێ. بە نموونە کە داروین بیروڕای خۆی لەبارەی گیانلەبەران دەردەبڕێ یەخەگیری باوەڕی ناو کتێبە ئاسمانییەکان دەبێ نەک تاک تاکی ئیماندارانی. من کە دەڵێم هەمزە فۆنیمە و کەسرە مۆرفۆلۆژیی کوردی...

بکرێ هەر ڕووبەڕووی ڕابەرەکانی فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی دەبم. لە کوردەوارییدا کەس پێشدەستیی لەو بابەتەدا نەکردووە تا بهێتە ڕابەری مامۆستاکانی ئەورووپا ، کە دەنگیشمان نابیستن. بە هەموو باوەڕمەوە وەهام زانیوە د. ئاورەحمان لە خوێندن وەیا گوێبیستبوونی تۆژینەوەی فۆنەتیکی و فۆنۆلۆجیی ئەورووپا هاتۆتە سەر ئەو ڕایەی کە لەبارەی هەمزە و کەسرە موختەلەسەوەی دەنووسێ بتریش بەرم بۆ ئەوە دەچوو کە بەخوێندن پێی گەیشتووە قەت بەدڵمدا نەدەهات کەسی وڵاتی خۆمان کە هێشتا تەقەی فۆنیم و فۆنەتیکی تێدا زۆر بەرز نەبۆتەوە لە پلەی خوێندن وەیا دوای خوێندنیش، بێ سۆسەکردنی سرکە و کورکەی ئەورووپا، گەیشتبێتە بیروڕایەک کە هەر نەبێ بەڕواڵەت عەکسی هەست و پێزانینە بەتایبەتی لە کێشەی هەمزەدا. پرسیارەکانی سەر بەزمان و دەنگیش وەکو باسی کیمیا و فیزیا نین بەبەڵگەی مادی بۆ ئەو ڕابەرانە ساغ بووبێتەوە دەنگناسی، فەلسەفە، ڕێزمان، مێژوو، کۆمەلایەتی بەتێکڕایی میتافیزیک... بەند نین بە تەزموگە (مختبر) تەنانەت کۆمپیوتەریشیان تێدا بەکار بێت بڕیارەکان لە هەست و هۆشەوە دەردەچن لە مەیدانی دەنگی زمانی کوردیشدا ڕابەری غەیری کورد ناتوانێ وەکو کوردێکی سەرنجەر بچێتە ناو شەرازە و ڕایەڵی زمانەکەوە. ئەو نموونانەی لە گوتاری ئێمەماناندا دێنەوە دەرەنگ بەخەیاڵی بێگانەدا دێت یان هەر نایەت.

لە ستوونی دووەمی لاپەڕە (٦٣) ئەم قسەیەم خراوەتە نێوان دوو کەوانەوە «ئەوەندەی بزانم دەنگناسان لەبارەی فۆنیم نەبوونی دەنگ دواین هەر ئەوەندەیە کە د. ئاورەحمان لە گوتارەکەیدا باسی کردووە» بەدوا ئەوەدا دەنووسێ «ئەو چەند دێرە کەمەی من تنۆکێکە لە دەریایەک».

هەڵبەت من ناشێ مەبەستم ئەوە بووبێ کە لە قسەکەی د. ئاورەحمان دەفامرێتەوە چونکە هیچیشم نەخوێندبێ و لێک نەدابێتەوە عومرەکەم لێی ئاوەشێتەوە شتی وەها سەراولیکەی هەژارم مەبەست بووبێ. منێکی تەقوێ فێر بووبم چۆن وەهام لێ ڕەچاو دەکرێ؛ مەبەستم، لە زەمینەی داسەپاندنی ناساندن و سنووردانان بۆ واتای

یم شتێکم نەبیستووە و نەخوێندووتەوە دژی ئەو ڕاگەیاندنە بێ کە نووسینەکەی د. ڕەحمان بەدەستییەوە دەدا قامووسیش دوو دێڕی کورتی بە تەعریف هێناوە بۆ نیم. کە دەگوترێ یان کە من دەڵێم زەوی ئەستێرەیەکی بچووکە بەدەوری ڕۆژدا خولێتەوە نەهاتووم بڵێم زانستی جیۆلۆجی و فەلەک و بایۆلۆجی هەزار کتێبیان سەر دانەندراوە. د. ئاورەحمان خۆیشی نەیویستووە چی دیکە لەو دەریایەوە ڵێنجێ لەبەر بێ لزوومی.

هەر لەو ستوونەدا بەسەر قسەیەکمدا دێتەوە کە گوتوومە بەشێکی کۆنسنانتی کپ ڕانەن بەبردنەژوورەوەی هەواش پەیدا ببن ئینجا دەڵێ «بەڕاستی ئەم تاقیکردنەوە یەی مامۆستا مەسعوود بە هیچ جەشنێک لەگەڵ فەرمانی فۆنەتیکدا ناگونجێ.» من دوا ئەوەی تاقیکردنەوەکەم باس کردووە گوتوومە. « لەگەڵ ئەمەشدا ئەو تەرزە نگانە کە برای دەنگی سروشتییش هیچ کامێکیان نابنە فۆنیم چونکە ناتوانێ دەنگی کە بەدوا خۆیدا بهێنێ و وشە دروست بکات. جگە لەوەی کە هەرگیز ناتوانێ ئاوازە پەیدا بکات چونکە ئاوازە لە ڕێی قوڕگەوە بەرەو دەرەوە دەردەچێت. هەر بۆیەشە وازەدار بەرەو ناوەوە پەیدا نابێ». خوێنەر دەبینێ من نرخی ئەو دەنگانەم زانیوە عەکسی هێنای قسەکانی د. ئاورەحمان و ئەو هێندە قسەیەم کە ڕای گوێستووە بۆ ر گوتارەکەی. ئینجا ئەگەر لزووم نەبێ بگوترێ دەنگی (هـ) کە بەرەو ناوەوە پەیدا بێ فۆنیم نییە دەبێتە عەیب لەو ڕابەرە زلانەی فۆنۆلۆجی پێمان بڵێن فیکە و لرخە نیم نین. لە کدوولەی تەریشدا کەس بەتەما نەبووە بڵێ ئەمانە فۆنیمن، نەک هەر نیم نین، بەڵکو کەس بەخەیاڵیدا نایێ دەنگی زمانین. تەعریفی فۆنیم و دەنگی انی بەسن بۆ ناساندنیان یاخود هەر نەبێ لرخە و فیکە و کۆکە لە خەیاڵان مکێنێتەوە.

کە باسی لرخە و فیکە هاتە ناوەوە تەجرەبەکەی من دەبێتە هەنگاوێکی ونکەرەوەتر چونکە هەر نەبێ دەنگی (هـ، ت، ف)ی بەرەو ناوەوە لە دەنگی ئاخاوتن کەن. سەرنجدانیشم لەو ڕاستییە کە ئاوازە لەو دەنگانە پەیدا نابێ وردبینییەکە سوودی دەنگسازی تەواو دەبێ. وا ئێستا دەڵێم ڕستەی (بەبڕای خۆم بڵێم) تاقی وە لەگەڵ خۆتدا لە ڕێی بردنە ژووری هەواوە گوێت لە شتێکی مەفهووم دەبێ، بەڵام بەئاخاوتن حیساب دەکرێ و نە دەنگەکانیشی فۆنیم وەیا دەنگی زمانین. تێبینیی کە زۆرن وەکو (قسەی تووتی، ئەو دەنگەی لە میارەی پشیلەدا بە «میاو» دەچێ،

دەنگێکی حیلەی ماین کە بانگهێشتی جانووەکەی دەکاتەوە لەو شوێنەی قورگییەوە دەردەچێ کە دەنگی «ح» لە قورگی بنیادەمەوە دەردەچێ) هەموویان لە فیکە و لرخە شیاوتری قسە لێوە کردنن. پسپۆڕی زۆر شارەزای مۆنتاژی دەنگ دەتوانێ لەو دەنگانە وشە پێکەوە بنێ. لە ئەوانێکی کۆنی (سامی شوا) کە بەکەمانچە، لە ژێر عینوانی (العاصفة – غرق المسافرین – ألام واحزان موسیقی) بڕی کردبۆوە گوێت لە یەک دوو وشەی مەفهووم دەبوو کە بە کەمانچەکەی دەرکاندبوونی. هەڵبەت ئەمانە هیچیان نە ناخاوتنن و نە فۆنیم و نە دەنگی زمانی، مەگەر تەعریفێکی تازە لەو بابەتانە دەرچێت و بیانگرێتەوە. لەوەوە ڕێم دەبێ وەرامی پرسیاری د.ئاورەحمان بدەمەوە کە دەڵێ: «مرۆڤ بۆ عەکسی واقیع بوەستێ سەرەڕای ئەوەش خۆی بۆ هەناسە سوار بکات. ئەگەر فۆنۆلۆجیستەکان ئەو جۆرە قسانەیان بکردایە دەبوو هەڵوێستی مامۆستا مەسعوود چی بوایە؟».

لە وەرامی ئەو پرسیارانەدا دەڵێم من بۆ سەپاندنی واقیع هاتم عەکسی واقیع وەستام نەک بۆ لەقاندنی. زاناکان هەناسە ڕاگرتنیان تاقی کردەوە تاکو بزانن گیانلەبەر چەند دەقیقە بێ هەناسە هەڵێنان دەژێت خۆ ئەوانیش عەکسی واقیع ڕۆیشتن. دێن حاڵەتی بێ کێشی پەیدا دەکەن عەکسی هەموو یاسا و دەستووری مادە ئینجا ئەگەر بگوترێ ئەم تاقیکردنەوانە بۆ پاراستنی ژیان و گەشتی نێو ئەستێرانە منیش دەڵێم تاقیکردنەوەی من زۆرە دەنگەکان دەخاتە پاڵ فیکە و لرخە و ملچەی زمانەوە هەتا کەلەبەرێکی ئەوان بگرێ لە مەیدانی دەنگناسی و دەنگسازیدا. ئەمما ئەگەر فۆنۆلۆجیستەکان قسەی وەهایان بکردایە [ڕەنگە کردبێتیشیان و ئێمە نەمانبیستبێ] دەمگوت: دەک زارخۆش فۆنۆلۆجیست کە زمانت لە لرخە و فیکە هەڵنەنگاوت بۆ بەرەژووورتر، چ ڕێگەی دیکەش شک نابەم پێیدا بڕۆم.

لەبارەی بیروڕام بەرانبەر مامۆستا ڕایەرەکان کە لەو گوتارەدا وەها لێک دراوەتەوە گۆیا من قەدریان نازانم، لێرەدا دەڵێمەوە من دژی ڕابەرێکم ڕێ بە قوتابی نەدات بیروڕای خۆی هەبێ. مامۆستا هەقیەتی و واجیبیەتی ڕای خۆی بە قوتابییەکانی بڵێتەوە، پێویستیشە لەسەر قوتابی ڕای مامۆستا بزانێ. لەوە بەولاوە بێ ئینسافییە لە مامۆستاوە دەنگی قوتابیی چاوساغ و بیرتیژ خەفە بکات. گریمان من مامۆستای دەرسی فۆنۆلۆجیم و لە سوختەکانم نەسەلماند بڵێن هەمزە فۆنیم نییە و ساڵەوساڵ لە ئەزموون خستمن هەتا لە فێرگە دەرکران ناخۆ لێم ڕازین؟ چ ئینسافێکم بەکار هێناوە

مامۆستایەك بە هەڕەشەی نومرە شكاندن سەر بەقوتابی دابنوێنێ بۆ ئارەزووی خۆی، كە دەسەڵاتی دنیایی هەبوو بەپێی سنووری ئەو دەسەڵاتە لە خراپە زیاد دەكات د. ئاورەحمان كە لە ستوونی دووەمی گوتارەكەیدا دەڵێ «بەڵام وەنەبێ بەو چراهانە و راستەشەقامەدا كوێرانە مل بنێم، بەڵكو باش سەرنجی لێ دەدەم و رای خۆمم زۆرە. ئەگەر وا نەبوایە هەڵبەت چەند جار رەخنەم لە رابەران و مامۆستایانم قەناتی كورد و چەركەزی بەكۆ و كەریمی ئەیوویی ونی. تا سەرنۆڤا ئەدەگرت». ئەم قسانە راستن، بەڵام سەرنجێكی لێوە هەڵدەستێ.

١- من ئەمگوتووە د. ئاورەحمان لە ئاست رابەرەكانیدا چاونووقاو بووە ناشزانم چۆنی قوتابییەتیی بەسەر برد لە زەمینەی رەتكردنەوەی رای مامۆستاكانی.

٢- هەموو قوتابییەك ئەو لەخۆبوردووە نییە بەگژ رای مامۆستاكەیدا بچێتەوە

٣- د. ئاورەحمان لە دوای دەرچوونی ئەو بیروڕایانەی دەربڕی كتێبەكەی كە ئەوان راهانەی تێدان لە ١٩٧٦ لە بەغدا چاپ كرا.

٤- ئەگەر قوتابی ناچار بوو لە توترووحەدا بیروڕای مامۆستا بچەسپێنێ دواتر زەحمەتە لێی پاشگەز بێتەوە، چونكە شەهادەكەی بێ سووك دەبێ.

٥- راهاتنی قوتابی بۆ ماوەی (١٥- ٢٠) ساڵ بە گوتنەوەی بێ رەخنەی بیروڕای سەلمێندراو گەلێك مۆم لە مێشكیدا دەكوژێنێتەوە. هاوڕێی منداڵ لەگەڵ هاوزای خۆیدا بە تەنسیرە چ جایی لە سایەی دەسەڵاتی مامۆستایدا.

٦- بەستراونەوەی گوزەران و چارەنووسی خوێندكار بە بەرنامەی سەلمێندراوی ئینجیلی، بەرەو ئەزۆكیی فكرییەوەی دەبات بەتایبەتی لەو مەیدانە هەستیارانەدا كە پێوەندییان بە فەلسەفەی ژیانەوە هەیە.

٧- كە رێگە لە بیری سەربەخۆ بەسترا چاپخانەی ئەوتۆش نامێنێ بتوانێ بیری سەربەخۆ لە چاپ بدات و بڵاوی بكاتەوە.

٨- نەك قوتابی بەڵكو مامۆستای زانكۆ لەسەر بیری ئازاد دووچاری وەستاندنی (ترقیەی علمی) بووە د. ئاورەحمان خۆی لەمە ئاگادارە.

مەسەلەی پاشگەزكردنەوەی گالیلیۆ لە بیر ڕووناكەكانی بەهەڕەشەی دادگای كەنیشتە هی لەبیركردن نییە، سووتاندن و حەپسكردنی فلان و فلانیش لە بیرئازادانی كۆن و نوێ هەر وەها. مامۆستایەكی بەهەڕەشەی نومرە شكاندن

قوتابییەکانی بتۆقێنێ دادگایەکی بچووکی کەنیسەی بەر لە (٥٠٠) ساڵە. لە خۆڕایی نەبوو برناردشۆ ئامۆژگاریی قوتابیی زانکۆکانی بریتانیای کرد کە هۆشی خۆیان تەسلیم بە مامۆستاکانیان نەکەن. وابزانم لەمەوبەر قوتابیی ئینگلیز فێر دەکرا بڵێنەوە ئیمپراتۆریەتی بریتانیا خەریکی خزمەتی مرۆڤایەتییە. ئازادیی بیروباوەڕ بەر لە هەموو شتێك ڕێدانە بەلایەنی بێ هێز بۆ خۆ ڕوونکردنەوە هەرچی لایەنی بەهێزە خۆی ڕێ بەخۆی دەدات پێشم مەڵێنەوە مامۆستا قەناتی و ئەو بەڕێزانەی ناویان بردرا لەوانەن ڕێی بیری ئازاد بە قوتابی دەدەن. دەشێ ئەوان باغەڵ فەراح بن بەلام کێ بەرباری ئەو متمانەیە دەبێ لای مامۆستایەکی دیکە ئەگەر لە سەرەتاوە ئازادیی بیروڕا نەبووبێتە دەستوور. دەشێ. چونکە تەجرەبەی من لەو هەرێمەی ئازادیی تەعبیر و سەپاندنی بیندرێژتر و هەمەچەشنەتر بێ لەو جێلەی بەدرا مندا هات من دڵگەرمانەتر لێوەی دەدوێم تاکو تەوتوزیم گەیاندە مەیدانی فۆنەتیك، بەبەخشن.

له ستوونی یەکەمی لاپەڕە (٦٧)دا د. ئاورەحمان چەندین نموونەی هێناوەتەوە لەو وشانەی دەنگی (ه) کەوتۆتە ناو توێژیانەوە ئەو وشانە هەندێکیان نموونەی دروستن وەك.. بەهرە، بەهار، نهێنی.. بەلام لێرەدا مەسەلەکە پێویستی بە ڕوونکردنەوەیەکی ئەفەسدرێژی زۆر لایەن هەیە.

أ- لە ستوونی یەکەمی لاپەڕە (٣٠) ژمارە (٩٥) ڕۆشنبیری نوێ گوتوومە «دەنگی (ه) لە بەری سۆران و تێکڕای کوردستانی خوارووی بەدەگمەن نەبێ لە ناو توێژی وشەدا نەهاتووە وەك (تەوژم، سەربەوردی..) هەرچەند بە تەواوی لە زاری کرمانجیی سەروودا دەنگی (ه)م بەتاقی نەکردۆتەوە بەلام وا بزانم لەوێدا دەنگی (ه) هەم بەوەستاوی و هەم لە ناو توێژی وشەدا دێت. لە کرمانجیی سەروودا مەیلێك هەیە بۆ وەستاندنی دەنگی بەرایی وشە تەنانەت (لە) دەکرێ بە (ل) ئەمەش تا ڕادەیەك لەو دەستوورانەی دەنگسازیدا بەدەر دەداتەوە».

دیارە من چیم گوتووە. (١) دەنگی (ه) لە کرمانجیی خوارووی بەدەگمەن دەکەوێتە ناو توێژی وشەوە. (٢) لە کرمانجیی سەروودا هەم بە وەستاوی لە بەرایی وشەوە و هەم لە ناو توێژی وشەدا دێت. لە نموونەکانی د. ئاورەحمان ئەو بەشەیان لە بنەڕەتدا لزوومی نییە کە دەیەوێ ئیسپاتی هاتنی دەنگی (ه) بەوەستاوی لە بەرایی وشە بکات چونکە هەموویان بەکارهێنانی کرمانجیی سەروون منیش دانم پێوەدا هێناوە

دواتریش بۆیان دەگەڕێینەوە.

وەك بە لێکۆڵینەوە دەردەکەوێ، کەمبوونی دەنگی (هـ) لە ناو توێژ و بڕربوونی لە کۆتایی وشەی کوردیدا دیارترە تا زمانی فارسی... هەموو وشەی وەکو (ئاگاه، پناه، راه، دهه، دیه...؛ لە زمانی کوردیدا (ئاگا، پەنا، ڕێ، دە...). دەتوانین بڵێین لە کوردیدا دەنگی (هـ) بارتەقای هەمزە بە کۆتایی وشەوە نەماوە فارسیش لە چاو پەهلەوی و هەخامەنشی و ئاڤیستا (هـ)ی کەم بۆتەوە بە نموونە لە پەهلەوی پاشگری ناوی مەعنا (یهـ) بووە لە فارسی و لە کوردیدا بۆتە (ی)، وشە هەبووە لە پەهلەویدا بە (هـ) دەستی پێ کردووە لە فارسیدا دۆڕاندوویەتی وەك .

| | |
|---|---|
| هـان | آن |
| هرم | خرم |
| همانـاك | مـانند |
| هوسکارت | سکالید |
| هـچ | از |
| هنگار | انگار |
| هندیشیت | اندیشید |
| هندوهـ | اندوهـ |
| هندرز | اندرز |
| هنداخت | انداخت |

بنواڕە واژەنامەی کۆتایی کتێبی "کارنامە اردشیر بابکان، بهرام فرەوشی".

دیراسەیەکی تەواوی دەنگی (هـ) لە کوردیدا بکرێ چاکتر بۆمان دەردەکەوێ کە تێپەڕدنی لە ناو توێژی وشەدا دیاردەیەکی مێژوویی و بنجییە لە کۆتایی وشەشدا وەك نەبوویێ وەهای لێ بەسەر هاتووە بەشێك لەو نموونانەی د. ئاوڕەحمان هێناویەتیەوە وەك (پانگهێشتن، نەهات، نەهێشتن، ناهەموار، بێهوودە، بێهۆش...) بەهۆی خێراییکردن کەوتوونەتە نووسینەکەوە دەنا د. ئاوڕەحمان وەك بەدیهییە دەزانێ نموونەکان بایەخیان نییە چونکە کەرتی پێشەوەیان لەلاوە هاتووە بۆ سەر ئەو وشانەی دەنگی (هـ)یان لە بەراییدایە. لە ئەسڵدا (هێشتن، هات، هەموار، هوودە،

هۆش.) بوون و کرانە وشەی لێکدراو [وەك بانگ هێشتن] یان داڕێژراو. ئەم نموونانە سەرلەبەری قسەی د. ئاورەحمان دەربارەی نەهاتنی دەنگی هەمزە لە ناو توێژی وشەدا هەڵدەوەشێنن چونکە چەندێکی بنەوێ وشەی وەکو (دەست نەستوور، نانەمین، بێ نەمەك، بەنێش، تێناڵان، خۆنەنگێوە، چاوناژا، بێ نۆقرە.) دروست دەکرێت. بەهیچ کلۆجێکیش ئەو نموونە نادروستانە لەسەری حیساب ناکرێ.. هەر خوا سەهو ناکا. د. ئاورەحمان کتێبی لەسەر (وشە ڕۆنان) داناوە، ئیتر نموونەکان لە بەرانبەر باخەبەریی ئەودا لەخۆوە دەسڕێنەوە.

نموونەکانی.. (هژمار، ملفرین، هلگرتن، هلهاتن، هنار، هرچ، هشیار، حزحزکەر) هەموویان دەچنەوە بۆ ئەو مەیلەی کرمانجیی سەروو بۆ وەستاندنی دەنگی بەرایی وشە. ئەسڵی وشەکان (ئەژمار، هەڵفرین، هەڵهاتن، هەڵگرتن، هەنار، هەرچ، [یان هورچ]، هوشیار، حەزحەزکەر) بووە. کەس بەخەیاڵیدا نایەت (هش) لە (هوش)ەوە نەهاتبێ. وشەکانی (هنك، حسلت، حشت، عجران، عنکر، عرین) لێیان بەڵەد نیم و نایانزانم تاکو بۆ بنەڕەتیان بچمەوە. ئەوانیش لەسەر لایەنی هەڵە و سەهووی گوتارەکەی من حیساب ناکرێن چونکە قسەم لە زاری کرمانجیی خواروو بوو کرمانجیی سەروو دەنگی بەرایی پریپۆزیشنی (بە، لە) و نیشانەی موزارعەتیش دەوەستێنن.

ب- دەنگی (هـ) ناگاتە دەنگی هەمزە بۆ ئیمتیازی تایبەتی کە لە دەنگەکانی دیکەی جودا دەکاتەوە هیچ دەنگێك نییە وەك هەمزە بەژێ دەنگەکانەوە نووسابێ ئاوازەدارەکان تەنها ئاوازیان لە ژێ دەنگەکانەوە دێت.. دەنگی (د) زمانی - ددانییە (ن) زمانی - لووتییە، (م) لێوی - لووتییە.. هتد. چونکە (أ)یش وەکو هەمزە خزماتیی هەر بە ژێ دەنگەکانەوە هەیە بۆیەیە وەها هەمزە خۆی بێ دەگۆڕێتەوە. هەر ئەم نزیکییەیشە لە نێوانیاندا کە تەلفوێتی عەرەبی (٢٨) بێتە تومەز هەردووکیان بەیەك بێت بەخشیوە لەوەیشەوەیە نرخی دەنگی هەرە دوای (ئەبجەد) تێپەڕی نەکردووە لە (١٠٠٠).

ئیمتیازی هەمزە لە (هـ) ئەوەیە هەمزە بە ژێ دەنگەکان دەکەوێتەوە هەرچی (هـ)، وەك بای هەناسە بە هیچ شتێك ناکەوێتەوە دەنگی (ع) - وەك هەست دەکەم - جیرانی (هـ)ە بەڵام تامی هەمزەی پێوەیە بۆیەیە زۆر جاران وەکو هەمزە دەبێتە جێگری ئەلف یان دەبێتە هەمزە یان هەمزە دەبێتە (ع).. بە نموونە:

| | |
|---|---|
| مابین | مەعبەین |
| رابە | دەعبا |
| ئەرز | عارد |
| عەسکەر | ئەسکەر |
| وعدە | وادە |
| سادە | سەعدە |
| مزرعە | مەزرا |
| کعبە | کابە |
| بەعطل | باقل |
| نعلەی ئەسا | علەعی ئەسا |
| بەعەجلە | بەنەجلە |
| ئەژدەها | عەزیا |
| رابعە – رەعبە | رابی |
| دەعوا | داوا |
| دەعوەت | داوەت |
| مەعقوول | ماقوول |
| معاملە | مامڵەت، مامڵە |
| معروف | مارف |
| مەعلوومە | مالوومە |
| معلم | مالم |
| عاشق و معشوق | ئاشق و ماشووق |
| ئەتبار | عەتبار |

هەروەها دەنگی (ع) لەگەڵ (ح) بەیەکدی دەگۆڕدرێنەوە چونکە جیرانی یەکدین و بە ژێ دەنگیش دەکەونەوە. دزەییاتی و بەشێکی خەڵقی ناوچەی کۆیێ سەرلەبەری (ح، ع) بەیەکدی دەگۆڕنەوە. (عەمەد، حەلی) لە بەغدا دەمخوێند گوێم لێ بوو پیرێک سەموونی دەفرۆشت دەیگوت (سەموون عار – لە جیاتی حار) دەرکەوت بەقسەی خۆی

پێویسته بۆیه ناوناوه بەیەکدی دەگۆڕێن وەك.

| | |
|---|---|
| احوال | هەواڵ |
| حرکه | هەرەکە |
| هفت | حەفت |
| حرام | هەرام |
| هەموو | حەموو |
| حیزە مەبز | هیزە مەرۆ |
| حەقیەتی | هەقیەتی |
| حقه | هزقه |
| حەلوا | هەلوا |
| چۆڵ و هۆڵ | چۆڵ و حۆڵ |
| حەتا (حتی) | هەتا |
| حەولدان | هەوڵدان |
| حمزه | هەمزە |
| بەحەواوە | بەهەواوە |

زۆر زەحمەتە دەنگی (هەمزە، ه، ع، ح) بە (ق، ز، ر، ش، ن...) بگۆڕێن، بشگۆڕێن لە ڕێی نادروستەوە دەبێ.

فۆنەتیك، كە من نەمخوێندووە و هەر بە لێكدانەوە و كەمتاكورتێكی خوێندنەوە -نەك خوێندن- تێی دەگەم، دەبێ ڕێ بۆ ئەم دیاردانە دەربكات و ئەوەی لێی شارەزایە دەستوورەكانی بدۆزێتەوە وەیا بیانسەلمێنێ. بەهەمەحاڵ چونكە دەنگی هەمزە پتر لە هەمووان لە پەكی قوڕگ و زێ دەنگەكانەوە نزیكە [تەنها دەنگی نەلفی لێ بترازێ] ئیمتیازی وەرگرتووە و وەهای كردووە مامڵەتكردن لەگەڵیدا جودا بێ لەگەڵ ئەمەشدا میللەتان بەپێی باری ئاخاوتن و گوێزەگوێز و گۆڕانی دەورووبەر و پێداویستیی هەمەجۆرەی ژیان و گوزەران و دەیان كاریگەریی دیكە دەنگی كۆن دەسوێنن وەیا دەیپارێزن، دەنگی تازە پەیدا دەكەن و بەیەكدییان دەگۆڕنەوە وا دەبێ

میللەتێك نازانێ دەنگی ناهاوتنی میللەتەکەی دراوسێی بڵێتەوە. تۆ سەیری ولاتی نێوان زێی گەورە و گچکە بکە کە پێی دەڵێن سۆران.. لە هەر زێیەکیان بپەڕیتەوە باری ناهاوتن دەگۆڕێ.. لە دەربەندی ڕەمکان ئاوا بیت بۆ دیوی پژدەر فەرقێکی گەورە پەیدا دەبێ.. لە سلێمانی بەرەو هەڵەبجە بڕۆ لەهجە دەگۆڕێ، پێی ناوێ هەزار میل دوور بکەویتەوە یان هەزار ساڵ چاوەنۆڕی بکەیت بۆ گۆڕانی چۆنایەتیی ناهاوتن. ئنجا هیچ سەیر نییە زمانی کوردی لە ماوەی پتر لە دوو هەزار ساڵدا گۆڕان بەسەر دەنگەکانیدا هاتبێ و هێندێکی لێ سوابێ، وەکو ث، ذ، ص، ض و دیکەش تێ کەوتبێ وەکو ح، غ، وەیا جێگەی دەنگ لە وشەدا لەق بووبێ وەکو هەمزە و (هـ) کە لە کۆتایی وشەدا نەماون و لە ناو تویژیش یا هەر نین یا دەگمەنن. زمانی کوردی نووسینی نەبووە لە کۆنەوە شایەدی بدا بۆ ئەو گۆڕانە مەگەر لە دوو ڕێگەوە بەڵگە بدۆزینەوە. یەکیان، لە بەراوردکردنی نێوان لەهجەکانی ئێستاکەی کە دیارە چەند لە یەکدی دوور کەوتوونەتەوە وەك کە لەهجەی بەغدا و تووتس وەیا ئیسفەهان و تاران لە یەکدی دوور کەوتوونەتەوە. ڕێگەی دووەم ئەوەیە کە بچینەوە بۆ ئەو نووسینانەی شێوەی کۆنی وشەی زمانە ئێرانییەکانی پاراستووە. بە نموونە لە دوو کتێبی فرهنگ ایران باستان و مزدیسنا و ادب پارسی، ئەم وشانە و هی دیکەش دەدیترێن کە لە ئاڤێستا و لە هەخامەنشیدا دەنگی هەمزە لە ناو تویژی وشەدا هەبووە.

لە لیستەی وشەی ئاڤێستایی و هەخامەنشی و پەهلەوی، کۆتایی فرهنگ ایران باستان، نووسینی پور داود. لە لاپەڕە (۲۵۸) تاکو نیوەی لاپەڕە (۲٦٥) ئەم وشانە دەبینیت:

| | |
|---|---|
| ئەئیریەنە – ڤەئیچە | مەئیتەنە |
| ئەئورڤەنت | مەئیفە |
| ئەئورروشە | مەئیشە |
| ئەیەئوشە | مەئیریە |
| پەئیتی | مەئوئیری |
| پەئیس | مەرەغو سەئینە |
| یوئورروش ئەسپ | مەئوردو |
| تەئوروونە | ئەئیرە مەنە |

| | |
|---|---|
| ئرمئیتەئونە | ڤەئیریە |
| خشەترە ڤەئیریە | ڤیش هەئورڤە |
| خرەئوس | ڤونوروکەشە |
| دەئیس | هەئوشیەنگە |
| رەئیتیە | هەئوسرە ڤەنگە |
| زەئیرینە | هەئیچ |
| زەئورونە | هەئیهەت ئەسپە |
| زەئورڤا | هەئورڤە |
| سپێنتو مەئیئیو | هەرونیڤە |
| ستەئورە | هوتەئوسا |
| فرەزەئیئتی | هڤرە خشەئیتە |
| گەئو | گەئوش |

لە لیستەی وشەی پەهلەوی کە هەشتا وشەیەکی تێدایە تەنها یەکێکیان هەمزەی لە ناو توێژیدایە ئەویش (پشوش هئوروستان)ە دوای ئەمانە لیستەی فارسی دێت، ئەو وشانەی تێدایە کە ڕیشەی دەچێتەوە بۆ کۆنینە، هەر لە نیوەی لاپەڕە (٣٦٥)ەوە دەگرێتەوە تا چواریەکی لاپەڕە (٣٧٠) تاکە یەك وشەی نییە هەمزەی تێدا مابێتەوە

لە کتێبی مزدیسنا و ادب پارسی، نووسینی فرەوشی، چەند وشەیەك هاتووە هەمزەیان کەوتۆتە ناو توێژەوە وەك..

دیانوە «سانسکریتییە» ل ٣٧

هشڤەئیڤە پەراوێزی ل ٤٨

هەئومە ل ٤٩

هی دیکەش هەن بەلام لە لیستەی پێشووتردا هاتن. لە لاپەڕە (٩٠) هەمان سەرچاوە ئەم ڕستەیە هاتووە: مائازارەیونیش زەرەثوشترە ما پوئوروشەسپەهی ما دوگدوئام ئەئیهەرە پەئیتیش. واتە «مەئازارێنە زەردەشت، نە پووروشەسپ نە دوغدو، نە مامۆستایان».

دوغدو دایکی زەردەشتە.

لەم وشانەدا ڕێنووسەکەیانم هێناوە سەر ڕێنووسی کوردی بۆ ئەوەی دەست لە شکڵی ئەو پیتە بدەم کە نرخی هەمزەی هەیە. هەرچەندە ڕێنووسی فارسی پشتی پێ نابەستری بەڵام چونکە لە زۆر وشاندا حەرفی ئەوتۆیان لە لاتینییەوە بە (ی) هێناوە کە ئەگەر وشەکە بۆ فارسی نووسرابایە ئەو حەرفەیان دەکرد بە هەمزە بۆیە باوەڕ دەکەم نووسینەکە ڕاست بێ بە تایبەتی چونکە زۆر ئەو پیتانەی بە هەمزە حیساب کراون چوکڵەیان بەسەرەوەیە بە نیازی نیشانەی جوداکەرەوە. فارسیش هێندەی کوردی دوژمنی هەمزەی ناو وشە نییە لەم ڕۆژانەدا گوێمان لە وشەی (هەمەنیی) دەبێ هەمزەی سەرلەبەری ئەو نموونانە دواتر سواون دەنگی دیکەشیان لەگەڵدا سوواوە (زەرەتوشترە) بۆتە زەردەشت. (ئەمیشتە مەندە) بۆتە بەهمەن وشەی (گائوسپێنتە) بۆتە گوسفند لە فارسیدا. لەم موناسەبەیەدا دەڵێم د. ئاورەحمان لە ستوونی دووەمی لاپەڕە (٦٦)، لەبارەی تێچوونی دەنگی (هـ) لە وشەی (دەستهار – دەستار)دا نووسیویەتی «بەیەکەوەهاتنی سێ دەنگی کۆنسنانتی بێ ئاوازەی (س) و (ت) و (هـ) گرانە بۆیە یەکێکیان تێدا چووە». ڕاستە ئەم سێ دەنگە بێ ئاوازەن، سەرەڕای بێ ئاوازیی یەکەم و دووەمیان وەستاویشن، بەڵام دیسانەوە ئەم ڕاستییانە هۆی تێداچوونی دەنگەکەی (هـ) نین د. ئاورەحمان چەند حاڵێکی سەرەکیی لەو دیاردەیەدا فەرامۆش کردووە.

١– وشەی پشت، هشت، چشت، تەفت، فستق، فستوق... هەموو مەرجەکانی (دەستهار)یان تێدایە و هیچ دەنگێکیش لەو سێ دەنگە بێ ئاوازەی لە هەر وشەیەکدا هەیە تێ نەچووە. وشەی (ڕاستهاوێژ) سێ دەنگی (س، ت، هـ)ی تێدایە بارتەقای (دەستهار) لە وشەی (دەستکورت)دا دەشێ دەنگەکەی (ت) لە وشەی (دەست)دا بمێنێ و دەشێ تێش بچێ و وشەکە ببێتە (دەسکورت – وەکو دەسخۆر، دەسکوژ، دەسکرد...).

٢– لە وشەی (دەستدرێژ)دا دەنگی دوای (س، ت) دەنگی (د) کۆنسنانت و ئاوازەدارە نەک کپ کەچی بەزۆری دەگوترێ (دەسدرێژ – وەکوو دەسڕەنگین، دەسماڵ، دەسنوێژ– دەزنوێژ، حەفڕەنگ – حەڤڕەنگ).

٣– لە وشەی (ڕەشهاوێژ)دا دوو کۆنسنانت (ش، هـ) بەدوا یەکدیدا هاتوون کە چی وشەکە دەکرێتە (ڕەشاوێژ) و (هـ)ەکە تێ دەچێ.

٤ - لە (شیربەهابی)دا تەنها یەك (هـ) لە نێوان دوو ڤاوڵدایە كە ئاوازەداریشن. ئنجا تێ چووە و سڕاوەتەوە و وشەكە بۆتە (شەربایی) وشەكانی (دەهاوێ، دەهێنێ)ش یەك (هـ)یان تێدایە لە نێو دوو ڤاوڵدا كەچی بەزۆری (داوێ، دێنێ) بەكار دێت. دەتوانم بڵێم موزاریەی (هات) بێنێتە (دەهێ) بەڵام نەكا ئیعتیراز بگیرێ بەوەدا كە سڕانەوەی لە موزاریعدا بەیەكجاری ڕێ نادا بە نموونە قبووڵ بكرێ لزووم نابینم (دێ، بەت) بەشایەد بگرم. وشەی دیكەش زۆرن لەم بابەتە.

٥ - لەو ڕایەی د. ئاوڕەحمان تەعلیل نییە بۆ هەڵبژاردنی دەنگی (هـ) بۆ تێدا چوون.. بۆچی نەگوترا (دەسهار دەتهار)؟ بۆچی دەبێ قیامەت هەر لە بەرخی مەلا ڕابێ؟

كەواتە هاتنی سێ كۆنسنانت دەخلی نییە بەسەر تێداچوونی (هـ) لە دەستهاڕدا بەپێی سەرنجێكی لە دەنگەكانی كوردیم گرتبێ و دیاردەی دەنگی گەروویم تێدا ڕەچاو كردبێ تێچوونی (هـ) لەو نموونانەدا دەچێتەوە بۆ سروشتی دەنگی (هـ) كە دەرووی لە دەرووی دوو دەنگی ڤاوڵی (ا، ی)وە نزیكە بۆیە لە زۆر باردا خۆی بە ئەوان دەبەخشێ لە ئاست بزوێنی (و)دا وەها خۆبەخشكەر نییە چونكە دەنگی واو لێوییە و لە دەرووی (هـ)وە دوورە بۆیە كاری (هۆندییەوە) لە موزاریعدا نابێتە (دۆنێتەوە) وشەی (دەهۆڵ، سەهۆڵ) كە بۆتە (دۆڵ، سۆڵ) بە سووانی عادەتیی (هـ)ەكەیان تێ چووە نەك بە قۆناغی (ماضی و مضارع)دا وەك (هات، دێ..) بە سەرنج دەربەكەوێ (هـ) پتر بۆ بزوێنی درێژ خۆبەر دەدات: هەرچی كاری (هەناردی)یە چونكە بەزۆری لە سەرەتاوە كراوەتە (ناردی) بۆیە لە موزاریعدا دەبێتە (دەنێرێ) نەك لەبەر هاتری بزوێنە كورتیلەی دوای (هـ)ی (هەناردی) كە فەتحەیە. جارێ هەر وشەی (بەرەڵا)م بە بیردا دێت كە لە (بەر هەڵدراو)ەوە هاتووە و دەنگی (هـ) تێیدا خۆی بۆ فەتحە بەخت كردووە بەڵام چونكە وشەكە وەها شێواوە هیچی بەسەر هیچی نەماوە دەستووری لێ وەربگیرێ بۆیەیە هیچ دەلالەتێكی سەر بە (هـ) نابەخشێ. وشەی (هەنووم) هەر دەمێنێتەوە بە (دەهەنووم) نەك (دەنووم). لەگەڵ ئەمەشدا مەرج نییە دەستوورە باسكراوەكە بچێتە پلەی حەتمییەتی یاسای كیمیا و فەلەك چونكە ئاخاوتن بەلای (تجرید)دا بۆتەوە پتر لەوەی مادی بێ. بە نموونە كاری (هاری) كە (دەستار)ی لێ وەرگیرا لە موزاریعدا نابێتە (دارێ). ئەگەر (هیهاندی)م لێ بسەلمێنن بەكاری ڕابردوو وەك كە لە نووسینمدا بەكارم هێناوە لە موزاریعدا نابێتە (دیچێنێ) بەڵكو دەمێنێتەوە بە (دەهیچێنێ). وشەكانی (بەرهەڵست، بەرهەم، بەرهەتاو، بەرهەڵبێتە سەر هەڵقەنە..)

وەکو خۆیان بێ سووانی دەنگی (هـ) دەهێننەوە کەچی (هەریری هەڵهاتە، دەغڵی هەڵهاویتە) دەبنە (هەلاتە، دەراویتە) بەڵام (دەرێنان، دەرهێنان) و (هەلاتن، هەلهاتن) و (هەلاویشتن، هەڵهاویشتن) هەموویان باون بەهەمەحاڵ سروشتی دەنگی (هـ) و جیرانەتیی لەگەڵ ڤاولدا هۆی ئەم ئاڵوگۆڕەیە.

ئەم ڕوونکردنەوەیەمش لە منەوە بۆ جولبەجێیی نییە.. دەنگناسانی کورد با سەرنجی لێ بگرن، ئەگەر بەرەو دروستییەوە بوو لە هەمووان پیرۆز بێ دەنا خەزنە نییە بەرۆشێ بۆ بخورێ چ تەعلیلەکەی د. ئاورەحمان ڕاست دەرچووبایە و چ ئەمەیان ڕاست دەرچێ وەیا دەرنەچێ هەردووکیان ویستوویانە لە ڕێی فۆنەتیکەوە دیاردەیەکی سووانی دەنگ ڕاڤە بکەن. بەوردبوونەوە لە تاقیکردنەوەی دەنگی دیکە بۆ تێچوون و تێنەچوون لەو تەرزە شوێنەدا کە دەنگی (هـ) تێ دەچێ پتر قەناعەت دەهێنین بەوەی کە سروشتی (هـ) دەوری هەیە لە تێچوونی بەتموونە هەرچی کاری هەیە وەکو (کێشای یاری، پاراستنی، پێوای، ئاڵاندی، ئاشتی، وێرای، زانی، ڕازاندییەوە، پاچاندییەوە، تاسا، ڤاراندی..) لە موزارێعدا ئاقییان بکەوە دەبینی دەنگەکەی پێشەوەیان تێ ناچێ وەک کە (هـ) تێ چووە زەحمەتیی دەربڕین کە بێتە هۆی تێچوونی دەنگ لە وشەی وەکو (دەستکەوت، دەستگیران، دەستدرێژ، دەسترەنگین، حەفترەنگ...) دەدیتری کە وشەکان دەبنە (دەسکەوت، دەزگیران – دەزگرە – دەسدرێژ، دەسرەنگین، حەفرەنگ..) لە هەمووشیاندا دەنگی (ت). کە لە ئاوەندایە تێ دەچێ هێندێکیان، بگرە بەشی زۆری وشەکانیش دەنگی ئاوازمداریان تێدایە.

ج– من کە لە گوتارەکەمدا باسی دەگمەنبوونی دەنگی (هـ)ی ناو وشەم کرد وەیا گوتم ئەویش و (ع – ح)یش لە بەرایی وشەوە دێن و ڤاوڵ بەدوا خۆیاندا دێنن مەبەستم ڕوونکرنەوەی باری دەنگی هەمزە بوو کە چۆن وەک دەنگێکی گەروویی دراوسێی ژێ دەنگەکان لە بەرایی وشەوە دێت لەوە بەلاوە ئەو دەنگانە چۆناوچۆنی بێن هەر فۆنیمن و وشە دروست دەکەن و بە گۆڕان و نەمانیان واتا دەگۆڕێ وەیا نامێنێ.. سوانیان بەسەردا دێت و بەیەکەی دەگۆڕدرێنەوە و هەرچی بۆ فۆنیم ڕەچاو کرابێ لەواندا دێتە جێ چ کەمایەتییش بۆ فۆنیم پەیدا نابێ کە لە بەرایی وشەوە بێت وەیا ڤاوڵ بەدوا خۆیدا بهێنێت. (دەنگی گەروویی) دیاردەیەکە هی ئەوەیتێ نییە بەهێی دراوسێیەتی دەنگەکەش لەگەڵ ژێ دەنگەکان تایبەتیەتیی جوداکەرەوە پەیدا دەکات، لەو بوارەشدا لە یەکەم پلەدا هەمزە دێت دووەم (هـ) پاش ئەوان (ع) ئنجا (ح) هەرچی

(غ - خ)ە پشکیان لە دراوسێیەتی ژێ دەنگەکان نەماوە و بوونەتە دراوسێی بەهێنی (ح) و (ك)، سەرەی ئەو دەنگانەش بەمجۆرەیە. هەمزە، (هـ)، (ع)، (ح) ئنجا (غ)، (خ)، (ك). من بەهێنی هەستی خۆم وەهایان دەناسمەوە دەشێ پێش و پاشێك هەبێ بەلام باوەڕ ناکەم گرنگ بێ و دەستوور بگۆڕێ دوو دەنگی (غ)، (خ) بوونەتە برای دەنگە عادەتییەکان و لە هەموو شوێنێکی وشەدا بێ بزوێنی ئاشکرا دێن.

ئەگەر بسەلمێنین هاتنی دەنگ لە بەرایی وشەدا بە قاوڵەوە و نەهاتنی لە ناو توێژ و کۆتایی وشەدا دەبێتە نیسبەت بۆ فۆنیمنەبوونی دەنگەکە دەبێ دان بە شتێکدا بهێنین کە لەو مەیدانەدا قسەی ڕابەرە دەنگناسەکانی ئەورووپا بەجارێ هەڵدەتەکێنێ.. سەیری فەرهەنگێکی فەرەنسەیی بکە و سەر بەو وشانەی داپگرە کە بەپیتی (هـ) دەست پێ دەکەن دوو دەیارەی زەق دەبینیت یەکیان ئەوەیە سەرلەبەری ئەو (هـ)انە بزوێن بەدوایاندا دێت بەتەواوی وەکو هەمزەی کوردی و ئینگلیزی و فەرەنسەیی و... تەنانەت (ئنجا، نەم)یشیان تێدا نییە. دووەمیان ئەوەیە تاکێك لەو (هـ)انە ناخوێندرێتەوە و دەکوژرێن و بەشی هەرە هەرە هەرە زۆریشیان جێگە بۆ دەنگی هەمزە چۆڵ دەکەن هەر بۆیەش بوو گوتم (پیتی هـ) نەك (دەنگی هـ). ناوناوەیەکی یەکجار دەگمەن (هـ) لە ناو توێژی وشەی فەرەنسەییدا دەدیترێ بەلام لەوێشدا هەر دەکوژرێ و جێ بۆ قاوڵی دوایەوە چۆڵ دەکات تەنانەت وشەی بێگانەی وەکو (مەهەراجا، ماهومەت - محەمەد)یش ئەو دەنگەیان تێدا دەسوێت بەکورتی هەر دەڵێی دەنگی (هـ) لە فەرەنسەییدا پەیدا نەبووە و بە خۆڕایی لە فەرهەنگاندا نیگاری دەکێشن ئنجا ئەگەر هاتنی دەنگ لە بەرایی وشە بە قاوڵەوە نیسباتی فۆنیمنەبوونی دەنگەکە بکات دەنگی (هـ) لە فەرەنسەییدا سێ جاران لە فۆنیمبوون دەکەوێ جارێکیان کە لە پێشەوەی وشەوە لە ناوتوێژدا بەقاوڵەوە دەنووسرێ جاری دووەمیان بەوەدا ناخوێندرێتەوە جاری سێیەمیشیان کە خۆی بەقوربانی هەمزە دەکات، هەمزەیەکی پێی ڕەوا نادیترێ فۆنیم بێ. لە ئینگلیزیشدا وەك بارەها گوتم (هـ) لە بەرایی وشە بەقاوڵەوە دێت لە ناو توێژیشیدا دەگمەنە و هەمیشە قاوڵیشی بەدوادایە لە کۆتایی وشەیشەوە نایەت مەگەر لە وشەیەکی وەکو hur)har) کە (هـ)ەکەی دوایێی ناخوێندرێتەوە ئیتر چۆن هەقم نییە بڵێم ئەو ڕابەرانە چی بیڵێن لەبارەی هەمزەوە بایی فلسێکە. دەبوو تەعبیرێکی ناسکتر بهێنمەوە بەلام نووسەری زۆر گەورە تەعبیری یەکجار ڕەقتریان بۆ غەیری خۆیان بەکار هێناوە نەزاکەتی تەعبیریش حەقیقەتی باسەکە ناگۆڕێ بەرانبەر دیاردەی وەها

ئاشکرا ئەنویلی باسکراوی ئەو ڕابەرانە بۆ بایەخ دەزانم.

لێیان ناسەلمێنم ئەو (هـ)ەی کە وجوودی لەو وشانەدا نییە فۆنیمە هەمزەکەی کە بووە جێگرێشی فۆنیم نییە. ئەو ڕابەرانە یان دەبێ بڵێن هەمزە و (هـ) بەجووتە فۆنیم نین و هیچن یان هەردووکیان فۆنیمن خۆ ئەگەر بڵێن بەجووتە هیچن من هەر لێیان ناسەلمێنم. بۆ خۆیان قسەیەک دەڵێن لەبارەی ئەو دوو دەنگەوە تەنها هێزێکی تێدا بێت هەر ئەوەندەیە کە خۆی خۆی هەڵناوەشێنێتەوە لە چاو ئەوەی بڵێن (هـ) فۆنیمە و هەمزەش نا. ڕاستە بێ قیڵە بێ عەیبەکە ئەوەیە هەردوویان فۆنیمن لە ئینگلیزیدا هەردوویان هەن لە فەرەنسەییشدا هەمزە هەیە بەئەسڵ (هـ)ش هەبووە ئێستا لەسەر زمانیان سووک بووە لە لەهجەی بەرتەسکیش ماوە زمانی دیکەی دنیاش پڕن لە هەمزە و (هـ) زمانی وەهاشیان تێدایە هەردوو دەنگی هەمزە و هێ لە بەرایی و ناو تووێژ و کۆتایی وشانیانەوە دێن بەوەستاوی و بەبزوێنەوە ئیتر چیمان دەوێ لەوە زیاتر؟ هەر ماوە داوا لە هەمزە بکەین بەدەنگ بێت و بڵێ کوڕینە فۆنیمم. خۆ هاواریش دەکا بەڵام گوێی تادرێتێ کەچی قورسکردنەکە دەنگیش ناکا دەڵێن فۆنیمە.

ڕوونکردنەوە پێویستە لەبارەی مەبەست لە (سوان)ی دەنگ. مانای چی دەنگ دەسوێ؟ ئایا قۆتانی دەنگ مەبەستە یان سووکبوونی یان بزربوون و دەرکەوتنەوەی یان شرانەوەی لە پەنا دەنگی دیکەدا...؟

سوانی فۆنیمە ئاشکرا سەربەخۆکانی وەکو (ب، ق) هەمزە (د، ر، غ، م، ن، و، س، ی...) دیاردەیەکە هەمووان دەگرێتەوە کورتە بزوێنەکان هەرچەندە سەربەخۆش نین بارتەقای دەنگی ئەلف کە ئەویش بێ کۆنسۆنانت دەرنابڕدرێ سەرلەبەریان سوانیان بەسەردا دێت، بەسەرنج ڕاگرتن لەم دیاردەیە دەردەکەوێ کە ئەم پلە جۆراوجۆرانە لە سواندا هەن.

١- نەمانی فۆنیم لە زماندا وەک نەمانی (ذ، ث) لە کوردیدا.

٢- نەمانی فۆنیم لای بەشێکی ئاخێوەری یەک زمان وەک کە لامی قەڵەو لە بەشێکی کرمانجیی خواروو و بەکار نایەت ئەم فۆنیمە لە کرمانجیی سەروودا دەرنەکەوتووە. ڕەنگە بشێ بڵێین (پەیدابوونی فۆنیم لای بەشێکی ئاخێوەری زمانی کورد) چونکە لە سەردەمی مادەکان و هەخامەنشیشدا دەنگی لامی لاواز و قەڵەو جارێ پەیدا نەبووبوو بەتموونە ئەلبورز ئەلوەند یەلغ لەو سەردەمانەدا

(هەرە بەرزەنیتی. ئەنورقەنت. باختەری)یان پێ گوتراوە (فرهنگ إیران باستان ل، ۲۹۸)

٣- گۆڕینەوەی دەنگ بەیەکێکی دیکە وەك کە دالی (مەند) لە سلێمانی بەگاف دەگۆڕێ (دەربەنگ).

٤- سوان و مانەوەی فۆنیم لە وشەدا وەك کە دەگوترێ (دەستد) و (دەستك) وەها (قەننە) و (قەڵنە).

٥- مانەوەی فۆنیم لە نووسیندا بێ ئەوەی بخوێندرێتەوە ئینگلیزی و فەرەنسەیی پڕن لەو نموونانە.

٦- گۆڕانی دەنگی فۆنیم لە دراوسێیەتیی دەنگێکی دیکەدا وەك کلۆرکردنی (ك، گ)ی بەرابیەی (ی) لە کوردیدا وەیا گۆڕانی (س) بە(ز) لە تەك دەنگی ئاوازەداردا (دەستگا= دەسگا= دەزگا. دەستگرە= دەسگرە= دەزگرە). لە نێوان زمانەوانانی کورد وەها ڕۆیشتووە کە هاتنی دەنگی (ل)ی وەستاو لە پێش (ت)دا دەبێتە هۆی گۆڕانیان بە (ڵ، ط) وەك (خلط، پالطو، قەڵطارە..) ڕاستییەکەی دەنگی (ل) و (د)یش ئەو کارە دەکەن و دالەکە قەڵەو دەکرێ بەرەو (ض) دەبێتەوە وەك غلدە، داڵدە، گۆڕی حەمە خالدان [شوێنێکە لە شاخی باواجی کۆیێ] پالدە جەڵد..

سەرلەبەری ئەو حاڵەتانە دەطلیان بەسەر فۆنیمبوون و فۆنیمنەبوونی دەنگەوە نییە نابنە بنەمای تاقیکردنەوەی دەنگ. لە وشەی وەکو (دەسکرد، دەسکوژ..)دا نابێ بچینەوە بۆ (دەستکرد، دەستکوژ) و لەوێوە بڕیار بدەین کە ئەو (ت)ە فۆنیم نییە هەر چونکە بەتێچوونی واتا نەگۆڕا ئەمە لە ئاکامی گۆڕان و هەڵسوکەوتی زمانەکەماندا گەیشتووینە بارێك لە هەردوو جۆری (دەستکرد، دەسکرد)ی تێدا باوە ئەگەر بمانەوێ لە (دەسکرد)دا فۆنیم تاقی بکەینەوە دەبێ خەریکی فۆنیمەکانی (د، ە، س، ك، ر) بین فۆنیمی (ت) لە هەزاران وشەدا زیندووە لێرەشدا لزووم بەوردبینی و درێژ دابڕین نابینم زمانناس و دەنگناسەکان ئەم حاڵەتانە دەزانن دواتریش وێنەی دیکە لە جۆری گۆڕان و تێچوونی فۆنیم دەبینین..

سوان و گۆڕانێکی دیکە هەیە لە دەنگدا جودایە لەوەی باسمان کرد ئەویش بەدوو بەشی سەرەکی دابەش دەکرێ..

یەکەمیان هاتن و چوونی ئەو نەبرە و توندی و نەرمیی ئاخاوتنە کە حاڵەتی

ئاخێوەر داخوازیی دەکات وەك. تووڕەیی ڕەزامەندی هەڕەشە پاڕانەوە تێ ڕاخوڕین، پرسیار تعجب. ئەبرە و ئاوازی ئەم حاڵەتانە پەیدا دەبن و هەموو ڕستە دادەگرن نەك تاکە فۆنیم کە حاڵەتەکەش بەسەرچوو ئەوانیش تێ دەچن هەڵبەت ئەمانە فۆنیم دروست ناکەن هەرچەند بۆ هێندێکیان نیشانەش داندراوە وەکو (؟!!)

بەشی دووەم هاتن و نەمانی کەسرە موختەلەسەیە کە من پێی دەڵێم قورسکردن قورسایی، ئەم ناوەیشم بۆیە بەسەردا بڕیوە چونکە ئاخێوەر نایەوێ فۆنیم ببزێوێ بەڵکو تاکە مەبەستی ئەوەیە بتوانێ بێ بزوێن کونسنانتێك بەیەکێکی دیکەوە ببەستێتەوە بەنموونە کورد دەڵێ (کردم) هەڵبەت دەبێ دوو دەنگی (ك، د) قورس بکات دەنا ناتوانێ فۆنیمی دیکەیان بەدوادا بهێنێ. لە فارسیدا دەگوترێ (کردم – کەردەم) و بەبزوێنی ئاشکرا تێکی بەستوون کە بزوێنەکان هەڵستان مایەوە قورسایی وەیا کەسرە موختەلەسە فەرمانی تێك بەستن جێبەجێ بکا ئەم قورساییەش کورتکراوەی کورتە بزوێنەکەی فەتحە نییە چونکە کە بەتەجرەبە درێژە دەدەیت بەو ئاوازەیەی کە لە دەربڕینی (ك)ی (کردن)دا پەیدا دەبێ فەتحە پەیدا نابێ ئاوازەیەکی بێ (هویة) کە لە هیچ دەنگێکی بزوێن و نابزوێن ناکات دێتە کایەوە ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی کە ناوی (کسرة مختلسة) بەهەڵە دەزانم چونکە ئەگەر (کەسرە..) بایە دەبوو لە درێژکردنەوەیدا کەسرە پەیدا ببێ. ڕەنگە تەجرەبەکەشم وەکو تەجرەبەی (بردنەوە ژووری هەوا) لێ بەعەیب بگیرێ بەڵام داخوازیی مەنتیقی لێکۆڵینەوەم زاڵترە لە ترسی عەیبداری هەروەك هاتنی دەنگی (کسرة مختلسة، قورسایی) بۆ ناو وشە وەکو هاتنی (د، هـ، و، ع...) نییە کە بریتی بێ لە ڕاگوێستنی دەنگێکی حازربەدەستی بەهێز و زەق هەروەهاش سوانی دەنگەکە وەکو سوانی (د، ه، و، ع..) نییە کە لە ئاکامی ئاڵوگۆڕی زمان وەیا داخوازیی واتا وەیا خۆگۆڕینەوە بەدەنگێکی دیکە وەیا جیرانەتیی دەنگ و دەنگ وەیا جیرانەتیی میللەت و میللەت گۆڕان و تێچوونی بەسەردا بێت. ئەم دەنگە بێ بێزەش هەروەکو هەیەجانی تووڕەیی ئاوازەیەکی تایبەتی بۆ ناو ڕستە دەهێنێ ئەویش بەپێداویستی دەربڕینی دەنگ پەیدا دەبێت. دیسان هەروەکو ئاوازەی تووڕەیی، نەمانی تووڕەیی هەڵدەستێ ئەمیش بەنەمانی پێداویستی دەربڕینی دەنگ تێ دەچێ.

ئەم لێکچواندنەی قورسایی و ئاوازەی تووڕەیی تەنها لە ڕووی (پێداویست)بوونە وەك بڵێم لە یەك پلەدان چونکە لە سەرەتاوە لێکم جودا کردوونەتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا

ئاوازەی توورەیی کەم و زۆر واتایەکی تازە بۆ ناو ئاخاوتن دەهێنێ کەچی قورسایی دەخلی بەسەر واتاوە نییە. ئەم لایەنەش دواتر روونتر دەبێتەوە.

کە قسە لە زمانی کوردی بکەین ئەم چەند دەستوورە لە هاتن و بزربوونی قورسکردنەکە هەڵدێنجرێ..

١- دەنگی سەرەتای وشە کە بزوێنی ئاشکرای بەدوادا نەهات بەناچاری دەنگە بێ هێزەکە پەیدا دەبێ بۆ خاتری دەنگی کۆنسنانتی دووەم بەدوا یەکەمدا بێت وەک ئەوەی هەتا توورە بێت ئاوازەی توورەیی لە قسەتدا دەربەکەوێ. لە کرمانجیی سەرووودا بیستوومە وشە هەیە بەدەنگی بێ بزوێن و بێ قورساییش دەست پێ دەکات رەنگە قسەکە راست بێ چونکە لە وشەی وەکو (فتار، ستاندن، شتومەک..)دا هیچ ئاوازە بەدوا فۆنیمی سەرەتای وشەکاندا نایەت. بەعادەت قورسایی ئاوازە پەیدا دەکات.

٢- لە نێوان ئەو دەنگە کۆنسنانتانەدا کە گونجانی تەواو هەیە (وەکو. ش ت، رد، رت، ن گ، ن د، ل ت، ن ج، س ت) قورسایی پەیدا نابێ چونکە دەربڕینی کۆنسنانتی دووەم یەکی لەسەر قورسکردنی دەنگی یەکەم نەکەوتووە تەک. چونکە قورسایی لەو شوێنەدا نەهاتووە وشەکانی (دەنگ، ماست، پشت، گەنج، بەرد، خەڵت، کەرت، پەند) قورسایی تەحەمول ناکەن بۆیەیشە هەموویان یەک برگەن لەگەڵ ئەمەشدا کە هاتنی قورسایێت خستە نێوان ئەو جۆرە دەنگانەوە واتای وشە ناگۆڕێ. بەنموونە نالی هاتووە لەبەرکێشی شیعر قورسایی خستووەتە سەر دەنگی (س) لەم بەیتەدا، واتای وشەکەش نەگۆڕاوە.

راستی سەیقەڵیە تیغی زمانی نالی
نەرم و توند ئاوی گڵۆرگیرە قسەی پێ دەبڕێ

وشەی (راستی) بەقورسکردنەکە بووەتە سێ برگە لە جیاتی دوو برگە. لزووم نابینم درێژە بدەم بەنموونە هێنانەوە. مەسەلەکە زۆر روونە.

٣- لە نێوان ئەو دەنگانەی گونجانیان لەگەڵ یەکدیدا لە پلەی دووەمدایە وەکو دەنگەکانی (نک، رگ، خ ت، ر ج..) دەشێ قورسایی لە بەینیاندا هەبێت وەنەبێت. وشەکانی (دەنک، مەرگ، بەخت، ورج..) لەوانەن بەیەک برگە دەربهێردرێن هەروەک دەمکێنیشە ببنە دوو برگە و بگوترێ (دە- نک، مە- رگ، بە- خت، و- رج) لە

هەردوو شێوەدا واتای وشەکان ناگۆڕێن.

٤- لە نێوان ئەو دەنگانەدا کە گونجانیان لە پلەی سێیەمدایە وەك. (ن م، ل م، ت ن، س ر، ز ر، ر ز، م ل، ت ر) دەبێ قورسکردن دەرکەوێ تاکو بشێ گونسانێی دووەم لە دەمەوە دەربێ وەك کەلە وشەکانی (گەنم، زەڵم، کەتن، کەسر، بزر، وەرز، هووەل، چەتر..)دا دەبێ قورسایی هەبێ و وشەکان ببنە دوو برگە (گە- نم، زە- ڵم، چە- تر) هەتا فۆرمی وشەکان لەو بارەدا بێ قورساییەکە بەردەوام دەبێ و مومکین نییە هەڵستێ بەلام کە گوتت (گەنمەکە، لە زەڵمەوە بۆ هەڵەبجە، کەتنی وەها نەکراوە، کەموکەسری زۆرە، چاکەی دارا بزرە، وەرزی مەکە، ئەو هووەلانە لە زێوە هاتوون [ هووەل ماسیی زۆر گەورە] چەترەکەم کڕی) دەشێ قورساییەکە هەڵستێ لە هێندێکیشیاندا هەڵستانی قورساییەکە دەبێتە حەتمی وەکو (کەموکەسری، لە زەڵمەوە، چەترەکە کەتنی گەورە) هەر چۆنێکیش وشەکان دەربڕێت واتایان کەم و زیاد ناکا. ئەوەندە هەیە کە قورساییت خستە سەر دەنگێکی وەکو (ڵ)ی (زەڵمەوە) دەزاندرێ کورد نیت وەیا بەشۆخی وەها دەڵێیت یان لەهجەی ناوچەییە.

٥- دەشێ لە دراوسێیەتیی دوو وشەدا وەها رێك بکەوێ دوو دەنگی وەکو (س ت- ش ت) کە لەگەڵ یەکدیدا دەگونجێن، بکەونە تەنیشت یەکتر و بەحوکمی رێزمان نەك دەنگسازی قورسایی بخرێتە بەینیانەوە وەك کە وشەی (گەش) بخەیتە پستەوە و بڵێیت (گوڵی گەشت چنی)، لێرەشدا کە گوتت (ئیمرۆ رۆژی هەرە گەشتە) قورساییەکە هەڵدەستێ و ناشێ دەرکەوێتەوە لێرەدا سەرلەنوێ حوکمی دەنگسازی بەسەر رێزماندا زاڵ بوو. ئەم زاڵبوونە لەم شوێنەدا وەها فەرمانڕەوایە لەگەڵ سەرلەبەری دەنگەکاندا ڕۆیشتووە نەك هەر دەنگی گونجاو، بەنموونە دەڵێی (قسەکەت چووە دڵم) و قورسایی دەخەیتە سەر (ڵ)ەکە بەلام کە گوتت (قسەکەت بەدڵمە) قورسایی نەما و جێشی نابێتەوە لە هەموو حالانیشدا واتا ناگۆڕێ.. نەگۆڕانی واتاش بەهاتن و چوونی ئەم دەنگە بێ هۆزە لەوەوە دێت کە بەتەسڵ دەنگەکە بەشداریی نەکردووە لە واتای وشە بەعنی بەشێکی بنجی و دروستکەر نییە لە ناخاوتندا. تاکە هۆی پێکەوە بەستنەوەی دوو دەنگ بەبێی داهولزیی باری ناخاوتن پەیدای دەکات و هیچ واتاش لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ کە فۆتاش ج واتای لەگەڵدا نەبووە تاکو لەگەڵیدا بفۆتێ. مەرجی یەکەمی بەشداریکردن لە واتای

وشەکە فۆنیمی بۆ دەناسرێتەوە لەم قورسکردنەدا وجوودی نییە. د. ئاورەحمان بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی هاتن و چوونی ئەم دەنگە بێ هێزە بەپێی دەستووری دەنگسازی لە ستوونی دووەمی ل. ٦٤دا دوو نموونەی هێناوەتەوە. نموونەی یەکەمی لە (نووسین، پێنووس) و لە (نووسرا) هێناوەتەوە گۆیا واوی (نووسین، پێنووس) درێژترە لە هی (نووسرا) بەپێی رای د. ئاورەحمان هۆیەکە دەچێتەوە بۆ ئەوەی کە لە (نووسین، پێنووس)دا هێز [هێز= Stress م. م] لەسەر دەنگی (وو)ە بەلام لە (نووسرا)دا هێزەکە دەبرێتەوە بۆ سەر ئەلفی کۆتایی وشەکە. ئینجا دەڵێ: «جا بزوێنێکی درێژی وەك (وو) لە باری بێ هێزیدا وەك (و)ی لێ بێت بزوێنێکی ئێجگار کورتی وەك (ِ) ئەگەر هێزی لەسەر ئەبێ بەدیار ئەکەوێ شتێکی دوور لە یاسا و دەستوور نییە».

نموونەی (نووسین، پێنووس) و (نووسرا) پتر بەلای رێزماندا دەچنەوە بەلام چونکە ناوی هێز و تێچوون و سووك و قورسیی لێ هات قبووڵ دەکرێ و دەشێ روون بکرێتەوە.

١– کاری (نووسی) لەبارترە ببێتە هاوتەرازووی (نووسرا).

٢– واوی (نووسرا) ئەوەندە کورت نییە ببێتە (و– ضمە).

٣– مەسەلەی هێز دەخلی نییە بەسەر کورت و درێژیی واوەکان:

ئەحمەد نووسی

نامە نووسرا

لەم رستانەدا هۆیەك نییە دەنگی واوی (نووسی) بخاتە ژێر هێزەوە و واوی (نووسرا)ش لە هێز بکەوێ.

٤– هۆیەك دەچێتەوە بۆ ئەوەی لە (نووسرا)دا دوو کۆنسنانتی (س، ر) کەمێك واوەکە ئەتەبەنی دەکەن ئەگەر (نووسا) بایە فەرقی نەدەبوو لەگەڵ (نووسی). وشەی (نووسین، پێنووس) بەوەدا واوەکەی هەناسەسوار نابێ کە کۆنسنانتێك لە کۆتاییاندایە چونکە داهوازی هیچ ئەرکێکی نەکردووە.

بۆ پتر روونکردنەوەی خاڵی سێیەم و چوارەم نموونەیەکی زیندووی پر بەپێستی بابەت هەیە. لە پژدەر دەگوترێ (کوشتن، کوشتی..) بەلام لە کاری کارا بزردا ناڵێن (کوژرا، دەکوژرێ) بەڵکو ئەو (ر)ە دەسوێنن و دەڵێن (کووژا) بەواوێکی درێژی وەکو

واوی (نووسا، مووسا). بێگومان ئەگەر لەوێشدا ئەو (ر)ە مابایەوە نەدەکرا واوەکە درێژ بکرێتەوە چونکە هەم لە ئەسڵدا کورتە هەم هاتنی دوو کۆنسنانت لە (گوزرا)دا کاری خۆی دەکرد. ئەگەر مەسەلە هێز بوایە خۆ (گووژا)ش وەکو (نووسرا) کارا بزرە، لە کاری (هەڵترووشکا)دا کە وەکو (نووسا) کارا دیارە هەرچەند مەسەلەی هێز لە بەیندا نییە، چونکە دوو کۆنسنانتی (ش، ك) هەن واوەکە ئەخنێك لێی کورت دەکرێتەوە بەهەمەحاڵ ئەم مونافەشەیە لە بنەڕەتەوە دەخلی بەسەر تێچوونی کەسرە موختەلەسەوە نییە.

وەك پێشتر باسم کرد، هاتوچۆی ئەم دەنگە بێ هێزە تاکە هۆی داخوازیی دەربڕینی دەنگ لە باری خۆیدا پێکی دێنێ هەرچی (Stress) وەیا هێزە دێتە سەر کەسرە موختەلەسەیەکی لە وشەدا مەوجوودە نەك دەبێتە هۆی پەیدابوونی.. تۆ بێنە وشەی (کردم) تاقی بکەوە. لە دوای (ك) و (د)دا ئەو قورساییە هەیە، ئێنجا دەتوانی هێز بخەیتە سەر قورسایی دوای (ك)ەکەوە وەیا دوای (د)ەکەوە وەیا هەردووکیانەوە بەپێی داخوازیی مەبەست، ئەمجا چونکە قورسایی لە دوا (ر)ەکەوە نییە ناتوانی هێزی بەدوادا بێنیت، ئەگەر ویستت هێز بێنیت پێویستە لە پێشەوە قورسایی بخەیتە سەر ئەو (ر)ە و کارەکە لە دوو برگەوە بکەیتە سێ برگە ئێنجا هێز بدەیتە ئەو قورساییە ئەوساش وشەکە لە کوردی دەشۆرێ. کە قورسایی هەبوو پەکی لەسەر هێز ناکەوێ کە ئەشبوو هێز ناچێتە سەر هیچ، لەلایەن واتایشەوە ئەو هێزە چ لەسەر (د، و، ر، م.. ) بێ و چ لەسەر قورسایی بێ واتایەکی تەجریدی بەوشە وەیا ڕستە دەبەخشێ، هەرچی قورساییە واتای پێوە نییە چونکە وەك تەقەڵی درووما نە بۆ شوێنی پێویست بەڵام نەك تەقەڵی مادی وەك دەزوو. لە فەرزی من بەسەهوو نرخی تەقەڵم دابێتێ ئەو هەر دەمێنێتەوە وەك هەیە چ دەخلی بەسەر واتاوە نییە. هێشتان لایەنی گونجان و نەگونجانی دەنگ پتر پێوەندیی هەیە بەتەکوینی وشەی کوردی لەو قورسکردنە چونکە بەشێکی زۆری وشەکان بەحوکمی ئەو گونجانە شکڵ وەردەگرن بەنموونە وشەی (بڵند) کە دوو برگەیە و بریتییە لە (ب- ڵند) بەحوکمی گونجانی (ن- د) ئەو شکڵەی وەرگرتووە چونکە ئەگەر بگوترێ (بڵ- ند) دەبێ قورسایی بخرێتە سەر (ن)ەکە ئەمەش دژی یاسای فۆنەتیکی کوردییە. وشەکانی دەرد، دۆست، سارد، گۆشت، پێت، قەڵت، چەند، رەند، مەند، ئەنگ، شەنگ، جانگ، هەشت، بیست، گەشت.. و سەرانی وەك ئەوان ژمارەی برگەیان بەندە بەگونجان و نەگونجانی فۆنیمەکانیان، ئەمانە هەموویان

چوار فۆنیم و یەك بڕگەن چونكە لە هەموویاندا دوو فۆنیمی كۆتاییيان لەگەڵ یەكدیدا دەسازێن. وشەی (مزر) سێ فۆنیم و دوو بڕگەیە چونكە (ز، ر) بەیەكەوە ناسازێن دەنا وەكو (مشت، مرد، مست) دەبووە یەك بڕگە. هاتنی قورسایی بۆ سەر (ز)ی (مزر) و نەهاتنی بۆ سەر (ش، ر، س)ی وشەكانی دیكە پەیوەندی خۆی وە یا ئارەزووی من و تۆ نییە بەڵكو باری گونجان و نەگونجانی دوو فۆنیمی دوایی وشەكانەوەیە. كە گوتت (ماسەكە مزرە) قورساییەكە دەبێتە دڵخواز، كە گوتت (مزرە سێو) قورساییەكە تێ دەچێ، لە هیچ بارێكیشدا تەفسیری سەلبی و ئیجابی لە واتای وشە نەكردووە. قورسایی لە خۆیەوە وەكو فۆنیمە ڕاستەقینەكان بۆ ناو وشە نایەت، بەئارەزووش نایەت: دەبێ ناچاریی فۆنەتیكی بیهێنێ و نەمانی ناچارییەكە بیسڕێتەوە. هەر چونكە قورسكردن پێداویستی دەربڕینی كۆنسنانتی وەستاوە بۆ لكاندنی بەكۆنسنانتی دوایەوە لە باری تایبەتیدا ج دەخلێكی بەسەر واتاوە نییە، هەندێ جار قورساییەكە لە بارێكدا دەبێ هەڵستانی مومكین نەبێ وەك لە وشەی (فرچك)دا قورسایی سەر (ف)ەكە هەڵستانی بۆ نییە. ئەم ناچارییە دائیمییە هونەری قورساییەكە نییە بەڵكو دڵخوازی لكانی (ف)ەكەیە بە (ر)ەكەوە. ئێمە پێمان دەكرێ بڵێین (فچك، فك، فرك) و فۆنیمی زەقوزۆپ بەلاوە بنێین بەڵام لە هەموو حاڵاندا قورسایی سەر (ف)ەكە دەمێنێتەوە. خۆ مەعقوول نییە بڵێین ئەو دەنگە بێ هێزە گرنگترە لەوانی دیكە، چونكە قسەی وەها لە كەس ناوەشێتەوە هەر نەبێ لەبەر ئەوەی كە لە هەزاران باردا وەكو سێبەری هەور دێت و دەچێت و هەستیشی پێ ناكرێ جگە لەوەی كە وجوودی خۆی بەندە بەو فۆنیمانەوە بگرە وجوودی بەندە بەجیرانەتیی فۆنیم و فۆنیم... بزوێنەكان بەكورت و درێژیانەوە هەم دەشێ بەئارەزوو بیانهێنین و بیانسڕینەوە، هەم بەهاتن و سوانیان واتا دەگۆڕێ وەیا نامێنێ. هیچ مەرجێكی (فۆنیم) لەو قورساییەدا نییە پێداویستی دەربڕینی دەنگە لە باری تایبەتیدا چەندێكی تێش بچێ واتا ناگۆڕێ. لەبەر ئەم تێبینی و ڕاستییە بەدیهییانەیە خۆگیری دەكەم لەوەی پێی بڵێم بزوێن، تۆ بڵێ ئەگەر بزوێنە بۆچی لە كوردی و ئینگلیزیدا ئەمەت وەكو بزوێنەكانی دیكە هەمزە بخاتە پێش خۆیەوە؟ بۆچی هەمزەی دەنگدار و زەقوزۆپی بێ نیگار نەچنە پێش قورسایی بەنیگار؟ هەڵبەت دەزانم چی بەڵگەی دنیا هەیە ناتوانێ ڕابەرەكانی فۆنۆلۆجی ئیقناع بكا دژی ئەو قورساییە. وا من لە جیاتی ئەوان وەڵام بۆ ئەم تەرزە پرسیارە پێشكەش دەكەم و دەڵێم بەر لە هەزاران ساڵ بنیادەم زانی ئەم

بزوێنە یەکجار کز و بێ هێزە بەبەریەوە نییە هەمزە بخاتە پێش خۆیەوە، ئینجا کە گوترا ئەدی چۆن بنیادەم زانی دال و سین و گاف بە بەریانەوە هەیە؟ رابەرەکان دەڵێن ئا ئەمە بەڵگەیە کە هەمزە فۆنیم نییە وەک کە دال و سین و گاف فۆنیمن. دیسان ئەگەر گوترا ئەدی چۆناوچۆنی لە زمانە سامییەکاندا قورسایی بەبەریەوە هەبوو هەمزە بخاتە پێش خۆیەوە؟ لێرەدا بەڕاستی نازانم جواب چی دەبێ، پێشتریش و لە هەموو حالانیشدا جواب نەبوو بۆ ئەو پرسیارەی بڵێ: بۆچی تێچوونی قورسایی هەرگیزا و هەرگیز لە واتا.. تەئسیر ناکا؟ ئەدی فۆنیم نییە؟

بەر لە (٢٧٠٠) ساڵ کە ئەلفوبێ پەڕییەوە بۆ ئەورووپا و نیگار بۆ دەنگی هەمزە دانەندرا بڕیاری نەهێشتن و ئیهمالکردنی دەرچوو.

بەوردبوونەوە لەو دیفاعەی د. ئاورەحمان لە کەسرە موختەلەسەی دەکا بەهێنانەوەی نموونەکانی (نووسین، نووسرا) دەبینین لە حەقیقەتدا بێ ئەوەی پێستبێتی، ئەو خۆی کەسرە موختەلەسە پتر بێ بایەخ دەکات لەوەی من کردوومە چونکە کە دەڵێ دەنگەکە هێند کورتە هێزی لەسەر نەبێ دەرناکەوێ بڕیار دەدا کەوا ئەو دەنگە بەچکەی هێزەکەیە واتە لەبتەرەتەوە بەندە بەهەبوونی هێز. ئەم قسەیە یەکسەر و بێ تەئویل وەها ڕادەگەیەنێ کە کەسرە موختەلەسە؛ بریتی بێ لە هێز چونکە مەعلوومە هێز ناچێتە سەر (عدم، هیچ) قسەکە وەک ئەوەیە بڵێی کابرا هێند موفلیسە ئەگەر پارە ئەخەیتە گیرفانی فلسێک لە گیرفانیدا نادۆزیتەوە دەنگێک وەها بێ وجوودی بەند بێ بە هێزەوە و واتاش نەگۆڕێ چۆن فۆنیمێکە؟ ئینجا چۆن بسەلمێنین دەنگی وەها سەراوی ئەوەندە بایەخی بدرێتێ نیگاری هەبێ [لە حاڵێکدا هەمزەیەکە زەلوزۆپ بێ نیگار بێ] کە نیگاریشی بوو ببێتە برای هیچ یان هەر هیچی بێ تەئویل کە بووش بەهیچ بابەتی زەرەیەک کاری سەلبی و ئیجابی لە واتای وشە نەکردبێ؟ هەر فۆنیمیش بێ؟

نموونەی دووەم لە زمانی ڕووسییەوە هاتووە کە وشە لە حاڵی جەڕدا بزوێنە ئاشکراکانی دەگۆڕێن وەها تێدا دەچن.. کە گۆش دەکرێ هەروەها . گۆیا ئەمەش نابێتە بەڵگە لەسەر فۆنیمنەبوونی ئەو دەنگانە. هەرچەند د. ئاورەحمان هەر هێندە دەڵێ و دیفاعەکەی لە فۆنیمی (ۆ، ێ)ی ڕووسییە بەڵام شوێنی قسەکەی دیاری دەکات کە مەبەستی ئەوەیە لە ڕێی قیاسەوە بسەلمێنین کە تێداچوونی کەسرە موختەلەسەش نابێتە بەڵگەی عەکسی بۆی.

من ڕووسی نازانم ئیعتیرازیشم لە نموونەکان نییە بەڵام لە کوردیدا نموونە زۆرن تێی بناڵێین.

| | |
|---|---|
| لە تۆ دەپرسم | لێت دەپرسم. |
| بەتۆ دەڵێم | پێت دەڵێم. |
| لە تۆ دەگەم | تێت دەگەم. |
| سووتا | دەسووتێ. |
| ئەخوازێ ئەڵڵا | ئەخوازەڵڵا، ئەخەسەڵا. |
| گوتی | دەڵێ. |

ئەم نموونانە و دوو نموونە ڕووسییەکە و هەرچی دیکەی ئەوتۆیی گەڵەکە بکات باری قورسایی ڕاست ناکەنەوە چونکە پێوەندییان پێیەوە نییە ئەمانە سەر بەڕێزمانن و دەچنەوە بۆ لای سینتاکس نەک فۆنەتیک. نموونەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم، وەکو هی ڕووسی حاڵەتی جەری ڕاناوی کەسی دووەمی تاک لە ڕستەکاندا نیشان دەدەن دیارە چۆن بەگۆڕانی ڕاناوەکە لە حاڵەتی نەلکاوییەوە بۆ حاڵەتی لکان شکڵی (جار و مجرور) وێکڕا گۆڕان، هیچ داخوازییەکی فۆنەتیکیش حوکمی نەکردووە (لە تۆ دەپرسم) ببێتە (لێت دەپرسم) کەچی (لە تۆ دەگەم) ببێتە (تێت/ دەگەم). واتای (تێگەیشتن) جودایە لە (لێپرسین) و پتر بەرەو ئاوەی (مجرور) دەڕوات بۆیە شکڵەکەی گۆڕا. لە هەندێ لەهجەی ناخاوتنی کوردی دەگوترێ (دەتۆ ڕادەمێنم- نەک لە تۆ ڕادەمێنم) دیارە (دە)ش نزیکترە لە (تێ). بەو پێیە ئەو لەهجەیە نزکترە لە مەنتیقی گۆڕانی دەنگ تا ئەوەی (لە) ببێتە (تێ) بەڵام بۆی ڕێك نەکەوتووە بەرە بستێنێ. لە کرمانجیی سەروودا بەرانبەر ئەو (دە)یە (ژ) بەکار دێت. (سووتا) دەبێتە (دەسووتێ) بەهۆی دەستوورێکی ڕێزمان هەرچی کاری ڕوودان و کارا نادیار هەیە بەری دەکەوێت و لە هەمووانیدا ئەم ئەلفە لە موزارعدا دەبێتە (ێ) وەکو:

| | |
|---|---|
| سووتا | دەسووتێ. |
| ڕما | دەڕمێ. |
| بڕژا | دەبڕژێ. |
| دیترا | دەدیترێ. |
| خورا | دەخورێ.. هتد. |

هەر عەینی ئەو کارانە لە ڕابردووی بەردەوامدا وەکو خۆیان دەمێننەوە هەرچەند (دە)ی موزاریعیشیان بەسەرەوەیە.

| | |
|---|---|
| سووتا | دەسووتا. |
| برژا | دەبرژا. |
| دیترا | دەدیترا. |

فۆنەتیک چ دەخلی بەسەر ئەم ڕێژانەوە نییە ئاشکرێ یەخەی کورد بگرین بڵێن بۆچی وەهات کردووە؟ (ئەخوازێ ئەڵڵا) دەماودەم لە ماوەی سەدان ساڵدا بووەتە (ئەخوازەڵا، ئەخەسەلا) و چووەتە ئیدیەمەوە. بەڵام دەکرێ بگوترێ (قبوول ئەکا ئەڵڵا) بێ گۆڕان و بێ دەردی سەر. بەهیچ تەئویلێک ئەم گۆڕانە وەیا (گوتی، دەڵێ) باناڕینەوە بۆ داخوازیی فۆنەتیک. زمانە و دەگەڕێ و دەگۆڕێ و یاسا دادەمێنێت و ئێی دەبات و ئێی نابات و لەهجە تا لەهجە فەرق دەکات و دەیان ڕێچکۆڵە پەیدا دەبێ و دەبنە شەقامەڕێ و ئەوەی دەقەومێ یاسای ڕێزمان تێیدا دیار دەبێ و هی فۆنەتیکیش هەروەها، پەند و ئیدیەم و مەتەڵ و فنوونی بەلاغەت و نازانم چی دەزێنێتەوە، جاڕ و مەجروور و کارا و بەرکار و سەدان کەرتی دیکەی ڕێزمان دەوری خۆیان دەبینن و یەکێک دەڵێ (بەتاق و تەنیا) و ئەوی دیکە (تەک و تەنها) سێیەمیان (بەتەنێ تەقێ) بەپێی ڕاهاتن.. خولاسە دیاردەی زمان بەزەمان و مەکان و ئینسانیەوە شەپۆل دەدات و فۆنەتیک یەکێکە لە شەپۆلەکانی و ناتوانێ حوکمی شەپۆلی لەخۆ گەورەتری وەکو (ڕێزمان) بۆ خۆی ڕاکێشێ و ڕێی تەعبیری جودا و دەربڕینی هەمەچەشنە لەو هەڵقە هەمەچەشنەیە ببەستێ. ئێمە.. دەزانین (دەستگرە) دوای سوانی دەنگی (ت) بووە (دەزگرە) چونکە بەپێی دەستوورێکی فۆنەتیکی کوردی دەنگی کپ ئاغڵەب لە جیرانەتیی دەنگی ئاوازەداردا دەبێتە ئاوازەدار بۆیە سینەکەی (دەسگرە) بووە (ز) بەڵام دەستووری دروستکردنی وشەی لێکدراو وەیا داڕێژراو بەجۆرێکی سەربەخۆ لە زماندا هەزاران وشە پێک دێنێ وەک کە (دەستگرە- دەزگرە)ی پێک هێنا ئیتر فۆنەتیک چۆنێکی کار دەکا پایبکا. سەدان وشەی وەکو: کلک تەڵێنە بەردەنوێژ، دەستەبەرە، کێلەقەبر، بزمارکوت شیرەخۆرە، گورگ ئەخۆرە، مەلا خۆرە، گورگ ئەخۆرەی دز ئەیبەرە، سەر هەڵقەنە گێرەشێوێن، سەرپاڵە.. بێ ئەوەی فۆنەتیک کاری تێ کردبێ لە گەردان، لە کوردیدا فۆنەتیک وەهای کردووە وشەی لێکدراوی (گاناسن) ببێتە (گاسن) کەچی لە

فارسیدا هەردوو بەشی وشە لێکدراوەکە بەدروستی دەمێننەوە و دەڵێن (گا وآهن) کورد دەڵێ (حەماغا- لە جیاتی حەمەد ئاغا) هەرچی فارسە دەڵێ (حمد آقا) کورد دەڵێ (دە ئەنگێوم، دەنگێوم) بەلام دەڵێ (ئەنەنگاوتن) و ئالێ (نەنگاوتن) فۆنیمی حەقیقی لە سەرەتاوە وشە دروست دەکات دواتر پێداویستی فۆنەتیک ئاوتووی تێدا دەکات. دەبینی وشەی بێگانە کە ج دەخلی نیمەی تێدا نییە و لە پشت حەفت بەحوان تروورکارە کە دێتە نێو کوردەواری هەر ئاوچەیە جۆرە مامڵەتێکی لەگەڵدا دەکات بەنموونە وشەی مەرەکەبی (کوپنك) لە سلێمانی کافی پێشەوەی گلۆر دەکرێ لە بەری سۆران کلۆر ناکرێ تەنانەت لە بەری سۆران هەر چونکە کاری (پشکووت، گوا، ئەنگووت) لە سەرەتاوە کاف و گافەکەیان کلۆر نەبووە. لە موزاریەدا کە دەڵێن (دەپشکوێ، دەگوێ، دەنەنگوێ) کاف و گافەکە کلۆر ناکەن کەچی لە بەری بابان کلۆری دەکەن خولاسە فۆنەتیك بەدوا وشە و ڕستەدا دێت و خزمەتکاری فۆنیمەکانە هەرچی کەسرە موختەلەسەیە هۆی زادەی فۆنەتیکە چونکە بەپێی داخوازیی دەربڕینی فۆنیم پان دێت یان نایەت، یان کە هات دەسوێت و دەخلی بەسەر واتاوە نییە واتە دەخلی بەسەر تەکوینی وشەوە نییە دەنا دەبوو بەسوانی واتا نەمێنێ. تەکوینی وشە و واتای وشە دوو ڕووی یەك سکەن ئەم قسەیەم لێی هەڵناستێ بگوترێ: بڕگە لە وشەدا یان بزوێن یان قورسکردنی تێدا نەبێ پەیدا نابێ چونکە قسەکەی من خۆی لە بنەڕەتدا وەلامی ئەم ئیعتیرازە دەداتەوە کە دەیەوێ لە پەنا بەهانەی تەکوینی بڕگەوە بایەخ بەو قورسکردنە بدات. سەرنج بگرە دەبینی ئەو بڕگەیەی بەهۆی بزوێنی ڕاستەقینە پەیدا دەبێ ولتاکەی بەندە بەو بزوێنەوە مەگەر جودایی لەهجە و سوانی عادەتی بەسەر وشەدا هاتبێ فۆنیمی گۆڕی بێ وەك کە (مر) بوومتە (مل) وەیا وشەی (شطە) لە هەندێ لەهجەدا دەبێتە (شلە) کە ئەمە دیاردەیەکە دەخلی بەسەر فۆنیمبوونی دەنگەکانەوە نییە پێشتریش باسمان کردووە لە هەموو دنیاش باس کراوە. تێچوونی بزوێنی حەقیقی دەبێتە هۆی نەمانی واتا وەك کە (سەر) بوو بە (سر) واتا نامێنێ هەرچەند ئەو قورساییەش لەسەر (س)ە کە هەر ماوە وشەی (پەنیر) بیبێتە (پەنر، پنیر) لە هەردوو باردا واتای نامێنێ. بەلام قورسایی لەسەر (گەنم) لادە و بڵێ (گەنمەکە) واتا تێك ناچێ.. ئەمەش بەدیهییە.

لە هیچ ڕوویەکەوە قیاسی تێداچوونی قورسایی لە وشەدا لەگەڵ تێداچوون وەیا گۆڕانی فۆنیم ناکرێ ج لە وشەدا بێ ج لە ڕستە و باری ڕێزمانیدا بێ، چونکە ئەگەر

ئەو قیاسە بکەین دەبێ بڵێین ئەمانی دەنگی ئەلفی (ژماردی، سپاردی، ڕژا) لە (دەژمێری، دەسپێری، دەڕژێ)دا وەکو ئەمانی قورسایی لامی (دڵ)ە لە (بەدڵمە). ئەوساش سەرەڕای بەعەطفداچوونێکی ئەوعیی سەرەتایی سەرسووڕێن، دەکەوینە تەناقوزێکی لە حیساب بەدەر چونکە لەلایەکەوە گوتمان ئەمانی قورسایی و ئەمانی ئەو ئەلفانە وەکو یەکدین، لەلایەکی دیکەشەوە زەق زەق دوو دیاردەی ڕێزمان و سینتاکس دەبینین ئەو لە یەکدی چوواندنە ناسەلمێنن: دیاردەی یەکەم ئەوەیە ئەلفەکان لە موزاریعدا نەفەوتاون بەڵکو بەپێی یاسایەکی ڕێزمان بوونەتە (ێ) یاساکەش وەها پەرەسەندووە هەموو کاری موزاریعەی وەکو (سووتا، ڕما، برژا) و هەموو کاری (مبني للمجهول) و هەموو کاری ڕێژەی (نواندی، بواردی، ستاندی) دەگرێتەوە تەنها (خواردی) ناگرێتەوە کە پەیڕەوە: دەسووتێ، دەڕمێ، دەبرژێ، دەنوێنێ، دەبوێرێ، دەستێنێ، دەچێنێ، دەسپێرێ ... هتد. وەك دیارە گۆڕانەکە بەدەستووری ڕێزمان پەیدا بووە نەك فەوتێك.

دیاردەی دووەم ئەوەیە گۆڕانی دەنگەکە لە ئەلفەوە بۆ (ێ) شانبەشانی گۆڕانی زەمانی کارەکە لە ڕابردووەوە بۆ موزاریع هاتووە بێگومان لەو کارانەدا گۆڕانی ئەلفەکە پتر لە (دە)ی موزاریع بەشداریی گۆڕینی زەمان بووە چونکە لە ڕابردووی بەردەوامدا (دە)ی موزاریع هەیە و ئەلفەکەش ناگۆڕێ: دەگوترێ (دەسووتا، دەڕما ... دەبوارد، دەچاند، دەمانستاند، دەیانسپارد ...هتد).

لە ستوونی دووەمی لاپەڕە ٦٧دا وەها هاتووە کە (نە)ی کاری موزاریع، لە ناخاوتنی سلێمانیدا بەهۆی سوانی (د)ی (دە)ی موزاریع پەیدا بووە گۆیا کە دالەکە سوا دەنگەکەی فەتحەی پاشیەوە «بەئاسانی ناتوانرێ تەلەفوز بکرێ» [سەرەتای لاپەڕە ٦٨ی بەیان].

لە پێشەوە دەڵێم کە دالەکە سوا ئەو فەتحەیە نە بەئاسانی ونە بەزەحمەت تەلەفوز ناکرێ. ئەگەر بشسەلمێنین دوای سوانی دالەکە هەمزە هاتووە بەجێگر هەر ئەوەندە مەعلووم دەکرێ کە هەمزە دەنگێکی چالاکە، پتر خزمەتی زمان دەکا لە (ف، ش، چ) دەنا چ قەیدی دەکرد بگوترێ (فەبزم، تەخوم، چەنووسم) ئەمە با لێرە بێت. ڕایەکەی د. ئاورەحمان ئێبیهێی گرنگی دیکە هەڵدەگرێ لە ناخاوتنی سلێمانیدا بەدەگمەن نەبێ دەنگی دال لە بەرایی وشەدا ناسوێ، دەگوترێ دار، دەزوو، دێن... بەو پێیە دەشیا بگوترێ (دەڕوا) بەڵام هەڵقەکە پێڕەوی ئەو شێیانەی نەکرد. ئاوناوەیەکی زێدە کەم

دەنگی (د) لە پێشەوەی وشەدا دەسوێ وەک کە (دای، دێت) دەبێتە (یای، یەت). بەبیرمدا نایەت لە ئاخاوتنی سلێمانیدا دالی بەرایی وتە لە غەیری (دە)ی موزاریعدا کرابێتە هەمزە. وشەی (داخۆ، داخوا) دەشێ ببێتە (ئاخۆ، یاخۆ) بۆیە ناڵێم دالەکەی بووەتە هەمزە، دیارە شەریکی هەیە. بچین بۆ بەرەو کۆتایی وشە دەبینین قەسیدەیەکی نالی سەرلەبەری دەنگی دالی پاراستووە لەو شوێنەدا.

جۆشەش و تاوە لەناو دیدەیی گریانمدا

چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی توفانمدا

بەعادەت ئاخێوەری سلێمانی دەڵێ (گریانمدا، گریانما). ئاخێوەری سلێمانی وشەی (تێدا) دەکاتە (تیا) و هەمزەی تێ ناترنجێنێ. دەشێ بڵێین دوای سوانی دالەکە بزوێنی (ی) هەیە و دەکرێتە کۆنسنانت و بەشەلفەکەی دوایەوە دەلکێ. ئەما لە (تیابا)دا کە گۆڕاوی (تێدادا)یە دیارە دالی (دا)ی دووەم کراوە بە (ی). وشەی (لێرەدا) دەکرێ بە (لێرەیا)، ئەویش دالی بە (ی) گۆڕاوە. (مەیان) لە (مەیدانەوە) هاتووە و دالەکەی بووەتە (ی). (عەوداڵ) دەکرێتە (عەوواڵ) و دالەکەی بە (و) گۆڕاوە. بەپێی رایەکەی د. ناورەحمان لە گۆڕینی (دە) بە (ئە) دەبوو لە برِی (یام، گریانما، یاخۆ، تیابا، لێرەیا، مەیان، عەوواڵ) بێنە (ئام، گرینمنا، ئاخۆ، تیانا، لێرەنا، مەینان، عەوناڵ...) وشەی (یەت) چونکە لە (دەیەت، دەهێت)ەوە پەیدا بووە بەر دەستوورەکە ناکەوێ.. من پێم هەیە بڵێم ئەو وشانەی کە هەمزەکەیان دەکەوێتە ناوەوە ناجایەزن چونکە دەنگی هەمزە لە ناو توێژی وشەی ئێستاکەی کوردیدا نەماوە. بەڵام د. ناورەحمان دەڵێ هەمزە لە سەرەتای بڕگەشەوە بەهارێدەدەر دێت ئیتر بۆ نەبێتە بەرایی ئەو بڕگانەوە؟

لە سلێمانی دەبیەیت وشەی (بەدەل، مەدەد، ئەحمەداوا) و هی تریش بەجۆرێک دالەکەیان کلۆر دەکرێ لە دەنگی زمانی دەشۆرێ و قابیلییەتی نووسینی پێوە نامێنێ. ئنجا ئەگەر (دە)ی موزاریع بەو ئەوازەی کە د. ناورەحمان دەڵێ بوو بێتە (ئە) دەبوو وشەکان بێنە (بەئەل، مەئەد، ئەحمەئاوا).

راستییەکەی گۆڕانی (دە) بە (ئە) هیچ پێوەندیی بەهارێدەربوونی هەمزەوە نییە، هەر ئەوەندە بەئیسپات دەگەیەنێ کە دەنگی هەمزە پتر بەهانامان دێت لە (ق) هەروەک (ی)ش پتر بەهانامان هات لە (غ). (مەیان، حەقڤەیەت) و ئەحمەداوا و بەدەل، هەموویان دوای سواندنی دالەکەیان بەو جۆرەی دەیبیەین لە زاری خەڵقەکە خۆش

هات، نه هەمزە لە توهمە دەپەڕێننەوە نە پشتگیریش لە ڕایەکەی د. ئاورەحمان دەکەن منیش پێم دانەگرت لەسەر بەهانە پێوە گرتنیان چونکە مەبەست ڕوونکردنەوەی مەوزووعە نەك پەکدی سەغڵەتکردن. هەرچی بەڵگەیەکی لێرە و لێرە مەپێشەوەش نووسیبێتم لەبارەی هەمزە و قورسکردنەوە پەخشگیری سەرچاوەی باوەڕە جوداکە دەبێت کە مامۆستاکانی زانستی فۆنۆلۆجییە. د. ئاورەحمان کە لە سەرەتاکانی ستوونی پەکەمی لاپەڕە ٦٦ دەنووسێ: «... بۆ دانەنانی هەمزە بەفۆنیم لە کوردیدا ئەوەی نووسیومە ڕا و بۆچوونی خۆمە و مامۆستا مەسعوود بەخۆڕایی وای داناوە، کە بەهێنی پەسەندکردنی (بەروڕای فۆنۆلۆجیستەکان لەبارەی هەمزەوە) لە پێشەوە (بڕیاری ئیعدامکردنی هەمزەم داوە) قسەیەك بەزاری مندا دەهێنێ. هەرگیز بەو شێوەیە لە زارم دەرنەچووە.

لە ستوونی دووەمی لاپەڕە (٢٠)ی ڕۆشنبیری نوێ، گوتوومە: «فۆنۆلۆجیستەکان کە د. ئاورەحمان لەوانەوە باسی فۆنیمان بۆ دەگێڕێتەوە ئەوە دەڵێن کە لە گوتارەکەدا بەکورتی نووسراوە واتە: فۆنیم ئەو دەنگانە دەگوترێ کە لە زماندا وتە پێك دەهێنن و بەگۆڕان و نەمانیان واتا دەگۆڕێن». چی لە قاموسیش نووسراوە هەر ئەمەیە ئیعدامکردنی هەمزەش بەهیچ جۆرێك وەپاڵ د. ئاورەحمان نەدراوە چونکە بەر لە د. ئاورەحمان بەساڵەها قسەکە نووسراوە و بیستراوە.

ئەگەر ڕابەرەکانی ئەورووپا گوتبایان هەمزە فۆنیمە زەحمەت مەودا مابایەوە لە پێش کوردێکی عێراق کە خۆی خوێندنی لە ئەورووپا تەواو کردووە ڕایەکی دیکە دەربڕێ. ئاسانترە بگونجێ هەمزە فۆنیمە چونکە وەکو دال و میم و شین بەرهەستە و لە وتە و ڕستەدا کار دەکات، بەڵام دنیا بڵێ فۆنیمە و من بڵێم فۆنیم نییە بەو هەموو زەقییەی تێیدایە کارێکی ئاسان نییە. ڕێکەوت وەها بوو لە تۆتۆمۆبێلێکدا کە د. کەمال مەزهەر لێی دەخوڕی بۆ پەکەم جار لە د. ئاورەحمانم بیست کە بیروڕای لەبارەی هەمزەوە هی خۆیەتی، پێشم گوت کە من ئەمەم بەهەمیالدا نەهاتووە. ئەوساش گوتارەکەم دەرچوویوو یان لە چاپکردندا بوو [دەرچوونەکەشی لە گوێنترە]. من هەر چونکە د. ئاورەحمان بەئینسانێکی ڕاستگۆ دەزانم باوەڕ بەو قسەیەی دەکەم، ئەگەر پێشتر لێم بیستبایە لە گوتارەکەمدا باسێکی ئەو لایەنەم دەکرد. بەهەمەحاڵ من هەر جارە باری قسە هاتبێ گوتوومە لەومەتەی ئەلفوبێی ڕۆژهەلات بەر لە ٢٧٠٠ ساڵ پەڕیوە بۆ ڕۆژاوا ئیعدامی هەمزە دەرچووە. لەبەرئەوە جێی خۆی نەبوو دوای قسەکانی

سەرووی بڵێ: «بەپێچەوانەوە بۆم هەیە لە مەسەلەی هەمزەدا من ڕەخنە لە مامۆستا مەسعوود بگرم، چونکە لە نووسینەکەیدا ئاشکرا دیارە، کە ئەو هەوڵی داوە زمانی کوردی بخاتە قاڵبی عەرەبییەوە و فۆنیمی عەرەبی بەسەر کوردیدا ساغ بکاتەوە و بەمە گیان بەبەری هەمزەدا بکات». تێ ناگەم من چۆن و چۆنی گیان بەبەر دەنگێکدا دەهێنمەوە کە کورد لەومەتەی هەیە بەکاری دەهێنێ؟ چما هەمزە (ض، ط، ظ)ە ڕام گواستبێتە ناو کوردی؟ کە بەڵگەش لە زمانی ئێرانیی کۆن وەیا عەرەبی وەیا ئینگلیزی و فرەنسەیی بهێنمەوە کتوپڕی و کواوکوویی و چۆناوچۆنی زمانی کوردی دەخەمە قاڵبی عەرەبییەوە؟ سەرلەبەری کۆڕی زانیاری کورد پێی نەکرا واوی کەشیدەدار بەسەر ڕێنووسدا بهێنێ چونکە دەسەڵاتی نەبوو، گۆیا من تەنها پێم دەکرێ هەموو زمانەکە لە قاڵبی خۆی دەربهێنم! بێگومان لە زەمینەی جوابە جێییدا بەنوکتە ئەو قسەیە هاتووە دەنا هەروەک د. ئاورەحمان بەو ڕایانەی پشتگیرییان لێ دەکات نایەوێ کافرستانی دابهێنێ، منیش ئەمەویستووە لە ڕێی بیروباوەڕمەوە خەڵق بۆ حەج ڕاپێچەک دەم. بەهەمەحاڵ هەرچی بڕیارێکی بۆ هەمزە بدرێ کار ناکاتە سەر لایەنی دیکەی زمانی کوردی، بۆیە ئەگەر (تیرویشکێ ....) لە چارەنووسی هەمزە بهاوێین زەرەر ناکەین. هەر ئەم هۆیەش بوو ناوی ئەم گوتارەمی دیاری کرد بە (تیرویشکێ . .) هەرچی بڕیارێکیش بۆ کەسرە موختەلەسە بدرێ باری زمان ناگۆڕێ بەمەرجێک مانەوەی لەو شوێنانەی تێ دەچێ دانەسەپێ: (گەن – مە – کە) نەبێتە (گە – ن – مە – کە)، (بە – دڵ – مە) نەکرێتە (بە – د – ڵ – مە) (هەڵ – تان – گرت) نەبێتە (هە – ڵ – تان – گرت) (مەز – نە – پیاو) نەبێتە (مە – زنە – پیاو) نەبێتە (مە – ز – نەپیاو). ئەگەر قورسکردن بەنیگارەوە داسەپا و چاری مان و نەمانی تێدا نەکرا زمانەکە وەها دەشێوێ عەیبدار بێت. ئەم زەرەرە چ قیاسی ناکرێ لەوەی کە د. ئاورەحمان دەیەوێ (ی) وەسف و ئیزافە بەدوا ئەو وشانەشدا بنووسرێن کە کۆتاییان بەواوی تیژی درێژ دێت. ئەم پێیە هەرچەند لە گوتندا مومکین نییە دەرکەوێ، هێندەی پێی ئەسڵی وشە و ئیسمی مەعناش درێژ نییە ئەنانەت بەدوا ئەلف و واو و فەتحەدا دەشبێتەوە کۆنەسانت، دیسانەوە خزمەتێکی ڕوونکردنەوەی ڕستە دەکات. بەڵام مەسەلەکە هەر بڕیتیی نییە لە (ی) وەسف وئیزافە کە لە دوا (ی) تیژی درێژدا بزر دەبێ. خۆشم لەم گوتارەدا بەزۆری ئەو (ی)انەم نووسیوە چونکە نووسینیان بێ زەرەرە و بۆرە دەستوورێکیش پشتگیریی لێ دەکات. کە ئەم (ی)ە لە نووسیندا ژیایەوە دەبێ

زمانناسان بیر لە هەموو (ی)ەکی وەك ئەویش بکەنەوە کە بەپێی دەستووری زمان دەبێ هەبێت و لە ئاخاوتندا بەدوا (ی) ئاولدا تێ دەچێت. ئەمەش چەند نموونەیەك

لە کاری (دزی)دا دەبێ ئەو (ی)ە دەرکەوێتەوە

من نووسیم

ئەو دزیی

لە کاری (خشی)دا نابێ دەرکەوێ چونکە لە ڕابردووی تێنەپەڕدا ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك وجوودی نییە.

من خشیم

ئەو خشی

لە کاری (نووسی، دزی ...)دا دەبێ بۆ کەسی دووەمی تاك تەنها (ت) بەدوا کارەکەدا بهێنین چونکە لەو کارانەدا تەنها (ت) ڕاناوە:

من نووسیم، دزیم

تۆ نووسیت، دزیت

لە کاری (خشی، چمی، ڕزی ..)دا دەبێ (یت) بۆ کەسی دووەمی تاك بهێنەوە چونکە تێنەپەڕن:

من چمیم، ڕزیم، خشیم.

تۆ چمییت، ڕزییت، خشییت.

لە کاری (نووسی، دزی)دا بۆ کەسی یەکەمی کۆ ڕاناوی (مان) دێت، دەبێ بنووسری:

من دزیم، نووسیم

ئێمە نووسیمان، دزیمان

لە کاری (خشی، ڕزی ..)دا چونکە تێنەپەڕن دەبێ (ین) بێت:

من خشیم، ڕزیم

ئێمە خشیین، ڕزیین

لە کاری (دەنووسم، دەدزم ...)دا دەبێ ڕاناوی کەسی دووەمی تاك و یەکەمی کۆ بەم

جۆرە بلکێن

من دەنووسم، دەدزم

تۆ دەنووسیت، دەدزیت

ئێمە دەنووسین، دەدزین

لە کاری (دەژیم)دا دەبێ ئەو راناوانە بەدوا (ی) (دەژی)دا بێن:

من دەژیم

تۆ دەژییت

ئێمە دەژیین

ئەمانە بەدیهییەی ڕێزمانن و خۆ لێدزینەوەیان مومکین نییە: بەڵام دەشێ بگوترێ ئەم سەرشێواندنە مەتەڵاوییەی بێ ناوێ، با هەر یەخەی (ی) ئیزافە و وەسف بگرین، منیش بەرهەڵستیی لێ ناکەم دوای ئەوەی بەچاوی کراوەوە بڕیار درا. بەڵام ئەوساش گرفتی (ی) کەسی سێیەمی تاک لە حاڵەتی ئیزافەدا هەر دەمێنێ:

دەستم، چاوم، ترۆزیم

دەستی، چاوی، ترۆزیی

لەمیاندا چ بکەین؟ هەر بڕیارێکی بۆی بدرێ خراپ نییە بەمەرجێ مەنتیقی ڕێزمانی تێدا بەکار هاتبێ. بڕیاری بێ لێکدانەوە نابێتە جێی قەناعەت. کە بڕیار درا بنووسرێ (تەرۆزیی) ئەوساش بێ دوودڵی نووسینی ڕاناوی کەسی سێیەمی کۆ لەو بارانەدا لەخۆوە ڕوون دەبێتەوە:

دەستی، ترۆزیی

دەستیان، ترۆزییان

لەگەڵ (چی)دا بەقیاس دەنووسین:

پیاوی دیت

چیی دیت

پیاویان دیت

چییان دیت

من لە نووسینێکی کۆندا ئەم لایەنەم ڕوون کردبووەوە. وابزانم گوتبووم
ـیاندنەوەی (ی) وەسف و ئیزافە یەك (جدول لۆغاریتم) لە ڕێزماندا قوت دەبێتەوە.
ئێستاش دەڵێم، چاری ئەو جەدوەلە دەبێ بکرێ دەنا نووسەری ئەشارەزا، بگرە
ەزاش، لە ئەفوردەکە بڕ ناکات. خۆ تێنەگەیاندنیش لە کێشەکە مەنتیقی تێدا نامێنێ
ێکە لە سەرەتاوە ژیاندنەوەی ئەو (ی)ەلە ڕێی ڕێزمانزانییەوە هاتە ناوەوە، چ ڕەوای
ەقە زانینەکە هەر هەتا پێنجیەك و شەشیەکی ڕێگاکە تێشك بهاوێ؟ لەم
ناسەبەیەدا دەڵێم، جارێکیان گوترابوو (یازدەم، دوازدەم ...) کە من پێڕەوی لێ
کەم هەڵەیە، دەبێ بنووسرێ: یازدەیەم، دوازدەیەم ئەم ڕەخنەیەش پێنجیەکی ڕێگەی
بوە چونکە کێشەکە هەر بەدوا یازدە و پازدە و نۆزدەدا نایەت:
وشەی (سەر، دووسەر) بزوێنی فەتحەی بەدوا نایەت.
کە (لە)ی جەڕی کەوتە پێش دەگوترێ: (لە دووسەرەوە) واتە (ەوە)ی بەدوادا هات.
کەواتە بۆ (پەنجەرە) دەبێ (یەوە) زیاد بکرێ وەك (یەم) بۆ (یازدە) زیاد کرا:
یازدەیەم
لە دوو پەنجەرەیەوە
وشەی (کوڕ) کە ئەداتی تەعریفی بەدوادا هات دەبێتە (کوڕەکە) واتە (ەکە)ی بۆ
ت. ئەویش بەقیاس لە (یازدەیەم) داوا دەکات ئەو فەتحەیەی بۆ بپارێزرێ و
وترێ:
یازدەیەم
برایەکەم
زۆربەی کوردیش وەها دەڵێ تەنها ئەو لەهجەیەی دەڵێ (یازدەیەم) پێڕەوی لە
ستووری خۆی ناکات و دەڵێ (براکەم).
کورد دەڵێ: دەشتاودەشت، دزاودز، دەستاودەست. بەپێی دەستووری پاراستنی
تەی کۆتایی (یازدە) دەبێ ئەم ئەلفەی (او)یش بپارێزرێ و بگوترێ:
چیاباوچیا نەك چیاوچیا
دەریایا و دەریا نەك دەریا و دەریا
من کە دێم دەنووسم (یازدەم، دوازدەم ..) ئاگاداری ئەو دەستوورانەم بۆیە ڕێ

بەخۆم بەدەم تا ئەو ڕۆژەی بڕیارێکی چاوساغانەی شارەزایانە لە هەموو ڕووی کێشەکە بەدری ڕێگایەك بگرمە بەر کە لە سەرجەمی دەستوورەکانی ئەو کێشەیە لا نەدابێ. بەڕاست، کە دەنووسرێ: دووهەم، سێهەم، ئۆهەم، دەهەم .. ئۆزدەهەم دەستوورێکی فارسی بەکار دەهێنرێ. بەهەمەحاڵ دووەم، ئۆیەم، یازدەیەم ... ئۆزدەیەم کوردیترە یانی لەبارترە.

لەو ناوچانەی کە وەکو من دەڵێن (یازدەم) تەنها لەو وشانەدا کە بریتین لە یەك کۆنسنانت و یەك بزوێن، لەو حاڵەتانەدا (ی)ەك دەهێنن بۆ پاراستنی بزوێنەکە و دەڵێن: دەیەم

شەیەکە

گایەکە

لە ئاست (دوو)دا پێویست نابینن بەو (ی)ە واوەکە خورد دەکەنەوە دەڵێن (دووەم).

لەعەجەمش هەیە دەڵێ:

(دوویەم، لە زوویەکەوە، بەم ڕوویەدا هات...). لە (سێ)شدا ئەو (ی)ە نایەت بەزیادەوە بەڵکو (ی)ی وشەکەی (سێ) خورد دەکرێتەوە بە (کسرة + ی کۆنسنانت)و دەگوترێ (سێیەم).

قسەیەکی دوایێم ماوە:

فۆنەتیکناسی و فۆنۆلۆجی لەوەدا بایەخ وەرناگرن فێرمان بکەن فلانە دەنگ لە لووتەوە و ئەوی دیکەیان لە گوێوە دەردێ چونکە دەنگەکان بێ خوێندن و فۆنەتیك دەردێن و لەوەشەی مرۆڤیش هەیە بەدروستی دەری بڕیون. چ قازانج بەکەس ناگات بگوترێ لە بەرابیی نوونی چاوگدا قورسایی هەیە چونکە ئەم قورساییە لە (نووستن، نووستم، گردت، دڵت، دڵم، کوڵکن، جلك ...) و بەکۆتایی سەدان و هەزاران وشەوە هەیە نەك هەر نوونی چاوگ. ئێمە بەدۆزینەوەی قورسایی سەر نوونی چاوگ و پاشگری (ن) و (ك) لە (کوڵکن، جلك)دا نابێ وەها دانێین شێری مووساحان دۆزیوەتەوە چونکە ئەم کەسرە موختەلەسەیە لە کۆنی هەرە کۆنەوە دۆزراوەتەوە.

فۆنەتیکزان و فۆنۆلۆجیستی کورد لەسەریەتی ئەو هەڵانە ئاشکرا بکات کە زەق زەق لە چاو دەچەقن. کەسرە موختەلەسە لە ڕێنووسی ئێستاکەماندا بەرچاو نییە. دەمەتەقە لەو بابەتە دەبێتە بابەتی ئەکادیمی تا ئەو ڕۆژەی پیتی لاتینی لە نووسینی کوردیدا

بەکار دێت. گریمان هەموو دنیا سەلماندی، قورسایی بەرایی نوونی چەرگ و ڕاناوی کەسەکان ... دەبێ نیگاری بۆ دابندرێ، خۆ هەر مومکین نییە ئەو نیگارە پەیدا بکرێ ئەوپەڕی ئیمکان لەو ڕێگەیەدا ئەوەیە بچینەوە بۆ پێشنیازەکەی مامۆستا وەهبی، باوەڕیش ناکەم کەس بەدوا پێشنیازی ئەوتۆیی بکەوێ. ئێمە با جارێ پەخەی ئەو هەڵە ئاشکرایانە بگرین کە زەق زەق لە چاو دەچەقن. فۆنەتیك و فۆنۆلۆجی ئەگەر هەر فێری زانیارییە سەراوییەکانی وەکو: ناولزەدار، لێوی، پووکی، ئینفیجاری...مان بکات وەك ئەو کەسەمان لێ دێ بزانێ بەردی سەر تەختەدامە بجوڵێنێ بەڵام چۆغەدار و ئالتی داش و مەهموون نۆینی فێر نەبێ و نەتوانێ بەردێك بگەیەنێتە خانەی دامە، وەیا کەسێك فێری ئەلفوبێ ببێت و نەزانێ نامە بنووسێ، وەیا کەسێك دەم لە کێش و قافیە بدات و نەتوانێ شیعر هەڵبەستێ. ئەو تەرزە زانیارە سەرەتاییانە لە فۆنەتیکدا ئەزۆك دەمێننەوە ئەگەر گەشتی بەرەو شاوەوەی زمان نەکەن. دەبێ دەستووری وەهایان تێدا بدۆزینەوە بشێ هەڵەی وتە وەیا تەعبیرمان بۆ ساغ بکاتەوە. ئێمە ئەگەر پێ داگرین لەسەر (پانزە، دوانزە، سیانزە، شانزە، حەڤدە) ج دادمان نادا چەند سەرنجەرێك لە ڕێی فۆنەتیکەوە وەیا لەخۆوە زانیبێتی، سوانی دەنگی (د) لەو وشانەدا نوونی بۆ چواریان هێناوە و (ڤ)شی بۆ یەکیان هێناوە زانینەکە پێویستە، بەڵام پێڕەوی لێکردنی فەرمانی سەرشانە بەتایبەتی چونکە بەشی زۆری کورد وتە ڕاستەکان دەبێژن: پازدە، دوازدە، سێزدە، حەڤدە دەبێ بزانین شکاندنەوەی (ی) تیژی درێژ لە نیشارەتکردن و کۆکردن و باری ئەوتۆییدا دەیکاتە (کورتە بزوێنی کەسرە + «ی» کۆنسنانت) ئیتر وەك کە دەڵێین (دارا برسییە ئەم کورسییە شکاوە) دەبێ بڵێم (کورسییەکان، ئیتالییەکان) نەك (برسێکان، ئیتالێکان).

لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی ئەم هەڵەیە بەسەر دەرگەی هەموو دایەرەکانیدا لە چاوان دەچەقێ کە لێیان نووسراوە (ئەمینداریتی) لە جیاتی (ئەمینداریێتی). بەعادەتی دەستووری کورتبێژی زۆربەی کورد لەو تەرزە وشانەدا دەڵێن (ئیتالییەکان، ئەمینداریەتی) بەڵام دەڵێن (برسییەتی) نەك (برسیەتی). ج بڵێی (برسییەتی کافرە) و ج بڵێی (من برسیمە، دارا برسییەتی) فەرق ناکا لە ڕووی شکاندنەوەی (ی) درێژی تیژ. بەنموونە، دەگوترێ (هەر ئەم پیاوە خزم و کەسیەتی) و ناگوترێ (کەسییەتی) بەڵام دەگوترێ (خزمییەتی) و دەشگوترێ (خزمیەتی). بەهەمەحاڵ (کەسیەتی، خزمیەتی) بەر یاسای دەنگسازی و کورتبێژی دەکەون بەڵام (ئەمینداریتی، برسێتی، ئیتالێکان).

پێوەندییان تەنها بەزاری ناوچەییەوە هەیە نەک بەدەستووراتی ڕەسەنی هەمەکیی کوردییەوە. هەر ئەو زارەی دەڵێ (ئیتالیکان) ناچارە لە بنای وەسفدا بڵێ (ئیتالییە زیرەکەکان، برسییە ڕووتەکان). دەبێ فۆنەتیکناس بەخەڵق ڕابگەیەنێ (تێدا، جودا) ڕاستن و بەسەر زاری زۆربەی کوردەوەشن چ ئینساف لەوەدا نییە ئاخێوەری ڕانیە ناچار بێ لە نووسیندا ڕاستەشەقامی کوردی لەو وشانەدا بەجێ بهێڵێ بۆ (تیا، تیایا، جیا). ئەگەر پسپۆریی باسی فۆنۆلۆجی بەدەنگ ئەیەت نووسەری ئاسایی ئەک هەر ناوێرێ بەدەنگ بێت، بگرە جۆرێک پاپیرووتیش لە خۆیدا هەست دەکات کە دەبینێ قەڵەمەکەی لەو جۆرە هەڵەی پەرەسەندوودا دەگێڕێ و خەریکە بەخۆی بڵێ: ئەوە ئەزم لە باتان دەبەزم. لە وشەی وەکو (نوێژ، توێ، کوێر، سوێر)دا نووسەران بەپێی لەهجەی شاری سلێمانی و بەشێکی دیکەی کوردستانی خواروو دەیانەوێ (دیفتۆنگ)ی نێوان (وێ) بەسەر نووسینی ئەدەبیماندا بسەپێنن. بەڵگەی بێ کەلەبەر ئیسپات بووە و دەبێ کە دیفتۆنگەکە ناوچەییە نەک کوردیی ڕەسەن، وا بزانم د. ناورەحمانیش پشتگیریی لەو بەڵگانە کرد. نالی لە شیعردا شێوە ڕەسەنەکەی بەکار هێناوە:

هەر جۆگە و جێگایە کەوا سوور و سوێر بێ
جێی جۆشەشی گریانی منە خوێ ئەڕژاوە

وشەی (سوێر) ئەگەر دیفتۆنگی تێدا بێ کێشی میسرەعەکە لەنگ دەبێ:

بولبول کە گەرمی نەغمەیە ئاگر دەکاتەوە
غونچە حەزینە جەرگ و دڵی بۆ دەکا توێ

وشەی (توێ) ئەگەر دیفتۆنگدار بێ هەم شیعرەکە لەنگ دەکات و هەم ناشێتە قافیەی (هوردوێ، گوڵی بوێ ... هتد) لە قەسیدەکەدا.

ئەمانە نموونەن بۆ دەستنیشانکردنی ڕێبازی فۆنەتیک و ئەرکی سەرشانی فۆنەتیکزان، کەچی بەداخەوە دەبینم خاوەن شەهادەی بەرزی زمان کە خۆیشی شیرمژی ئەو زارە ناوچەییە نییە لە جیاتی (دەڕۆم) دەنووسێ (ئەڕۆم). من دژی (ئەڕۆم) نیم، بەڵام نابێ خۆی بەسەر (دەڕۆم)دا زاڵ بکات کە ڕێبازی ڕەسەن و زۆربەی کوردە. د. ناورەحمان لە بنی دڵیەوە بەپەرۆشە بۆ زمانی کوردی، هەموو هێزی لەش و هۆشیشی بەو بەخشیوە تا ئەوەی لە هیچ بابەتێکی دیکە قەڵەم ناگێڕێ بەڕۆژ خەریکەتی بەشەویش خەونی پێوە دەبینێ. لەو شەنگ و تاقەتەیدا، بەباوەڕم

لیی دەوەشێنێتەوە دەست بۆ هەر لایەنێکی (زمان) ببات بەرهەمی لێ پەیدا بکات. بەولای خەبەردارکردنی نووسەران لە هەڵەی ساو، ڕێبازێکی دیکە هەیە چاپووک سوارێکی خۆتەرخانکردووی بەپەرۆشی وەکو ئەو دڵسۆزەی گەرەکە هاتوچۆی تێدا بکات ئەویش بەستنەوەی کوردیی ئێستاکەمانە بەهی کۆنینە. زمانی کوردی لە دوای سادەکانەوە و لە زەمانی سادەیش نووسینی نەبوو وەیا لەی بەجێ نەماوە بێ بەهێی ڕۆژگار و گۆڕانی باری ئاخاوتن و نووسین دەقی ڕەسەن و سەرچاوەی ڕوونی لەهجەکانی لێ بناسرێتەوە. هەر ئەم فەلاکەتەیشە بووە هۆی نەبوونی زمانێکی ئەدەبیی کوردی کە هەموو ئاخێوەری کورد تێی بگات. ئێمە کە نەتوانین مێژوو هەڵگێڕینەوە بۆ ئەوەی لە نووکەوە قاڵبی ئەدەبی بۆ هەموو کوردزمان ڕەنگڕێژ بکەین، ڕەنگە بتوانین ڕابەڵە پساوەکانی پێوەندیی ئێستاکەی زمانەکەمان بەئاڤێستاوە گرێ بدەین وەیا هەر نەبێ بەشێوەی پسپسۆکەیش بێ ئەوەندەی دەوەکینە لەو ڕیشاڵە کەرتبووانە بەیەکدی بگەیەنینەوە. دەزانم موشکیلە زۆرە لەو کارەدا، گەورەتریشیان ئەوەیە کە دوای سووتاندنی نامە زەردەشتییەکان لە سەردەمی ئەسکەندەری مەکدۆنیدا زارەوزار ئاڤێستا و گاتەکان... گەیشتنە پەهلەوی، شێوە نووسینی هزڤارشیش دەستی گیرا لە شێواندنی ئەوەی پارێزرابوو، هەڵسوکەوتی زەمانی ساسانییەکانیش لە نووسینەوەی دووبارەی ئەو نامانە کاری سەلبیی کرد (هەرچەند لایەنی ئیجابیشی هەبووە، لێرەدا جێی لێدوانی نابێتەوە).

لەگەڵ ئەمانە هەموویدا کارەکە خۆ بۆ تەرخانکردن دەهێنێ، ڕێبازیشی کوێر نەبووەتەوە:

وەختی خۆی لە ساڵی ۹۷۱ – ۹۷۲ کۆڕی زانیاری کورد ئەم فەرمانەی لە قەبەڵ ئەندامێکی تەرخانی کۆڕ کرد بەڵام داخم ناچێ هیچی لێ شین نەبووەوە لە تاکە گوتارێکی کورت بەولاوە گوتارەکەش، ڕاستییەکەی بایەخدارە بەڵام دوورە لە گەیشتن بەئامانج. حاجی قادر و نالی بەمن سپێردران: ئێستاکە لەگەڵ خۆمدا دەڵێمەوە سەر جاران خۆزی بەوەی تەکلیفەکە پێچەوانە بوایە و لایەنە زمانییەکە بۆ من مابایەوە، هەل لەدەست نەچووە من نا، د. ئاورەحمان لە بارێکدایە بتوانێ خەست خەست هۆشی خۆی بەدەستە چرای زانستی تازەوە بەناو تاریکاییی ڕابردووی زمانی کوردی پیرۆزدا بخولێنێتەوە.. سەرچاوە چەنگ دەکەون.. لە لەهجەکانی کوردیدا زۆر خەڵتەی ڕاگەیێن و ڕوونکەرەوە هەن... قوڵ و باسکی لێ هەڵماڵە کۆڕی زانیاری عێراق و

دەستەی کوردیش، بێگومان، پاڵپشتیت دەکەن. کوردێکی بشتوانێ ئەوت بخانە چراتەوە نابێ درێغی بکات . ئەوسا حەز دەکەی کارێك بەهەمزە بکە ناوی خۆی لە بیر بچێتەوە.

پوختەیەکی زێدە کورتی هەندێ حاڵی سەرەکیی ئەم گوتارە لەم چەند بەندەدا دەبێنە پاڵاوتە:

١- هەبوونی کەسرە موختەلەسە لە وشەدا بەندە بەداخوازیی بەستنەوەی! فۆنیمی وەستاو بەفۆنیمی دوایەوە لە باری تایبەتیدا. بەنەمانی داخوازییەکە، کەسرە موختەلەسە دەشێ نەمێنێ و زۆر جارانیش دەبێ نەمێنێ.

٢- هێز (stress) دێتە سەر کەسرە موختەلەسەی مەوجوود لە وشەدا، ئەگەر وجوودی بەند بێ بە هێزەوە بایەخی (دەنگ)یشی نامێنێ چونکە بریتی دەبێ لە هێزەکە خۆی.

٣- هەبوونی کەسرە موختەلەسەر هاتن و چوونی لە هیچ بارێکدا دەخلی بەسەر واتاوە نییە. هەرگیزا و هەرگیز تێداچوونی ئەو دەنگە تەئسیر لە واتا ناکا بەو پێیە، موستەحیلە نرخی فۆنیمی هەبێ، دانانی نیگار بۆی دەبێتە هۆی خۆشخوێنیی نووسراو نەك دانهێنان بەفۆنیمبوونی ئەو دەنگە.

٤- فۆنیمبوونی دەنگ و فۆنیمنەبوونی لە حاڵاتی ڕێزمانیدا تاقی ناکرێتەوە، لە عەینی وشەدا تاقی دەکرێتەوە چونکە سوان و گۆڕانی دەنگ لە بارە جوداکانی ڕێزماندا دەستوورەکانی ڕێزمان ساغ دەکاتەوە نەك (هۆیە)ی دەنگ.

٥- هەمزە و دەنگی (ە) لە چاو هەموو دەنگەکانی دیکە تایبەتی و چۆنایەتیی دەگمەنیان هەیە، هۆیەکەش دەچێتەوە بۆ نزیکایی دەروویان لە یەکی قوڕگ و ژێ دەنگەکانەوە. هاتنیان لە بەرایی وشەوە بەشاوڵەوە و تێچوونیان بۆ ئاوڵی ئەلف و پێ و بەیەکدی گۆڕانەوەیان بەڵگەیە بۆ چالاکییان و خزمایەتیی نێوانیان.

٦- وا دیـارە فۆنیمی هەمزە یەکێکە لەوانەی لە گشت زمانەکاندا هەیەت، فۆنیمبوونیشی لە ڕادەی بەدیهییەدایە: هەر زمانێکی هەمزەی لێ بسڕێتەوە کاول دەبێ، کەچی بەسڕینەوەی (ث، ن، ض، ط، ظ، پ، چ، ژ، گ، ڤ، ص، ڵ، ق، ح، ع، ڠ، غ) کە بریتین لە ١٧ فۆنیم هەموو زمانێك کاول نابێ.

٧- تایبەتییەتیی دەنگی هەمزە و هێ وەها دەکات لە زۆر زماناندا ئاوڵ بەدوایاندا بێت

نەك ڤاوڵ لە هیچە ئەو دەنگانە بەساختە دەخاتە پێش خۆیەوە. موستەحیلە میللەتان بەر لە هەزاران هەزار ساڵ بیریان لەوە کردبێتەوە کەوا بۆ خاتری ڤاوڵ لە بەرایی وشەوە بێت دەنگێکی ساختە هەڵبەستن و بیخەنە پێشیەوە. هەزاران هەزار وشە هەن فۆنیمی پێشەوەیان ڤاوڵی بەدوادا دێت، چ قەیدی دەکرد لە جیاتی (ئەز، ئێمە، ئەنگوست...)یش بیانگوتبایە (شەز، شێمە، شەنگوست...)؟ خۆ هەمزە ناعوور نییە یەکێ ناو بەرزکردنەوەی بێ بکەوێ، چونکە کەسرە موختەلەسە بەچکەی ناچارییە بەهەڵستانی ناچارییەکە تێ دەچێت.

ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ۱۰۱، ۱۹۸٤

# لە ئاوێنەی ئەم گوتارەدا تیشکی چەند چرایەك

## بەشی یەکەم

هەندێ جار نووسین لە بارێکدا دەبێ بشێ پێی بگوترێ (فەرمانی ناچاریی ئێسك قورس) لایەنی ناچارییەکەی لەوەوە دێت کە پێویستی سەرشانی نووسەرە، تا ئەو ڕۆژەی پەنجەکانی لە نووسین دەکەون، خۆی نەدزێتەوە لە دەربڕینی ڕاستیی شرابەوە و ڕاستکردنەوەی شتی هەڵەدار و سازدانەدنی شتی ناتەواو. لایەنی ئێسك قورسییەکەشی ئەوەیە، چەندێکی نووسین خۆی شیرین بکات دیسانەوە کە ڕووی لە ڕەخنەگرتن و هەڵە دەرخستن و کەموکوڕی بڕین بوو، هەر دەبێتەوە بە وێنەی ناو ئەو ئاوێنە عەیبدارەی کە جوانترین ڕووخسار تێیدا وەك پەتیارە خۆی دەنوێنێ. من بەش بەحاڵی خۆم کە بەسەر نووسینی یەکێکی دیکەدا دەچمەوە هەستی ناڕاحەتی دام دەگرێ، ئینجا کوردی گوتەنی دەبێ هەستی خاوەن تەعام چۆن بێ؟ لە نێوان هاندان و بەرتەکدانەوەی ئەم دوو ماکەی فەرمان و ئێسك قورسییەدا چەند شەفاعەتکارێك ڕووی خامە سپی دەکەنەوە: دەست خاوێنی، نیازی پاك، ئەدەبی شێواز. نووسەنێك ئەم مەرجانەی پێوە نەبێ خوێندنەوەی لێ خەسارە چ جایی ترخی وەڵامدانەوەی هەبێ

لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەم خاڵە سەرەتاییپیانەدا بەرەو بابەتی گوتارەکەمەوە دەڕۆم کە دەسکێ گوڵی چەند گوڵزارێکی نووسینی ئەم دواییەی ڕۆشنبیریی کوردیم هەڵبژاردووە بۆ خامە تاقیکردنەوە و لە ئارایشتدانیان و خستنەوە بەر نیگای خاوەنە بەڕێزەکانیان و تێکڕای خوێنەرانی خۆشەویستی کوردزمان.

مرۆڤ کە لە نووسیناندا شتێکی ئەوتۆی دیت ئێبینی هەڵبگرێ (کێچ دەکەوێتە کەوڵی) تا ئامەزرۆی خۆی لێ دەشکێنێ بە نموونە کە (بەرگی دووهەمی یادی مەردان)ی مامۆستا مەلا شێخ کەریمم خوێندەوە بە دەست خۆم نەبوو لە ئاست ئەو بەیتەی کە لە پەراوێزی لاپەرە ٣١٥دا مێژووی وەفاتی شێخ عەلائودینی تێدا دیاری کردووە دڵم هەڵدەچوو بۆ ئەوەی دەنگی خۆمی بگەیەنمێ و بڵێم مامۆستای بەڕێزم' ئێوە بەیتی (گم شد از باغ محبت گل باغ عمری) کە بەدوایدا دەفەرموویت (بەحیسابی

حورووفی ئەبجەد نیوە یەیتی دوایی ئەکاتە ١٣٧٣ و ئەوەش ساڵی کوچی دوایی شێخە) ڕاستییەکەی (٣١٩٨) دەگرێتەوە کەوا جاری نزیکی ١٨٠٠ ساڵی ماوە بیگەینێ.

تەئریخەکە لە (گل باغ عمری) دەردەچێ کە دەکاتە ١٣٧٢. بەداخەوە دەنگم نەیگەیشتێ تاکو وا لەسەر ڕووی ئەم لاپەڕەیە دەڵێم، بەنەدەبەوە، مامۆستا دەرهێنانی مێژووە کە ڕاست و شیرینە بەڵام لەو یادی مەردانەدا ئەوەی سەرپەرشتیی کتێبەکەی کردووە بە وردی پەنجەی لە جەرگەی نیشانە نەکێشاوە.

هەر لەو کتێبەی (بەشی دووهەمی یادی مەردان)دا مامۆستای بەڕێزمان کە باسی شێخ نەبی ماوێلی دەگێڕێتەوە بە چاکە و دینداری و مەلایەتی ناوی دەبات دیارە مامۆستا قسەی لە جیلی پێش خۆیەوە وەرگرتووە چونکە سەردەمی شێخی ماوێلی نەبیری ئەو نییە [بەپێی نووسینی مامۆستا لەو کتێبەدا شێخ نەبی لە (١٣٠١ی ك) مردووە کە ١٠٠ ساڵ پتری بەسەردا تێ پەڕیوە].

لێرەدا ناچارم بە دڵی نائارامەوە بڵێم، بەڵگەی بێ کەڵەبەر هەیە لەسەر ئەوەی کە شێخی ماوێلی بۆ ماوەیەك لە سەرەتای ئیرشادیدا بەڕاستە شەقامی ڕێنموونی و خواپەرستیدا ڕۆیشتووە، لەوە بەولاوە ڕوو لە دنیا بووە.

چونکە بەینێکی تەواویشی لە دەوری دنیا دۆستییەکەی لە کۆیی ڕابواردووە، لەو بەینەدا ڕایەڵەی ڕەفتاریشی کەوتووەتە ڕێ گوزەر حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی و حاجی مەلا عەبدوڵای جەلی، گەلێ خەبەراتی ئەو سەردەمەی شێخی ماوێلی پشتاوپشت بۆ ڕۆژگاری ئێمە هاتووەتە خوارێ، هەمووشی باسی لە دین دەرچوونی ئەوسای دەگێڕێتەوە تاکو باری گەیشتە ڕادەیەك بوێژێکی ئەو ڕۆژگارە بڵێ:

(ستُ عشر) ژنیەتی بە مەزهەبی حیماری
(ابن آدم) ئەماوە سەری پان کا وەك ماری

لەمانەش چاوپۆشی بکەین هۆ ناشێ شادیەیی حاجی قادر و کارەساتی بەینی ئەو و شێخی ماوێلی بەلاوە بنێین: حاجی قادر هەر وا لە هۆزرایی و بەربەیار نەیگوتووە

شێخ دەڵێ باری ڕیا شانم جەمو ناکا ئەگەر
کێوی کاروۆم بێ گوتم سەد (بارك اللّٰه) کەر (نەبی)

وەیا لە ئەستەمبوڵەوە بە کۆییبیان ڕادەگەیەنێ:

لە دەوری (کەرنەبی) تا دەوری (گای کوێر)
لە گوێی گا نووستوو وون زۆر حەیفە بۆ شێر

شێعرە بڕندەکانی حاجی قادریش بوو وەهای لە شێخ نەبی کرد فەرمانی کوشتنی حاجی قادر بەمریدەکانی بسپێرێ. ئەوانیش ڕابسپێنە کوشتنی، دەشیانکوشت ئەگەر فەقێ و موستەعید و خەڵقێکی لەو دەمەدا حازر بوون چەپارەی حاجییان نەدابایە، ئەم ڕاستییانە هی ئەسەلماندن نین. کە بڵێین ڕازی بین بەدەنگوباسی دینداریی شێخی ماوەلی دەبێ هەم مێژوو بەدرۆ بخەینەوە، هەم حاجی قادریش ئەوەندە نزم بکەینەوە کە ڕەوای کوشتن بێ. ئەوساش نازانین شێعرەکانی چ لێ بکەین بەخۆیان و پرشنگی بەهێزی دڵسۆزی و ڕابەرایەتییان لە مەیدانی نیشتمانپەروەریدا. مامۆستامان بە دڵی سافەوە لە (سیاق التصدیق)دا قسەی ئەو کەسانە دەگێڕێتەوە کە شایەدیی چاکەی شێخی ماوەلییان ساز داوە، لەمەشدا مەیلی (فطری) بۆ زۆربوونی نموونەی پاکی و چاکی لە مرۆڤدا ڕێ خۆشکەرەوەی باوەڕهێنان بەو شایەدییانە بووە.

لە چەند جێگەیەکی کتێبەکەدا هەڵەی چاپ وای کردووە واتای وشە بگۆڕێ وەیا فۆرمی شیعر بشێوێ. هەندێك لەو هەڵانە لیستەی کۆتایی کتێبەکە لێیان بێ دەنگە، وەك کە نیوە بەیتێکی حاجی مەلا عەبدوڵا لە لاپەڕە ١٧٥دا ، نووسراوە:

«لە جێی من بەر شەقی دەم ئەو بەر لەقی دام»

وشەی «ئەوە» لەم نیوە بەیتەدا زیادە و لەنگی کردووە و بڕگەکانی لە یازدەوە کردووە بە دوازدە. لە دەستنووسەکانی لای خۆمان کە من دیتوومن دێڕە شیعری ئەم نیوە بەیتە پەیدا نییە. بەهەمەحاڵ سەرلەبەری ئەو هەڵانەی ڕاست نەکراونەوە لە ناو کانی کتێبەکەدا وەکو گۆلمە زیخی بنی حەوز نموونەی نییە و بەنەبوو حیساب دەکرێ.

لە کتێبە سوودبەخشەکەی د. کامل بەسیر (ڕەخنەسازی..)دا کە مەیدانێکی بەرفرەوانی ئەو باسەی گرتووەتە بەر، دەشێ خاوەن ڕایان ڕەخنەی تێدا دەربڕن هەریەکە بەپێی بۆچوونی خۆی، من لێرەدا لەسەر خاڵ و نیوێکی دەنووسم ئەویش نەك بەگیانی ڕەخنە لێگرتن بەڵکو بەنیازی خزمەتی کتێبەکە خۆی و فکری ناو کتێبەکەش.

خاڵەکە خزمەتی کتێبەکە دەکات چونکە هەڵەیەکی چاپ و سەهوێکی پەلەکردنی تێدا چارەسەر دەکات. لە پەراوێزی ژمارە (٣٢)ی لاپەڕە (٣٩) هێنا بۆ ئایەتی (٢٢)ی سوورەتی (الشعراء) کراوە. ڕاستییەکەی ئەو هێنەی بەناوی ئایەتی (٢٢) نووسراوە

بریتییە لە ئایەتی (٤) ئایەت. هەر لە (٢٢٤) هەتا (٢٢٧)ی کۆتاییی ئەو سوورەتە:

ئایەتی (٢٢٤) «الشعراء یتبعهم الغاوون».

ئایەتی (٢٢٥) «ألم تر أنهم فی کل واد یهیمون».

ئایەتی (٢٢٦) «وأنهم یقولون ما لا یفعلون».

ئایەتی (٢٢٧) «إلا الذین آمنوا وعملوا الصالحات وذکروا الله کثیرا وانتصروا من بعد ما ظلموا وسیعلم الذین ظلموا أی منقلب ینقلبون».

دیارە ژمارە (٢٢)ی پەراوێزەکە هەڵەی چاپە، بەڵام وا پێ دەچێ هێماکردن بۆ ئاکە ژمارە سەهوو بێ. ئەو خاڵەکەش تێبینیکردنە لەوەی د. کامل لە لاپەڕە (٤٠)دا لەبارەی ئەو پێوانانەی قورئان لەو ئایەتانەدا بۆ هەڵسەنگاندنی هەستیارەکانی داناوەو دەڵێ:

پێوانەی یەکەم: لە جەماوەری شاعیرە خراپەکانەوە هەڵهێنجراوە کە قورئانی پیرۆز بەنازناوی (الغاوون) وەسفیان دەکات، واتە ئەوانەی پیشەیان ڕابواردن و لە خشتەبردنی خەڵقە.

لەم قسەیە وا دەردەکەوێ کە مەبەس لە (غاوون) ئەو کەسانەن کە شوێن شاعیرە خراپەکان دەکەون و هەر ئەو دواکەوتووانەشن و ڕاەبوێرن و خەڵقی لە خشتە دەبەن. وەك دەزانین (غاوی) خۆی لە خشتە بردراوە چونکە بەواتای (ضال) دێت. لە (مختار الصحاح)دا دەڵێ: (غوى: ألغی الضلال والخیبة. غوى فهو غاو، وأغواه غیرة فهو غوی). هەرچی شاعیرەکانن یەکسەر باسی لە خشتەبردنی خەڵقیان نەکراوە بەڵام لە ڕێی ئەو (غاوون)ەو بە تەئویل دەبنە (لە خشتەبەر).

لەبارەی ڕەخنەی ئەدەبیشەوە قسەیەکی کورتم هەیە دواتر بۆی دێمەوە.

چاوێك بە کتێبەکەی (ئەنجوومەنی ئەدیبان)ی ئەمین فەیزی بەگدا بخشێنین: بێگومان لیژنەی وێژە و کەلەپووری سەر بەدەستەی کوردی لە کۆڕی زانیاری عێراق کارێکی مەردانەی کردووە بەژیاندنەوەی بیرەوەریی ئەمین فەیزی و ئەو شوێنەوارە تریسکەدارە و مەیلەو لەبیرکراوەی. کاشکی لەو کارەیدا لیژنە بەنەفەسێکی درێژترەوە ئەمین فەیزیی بەکوردەواری ناساندبایە و پتر ئینووەتی و ئامەزرۆیی ئەدەبدۆستانی بشکاندایە، ئەویش بەهەرخستنی لایەنی نەزانراو لە ژیان و سەرجەمی چالاکییە زانستیە ئەدەبییەکانی ئەم بەهرەوەرە گەورەیەی کورد. پێتەکییە کورتیلەکەی لیژنە مێوانی نووسینی مامۆستا ڕەفیق حیلمییە، چی مامۆستا حیلمیش نووسیویەتی بە

حاڵ لە میوانەتیی ئەمین فەیزی بەگی دەرداوێ، تەنانەت نازانین (ئەگادەمی فرانسە) کەی و چۆن و بە چ موناسەبەیەك (تەقریری کەمالاتی ئەمین فەیزیی کردبوو بەپێی تەعبیری مامۆستا حیلمی). ئێمە باوەڕمان هەیە بەشایەدییەکەی مامۆستا حیلمی بەڵام ئینووشین بۆ ئەوەی شارەزاتر بین بە بناوان و بنەمای ئەو خەبەرەی وەری دەگرین. بەش بە حاڵی خۆم شارەزاییم بە ئەمین فەیزی چی ئەوتۆ فەرقی نەکرد، بگرە لە پەراوێزی بەرفرەوانی کە من بە دەوری ناوی ئەمین فەیزیمدا کێشا بوو، هەر لەبەر تەنگبەریی پێشەکی و ناوەرۆکی کتێبەکە تا لەو پەراوێزە کەمێك وێك هاتنەوە ڕووی دا.. بێگومان ئەمین فەیزی گەلێك زلترە لە ڕانواندنی ئەم کتێبەکە هەر نەبێ لەبەر دوو سەبەب. یەکەمیان هەژاریی کتێبەکە. دووەمیان لەو ڕووەوە کە بەرهەمی نووسراو چەندێکی ببێ بەشێکە لە ئەنباری زەخیرەی نووسەرەکەی، تەنانەت سەرلەبەری بەرهەمی نووسەر و زانا و هونەرکار بەراقەکردن و بەسەرەوەنانیش هەر ناتوانێ (هەموو) بەهرەی خاوەنەکەی بەدەستەوە بدات. ئنجا کە من بێم ئەمین فەیزی بناسم لە ڕێی ئەو کتێبەوە کە چەند پارچە هەڵبەستێکی زانراو و بیستراوی شاعیرانی سەر بە بابانی تێدا کۆ کراوەتەوە، پێشەکییەکانیشی تروسکەیەك ناهاوێژن بۆ هیچ لایەنێکی مەزنایەتیی ئەم مەزنە زانایە، بە دەست خۆم نییە نەختێك پەرگارم وێك دەهێنمەوە.. بەڵێ دەزانین بیرکردنەوە لە دەرکردنی کتێبێکی ئەوتۆیی لەو ساڵەدا (١٩٢٠) بەڵگەی سۆز و پەرۆشی خاوەنیەتی بەڵام دەبێ ئەم خاڵانەش بە چاوەوە بگرین:

١- ئەو ساڵەی دەرچوونی کتێبەکە بەنیسبەت ئەوسا زۆر زوو نییە بەنیسبەت ئێستاش زۆر کۆن نییە. دەرکەوتنی گیانی کوردایەتی بەنووسینی پتر لە چواریەکی سەدەیەك بەر لەو کتێبە خۆی نواندبوو. ئەوسا (٢٣) ساڵ تێپەڕی بوو بەسەر دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستان لە ئەستەمبووڵ بە ناوەرۆکی شیعر و پەخشانەوە.

٢- ئەو بـاری چاپەمەنی کە لـە ئـەستەمبووڵدا هەبوو لە شوێنی بێ چاپی وەك کوردستان پەیدا نەبوو. یەکێك ویستبای لە قەڵادزەی ١٩٢٠ کتێب چاپ بکات دەبوو خۆی هەڵکوتێ بۆ هەندەران. نموونەی هەرە جانفیدای کورد لە مەیدانی چاپەمەنیدا سەید حوسێن حوزنی موکریانییە. دوور لە ڕووی ئەو وەك کە جانەوەر لە ترسی درندەی گۆشتخۆر بێچووی دەگوێزێتەوە، ئەویش بە ئاوارەیی مەکینەی چاپەکەی بە وڵاتاندا دەگێڕا. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی.

٣- زیاندنەوەی ناوی ئەدیبەکانی کورد دەمێك بوو سەرمەشقی دادرابوو. بە تایبەتی لە شیعری حاجی قادردا کە نیگای بە هەموو کوردستاندا گێرا بوو. تەنانەت لە قەسیدەی (شەمسەواری بەلاغەتی کوردان)دا شاعیرەکانی کۆیەی پشتگوێ خستبوون.

٤- گەلێك سەربازی نەناسراوی بێ ناوونیشان بەدەستووس کەشکۆڵی وەهایان تۆمار کردبوو کە دواتر ئەمین فەیزی بەگ و ئەزکرای کوردیش لەبەریان بنووسنەوە. مەراقی ئەو خەتخۆش و خەت ناخۆشانەی بێ ناوونیشان بۆ نووسینەوەی شیعر و خەبەراتی تەفرەقەی سەر بە کورد گەلێك گەنجینەی ئەدەبی و هەواڵی مێژوویی بۆ ئێمە کرد بەزەخیرە. لەو مەراقەشدا نە بەئەمای ماڵ بوون و نە بەئەمای ناو وەك کە نووسەر و بڵاوکەرەوەی ئەم ڕۆژگارە بەهۆی لە چاپدان و بڵاوکردنەوەوە لە ماڵ و ناویش خاوەن پشکن، هەزار جار لێیان پیرۆز بێ.

ئەم تێبینییانە نرخی کتێبەکە دانالەنگێنێ بەڵکو وەك کە من هۆشم بەنرخی شتان بشکێ نرخی ڕەوای بۆ دادەنێ. دوای ئەوەی کە تیشکی واقیع ڕۆشنایی خستە دەوروبەری کتێبەکە و هەر هۆیەك لەوانەی ڕێیان بۆ دەرچوونی خۆش کردووە دەرخسترا ئەوسا بە دڵی ئارامەوە دەڵێین ئەمین فەیزی بەگ دەستپێشخەرییەکی گیانپاکانەی لەو مەیدانەدا کردووە.

ئەگەر هەڵەی چاپ بەرپرس نەبێ بڵێین هەندێك لەو نموونانەی فەیزی بەگ کردوونی بە ناوەڕۆکی ئەنجوومەن بە ئەسڵ لەنگ و تاڵعبار نووسراونەوە ناشزانم چۆن بەسەر زیهنی فەیزی بەگدا کشیوەتن. وەك دیارە لیژنەش خۆی بەڕاستکردنەوەی ئەو نموونە عەیبدارانەوە خەریك نەکردووە بەنجەشی بۆ ڕانەکێشاون. خۆ و تاڵع وا بووە هەڵەیەك لەخۆوە چارەسەر کراوە وەك کە سەرەتا ناتەواوەکەی (شەکوای حاڵ)ی (عارف) کە لە لاپەڕە (١٣٤)دا نووسراوە، لە لاپەڕە (١٣٥)دا بەهۆی دەقی قەسیدەکە کە لە کتێبی (لە خەوما)وە ڕاگوێزراوە ناتەواوییەکەی چار کراوە. هەندێ جاریش هەڵە وەیا ناتەواوی شیعری نالی لە ڕێی شەرحەکەی مەلا شێخ کەریم و کاك فاتیحەوە بەسەر گیراوەتەوە بەڵام لە زۆر شیعری دیکەدا هەڵەکان وەکو خۆیان ماونەتەوە هێماشیان بۆ نەکراوە وەك کە لە لاپەڕە (٩٠)دا میسرەعی یەکەمی بەیتی سێیەم لەنگە و بەلەنگی ماوەتەوە

«گەر بەناوزەنگی پەراسووی ئەمسەر و ئەوسەر هەڵدری»

دەبوو بنووسرێ:

«گەر بە ناوزەنگی پەراسووی ئەمسەرە و سەر هەڵدری»

ڕاستییەکەی هەر لەو لاپەڕەیەدا دەبوو بنووسرێ:

«ساڵ دوانزەی مانگ سواری نابم و...»

چونکە کە نووسراوە (ساڵ دوانزە مانگ...) بەیتەکە کێشی تەنبەڵ بووە

بگەڕێوە بۆ لاپەڕە (٨٥) دەبینی بەیتەکەی نالی نووسراوە:

«تیپی شکۆفە خەیمەیی هەڵداوە لە هەر طەرەف»

ڕاستەکەی ئەمەیە:

«تیپی شکۆفە خەیمەیی هەڵدا لە هەر طەرەف»

پێشتریش لە لاپەڕە (٧٨)دا لیژنە چەند بەیتێکی خستووەتە سەر بەیتەکانی ناو ئەنجوومەن و یەک دوو هەڵەی تێدا کردوون.

نووسیوەتی:

«دەبێ ئەشکی تەراوووزی ئارەزوو نەی دیدە بشکێنێ»

میسرەعەکە لەنگە نە دەزانم چۆن چارە دەکرێ نە لە واتاشی دەگەم. دواتریش نووسیوەتی:

«ڕەها بێ گەر لە بەندی زوڵفی یارا گەردنی من»

ئەمەشیان لەنگە ئەگەر نووسرابایە:

«ڕەها بێ گەر لە بەندی زوڵفی یارا گەردن و شانم»

لەنگییەکەی نەدەما. بەڵام سەیر لەوەدایە لیژنە نیوەی دووەمی ئەم بەیتەی لە لیستەی (ڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپ)دا چار کردووە کە نووسیوەتی (بەعدم) هەڵەیە و (بەعد) ڕاستە ئەمەش نیوە بەیتەکە بەهەڵەیەوە:

«بە سەهلی بەعدە ئەزین بازی بەحەلقەی ئەژدەها ناکەم»

هەڵەی دیکەش لەو بابەتە دەکەونە بەرچاو مەبەستمان نییە سەرژماریان بکەین. بەڵام دەبێ بڵێم فەیزی بەگ لە ژێرووی لاپەڕە (١١٨)دا بەدوا قەسیدەکەی شێخ ڕەزادا

نووسیوەتی: (بیشمە) (شاور) (شیتنە) ئەمانە ئیسمی دیهاتن، وەك دەزانین (بێشمە) ناوی دێ نییە بەڵكو (بێ شەمە) بەواتای بۆنخۆشە و خەڵق دەڵێن (تووتنی بێ شەما). وشەی (بێ) لێرەدا لە (بە)ی فارسییەوە گۆڕاوە بەنووسینی كوردی (بهە) دەنووسرێ. وا بێ دەچێ فەیزی بەگ وشەی (بێ شەمە – بێ شەما)ی نەبیستبێ. لێژنەش بێ لزووم خۆی لێ بێ دەنگ كردووە.

لە لاپەڕە (٣٨)دا فەیزی بەگ ڕای خۆی لەبارەی شاعیریەتیی نالی دەربڕیوە دەڵێ «زەكای نالی ئینكار ناكرێ. لاكین ئەوەندەی سەنایعی لەفزییەی ئیستیعمال كردووە بهار ڕەنگە بڵێ: شیعری ئەو نەتیجەی عیلم و ئیشتیغالە».

لێرەدا مەودای موناقەشە بەربەرەڵایە و هەویرەكە ئاوخوازە بەڵام من بەكورتی دەڵێم: گلەییەكی گەورە ئاچێتەوە سەر فەیزی بەگ لەوەدا كە قووڵ نەبووەتەوە لە سەرجەمی شیعری نالی چونكە ئەو لە بنەڕەتدا شاسواری زانست و عەسكەرییە نەك ئەدەب. لەلایەكی دیكەشەوە دەتوانم بڵێم سامانی هونەری و ئەدەبیی لە ڕادەبەدەری نالی وەهای كردووە لە چاو هەزاری و نەداریی لە ڕادەبەدەری كورد خۆی زەق بنوێنێ وەك كە هەزار جلكی پۆشتە لەبەر بكات پێوەی دیار دەبێ دەنا ئەگەر هاتبایە هەمان كەرستەی (صنایعی لفظیە) بەبەر شیعری حافز و سلێمان نەظیفەوە بایە كەس لێی بەسەر نەدەگرتنەوە سەیرێكی ئەو نموونانەش بكەیت كە (ئەنجوومەن..) لە شیعری نالیی هەڵبژاردوون وەكو (قوربانی تۆزی ڕێگەتم – لە دوگمەی سینە – تاقمی مومتازی شاهـ – تا فەلەك دەورەی ئەدا – ئەمردم من – تەشریفی ئەوبەهارە..) ئینجا نموونە یەك لە دوا یەكەكانی لاپەڕە (١٤٥ – ١٤٦ – ١٤٧) هەموویان شیعری نازكی پاراوی دەوڵەمەندی هونەركاری شاكارن. هەندێ قەسیدەی نالی كە ئاخنراون بە وشەی سەخت و واتای تێكئاڵاوی ورد و قووڵ لە ڕاستیدا بۆ ئەو سەردەمە و بۆ هەموو سەردەمێك سەرمەشقی هونەر و ئەدەبن، بەدەست و قەڵەمی ڕەنگین و هێزای ئەو نەبێ ئەخشەكێش ناكرێن . لە نووسینی دیكەمدا گوتوومە یەك لە هونەرە بەرزەكانی نالی ئەوەیە كە توانیوەتی وشەی سەخت و سەركێش ڕام بكات بۆ ناو ترنجۆكی شعر وەك كە دەڵێ:

برق البصر لەبەر بەرق و تەلەئلوئی لە نالی
خسف القمر لە ئیشراقی قیامەتی جەمالی

وەیا کە دەڵێ

طەبعی نالی تونە نیمرۆ یا بە نەشئەی ئەم نیگاهـ
مەستی ڕەحراح و مەی و ڕاح و قوراح قەرقەفە

(کوردی)ش لەلای خۆیەوە وەهای کردووە کە گوتوویەتی:

«لەوشیش ئەبوتی دەعوییە یا ڕاستە یا درۆ»
بەڵام (کوردی) کە دەڵێ «باعیثی عومیانی بەسەر»

عەرەبییەکەی کورتی هێناوە چونکە وشەی (عمیان) بەواتای (عمی، کوێری) نەهاتووە. هەرچەند سەیری هەموو قاموسێکم نەکردووە بەڵام وابزانم ئاشکرایە (عمیان) ڕێژەی کۆی (أعمی)یە.

نالی شاعیری بەهرەیە نەك ڕاهاتن، بەڵگەش زۆرن یەکێکیان ئەوەیە کە نالی لە شیعردا نارایشتی وەها بەکار هێناوە گرفت و لەقی و هەناسەسواریی تێدا نەبێ، لە زۆر شوێنیشدا خەیاڵی وەها تەنکی ڕاو کردووە هەر دەڵێی خەریکە بەتاو داوە شیعرەکانیدا دەرباز بێ

بەنەشئەی سستی و مەستی وەها مەستوور و مەخمورە
نەزانم خەو لە چاوتدایە یا چاوت لە خەودایە

لێرەدا چاوی مادی و خەوی مەوهووم تێکەڵ بەیەکدی بوون، لە خۆراییش ئەو تێکەڵبوونە پەیدا نەبووە، وشەکانی (سستی، مەستی، مەستوور، مەخموور) ڕێگەیان بۆ خۆش کردووە، دوو وشەی (مەستوور، مەخموور)یش تێکەڵ بەیەکدی بوونەتەوە چونکە هەرچەند یەکیان کوردییە و ئەوی دیکەیان عەرەبییە، هەردووکیان لە مەعنی دوو واتا بەشدارن:

مەستوور : سەرخۆش، داپۆشراو

مەخموور: سەرخۆشی داپۆشراو – لە «خمار»ەوە

ئیتر حەز دەکەیت (مەستوور)ەکە (سەرخۆش) بێ و (مەخموور)ەکەش (داپۆشراو) بێ، حەزیش دەکەی بارییان بگۆڕە، یان هەردوویان بەهەردوو واتاوە بۆ تەئکید بێ یارمەتیی تێکەڵبوونی مادە و وەهمەکە دەدات..

هەر لەم غەزەلەی کە ئەم بەیتەی تێدایە فەیزی بەگ بەیتی دوایی وەها نووسیوە:

له دووریی تۆیە ئەی خورشیدی پرتە و بەخشی شەوگەردان
کە نالی وا لە حالاتی محاقی ماهی نەودایە

ئەم وشەیەی (دووری) سەرەتای بەیتەکە بووەتە تەکەی ئەدەبیان و بەمدیت ەکێکی پێوەی نەبووبێت. وشەکە (دەور)ە نەك (دوور) بەرێنووسی کۆن هەردووکیان .وور) دەنووسران.

ئەگەر نالی لەو خورشیدە پرتە و بەخشە دوور بایە ئەدەکەوتە حاڵەتی (محاق) ێکو دەبوو بە (بدر) بەلام چونکە لە شەودا وەها لێی نزیك بووەتەوە کە پێشتر وتەووی:

«هەناسەم زوڵفەکەی لادا و مەیلێکی ئەکرد چاوی»

حەقیقەتی بڵێ لە حالاتی محاقی ماهی نەودام. وشەی (نەو – نوێ) لێرەدا بە تەنها ێوی نرخی قەسیدەیەکی سەرکەوتووی هەیە. ئەم وشەیە یەکێکە لەوانەی کاری فسووناوی دەکەن: وەك دەزانین حاڵەتی (محاق) لە نێوان کۆتایی مانگ و سەری انگدا دەبێ. ئەگەر محاقەکە بەر لە کۆتایی مانگ بخرێ هی پتربوون و ەسەرچوونی مانگە ئەگەر هی (ماهی نەو – مانگی نوێ) بێ هی فراژیبوون و ەشەی مانگەکەیە، دیارە لێرەدا نالی کە بەیارەکەی گەیشتووە دەبێ لە محاقی مانگی نوێ)ی بەرەو گەشەکردن بێ. سەیری ئەم نوکتە ئەفسووناوییە چەند بە لووس لێکی و بێ گرفت و گرێ، هێندەی هەناسەی ئارام، دێت و دەچێت تا ئەوەی چاو و ۆشی ئەدەبیانی بەسەردا دەکشێت و هەستی پێ ناکەن. ئایا ئەمە (صنایعی فظیە)یە یان هونەری ئەژاوی زگماکی سروشت زادە؟

لە ڕیزە گوتاری (چەپکێك لە گوڵزاری نالی)دا ئەم غەزەلەم شی کردووەتەوە و وتوومە سەرلەبەری بەیتەکان باسی ئەجرەبەیەکی سەردەمی گەنجایەتیی نالی ەگێڕنەوە کە بەشەو چووەتە پارێزی دۆستەکەی. ئینجا ئەگەر فەیزی بەگ بەچاکی ە واتای بەیتەکان ورد بووبایەوە هەڵبەت ڕایەکی بەرلدا دەهات لەبارەی اوەتەکەیەوە جودا بێ لەو (صنایعی لفظیە) ئەوسا دەشینووسی (لە دەوری تۆ..)

لێژنە ناوناوە لە چەندوچۆنی نموونە شیعری ناو کتێبەکە ڕایەکی خۆی دەردەبڕێ ەك کە لە پەراوێزی لاپەڕە (١٣٠)دا (داری سەنگدل) بەسەر (یاری سەنگدل) تەرجیح ەدات، بەمەشدا کارێکی باشی کردووە، بەلام دڵەکەم لە زۆربەی ئەو شوێنانەی لێ

بەرەنگهاتنی دەویٚ لیژنە بیٚ دەنگە. لیٚرەدا من ڕێنووسی ناو کتێبەکە و شێوەی چاپکراوی وشەکانی دەکەم بەشایەدی بیروڕای خۆم. ناشزانم ئەو هەلانەی لە کتێبەکەدان چەندیان هی چاپن و چەندیان ئەسڵین. ناشزانم ڕادەی دەسکاریی لیژنە لە ڕێنووسی کتێبەکە چەندە چونکە ئاشکرایە فەیزی بەگ ڕێنوسی وەکو هی ناو کتێبەکەی بەکار نەهێناوە.

نوسخەی کتێبەکەی ١٩٢٠م لا نییە بەراوردی بکەم لەگەڵ هی ١٩٨٣. لەگەڵ ئەمەشدا دەبیٚ وتوویژ لەگەڵ ئەو شێوە ڕێنووسە بیٚ کە کتێبەکەی بیٚ چاپ کراوەتەوە.

لە ئاست بیروڕای لیژنەدا تێبینی دەردەبڕم لەگەڵ ڕێز و سپاسیشم بۆی:

لە لاپەڕە (٢٢، ٢٣)ی کتێبەکەدا لیژنە چەند ڕایەکی دەربڕیوە جێی هەڵسەنگاندنن. لە پێشەوە دەڵیٚ نالی لە (١٢١٥ک - ١٨٠٠ز) هاتووەتە دنیا. ڕەنگە ئەم قسەیە ڕاست بیٚ بەلام هیچ بەڵگەی لەگەڵدا نییە، لە کەسیش مەعلووم نەکراوە چۆناوچۆنی ئەو ساڵە بووە زادساڵی نالی. وەختی خۆی من لە (چەپکێك...) لەبارەی ساڵی بوون و مردنی نالییەوە دواوم، دواتر کاك فاتحیش بەدرێژی لە مەسەلەکەی نووسیوە. عەلی موقبیل و بەدوا ئەویشدا هی دیکە دەڵێن نالی لە ١٧٩٧ هاتووەتە دنیا. وەك کاك فاتیح دەڵیٚ ئەم ساڵەیان لە بەراوردە هەڵەیەکەی عەلی موقبیلەوە هاتووە کە (١٢١٥ی ك)ی بەرانبەر (١٧٩٧ز) داناوە. بەهەمەحاڵ ساڵی لە دایکبوونی نالی وەها بەڕاشکاوی نە ١٨٠٠ و نە ١٧٩٧ و نە هیچی دیکەشی بە متانەوە بۆ دەست نیشان ناکریٚ، هەر دەبیٚ پێویستە سەیرەکێك وەیا پرسەکێك (علامة تعجب، علامة استفهام) بخرێتە سەر ئەو ساڵەی بۆ لەدایکبوونی دادەنریٚ. بەلای منەوە چەندێکی لە سنووری لوانداهبوونی نالی پێش ١٨٠٠ بکەوێتەوە چاکتر دەگونجیٚ لەگەڵ ئەو ڕاستییەی کە نالی لە حوکمڕانی (عەبدوڕەحمان) پاشادا دەستی کرد بەهەڵبەستی کوردی.

عەبدوڕەحمان پاشا یەکەم ئەمیری کورد بوو بیری لە کوردایەتی کردەوە و گیانی کوردایەتیی لە دەوری ئەودا شیعری عەرووزی کوردیی لە بابان و سەرلەبەری کوردستانی عێراق و ئێراندا داهێنا. من لە نووسینی دیکەمدا بەدرێژی ئەم ڕاستییەم باس کردووە، لیژنەش لە پەراوێزی لاپەڕە (٢٣)ی (ئەنجوومەن...)دا بیٚ ئەوەی هێما بۆ لێکدانەوەی کەس بکات دەڵیٚ «بنیاتنانی شاری سلێمانی (لە ١٧٨٤ز) و بوونی میرنشینی بابان پاڵپشتێکی بەهێز بوون بۆ تەقینەوەی بەهرەی شاعیرێتیی

[شاعیریەتیی] (نالی) ڕاستی ئەم بارە ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتییە نوێیە بووە کە ئەیهێشتووە ئەم بەهرەیە وشك بێتەوە. دوا بەدوای خۆیشیا دەستەیێ شاعیری مەزن و گەورەی پێ گەیاندووە وەکو (سالم) و (کوردی) و (مەحوی) و (حاجی قادری کۆیی).. هتد.

ئەم قسانەی لیژنە بایەخدارن بەڵام کەلەبەریان هەیە و هەڵسەنگاندن هەڵدەگرن:

أ- لە ساڵی (١٧٨٤)ەوە تا ئەو ساڵەی نالی گەیشتە تەمەنی شاعیریەتی بەلای کەمەوە ٣٠ ساڵێکی بردووە. ئینجا ئەگەر پەیدابوونی سلێمانی خۆی لە خۆیدا کاریگەر بوویێ دەبوو بەر لە نالی شاعیری دیکە پەیدا بووبن شیعری عەرووزی کوردی بهۆننەوە.

ب- باری کۆمەڵایەتی و ئابووریی بابان لەو ساڵانەدا کە نالی تێیاندا بوو بەشاعیر وەها لەبار و ئارام و تێر و تەژی نەبوو لە چاو ساڵانی دیکەدا کە تازە بەتازە سلێمانیی تێدا بنیات نرابوو.

ج- لە کوردستانی عێراق و ئێراندا بەر لە بنیاتنانی سلێمانی شاری دیکە هەبوون، تەنانەت (سنە) میرنشین و گەورەتریش بوو لە سلێمانی. باری ئابووریشیان لە هی سلێمانیی ئەوسا بەرەوژێرتر نەبوو کەچی شیعری عەرووزییان پەیدا نەکرد.

هۆی هەرە گرنگی لە پەیدابوونی شیعری عەرووزی کوردی لە کوردستانی عێراق و ئێراندا ئەوە بوو کە عەبدوڕەحمان پاشا دەستی دایە کوردایەتی. ئەویش لەوەدا قەرزداری شۆڕشی فەرەنسە بوو. سەرنج بگرن لە بەیتەکەی عەلی بەردەشانی کە پێی دەگوترێ (بەیتی عەبدوڕەحمان پاشا) چ ئاگرێکی گیانی کوردایەتیی تێدایە. عەلی لەو دەمەدا لە بارەگای عەبدوڕەحمان پاشادا شاعیر بووە بۆیە وەها هەستی بزووتووە دەنا بەیتی دیکەی زۆرن کەچی کوردایەتییان تێدا دیار نییە. کە بپرسین ئەدی بۆچی نالی یەکسەر دەستی نەدایە کوردایەتیی وەك کە عەلی بەردەشانی کردی؟ دەڵێین نالی لە بارەگای عەبدوڕەحمان پاشادا نەژیاوە وەکو کە عەلی تێیدا دەژیا. بۆ نالی و برادەرانی ئەوەندە مومکین بوو کە لە ئیلهامی کوردپەروەریی عەبدوڕەحمان پاشاوە بەرەو هەڵبەستی کوردی ڕۆیشتن. تەنانەت نالی کە بۆی ڕێك کەوت دۆستی سلێمان پاشا و ئەحمەد پاشا بێ (تا فەلەك دەورەی ئەدا) و (ئەم تاقمە مومتازە)ی هۆنیبەوە لە دەوری عەبدوڕەحمان پاشادا نالی و سالم تازە مێردمنداڵ بوون و لە ساڵی مردنی

عەبدورەحمان پاشا (١٢٢٨ك) تەمەنیان (١٣) سالەیی بووە [بەپێی ئەوەی لە ١٢١٥ بەوەلەد بووبن]. هاورییەتی و یەیەکەوەژیان هۆیەکی زیندە زیندە کاریگەرە لە ملیۆنی یەکێك نییە بیّ رابەر خودبەسەر بەرەو بیریکی نوێوە بروا دەبینی میللەتێك بۆ ماوەی هەزار ساڵ لەسەر باوەرێك دەژیت ئینجا یەکێکی بەهرەمەند و دڵگەرم و قسە پاراو لە پارێکی بەبرشتدا دەم لە بیرێکی نویّ دەبزێویّ و هەزاران هەزاری بۆ بەدەنگ دێت و دوای دەکەون وەها دەبیّ خەلق شەیدای شەخسییەتی رابەرەکەیان دەبن هەرچەند ناپەسەند و خۆپەرستیش بیّ وەك کە مریدەکانی (حسن الصباح) بەبرۆ هەڵنەکاندنی رابەرەکەیان خۆیان لە شاخی هەڵدەداشت.. ئێستاکەش شەیدای ئەوتۆیی پڕی دنیایەن.

ئەم باسە زۆری بەبەرەوەیە پێویست نییە پتری بە دوو بکەوین:

لیژنە دەڵیّ سالم و کوردی بەدوا نالی و بەپێرەویکردن لەوەوە بوونە شاعیری کوردیەوژن. بەپێی ئەو تەرجەمە حاڵەی لیژنە خۆی بۆ سالم و نالیی پەسەند کردووە سالم و نالی لە هەمان ساڵی (١٨٠٠ز) بەوەلەد بوون. لەوەوە بەسەرنجدان و ناکام لە واقیعەوە وەرگرتن دەرفەت نامێنیّ، وەیا یەکجار تەسك دەبێتەوە، بگوتریّ سالم بەدوا نالیدا شیعری کوردیی گوتووە.

ئەم راستییە لە روویەکی دیکەی واقیعەوە مەحکەمتر دەبیّ کە نالی زادەی (خاك و خۆڵ)ی شارەزووورە، ئینجا چ بڵێین باری ئابووری و کۆمەلایەتیی سلێمانی هاندەر بووبیّ بۆ پشکووتنی غونچەی شیعری کوردی [وەك کە لیژنە بۆی چووە]، چ بڵێین رابەرایەتیی عەبدورەحمان پاشا لە گیانی کوردایەتی بەدوا بەرپابوونی شۆرشی فرەنسە ئەو هاندەرە بووبیّ [وەك من بۆی دەچم] نالی پێی ناکریّ بووبێتە رابەری شاعیرێکی وەك سالم کە خۆی خەڵقی سلێمانی و لە بابانەکان نزیکتر بووە. بەپێی تەمەن نالی و سالم وێکرا دەگەنە پایەی شاعیرییەت، ئیتر بۆ دەبیّ سالم بەدیار نالییەوە بووەستیّ تا لە دەشت و دەر پیّ دەگات و دەچێتە عومرێکەوە دەست بدا بۆ (موستەعبدی) لە خوێندنی شارستان و بە ئیلهامی شارستانەتیی سلێمانی وەیا رابەرایەتیی پاشماوەی گیانی کوردایەتیی عەبدورەحمان پاشا بەهرەی شاعیریەتیی گەشە بکات ئینجا سالم لنیەوە فێری شیعری کوردی بیّ؟ چ شارستانەتی هاندەر بێت و چ رابەرایەتییەکەی عەبدورەحمان پاشا، سالم لێوەی نزیکترە و زووتر چەشەخۆری دەبیّ.

ڕاستیی مەسەلە ئەوەیە سالم و نالی پێش و پاش ناخرێن و بەکەس ناکرێ نیسپاتی مامۆستایەتی و سوختەیەتیی بۆ ئەم و ئەو بکات. مستەفا بەگی کوردی بەپێی تەرجەمەنامەکەی ناو (ئەنجوومەن..) کە لیژنە داینناوە، وەیا پەسەندی کردووە، بە (١٢) ساڵ لەوان گچکەتر بووە دوازدە ساڵ جوداوازیی تەمەن لە سەرەتاکانی ژیاندا بایی پێویست دەکات بۆ هەڵنانی پلیکانەی سەرەی یەکەم و دووەم. کە مستەفا بەگ دە ساڵی بووە ئەوان لە بیست و ساڵ تێپەڕیان کردووە. بەم پێیە دەشێ مستەفا بەگ بەشوێن ئەواندا هاتبێ. حاجی قادریش کە کوردی پێش نالی دەخاتەوە و دەڵێ:

ئەو کە نۆشی شەرابەکەی تاڵی
نالی لەم عەسرەدا بووە تالی

مەبەستی ئەوە نییە بڵێ نالی بەدوا کوردیدا بووەتە شاعیر بەڵکو مەبەستی پایەی شاعیرییەتە. بەڵام وەها دەزانم ئەمیش هەر ڕایەکە لە سیاقی شیعردا هاتووە نەک بەرهەمی توێژینەوەیە. حاجی قادر لە گەلێک بەیتدا بە نالیی هەڵگوتووە و پێیەوە دیارە چ پایەیەکی لێ دەنێ.

لیژنە ساڵی مەرگی نالیشی بێ لێکۆڵینەوە و دوودڵی دەستنیشان کردووە، لەوەشدا قسەی لە خۆی بە پێشەوە، کە بێ بەڵگە (١٨٥٦ )ی بۆ مەرگی نالی دیارە کردووە، دووبارە دەکاتەوە.

ساڵی مەرگی نالی وەک هی لەدایکبوونی سەرگوم نییە:

دەبوو لیژنە سەرێک لە پێشەکییەکەی شەرحی مامۆستا مەلا کەریم و (چەپکێک..) خوار بکاتەوە، هەر نەبێ لەواندا لێکدانەوەیەک کراوە. بەو دواییەش مامۆستا (حەمەبۆر – بەپێی تەعبیری خۆی) دەستنووسێکی دۆزییەوە و گوتارێکی لەسەر بڵاو کردەوە گومان ناهێڵێ لەوەدا نالی دوای ١٢٨٨ مردووە کە دوای (١٨٧٢ز) دەگرێتەوە. (چەپک...) و شەرحەکەی مامۆستا مەلا کەریم و گوتارەکەی مامۆستا حەمە هەڵیان دەگرت دوو قسەیان لە بارەوە بکرێ هەر نەبێ بۆ پووچاندنەوەیان. بەپێی ئەم سەرچاوانە نالی بەر لە (١٨٧٢ز) نەمردووە، شیعرەکانیشی شایەدن کە زۆر پیر بووە و تەمەنی ٥٦ ساڵە جێگەی بۆ ناکاتەوە.

لیژنە لە لاپەڕە (٢٣)دا دەڵێ «ئەم شاعیرە گەورەیە لە پاش ساڵی ١٨٤٠ز بە ناچاری شاری سلێمانیی بەجێ هێشتووە». لیژنە پێمان ناڵێ بۆچی دەبێ ئاوارەبوونی دوای

۱۸٤٠ ز بێ، ئێشمان ناگەیەنێ (ناچاری)یەکە چییە. وا من لە وەکالەتی ئەو وەڵامی ئەو دوو پرسیارە دەدەمەوە:

ساڵی (۱۸٤٠ز) لەوەوە دێتە پێش لێکدانەوەی لیژنە چونکە مەعلومە لە ساڵی (۱۲۵٤ك) کە دەکەوێتە بەرانبەر (۱۸۳۸ – ۱۸۳۹ز) لە سلێمانی بووە: بەپێی ئەوەی لەو ساڵەدا (تا فەلەك دەورەی نەدا)ی لە لاواندنەوەی سلێمان پاشا و پیرۆزبایی ئەحمەد پاشای بابانەدا گوتووە، دیارە لە سلێمانی بووە. چونکە دواتریش لە قەسیدەی (ئەم تائفە مومتازە)دا مەدحی سپای ئەحمەد پاشا دەکات دەبێ لە (۱۸٤٠ز)یش جارێ لە سلێمانی مابێ.

ناچارییەکەش لەوەوە دێت کە نالی لە پاش تێکچوونی میرنشینی بابان، لە ترسی ستەمی تورکە عوسمانلییەکان بۆی دەرچووە. بەڕاستی ئەم (ناچاری)یە لزووم بەناوهێنانی ساڵی (۱۸٤٠ز) ناهێڵێ چونکە وەك (تحصیل حاصل)ە کە ڕمانی حاکمایەتیی بابان دەکەوێتە دوای سەرەتای حوکمی ئەحمەد پاشا. تێ ناگەم لیژنە، یان ئەو ئەندامەی لە بری لیژنە پێشەکییەکەی نووسیوە، بۆچی وەهای پەسەند کرد کە بەوشەی (ناچاری) ساڵەکەی (۱۸٤٠ز) هەڵوەشێنێتەوە؟ چ دەبوو بیگوتبایە دوای ڕمانی حاکمایەتیی بابان نالی بەناچاری ئاوارە بوو، بێ ئەوەی پێویست بەناوبردنی (۱۸٤٠ز) بکات؟

ساڵەکەی ڕمانی بابان لە هەندێ نووسیندا کە یەك لەوان پێشەکییەکەی شەرحی مامۆستا مەلا کەریم و کاك فاتیحە (۱۲٦٤ ك)ی بۆ دەستنیشان کراوە کە دەوەستێتە بەرانبەر بە (۱۸٤۷ – ۱۸٤۸ز). بەڵام بەپێی ئەوەی کە عەبدولباقی عومەری لە پیرۆزبایی نەجیب پاشای والیی بەغدا بەبۆنەی زاڵبوونی بەسەر بابانەدا نیوە بەیتی (بسدید رأیك فتحت بابانها)ی کردووەتە مێژووی ئەو زاڵبوونە دەبێ لە (۱۸٤۵ ز) بابان تێك چووبێ.

بەلای باوەڕی منەوە نالی لە گژە حەجی ساڵی۱۲٦۱ وەیا ۱۲٦٠ بە ئاسایی بۆ حەج چووە بەڵگەش بۆ ئەم ساڵە لە لێکدانەوە و بێداویستیی حاڵ و واتای هەندێ شیعری نالییەوە دەردەست دەکرێ.

أ– هیچ بەڵگەی سەلمێندراو نییە ئەم ساڵە بەدرۆ بخاتەوە.

ب– ئەگەر نالی لە کاتی داگیرکردنی سلێمانی لەلایەن تورکەوە جارێ لە سلێمانی

بوویێ و لە ترسان هەرای کردبێ، زەحمەت دواتر بوێرێ پرسی گەڕانەوە لە سالم بکات. بەڵام ئەگەر لەو دەمەدا چووبێ بۆ حەج جێی خۆیەتی ئەو پرسە بکات چونکە پێشتر تەجرەبەی حوکمی تورکی لە سلێمانی نەبووە تا بزانێ ئایا لەوانەیە تێیدا بحەوێتەوە یان نا؟

ج- سەرنج لە موناجاتەکانی ڕێی حەج و قەسیدەی (ئەی ساکینی ڕیازی مەدینەی مونەوەرە) و قەسیدەی (وەی کە ڕووزەردی مەدینە..) بگرە هەست بەوە ناکەیت نالی ئاوارە و لێقەوماوە بە تایبەتی قەسیدەکەی دوایی (وەی کە ڕووزەرد...) پێوەی دیارە کە نالی عوزری بەجێهێشتنی مەکە و مەدینە بەوەدا دەهێنێتەوە کە دەڵێ (من کە بازی دیدەبازم ئەف شەوارەی دەستەموم). بازی دیدەباز [بازی چاوبڕکێکەر] هی لێقەوماوی نییە.

ئەم چەند برە شیعرە توند و بەرزەی لە یەکەم سەفەری حەجیدا گوتوون کە جارێ تەنگانەی نەگەیشتووەتێ. دوای جێهێشتنی حیجاز بەرەو ماڵ، هەبەری تێشکانی بابانی وەرگرتووە و ماوەتەوە. بەینێکی زۆری پێ دەچێ دەگەڕێتەوە بۆ حەج. ئەمجارەیان لە قەسیدەی (ئەی تازە جەوان)دا ئاوارەیی پێوە دیارە کە دەڵێ:

«موژدێکە کە هەم گەردشی دەورانی سوپەپەرم»

هەموو بەیتەکانی دیکەشی داد و بڕۆیە لە دەست پیری و بێ وەزعی و لێقەوماوی.

ئەم بۆچوونە ڕێک دێت لەگەڵ ئەحواڵی مەعلوومی نالی:

ئەگەر نالی لە ١٢٦٠ بۆ حەج چووبێت و دوای سەفەری ئەو میرنشینی بابان تێک درابێت جێی خۆیەتی پاش چەند ساڵان پرس بە سالم بکات بۆ گەڕانەوە چونکە لە خۆی بە گومانە ئایا دووچاری چی دەبێ لە سلێمانی. شایەدییەکەی (خۆدزکۆ) کە دەڵێ لە ساڵی (١٨٥٣ز) ئەحمەد خان لە پارس پێی گوتم بچمە شام نالی ببینم، بەچاکی جێی خۆی دەکاتەوە لەم لێکدانەوەیەدا.

لە ١٨٤٥ تا ١٨٥٣ (٨) ساڵان دەگرێتەوە ئەمەش ماوەیەکی ئەوتۆیە هەم نالی تێیدا سەغڵەت بووبێ هەم پرسیش بکا بۆ گەڕانەوە. سالم لە خۆڕایی جەوابی نامەی نالی بۆ شام ڕەوان ناکات، دیارە لەو دەمەی کە نالی کاغەزی بۆ سالم نووسیوە لە شام بووە. ئینجا لە کەیەوە هاتووە بۆ شام دەخلی بەسەر سەرەتای ئاوارەبوونیەوە نییە.

لە بەراوێزی لاپەڕە (٣٢) لیژنە وشەی (هەڵبەستەر)ی بەواتای (ناظم) بەکار هێناوە هەرچەند جۆرە قیاسێك لە دارشتنی بەکار هاتووە، دیسان لەبەر زەقیی وشەکە چاو لێی هەڵدەبەزێتەوە. جگە لەمە هۆی دیکەی ڕێزمانی هەیە دارشتنەکە دەخاتە خانەی ڕێزپەڕ (شاذ)ەوە.

بەزۆری کاری کوردی دوو جۆرە ناوی کارا (اسم فاعل)ی لێ هەڵدەستێ. بە نموونە: خواردن، کردن، بردن، کوشتن، ناقی دەکەینەوە دەگوترێ:

نانخۆر نانخواردوو

هەڵەکەر هەڵەکردوو

باربەر باربردوو

کوردکوژ کوردکوشتوو

هەرچی کاری (بەستن، پەستن، پەرستن) و یەك دووانێکی دیکەش ڕێژەی بەرانبەر (نانخۆر، باربەر)یان نییە چونکە لە موزاریعدا هەموو کارەکە دێتەوە و دەگوترێ (دەبەستم، دەپەستم، دەپەرستم). کەچی لە فیعلەکانی دیکەدا دەگوترێ (دەخۆم، دەکەم، دەبەم، دەکوژم). ئەم شێوە کورتکراوەیە دەبێتە هۆی پەیدابوونی دوو جۆرە ناوی کارا لەو فیعلانەدا.

ئینجا کە گوتمان (هەڵبەستەر) وەك ئەوەیە گوتبێتمان (تێ کردەر) لە جیاتی (تێ کەر) وەیا (نان خواردەر) لە جیاتی (نان خۆر).. هتد. لەبەر ئەمە وەها بەڕاست دەزانم لەو کارانەی کە موزاریعیان کورت نابێتەوە ڕێژەی (خواردوو، کردوو، گوتوو..) بەکار بێت و بگوترێ (هەڵبەستوو – نەك هەڵبەستەر). کە ویستمان ڕێژەی کارای لێکدراویان لێ وەرگرین بڵێین:

خواپەرست

بەرپەست

قتووپەست

دەنا نووشی (خوا پەرستەر، بەرپەستەر، هەڵبەستەر...) دێین.

لیژنە لە لاپەڕە (٦٤)دا بەشێوەیەکی گشتی (بۆ سەیرکردنی ڕاڤەی هەڵبەستەکانی نالی) خوێنەر حەواڵەی لێکدانەوەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم و کاك فاتیح دەکات.

لەوەشدا کاغەزی سپی بۆ ئەو لێکدانەوەیە ئیمزا دەکا.

دەزانین کەس نەهاتووە سەرلەبەری دیوانی نالی شەرح بکات وەک ئەو دوو بەڕێزە کردوویانە، خۆیشم چەندی گرفتم بووبێ لە ڕاڤەکردنی بەیتێکی نالی پەنا دەبەمەوە بەر ئەو کتێبە. خزمەتەکەشیان بە ئەدەبی کوردی لەلای هەموو قەدرزانێکەوە جێگەی سپاس و منەتباری و بە گەورە گرتنە. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، تەواوی هەر بۆ خوایە. وا لێرەدا چەند نموونەیەک دەهێنمەوە لەو بەیتانەی کە ڕاڤەیان لەو کتێبەدا پێویستی بە مشتوماڵ هەیە. لە لاپەڕە (٣٥٢)دا ئەم بەیتە سەیر بکە:

وەرە تا عالەمی قەلبت نیشان دەم
کەوا فەقری غینایە مردنی ژین

لە شەرحدا (عالەمی قەلب) بە عالەمی دڵ و خۆشەویستی لێک دراوەتەوە و هیچی تر. کەچی ئەم عالەمەی قەلب هەرای ناوەتەوە لەبەر زۆر واتایی:

عـالــەمــی قــەلب – عــالــەمــی دڵ
عالەمی قەلب – عالەمی چرووک (قەڵب)
عالەمی قەلب – عالەمی وەرگەڕاو (وەرگەڕان)

هەرسێ جۆریش لەگەڵ (فەقری غینایە مردنی ژین) ڕێکن.

لە بەیتی دوای ئەمیاندا کتێبەکە وشەی (تێدا)ی هەڵبژاردووە لە پەراوێزدا دەڵێ چەند نوسخەیەک (تیا)یان نووسیوە. ئەمەشیان ڕاستە چونکە (تێدا) بەیتەکە وەها تەنبەڵ دەکا بەلای لەنگییەوەی دەبات:

تێدا ئومەید و بیم و گریەو و سۆز
تیا ئومەید و بیم و گریەو و سۆز

ئاشکرایە (تیا) شیرەخۆرەی بەیتەکەیە. نالی بەپێی داخوازیی کێش و مۆسیقا (تیا) و (تێدا)ی بەکارهێناوە وەک لەو دوو نموونەیەی خوارەوەدا دیارە:

بەچەمی پەرچەمی بوو پەرچی سیا
هەر دەڵێی مانگەشەوە کوڵمی تیا
بەعنی ڕیاضی ڕەوضە کە تێدا بەچەند دەمێ
مشکین دەبێ با کاکوڵی غیلمان و زوڵفی حوور

لە لاپەڕە (٣٤٠)دا سەرەتای (مەدحی تاقمی مومتازی شاهـ) کە دەڵێ

ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاصەیی شاهن
ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن

لە ڕاڤەدا نووسراوە (تێکڕای پارچە شیعرەکە وا ئەگەیەنێ هەڵمە..) لە ڕاستیدا بەیتەکە شارێکە بۆ خۆی.

١- ئەم تاقمە مومتازە ئاشووبی دڵی مەملەکەتن. ئینجا ئەگەر مەملەکەتەکە سلێمانی بێ ئاشووبەکە هی خۆشویستن و پێوە شەیدابوونە. ئەگەر مەملەکەتی دوژمن بێ دیارە ئاشووب چ دەگەیەنێ.

٢ – ئەم تاقمە مومتازە قەلبی سوپاهن. جاران لە سپادا مەیمەنە و مەیسەرە و قەلب هەبوو. ئەم تاقمە قەلبەکەن کە جەرگە و کۆڵەگەی سپان و بەدەوری سەرکردەوە دەوەستن.

٣- ئەم تاقمە مومتازە ئاشووبی قەلبی سوپاهن. لێرەدا قەلبی سوپاهـ هی لەشکری دوژمنە.

نالی بەمەعارەتە لە حەد بەدەرەکەیەوە هاتووە بۆ (مەملەکەت) وشەی (دڵ)ی ئیزافە کردووە بۆ (سپاهـ)یش وشەی (قەلب)ی ئیزافە کردووە چونکە لە زاراوەی عەسکەریدا (قەلب) بەکار هاتووە هەرچەند لە واتادا هەر دەکاتەوە (دڵ)، بەم دوو وشەیەی (دڵ، قەلب) عەسکەری و مەدەنی گرتووەتەوە کە ئەوانیش لە دوو وشەی (مەملەکەت، سوپاهـ)دا دەردەکەون.

لە لاپەڕە (٣٤٢) بەیتی ژێرەوە هەیە:

صەحرا بەتەجەللی دەکەنە وادیی ئەیمەن
قامەت شەجەر و مەظهەری ئەلطافی ئیلاهن

لە ئاستی وشەی (ئەلطاف)دا هەر ئەوەندە نووسراوە کە لە هەندێ نوسخەدا وشەی (انوار) هاتووە. ئێمە ئەگەر مەعارەتی نالی بکەینە سەنگی لەو دوو وشەیەدا بێگومان (انوار) ئەسڵییە ئەویش لەبەر هۆیەکی زێدە بەنجی. (انوار) ڕێژەکۆی دوو وشەیە: (نور – بەواتای ڕووناکی) و (نور «نەور» بە واتای غونچە). ئینجا کە واتای (نور – ڕووناکی)ی لێ وەربگرین، بۆ (تەجەللی) دەچێتەوە کە دەزانین لە قورئاندا باس کراوە نوری خوا لە درەختێکەوە تەجەللی کردبوو. ئەگەر واتای (نەور – غونچە)ی لێ وەربگرین، بۆ درەخت دەچێتەوە.

وشەی (ئەلطاف) بەیتەکە ڕووت دەکاتەوە لەو سامان و ئارایشتەی وشەی (ئەنوار) پێکی دەھێنێ چونکە ئەو (استخدام)ەی لێ دەستێنێتەوە، وەك بزانم ئیستیخدامەکانی نالی بێ مانەندن و قیاسی ناکرێ لە جیناس و تەورییە و ئەو جۆرە ھونەرانە.

بگەڕێینەوە بۆ لاپەڕە (٢٥٧) سەیرێکی ڕاڤەی بەیتی خوارەوە بکەین:

دەس بەندییانە دێن و دەچن سەروو ئارەوەن
صاحیب کولاھ و سایە و بەرگن وەکو ملوك

لە واتای (دەس بەندییانە)دا شەرحەکە (دەست گرتنی ھەڵپەڕکێ)ی پەسەند کردووە، بەلام واتایەکی دیکەی ھەیە (دەس بەستراوانە)یە کە وەسفی ئینسانی بەستراو دەکات.

نالی بەم وشەیە وەسفی درەختەکان لە دوو ڕووەوە دەکات. یەکیان ئەوەیە کە دێن و دەچن بە شنەی با و دەستی یەکدییان گرتووە وەکو ڕیزی شایی. بەلام ئەو درەختانە (دەست بەستراوانە) دێن و دەچن چونکە درەخت بەزەوییەوە داکوتراوە و بەستراوەتەوە. جان پۆل سارتر لە وەسفی پەرژینی باغدا شتێکی وەك ئەمەی نالی گوتووە لە عەرەبیدا خوێندوومەتەوە دەڵێ: كانت اشجار السياج حركة خضراء كبير مسمّرة. واتە (درەختەکانی پەرژین جووڵەیەکی سەوزی گەورەی داکوتراو بوون).

لە لاپەڕە (٤٤٠ ) بەیتێك نووسراوە:

دنیـا بـووە بـەتـاوە و صەحـرا یـە ژیـلـەمۆ
دنیـا دەڵـێن کـە ئـاگـرە مـاری سەمـەنـدەرە

لە پەراوێزدا ئیشارەت ھەیە بۆ ئەوەی کە لە ھەندێ نوسخەدا لە جیاتی (دنیا)کەی سەرەتای نیوە بەیتی دووەم وشەی (دەریا) نووسراوە. ئەمەشیان جێی خۆیەتی چونکە دووبارەکردنەوەی دنیا لەو شوێنەدا بێ لزوومە. دەریاش دەبێتە تەواوکەری دنیا بە سەحرا و دەریاوە، ئەوەندەش گەرمە لەو ڕۆژەدا وەکو ئاگری لێ ھاتووە (دەریا دەروونی ئاگرە ماری سەمەندەرە).

لە ئاست وشەی (سەمەندەر)دا نیشانەیەکی پرسیار (؟) داندراوە پاش واتای ئادیارە. ئەم وشەیە (سمندر، سمندل)ی ھاتووە وشەیەکی ئەفسانەییە بەو مارە دەڵێن گوایا لە ناو ئاگردا دەژیت. لە ئافەتەکشی بەوەدا ھەست دەبێ کە ماری سەمەندەر لە ئاوی بەحردا بژیت دیارە بەحرەکە ھێند گەرمە لە گەرمای وشکاییی تێپەڕ کردووە وەك دەشبینین لە بەیتەکەدا سەحرا ژیلەمۆیە و دەریا ئاگرە، ئاگریش لە ژیلەمۆ گەرمترە.

لە لاپەڕە (٤٨٩)دا بەیتی ژێرەوە هەیە:

لە سەر جێ کلکی ئوشتر گەییە ئەرزی مەملەکە هێشتا
پەمی ئەججی عەمیقی ئالی هەر بێ قەعر و پایانە

وشەی (ئاڵ) لە شەرحی بەیتەکەدا هەر ئەوەندە جێگەیەی بۆ کراوەتەوە کە دەڵێ (کەچی هێشتا دەریای شینی ڕێگای دووری...) بەو پێیە واتاکەی بەرەنگی (شین) لێک دراوەتەوە.

ئەم وشەیە (ئاڵ) نییە (آل - ئال)ی عەرەبییەکە بەواتای (سەراب) دێت. هەر ئەم واتەیەشە مناسبی سەحرا و بەحر بێ چونکە سەراب دیاردەی سەحرایە و وەکو ئاویش خۆی دەنوێنێ.

گەیشتنی کلکی وشتریش بەزەوی، وەك بزانم، کینایەیە لە مردن چونکە وەها زانراوە کلکی وشتر لەپێخبوونیشدا ناگاتە زەوی. ئینجا دەمێنێتەوە وشتر بمرێ و بکەوێتە سەر تەنیشت چونکە بە زیندوویەتیش پاڵ ناداتەوە.

بێ ناوێ چەی دیکە نموونەی ئەوتۆیی بهێنمەوە. مرازیشم لەو سەرنجڕاکێشانە ئەوەیە بڵێم حەواڵەکردنی خوێنەر لەلایەن لیژنەوە بۆ ئەم شەرحە نابێتە بەڵگەی تەواوی و بێ کەلەبەریی شەرحەکە، دیارە ڕێزی لیژنە بۆ شەخسی مامۆستا مەلا کەریم کە مامۆستای هەموو ئێمەمانانە سەنەدی سەیی بێ ئیمزا کردوون. ڕێشی تێ دەچێ کە ئەوەندەی شەرحەکە بەدەستییەوە داوە، بەلای نووسەری پێشەکییەکەوە، ئەوپەڕی واتای شیعرەکانی نالی بێ: ئینجا من دەمەوێ بڵێم جارێ بە کەس نەکراوە بگاتە بنی دەریا و ئەوپەڕی ناسۆی واتاکانی نالی. توێژینەوەیەکی بەراوردی بکرێ لە نێوان شیعری نالی و هی شاعیری زەمانەکانی دیکە لە تاکە مەیدانی (استخدام)دا مەعلووم دەبێ نالی جۆرێکی (استخدام) بەکار هێناوە گەلێك بەولای مەبەستی وشەکەوەیە و بەهەمبالی زاناکانی بەیان و بەدیعدا نەهاتووە. وشە و تەعبیری وەهای هەیە لە چەقی دائیرەوە چەند تیر بەرێ دەکا بۆ ئامانجی جودا جودا، هەر بەڕێوە کینایە و تەورییە و جیناس دەبێکی و سەرلەنوێ (استخدام) لەو فنوونەوە هەڵدەستێنێتەوە، هەمووشی بە لووسی و بێ گرفت.. بەلام لەگەڵ ئەمەشدا کە شەرحەکە پێویستی بەتەواوکردن هەیە و زۆر خۆی لە قەرەی ئەو (استخدامانە) نەداوە، هەر دەڵێم کەس نییە لەوانەی شیعری نالی دەخوێننەوە قەرزداری شەرحەکە وەیا موحتاجی نەبن بەڵگەشم لەوەدا بەر لە هەموو

کەس خۆمم کەوا گەلێك پێوەی سوودمەند بووم. ماوەتەوە بڵێم پێویستە لە رووی وەفاکاری بۆ حەقیقەت و بەنیازی حورمەتگرتنی مێژوو ئاشکرا بێ کە بەشێکی گرنگی شەرحی دیوانەکە مالی حەلالی سەربازی نەناسراو، کاك محەممەدی مەلا کەریمە. لەو ساڵەی ۱۹۷٦دا من لە کۆڕی زانیاری کورد وەکیلی سەرۆك بووم و ئاگادارم کاکە حەمە چۆن هەفتەها و مانگەها هەریکی توێژینەوە و پرسین و گردوکۆیی بوو بۆ ئەم کتێبە. هەر لە بیرمە ڕۆژێکیان دوای دەرچوونی کتێبەکە کە هەر خۆی سەرپەرشتیی لە چاپدانی کرد، بە پەرۆشەوە گوتی، بەدەرەنگەوە زانیومتی (بوریا) واتای حەسیری هەیە، ئەگەر زووتر ئەمەی زانیبایە لە شەرحی (پیشەکەی پان و درێژی بۆ ڕیا خزمەت دەکات)دا، ئیشارەتی دەکرد کە (بۆریا) بە ڕێنووسی کۆن دەشبووە (بوریا – بووریا) بە واتای حەسیر. شاڵڵا بەم قسەیەشم کەسم نەرەنجاندبێ چونکە کور و برا و باوك هەمیشە بە شێری یەك بێشە دانراون.

دوایین قسەم ماوە لەبارەی ئەنجوومەنەوە: خوا خێری بنووسێ، هەڵەیەکی خۆمی بۆ ڕاست کردمەوە. من وام دەزانی شێخ ڕەزا گوتوویەتی.

«خۆی کرد بەنێرە تورك و لێمی خوری کیم بلیر سزی»

کەچی لە ئەنجوومەندا دەرکەوت کە ڕاستیی بەیتەکە ئەمەیە:

«خۆی کرد بە نێرە تورك و گوتی کیم بلیر سزی»

من لە هیچە دوو برگەم بۆ بەیتەکە زیاد کردبوو. ئەمما دەبێ بشڵێم من دیتوومە نووسراوە (خۆی کرد بە تورك و لێمی خوری کیم بیلیر سزی) بەمەرەکەشی تەواوە. دیارە من هەردوو شێوەم لێ تێکەڵ بوون.

لە زەمینەی هەڵەی خۆمدا، مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی بە تەلەفۆن پێی گوتم لە نووسینێکمدا گوتوومە وشەی (ئاش) لە (ئاشیهانە)دا بەواتای هێلکەیە کەچی فەرهەنگەکانی فارسی هەمووی دەڵێن (ئاش) بەواتای تەیرە. زۆرم سپاس کرد بۆ ئەم پەرۆشەی، بەڵام قسەیەکیش بۆ دز بکەم: لەو باوەڕەدام کە دیتوومە لە کتێبێکی فارسیی نوێ، لەوانەی توێژینەوەی زاناکانی ئەورووپا لەبارەی زمانە کۆنەکانی ئێرانەوە باس دەکەن، (ئاش) لە کۆندا بە هێلکە گوتراوە. تەنانەت کە ئەمەم خوێندەوە بەبیرمدا هات وشەی (ئاش) نزیکە لە (هێك)ی کوردی ( egg)ی ئینگلیزی. گەڕامەوە بۆ ئەو کتێبە فارسییانەی لە بەردەستمدان. تەنها سێیانم لێ چەنگ کەوتن

١- كارنامك اردشيربابكان

٢- فرهنگ ايران باستان

٣- مزديسنا و ادب پارسي..

چەند کتێبێکی دیکەی وەك ئەمانەم هەن، لە گرێزەگوێزی کەلوپەلی ناو ماڵ و ڕاخستن و هەڵگرتنەوەی ڕاپەڕ کەوتوونەتە قوژبنی ئەوتۆوە بە ئاسانی ناپاندوزرێنەوە. لە نێوان ئەو سێ کتێبەشدا تەنها فرهنگ ایران باستان لەبارەی وشەی (اش)ەوە ئەدوێت و ئەڵێ بە واتای خواردنە و لە بنەڕەتدا لە (ad)ی سانسکریتی وەرگیراوە و خۆی سەرچاوەی (eat)ی ئینگلیزی و(essen)ی ئەڵمانییە. لەو ڕیشەیەوە چەند وشەیەك ماوەتەوە وەك: کرگس کە بریتییە لە دوو کەرت، یەکەمیان (کە هرکە) بە واتای تەیر، دووەمیان (ناسە) بە واتای خواردن و دەبێتە (تەیرخۆر). وشەی (ناشتا - بەواتای خوڕین، کوردیش ئەڵێ (لە ناشتا) ئەویش لە (نا)ی ئەفی و (اس)ی خواردنەوە هاتووە دەبێتە (نەخۆر، بێ خواردن). هەروەها وشەی (ئەسپەست) بە واتای (خۆراکی ئەسپ) کە ئێستا یۆنجەی پێ ئەڵێن و لە سوریانی بووەتە (پەسپەستا) و عەرەب کردوویەتییە (فصافص). فەرهەنگەکانی فارسی وەکو (برهان قاطع) و هی نوێتریش ئاگایان لەو تەرزە توێژینەوانە نییە چونکە کاتێك ئەوان دەردەچوون جارێ زاناکانی ئەوروپا نەکەوتبوونە سەر لێکۆڵینەوە لە مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵات، بەدرەنگەوەش نووسینەکانیان بەناو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا بڵاو بوونەوە. بەهەمەحاڵ ئەو سێ کتێبە بەلای ئەوەدا ناچن کە ئاش بە واتای تەیر بێ. ئینجا دەشێ من وشەکەم لە کتێبێکی ئەوتۆیدا دیتبێت دەنا دەبێ بەسەهوو لە جیاتی (مرغ) چاوم (تخم مرغ)ی خوێندبێتەوە چونکە وەك (فرۆید) ئەڵێ زۆر جاران مرۆڤ شتێك دەبینێ وەها دەبیستێ بەو جۆرە لە دڵدا پێی خۆشە.

مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی هەر لەو ئەلەفۆنەدا ئیمجە هەڵەیەکی دیکەشی بۆم باس کرد کە من لە گوتاری (دساتیر)دا ڕستەی (راهرا از چاه بدانیم)م بە (ڕێگە لە زیندان بناسینەوە) تەرجەمە کردووە لە جیاتی (ڕێگە لە چاڵ بناسینەوە). هەرچەند (چاه) بەواتای زیندانیش دێت بەڵام لێرەدا بەجیرانەتی (راه - ڕێگە) دیارە مەبەست لە (چاه) قوڕت و چاڵە. سپاسم بۆ مامۆستا.

كاروان، ژمارە ١٩، ١٩٨٤

# لە ئاوێنەی ئەم گوتارەدا تیشکی چەند چرایەک

## بەشی دووەم

لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق «دەستەی کوردی» بەرگی دەهەم ١٩٨٣ چەند بابەتێک هەن لە هەندێ جێگەیاندا تێبینی هەڵدەگرن.

لە پێشەوە گوتاری د. کامل بەسیر لە ژێر سەرەناوی (ڕەخنەسازێک و بیردۆزی هۆنراوە)دا هاتووە. ئەو ڕەخنەسازە چل ساڵێک لەمەوپێش لە (یادگاری لاوان)دا بۆ ئەوەی خۆی بناسێنێ شتێکی بڵاو کردووەتەوە بە ناونیشانی (شاعیرەکانمان). هەرچەند دەقی گوتارەکەمان لا نییە بەڵام چی لێی نەقل کراوە لە گۆڤاری کۆڕدا پێم دەدا بەسەر بابەتەکەدا بڕۆم. ئەگەر خوێنەریش وەکو من نموونەی بیروڕای ڕەخنەسازەکە لە ناو گۆڤارەکەدا بخوێنێتەوە، ڕەنگە ئەویش وەکو من باوەڕ بهێنێ کە ڕەخنەسازەکە گەنجێکی دڵگەرمی بەپەرۆش بووە بۆ سوودی کورد، سەرکێڵیی بەرقەننەیەکی لە سەقافەتی ئەدەبیی ئەورووپا خوێندووەتەوە بایی ئەوەی ببکا بە دوژمنی شیعری کوردیی ئەوسا و لەمەوبەرتریش، واتە هاتووە لە تاکە کولانەی شیعرەوە بەراوردی شاعیری کوردی لەگەڵ هی ئەورووپادا کردووە و بڕیاری بێ بایەخی و بێ نرخیی شیعری شاعیری کوردی داوە. ئەوەندەش شلک بووە نەیتوانیوە سەرنجی ورد لە واتا و ڕاگەیاندنەکانی شیعری کوردی بگرێت و بە ڕوونی تێیان بگات، بە پەلەش شیعری سەدەی نۆزدەم و بیستەمی وێکرا پێکاوون بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکا.

هەر لە بیرمە، لە سییەکاندا، ڕۆشنبیری ئەوسای کورد وای دەزانی بەهەڵاوبوونەوەی خوێندن و نووسین، تەنگ و چەڵەمەی ژیانی کوردەواری دەڕەوێتەوە و میللەت ئاسوودە دەبێ. دواتریش وای دەزانی دەمدان لە بیری سەر بەچینایەتی دەرگەی کامەرانی بەڕووی میللەتدا دەکاتەوە. بە دڵی ئەو گەنجانەدا نەدەهات، بۆ ماوەی چل ساڵ و پەنجا ساڵی دیکەش کورد لە شوێنی خۆیدا پێکوتە دەکات. کە ڕاپەڕینی ٩٤٨ (وثبە) بەرپا بوو وا زاندرا کلیل خرایە قفڵی خەزێنەی قاڕووتەوە.

ئەو ڕەخنەسازە، کە بە خاترانە پێی دەڵێین ڕەخنەساز دەتا گەنجێکی عاتیفیی

دڕشتبینی سافیلکەی سەرابیی بە پەرۆش و دڵسۆزە، چاوی خۆی بڕییە شیعری کوردی و بەراوردی کرد لەگەڵ شیعری شێللی و نازانم کێ و بڕیاری خۆی دەرچواند بە هیچ و پووچیی شیعری کوردی. ئەگەر ئەختێك ڕەگی سەقافەتەکەی بەناخی واقیعدا چووبایە، چاوێکی دەگێڕا بەو دەوروبەرەی شیعری کورد و شیعری ئەورووپای لێ هەڵقوڵیوە، ئینجا لیستەی دەگرتەوە بۆ ژمارەی فابریقەکانی هەڵەبجە و بەرمەنگهام.. درێژاییی ڕێگە ئاسنەکانی کوردستان و ئینگلتەرەی بەیەکدی دەگرتن.. سەرژماری کتێبخانە و چاپخانەکانی ڕانیە و ئۆکسفۆردی دەکرد.. بیری لە ئۆتێلەکانی لەندەن و دهۆك دەکردەوە. زانکۆ و کۆلێجەکانی بەیەکدی دەگرتن.. پاپۆڕ و تەیارەکانی کورد و ئینگلیزی دەنرخاندن .. بانکەکانی لە هەردوو وڵاتدا دەژماردن.. بنگەی پیشەسازی و لەشسازی و زەویسازی و هونەرسازی و.. سازی .. سازی (لانکە شایەر) و (بیتوین شایەری) هەڵدەکێشان و ئینجا کە بۆی ڕوون بووەوە لە هەموو سازوباز و نازێکدا کورد هاوشانی ئینگلیزە دوو پەنجەی شادەی هەردوو دەستەکانی لە بیبیلەی چاوی گۆران و نالی و حاجی قادر دەچەقاند و کوێرایی دادەهێنان، ئێمەش چەپڵەڕێزانمان بۆ دەگێڕا و ئافەرینمان لێ دەکێشا. مەلا حەسەن چەند حەقی بوو گوتی:

«ئەی میللەتی بێ چارە عەجەب جاهیل و خامی»

بێگومان کاکی ڕەخنەساز ئەگەر باری مادیی کورد و ئینگلیزی بەیەکدی گرتبایە و هەر لەسەر سافیلکەیی خۆی ڕۆیشتبایە بێ ئەوەی بچێتەوە بۆ ئەو هۆیە مادییە مێژووییە کۆمەڵایەتییە ناوچەییەی کوردی لە ئینگلیز و لە ئەورووپا دابڕی، دەهات بڕیاری وێرانکردنی شار و دەشتی کوردستانی دەدا چونکە نە تەیارەخانەیان هەبوو نە هۆڵی دانس و نە لۆقەنتەی شیك و نە سینەمای دڵگیر و نە شوێنی مەلە لێکردنی هاوینە و نە هونەر و نەچاپەمەنی و نە هیچ... دەهۆڵ و زوڕنا هەبای کوردی دەبرد لە تەك تیپی سیمفۆنی.

هەتا ئێرە لە ڕاستە حیسابی سڕینەوەی شیعری کوردی ڕواڵەتێکی سەرکێڵی و بێ سەقافەتی و کەم ئینسافیی ئەم ڕەخنەسازە دڵسۆزەمان باس کردووە کە بێین بەوردی و قووڵی لە هەڵوەستی بکۆڵینەوە حیسابەکەی گەلێك بەرمۆزتر دەڕوا:

شیعری کوردی و ڕۆشنبیرییە هۆشەکییەکەی کوردی گەلێك بەرمۆزووتر بووە لە

باری مادیی کورد. ئەگەر چاوەنۆڕ بایبایە تا شیعری کوردی وەکو بەیت و بالۆرە لە بەرەوپێشچوونی باری مادی و رامیاری و کۆمەڵایەتی و سنعەتیی کورد هەڵقوڵابایە نەبوو شاعیر لە کورد پەیدا نەبێ بەرانبەر شاعیری وڵاتی پێشکەوتوو رابگیرێ. ئەم دیاردەیەی بەرەوزوورتربوونی لایەنی ئەدەبی و (هۆشەکی - عقلی) کورد لەلایەنە مادییەکەی کورد مەتەڵێك نییە بەکەس هەڵنەیێ، کورد کە ناتوانێ لەبەر هەزار و یەك هۆ فابریقەی تەیارە و رادیۆ و دووربینی هەبێ دەتوانێ نووسراوی لەندەن و پارس و قاهیرە بخوێنێتەوە، لە کۆنیشەوە تواتیوەتی لە دێیە وێرانەکانی کوردستاندا فەلسەفەی ئەفلاتوون و مەنتیقی ئەرەستۆ و فەلەکیاتی بەتلەمیۆس بە دەرز بڵێتەوە.. بارتەقای مەلای ئەستەنبووڵ و مامۆستای لاهۆر لەسەر پرسیارەکانی زانستە ئیسلامییەکان بدوێت و بنووسێت. خوێندنەوەی شیعری موتەنەبی و حافز و جەلالەدین رووميی وەك دروستکردنی کارگەی ئۆتۆمۆبیل نییە پەکی لەسەر فابریقە و پسپۆڕ و هەندەسەی میکانیکی و ئەو دەرد و بەڵایانە کەوتبێ. کە بڵێن مەلا و شاعیری کورد بە مەلا و شاعیری تورك بگرین دەبینین ئەوان لە یەکتر نزیکتر بوون تا خەرەکی شەقڵاوە و تەرسانەی نوسکودار... ئینجا نازانم لە مەلای ئەزهەر دانەماوە بەڵام رۆست و (تولزە - کە خۆی بەدەستی خۆی ناوەکەی نووسیوە) چوار هەزار ساڵ لە قاهیرە دواکەوتوو بوون.. ئینجا کە پەکێك لەسەری زەمانەوە دەڵێ شاعیری کورد چاولێکەریی شاعیری بێگانەی کردووە دەبێ شەرم لە خۆی بکاتەوە چونکە لەو سەرشکێنکردنی شاعیری کورددا بە لای کەمەوە دووجاران بە کارکارەی هەڵەدا چووە: جارێکیان لەوەدا کە سەرەمشقی شاعیری کورد موتەنەبی و سەعدی بێ چاکترە نەك گووفەکی قرناقە و مەلارەپای شارەزوور، هەروەك لە زانستدا فەلەکیاتی یۆنان رابەری بێ نەك دێوی پشت چیای قاف و عەزیای واقلواق. جاری دووەمیان لەوەدا کە بەبیری کوێرەوەبوویدا نایەت بۆچی تەشیرێسی کورد پێی ناکرێ چاولێکەری لە کارگەی فەتاح پاشا) بکات وەك کە زیوەر بەسەر رێی نیزامیدا رۆیشت، خۆ ئەگەر تەشیرێس ەو چاولێکەرییەی کردبایە کەس عەیبی لێ نەدەگرت، نافەرینیشی لێ دەکرا! هەڵبەت خزانم ئەم چاولێکەرییە نەك بەهەرەگرێس ناکرێ، بەڵکو لە بەرەو دوای سەدەی بستەمدا بە پارەدارەکانیشمان ناکرێ لە هەڵەبجە کارگەی قوماش دابنێن.. قسەکە بۆ ڕوونکردنەوەی دابڕانی ئەو جۆرە بیرکردنەوەی رەخنەساز و ئەمسالی ئەوە لە ەڵکەوتی زەق و زۆپ..

چیی گوتم بۆیە بوو لە سفرەوە بەرەو موناقەشە بڕۆم، دەنا شاعیری کورد ئەو بێ بایەخە و لاسایکەرەوەیە نییە بۆی بهارێنەوە وەیا عەیبدار بووبێ.. فەرموو شێخ ڕەزا بگرە بەمەر شاعیرێکی ڕۆژهەلاتی ئیسلام بێ و پێم بڵێ لە کامیان دادەمێنێ؟

با ئەم قسە گشتی و هەمەکییانەم لێرە بێ و سەرێك لە ئاردانوێژی ڕەخنەسازەکە خوار بکەینەوە و بزانین چ ڕێ نموونییەکمان دەکا بۆ ناسینەوەی شیعری ساغ لە هی چرووك.

دەڵێ: [بەو شێوەیەی لە گۆڤارەکەدا هاتووە قسەکانم ڕاگرتووە]. «شیعر: تەرجمانی دڵە، چی بەدلا بێ، ئیش و ئازار، دەرد و خەفەت ... شین و شادی .. خۆشویستن و قین ... خراپی و چاکیمان بە واتەی ڕێکوپێك بەشێوەیەکی دڵگیرا بۆ دەردەخات کە هەموو کەسێ لە دەمی خوێندنەوەیدا شێوەیەکی دڵی خۆی تیا ئەبینی.» [لاپەڕە ١٣ی گۆڤار – شوێنی خاڵەکان بەمەبەستی کورتکردنەوە هەڵبوێردران].

بەم پێودانە کام شاعیری کورد لە شاعیرایەتی دەشۆرێ؟ ئەمە کوردی و سالم و نالی و حەریق و حاجی، گوێیان لێ بگرە چییان گوتووە لەوە بەولاوە کە بیریاندا هاتووە؟ هیچ کامێکیان بە پارە شیعریان نەگوتووە تەرجەمەی شیعری غەیریشیان نەکردووە. تۆ بڵێی شتێکیان گوتبێ غەیری (ئیش و ئازار... دەرد و خەفەت .. شین شادی.. خۆشویستن و ڕق لێبوونەوە؟ هێندە هەیە دەشێ ئەوان دەرد و خەفەتیان ئەوە نەبووبێ که ڕەخنەسازەکە بە هەندی هەڵگرتبێ، وەیا ئابێتێکیان خۆش ویستبێ کە مولعیدێکی سەردەم قینی لێبێتی. لەلایەن (چاکی و خراپی)یەوە، عەیارەی خەڵق لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك و لە ڕۆژگارێکەوە بۆ ڕۆژگارێك دەگۆڕێ، بگرە ئێستاکە لە تاقمێکەوە بۆ تاقمێك نرخی چاك و خراپ جودایە، ئەو خەڵقانەی لە سەرتانسەری دنیای خۆماندا پەخەگیری یەکدی بوون لەبەر جوداوازیی کێشانەی (چاك و خراپ) وەها دلێرانە دەست لە جەرگی یەکدی گیر دەکەن شاعیر و نووسەر و هونەرکار و بیریار مەر هێندەی لێ داوا دەکرێ لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ بێ، دووڕوو نەبێ، نۆڵ نەکا، بەکردەوە دروشمەکانی خۆی بەتاڵ نەکاتەوە. کابرای نەخوێندوو گوتی (خاس بکە خراو مەکە) ڕەخنەسازەکەش مەر وەها دەڵێ، بەلام پێمان ناڵێ چاکە چییە و خراپە چییە خۆ ئەگەر ناویشی لێ بنێن کەسی ئەوتۆ گوێیان ناداتێ چونکە مەر کۆمەڵە و تاقمە و بەرژەوەندە و ئایدیۆلۆجیایە عەیارەی تایبەتی خۆی هەیە لەو بازارەدا.

هەر لە هەمان لاپەڕەدا دوازدە دێڕی دیکە لەو جۆرە قسانە دەنووسێ وەکو (شیعر چرایەکە تاریکی .. ڕۆشن ئەکاتەوە - شیعر جوانیی هەموو شتێکمان بۆ دەرئەخات - شیعر لە ئاوازی دڵگیری بلبل .. لە .. لە .. لە دەنگی موزیقە مەعنایەکمان بۆ دەربەچوێنێ - شیعر ژیانە ..). ئەم قسە لووس و لێکانە سەرەڕای ئەوەی چی لێ خەرج ناکرێ، بەسەر هیچ بنکەیەکەوە ناوەستن و خۆیان بە هیچ لایەکدا ساغ ناکەنەوە. هەزار ساڵیش پترە ئەو جۆرە قسانە دەگوترێن بەڵام لەو ماوەیەدا بەخەیاڵی کەسدا نەهات قسەی ئەوتۆیی بۆ پووچاندنەوەی ئەبونەواس و موتەنەبی و ئەنوەری و ئیبنولفارز بێ هەتا ڕەخنەسازەکەی خۆمان هات و بەخێری خۆی چاوی کردینەوە.

لە کۆتاییی لاپەڕە (١٤) و بەشی زۆری لاپەڕە (١٥) بیروڕا و وەسفی (شێللی) دەنووسێتەوە لەبارەی شیعرەوە، ئەوانیش گوتەی بێ سنوور و بێ (هویە)ن هەرگیز دەست نادەن ببنە پێناسەی شیعر و عەیارەی ڕەخنەسازی، وەکو کە دەڵێ (شیعر وێنەیەکی ژیانە لە ڕاستیی ئەزەلییەوە وەرگیراوە - لە شەوانی لێکەوتنڕاندا فوو لە کوورەی دڵ ئەکا - تەرجەمەی نیگای ئاسکێکی سڵ ئەکا - بەخوێنی دڵ و فرمێسکی چاو ئەنووسرێ ...). وەک دیارە ڕەخنەسازەکەش وەکو شێللی یەک ئایدیالیستی مۆدێلی چەند سەدەیەک لەمەوپێرە. ناشزانم لە فەلسەفەوە بۆ ئایدیالیزم چووە یاخود لە جوینەوەی قسەکانی شێللی بەئایدیالیست دەشوبهێ..

دواتر لە کۆتاییی لاپەڕە (٢٧) و بەشی زۆری لاپەڕە (٢٨) قسەی دیکەی ڕەخنەسازەکە تۆمار کراونەتەوە، سەرەتایان ئەمەیە:

«لە پاش ئەمەی کە زانیتان شیعر چییە ڕەنگە هەمووتان بقیژێنن بە سەرما بڵێن: کەوا بوو وەکو تۆ ئەڵێیت کورد شیعری نییە؟». پاش چەند دێڕێک دەڵێ: «خۆزتان شیعری کوردی بخوێننەوە و ئەگەر لە: (وتنێکی وەزندار قافیەدار) زیاترتان دی؛ بڵێن هەیەتی،...». دواتر دەڵێ «کە وتم شیعرمان نییە یەعنی شاعیرمان نییە: مەحوی، سالم، کوردی، نالی، ناری، زیوەر، حەمدی، موختار کێن؟». ڕەخنەساز بەڵێن دەدا لە کوتارێکی دیکەدا یەکە یەکە باسیان بکات و هەڵیان سەنگێنێت، بەڵام نەیکرد.

لە لاپەڕە (٣٠)دا دوای سەرشکێنکردن و بە هیچ دەرچوواندنی شیعر و شاعیری کورد [لە دەمی دەرنەچووە هیچ شاعیرێکی کورد لەو حیسابە دەربهاوێ] ئەمانە دەڵێ:

«توخوا پێم بڵێ کێ هەیە؟ لە نیوەی شەوێکی کوردستاندا، لە زەردەپەڕێکدا، لە

بەرمبەیانێکدا، لە ڕۆژئاوایەکیدا، سەیری کێو و کەژ بکا، لە هاوینێکدا سەیری گوڵشەن بکا، بڕوانێتە تارای سەوز و سووری دەروودەشت، لە پاییزێکدا گوێ لە ورشەی ڕەشەبا و خڕەی گەڵا ڕێزان، لە زستانێکدا .... چاوی بێ بکەوێ شاعیریش نەبێ نابێ بە شاعیر؟ وەرە شیعرێکی دڵداریی شاعیرەکانمان بخوێنەرەوە کە ئەمە بەشی هەرە زۆری فەرمانی شیعریانە ... هتد»

کاکی ڕەخنەساز ئەگەر ماویت، لە خۆت، دەنا لە تارماییت دەپرسم: کام شاعیری کورد هەیە ئەوەی تۆ دەیڵێیت بە شیعر نەیداپێتەوە؟ تۆ خۆت ئەناس دەکەیت یان بەهارییەکەی حاجی قادر و پارچە هەڵبەستەکانی نالیی سەر بەبەهار و شارەزوور و قەرەداغت نەبیستووە؟ چۆن پیرەمێردت لەبیر چوو؟

بەهۆی و چەند پارچە شیعری سەر بە کوردستان کە ئاگر لە دڵی هەستیار بەردەدەن؟ دەسکێ لە گوڵەکەی باغچەکەی سەرا هۆنراوەی سەرەتای سییەکانە، لە گوێچکەت نەزرینگاند؟ بۆنی بە لووتتدا نەچوو؟

ئەی ڕەخنەساز! ئەی خوێنەر! گوێت لەم حیکایەتە بێ!

ساڵی ١٩٥٧ بەدوا لێشاوکەکەی سلێمانیدا تیپی مەولەوی سەری لە کۆیە دا. یەکەم شەوی ئاهەنگ مامۆستا ساڵح دیلان لە نۆرەی خۆیدا پارچە هەڵبەستێکی پیرەمێردی بە ئاواز خوێندەوە خەڵقەکەی بێ سەرشێت بوو... سبەینێ موعاونی شورتەی کۆیێ تکای لێ کردم کە لە شەوی دووەمدا کاک ساڵح هەڵبەستێکی دیکە بخوێنێتەوە ... ئینجا ئەی خوێنەر کە میللەتێک تا ئەم ڕادەیە بە ئاگری شاعیرەکەی هەڵچێ چ پێویست دەمێنێ بەهاناهێردنە بەر عەیارەی فەنی بۆ ئیسپاتکردنی بلیمەتیی شاعیر بە میللەت و هاکیەوە؟ بۆ بەڵگەی نەبوونی شیعرەکەی؟ شێللی کاری وەهای لە ئینگلیز کردووە؟

لەومەتەی بەر لە ١٥٠ ساڵێك شیعری عەرووزی لە کوردستانی عێراق و ئێران پەیدا بووە مەجلیسی شادی و ڕابواردنی شەوانە و بەزم و ئاهەنگی کورەواریی ئەو هەڵبەندانەی بە لە هەجەی باشووری دەئاخێون، بە شیعری شاعیرەکانمان گەرم بووەتەوە، وێڕای بەیت و بەستە و لاوك و حەیران .. تا ئەو ساڵانەش لە کۆیێ، کاتێك بووك دەگەیشتە بەردەرگەی ماڵی زاوا، تاقمێك گەنجی دەنگخۆش لەسەر قەمتەرەی دەرگا غەزەلی (ساقی لە پەردە دەرهات)ی سالمیان بەئاهەنگ دەخوێند و تێکەڵ بەهەلهەلە و قاژ و قووژ و تێکهاویشتنی قەوغا و ڕەمبەی پێی شاییکەران و قیقەی زوڕنا و تەپەی دەهۆڵ دەبوو، کەسیش لەو حەشر و حەلایە هەستی بەکەلێنی (شێللی

و بایرۆن) نەدەکرد. شیعری عەرووزی کوردی تا ئێستاش لەبەر چەژی کوردەواری ناشناترە لە شیعری ڕەهای نوێبابەت بەخۆی و بەتەکانە بەرەوپێشچووەکانی ڕووەو سەقافەتی ئەورووپایەوە: بە قەدەر نزیکبوونەوەی شیعرمان لە فۆرم و شێوازی ئەورووپا دەبێتە بابەتی دەستەی خوێندەوارە هێژاکان و لە جەماوەری ناو کووچە و بازاڕ و دەروەشت دەتارێ.. ڕەخنەسازەکەمان لە سەرەتای لاپەڕە (٣١)دا دەڵێ: «شیعرێکی بلداریی شاعیرەکانمان بخوێنەرەوە. ئەگەر شێوەی ژنێکت هاتە یادەوە پێم بڵێ چە ژنێکە، چینی؟ هندی؟ ... هەرچی بێ ژنێکی کورد نییە، بەڵێ ناوەقیان نییە ژنی کوردیان نەدیوە، نەیاندیوە (یەمنێ) مەڕ بدۆشێ، (شیرین) مەشکە بژەنێ (گوڵناز) بەشەدەی لاریەوە گۆزە لەسەر شانی لە کانی بێنێتەوە ...». لە ئاست (مەڕ بدۆشێ)دا، زۆر بەسەیری، ڕاستییەکی بێگومان هەیە لە شیعری تەمەنی ٢٠ – ٢٢ ساڵەی باپیرم باسی کچێك دەکات مەڕی دۆشیوە، دواتریش شەیدای بووە:

که بیری هاتە ناو مێگەل سەراپا قرمزی پۆشی
مەلا ئیدراکی چوو شێخیش تەریق زاهید نەما هۆشی

ئەگەر ناوی تەشیڕێسی هێنابایە دەمگوت (شیرن تەشیێ دەڕێسی)یەکەی وەفایی بخوێنەوە. نالی نەك هەر وەسفی ئافرەت، بەڵکو ئافرەتێکی خاڵ دەکا و خێلییەکەی بۆ بەنارایشت دادەنێ:

پێم دەڵێن مەحبووبە خاڵ و قیچە مەیلی شەڕ دەکا
خاڵ و قیچە یا تەرازووی نازی ئەختێ سەر دەکا

حاجی قادر لە (شەمسییەی شاهەنشەهی ئەرز)دا کە وەسفی گوڵێ دەکا، دیمەنی کچێکی نازداری لاجان ئەخشەکێش دەکا.. شیعرەکانی گۆران، بەشێکیان وەکو کامێرا وێنەی چەشمەندازی گرتووە لە ناویدا ئافرەت: وەسفی شانۆ و ژنە دانەرەکە و تیپی مۆسیقاکەی هەر بەو کراوە باوەڕ دەکەم لە قەسیدە مەشوورەکەی (ابن الرومی) تێ پەڕاندووە کە وەسفی جارییەیەکی گۆرانیبێژی تێدا دەکات. مەحوی‌ش لە قەسیدەی شەوە مەشوورەکەیدا، هەر چەند دەڵێ کاری خەیاڵە پەیکەری ئافرەتی داتاشیوە: بەئیزنی خوێنەر ئەم پارچەیەی لێ دەنووسم:

وەك تازە هەڵووژێکی لەناو دوو لقەدا بێ
وا ڕێك گوشرا بێ کە لە دوولاوە قوپا بێ

هەندێکی قوپا بێت و ئەوی دی قڵەشا بێ
قڵشانی ئەوا بێ کە بە چاو فەرقی کرا بێ
هەروەک کە لەسێوێکی درابێ لەبی ئەشتەر

وەک بۆ سیحر و ئەفسوونت کەڵەشاعیر!! توخوا کە لەو قەسیدەیەدا لە وەسفی بەیەکدی گشتنی لەگەڵ یارەکەی و ئەندازەی پێوە گەشانەوەی، دەخوێنیتەوە:

دەمزانە چ شیرینە کە روح بێتەوە بەر بەر!!

هەست ناکەیت فەرەحنابییەک دەتگرێتەوە؟ میسباحولدیوان لەو شیعرەدا چی نەهێشتووەتەوە لە لەزەتی جەژنی ئافرەت نەیگوتبێ، پێشتریش نالی لە وەسفی مەستوورە وێنەکێشی و یەکەرتراشیی ئافرەتی کردبوو و سەرمەشقی دادا بوو بۆ میسباحولدیوان. ئەم دوو وەسفە بگرن بە قەسیدە مەشوورەکەی (نابغة الذبیانی) کە پێی دەگوترێ (المتجردة) و بزانن ئەمانە لە کوێ و ئەو لە کوێ. بەهەمەحاڵ هەستکردن بە تامی مێیینە ئیمتیازێک نییە بەر ئەورووپا کەوتبێ، کوردیش تێیدا خاوەن پشکە. لەگەڵ ئەمەشدا نابێ لەبیر بکەین کە هەر واقیعە داخوازی و بڕیاری خۆی هەیە لە باسی هەستداری وەک وەسفی لەشی ئافرەت. خۆ ئەگەر بسەلمێنین شاعیری کورد ئافرەتی نەدیتووە تا بتوانێ وەسفی بکات عوزری خۆی لەگەڵ خۆیدا دەبێت و بۆشی دەمێنێتەوە لە جیاتی ئەوەی قەرزدار بێ ـ هیچ کەسێک لە هیچ مەیدانێکدا بەولای توانایەوەی لێ داوا ناکرێ.

رەخنەسازەکەمان لە لاپەرە (٦) وشەیەکی لە دەم دەرهات بۆ عەیبدارکردنی شاعیری کورد کە گوتی: «شاعیرەکانمان هەتا ئێستا بڕوا ناکەم لە واتەی سیاسی و ستایش زیاتریان بیستبێ ...». مەبەستم لەو وشەیە (واتەی سیاسی)یە کە دیارە بەلای رەخنەسازەکەوە نرخێکی ئەوتۆی نییە.

هەرچەند ئاشکرایە لە بابەتی ناو دیوانەکان کە سیاسەت و ستایش ناوەرۆکی شیعری کوردی بەر لە ١٩٣٠ پڕ ناکەنەوە، هەر خۆیشی دواتر گوتی دڵداری بەشی هەرە زۆری شیعری شاعیرەکانی کورد دەگرێتەوە، بەلام لێرەدا مەبەستم نییە ئەو هەڵەیەی ڕاست بکەمەوە بەڵکو دەمەوێ بڵێم رەخنەسازەکە لەو بێ بایەخکردنی بیستنی شتی (سیاسی) ئەوەندە لە واقیعی کورد و میللەتی وەک ئەویش پشتڕێ بووە کە نیتر هەرچی شێللی و بایرۆن و ڤیکتۆر هیگۆی دنیا هەیە بخرێنە دەستە تەرازووییەوە

ناتوانن قورسی بکەن. لە ساڵانی ۹۳۰، کە تازە بەتازە کارەساتی شەشی ئەیلوول ڕووی دابوو، پێش ئەویش و دوای ئەویش شۆڕشەکانی شێخ مەحموود تەقی بوونەوە، ئەگەر شاعیری کورد و شیعری کوردی گوێگر و گوێبیستی بابەتی سیاسی نەبووبن و شیعریان بەرەو سیاسەت و بیری قەومایەتی نەچووبێ چ حورمەتێکیان پێوە دەمێنێ، میللەتیش هێندە ئەزۆک بێ نەتوانێ بەزمانی شاعیرەکانییەوە دەم لە ئێش و ئازاری باری سیاسیی خۆیەوە بدا هەقی ئەوەی نابێ ڕەخنەسازەکە پەرۆشی لایەنی بێ کەڵکیی شیعری بۆ بخوا چونکە میللەت بەو ئەزۆکییەی لە مافە بنەڕەتییەکەی ژیان و بەخۆنازینی ترازاوە .. ئێمە کە نووسینەکانی ڕۆژنامەی دەوری شێخ مەحموود لە سەرەتاکانی بیستەکان دەخوێنینەوە و سروودەکانی ئەو سەردەمانە بەبیر خۆماندا دەهێنینەوە و کوردستان و چارەنووسی کوردەوارییان تێدا دەبینین، دەزانین خەڵقی ئەو دەمە بەنووسەر و شاعیر و جەماهیرەوە پتر ڕۆڵەی سەردەمی خۆیان بوون لەو ڕەخنەسازەی کە ۱۰ – ۱۲ ساڵ بەدوا تەجرەبەی ئەواندا تەزووی (ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم)ی پێدا نایەت. سەیریش لەوەدا نییە چونکە بە نموونەکانی نووسینەدا دیارە گەنجێکی ڕۆمانتیکیی خەیاڵاویی دوور لە واقیعی کوردە. تەنانەت کە دێت و تەرجیحی بەستەبێژ و بەیتبێژن دەدا بەسەر شاعیری عەرووزی کورددا هەڵەیەک دەکا زۆر ناوخواز بێ: من لە نووسینی دیکەمدا گوتوومە ئەوانەی عەیب لە شاعیرەکانی سەدەی بیستەم دەگرن و بەرهەمەکانیان بێ کەڵک دەکەن سەرەوبن لە دنیا ڕادەمێنن چونکە گوناهی ئەو شاعیرانە بریتی بوو لەوەی کە فێری سەقافەتی سەردەمی خۆیان بوون و لە نەخوێندەواری ڕزگار بوون و گەیشتنە پایەی مەلایەتی و شاعیری و میرزایی، ئینجا کەوتنە بەر تیر و شیری توانجی خوێندەواری شلکی ئەم سەردەمە وەک مێرووی باڵی لێ بڕسکێ بەر غەزەبی خوا دەکەوێ، ئەمما ئەگەر بەنەخوێندەواری مابانایەوە بەر ئەو ڕەحمەتە گشتییە دەکەوتن کە بۆ گیانی مردووان بەرێ دەکرێ .. ئەوساش ڕووبەڕووی مێژووی ئەدەبمان سپی و هاوێن و لووس، وەکو دەشتی کاکی بە کاکی، دەمایەوە هەر پێی دەویست شاسواری وەکو ئەم ڕەخنەسازە ئەڵەمی سەقافەتی نوێی لەسەر بگێڕێ ..

ماوەتەوە لە مەیدانی ڕەخنەسازیدا شتێک بڵێم جارێ نەگوتراوە:

ڕەخنەی ئەدەبی ئەگەر لایەنی هونەریی بابەتی ڕەخنە لێگەڕاو نەگرێتەوە لە مەفهوومی (ڕەخنەی ئەدەبی) دەشۆرێ و دەبێتە وەعز و ئامۆژگاری و بەلای ئەخلاقدا

دەچێتەوە من کە گوتم: هۆ کابرای بەقاڵ سێوەکانت مەدە بەر سەرماوسۆڵ دەنا ڤیتامینیان دەمرێ [ئەگەر ڕاست بێ دەمرێ] نەبوومە (ڕەخنەگری هونەری) بەڵکو بوومە دکتۆر. بەڵام کە هاتم عەیبم لە ڕیزکردن و تەرتیبدان و جۆری دیارخستنی میوەکانی گرت بەرەو لایەنی (جەمالی و هونەری) دەچمەوە ئەدەب، هونەر، یاری، تەمسیل [ئەویش هونەرە]، دامە و شەترەنج، باخەوانی، نەخش و نیگار ... و چەندان لایەنی دیکەی ژیانی کۆمەڵایەتی و یاری گوزەران هەمن دەچنە ژێر سەرناوی (مەهارەت) لە پاشدان تایبەتییەکانیان لێکیان جودا دەکەنەوە حیکایەتبێژی هێژا هونەرکار و ماهیرە بەڵام جودایە لە گۆرانیبێژ، هەروەهاش هەموو مەهارەتێکی دیکە. ئینجا ئەگەر ڕەخنەگر فەرامۆشی کرد کە لە شیعر و هونەردا لایەنی مەهارەت هەیە و خۆی بەلایەنی فەلسەفەی بابەتەکەوە خەریک کرد هەقیەتی لەسەر کەوڵی شێخایەتی دانیشێ. بە نموونە (بردیّة)ی بوسەیری بەداڕشتنە ڕەنگینەکەی هونەر و مەهارەتە، بەناوەرۆکەکەی سۆفیەتییە، ئینجا ئەگەر لە ڕوخسار و لە ناوەرۆکیمان کۆڵییەوە یان تەنها لە ڕوخساریمان کۆڵییەوە دەبینە ڕەخنەگری ئەدەبی، بەمەرجێک قسەکانمان نرخی ئەو وەسفەی پێوە بێ چونکە هەموو عەیبگرتن وەیا ترخاندنێک ناچێتە پلەی ڕەخنەی ئەدەبییەوە، ئەمما ئەگەر بەناوەرۆکییەوە خەریک بووین و شێوازمان بەلاوە نا ئەوسا ڕەنگە (أصولی، نحوی، کلامی ...) بین. ئەو ئایەتانەی سوورەتی (الشعراء) کە باسی شاعیران دەکەن تەنها بەلای ئاکاردا چوون و خۆیان لە هونەری شیعر نەگەیاندووە، باسی شێواز ناکەن، مۆسیقای ناوەکی هەڵناسەنگێنن، ڕەخنە لە داڕشتن ناگرن.. بەڵکو لە کولانەی خواناسین و ڕوانگەی بەهەشت و جەهەننەم (اعملوا الصالحات)ەوە شاعیران سەرشکێن دەکەن. ئەگەر لە جیاتی (ویقولون مالا یفعلون) بیانفەرمووبایە واتا بەقوربانی ئارایشت دەکەن وەیا لە پێناوی کێش و سەروادا کەسرە دەکەن بەبێ وەیا لە تەشبیهی حوشتر بە حوشترمرغ ناشارەزان ... دەشیا خەیاڵ لە ڕەخنەی ئەدەبی بکەینەوە

ئەو ئایەتانە هەر دەچنەوە ڕیزی (ویمنعون الماعون - ویل للمطففین) با ناوی شاعیریشان هێنابێ. بێینەوە سەر حیسابی کابرای ڕەخنەساز، ڕاستە خەریکی ڕەخنەیە بەڵام قسەکانی بەهیچەوە بەند نابن .. شتێك نالێ پێڕەوی لێ بکرێ. باشترینی گوتەکانی پەر لە هەزار ساڵ گوتراون، تەنانەت ئاگای لە خۆی دەبڕێ ڕەخنە لە کێ دەگرێ: لە لاپەڕە ۳۳دا دەڵێ: « ... بەڵام ئەمانەی ئێمە [شاعیرانی ئێمە]

ئاوێنکی لێڵن ... لە عەسری (٢٠)هەمی شارستانییەتیدا لاسایی شاعیرانی حەوت و هەشت عەسر لەمەوبەر دەکەنەوە ...» ئەمە دەڵێت کەچی گاڵتە بەشیعری سالم و نالی دەکات کە هی سەدەیەک لە پێشترن و داهێنەری شیعری عەرووزین لە هەموو کوردستانی لەهجەی جنووبی.

راستییەکەی رەخنەی وەک ئەوانەی رەخنەسازەکە دەیانگرێ، نرخ بەوەدا پەیدا دەکەن کە دواتر لەسەریان دەنووسرێ: کابرایەک کە دەستی دابە شمشێر و چووە راوی پڵنگ و کە گوێی لە دەنگی پڵنگیش بوو هەڵات هی ئەوە نییە بەنووسین خەریکی بێت چونکە راوکەر نییە و رێویشی نەگرتووە.

تەنها لەوەدا هەقە باسی بکرێ کە بگوترێ پڵنگ ئەو دەعبایە خوێرووە نییە تۆ بچیتە راوی. د. کامل خۆی ماندوو کردووە بە بەراوردکردن و بەبەڵگە هەندێ لە رەخنەکانی بەرپەرچ بداتەوە وا منیش بەدوا ئەودا خۆم ماندوو کرد، تەنانەت لە لاپەرە ٣٩دا دوو بەیتی ساڵەکانی ١٩٢٠ لە شیعری (ئەحمەد موختار جاف) دەهێنێتەوە بەنموونە بۆ هەبوونی شیعری کوردی کە لایدابێ لە بابەتی دڵداریی لاساییکەرەوە:

«شاعیرانی کورد بەسە بەس باسی زولف و چاو بکەن»

بەلام سەرەرای ئەوە کە رەخنەسازەکە خۆی لە لاپەرەی پێشووتردا گوتی (لەگەڵ ئەسیری نیم لەوەدا کە دەڵێ «ترکی اشعاری عشق بازی کە گەر زەوقت هەیە») پێشتریش لە زەمەندا عەیبی لە فکری سیاسیی شاعیرەکان گرتبوو. ئێمە ئەگەر بەدوا شیعری ئەوتۆییدا بگەرێین حاجی قادر هەیە بەر لە ئەحمەد موختار بە ٣٠ ساڵ وەیا زیاتر گوتبووی:

حەیفە بۆ پیاوی ساحیبی تەمیز
هێندە باسی مەکانی پیس و میز

سالانی بیستیش هەنگامەی شیعری پڕ خرۆشی گیانی کوردایەتی بوو. پیرەمێرد گوتبووی:

کچانمان لە ژێر بەیداغی رەشدا
چاو هەڵئەهێنن بە خوێنی گەشدا
کوڕانمان هەموو بەورد و درشت
لە رێی ئازادی خۆ ئەدەن بەکوشت

ئازادی نابێ سەربەستی نابێ
ئازادی دەبێ هەر خوێن بەها بێ

مەلا حەسەن بورکانی «ئەی کوردی ستەمدیدەی» تەقاندبوومەوە. زیوەر و بێکەس ئاگرۆچکەکانیان خستبووە ناو هەڵبەستەوە لە کوێێ مەدرەسەی حاجی قادر لەلایەن باوکمەوە بەبیری نوێترەوە ژیا بوومەوە. لەو سالانەدا شیعری سەر بەکوردایەتی و ڕوو لە کۆمەلایەتی و دژی ئەفسانە و لایەنگیری زانست و حورمەت کار بۆ ئافرەت و ئەو تەرزە بابەتانە تەنگی بە شیعری دلداری هەڵچنیبوو. حوکمداریەتیی شێخ مەحموود و شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و بزووتنەوەی سمکۆ ویژدانی شاعیرانی بەگیانێکی تێر و تەژیی نوێخوازی ڕووەو سەدەی بیستەم ژاخاو دابوو. هەر لەو سالانەدا دەست کرا بە لە چاپدانی دیوانی شاعیرەکانی ئەوساو سەدەی پێشووتر.

باری شیعری ئەو دەمەی کورد گەلێك پێش پلەی گۆڕانی مادی کورد کەوتبووەوە کە لە ڕێکاری ئەفلاسدا بوو. ئەمانە هەموو بەلای ڕەخنەسازەکەوە بایەی پوولێکن. ڕەنگە بەبریش لێ نەکردبێتەوە چونکە بەکێشانەی شیعری شێللی شاعیرەکانمان هەڵدەکێشێ. ئەو ئەگەر هیچی زانیبایە لە بڕیاری باری مادی و دەوروبەر و پلەی شارستانەتی دەبوو کرنوو بیا بۆ نالی کە ٨٠ ساڵێك بەر لە گوتارەکەی ڕەخنەگرانەی گوتبووی:

«کەس بە ئەشعارم نەڵێ خۆ کوردییە خۆ کردییە»

بەداخەوە هەمان خۆ لەبیرکردن بۆ ماوەیەك لە پاش شەڕی دووەمدا سەری لە بەشێکی ئەدیبی کورد شێواند. ئێستاش لە شێرازەی گەلێك گوتار و هۆنراوەی ئەم ڕۆژانەماندا هەست بە جۆرە لێڵییەکی بێنین دەکرێ. بەلام بە تێکڕایی سەقافەتمان ماوەی بەرچاوی بڕیوە، دەست و قەڵەمی ڕەنگین و زمانی تەڕ و پاراو ئابڕووی کوردایەتی دەپارێزن و بۆی دەجەنگێن و تا ڕادەیەکی دڵ خۆش بکا (هەست بەخۆکردن و ڕێگا دۆزینەوە) پێیانەوە دیارە.

لە گوتارەکەی (د. وریا عومەر ئەمین) یەك ڕوونکردنەوە و یەك تێبینی بە پێویست دەزانم، ڕوونکردنەوەکە ئەوەیە کە ڕاناوی لکاو لە زاری کرمانجیی خواروودا لە ڕووی هێزەوە دوو بەشن: بەشی بەهێزیان ئەوەیە لە ڕابردووی تێپەڕدا بەکار دێن وەك:

گوتم گوتمان

گوتت   گوتتان

گوتی   گوتیان

بەشی بێ هێزیان ئەوەیە کە لە ڕابردووی تێنەپەڕدا دەردەکەوێ و بەدوا مۆرفیمی تێپەڕ و تێنەپەڕدا دێت:

نووستم   نووستین

نووستیت   نووستن   ڕابردووی تێنەپەڕ

نووست   نووستن

دەنووم   دەخۆم

دەنووین   دەخۆین

دەنوویت   دەخۆیت

دەنوون   دەخۆن

دەنوێت   دەخوات

دەنوون   دەخۆن

وەك دیارە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك لە هەموو باراندا هەر (م)ە.

دەرنەکەوتنی ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك لە ڕابردووی تێنەپەڕدا دواتر بەتێبینی بۆی دەگەڕێینەوە.

بەهێزی و بێ هێزیی ڕاناوەکان جگە لەوەی کە تێپەڕ و تێنەپەڕبوونی کارەکانیان لە ڕابردوودا هێمای بۆ دەکات دیاردەیەکی ڕێزمانیشی لێ دەکەوێتەوە ئەویش بریتییە لەوەی کاتێك کە ڕاناوی لکاو و نەلکاوی بەهێز و بێ هێز لە ڕابردووی تێپەڕدا وێکڕا هاتن هەمیشە بێ هێزەکە دەبێتە بەرکار هەرچەند شوێنی کاراشی گرتبێتەوە دەزانین بەپێی دەستووری گشتی لە ڕێزماندا کارا (فاعل) بەدوا بەرکار (مفعول)دا دێت وەك:

کوڵم چنی.

تۆم دیت.

ئێمەیان گرت.

بەڵام ڕاناوی بێ هێز لە هەموو باراندا دەبێتە بەرکار:

دیتمن        من تۆومم دیت

دیتنم        من تۆومم دیت

دیتیانیت    تۆیان دیت

دیتیتیان     تۆیان دیت

لە هەردوو فۆرمدا راناوەکانی (ن، یت) بەرکارە.

راناوی کەسی یەکەمی تاک چونکە هەر شێوەی (م)ی هەیە، بەلای باوەڕمەوە پێویستە لە جێگەی کارادا بەکارا بروات:

دیتمت

دیتتم

دیارە لە ڕستەی یەکەمدا (م) بەرکارە، بەلام لە ڕستەی دووەمدا گومان هەیە لەوەدا ئایا کام راناو کارایە و کامیان بەرکارە.

هەرچەند هەق وایە بگوترێ (دیتمیت یان دیتیتم) بەلام کە گوترا (دیتتم) پێویستە راناوی (ت) بەرکار بێ.

دەمەتەقە لەسەر (دیتمانیان، دیتتانمان، دیتیانمان ..) و لەسەر (دەتانبینین، دەمانبینن ...) لێرەدا جێی نابێتەوە.

تێبینییەکە ئەمەیە:

راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک لە (مضارع)دا دەرناکەوێ. کۆتایی کاری کەسی سێیەمی تاک سێ جۆری هەیە:

دەکات

دەچێت

دەژیت

لێرەدا چاوپۆشی لە شێوەی (دەکا، دەچێتن ..) دەکەین.

لە نووسینی دیکەمدا لەسەر ئەم باسەم نووسیوە و دوو بەڵگەم بۆ نیشاندانی رایەکەم دەربڕیوە:

بەڵگەی یەکەم: ئەگەر ئەو کۆتاییانە (ا، ات، اتن – ێ، ێت، ێتن – ی، یت، یتن)

ڕاناوی لکاو باناپە نەبوو ئەوانیش وەکو ڕاناوە لکاوەکانی دیکە لە ڕستەدا ببنە بەرکار.

ئێمە دەڵێین:

دیتمیت     تۆم دیت

دیتمن     ئێوە، ئەوانم دیت

دیتیانین   ئەوان ئێمەیان دیت.. هتد

بەڵام نەگوتراوە و ناگوترێ: دیتمیێت، دیتمینن، دیتما، دیتمات ..

بەکەس ناکرێ لە سنووری ڕێزگرتن لە ڕێزماندا بڵێ ئەو کۆتاییانە (یت، یتن، ا، اتن..) ڕاناون و ناشبنە بەرکار.

تاکە بەهانەیەکی شکی ببەم بۆ ئەوەی بەڕاناو دابندرێن هەر ئەوەیە کە لە فارسیدا کۆتایی کاری کەسی سێیەمی تاک، تێپەڕ و تێنەپەڕ، لە موزاریعدا کە (د، اد)ە بەلای هەندێ لە زمانناسەکانیانەوە ڕاناون، بەڵام لە فارسیشدا کەس جەوابی نییە کە لێی بپرسێ بۆچی نابنە بەرکار؟ خۆ ئەگەر دەرچوو لە فارسیدا دەبنەوە بەرکار دیارە هەقیانە بەڕاناویان دابنێن. من بەگومانەوە قسە دەکەم لەبەرئەوەی بەڵەدی فارسی ئەم بابەیی بڕیاردان لە باسی وەهادا. وەک بزانم ئەوەی لە فارسیدا دەبێتە بەرکار بۆ کەسی سێیەمی تاک (ش)ە وەک (گفتمش، می گویمش) ـ لە پەهلەویش هەر ئەوە ڕاناو بووە لە کوردیدا ئەم کۆتاییانە زیادییەکی گەردانن وەک ناوناوە لێرە و لەوێ زیادەی وەها دێتە قسانەوە بە نموونە لە سلێمانی دەڵێن: بۆم بێنەرەوە [لە جیاتی بێنەوە]، هاتمەوەوانێ [لە جیاتی هاتمەوە]. لە زۆر جێگەدا دەگوترێ ئێستەکێنێ لە جیاتی [ئێستا]، ڕاوەستەکێ، لە جیاتی [ڕاوەستە]. ناوچە هەیە دەڵێ: گرتبام هەیشە دەڵێ گرتباماپە بمگرتبایە، بمگرتایە بمگرتبا ـ ئەوەندە هەیە ئەو (ت) و (تن)ە هەمەکیترە لەوان.

هەرچی (ا، ێ، ی) جێی بابەخ نین بۆ لابەنی ڕاناوبوون چونکە ناشێ ڕاناوێک سێ جاران بگۆڕێ.

بەڵگەی دووەم: وا دەزانم ئەمەیان بەهێزتریشە.

بەپێی ڕاناوبوونی ئەو کۆتاییانە دەبێ لە کاری (چوویت، چووبێتن)دا ئەم (یت،

یتن) وەیا (ت، تن)ە ڕاناو بێ چونکە (ـەبێت) هەر خۆیەتی هاتووەتە دوایی (چوو)ەوە تەنها نیشانەی (ە)ی لێ قرتاوە. ئینجا ئەگەر ئەمە وەها بێ چ بڵێین لە ئاست (چووبێتین، چووبێتیت، چووبێتم) چونکە لەم ڕێژەیەدا دوو ڕاناو بەدوا یەکدیدا دێن هەردوویان کارا (فاعل) و یەکیان بۆ کەسی سێیەمی تاک ئەوی دیکەشیان بۆ کەسی یەکەم وەیا دووەم؟ قسەی ئەوتۆیی هی کردن نییە.

(چووبێت) کاری تێنەپەڕە کە بڵێین (کردبێتی) ئەوسا دوو ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک بەدوا یەکدیدا دێن هەردووشیان کارا، یەکیان بەهێز و ئەوی دیکەشیان بێ هێز.

وا دەزانم بەر لەوەی ئەم هەڵەیەش وەکو وشەکانی (فرمان، ڕاناو) چنگ لە هەناوی ڕێزمانی کوردی گیر بکات پێویستە لەسەر مامۆستا دڵسۆزەکانی زمانی کوردی نەفەسی بەبڕن. وشەی (فرمان) بەکارهێنانێکی بازاڕیی وشەی فەرمانە بەواتای (أمر)ی عەرەبی. ئینجا نەخوێندوو گوتی (فرمانی خۆم بەجێ هێنا) مەبەستیشی (ئەو فەرمانەی بەسەر مەوەیە بەجێم هێنا)یە تاقمی خوێندەواریش گوتی دیارە (فرمان) بەواتای (عمل، فعل) دێت و کردی بە (فرمان)ی ڕێزمانی لە جێگەی (فعل)ی عەرەبی ... هەرچی وشەی (ڕاناو)ە بە دژایەتیی زمان و ڕێزمانی کوردی پێشگری (ڕا)ی لە فیعلەوە هێناوە بۆ سەر وشەی (ناو) کە لە بەرەی (ناو – noun)ە. ئەم ڕەفتارە وەک ئەوەیە بگوترێ (هەڵمەترەق – وەرگێڕە – دابایەنجان). ئەگەر بڵێین لە (ئەڕا)وە کورت کراوەتەوە دەبوو بگوترێ (ئەڕای ناو) وەک کە گوترا (بۆناو).

واشدەزانم وشەی (کار) بۆ (فعل) لە هەموو زاراوەکانی دیکە باشترە هەرچەند ئەویش verb ناگرێتەوە بەڵام چونکە لە هەمووان پتر بەلای (تجرید)دا بووەتەوە پەسەندترە لە (کردن، کردار). وشەی (کارا) بۆ فاعیل و (بەرکار)یش بۆ مفعول وشەی جوانن. هەر لەو بوارەیشەوە وشەی (کارگێڕ) لە (بەڕێوەبەر، سەرپەرشتیکەر خۆشترە. زێدە واتای تجرید لە وشەی کاردا بەوە ڕوون دەبێتەوە کە دەگوترێ (کاری تێ کرد) نەک کردار یان کردن.

لە ئاست لێکۆڵینەوەکانی لیژنەی زمانی کوردی تەنها دوو تێبینی دەردەبڕم:

یەکیان ئەوەیە لە کوردیدا سێ ڕێژە پەیدا نییە بۆ زەمانی ڕانەبردوو. لە زاری کوردی ناوەندی (خواروو، باشوور)دا تەنها یەک ڕێژە هەیە ئەویش بۆ ئێستا و دواتر وەک (دەڕۆم، دەخۆم ..). لە زاری کرمانجیی سەروودا دوو ڕێژە هەیە (دچم، دێچم).

لیژنە زۆر بە ڕووناکی بۆ سێ زاراوەی (حاضر، مضارع، مستقبل) نەچووە چونکە (مضارع) دەقلی بەسەر زەمانەوە نییە بەڵکو بە واتای (مشابه، مماثل)ە لەو ڕووە کە (یضارع الاسم فی قبول الحرکات). لە ڕووی زەمانەوە یا (حاضر) هەیە یا (مستقبل) ئەویش لە عەرەبیدا بە (سیفعل، سوف یفعل) دەردەبڕدرێ و ڕێژەی تایبەتیی بۆ دانەندراوە.

تێبینییەکەی دووەم ئەوەیە کە گۆڕانی دەنگی (نە) بە (م) لەو شوێنانەدا کە لیژنە نموونەی بۆ هێناونەتەوە ناچێتە ڕیزی ئەو گۆڕانەی کە باسەکە لێی دەدوێ: گۆڕانی دەنگی (ن)ی وەستاو بە دەنگی (م) لە بەرابەی دەنگی (ب)دا بە فەرمانی دەنگسازی (فۆنەتیك) دەبێ و ناچارییە. ئەگەر هاتبایە جارێك گۆڕابایە و جارێکیشیان نەگۆڕابایە دەشیا نموونەی لێ بهێندرێ. لە وشەی (نهێنگیر)دا کە بەشێکی کوردەواری بەمەڵە دەیکاتە (نێمگیر) دەنگی (ن) بە (م) گۆڕاوە بەڵام کە دەگوترێ (شەمبە، بەرامبەر، چەمبوڵە سەمبەر، تەمبەڵ ...) لە جیاتی (شەنبە، بەرانبەر، چەنبوڵە، سەنبەر، تەنبەڵ ...) پێی ناگوترێ گۆڕان چونکە زۆربەی وشەکان تا ئێستاش هەر بە (ن) دەنووسرێن. ئەوەی لە نووسیندا دەیانکاتە (م) هەڵە دەکات. لە عەرەبی هەمان دەستوور هەیە بەڵام لە نووسیندا هەڵە ناکرێ .. گۆڕانی (ن) لەو شوێنەدا، لە زمانی کوردی، وەك گۆڕانی دەنگی (ل، ت)ە کە لامەکە بەوەستاوی دەکەوێتە بەرابەی (ت)ەکەوە:

شەڵتە، قەڵتارە، پاڵتۆ، ئاڵتوون .. لە گوتندا دەبێتە: شەڵطە، قەڵطارە، پاڵطۆ، ئاڵطوون .. دەنگی (ك، گ)یش لە بەرابەی (ی) وەیا (وی) گلۆر دەکرێن: لە سلێمانی کە (د) بەدوای (ن)ی وەستاودا هات دەکرێتە (گ). ئەم تەرزە گۆڕانە جودایە لە گۆڕانی (کشهل، قشهل – سەقەت، سەکەت. کەوت، کەفت ...). بۆ دۆزینەوەی باری ڕاستی لە گۆڕانی دەنگەکانی وشەی کوردی پێویستە ئاوڕ لە کتێبەکانی زەردەشتی و نووسینەکانی پەهلەوی و سانسکریتی و ئەو جۆرە سەرچاوانە بدرێتەوە. بە نموونە (سوور، سۆر)ی کوردی و (سرخ)ی فارسی لە ئاڤێستادا (سوخره) بووە وشەی (پەز)ی کوردی لە ئاڤێستادا (پەسوور، پەشوو) بووە بەلای منەوە وشەی (کەڵە) لە (کەڵەشێر، کەڵەباب)دا هەمان (کەهرکە)ی ئاڤێستایە بە واتای (تەیر)، بەو پێیە ڕەنگە (کەهرکە شێر، کەهرکە باب) بووبێ. زۆر دەنگی (ر)ی ئاڤێستادا دواتر گۆڕاوە بە (ل) وەك دەشزانین دەنگی (ل) لە ئاڤێستادا نایەتە بەرچاو.

لە لاپەڕە (٨٣ )ی (فرهنگ ایران باستان) لە نووسینی پوورداود هاتووە: وشەی taro - mati بەواتای (خیرە سری، ناسازگاری) کە لە دوو وشە پێك هاتووە، بە باوەڕی من کەرتی یەکەمیان (taro) هەر ئەو (تڕۆ)یەیە کە ئێستا لە کوردیدا بەکار دێت. لێرەدا هەر ئەوەندە ماوەیە هەیە کە هێما بۆ ئەم لایەنە بکەم، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی سەرلەبەر جێگە و کات و باری لەبارتری دەوێ.

کاروان، ژمارە ٢٠، ١٩٨٤

# ڕۆشنبیری پێویستی بەکوردەغیرەتی نییە

بەردەوامبوون لەسەر ڕەوشتی چاک پێبلکەی بەرەژووڕچوونە، بگرە لە بنەڕەتدا ئەم خووەی نۆگرگرتن بەداوودەستوور بەلای چاکە و بەرژەوەندیی مرۆڤدا دەچێتەوە هەرچەند هەموو داوودەستوور چاکیش نین. بەبەرژەوەندەکە لەوەدایە کە گەلێک لە شیرازە پیرۆزەکانی کۆمەڵایەتیمان قەرزداری ئەو خووەیە، بەنموونە: نۆگرگرتن بەخاک و تێکڕای پێکهێنەرەکانی سروشتی و مرۆیی لەو دەوروبەری تێیدا دەژین بنەمای هەستی نیشتمانپەروەرییە. لە باری پێچەوانەدا کە هات مرۆ لە دەوروبەری منداڵیی خۆی دوور کەوتەوە و ماوەیەکی درێژ لێی دابڕا هەستی بزە و سۆزی بۆی دەبووژێتەوە. بەکورتی، گیانی ئاشنا دۆستی و دەماری کۆنەویستی (نەک کۆنەپەرستی) لە سەرجەمدا خزمەتگوزارن نەک بەدکار.

جاران، بەر لە سەدان ساڵ و هەتا سەردەمێک کە بەبیری زۆر کەس لە زیندوواندا دێتەوە، چەنگاڵ گیرکردن لە داوودەستوور و نەریت و بیروباوەڕ تا ڕادەی دەروێشایەتی هاندەری بەردەوامبوون و پەکخەری نوێکردنەوە بوو بەئاسایی و بێ هەناسەسواربوونی کەس، چەرخی بەرەوپێشبوون و نوێخوازی تێدا تەمبەڵ دەکات هەر بەو پێیەش فرچککرتن بەنەگۆڕاوی و یەکتەوایی شەقڵی خۆی لە ڕەفتار و ئاکار دەدات. ٤٥٠ ساڵ تێپەڕی بوو بەسەر دۆزینەوەی گەڕانی زەوی بەدەوری ڕۆژدا هێشتان تەقەی ئوستورلابی کۆن لە سەری فەلەکناسەکانمان دەهات، جا ئەو کۆنە فەلەکناسانەش گەلێک بەرەوپێشبوون لە چاو زۆربەی هەرە هەرە زۆری میللەت کە پتر حەزی دەکرد زەوی تەخت بێت و شەیتان و جنۆکە ڕۆژ و مانگ تاریک بکەن. پارەداری زەمانی عوسمانلی دوای شەڕی یەکەم تێیاندا بوو پارەی کۆنی بەنوێ نەگۆڕییەوە هەتا ئیفلاسی کرد... بەهێنێکی درێژ سواربوونی گەڕۆک و بەستنی ڕادیۆ بەحەرام لە قەڵەم درا... ئەگەر ئەو زانین و دروستکردنانە لە هەناوی خۆمان ڕسکابانایە هەڵبەت پێشیان بەربەرەکانی لەگەڵدا نەدەکرا.

نوێخوازەکانمان بەر لەوەی قووڵیش ببنەوە لە زانست و سەقافەتی سەردەم، ئەورووپی، پشت لە کۆنینە ڕاوەستان و چاکیشیان کرد هەرچەند لە هەندێ ڕووەوە پەلە

و لە هەندێ بۆچووندا هەڵەیان کرد بەڵام وا نیە دەچێ پەلە و هەڵە باجێکە، نوێبوونەوە لە مرۆی دەستێنێ.

دژوەستان لە ئاست گیانی داوەستاوی کۆنەخوازی کارێکی ڕەوایە، لە ڕەواش بەولاوە پێویستە: ئێمە کە هێندە بەئینساف بین لەگەڵ کۆنینە مافی لەسەرخۆکردنەوە و بەردەوامبوونی عادەتی لێ بسەلمێنین دەبێ هەر نەبێ هەمان ئینساف لەگەڵ نوێخوازیش بەکار بهێنین و چاو بپۆشین لە وردە تێزڕۆیی و کەم سەبرییەکی کە لە هەوڵی نوێکردنەوەدا پێوەی دیار دەبێ چونکە هەروەك کۆنەخواز بەسروشتی مەیلەکەی بۆ وەستان و وەستاندن ئێ دەنووسێ بەرەو پێشەوە.

بەرەوپێشچوونی ڕاست و دروست بەزیادەوە مافی چاو لێپۆشینی بەسەرمانەوەیە لەم قسانەدا شتێکم گوتووە ڕەنگە دەمەتەقە لە نوێخوازەوە هەڵنەگرێت بەڵام هەر ئێستە دەگەمە خۆ و خلیسکی ئەوتۆ دووچاری وێککەوتنەوەم دەکات لەگەڵ نوێخوازدا.

ڕۆشنبیری نوێخواز ناشێ لە شەقامەڕێی خۆیدا بپێتەوە بەکۆنەخواز. ناشێ دەق بەشتێکی تازەبابەتەوە بگرێت و چنگاڵی لێ گیر بکات وەك کە فەلەکناس چەنگاڵی لە خولانەوەی ڕۆژ گیر دەکرد. سووربوون لەسەر بیروباوەڕێك و قەناعەتێك کە گومانی تێکەڵ دەبێت بەلای کۆنەخوازیدا دەچێتەوە چونکە گومان پەیدابوون بەسە بۆ ئەوەی ڕۆشنبیر بهاوێتە سەر کنەکردن لە بنەمای ئەو گومانە، ئاخۆ چی لێ پەیدا دەبێ. کە هات و گومانەکە بەلای چەسپانەوە بۆوە ئەوسا سووربوون لەسەر هەڵەی کۆن سنووری کۆنەخوازی تێ دەپەڕێنێت و دەبێتە کوردەغیرەتی و هۆی وەستاندن. بگرە پاشەکشەش.

چی لەم گوتارەدا بە بەرچاوی خۆمەوەم گرتووە چەند حاڵێکە لە مەیچیاندا هەستیاری (حساسیة) ناژێنێتەوە چونکە بابەتی ئەوتۆن بەهەر لایەکدا بکەون ج حیسابێکی بنەڕەتی لە کەس هەڵناوەشێننەوە بەڵام دەشێ سەلماندنیان لەلایەن نوێخوازەوە ببێتە ڕێباز بۆ سەلماندنی شتی ئەوتۆیی لە دواڕۆژدا. بەهەمەحاڵ کوردەغیرەتی لە نوێخواز ناوەشێتەوە.

لە پێشەوە کێشەی ساڵی بوون و مردنی نالی دەخەمە ڕوو کە دەنووسرا لە ١٨٠٠ز بووە و لە ١٨٥٦ مردووە، مامۆستا سەجادیش دەیگوت لە ١٧٩٧ بووە.

ئەم دوو ساڵەی هاتن و چوونی بێ بەڵگە و بێ لێکدانەوە و بێ سەرچاوە و بێ

بەراوردکردن لەگەڵ داخوازیی حاڵ، وەکو تیرای عاسمان نەقشی لە دڵاندا بەست، هەرچی هات لەو کانیاوەی خواردەوە و پێی مەست بوو.

عەجەب و سەد عەجەب لە پێدەنگیی نووسەرانی نەوبادی نوێخواز لە خەبەرێکی بێ نەسەری بێ سەروشوێنی بێ بەڵگە کە دەزانین نوێخوازانی دوای شەڕی گەورەی دووەم گومانیان خستە بەدیهییەکانی کۆنیشەوە بەڕێکەوت من حیکایەتی نوێم لا بوو لەم مەسەلەیەدا، وا بوو لە هەفتەکاندا کە لە کۆڕی زانیاری کورددا ئەندام بووم بەخوێنەری کوردم ڕاگەیاند کە حاجی مەلا عەبدوڵای باپیرم لە ساڵی (١٢٨٨ك) کە دەوەستێتە بەرانبەر (١٨٧١ و ١٨٧٢ز) لە سەفەری حەجی بۆ مەکە (نالی)ی دیتووە. ئەما بەهیری و زۆریش بەهیری. بەدوا شاهەدیی باپیرمدا لێکۆڵینەوەشم لە هێمای شیعرەکانی نالی کرد کە تەمەنێکی هەڵکشاوتر لە ٥٦ ساڵ ڕادەگەیەنن. ئەم حیکایەتانەی من هەر ئەوەندەی لێ کەوتەوە کە کاکە فاتیحی مەلای مودەڕیس لە پێشەکیی کتێبە بەنرخەکەی (دیوانی نالی- لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٦) بەگەرمی لایەنی ڕایەکە و خەبەردانەکەمی گرت. خەڵقی دیکە هەر لەسەر ڕچەی بێ سەر و سۆراغی کۆنینە بەردەوام بوون. خوا و ڕاستان مامۆستا حەمەبۆر لەژمارەکانی ٦٩٥، ٦٩٦، ٦٩٧ ی مانگی حەفت و هەشتی ساڵی ١٩٨٣دا گوتارێکی بابەخداری ڕوونکەرەوەی لەم بابەتەوە نووسی کە لە کەشکۆڵی عەلی ئاغای نەفتچیی هەڵێنجا بوو، مەرگی نالیی دەبردەوە بۆ ساڵی (١٢٨٩ك) کە دەوەستێتە بەرانبەر (١٨٧٢ و ١٨٧٣ز)

لێرەدا پێویستە بڵێم عەلی ئاغا لە نێوان ساڵانی (١٢٩٦ و ١٣١٣ك) ئەم کەشکۆڵەی لە گەشتی نێوان کەرکووک و کۆیە و سلێمانی کۆکردۆتەوە کە گرینگییەکەی لەوەدایە بۆچوونەکەی لە وەختێکدا کردووە چەند ساڵێک بەسەر مردنی نالیدا تێپەڕی کردووە واتە بەلای ئەوەوە ساڵی ١٢٨٩ زۆر لەبار بووە چونکە لەو دەمانەدا ئەو ساڵە ڕێک هاتووە لەگەڵ ئاگەداریی خۆی دەربارەی مەرگی نالی. ئەگەر نالی لە ١٢٧٣ك مردبایە عەلی ئاغا بیری لەوە ئەدەکردەوە لە ڕێی حیسابی ئەبجەدەوە ساڵی ١٢٨٩ نامزەد بکا بۆ مەرگی نالی، ئەوساش جارێ ئەعلی موقبیل و ئەکەسی دیکەش پەیدا بووبوون بەهەڵە مەرگی نالی بەساڵی ١٢٧٣ ببەخشن و عەلی ئاغای نەفتچی بیەخنە گومانەوە، کە دەزانم لە جیهانی ئەوەی بکەوێتە گومانەوە دەستەوبەخەیان دەبوو. مامۆستا حەمەبۆریش بەم بەڵگەی لێکدانەوەکانی ئاغای نەفتچی پشتگیریی لە

ڕابەکەی من کردبوو.

ماڵی ئاوا بێ دەبێ ئەمەش بڵێم کە من گوتوومە باپیرم لە (١٢٨٨ک) نالی لە مەکە دیتووە قسەکەم لەوە دێت کە ئەو لەگەڵ باوکی، حاجی مەلا ئەحمەدی جەلی زادە، سەفەری حەجی کردووە بۆ مەکە لە ساڵی ١٢٨٨. دیارە حەجەکە لە (ذوالحجە)ی ئەو ساڵەدا بووە. بەڵام باپیرم لە خزمەت باوکی داماوەتەوە هەتا ئەو ساڵە بەسەرچووە و دوای مەحەرەمی ١٢٨٩ش نالیی بەزیندوویەتی دیتووە و لە مەکە بەجێی هێشتووە.

ئەمانە بەجێی خۆیان. لە بەرەو کۆتاییی ساڵی ١٩٨٦ مامۆستا عەبدوڵا حەداد کە لە پاریس خەریکی تەواوکردنی خوێندنی بەرزە و سەردانێکی نیشتمانی کرد و بەخەڵقی ڕاگەیاند کە لە کتێبێکی تورکیدا خوێندوویەتیەوە نووسەری کتێب دەڵێ لە ساڵی ١٢٩٠ک نالی لە ئەستەمبۆڵ مردووە و خۆی بەشداریی کردووە لە مەراسیمی ناشتن. من دیدەنیم بوو لەگەڵ مامۆستا حەداددا؛ تومەز گوتارێکیشی لەم بابەتەوە بۆ دەزگەی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی ناردووە بەڵام لە پۆستە تێ چووە. خەبەریشم پێ درا کە مامۆستا حەداد لە تەلەفزیۆنی کەرکووک دووانێکی بووە ئەم ڕاستیەی تێدا دەربڕیوە.

ئەم دۆزینەوەیە لێکدانەوەکەی عەلی ئاغای ئەفەنجی گەلێک لە ڕاستی نزیک دەکاتەوە، بۆ ئەویش کە لە دوورەوە خەبەری مەرگی نالی وەرگرتووە کۆتاییی ١٢٨٩ و سەرەتای ١٢٩٠ تێك دەکەنەوە.

وابزانم تازە کەس ماقی ئەوەی ئەما بەکوردەغیرەتی و کوتەکەم حەقی چن و سووربوون لەسەر زۆرەملێ بیخەڵقەی ساڵی ١٨٥٦ی زاینی و ١٢٧٣ی کۆچی بگرێت بەنامزەدی مێژووی مەرگی نالی، خۆ لە نێمکاندا نییە نالی خۆی یان کەسێکی هاوکاتی خۆی بژیتەوە و شایەدیمان بۆ بدات. ئەوەی ڕاستی بێ کەسێکی بەهۆی بێ داگری لەسەر هەڵە، بەتایبەتی لە نێوان ئێمەماناندا، کە بڕشتی سەقافیمان لەمەیر نابەحێتە بەر هەنگاوی هەڵەکردوو، دەتوانێ بڵێت و بنووسێت هەر دەبێ نالی لە ١٨٥٦دا مردبێت. نووسینەکەشی بۆ بڵاو دەکرێتەوە چونکە چاپکراو و چاپکەر پێی عەیبدار نابێت.

بگەڕێمەوە بۆ لێکدانەوەکەی عەلی ئاغای ئەفەنجی و هێمایەکی لێ وەربگرم کە بەکەڵکی ئەم نووسینە دێت.

من ئەو ژمارانەی ٦٩٥ و ٦٩٦ و ٦٩٧ی هاوکاریم لە بەردەستدا نییە. بەتەلەفۆن لە بەیانییەکەی ڕۆژی ١٠/ ١/ ١٩٨٧ لە مامۆستا حەمەنوورم زانی کە عەلی ئاغا بۆ ئەوە چووە کە حاجی قادری کۆیی لەو پەڕە شیعرەی کە بە(شەهسواری بەلاغەتی کوردان...) دەست پێ دەکات مەبەستی لە نیوە دێری (اسمی صاحبقران خاص اوە) دەرهێنانی مێژووی مەرگی موستەفا بەگی کوردییە و ١٢٧٦ دەگرێتەوە. دواتر کە دەڵێ: (ئەو کە نۆشی شەرابەکی تاڵی- نالی لەو عەسرەدا بووە تالی) وشەی (بووە) کە (١٣) دەگرێتەوە بەحیسابی ئەبجەد دەخرێتە سەر ١٢٧٦ و مێژووی مەرگی نالی پێ دەردێت. دیارە بەم حیسابە ساڵی ١٢٨٩ دەست دەکەوێ.

من وەهای بۆ دەچم عەلی ئاغا نەهاتووە لە سەرەتاوە بەوردبوونەوە لە واتا و هێمای شیعرەکان ژمارەی (١٢٧٦ و ١٣)ی دۆزیبێتەوە و مێژووی مەرگی ئەو دوو شاعیرەی لێوە وەرگرتبن. عەلی ئاغا لە سەرەتاوە زانیویەتی نالی لە دەوروبەری ١٢٨٩ مردووە چونکە خۆی لەو ساڵەدا بەحەیات و شیعردۆست بووە تا ئەوەی دوای حەوت ساڵ کەوتووەتە سەر کۆکردنەوەی کەشکۆڵ ئیتر خەریک بووە بەوردبوونەوەی دوا کاتەوە دوو ژمارەکەی هەڵناوە تەنانەت بۆ ئەوەی لە نیوە دێرەکەی (اسمی صاحب قران خاص اوە) ساڵی ١٢٧٦ هەڵستێ ئەو (ی)ی ئیزافەی بەوشەی (اسم)ەوە ناوە کەچی لە وشەی (خاص)ی ستاندۆتەوە کە ئەویش دەبوو بەپێی دەستووری اضافە (ی) بەدوادا هاتبایە، ئەوساش ژمارەکە دەبوو ١٢٩٩ و کەڵکی پێوە نەدەما. خۆ ئەگەر بگوترێ چ زوو لە بیری چوو نالی لە ١٢٩٠ مردووە نەک ١٢٨٩: دەڵێم من و تۆش لە ماوەی ٤ ساڵ و ٦ ساڵدا تووشی لەبیرچوونەوە دەبین.

دەسا بەر لەوەی مامۆستا حەمەنوور پێم بڵێ گوتارەکەی هاوکاری لە ١٩٨٣ دەرچووە لە بیرم نەما بوو کەی دەرچووە هەرچەند خۆی نوسخەی دابووم.

ئەم هەڵسەنگاندنەی بۆچوونی عەلی ئاغا جارێکی دیکەش یارمەتیی دەدا لەوەدا کە نالی لە دەوروبەری ١٢٩٠ مردووە هەرچەند دوای دۆزینەوەی ئەو کتێبە تورکییە پێویست بەلێکدانەوە و بەلالەت وەرگرتن نەماوە

کێشەی (بەروار) کەوا گەلێک لە نووسەران بەهاوواتای (date)ی ئینگلیزیی دەزانن وەک کە دەنووسن: ڕۆژی پێنجشەممۆ بەرواری ١٨ی مانگ... تا ئەم کێشەیەش هەتا ئێستا بەتوندی هەناسە هەڵدێنێ، تا ئەوەی بەر لە یەک دوو حەفتە نامەی ئاسیاوێکم

پێ گەیشت زۆر بەراشکاوی (بەروار)ی تێدا نەخشبەست کردبوو.

بەش بەحاڵی خۆم دەمێکە بەخەڵقم ڕاگەیاندووە ئەم وشەیە چ پێوەندیی بەو واتایەوە نییە وا لێرەشدا حیکایەتەکەی دووبارە دەکەمەوە:

برادەرانی مەهابادی کە بەشداریی شۆڕشەکەی قازی بوون گێڕایانەوە کە لە دەمی جمهوریەتی مەهاباددا نامەیەکیان لە عێراقەوە بۆ هات لە کۆتاییدا نووسرا بوو (بەرواری ٧/ ٤/ ٩٤٠٠٠٠) تومەز لە (بەرواری باڵا)وە نووسرا بوو برادەرانی مەهابادی وەیانزانیبوو کە (بەروار) بەواتای مێژووی نووسینی نامەکەیە ئەو (ی)ەی کۆتاییشی هی اضافەیە وەك کە بڵێی ڕۆژی ١٥/ ٧/ .. لەو ڕۆژەوە ئەم وشەیە وەکو دانە گەوهەرێکی بەنرخ چووە فەرهەنگمانەوە. تۆ سەیری، ڕێکەوت چۆن وەهای کرد نووسەری ئەو نامەیە ئەهات ئەواوی ناوی (بەرواری باڵا) بنووسێت و ئەو کێشەیەمان بۆ دەنێتەوە. لە موناسەبەدا دەڵێم، منداڵێك دەگریا خوشکی گەورەشی بۆ ژێرکردنەوەی بانگی کرد، وەرە کێم شتەکت بدەمێ منداڵەکەش گریانەکەی بڕییەوە پرسی چم دەدەمێ ئەویش هەر بەزمانی کۆیێ گوتی (چی کووت دەوێ واتە چی چۆنت دەوێ) منداڵەکە وەها بزانی (چی کوو) شتێکە و ئەو نەیبیستووە دایەوە گریان و گوتی (چی کووم دەوێ، چی کووم دەوێ...) ئێمە کە منداڵ نین نابێ (بەروار)مان بوێت، چونکە حەت و سەوادیشمان هەیە دەبێ واز لە نووسینی بهێنین.

لە باسی ڕاناو درێژە هەیە ئێرە جێی نییە من تەنها لە یەك دوو خاڵەوە بۆی دەچم لە حەفتاکاندا بەدرێژی لەسەر ڕاناوم نووسی و چەند جارێکیش بۆی گەڕامەوە تا ئەوەی مەتەڵی ئەم دوو جۆرە جێگۆڕکێی سیفەتی ڕاناوی کارا و بەرکار کە لەم دوو ڕستەیەدا دەردەکەوێت بابەتی بەشێکی یەك لە نووسینەکانم بوو. ڕستەکان ئەمانەن:

دەتدیتم

دەتبینم

لە ڕستەی سەرەوەدا ڕاناوی کەسی دووەمی تاك (ت) کارایە و ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك (م) بەرکارە. لە ڕستەی دووەمدا بێ ئەوەی ڕاناوەکان ڕابگوێزرێن ئەوەی کارایە بووەتە بەرکار ئەوەی بەرکارە بووەتە کارا... زمانزانەکان ئەگەر هەمووشیان نەبن بەشێکی زۆریان وەها دادەنێن کە ئەو (ت)ەی کۆتاییی فیعلی وەك (دەچێت، دەکات، دەڕێت) ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە. لە ڕوونکردنەوەدا نووسیم، ئەگەر ڕاناو

بایە دەبوو ئەویش وەکو ڕاناوەکانی دیکە بووبایە مەفعوول. لەوەش زیاتر: ئەگەر ڕاناو بێ لە ڕێی قیاسەوە دیارە مادەم لە (دەچێت، دەڵێت، دەبێت)دا ئەو (ت)ەی کۆتاییی فیعلەکان ڕاناو بێ لە فیعلی (چوویێت، هاتبێت، نووستبێت)یشدا هەر ڕاناوە ئینجا کە ئەمە وەها بێت ئەدی چی بڵێین لە (چووبێتم، چووبێتین، نووستبێتین، هاتبێتن...)؟ تۆ بڵێیت ژیربێژی (گوتەن = منطق) لێمان بسەلمێنێت یەک فیعل ڕاناوێکی کەسی سێیەمی تاک و یەکێکی کەسی یەکەم و دووەمی هەبێت؟ لەم نموونانەدا فیعلەکان هەموویان تێ ئەپەڕن. نموونەی فیعلی تێپەڕی وەکو (کردن، بردن...) دەشێ بکرێتە (کردبێتی– بردبێتی...) کە لەواندا دوو ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک لە یەک فیعلدا بەدوا یەکیدا دێن جگە لەوەی کە گوترا (کردبێتم، بردبێتیان، خواردبێتمان، دیبێتیان، بوواردبێتت) لە هەمووواندا دوو فاعیلی (ڕاناوی) کۆ دەبنەوە کە شتی ئەوتۆیی لە کەوولەی ئەڕیشدا نەبیستراوە و نەدیتراوە و بەخەون و خەیاڵدا نەهاتووە لەمەوە هێندەی تیشکی ڕۆژ ئاشکرایە ئەم (ت)ی کۆتاییی فیعلەکان زیادەیەکی گەردانی (تصریفی)یە بێ زیاد و کەم، لە زۆر لەهجەشدا تێ دەبردرێ و کۆ ناکرێت وەک کە دەڵێی (دەخوا، دەڕوا، دەچێ... هتد) هەر خۆم تازە نووسیم (دەڵێی) لە جیاتی (دەڵێیت): ئەشمنووسی (تێ دەبردرێت).

وا بزانم بەڵگە لەم بەڵگەیە بەهێزتر بۆ هیچ شتێك پێویست نییە جا ئەگەر نەسەلمێندرێ هەر دەبێ کوردەغەیرەتی هۆی نەسەلماندن بێت. لەلای هەندێ نووسەرەوە لە فیعلی وەکو (بدە، بکە، ببە)دا ئەم دەنگی کۆتاییی فیعلەکان کە شکڵی (ە)ی بۆ دادەنێین ڕاناوی کەسی دووەمی تاکە. ئەگەر وەها بێ ئەدی لە (بکەم، بدەم، بدەیت، بکەین، بدەن...)دا چۆناوچۆنی ڕاناوێك دەردەچێ؟ لێرەشدا دوو ڕاناوی لە یەکتر جودا بۆ دوو کەس لە یەکتر جودا کۆ دەبنەوە وەیا دوو ڕاناوی یەك تاکە کەس لە فیعلێکدا دەردەکەون.

ئەگەر کوردەغیرەتی لە بەینا نەبێ ج ڕێگەی پێگری لە پێش کەس نامێنێتەوە دەبینین لە (ببە)دا ئەشیا بڵێین (ببەم، ببەین، ببەیت) تۆمەز گەردانی فیعل چارێکیان ئەم بزوێنەی (ە)ی هێڵاییەوە و چارێکیشیان تێی برد. مەسەلەکە دەچێتەوە بۆ قاڵبی (گەردان) کە هەر چارە بەپێی هەڵکەوت دەگۆڕێ و هیچ دەخلێکی بەسەر ڕاناوبوونی ئەم بزوێنەوە نییە.

کەسی سێیەمی تاك لە ڕابردووی فیعلی تێنەپەڕدا دەرناکەوێت. لە ئاییندەدا هەر

بەجاریٚ ڕێی دەرکەوتنی نامێنێ چونکە ڕاناوی کەسەکانی یەکەم و دووەمی تاك و کۆ، و کەسی سێیەمی کۆ کە لە ڕابردووی تێپەڕدا (م، مان، ت، تان، ی، یان)ە لە ئاییندەدا وەکو ڕاناوی فعلی تێنەپەڕی لیٚ بەسەر دێت کە لە ڕابردوو و ئاییندەدا (ین، یت، ن)ە.

ئینجا کە ڕاناوی بەهێز لە ئاییندەدا بێ هێز بێت چۆن فیعلی وەکو (ڕۆیی – هات) کە ڕاناوی نییە لە ئاییندەدا لێی دەرسکێت. ڕێژەی ئەمری کەسی یەکەمی تاکیش چونکە کەسەکە لە ڕوودایە لزووم بەڕاناو ئەماوە هەتا لەلایەن ژمارەی تاك و کۆی کەسی دووەمەوە پێویست بە ڕاناو پەیدا دەبێ ئەوساش ڕاناوی بێ هێزی بۆ بەکار دێت. کە فیعلەکە بوو بەئیلیزامی و گوترا (بکەیت) و لە ئەمری سەریح دەرچوو ئەوسا ڕاناو پەیدا دەبێت، کە (یت)ە.

لزووم نەبوون بۆ دەرکەوتنی ڕاناو باری دیکەشی هەیە، کە دەڵێی: خواردم، دیتم، بیستم، کردتان، بریمان، گوتت. لە خۆوە دیارە بەرکاری ئەم فیعلانە تاکی سێیەمە چونکە ئەگەر بەرکار شتێکی دیکە بووایە دەبوو دەرکەوێت.

ئەم ڕاستییە زۆر بەسەیری وەها دەکات هێندیٚ زمانزان بۆ ئەوە بچن کە لە فیعلی (خواردی، کردی، بردی...)دا ئەم (ی)ە مەفعوول بێت چونکە هەبوونی مەفعوول لە شکڵی کەسی تاکی سێیەم یەکسەر بەبیردا دێت، ئینجا کە ئەم (ی)ە دەرکەوت خێرا بیر بۆ ئەوە دەچێت کە مەفعوول بێت. بۆ پتر ڕوونکردنەوە سەیری نموونەیەکی دیکە بکە. کە دەڵێی: دەی دیت، ئەگەر ئاگاداری خۆت نەبیت یەکسەر ئەو (ی)ەی دوای (دە) بەمەفعولی بیٚ دەمەتەقە دادەنێیت بەڵام لەگەڵ نموونەی وەکو: دەی دیتم خێرا بۆچوونەکەی هەوەڵ جار دەبووژێتەوە هەروەها کە دەڵێی: دەم دیت، لێت مەعلووم دەبیٚ کەسی سێیەمی تاك لە شکڵی ڕاناودا کە دەرنەکەوتووە مەفعوولە ئەگەر ڕاناوێکی دیکە بایە دەردەکەوت وەك: دەم دیتن، دەم دیتیت.

دیتوومە نووسراوە کە ڕاناوی لکاو لە کوردیدا نییە گۆیا ئەوەی بەڕاناوی ئەلکاو دادەنرێت شتێکە وەکو verb tobe لە ئینگلیزیدا، لەم گوتەیەشدا پتر ڕاناوی لکاوی بیٚ هێز مەبەستە وەك: نووستن، چوون، هاتیت، ئێمە کوردین، دەبینین، دەڕۆن.

لەبارەی ڕاناوبوونی ئەوانەی کە لەم فیعلانە دەردەکەون. دیتمان، خواردتان، بردیان، کردت، بیستم، هێنای، ئەوە بەسە کە دەبینە (مضاف اليه) وەك: براتان،

دەستمان، خزمم، ماڵیان، هاوتات، باوکی. دەشبنە بەرکار (مفعول) وەك. دیتمانی (دیتینی)، دەتانناسم، دەمگرن، دەتتاختیووم، دەیگێرین، دەیانکێشین. کەواتە گومان نییە لەوەدا کە راناوی لکاوی بەهێز هەیە و جێی دەمەتەقە نییە. دەمێنێتەوە لکاوی بێ هێز.

بۆ بەتاقیکردنەوەیان نابێ لەگەڵ فیعلی رابردوودا بیانهێنین چونکە لەگەڵ ئەو فیعلەدا گومانی راناوتەبوونیان لێ دەکرێت. لەبەرهەمان سەبەبیش نەهاتم لکاوی بەهێز لەگەڵ فیعلی رابردوودا بهێنم تەنها لە نموونەی یەکەم نەبێ. راناوی لکاوی بێ هێز ناتوانێ ببێتە (مضاف الیه). بەڵام دەبێتە بەرکار (مفعول) وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێت: دیتنی ئەو ئێمەی دیت (ین مفعوولە)

ئەم ویستن من ئێوە وەیا ئەوانم دەویست (ن مەفعوولە)

هەڵیان بژاردیت. ئەوان تۆیان هەڵبژارد (یت مفعوولە)

پێشتر گوتم کەسی سێیەمی تاك بەمەفعول لەم شوێنانەدا دەرناکەوێ هەرچی کەسی یەکەمی تاکە لە هەردوو حاڵی بەهێزی و بێ هێزیدا هەریەك فۆرمی (م)ی هەیە وەك

ئەم بینێ، دەیدیتم (دەیدیتین، دەیدیتیت...)

ئەم راناوانە لە رستەی بێ فیعلی ئاشکراش دێن. دیارە رستەی ئەوتۆیی بەناچاری داوای راناوی بێ هێز دەکات چونکە راناوی بەهێز هەر لەگەڵ تێپەڕدا دێت، ئەویش لە رابردوودا. ئەمانە نموونەی رستەی بێ فیعلن:

من ئازام، تۆ راستگۆیت، ئێمە کوردین، ئەوان- ئێوە کوردن.

کە دەگوترێ (ئەو کوردە) راناوی کەسی سێیەمی تاك دەرنەکەوتووە ئەوەی لە کۆتایی رستەکەدایە پاشماوەی (verb tobe) کۆنە. لە هەندێ لەهجەدا دەگوترێ: کوردەس. بگەڕێینەوە بۆ پتر لە دوو هەزار ساڵ ئەم فیعلی هەبوونە رابردووشی هەبوو. ئێستە لە فارسیدا (است) بەکار دێت لەگەڵ راناوەکان وەك: مرداستم، بالاستی، خوب استیم... هتد. هەروەها بێ ئەو (است)ەش رستە دروست دەبێ وەك: خوبم، خوبی، خوبیم، خوبند، خوبید. تەنها لەگەڵ کەسی سێیەمی تاکدا دەبێ است- هست بەکار بێت.

من لە نووسینی کۆندا ئەم بزوێنەی (بالات راستە)ی کۆتایی ستەکەم بەراناو

دادەنا. لەمەدا سەهوو بووم تومەز لێرەشدا ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك جێی دەرکەوتنی نییە هەروەك لە فیعلی تێنەپەڕدا نەبوو. فیعلی بوون لەم ڕستانەدا سوواوە چی ماوەتەوە ڕاناوە جگە لە کەسی سێیەمی تاك.

ڕاستییەکەی دەبوو بۆ مەفهوومی (فعل- کار) وشەیەك دابندرێ نەك تەنها کردن و ڕوودان بگرێتەوە بەڵکو ئەوەی ڕوودان و کردنیشی تێدا نییە وەك (دارا مەرە) ئەویش بەر بکەوێت... لەم تەرزە ڕستانەدا گەلێك جار (کات)یش مەبەست نییە: تۆ کە دەڵێی (بەفر سارده) ناتەوێ بڵێی ئێستە ساردە یان دوێنێ ساردبوو، سبەی سارد دەبێ. تۆ دەتەوێ ڕاستییەکی (مطلق) دەربڕیت کەوا نەڕوودان نەکات، هیچیانی تێدا نییە. لە ئاست زاراوەی verb تێبینیم چونکە لە قامووسەکانی من دیتوومن نەنووسراوە واتای وشەکە لە دەرەوەی ڕێزمان چی دەگەیەنێ.

کە وردتر بێینە ناقصی (افعال المطاوعة)ی کە من لە کوردی (کاری ڕوودان)یان پێ دەڵێم لەوانەیشدا (کردن) پەیدا نییە. بەنموونە کە دەڵێی (دیوارەکە ڕما) دیواری بەستەزمان هیچی نەکردووە بێ ئەوەی ویستیێتی ڕوودانی (ڕمان)ی بەسەردا هاتووە ئەم ناقصە وەکو ناقصی کاری کارا نادیار (= مبني للمجهول) خۆ دەنوێنن لە ڕووی دەوری کارا (فاعل) تێیاندا کە هیچ لایەنی ئیجابییەتی تێدا نییە: لە ڕستەی (دارا دیترا)دا دارا چەند ماندوو بووە کە گوترا (دارا کەوت، پووش سووتا) لەوێشدا دارا و پووش هەر هەندە ماندوو بوون کە دەکا هیچ. هەر بۆیەیشە ڕێژەی کاری ڕوودان بەزۆری وەك ڕێژەی کارا نادیارە، گەردانیشیان یەك جۆرە وەك:

| | | |
|---|---|---|
| سووتا | دەسووتێ | دەسووتێم. |
| ڕما | دەڕمێ | دەڕمێم. |
| پسا | دەپسێ | دەپسێم. |
| دیترا | دەدیترێ | دەدیترێم. |
| خورا | دەخورێ | دەخورێم. |
| کێڵرا | دەکێڵرێ | دەکێڵرێین... هتد |

بێینە سەروکاری ئەم زاراوەیەی مامە (ڕاناو) کە لەسەریشم نووسیوە و لێرەشدا بۆ ئەو و زاراوەیەکی دیکەش دەگەڕێمەوە.

وەك دەزانیت و دەزانم مەبەس لە وشەی ڕاناو ئەوەیە واتای وشەی pronoun بەدەستەوە بدات، واتە وشەیەك بێت لە تاقمی (ناو) حیساب بکرێت... هەر بەم مەبەستە بوو، هێندێ زانای زمانی (بۆناو، جێناو)یان لە بری (ضمیر– pronoun) دانا.

ئەم داڕشتنەی (ڕاناو) کە بریتی بێ لە (ڕا + ناو) بەهیچ مەزەهەبێکی ڕێزمانی کوردی ڕەوا نییە چونکە وەك چەند جارێك لێرە بەپێشەوە گوتوومە، ئەگەر ئەم (ڕا)یەی بەرایی وشەکە پێشگرەکەی (ڕاهورین، ڕاپسکووتن، ڕاکێشان...) بێت دیارە هەر دەچێتە پێش کار (فعل) و ناشێ بەهیچ جۆرێك بخرێتە بەرایی ناو و غەیری ناویش. ئەگەر کورتکراوەی (ئەڕا) بێ بەواتای (بۆ، لەبۆ) دەبوو هەرنەبێ بگوترێ (ڕای ناو). بەهەمەحاڵ (ئەڕای ناو، ڕای ناو) هەردوویان ناقۆڵان بەلام هێندەی پێشگری (ڕ) بێ جێ نین. بەکورتی ئەم زاراوەیە نالەبارترین دروشمە بۆ زمانناسی کە بیکا بەعینوانی زانستەکەی مەگەر هەر زاراوەی (فرمان) لەو نالەبارتر بێت کە ئەختێکی دیکە لێی ئەدوێم.

لەم (ڕاناو)ەدا سەیرێکی دیکە هەیە لێهێڵەنگبوونی دەبێتە بێتاگایی: ئەو زمانناسانەی لە بری (ضمیر – Pronoun) هاتن (ڕاناو، بۆناو، جێناو)یان ڕەچاو کرد، ویستیان خۆیان لە (ضمیر) بدزنەوە بۆ زاراوەی Pronoun گوێیا ئەمیان لەگەڵ کوردی ڕێك دێت. کە ئەمەیان کرد و چۆن و چۆتی هاتن بایانداوە سەر عەرەبی و دەقاودەق (متصل و غیرمتصل «منفصل»)یان لێ خواستەوە بۆ ڕاناوی (لکاو و نەلکاو)؛ ڕاستییەکەی ئەم لکاو و نەلکاوە هەرچی دەوری ڕاناوەکە هەیە لە زمانی کوردیدا پێشێل دەکات چونکە ڕاناوی لکاو شیرازەبۆتی ڕستەی کوردییە تا ئەوەی لە ڕابردووی کەسی سێیەمی تاکی کاری تێنەپەڕ و لە ئەمری کەسی دووەمی تاك بترازێت ڕستەی تەواو لە کوردی پەیدا نابێ بێ ڕاناوی لکاو، قسەش لێرەدا لەگەڵ لەهجەی کرمانجیی سەروو نییە کە لە بابەتی ڕاناودا ئەو لەهجەیە توێژینەوەی خۆی هەیە.

هەرچی لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ (جملة اسمیة) لە کوردیدا ڕاناوی لکاو جێی کاری هەبوونی تێدا گرتۆتەوە واتە (Verb tobe) لە ڕستەی کوردیدا سڕاوە و ماوەتەوە ڕاناوەکە (جگە لە کەسی سێیەمی تاك کە گوتم پاشماوەی ئەو کاری هەبوونی پاراستووە) خۆ دەزانین کە هەرچی فیعل هەیە بێ لەو دوو ڕێژەیەی باس کراوە بێ ڕاناوی لکاو نایەن. من ئەم لایەنەم لە دەمێکەوە ڕەچاو کردووە تا ئەوەی لە

حەفتاکاندا زاراوەی (ڕاناوی مەند) بۆ (تەلکاو) و (ڕاناوی چالاک)م بۆ (لکاو) پێشنیاز کرد ئێستەش هەر وەها دەکەم هەرچەند دەزانم کەس بەدوا قسەمدا نایەت. چ بڵێیت (ناسەمی گیانلەبەرێکە دوو چاوی هەیە) و چ بڵێیت (ڕاناوی لکاو و تەلکاو) هاتوویت وەسفێکت بەکار هێناوە هەرچی سروشتی بنەڕەتیی وەسفکراو هەیە تێی بردووە ڕاناوی لکاو و زاراوەی ناوانبارن.

بێینە سەر باسی (فرمان): ئەم فرمانە هیچ پێوەندییەکی بەمەفهوومی (فعل، وقوع، ڕوودان)ەوە نییە. هەروەك پێوەندییەکی بەوانەوە نییە زۆریش ئاشکرایە چ واتایەك بەدەستەوە نەدات.

فرمان بێ زیاد و کەم ئەو (فەرمان)ەیە کە پاتەوپاتە لەگەڵ (امر) فەرمان لە (فەرموون)ەوە بەشێوەی (ناوی چاووگ) هاتووە وەك کە(ترس) ناوی چاووگە (پرس، لەرز...)یش هەروەها. جاران دەگوترا (فەرمانی سوڵتان) ئێستە وا دەڵێین (فرمانی ڕێزمان) بەڵام دوور لە واتای خۆی.

ئەم (فرمان)ە لە زاری بازاڕ و ئاخاوتنی عادەتییەوە وەرگیرا کە خەڵقی نەخوێندوو دەیانگوت و دەڵێن (فرمانی خۆم بەجێ هێنا) مەبەستیشیان ئەوەیە بڵێن (ئەو کارەی بەسەر شانمەوەیە) واتە (ئەو واجبەی بەسەرمەوەیە). لەم بەکارهێنانەوە خوێندەواری نوێ بۆ ئەوەی چوو کە (فرمان) بەرانبەر (کار، عمل، فعل) دەوەستێت ئیتر گورج پەنجەی لێ گیر کرد و لە بری (فعل)ی عەرەبی کەلێنی لە ڕێزمانی کوردی پێ گرت. چ فەرقێك نییە لە نێوان (واجبم بەجێ هێنا) و (فعلم بەجێ هێنا) لە نەزەر ئەو کەسەی کاری خۆی بەواجب دەزانێ هەروەهاش چ فەرق نییە لە نێوان (فرمانم بەجێ هێنا) و (کارم بەجێ هێنا) لە نەزەر ئەو کوردە نەخوێندووەی کە ئاگای لە ڕێزمان نییە، ناشزانێ چۆناوچۆنی وشە جێگۆڕکێ و واتاگۆڕکێ دەکات.

لەو زاراوانەی تا ئێستە بۆ (فعل) دانراون هیچیان ناگەنە زاراوەی (کار) چونکە وشەی (کار) لە هەموو وشەیەك دەلالەتی (فعل)ی هەبێ پتر بەرەو (تجرید) چووە ئەو لە (کردار، کردن) گەلێك (مطلق)ترە. ئێمەش زۆرمان پێویست بە(مطلق و تجرید) هەیە بۆ ئەوەی نێزیك ببینەوە لە سروشتی ئەو فیعلانەی هەر ڕووداویان تێدایە بێ کردەوەی ڕاستەقینە. ئەمەت لەلایێکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە دەبێتە (کارا، بەرکار) بۆ (فاعل، مفعول).

کارگێڕیی لێ وەردەگیرێ بۆ (مدیر). هێندێك لە بری (فاعل) دەنووسن (بکەر)

چەندێکی بەوەیێ خۆمی پێ ئیقناع بکەم بێ سوودە. بەڵام دەتوانم بەرچەشنی بڵێم ئەم ڕێژەیەی (بڵێ، بخۆ... بکەر) بواری خۆی هەیە لە بارێکی تایبەتی ناخاوتندا ڕاگەیێنە. جگە لەمەش، هەر دەمێنێتەوە بڵێم ئەو کەسەی لە هەوەڵەوە (بکەر)ی بەکار هێنا دوور دەستووری (اسم الفاعل)ی کوردی تێك بەست چونکە قاڵبی (بڵێ، بوێر....) پێویستی بە (ر)ی فاعیلیەت نییە بۆ هەڵگرتنی فاعیل وەك کە دەڵێین (ناخێوەر، کوژەر، بیسەر....) لەبەر ئەم هۆیە دەبوو (بکە) بەفاعیل دابنێت ئیتر خۆشە ئێمەی تێدا بەرپرس نین. ئینجا ئەگەر بگوترێ لە (کردن)دا دەنگی (ر) هەیە خۆ لە (خواردن)یشدا هەیە کەچی کەسێ ناڵێ (بخۆر، بخوەر) ناشبێ بڵێین (بدەر) بەقافیەی (بکەر). لە قاڵبی (بڵێ، بخۆ)دا کە فیعلێك ڕێژەی ئایندە (مضارع)ی دەنگی (ر)ی تێدا مابەوە لە فاعیلیەتیشدا دێتەوە. بۆیە دەڵێی (بوێر) چونکە دەنگی (ر) لە (وێرای، دەوێرێ) بەردەوامە کەچی لە (خواردی، دەخوا)دا بەردەوام نییە. وشەی (ببڕ) کەوا پێ دەچێ بووبێتە (بڕوور) لە موزاریعدا (ر)ەکەی دەمێنێت: (بڕی، دەبڕێ) جێی خۆیەتی لەو قاڵبەشدا دەرکەوێتەوە. کورد لە ڕێژەی موزاریعەوە ناوی کارا (اسم فاعل) هەڵدەهێنێ. لە (کردی، دەکا)دا ئەم (ر)ە بەردەوام نییە کەواتە ناشێ بگوترێ (بکەر).

لە نووسینی ئەم گوتارەم ئەبوویووەوە ژمارە پازدەهەمی گۆڤاری دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عیراقم پێ گەیشت. دیتم مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لە گوتاری (بەرێگای ڕاستکردنەوەی شیعرەکانی حاجی قادری کۆییدا. ئەمەیش هەنگاوێکی تر) دەنووسێ کەوا لە چاپکردنی دیوانەکەی حاجی قادر کە مامۆستا سەردار خۆشناو و مامۆستا کەریم شارەزا گردوکۆییەیان کردبوو، منیش (مەحموود محەمەد) پێیدا چوویووەوە دەسکاریی لە زۆر شوێنیدا کردووە پێشتر ئەمەم نەدەزانی لەبەرئەمە پێداچوونەوەی من ئەو بەرپرسییەی تێدا نەماوە کە ئەگەر وەکو خۆی مابایەوە ڕووی لە من دەکرد. دەشبوو کاکە محەمەد پرسم پێ بکا لە گۆڕینی ئەو دەقانەی کە بەگۆڕاوی لەسەر من حیساب دەکرێ ڕاستییەکەی من هیچ سەرچاوەیەکم لا نەبوو پشتی پێ ببەستم، خۆ هەرچی هەبێ لەو سەرچاوانە هەر هێندی من پێیان بەشێعری حاجی بردووە ئەم کارەی کاکە محەمەد کە بێگومان لە پەرۆشەوە کردوویەتی، ئەویش کوردەغیرەتی پێ ناوێ کە ئەختێك سنووری (ئازادی لە کردەوە)ی بەزاندووە. بەهەمەحاڵ لەلای منەوە گەردنی ئازاد بێ. بەتێبینیی ئەوە کە لە دواڕۆژدا پرسم پێ بکرێ.

هاوکاری، ژمارە ٨٤٤، ١٩٨٧

# ڕەمزی نافیع

## قوربانییە زلەکەی هەولێر

دەمێکی لەمێژەوەیە خولیای (ڕەمزی نەوازی) لەگەڵمدا دەژیت و ختووکەی هەستی ڕوح بەرەییم بۆ گیانی کوردایەتی لێ دەبزێوێ. خولیا ساڵە و ساڵ لە دڵمدا ترنجۆکی شەپەنگی خۆی تەنییەوە و باڵە و باڵ بە پێپلکەی ترخە بەرزەکاندا بەرەو تۆقەڵەی سەنگاندنەوە تێ هەڵکشێ. خولیای نرخاندن و سەنگاندن، بەرەبەرە، لێم بوو بە هەستی فەرمانی قەومایەتی بەسەر شانمەوە: بۆچی شەپەنگی وەها گەش و پرشنگدار لە زیندانی فەرامۆشیدا ژەنگ هەڵبهێنێ؟ خۆ پەنجەچیلکە نین قەڵەم و گۆڤاریش کلچووك و کفنی بەڵەك نین بە هەموویان نەتوانن وێنەی ئەم قارەمانە لە گۆڕخانەی نەبەردییەوە بۆ بەرچاو و دڵ و مێشکی میللەتەکەی نەخش بەستوو بکەن؛ دوو ساڵ دەبێ بڕیاری پیرۆزم بە دڵی خۆمدا هێنا کە تۆز لە وێنەی ئەم خوێبەختکردووە بتەکێنم و ڕەسی جاڵجاڵۆکەی فەرامۆشی لێ داڕنم و بەسەرهاتەکەی بکەم بە دیاری دووەم لە خۆیەوە بۆ زیندووان.

شاباشی یەکەمی لە نامەنگی میللەتپەرستندا گیانی بوو، شاباشی دووبارەی لە زەماوەندی بیرەوەرییەکەیدا ئەم دراوێلکانەن و وا لە وشەخانەی زەینی منەوە دڵۆپ دڵۆپ بەنووکی خامە بەرەو توومارخانەی مێژوو بەبەرچاوی خوێنەردا گلۆر دەبنەوە. قۆڵ و باسکی پەرۆشم لێ هەڵماڵی و خامەم بەمەرەکەب داشت و لە مەزرای کاغەزم گێرساند. وەك حەتەجووتی جووتیاری کورد کە بەسەر خاکی پاکی زەوییەکانی کوردستانەوە وەردی ڕەش دەدەنەوە بە پیت و بەرەکەتی دانەوێڵەی هەژاران منیش بە نووکی خامە کاغەزم دایە بەر حەت، لە دوا حەتی هاتوچۆی مێشك بە ناو تانوپۆی ڕایەڵەی کارەساتی قوربانیدانی ڕەمزی نافیع بۆڵەی ئازدار و شەرەفداری شاری هەولێر لە پێناو تێکڕای میللەتی کوردا کە هەمووی لە تەرازووی بەراورد و هەڵسەنگاندندا هەر هەژاری دانەوێڵە و ترووسکەی ئاگری سەرمای ڕێبەندان بووە لە وەتەی زەمەی چاوی لە پێڵووی شڵەقاوی مێژوودا هاتووە.

دەست و قەڵەم کە گەرم ڕاهاتن لە نووسین دەکەونە برشت، (خومخانەی خەیاڵی

ئەرجومەندی – حاجی قادر) لە گۆیەندی یادکردنەوەی رەمزیدا، پەیتاپەیتا، لە جیاتی مەرەکەب برژێوی شەرابی بە خامەم دەبەخشی و منیش پێوە سەرگەرم دەبووم و (هەی پێ)م لە نووسین دەکرد: چرای گەشی چیهرەی رەمزی (شەمعی موتالا – نالی)م بوو.

جارێ، وەکو ئێستاکە، لە سەرەتاکانی پێشەکیدا هاتوچۆی ئەمسەر و سەری کاغەزم بە قەڵەم دەکرد، لە وتووێژدا، دۆستی رێز لێگیراووم د. کەمال مەزهەر پێی ڕاگەیاندم کە کتێبێک بە ئەڵمانی لەلایەن سەرپەرشتیکەری ئەو ڕووداوەی کە ڕەمزی تێیدا بوو بە قوربانی دەرچووە. نوسخەیەکیشی لای خۆی هەیە کە بۆ نیازێکی سەر بە باسی مێژووی کوردەوە دەردەستی کردبوو. هەرکە ئەمەم زانی لە نووسین وەستام. ناشێ سەرچاوەیەکی وەها گرنگی مێژوویی پشتگوێ بخرێ کە پڕ بێ لە باسی ڕەمزی. د. کەمال کتێبەکەی بۆ هێنام لەگەڵ چەند لاپەڕەیەک لە پاڵاوتەی کورتەی کتێبەکە، لەلایەن مامۆستا سەردار میرانەوە هێنرابووە سەر عەرەبی.

ویستم پتر لەم کتێبە سوودمەند بم بە تەرجەمەیەکی بیندرێژتر. بۆ ئەم مەبەستە کتێبەکەم دایە د. فەوزی ڕەشید. ئەویش دوای خوێندنەوەی هەر ئەوەندەی پێ کرا بە قسە باسی ناوەرۆکەکەیم بۆ بکات چونکە دەرفەتی تەرجەمەی بەنووسینەوە نەبوو. لە نێوان ڕاگەیاندنەکانی نووسینی مامۆستا سەردار و گێڕانەوەکەی د. فەوزی نەختێک جوداوازی هەبوو کە بەمن نەدەکرا تێیدا بەریوان بم، ئەم تەگەرەیەش وەستاندمی. ڕەنگە ساڵێک، زۆرتر کەمتر بەسەر وازهێنانم لە نووسیندا تێ پەڕی بێ بە دیار پەیدابوونی خێرومەندێکی ئەڵمانیزان و دۆست و خاوەن دەرفەت تەگەرە بچووکەکەم بۆ بڕەوێنێتەوە، بە داخەوە چەندێکی هەوڵم دا و برادەری نزیکیشم هەوڵی بۆ دام بە هیچ ئامانجێک نەگەیشتم، تا ئەوەی هەستم کرد کە شەرم و بەخۆداشکانەوە لە ئاست گیانی ڕەمزی چی دیکەم هاڵەبەخش ناکات. بۆیە بوو وا بەم شێوەیەی لێرەدا دێتە بەر نیگای خوێنەرەوە هاتمە سەر باسی نووسین هەمیشەش ئاگاداری ئەوە دەبم شتێک نەیەتە ناو نووسینەوە لەگەڵ ڕاستییەکی شرایەوەدا نەگونجێ. چی باسی دەکەم جێی دڵنیایی خوێنەرە، شتێکی لەوانە بێ لەگەڵ ناوەرۆکی نەزانراوی ئەو کتێبەدا ڕێک نەیەت، تا پێم بکرێ، خۆمی لێ لادەدەم، ئەوەی کاریشمان پێیەوە هەبێ لەو بەسەرهاتەی پێوەندیدار بێ بە ڕەمزییەوە، وەکو هەتێکی ڕۆشن ڕێگە بۆ سەر مەبەست دەر دەکات. بەڵام دەبێ بڵێم ئەو کتێبە سەرچاوەیەکی مێژوویی گرنگ و فەرامۆشکراوە

لەوانەی یەکوردەوە خەریك بوون. سەرگورشتەیەکی خۆشیشە لە گۆشەیەکی کەینوبەینی شەڕی گەورەی دووەم. لێی دێت نەختێك تەڕایی ببەخشێ بە دەماغی خوێنەر کە وشك بۆتەوە بە زۆربەی ئەو نووسینە وشکێن و برینگێنەی خۆ بە مل حاڵوباری ڕۆشنبیریماندا دەدەن. بەر لە ۱۳۰۰ ساڵ پتر پێغەمبەر (د.) فەرموویەتی (روحوا القلوب ساعة بعد ساعة..) ناوناوە دڵتان بحەسێننەوە. ڕاستییەکەی، لە دەستم هاتبایە سەرلەبەری کتێبەکەم بە کوردی یان بە زمانێکی ناشنا لەبەر گوێی کورد بڵاو دەکردەوە هەر دەشبێ ڕۆژەك لە ڕۆژان بکرێ.

ئەم کتێبە ساڵی ۱۹۵۹ لە شاری شتوتگارتی ئەڵمانیدا، لە ژێر سەرناوی (Im brennenden rient) لەلایەن گۆتفرید یۆهانس مولەرەوە نووسراوە و بڵاو کراوەتەوە. واتای عنوانەکە بەعەرەبی (في الشرق الملتهب)ی لێ دراوەتەوە لەلایەن مامۆستا سەردارەوە. ئینجا خوێنەر با دەقێکی کوردی بۆ پەسەند بکات وەك: لە ڕۆژ هەڵاتی هەڵایساو – بڵێسەدار – ئاگر تێ بەربووی – بڵێساوی.. یان هەرچی دیکەی لەبارتر بێ.

مولەر لە کتێبەکەیدا دەنووسێ کە وەکو ئەڵمانێکی بە پەرۆش بۆ میللەتەکەی لە جەنگی دووەمدا بیر لە پلانێك دەکاتەوە پارمەتیی وڵاتەکەی بدات بەرەو سەرکەوتن. لە کولانەی پێویستی ئەڵمانیا بە نەوت یادی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەچێتەوە کە پێشتر گەشتێکی تێدا کردبوو. لە بەشێکی گەشتەکەیدا بە یارمەتیی شێخ مەحموود گەڕانێکیشی لە کوردستاندا کردبوو. لە ساڵی ۱۹٤۳ نەخشەی پلانێك بۆ سەرکردایەتیی جەنگی رایخی سێیەم دەنێرێ لەبارەی چۆنیەتیی سوودبینین لە نەوتی عێراق بەهۆی کوردی عێراق نشینەوە وەك خۆی دەڵێ، دوای حەفتەیەك فەرمان لە سەرکردایەتیی سپا دەردەچێ بۆ ڕێکخستنی پێداویستیی بزووتنەوەیەکی ئەوتۆیی. ڕووبەڕوو تاقمێك لە دۆستانی پێك دەبەخشێ بۆ تێ هەڵچوونی ئەو پلانە بەڵام دەمێنێتەوە تەگەرەی هەرە گەورە بڕەوێتەوە: دەبێ کوردێکی ورپای تازا و دڵسۆزی عێراقی پەیدا بکەن لەگەڵیاندا چاوساغ و هاومەبەست بێ. بە بیری دێتەوە پێشتر لە ۱۹٤۲، بەرێکەوت و لابەلایی لە شاری ئەستەنبووڵ شناسایی لەگەڵ (رەمزی نافیع)دا پەیدا دەکات کە کوردێکی هەولێری و لە بنەماڵەیەکی بە دەسەڵاتە. گورج دێتەوە بۆ ئەستەنبووڵ و بە هۆی عێراقییەکی سەر بە (مخابرات)ی ئەڵمانیاوە بە دوا (رەمزی نافیع)دا دەنێرێ. رەمزی بێ وەخران مل دەنێ بۆ ئەوێ و لەگەڵ مولەردا دیدەنی

دەکـات و بـە پـێشنیـازی مـولـەر ڕازی دەبـێ کـە هـەوڵ بـدرێ بـۆ بـەرپـاکردنی بزووتنەوەیەکی کورد بە یارمەتیی ئەڵمانیا، لە ئەنجامدا کورد بە مافی نەتەوایەتی بگات و ئەڵمانیاش لە نەوتی عێراق بەرخوردار بێ. [ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٤١ بەرەو نیازی گەیشتن بە نەوت ڕۆیی کە ڕەشید عالی گەیلانی سەرپێچیی لە ئینگلیز کرد و ئەڵمانەکانیش بۆ یارمەتیدانی کەوتنە خۆیان بەڵام ئەو ماوەیەیان چنگ نەکەوت هێزی پێویست بگەیەننە سپای عێراق . م .م .] مولەر دەگێڕێتەوە ڕەمزی لەگەڵیدا دەچێ بۆ ئەڵمانیا. لەوێ لەگەڵ ئەو تاقمەی کە بەشداری دەکەن لەو پلانەدا هەریکی ڕاهاتن بەچەتربازی و خستنە ئیشی لاسلکی و ئەو جۆرە فەرمانانە دەبێ و بەزوویی تیایاندا ماهیر دەبێ.

پلانەکە بریتی دەبێ لەوەی کە مولەر و دوو پسپۆڕی دیکەی ئەڵمان لەگەڵ ڕەمزی بە فڕۆکە بەرەو کوردستان بێن و لە شەودا بە پەرەشووت دابەزن و پێوەندی بە شێخ مەحموودەوە ببەستن. بەپێی گێڕانەوەی د. فەوزی ژووان ئەوە بووە لە دوورایی ١٣٠ کیلۆمەتر لە ڕۆژاوای شاری (ورمێ – رضائیة) بەسەر سنووری عێراقەوە لە شوێنێکدا دابەزن. نووسینەکەی مامۆستا سەرداریش دەڵێ دەبوو لە دوورایی ٢٠٠ کیلۆمەتر لە مووسڵەوە دابەزن، دیارە مەبەست ڕۆژهەڵاتی مووسڵە.

فڕۆکەیەك لە ئەڵمانیاوە دەیانهێنێ بۆ (قرم)، لەوێوە بەرێگەی ئاسماندا بەرەو ئامانج دێن. هەر لەو دەمەدا کە بە زاهیر نزیکی جێ ژووان دەبنەوە و فڕۆکەوانەکە چەند سووڕێك بە دەوری شارێکی کارەباگەشدا دەدات، مولەر دەکەوێتەوە گومانەوە فڕۆکەوان لە جیاتی جێ ژووان لە ڕۆژاوای مووسڵ هەڵیان دەدات. ڕەمزی بەپرسین دەزانێ جێی دابەزینیان کوێیە و چ خزمایەتیی لەگەڵ ئامانجی ئەواندا نییە.

مولەر ڕوونی دەکاتەوە کە هەموو کارەکە لە ئەڵمانیاوە بە ئینگلیزەکان فرۆشرابوو، بۆی دەردەکەوێ کە ئاجەزەکانی لە ئەڵمانیادا هەروەکو لە سەرەتاوە ویستیان تەگەرە بیەخنە پلانەکەیەوە دواتریش کە نەیانتوانی بیوەستێنن بەدوژمنیان فرۆشت.

بەهەمەحاڵ بەرەو کوردستان مل دەنێن و بە مووسڵدا تێ دەپەڕن و لە زێی بادینان دەپەڕنەوە بەرەو هەرێمی هەولێر کە لەوێوە بگەنە شاخەکان لەو ڕەتبوونەیان بەرەو کوردستان جلکی کوردی لەبەر دەکەن کە لە ئەڵمانیاوە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان.. سەرئـەنجام لـە دێیـەکی بـنـەماڵـەی ڕەمـزی خـۆیـان هـەشار دەدەن بـۆ دەرفەتێك.. پۆلیسیش بە دوایاندا دەگەڕێ. ڕەمزی بۆ سۆراغی دۆزینەوەی ڕێگایەکی ڕزگاربوون لە

نەڵمانەکان دوور دەکەوێتەوە، لەو ماوەیەدا خەبەری حاڵ و شوێنیان بە حکومەت دەگات و دەربەست دەکرێن. ڕەمزیش دواتر لە ڕێی خزمی خۆیەوە تەسلیم بە حکومەت دەبێ. لە سەرەتاوە بۆ حەبسخانەی مووسڵ لەوێوەش بۆ بەغدا بەرێ دەکرێن. سەرەنجامیان دەگاتە حەبسخانەی (مزە) لە قاهیرەی میسر. دوای لێدان و ئەشکەنجە ڕەمزی لە بەغدا موحاکەمە دەکرێت و بە ٢٠ ساڵ حوکم دەدرێت، بەڵام بە هۆی ئازاردانەوە تێک دەچێت. دوای بەسەربردنی دوو ساڵ لە بەندیخانە بە نامەی (نەخۆشییەکی کە لێ دەربازبوونی بۆ نییە) عەفوو دەکرێت و هەر بەو دەردەی کە لە ئازاردانەوە دووچاری بووبوو دوای دوو ساڵی دیکە لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا گیان دەسپێرێت.

لە ماوەی حەبسبوونیدا، بە دوا ئەویشەوە کە بەرەڵا دەکرێ خزم و کەس و دۆستەکانی هەمیشە بە دوورییەوە دەبن و بەدەم دڵ ڕاگرتن و خزمەتکردنییەوە لە بارەی چەند و چۆنی بەسەرهاتەکەی پرسیاری لێ دەکەن. ئەویش لەو بارە نالەبارەی نەفسیدا کەموکورتێکی لێ دەگێڕێتەوە بۆیان. پێشیان دەڵێ بە خێر کە چاک بوومەوە هەموو شتێکتان بۆ دەگێڕمەوە.

هیکایەتی ئەو هێندە بەسەرهاتەی دوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا و حەبسبوون و بەرەڵاکردن و مردنی لە سەرچاوەیەکی جودا لە کتێبەکەوە دێت چونکە کابرای نەڵمان لە وردیاتی ئەم لایەنە بێ ئاگایە. بۆ وەدەستهێنانی خەبەراتی ئەو قۆناغە پڕ سفتوسۆیەی سەرگوزشتەی ڕەمزی پرسم لە خزمەکانی کرد لەوانیشەوە چەند لایەرییەکم باسوخواس لەو بارەوە بۆ هات و بەوەدا سەرچاوەکان بوون بە سێ. هەرچەند جوداوازی لە نێوان وردیاتی ئەو سەرچاوانەدا هەشبێ، هەموویان لە شایەدیدان و بۆ مەردایەتیی ڕەمزی یەک دەگرنەوە، هەر ئەمەیشە لەگەڵ ڕاگەیاندنی ڕووداوەکە و لەگەڵ چارەنووس و سەرەنجامی ڕەمزیشدا ڕێک دێت. ئەو لایەڕانە، دوای ئەختێک لێ کورتکردنەوە بەم جۆرە دەدوێن.

ڕەمزی لە ساڵی ١٩١٧ [لە هەولێر] پێ دەنێتە دونیاوە. لە ساڵی ١٩٤٧ [هەر لە هەولێر] کۆچی دوایی دەکات. لە ساڵی ١٩٣٩ بۆ خوێندن دەچێتە زانکۆی ئەمەریکایی لە بێروت و لەوێ پلەی (فرێشمان) تێ دەپەڕێنێ. بەدوا ئەوەدا لە ساڵی ١٩٤٢ دەچێتە (ڕۆبەرت کۆلێج) لە ئەستەنبووڵ. لەوێ پێوەندی بە د. کامران بەدرخانەوە پەیدا دەکات. ڕەمزی ئەندامێکی پارتی (هیوا) بووە و لە کوردایەتیدا دەستی هەبووە. لەم

کولانەوە بەڕێنموونیی کامران بەگ لەگەڵی ئازادیخوازانی کوردی تورکیادا تێکەڵی پەیدا دەکات بۆ بەرهەمهێنانی بزووتنەوەیەکی گشتیی کورد. ساڵێك لەو مەیدانەدا چالاك بووە و یەکێکی لەوانەی پێوەندیی پێیانەوە دەبەستێ (نووری مستەفا بابۆلی) بووە. کاربەدەستانی تورك هەست بە چالاکیی ڕەمزی دەکەن و نیازیان بووە بیگرن و بیگێڕنەوە بۆ عێراق، ئەویش بە یارمەتیی کامران بەگ پەنا دەبەرێتە بەر باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا و پاسپۆرتێکی ئەڵمانیی بۆ ڕێك دەیەخن و لەگەڵ موستەشاری ئەڵمانەکان لە نەمسا بەناسەی ئەوەی کە سکرتێریەتی دەینێرن بۆ سۆفیای پایتەختی بولغاریا [من بەرپرسیار نیم لە چۆنیەتیی لوانی ئەو تەرزە تەگبیرە و پەیدابوونی موستەشاری ئەڵمانەکانی نەمسا لە تورکیا و غافڵبوونی تورکەکان لەوەدا کە بە دوا گاتەوە سکرتێرێکی تازە بۆ موستەشار پەیدا دەبێ ئەمانە لە نووسینی خزمەکانی ڕەمزییەوە بە من گەیشتووە دەرفەتیشم نەبووە تۆژینەوەی تێدا بکەم . م . م]. لە سۆفیا کوڕی شەریف شەرەف - ئەو شەریف شەرەفەی لە بزووتنەوەی ڕەشید عالی بوو بە وصی لە بەغدا - کە دەبینێ ئەڵمانەکان وەها بەرزدی لەگەڵ ڕەمزی خەریکن لێی داوا دەکا یارمەتییەکی بدات بۆ ڕەیێشخستنی حاڵوباری لای ئەڵمانەکان. [ئەم هەبەرە لابەلاییە روونکەرەوەیەکە بۆ پلەی بایەخی ڕەمزی لای ئەڵمانەکان و دەخلی بەسەر شتێکی دیکەوە نییە.م.م] دوای ئەوەی ئەڵمانەکان دڵنیادەبن لەوەدا کە ڕەمزی کەسێکی خاوەن جێ و ڕێیە لە وڵاتی خۆی و کوردێکی پاکە نەجاسووس و نەمفتەخۆرە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٢دا دەینێرن بۆ بەرلین، ئەوسا حکوومەتی ئەڵمانیا دوو تاقمی ڕێك خستبوو لە گەنجانی ئەڵمان، یەکێکیان بۆ پێوەندی بەستن بە ئازادیخوازانی هەڵبجی عەرەبی، ئەوی دیکەشیان لەگەڵ ئازادیخوازی کورد. [دیارە ئەم هەبەرە لە ڕەمزییەوە بە خزمەکانی گەیشتووە. م. م .] ئیتر ڕەمزی پێوەندی بە (مێجەر مولەر)ەوە دەبەستێ و بۆ ماوەی ٣ مانگ خۆی و تاقمەکەی خەریکی گردوکۆیی دەبن. لەو دەمانەدا کابرایەك لە تورکیا بە وەکالەتی ڕەمزی ئەو پارەوپووڵێکی لە عێراقەوە بۆی دەهێت وەری دەگرێت و بەناوی کوردستانەوە بە سەلیمی سووری دەبەخشێت. ڕەمزی لەو ماوەیەدا دەزانێ ئەڵمانەکان بە نهێنی دۆستایەتییان لەگەڵ سوارلغای سەرەك عەشیرەتی بڵباس لە بیتوێنی سەر بەقەزای ڕانیە هەیە.

ڕەمزی مەشقی بەکارهێنانی چەکی نوێی ئەوسا و ڕاهاتن بە ڕۆیشتن لە چۆڵی و

شاردنەوەی ئەو شتانەی لە فرۆکەوە هەڵدەدرێن و ئەو جۆرە فەرمانانە دەکات. لە مارشال کاپتل بەڵێن وەردەگرێ بەهێنانەدیی ئامانجەکانی ئازادیخوازانی کورد بەرانبەر بە ئەوت، هەر لە پێنگەی سەرکردایەتیی ئەویشدا خۆی و هاورێیە ئەڵمانەکانی کە بریتی بوون لە مولەر و هوفمان و کۆنیچین - بە ئەسڵ پۆڵۆنی - سوێند دەخۆن:

رەمزی بە ئالای کوردستان ئەوانیش بە سوێندی رەسمیی خۆیان، کە خیانەت لەگەڵ یەکتریدا نەکەن و هەردوو لا بەڵێن بگەیەننەجێ ئەم کارەش بە بەرپاکردنی شۆرشێکی کورد و هاتنی یارمەتیی پێویست لە ئەڵمانیاوە مەیسەر دەبێ. لە هەمان کاتدا رێگەی یارمەتیی هێزەکان وەیا چەك و ئازووقەی دەوڵەتە سوێندخۆرەکان کە لە رۆژاواوە بۆ رووسەکان دەچێت دەبەسترێ.

لە سەرەتاکانی هاوینی ١٩٤٣ ئەم کۆمەڵەی چوار کەسی بەفرۆکە لە ئەڵمانیاوە دێن بۆ قرم لەوێوەش فرینێکی شەوانە لە دەوروبەری ٢٢ی تەمووز دەکەن بۆ عێراق بە نیازی ئەوەی لە بێتوێن بە چەتر دابەزن کەچی فرۆکەوان لە نێوان مووسڵ و دهۆك دایان دەبەزێنێ بۆ سەر زەوی [بێتوێن لەگەڵ ئەو قسەیەی کە پێی دەبوو لە دوورایی ٢٠٠ کیلۆمەتر دوور لە مووسڵ دابەزن رێك دێت چونکە لە مووسڵەوە بۆ بێتوێن نزیکی ٢٠٠ کیلۆمەتر مەودا هەیە جێگاکەش مەڵبەندی دەسەلاتی سوارآغا بوو. م . م] لەو شوێنەدا چی کەرەستە و پارەی زیاد و چەکێکی لەگەڵیاندا بوو بەجێ دەمێنێ. خۆیان دێن تا لە قەیاغی گوێر بەرەو قەزای مەخموور، لیوای هەولێر، دەپەرنەوە [پەرینەوەیان لە گوێرەوە بۆ بەری مەخموور پتر بەلای ئەو قسەیەدا دەچێ کە پێی لە رۆژاوای مووسڵ دابەزیون نەك لە نێوان دهۆك و مووسڵ چونکە دهۆك خۆی لە بەری رۆژهەلاتی دجلەیە. زۆریش دوورە لە گوێر، بێ لێزوومیش لە شاخەکانیان دوور دەبەخشێنەوە. م .م] شەو لە دێی (تەرجان - بەری مەخموور) دەبن، لەوێوە بە سواریی ولاغ دێن تاکو لە دەموبەیاندا دەگەنە هەولێر. لە باغەکەی پشت ماڵی (عطاء الله ئاغا)ی مامی رەمزی خۆیان پەنهان دەکەن بۆ چلك گۆرین. لەوێوە بە رەفاقەتیی ئامۆزایەکی خۆی (خورشید) دەچنە دێی (بنەسلاوە) کە لە دوورایی ٣ سەعات رێ بە سواری لە رۆژهەلاتی هەولێر کەوتووە. رۆژی دیکە دەچن بۆ دێی (بیوکە) بە نیازی ئەوەی بچن بۆ تورکیا و بەوێدا بگەرێنەوە بۆ ئەڵمانیا چونکە ئاشکرابوونیان هەموو رێگەیەکی سەرکەوتنی پلانەکەیان لێ دەبەستێ. بە تایبەتی کە هەرچی کەرەستە و

پارە و چەکێکی بۆ شۆڕش پێویست بوو لە کیسیان چووبوو ڕێکەوت وەها دەبێ قاچاغچییەکی ئەو دەوروبەرەی (بیۆکە) دەیانبینێ کە خۆی کۆنەفلووسەیی بووە، حکوومەتیش ۱۰۰۰ دیناری پاداش دانابوو بۆ کەسێك خەبەر لەو کۆمەڵە بدات، کابرای کۆنە فلووسەییش خەبەرەکەی لە ڕێی جوولەکەیەکەوە بە حکوومەت ڕاگەیاند. لە پێشەوە ۳ ئەڵمانەکە دەگیرێن. ڕەمزی لەوەدەمەدا لەگەڵیان نابێ. حکوومەت باوك و مامەکانی ڕەمزی دەگرێت. مامێکی، نورالدین ئاغا، بە ئیزنی حکوومەت دەچێ بە سۆراغییەوە و لێی داوا دەکا خۆی تەسلیم بکات و خزمەکانی پێوە ڕزگار بن. ڕەمزی ویستبووی خۆی بکوژێت بەڵام مامی تەمای ژیانی لەبەر دەنێت و دەیهێنێتە سەر تەسلیمبوون [هزمانی هیچ هەوڵێك ئەما ئەیەمن بۆ ڕزگاربوونی ڕەمزی، ڕەنگە هەر ئەو هەوڵەش بووبێ لە ئیعدامی ڕزگار کردبێ] لەوە بەولاوە دەیانێنن بۆ مووسڵ و بەغدا و قاهیرە. لە قاهیرەوە ڕەمزی دەنێردرێتەوە بۆ بەغدا و بە دوا موحاکەمەدا ۲۰ ساڵ حوکم دەدرێ... ئینجا ئەساغی و تەنگچوون و مەرگ..

من چەند جاران لە ڕێکەوتدا ڕەمزیم دیتووە: ئەم دیمەنەی ڕەمزی کە لە یادکردنەوە دێتەوە بەرچاوم، لە قژی زەرد و چاوی کاڵ و ڕووی سوور و بزەی سەرلێوانی کە وەکو شکۆفەی گوڵ هەمیشە لێی چەسپ بوو، لە وێنەشدا خەیاڵی ئەمبردەمەوە بۆ چەتریـازی و گیـانبـازی، بـە پێوانەی ئەو ڕۆژگارە ڕەمزی گەنجێکی خوا پێداوی حەسابەوەی شەنگی بەرچاوی دەسکە گوڵی هیوا لە دەستدا بوو. لەلایەن پێداویستی ژیـانی کـامەرانـەوە ئـەگـەر تـەمـاعیشی تێدا بـەکـار بێت، ڕەمزی بـەولای تێری و دەسەڵییەوە بوو. نیازێك نەبوو لەوانەی دڵی گەنجێکی خوێرتی کوردی ئەوسای بۆ بچێ ڕەمزی پێی نەگات. هەتا خەیاڵی چرووك بە دڵی کرمێدا هاتوچۆی پلانگێری بکات بۆ هـەڵبـەستـنی نیـازێکی فریوّك لە ویژدانی ڕەمزیدا لەوە پتر بەدەستەوە نـادات کە پیاوەتیی وەها مەزن لە ڕەمزییەوە وەك زەهر بێ وەهایە بۆ ناو زار و گەرووی بێگەن. ڕێککەوتنی بێ دەسەڵاتانەی لەگەڵ ئەڵمانەکان بۆ ئامانجی وەها گەش و پاك و گـەورە پـاکـتر بوو لە ڕێککەوتـنی نێوان سـتالین و هیتلـەر چونکە ڕەمزی بۆ ئـاکە مەبەستی وەدەستهێنانی مافی میللەتەکەی دەکۆشا، لەوەشدا ڕێی هەموارتر نەدەکرد بـۆ داگیرکردنـی شوێنـی بـێ لایـەنی وەکو هۆڵـەنـدە و بـەلـجیکـا و دانیمـارك.. بـەر لـە ڕەمزیش خەڵقی دیکە هەبوون بە ئومێدی ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی ئینگلیز و فرەنسای ئیمپریالیست مەیلیان چووبێ بۆ هاریکاری لەگەڵ ئەڵمانیادا. بەهەمەحاڵ میللەتان

کە لە مەیدانی ماقی نەتەوایەتیی خۆیاندا دەکۆشن دەبێ تاکە پێوانەی بەرژەوەندیی بێگەردیی خۆیان بکەنە عەیارەی نرخاندنی هەڵوەستیان، ئینجا ئەگەر میللەتێک هەبێ عەیارەیەکی دیکە لە نرخاندندا بەکار بهێنێ هەڵەی کوشندە دەکات، خۆ ئەگەر میللەتێکی دیکە وەتەنگ هات لە عەیارەی بەرژەوەندیی ڕاستینە و پاکی ئەو میللەتە دیارە هۆی وەتەنگهاتنی دەچێتەوە بۆ چەوتی و نادروستیی عەیارەی خۆی. کوردێکی دەستی کۆتا بێ لە دراوسێکانی، بزەیی دلگیرکەریشی بۆ نەبزوێ چۆن گلەیی لێ دەکرێ مانا بیاتە بە هەرچییەک بێ کە بۆرە ئومێدێکی پێ ببەخشێ بۆ ڕزگاربوون لە زیللەت و کوێرەوەری. ئەو حکوومەتانەی ئەوسا لە خەباتی یەکێکی وەکو ڕەمزی دەترسان لە نێوان خۆیاندا (میثاق سعداباد)یان بەستبوو کە یەکێک لە ئامانج و بەرهەمەکانی سەرکوتکردنی خەباتی میللەتی کورد بوو. حاجی قادر بە خۆڕایی بەر لە صەد ساڵ پتر، نەیگوت:

«گەر هیچ نەبێ بە ئۆێن تابیع بە دەوڵەتێ بن»

لەو ساڵەی ١٩٤٣دا ئەگەر کورد ئاوێکی ڕوونی شک بردبایە بۆ نەتوانەوە و حەسانەوە ئەمەشیا ڕۆڵەی وەها بەناز پەروەردەکراوی خۆی لە باوەشی گەرموگوڕی باوک و دایکییەوە هەڵدات بۆ گاڵتە پەکیان کردن، بۆ ڕێی هاتێک و بە جاران ئەمەات ئەومەندەی بیستبێتم و زانیبێتم، ڕەمزی یەکەم کورد بووە بۆ کوردایەتی، یان بۆ هەر نیاز و تەما و مەبەستێک بێ، بە پێلیژەی هەوادا، لە شەوی تاریکە، سەرەوژێر بووبێتەوە بۆ مەجهوولێکی پڕ لە ترسی سەکەتبوون و ملشکان و مەرگە.

بنەماڵەی ڕەمزی کە ئێستا لە هەولێر بە (حاجی رەشید ئاغا) هەڵدەدرێتەوە لە سەرەتاوە تا دوایی ناحەزی ئینگلیزەکان بوون. جگە لەم هەستە کۆنەی دژایەتیی ئەو بنەماڵە لەگەڵ ئینگلیز، تەجرەبەی خۆیان و تێکڕای کوردیش لەگەڵ سیاسەتی عێراقی ئەوسادا بەرانبەر کورد کە پێوەندیی بە ئارەزوو و بە بەرژەوەندیی ئینگلیزەوە هەبوو، بە ناچاری گەنجی وەکو (ڕەمزی)ی دەبردەوە بۆ لای نزیکی لەو سیاسەتە. لەم ڕووەوە چ سەیر و سەمەرە لەوەدا نییە گەنجێکی ئەوسای کورد ڕێگایەکی خەبات بگرێتە بەر پشت لە ئینگلیز بێت، تەنانەت پیاوێکی مەلای سەر بەرماڵی وەکو باوکم پاتەیات گوتبووی:

«سووری مووزەردی چاوشین ئەکەی بە ئومێدی بی»

بەڵێ لەوەدا سەیرماتنەوە پەیدا نییە بەلام سەیر لەوەدایە یەکێکی وەکو ڕەمزی زیاد

لەو هەموو خەلق و هوایە خۆ بە مل شەپۆلێکدا بدات ئەوەندەی لە مەرگ نزیك بکاتەوە ئەگەر ئاگری کوردایەتی مێشکۆڵەی ناو ئێسکەکانی ئەسووتاندبایە ئەو گورەی پێ نەدەبەست کە یەکەم هەنگاوی بە (مل لە چەقۆ) خشاندن دەست پێ بکات، چونکە بە ڕاستی خۆهەڵدان بە چەتر لە تاریکایی شەودا مل لە چەقۆخشاندنە. تۆ لەوە بگەڕێ ئایا هیچ جۆرە سەلامەتی لە بەرەنگاربوونی ئامانجی وەها سەخت و دووردەست بەدڵاندا دێت یان نا، هەر لەوە تێ بفکرە ئایا چەند کەسی تێر و تەسەڵ ئامادە بوو لە جیاتی ڕەمزی بەو فڕۆکە لە فریمەوە بە شەو ڕوو لە بیتوێن وەیا هەرێمی (وەرمێ) بکات و لەوێ بە پەرەشووت خۆ فڕێ بدات بۆ ئەوەی کە بە سەلامەتی گەیشتە سەر زەوی بیکەن و بە وەزیر؟ لەوەدا مل شکان و کوژران و تێداچوونم کردە هاترلنەی ئەو کەسانەی فکر دەگێڕن بەدوا بەهانایەکی لە ڕەمزی بەداوێوە بکرێ.

لەلایەن درەختی خانەوادەییەوە، ڕەمزی کوڕی ئاقیماغای حاجی ڕەشید ئاغای یەحیا غای عەبدولوەهاباغای ئەحمەد ئاغای هارساغایە لە عەشیرەتی مەموندی، ناوچەی مەموندی بناری چیای سهیلك نزیکی دێی سیساوا، بەسەر ڕێی نێوان شەقڵاوە و ڕەواندزەوە لە سەردەمی هارساغا، یان باوکی ئەو کە ناوی بۆم ڕوون نەکرایەوە، بنەماڵەکە دەگوێزێتەوە بۆ هەولێر و دەبن بە خاوەن مڵك و ماڵ و دیوەخانە هەروەك لە شوێنی خۆیاندا خاوەن مڵك و دیوەخانە بوون.

ڕەمزی لە لای دایکەوە دەچێتەوە بۆ میرەکانی شەقڵاوە کە وەك بزانم، خوارزای میرانی قادر بەگ و نەوەی میرانی موستەفا بەگ بووە. بەمەدا دیارە ڕەمزی بە ڕیشە و دەمار لە جەرگەی کوردەوارییەوە سەری هەڵداوە. وەك بشزانم ڕەمزی هەرچەند، بە اصطلاح، لە ناز و نیعمەتدا پەروەردەی هەولێر بوو، لەلایەن ڕەوشت و ئەدەبیات و ڕەفتارەوە دەماری گیانی عەشرەت و دەشت و دەری بەهێزتر بووە.

خوێنەری کوردی بەڕێز!

چی لەم ڕووپەڕانەدا هاتە بەر نیگات بایی ئەوە بوو قەرزی ئەدەبیی سەر شانمی پێ بدەمەوە بە کورد و مێژوو.

نەخشەکێشانی ئەو ژیانە کورتە ناکامە جوانەمەرگانەی ڕەمزی و دۆزینەوەی هەستە قووڵەکانی و باسی سەرجوملەی کۆشان و لەخۆبووردن و ڕەفتار و کرداری کارێکە دەبێ لە دەمی وەرگێڕانی کتێبەکەی مولەر بۆ سەر زمانی کوردی ئەنجام دریێت. لەم هەڵوەستەمدا هەر ئەوەندەم بۆ دەمێنێتەوە بڵێم:

ڕەمزی! ڕۆڵەی بە شەرەفی کورد و هەولێر! ئامەوێ لە بیرەوەریتدا چەتری فیز و ناز بە قەڵەمەکەم لێ بدەم و بڵێم، بێی ئاوێ بۆ شەهیدان شێوەن و گرین.. بە هەموو ماناوە شاگوڵێك بوویت لە باغی کوردایەتیدا، بەر لە پشکووتن هەڵوەریت.. ئاواتێك بە ئاکامی لە کیس نیشتمانت چوویت.. بڕەیەك بوویت، لە شەبەقی بەهاریدا، بەر لە خۆرهەڵات بەسەر لێوانەوە وشك بوویتەوە. وای لە ڕەنجی بەفیڕۆ ڕۆیشتووت..

وای لە ژیانی بێ ئامان و سامانی میللەتەکەت بە کوژانەوەت..

وای لە بێ ڕەحمیی ڕۆژگار بە تەنینەوەی فەرامۆشی لە دەوری پرشنگی ناو و هەبانت!

بڵێم حەسامەوە بە ڕزگاربوون لە شەرمەزاری بەرانبەر یادت؟ چاری ماوە بۆ خۆم و لە جیاتی میللەتیشت بەرباری قەرزت بم. هەزاران هەزار فرمێسکی بە کوڵ بۆ سەر خاکی قەبرە پیرۆزەکەت، نازداری کورد و هەولێر ڕەمزی گیان!

ڕوونکردنەوەیەك:

لە ساڵێك زیاترە بە هەوەیابووم بۆ یادکردنەوەی ڕەمزی دووانێك لەگەڵ مامۆستا د. ئاوڕەحمان عەبدولڵادا بکەم بۆ تۆمارکردنی ئەو هێندە ئاگادارییەی کە لە بارەی چەندوچۆنی بەسەرهاتەکەی ڕەمزییەوە پێی گەیشتووە. لەو ساڵەی ١٩٤٣، د. ئاوڕەحمان (ضابط احتیاط) بووە لە (حامیە)ی هەولێر. ڕووداوی دەستگیربوون و حەپسکردنی ڕەمزی و نەخشەکانی لە بەرپرسیاری پۆلیسی هەولێر بەدرێژی بیستبوو، زۆر شایەدیی بایەخداریشی دەماویەم بێ گەیشتبوو لە نەخشەکانەوە دەربارەی پلەی کوردایەتی و مەردایەتیی ڕەمزی. داخم ئاچێ، لە ماوەی ساڵێکدا ڕێك نەکەوت ئەو دووانە لەگەڵ شایەدی وەها چاوساغ و ڕاستگۆدا بکەم، سەبەبیش دەچێتەوە بۆ گەڕانی بێ سوودم بە دوا نەخشەنزانێکی ئەوتۆ ڕوونکردنەوەی تەواوی کتێبەکەی مولەری لێ دەبێتە بارگرانی، یان فەرمانێکی ڕەزلگران. تکای کوردانەم لە دۆستی بەڕێزم د. ئاوڕەحمان ئەوەیە چی دەمزانێت، یان چیی بە بیردا دێتەوە لە بەسەرهاتی ڕەمزی بە نووسین بیهارێزێت، ئاخر بەساڵداچوونیش دەماری فەرامۆشکردن لە مرۆڤدا ئەستووتر دەکات. وا لێرەشدا بە ئەرزی هاندان و ئەو شایەدییەی لێ دەدەم ئاکو ئەمانەتەکە پشتگوێ نەخات و لە فۆتانی چەهارە بدات.

کاروان، ژمارە ٣٣، ١٩٨٥

# میرزا حاجی کەریمی ئاسنگر

## سەربازێکی بێ ناو

بەدڵنیکی ئاناراممەوە دەڵێم، لەوانەیە گوتەی «بەخت و تاڵع بۆی هەیە» بێننکی ڕاستبوونی پێوە بێ. لەوە بگەڕێ کە زۆر کەسی کەمزان بێ ماندووبوون و دەردی سەر، چ لە ڕێی میراتەوە بێ و چ لە ڕێی ڕێکەوتی بانەسیب و پارە دۆزینەوە بێ، تێروتەسەل و حەسایەوە، بەسەر دەبات ژیانێکی مزۆکە ڕادەبوێرێ. لە دەرەوەی مەیدانی پوول و پارەش کەسانی وەها هەن ناو لە خەسڵەتی چاکەی وەکو سەخاوەت و ئازایی و دڵسۆزی دەربەکەن چەند جاران لێیان زیادە. بەرەو ڕۆشنبیری و ئەدەب و هونەرەوە بێیت دەبینیت شاباشی (ئافەرین، ئافەرین زارخۆش...) بۆ بەرێی مرۆی ئەوتۆوە هەڵدەدرێ مەگەر هەر خۆی بزانێ بەرگێکی چەند پان و درێژ لەبەر لەشی کورت و باریکی دەکەن. ڕاستییەکەی، قسە قسە دەهێنێ، مەسەلەی ڕۆشنبیری و پلە و پایەی لێهاتوویی بووەتە خزم خزمێنە وەکو کابرای عەرەبی سەر بە (مسیلمة الكذاب) کە گوتی: خۆ دەزانم پێغەمبەرەکەمان درۆزنە بەڵام هی خۆمانە.

ئەم لایەنانە لە ژیانماندا وەك لە ژیانی گەلانی دیکەی پاشکەوتووی جیهاندا، تا بڵێی بە تاڵی لە گەرووی دەچێتە خوارێ بەڵام لە چاو تامە زەهراوییەکەی بەخت و تاڵع و خزم خزمێنە و لایەنگیری لە مەیدانی کوردایەتی و نیشتمانپەروەریدا تاڵایی ئەو لایەنانە بەرەو شیرینی دەچێتەوە چونکە خۆ نەناسکردنی گشتی لە پاکترین هەستی دەروون کە کوردایەتییە تا ئەوەی خاوەن ماف تیفلاس بکات و بێ مافیش ئازوفەز لێ بدات، ئێسکە ماسییە و بە گەرووی ناچێت، هەزاران خزیەخنکردووی ڕێی ئازادی ناویان لە ڕووپەڕەی بوونەوەردا دەسڕێتەوە. هەزاران لەو هەزارانە هەر لە سەرەتاوە بێ ناو بوون و بەبێ ناویش چوونە ژێر خاك، نەکەس ناسینی و نەکەس فرمێسکێکی بۆ هەڵڕشتن و نەکەس فاتیحەیەکی نابەدڵیشی بەدوادا هەناردن، کەچی دایکی جەمال و مریەم خان لەوانەن سبەی ڕۆژ پەیکەریان بۆ داتاشرێ یان فێرگە و هۆڵی مۆسیقایان بەناوەوە بکرێ. قوربەسەریان ئەگەر نیشتمانپەروەر دەبوون، دەرووتانەوە چونکە بەر لە هەموو شتێك دەبوو واز لەو کەسە بهێنن کەوا هەرچەند لەگەڵ نیشتمانپەروەریدا

ڕێك ناكەوێ هەر خوێەتی ناویان بۆ نزیك ئەستێرەكان بەرز دەكاتەوە..

لێیان پیرۆز بێ.

تاڵع و بەخت بۆی هەبێ و نەبێ، ئەگەر ئێمە باری سازگار نەڕەخسێنین زۆر بەختی ڕێ و جێ ناگەشێنەوە. دەبینیت نووسەرێك دێت و مۆژدەی دۆزینەوەی شاعیرییەتێكی بێ ناومان دەداتێ. ماڵت ئاوا كاكی نووسەر، دیوەخانەی ئەدەبی كوردیت بە تازە میوانێكی سەر سفرەی ئەدەب گەرمتر كرد.

كەچی شەرم بڕەمێك لە شیعرەكان دەخوێنیتەوە ئاگا بە خڵت و خاشی شیعری شاعیرێكی پلەی سێیەم و بەرەژێرتریش.

حەماسەتی دوای ڕاپەڕینەكەی ١٩٤٨ كە (وثبە)ی پێ گوترا زمانەی دەكێشا. شاعیر كووچە و مەیدانەكانیان پڕ كردبوو. نركەی سینگ و گەرووی هوتاف كێشان بوو. شەڕە چەپەڵۆك بوو. بینیركێی چوونە پێشەوە بوو، هەرایەك بوو خوا بەخۆی بزانێ، چ پشكی كوردیش لەو بەرژەوەندەدا نەبوو كە هەرای بۆ دەكرا، بەرژەوەندەكەش نەهاتە دی. تازە برین و گەرماوگەرم پارچە هەڵبەستێكی ئەو ڕۆژەیان بۆ خوێندمەوە هەتا بڵێی قەڵب و بێ نرخ.. گوتم منیش دەزانم شیعری وەها چرووك و بێ ئارایشت هەڵبەستم، فەرموون گوێ بگرن:

دەڕۆم نازانم دنیا زۆر سەیرە
كۆترە باریكە و پەنیری مەیرە

دڵشاد ڕەسووڵی لێم بەدەنگ هات و گوتی. فڵان غەدر لە شیعرەكەی خۆت چونكە هەر نەبێ بە (تصوف) واتای بۆ پەیدا دەكرێ. كۆترە باریكەی باڵندەی هێلكەكەر گۆشتیشی ناخورێ. ئاژەڵی بێچوولەبەر شیرەكەشی دەبێتە خۆراك بە ماست و پەنیر و ژاژی و كەشك. نا ئەمەتە گەورەیی و شكۆی پەروەردگار حەقتە سەرت لێی سوڕ بمێنێ و دنیات بەلاوە سەیر بێ. دڵشاد، خوا لێی خۆش بێ لێم نەگەڕا دەنا منیش دەبوومە شاعیر.. دووكەڵی شەقەی سەر هێڕی گەرم..

زەق زەق دەبێكی گاسنی نەرم.
ئەم سەد ئەم ئاقار بە ئاقار.

ئەژماری داری بەختی سەر تەختی تەنگی ئیستیعمار..

بمرێ مار و هار.

ئێنجا ئەگەر خوێنەر لێم بپرسێ ئەم قسە تێک هەڵشێلانە چ پێوەندیی بە میرزای حاجی کەریمەوە هەیە. پێی دەڵێمەوە میرزاش لە فەراموشبوونیدا بەر هەڵشێلانێکی ئەوتۆیی کەوتووە لە دابەشکردنی ناو و شۆرەتی مۆرخاسیدا بە تێکهەڵدایی و بێ سەروبەری و ناڵەبارپی سەرخەرمان و بنخەرمان چووە هەگبەی کەسانێکەوە کە زۆریان ئەوەندە پاداشیان بەسە لێیان بێدەنگ بێت.

میرزای حاجی کەریم یەکێکە لەوانەی پشکی لە بەرەکەتی خزمەخزمێنە نەبوو. زۆر عەجایبم هات کە بیستم عزمانی پێیان خۆش بوو بڵێنم داوە لەسەری بنووسم، سەرکەوت هەقیشم بوو چونکە کەسیان وەڵامی هیچ یەکێک لەو پرسیارانەیان نەداوە کە بەعادەت ڕوو لە نووسەر دەکەن. لە چ بنەماڵەیێکە؟ هی لای باوکی و لای دایکی؟ کەی هاتە دنیا؟ منداڵییەکەی؟ خوێندنی؟ ژیانی وەزیفەی؟ کەی بوو بەئەندامی پارتی؟ لەو ڕۆژەوە کە داوام لێ کردن ئەو هەواڵانەم پێ ڕابگەیەنن تا ئەمڕۆکە (١٩٨٦/٥/٢٧) دوو سێ مانگ تێ پەڕیوە. لەو ڕۆژەی بەڵێنەکەشم تێدا بڵاو کردەوە تا ئەو ڕۆژەی تەکلیفم لێ کردن نزیکی دوو مانگێک تێپەڕی بوو. ڕەنگە هێندەی دیکەش تێ بپەڕێت و هیچ شتێکم لەبارەی میرزاوە پێ نەگەیەنن. ناچارم پشت بە ئاگادارپی خۆم دەبەستم و چی دەزانم ئەوە دەنووسم. ئەوی دەشیزانم لە جیرانەتی و هاوڕێیی و هاومەشرەبی و بەردەوامبوونی برادەرایەتی و ئەو جۆرە پێوەندییانەوە دێت. مەگەر بەسەهوو دەنا ڕێی بەهەڵەداچوونم زۆر فرەوان نییە. سەهووش بکەم لە بابەتی بنەمایی و پایەداردا نایکەم.

وەك بزانم بنەماڵەی ئەو مرۆیە چەند پشتێك لەمەوبەر لە لادێوە هاتوونەتە کۆیێ. بەپێی دەماری دۆستایەتی و هاتوچۆ ڕەنگە لە دێی (الا اللە ئیللەڵڵا)وە ڕایان گوێستبێ. نازناوێکی (چێڵێ)یان لەگەڵدا هاتووە پێ دەچێ لە پاش ماوەی لادێیی بۆیان مابێتەوە کە ماوەیەك لە شار چێڵیان بەخێو کردبێ.

ئەم نازناوە دەمێکە لە بیران چووەتەوە چونکە چینی تازە و چینە مزاشەکەی پێشتریش لە بارێکەوە ئەمان بە گەرموگوڕی ناوی لە ڕەچەڵەك و بنەچەك و کەی و کوێی خۆیان بدەنەوە بە زۆری خەریك بوون بەرەنگەکانی پەلکەزێرینەی سیاسەت و تەنگ و چەڵەمەی ژیان و هەڵسوکەوتی ڕۆژگار. ئێستا کە گەنجێکی کورد پشتاوپشتی لێنێن و ماو باشتر دەزانێ لە هی خۆی.

حاجی کەریم، باوکی میرزا، جیرانێکی نزیکمان بوو، لە گۆشەیەکی سەربانێکمانەوە بۆ بانی ماڵی ئەو دەمەترێك دوورایی هەبوو، لە دەرگەشمانەوە بۆ دەرگەی ماڵەکەی لە ٤٠ مەتری تێ نەدەپەڕاند. حاجی کەریم و سۆفی ئەشنەتی برای و تاهیری حەمەلاڵی برای لە دایکڕا، بەدرێژایی ژیانی باوکم لە هەموو دانیشتنێکی ماڵەوەی یان لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد بەشدارییان دەکرد هەتا مەجلیسەکە بڵاوەی لێ دەکرد. حاجی کەریم ئاسنگر بوو. لەلایەن ئاکارەوە پیاوی وەها شەرم بەخۆ و دیندار و ڕاست بەدەگمەن پەیدا دەبێ. لە هیچ کەس نەبیستراوە ئەم خوانانسە پێی بەخواری دانابێ. دەنگێکی بە سۆزی هەبوو، لە قامەتی پێشنوێژ و لە تەنزیلەی موناسەبەی دینیدا ئەو سۆزەی سەرنجی خەڵقی ڕادەکێشا. چەند ساڵێك دوای باوکم ژیا بەڵام ساڵی مردنیم لە بیر نییە. بنەماڵەی حاجی کەریم هیچ پێوەندیی بە ئاغا و پیاوی دنیاییەوە نەبوو.

دایکی میرزا کچی حاجی حەمە ڕۆمی بوو. من منداڵ بووم ئەم مام حاجییە کۆچی دوایی کرد. ماڵەکەی لە مزگەوتی کۆنە جومعە و ماڵی جەمیلاغاوە نزیك بوو، لە ماڵی ئێمەش دوور نەبوو بەڵام نوێژی لەو مزگەوتە دەکرد، وەك بزانم دیواریان بەین بوو. کوڕە گەورەکەی فەقێ تەها، خاڵی میرزا، جلدرووییەکی بەرچاوی کۆیێ بوو، وەکیل خەرجی باوکیشم بوو لەو کەمتاکورتە داهاتەی ئاوشار کە بە میرات مابووەوە بۆی.

فەقێ تەها بێ پرس و دەرگە لێدان دەهاتە ژوورەوەی ماڵمان، هەموو جارێکیش باوکم بۆ سەفەری هەولێر لەگەڵ خۆیدا دەیبرد. هەموو هاوینێکیش دەهاتە چناڕۆك چەند هەفتە لای باوکم دەمایەوە. فەقێ تەهاش دەنگخۆش و شارەزای گۆرانی کوردی بوو. جارێکیان لە بن سوولی پاشای چناڕۆك تەخمیسێکی نەدیبی بەسەر غەزەلێکی تاهیر بەگەوە خوێندەوە سەرەتاکەی دەڵێ:

«سەرفی عومرم کرد چوو ڕەممالان بە زەوج و فەردەوە»

بەڵام وشەی (ڕەممالان – ڕمالان)ی بەهەڵە وەرگرتبوو بووبووەوە (زەممالان یاخود زەممالان)، من شلك بووم تێی نەگەیشتم و بۆم ڕاست نەکرایەوە، خۆیشی هەروەها بۆی نەچوو. ڕام کردە لای باوکم، ئەو بۆی ڕاست کردینەوە بە (ڕەممالان) و واتاکەی تێ گەیاندین: تەمەنی خۆم وەك ڕەملگرەوە بە تاك و جووت سەرف کرد. وەستا تەها تا دوو ساڵێکیش دوای شۆڕشی ٩٥٨ ژیا.

سۆزی دەنگی حاجی کەریم و سازگاریی دەنگی وەستا تەها بە جووتە لە دەنگی میرزادا دیاریان دابۆوە. بەڵام جارێ زووە بۆ باسی ئەم لایەنە.

میرزا بە دوو سێ ساڵ لە من گەورە تربوو هەرچەند ناتوانم ساڵی لەدایکبوونی بهێنکم. لە لایەن بەشداریکردنی گەمەی منداڵانی گەڕەک، میرزا بەهۆی دوکانی باوکییەوە بە زۆری پاش بەسەرچوونی خوێندنی ڕۆژانەی سەراسۆیی کەسبی باوکی دەکرد بێ ئەوەی شاگردی بێت، بۆیەکا کەم دەیتوانی عەسران لەگەڵماندا خەریکی گەمی هەمەچەشنەی منداڵان بێت، لەشیشی بەهەرییەوە نەبوو تەقڵ و شەقڵی یارییە قورسەکان هەڵگرێت. زۆر جاران دوای ڕۆژاوا یان لە ماڵی ئەوان یان ماڵی ئێمە تۆڵەی عەسرانمان دەکردەوە بەیاریی ناو خانە نەک هی گۆڕەپانان.. هەروەک عەسران ئەدەماتە یاریی منداڵان شەوانیش ئەدەماتە یاریی ئەوانەی وەکو هواجەڕۆیێ (خوازەڵێ) و زرینگ زرینگ تاوە و بەردەگەڕمۆکێ کەلە کووچەی بەردەکی ماڵەکەیان بەرپامان دەکرد، لە سەیرانی بەهارانیش بەشدار نەدەبوو، ئەشەدیت لەگەڵ کەس بەشەڕ بێت، تەبیاتی بەرەو هێمنی و ئارامییەوە بوو لەگەڵ لاوازییەکەی ڕێک دەهات.

دەڵێن مانگەشەو سەر لە ئێوارانەوە دیارە. ئەم گوتەیە ئەگەر لە ئاست مانگی حەقدە و هەژدە شەوی ڕاستیش نەبێ، منداڵییەکەی میرزا لە هێمای بەرەو دواڕۆژی ڕاستگۆ بوو. لەلایەن دەنگخۆشییەوە کە گەیشتە تەمەنی ١٥ – ١٦ ساڵی بە بەر دەنگییەوە هەبوو بەکاتە گۆرانیبێژێکی پەنجەنیشان. دەنگێکی پڕی مەخمەڵیی بێندرێژی سەرەژوور چووی بە لەرەولەرزەی سازگاری هەبوو لە تایبی دەنگی تاهیر تۆفیق، فەرید ئەطلەترەش، عەبدولوەهاب بەڵام هی میرزا ئەگەر لەلایەن پسپۆڕانەوە مشتوماڵ درابایە و ڕاهێنرابایە بەرەو ئۆپەرالییەوە دەچوو. هەتا بەرزی دەکردەوە لە پانایی و ئەستووراپی کورتی نەدەهێنا و باریک نەدەبووەوە لە تەمەنی ١٧ – ١٨ ساڵی بوو، سەبەینەیەک پێش بەرچایی بەیەکەوە لە بن دارەبارەکانی کانی هاتوونی چنارۆک بووین: دنیایەکی گەش و فێنکایەتییەکی بەهەشتی و کزەبایەکی عاشقانە و دڵ و دەروونێکی ئاسوودە لەو دەمەدا دەنگی بە میرزا هەڵبڕی و گۆرانییە مەشوورەکەی ئاوسای (یا لوعتی)ی عەبدولوەهابی بە ئاگرۆچکە لە دەروونییەوە دەرهێنا و بەسەر ئەو باغ و مەزرایەدا شەپۆلی پێ دا. کە گەیشت (ومن قلبی طاوعته ورحت بایس ایدیه) سۆزێکی ئەوەندە هەست لە دەنگی گەڕا ئاوی لە چاوی من و خوێنی هێنا. پشوویەکی کورتی دا ئەمجا گۆرانییەکەی بۆ تەواو کرا. دوای چەند ساڵێک لێی پرسیم: تۆخوا ئەو

سبەینەی کانی خاتوونی چنارۆک یا لەوعەتییەکەم لە عەبدولوەهاب باشتر نەگوت؟ دەسا ئەشەدوبیللا باشتری گوت. لە دانیشتنی برابەرانەدا ئەگەر دەنگی هەڵێنابایە گۆرانیی کوردیی دەگوت. لە چ دەنگخۆشێکم نەبیست (وەک قومری سەربالم شینە)ی بەکوڵ دەربڕیبێ وەک کە لە دەنگی میرزادا ئاوڕینگی گەرمایی و سۆزی دەدایەوە بەڵام بەو هەموو دەنگە خۆشەیەوە حەزی نەدەکرد ناو بەگۆرانیبێژییەوە دەر بکات، هێندەش خۆی لێ دەپاراست کە کەس بەراشکاوی داوای گۆرانی گوتنی لێ نەکات. وەک کە بەسەرنجی دوا کاتەوە لێی ورد دەبینەوە، ئەم تەبیعەتەشی دەچووەوە بۆ مەیلە بنەڕەتییەکەی دژی خۆنیشاندان و دەرکەوتن و ناووشۆرەت. حەزی لە ڕابواردنی بێ هەرای خاڵی لە ئەرکی ناووشۆرەت بوو. دواتر بۆ ئەم خاڵە دێمەوە.

لە هێماکانی منداڵییەوەی ئەوە بوو کە لاشەڕ بوو. نە بە منداڵی و نە لە گەورەییدا، نەمدیت بەدەمەقاڵ بێت یان لە موناقەشەدا سوور هەڵگەڕێ. ئەم لاشەڕییەی و مەیلی سەلامەتی وێڕای خەسڵەتێکی دیکەی کە هەر ئێستا دەیگەمێ، لە سەرەتاوە ڕارەوی ژیان و گوزەران و بەسەربردنی دواڕۆژی بۆ ڕەنگڕێژ کرد. لە هیچ پلەیەکی تەمەن و قۆناغێکی دواتریدا نەکەوتە سەر زۆرەملێ لەگەڵ ئەم و ئەودا بۆ تەمای بەرەوپێش چوون و فرەکردنی ڕزق و ڕۆزی و دەسەڵات گرتنەدەست. هەر چونکە ڕازی بوو بەو قسمەتەی بۆی هەڵکەوتووە بێ ئەوەی کەسی تێدا مەغدوور کرابێ بۆیەش بوو بە توندی، بەڵکو بە پەرۆشەوە لەسەر مافی ڕەوای خۆی دەکردەوە ئەگەر لەوەدا سەریش نەکەوتایە پەشیمان نەدەبووەوە و خەفەتی نوێی لە سەرنەکەوتن نەدەخوارد، لەتێش لە سەرنەکەوتنێدا ئەو پەندەی بەکار نەدەهێنا کە دەڵێ: دەستێکی نەتوانم بیبڕم ماچی دەکەم. دەستەکەشی پێ نەدەبڕدرا و ماچیشی نەدەکرد. لە نموونەی مافپارێزیی ئەو مرۆیە ڕووداوێکی کورتیلەی لێ دەگێڕمەوە لە سییەکاندا کە من بە مێوانەتی لە ماڵی مەلا ئەفەندی قوتابیی فێرگەی ناوەندیی هەولێر بووم، میرزا کاتبی دادگەی کۆیە بوو. ڕۆژێک، سەر لە سبەینە کۆییەکی دیکە کە لە دوورە وڵاتان کاتبی دادگە بوو فەرمانی ڕاگوێزرانی خۆی بۆ کۆیێ و هی میرزا بۆ شوێنەکەی ئەو دەهێنێتە سەر مێز و بە فیزێکەوە پێی دەڵێ: هەڵسە لەسەر کورسییەکەت، بووەتە هی من. میرزا هەر ئەو ڕۆژە هاتە هەولێر.. بردمە خزمەت مەلا ئەفەندی، نامەیەکی سفارشی لێ وەرگرت بۆ کاربەدەستێکی گەورەی بەغدایێ (وا بزانم وەزیری عەدل). لە سێ ڕۆژاندا بە خۆی و ئیلغای فەرمانی پێشووی گەڕایەوە کۆیە و هەر لە دەوامی ڕۆژی سێیەمدا (یان

چوارەمدا) فەرمانی نوێی خستەوە سەر هەمان مێزی کە (ماڵی باوکی کەس نییە) بە ناردراوێژی ئاخافتنەکەی بەر لە چوار ڕۆژان پێی گوتەوە: هەڵستە لەسەر کورسییەکەت ... هەر لە بەهرمە کە مەلا ئەفەندی گوێی لە ناوەکەی میرزا بوو بەزەردەیەکەوە فەرمووی: کوڕم چما ئەتوو عەجەمی؟ میرزا گوتی: جەنابی ئەفەندی خەریکم بکەومە شك دەنا ئەگەر عەجەمم ئەبم لۆ ئەقلم دەکەن.

خەسڵەتەکەی دیکەی کە تەواوکەری لاشەرییەکەی بوو بریتی بوو لەوەی کە لە زوویکەوە خۆی ناسی (چەند دەخوا و چەند دەبەزی): پلەی زەکای خوێندنی فێرگەی ناونجی بوو، مێزی ماسوولکەکانی لە ماسناوەنجیش بەرموێژتر بوو. لە دەسەڵاتی دنیایی ئەوەندەی هەبوو کە خانەوادەیەکی شارستان بەناموسهاریزی و پێزی خۆراگرتن و سنوورنەبەزاندن پەرژینی سەلامەتی بە دەوری خۆیەوە دەتەنی. بە کورتی، موعامەلەی کۆمەلایەتی و باری کەسایەتیی سروشتکرد لە میرزادا سازابوون و لەنگەرێکی بەستبوویان لەق نەبوو. ئەمەیش کە من دەیزانم و لەگەڵ خۆمدا وردبوونەوەم تێدا کردووە یەکجار پارەدەی میرزایان دا کە هەنگاوەکانی لە هەڵسوکەوتی ژیاندا مەحکەم بن و بەملا و بەولایدا نەبەن. بەدرێژاییی وەزیفە بینینی شتێکی نەکرد ناچار بێ بەشاردنەوەی. هەرگیز بەرتیلی وەرنەگرت و پارەی لە کەس قەبووڵ نەکرد لە چارێك بەولاوە کە ئەویش ناوی بەرتیل هەڵناگرێ. کە کاتب بوو لە دادگەی کۆیێ توجارێك دەعوای هەبوون لێیان بەهەلە بوو. میرزا بەخۆمی گوت کە دوای دەوام، عەسران، دەچوومەوە بۆ دایەرە بەتنیاێی ڕاپەڕاندنی شکلیاتی دەعواکان و بەس. گوتی خۆ خزمەتکاری بابی مام حاجی ئەم، لە دەوامدا دریغ ناکەم لە فەرمانم، دوای دەوام ئەرکی بێ مزە هەڵناگرم ئەو ئیشەم بە پارەی ئۆفەرتایم بۆ مام حاجی کرد، دەستیشی خۆش بێ.

گوتم دواتر دەگەڕێمەوە بۆ خەسڵەتی حەزنەکردنی لە ناووشۆرەت.

چی تازە نووسیم لە مێماکانی سەرەتای ژیانی تێمان دەگەیەنێ کە مرۆی ئەوتۆیی لە کۆڕی سیاسەت و هەیاتیشدا تێزیۆ نابێ:

میرزا نموونەی واقیعبینی و بایەخناسی ناو بزووتنەوەی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی بوو. هەروەك شارەزای خۆی بوو (چەند دەخوا و...) هێندەش بە ڕوونی دەیدیت و دەیزانی، خۆ ماندووکردن بە شتی ناموەکین لە هەر مەیدانێك بێ کارێکی

ئەزۆکە. دەیزانی، چاکیشی دەزانی خەیاڵبازی و منداڵبازاری و قوتەقوتی سینگ دەربەڕینان و ئەرمەنەری ژێر دروشمی وێنەکرد هەمووی هەر تەلەزگەبەستنە بۆ ناو هیچە. کە ئەمە باوەڕی بوو لێشی ڕوون بوو نیشتمانپەر و کوردپەروەر و تێکڕای سیاسییان ڕێی واقیعییەتیان لە خۆیان کوێر کردووەتەوە تا ئەوەی یەکێکی بە مومکین رازی بێ ڕووت دەبێتەوە لەمەوە میرزا یەکجارەکی دەماری چوونەڕێزی پێشەوەی سیاسەتی لە دڵی خۆی دەرکێشابوو. بەزۆرەملێش ئەیدەسەلماند بکرێ بەچاوساغی بچووکترین تاقمی خەباتکەران. ئەم باوەڕە و تەبیاتی لەسەرەخۆیی هەمیشە لە ڕیزی هەرە پشتەوەی حیزبایەتیدا میرزای شاردەوە.

میرزا دوو ساڵێك بەر لە من قوتابخانەی سەرەتاییی کۆیەی تێ پەڕاند. تا من دەرچووم و دوو ساڵانیش دوای دەرچوونم ئینجا چووم بۆ ناوەندیی هەولێر، ئەو خوێندنی ناتەواوی هەولێری جێ هێشتبوو بۆ قوتابخانەیەکی کەم مەسرەفی کەم ماوە لە بەغدا.

بەردەوامنەبوونیشی لە هەولێر هەر دەچێتەوە بۆ بنەمای خۆناسین و توانای بیندرێژی و کورتی لە پلە دوا پلەی ناوەندی و سانەوی و... شەڕی بە خۆی نەفرۆشت و خێرا سەلماندنی ئەم سەفەرە درێژەی خوێندنی سەرلەبەر و سەرتاسەر قاچ و قولێکی درشتتری دەوێ لە هی ئەو کە بە منداڵیش سێ بازی پێ نەکردبوو. لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی خوێندنی کۆیەی بوو بە قوتابیی (دار العلوم)ی ئەعزەمییەی بەغدا. نە خۆی و نە هاوڕێکانی کوڕی ئەو مەیدانە نەبوون بەڵام تەمای ژیانی داخلی و مەسرەف گێڕانەوە، کە ئەوسا بە زەحمەت پەیدا دەکرا، بۆ ئەو شوێنە ناچۆرە دڕیایەتەی بردن. ساڵەهای دواتر گاڵتەی بە سەر و مێزەر و جبەی بەر خۆی و قوتابییەکانی دیکە دەکرد و نوکتەی لەسەر دەهێنایەوە کە خۆیشی دەگرتەوە.

هاوینی ١٩٣٥ لە کەرکووکم دیتەوە بە کاتبی (وا بزانم دادگە). ئەو یەکدی دیتنەوەمان لە هەدبەهەر خۆش بوو. لەگەڵ ئەودا بۆ یەکەم جار چوومە سینەما کە پێشتر هەر ناویم بیستبوو. هەر شەوە بۆ فیلمێکی دەیبردم، یەکیان میسری ئەوی دیکە ئەمەریکایی. لە پاش دەوامەوە هەتا کاتی نووستن لەگەڵمدا دەبوو. زۆری پێ نەچوو خۆی نەقڵ کرد بۆ دادگەی کۆیێ بە کاتبی بەردەستی حاکم. بەمێنێك گوێزرایەوە بۆ ڕانیە و قەڵادزە. ئەو ماوەیە کە لە قەڵادزە و پژدەر بوو دوو یادگاری لەبیرنەکراوی پێ بەخشی. یەکیان نوکتە و قسە خۆشەکانی حاجی ساڵحاغای پێماڵك، ئەوی دیکەشیان

ڕووداوێكی سەیر و سەمەرەی كەسنەبیستوو كە بۆ كچێكی هێرۆیی ڕەهسابوو، چ تەفسیری عیلمی و ئیمچە عیلمیش ڕێی بێ نابات. من ئەم ڕووداوەم لە زۆر كەسی دیكەش بیست ئەبوو لێشی بكۆڵرێتەوە بەڵام لێرەدا مەودا نییە تەنانەت ناویشی بهێنم چونكە بە ئەفسانەی باوكی ئەفسانان ئەژمێردرێ..

وەهام لە بیرە كە جەنگی دووەم بەرپابوو جارێ لە ڕانیە بوو. ئەو ساڵانەی چلەكان و پاش چلەكان زۆر جێگەی بە میرزا كرد هەمووش بە كاتبابەتیی دانگە. لە دەمی جەنگدا كە هیتلەر بەشێوەیەكی پەرسەندوو لەلایەن ئامێرەی گوێگرانی رادیۆی بەرلین و یونس بەحرییەوە بۆ ئاسمان بەرز ئەكرایەوە میرزا بە تایبەت دژی دیكتاتۆرایەتی بوو تا بشڵێی هیتلەری ئەدزا، زۆریشی پێ ناخۆش بوو كە وەستا تەهای خاڵی بە دڵ شەیدای هیتلەر بوو. بە بۆنە تەشویلان خەتایەكەی ئەبرئەوە بۆ تەجرەبەیەكی تاڵی خاڵی لە ئەزیەتێكی كە لە دەست ئینگلیزەكانی چێشتبوو، میرزا خزمی خۆی بە زیادەوە ئەویست.

دەنگ و سەدای جەنگ و شكۆفەكردنی بیری نوێ لە سیاسەت و خەستبوونی بزووتنەوەی كوردستانی ئێران بەپێكهاتنی كۆماری مەهاباد بوون بە هاندەری میرزا بەرەو ساغبوونەوە بۆ كوردایەتی و تێدا قاڵبوونەوە، ئەویش بەو جۆرە هێمنە واقیعبینەی كە ئەمێك بوو لە میرزادا ئەژیا.

هاتنەوەی بەلای كوردایەتیدا چ پێوەندیی بە ئەماری جیهانیەتییەوەی نەبوو ئەگەرنا ئەبوو چینەپەروەر بێ نەك قەومپەروەر، هەزاران هەزاری لەو تێروتەسەلتر (كە كاتێكی دانگە بوو) لە كوردستانەكە و عیراقەكە و ئەرەوەی عیراقەكەشمان، پاش جەنگی دووەم و سەركەوتنی یەكێتیی سۆڤیەت بەسەر ئەڵمانیادا، بە گوڕجی و گەرمی و چالاكی چوونە باوەشی فەلسەفەی سەر بە چینەوە زۆربەی كوردپەروەریش لە كولانەی ئەو فەلسەفەیەوە لە چارەنووسی كورد ڕامەما. هەرچی میرزا بوو، بێ ئەوەی ئیروتیر لە كەس هەڵگرێ و هەناسەسواریی پێوە دیاربێ كوردێكی بێ تەئویل بوو، ئەشیا بە باوەڕی دوای شەڕی دووەمییەوە لە سەدەی ئۆزدەیەمدا كوردایەتیی كردبایە. سەرگیزا و هەرگیز لێم نەدیت و لێم نەبیست تاكە یەك داوی كڵافەی كوردایەتیی بە هیچ فەلسەفەیەكی غەیری كوردایەتی ببەستێتەوە بەرژەوەندیی گەلی كوردی بەلاوە مەند بوو بە گەلی كورد خۆیەوە نەك بە پیوریتانیزمی ئەشیلەی ناو تەزەریانەوە كەوا نی چاوەڕوان نەكەن تاشقی چاوی ڕەشی كوردی بێ ئەسەلات بن. هەموو خاوەن

ئەزموونییەک قسەی لووس و لیک و شیرنی بێ ئەرک و مەسرەف دەبەخشێتەوە کە دەکا چش. گەلێک جار و سەدان بار لە ماوەی پتر لە سی ساڵ هاوڕێیی دوای ئەمەن و تەجرەبەی خۆش بە دنیا شکانمان، بە تایبەتی لە پاش ڕاپەڕینەکەی ١٩٤٨، لەگەڵ میرزادا بەیەکەوە بزووتنەوەی کوردایەتی و چینایەتی و سیاسەتی دەوڵەتە (چەپی و ڕاستی)یەکانمان داوەتە بەر هەڵسەنگاندن و لێتوژینەوە و بە تاقیکردنەوەوە. میرزا لەو باوەڕەدا بوو، منیش هەروەها، کە کوردایەتییەکی نیگا فراوان و دوور لە ویزنەی ڕەگەزپەرستی، سەرەڕای ئەوەی کە شخسامەڕێگایەکە کوردی هەست بە دنیا و بەخۆکردووی بەرەو چارەنووس و مافی قەومایەتی تێرا دەروات. هەموو ئەو داد و چاکە و بەرژەوەندەشی تێدایە کە دەشێ لە هەر فەلسەفەیەکی مرۆڤدۆستدا هەبێت، ئینجا بە زیادیشەوە ئەو چاکەیە دەخاتەوە سەر چاکەی فەلسەفەکان کە هەر بەدواداچوونی پێچکۆڵەی کوردایەتی بە دەست کورد دەکەوێت. کوردێکی خاوێن لە ڕێی هۆشی فراوانییەوە دنیای خۆش دەوێت بەڵام ئەوەندە خۆشویستنە گشتییە هەر بایی ئەوەی لێقەوماوێکی ژاپوونی سوودی لێ دەبینێت کوردیش سوومەند دەکات. دەبێ کوردی خاوێن بە کردەوە لە وێنەی تایبەتیدا کوردی خۆش بوێت، پەرۆشیشی بۆ تێکڕای ئادەمیزاد وەک پەرۆشی تێکڕای ئادەمیزاد بێ بۆ کورد. ئینجا ئەگەر گوترا کورد هیچی بەهەرەوە نییە لە دوورەوە میللەتان بۆی بە پەرۆش بن یان لەسەری بە دەنگ بێن ئەوسا هەر بە چاری کورد ڕزگار دەبێ لە پەرۆشخواردن بۆ غەیر چونکە کە لێی ئەوەشێتەوە چاکەی لەگەڵدا بکرێ دیارە لێشی هەڵناستێ لە کولەمەرگی و کوێرەوەریی خۆیدا بە غەیرەوە هەریک بێت. من کە ناساغ بووم و پێت گوتم: تۆ ئەوە ناهێنێت خزمەت بکرێیت، تازە بە هیچ مەزهەبان ڕێت نامێنێ داوای خزمەتم لێ بکەیت. میرزا لە ڕوانگەی ئەوتۆییەوە سەیری بزووتنەوەی کوردایەتیی دەکرد و بزووتنەوەی دیکەشی پێ تاقی دەکردەوە. ڕای ئەوە بوو دەیگوت، من کە کوردایەتی بکەم دەبێ من هەژاری کوردم بەلاوە سەبەستتر و خۆشەویستتر بێ نەک یەکێکی دیکە. لە ڕێی فەلسەفەوە پەرۆشی خۆی بە هەژاری هەموو دنیا دەبەخشێ بەو پێیەش پشکی هەژاری کورد لە پەرۆش و هەوڵی ئەو تەرزە کەسە کەم دەبێتەوە وەک ئەوەی کە دایکێک هەموو منداڵی دنیای بە قەدەر یەک خۆشویستن ناتوانێ شەونخوونی بۆ منداڵی خۆی بکات چونکە دیارە پێی ناکرێ شەونخوونی بۆ منداڵی هەموو دنیا بکات.

میرزا چەندێکی لە دەرسی قوتابخانە مامناوەنجی بوو لەوەی پێی دەڵێن

Common Sense هەستیار و زیرەك و نیگا بەرین بوو. هۆشی بە ڕامیاریی ناوەوە و دەرەوە و نێو میللەتان دەشکا. زۆر بە ئاسایی و ڕاشکاوی و ئاسانی دەیزانی فەرقی نێوان سیاسەتی ڕووکەشەی دەوڵەتێك لەگەڵ سیاسەتی ڕاستەقینەیدا چەند گەورەیە. هەروەك بڕوای نەبوو بەو شتانەی لە شێوەی پڕوپاگەندەدا بە دنیادا بڵاو دەکرێنەوە هەروەهاش لە شێوەی بەدیهییەدا دەیزانی هیچ دەوڵەتێك ناتوانێ لە قسە خۆشە سەرزارەکییەکانیدا ڕاست بکات. دەوڵەت نییە بتوانێ بەیەك لای بەخشندە بێ، کە بەخشندە بوو زۆر ئابا ئیفلاس دەکات. ئەوپەڕی ئینساف لە سیاسەتدا ئەوەیە لە مامڵەتدا فێڵ نەکرێت و پەیمانی درۆزن ئیمزا نەکرێ.

لە دەوڵەت وا زیێنە: برایەتی کە پێوەندییەکی نێوان دوو مرۆڤە و هیچ مافی میللەتانی تێدا زەدە نابێ ئەگەر برایەك لە براکەی بسەلمێنێ ئینجا دەبینین ئەم سەلماندنە وەزەحمەت دەکەوێ، خۆ ئەگەر وەزەحمەت بکەوێ و نەکەوێ هەر دەمێنێتەوە بڵێن ناشێ ئەرك بەلای یەکێکیاندا بکەوێ و ئەوی دیکەیان لە پەنا برایەتیدا لوقمەی چەورتر بخوات، برایەتیش بەخشندەیی دوولایی گەرەکە. کە ئەمە وەها بێ ئایا دەبێ برایەتیی کورد و ئوستورالیا چۆن بێ؟ تا لەم بابەتە لێکدانەوە و بۆچوونانەدا کەوا بێگومان ئەویش لە وتووێژی دوولایی پەیدا بووە، میرزا گەیشتبوو بەو قەناعەتە ناشێ ج میللەتێك بەربەیار و بێ سەنەد و سبووت و پەیمان و قەول و بڕیە گلەیی لە میللەتێکی دیکە بکات لەسەر کەمتەرخەمییەکی بەرانبەر خۆی لێی ببینێت. گلەیی لە پەیمانشکێنی دەکرێ نەك لە نەبوونی سەخاوەت. لە بیرمە دەیگوت، سولەیمانی کەیفی هات کە قەزای ڕانیەی خرایە سەرێ هەولێریش پێی ناخۆش بوو لێی بچڕابەوە. خۆ نە سولەیمانی قازانجێکی گەورەی دەست کەوت نە هەولێریش زەرەرێکی لێ کەوت ڕانیەش بە هەر لایەکدا بکەوێ دەچێتە باوەشی دایکی خۆی ئیتر بۆچی سەیرم بێتەوە لەوەی ڕووسیا و چین لەسەر سنووری لە یەکدی سوور هەڵگەڕێن خۆ هێندەی هەولێر و سولەیمانی خزم نین؟ سەیر لەوەدایە خەڵق لە ڕێی ئەزەرییەوە بەتەما بێت دوو وڵات هێندەی دوو هەرێمی یەك وڵات لەگەڵ یەکدیدا بێ فەرق یان بێ فەرقتر بن. هاووڵاتییەتیی سولەیمانی و هەولێر و هاوباوەڕیی ڕووسیا و چینیش لە جغزی واقیعی مرۆڤایەتیدا، کەوا نە فریشتە و پەرییە و نە کۆمپیوتەر و تەرمۆمەتریشە خۆ دەردەبەخێت. لە کەس داوا ناکرێ پتر لە خەڵق خۆی لە بیر بکات.

لە میرزام بەدی دەکرد قسە و بیروڕای ژیرانەی هەڵدەگرتەوە تەنانەت لە نیزاعە و

چاپەمەنیشدا گوڵبژێری دەکردن. بە نموونە جارێکیان بێ ئەوەی بزانم لەم سەبارەتە لەبارەی عەبدولکەریم قاسمەوە شتێکم دەربڕی، عەبدولکەریم دوای کردنەوەی دەروازەی ئازادی بۆ هەموو لایەنێک، پاش بەینێک کەوتە سەر سیاسەتی لێ کەمکردنەوە و فلان بگرە و فلان بەرمەدە. بە نیازی لە قاڵبدانی خەڵقەکە بەو جۆرەی کە عەبدولکەریم خۆی بە چاکی دەزانی. من گوتم، هەروەک کە بەرخت گروو جارێکی دیکە لەشەکەت بۆ ناچێتەوە ناو پێستەکەی هەروەهاش میللەتی عێراق، تازە بە کەس ناگرێ بیخاتەوە قەپێلکێکی وەکو پێش چواردەی تەمووز. دوو سێ حەفتە تێ پەڕی لە ڕووداوێکی ئەو ڕۆژگارەدا میرزا گوتی.

قسەکەی تۆیە خەڵك ناچێتەوە ناو پێستی جارانی.

ناوناوە کە پیاوە دەسەڵاتدارەکانی ١٩٥٩، ١٩٦٠ لە وتووێژیاندا وێنەی منداڵانەیان دەکرد و لە زۆر لاوە چەپڵەی ئافەرینتیان بۆ لێ دەدرا میرزا لەبەر خۆیەوە تێی دەسریواند و قسەیەکی مزری ڕاماڵ دەکردتێ بەڵام نەیدەهێشت خوێنگەرمەکانی شۆڕش تێی بگەن. سیاسەت بە لای میرزاوە نەبوویبوو بە دین، دروشمەکانیشی لێ نەبوونە پەڕۆی سەر چاك و پیران. بڕوای بە کوردایەتیی بێ کەلەبەر و کەموکورتی بوو بەڵام ئەو هەنگاوەی بە ناوی کوردایەتی بۆ کوردایەتی لە واقیع و ئیمکان دەردەچوو بە خراپی دادەنا.

میرزا بوو بە ئەندامی پارتی دیموکراتی کورد بەڵام نازانم لە کەیەوە. هەم بە پێی تەبیاتە هێمنەکەی خۆی و هەم لەبەر وەزیفەکەی، جگە لە لەمپەری تەمەن، نەیدەتوانی ئەندامەتیی هوتاف کێشان و دروشم هەڵگرتن و نەشرە بڵاوکردنەوە بەڕێوە ببات. ئەو (وا بزانم) لە ساڵی (١٩٣٧)ەوە بوو بە خاوەن خێزان و هەڵگری ئەرکی ماڵ و منداڵ. ژنێکی دوای بەرهەمهێنانی کوڕ و کچێك جوانەمەرگ بوو، ژنی دووەمی پەیتا پەیتا ساواڵەی بۆ دەخستنە ناو بێشکەوە. گرانبوونی نرخی کەرەستەی گوزەرانیش دوای جەنگ قورسایی زیاتری خستە سەر بودجەی مانگانەکەی کە بە حاڵ لە چەند ساڵێکدا نیوە هەنگاوێکی کورتی بەرەوپێش هەڵدێنا. لە باری وەهادا میرزا دەیتوانی لە سنووری ماڵی خۆی و دایەرەکەی خزمەتی ئامانجەکانی پارتی بکات. لەم مەیدانەدا، بێ تەقە و هەرا، هەر جانفیداییەکی لە دەست مرۆیەکی وەکو ئەو هاتبێ کردوویەتی. ساڵانی ساڵ نەشرەی نهێنیی پارتی لە ماڵی ئەو دەردەچوو. بەینێکی بەسەردا ماڵی لە کەرکووك بوو، کەرکووکیش لە چاو شارەکانی دیکە پتر جێی

مەترسی بوو بۆ چالاکی دژ بە حکوومەت. لە دەمی دەسەلاتی شەریکەی نەوتی ئینگلیز چاوساغ و خەبەردەر و هەست ڕاگر و ئیخبارییە ساز لەو شارە تێکیان دەھاویشت زۆربەی موتەھەمی سیاسیی کوردەواری لە عورفیی کەرکووک موحاکەمە دەکران. دوای ڕاپەڕینی (وثبە) و ئاشکرابوونی خەباتگێڕەکان خەتەری ئاشکرابوون و تێوەگلان هەستتر بوو لە جاران. میرزاش لە نزیکەوە برادەری هەموو ئەندامە ناسراوەکانی قیادەی پارتی بوو، لە زۆر هەڵکەوتدا بۆ سەر داوەت و دانیشتنی شەوانەی نادی لەگەڵیاندا کۆدەبووەوە و ترسی گیران و ئیخبارییەی بەوەدا لە خۆی دەتەکاندەوە کە لە ڕواڵەتی وەزیفە بەجێهێنان و ژیان بردنەسەردا باباپەکی بێلایەنی قسەخۆشی ئێسکسووکی بێ هەڵپە بوو. ئەوەندە لە وەزیفەکەی شارەزا بوو حاکمەکان موحتاجی بوون.

ئەم وەزیفەیەی کە هەمیشە لەگەڵ کاربەدەستاندا کۆی دەکردەوە و لە ڕێی دەعوای سیاسییەوە شارەزای مەئموورەکانی تەحقیقاتی جینائی و خزمەتی نهێنیی دەکرد و زۆر خەبەری شرایەوەی پێوە دەزانی، تا ئەم وەزیفەیە هەروەک بۆی بووبووە قەڵغانی سەلامەتی، دەربوونەیەکیش بوو سرکە و کورکەی حکوومەتی لێوە دەزانی و حیزبی پێ خەبەردار دەکردەوە تۆ بڵێی چەند جاران ئەمری گرتنی خەباتگێڕێك لە ڕێی مەحکەمەوە بە میرزا گەیشتووە و لەوێشەوە بە حیزب و لە حیزبیشەوە بەو خەباتگێڕە بەر لەوەی پۆلیس کەوتبێتە خۆی بۆ گرتنی کابرا؟

لەم مەیدانەی ئاگادارکردنەوەی حیزب بە خەبەراتی دەوڵەت خۆم ئاگاداری گەلێك چالاکیی میرزام، یەك لەوان ئەوە بوو کە لە هەڵبژاردنەکانی ۹٥۳ و ۹٥٤ میرزا کاتبی دادگەی کۆیە بوو. بە ڕێکەوت هەتی تەلەفۆنی کاربەدەستانی کۆیێ لە ڕۆژهاوڕۆژی شوورەی بانی ئەو خانووەوە تێ دەپەڕی کە میرزا تێیدا کرێگرتە بوو. شەوانە، بە ئەسپایی تەلی دەھاویشتە سەر ئەو هەتانە و گوێی لە قسە و موخابەرەی ناوەوە و دەرەوەی حکوومەتی کۆیێ دەبوو هەتا هەر لە حکوومەت دەکەوت. چی لەو گوێگرتنانەدا بیزانیبایە بە دەور و تەسلیم دەیگەیاندە پارتی. کە خۆم نوێنەری پارتی بووم لەو هەڵبژاردنانەدا میرزا ڕۆژانە دەیدیتم و ڕوونی دەکردەوە وەی کاشکی ئەو دەمە جیھازی تۆمارکردن هەبایە و ئەو موخابەرانەی بۆ دوارۆژ بە نموونەی جۆری بیرکردنەوەی حکوومەتی ئەو ڕۆژگارە بەجێ هێشتبایە.

میرزا بەدرێژایی سالانی ئەندامەتیی لە پارتی سەربازێکی ئەناسراوی زیندە چالاك

و ژیر و دڵسۆزی کوردایەتی بوو، بە بەهەشتەمیی نەك بەمرێ.

لە نوکتەبازی و سوحبەتچییەتیدا میرزا گرەوی لێ نەدەبردرایەوە کە ئەشرەی پارتی لە ماڵی ئەو دەردەچوو خێزانەکەی دووەمی (ئافرەتێکی دڵ لەخۆبووردووی هەولێری بوو) هەستی دەکرد ئەم کارە گەپ و گاڵتە نییە. میرزا دەیگێڕایەوە کە خێزانەکەی دڵخۆش دەکرد بەوەدا بەهێر لە سایەی ئەو مەکینەکەی چاپ خەڵی زێڕ و جلکی ئاوریشم و ئاقمی ناو ماڵی هەرە نایابی بۆ دەکڕێ. هەر سەرێکم لێ بگرە! خێزانەکەی هەرچەند بێ ئەو بەرتیلە مەوهوومەش ڕازی بووە بە چارەنووس ئەمما بێگومان خەیاڵی خۆشکەڵەی بەدڵدا تێپەڕاندووە.

میرزا لەگەڵ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی و شەخسییاتە بەرچاوەکانی پارتیدا نەك هەر بە پێوەندیی حیزبایەتییەوە بگرە بە ڕۆحی گەش و قسەی خۆش و مەجلیس ئارایی و تەبیات لەباری هەمیشە دڵخوازی ئەو کەسانە بوو. خواخوایان بوو هەلی دانیشتن ڕێك بکەوێت و میرزا تێیدا بەرێتە قسە شیرین و خۆشەکانی. ئەگەر ڕێ هەبایە بۆ گێڕانەوەی ئەو نوکتە سیاسییانەی لەو دانیشتنانەدا بە زمانی میرزادا دەهات دەتزانی چ جۆرە مەجلیسی شەنگ و دڵکێش و خۆشی بەخش بوو، مەجلیسێکی میرزا تێیدا دەکرایەوە هیچ پەنا و پەسیوێکی مەفهوومە سیاسییەکانی بەر لە شۆڕشی تەمووز و دواتر کە لە کردەوەدا خەباتگێڕەکانی بەگژ یەکدیدا دەمێنا لە میرزاوە نوکتەی تێ نەگیرا بێ.

بە درێژایی ساڵانی ئەندامەتیی لە پارتی، میرزا ڕای خۆی دەربڕیوە و چی بە هەڵەی زانیبێت کوتوومتی هەڵەیە بەڵام هەرگیز جوداوازیی بیروڕای نەکردووەتە هۆی کزبوونەوەی پێوەندیی خۆی بەحیزب یان بە ئەندامەکانی. چونکە شوێنیشی لە حیزب ئەوە نەبوو لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانیدا ناچاری هاتوچۆ و جموجووڵ بێت ڕەخنەکانی لە سنووری (بیروڕا)دا دەبوونە موحالەفە نەك لە شێوەی سەرپێچیدا. ئەندامەکانی حیزبیش لە ڕەخنەکانی زیز نەدەبوون ڕەفتاریشیان لەگەڵیدا هەرگیز لە چەقزی خۆشەویستی و ڕێز دەرنەدەچوو. لەلایەن پاداشیشەوە میرزا نەك هەر ئەرك هەڵگرێکی بێ مزە بوو بەڵکو تا ئەوەندەی بشێ لە ناسۆیشەوە موژدەی مزە بۆ کوردپەروەرێکی وەکو ئەو تارمایی بداتەوە یەك پەنۆکی تارمایی لە کەسەوە دیار نەبوو. پاداشی میرزا لە کوردایەتیدا بەهێنی ئەو بارەی کوردی تێدا بوو وەکو بەهەشتی دوای مەرگ بوو کە لە ژیاندا هەر داوای نوێژ و تاعەت لە ئیمانداران دەکات. تۆ واز لە

پاداشتی مادی بهێنێته لەلایەن ئەو نازەی کە ناو دەرکردن بە کوردایەتییەوە خەباتگێری پێ دەناسرایەوە لەویشدا میرزا پشکی ئەبوو چونکە خزمەتەکانی نە بەبڵاوی دەزانەران نە لەوانەش بوون بەچاو بدیترێن. کە دیترابایە یان بیسترابایە ئەشرەی پارتی لە ماڵی ئەو چاپ دەکرێ بەندیخانە و پرسیبوون دەبوون بە پاداشی..

ئەم ڕاستییە زێدە گرنگە بێ فێڵە پڕ مەترسییە لە خەباتی میرزادا گەوا دوای مردنیشی ئەبوو بە فاتیحەی سیاسی لە موناسەبەیەکدا بۆ گیانی بەرێ بکرێ، بە قەرز مایەوە لە زیممەتی شوێنەواری کوردایەتی هەرچەند لە ناست چارەنووسدا قەرزێکی بچووکیش بێ مرۆی دیکە هەن لە غەیری مەیدانی کوردایەتیدا گیانبازییان کرد و بەسەر چوون. لەوانیشدا هی وەها هەیە بێ سەروشوون مایەوە بەلام قەرزەکەی بەسەر شانی کوردایەتییەوە نییە. تۆ نابینیت شەهیدەکانی غەزای قارس و بایەزیدی بەر لە سەدەیەك کە بە ناوی ئاینەوە خزمەتی پێچکەی تەختی سوڵتانی عوسمانلییان دەکرد بە شەهیدی کوردایەتی لە قەڵەم بدەیت، تەنانەت لە ڕشتەی ژیانی شۆڕشگێڕێکی وەکو شێخ مەحموودا بەشداریکردنەکەی لە شەڕی عوسمانلییەکان دژی ئینگلیز بە درێژایی سالانی جەنگی یەکەم ناخەینەوە سەر خەباتەکەی بۆ کورد. ئەگەر لەو بەشداریکردنەدا مەرجێکی مافی کوردانی بەسەر عوسمانلییاندا سەپاندبایە حیسابەکە بەلای کوردایەتیدا دەهاتەوە ڕەنگە دیندارێکی ئیمان مەحکەم بە عیبارەی خۆی شەڕی دژ بە ئینگلیز لە ژێر ئالای عوسمانلییاندا بەولای کوردایەتیشەوە ببات بەلام دیسان ڕاستییەکە لە جێی خۆیدا دەمێنێتەوە کە کوردایەتی تێدا نییە. مەسەلەکە پتر ڕوون دەبێتەوە بەوەدا کە دەزانین دینداری ئەوتۆیی خەباتی کوردایەتیشی دژی پاشای ئیسلام بە ناڕەوا دادەنا. ئەدی ناڵێن مەلای خەتێ فەتوای ئەوتۆیی دژی پاشای ڕواندز دەرکرد؟

ئەمە بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێم دەنا من لەو باوەڕەدام فەتوای مەلای خەتێ بەنیازی چەپاردانی بەرەی کورد لە تەفروتوونبوون بە ڕەزامەندیی پاشا بوو (لە بەرگێکی کتێبی حاجی قادری کۆیی ئەم مەسەلەیەم بەپێی قەناعەتی خۆم ڕوون کردووەتەوە).

هەموو بیروباوەڕێکی ڕاست و چەوتی ئەم جیهانە خەتێکی بە دەوری خۆیدا کێشاوە لێیەرچوونی بەسەرچوون لە باوەڕەکە حیساب دەکات. کوردایەتیش دەبێ هەر وەها بێ و خەتێ دەوری خۆی تۆخ ڕابکێشێ دەنا لە هەموو تێك هەڵقرژانێکی لەگەڵ باوەڕی دیکەدا بە عیبارەی ئەو باوەڕە کوردایەتییە کە تاوانبار دەردەچێت. مەسەلەکەش

هێندە ڕوونە نەبوو لە خۆوە بەلای کورد و ناکوردەوە دیار بێ. میرزای حاجی کەریمی ئاسنگر وەکو مێروولەیەکی بێ ناوونیشانی مێرووستانی کوردایەتی دانەکێشیی لە ناو ئەو خەتە ڕانەکێشراوەدا دەکرد. ساڵم هەقە یەک کەرتە گەنم یان جۆ یان پووشکەی نەکێشا بۆ غەیری کوردایەتی. ئەشەدوبیللا لەو کەرتە دانەوێڵانەش یەک تۆسقاڵ نارد نەچووە هەناویەوە.

من سەیرم لەوە نایەتەوە کە میرزا هەرگیز ڕێبازی خۆی نەگۆڕی. سەیرم لەوەش نایەتەوە کە بێ ئومێدی سوود کوردایەتیی دەکرد. سەیرم لەوەش نایەتەوە کە مزەی ئەرکی خۆی بەلاوە نابوو. سەیرم لەوەش نایەتەوە کەوا بێ مزە و بێ ئومێد خەباتی پڕ خەتەری دەکرد، سەیرم لە ئاکە یەک خەسڵەتی دێتەوە کەوا ڕەنگە سەرنجی کەس ڕانەکێشێ. سەیرم لەوە دێتەوە چۆن توانی بێ وچان و بێ لێ کەمکردنەوە – بێ ئومێد، بێ سوود، بێ ناو – لە شەقامە ڕێگەکەی خۆی بەردەوام بێت و هەناسەسواریی پێوە دیار نەبێت و خۆ بەرەنجەڕۆ دانەنێت و پەلپ و بەهانان نەهێنێتەوە خۆی بێ بدزێتەوە لە ئەرک و ڕەفتار و کرداری نەگۆڕێت چ لە کوردایەتی بێ چ لە وەزیفە چ لە بواری کۆمەلایەتی. لە هەستیارترینی هەنگامەی دڵگەرمی و تەزێزیی و گەشبینی و (قەرسیل لە چۆکان) ئەو مرۆیە هەمان واقیعناسە بێ هەڵپە بێ تەکلیفە خزمەتگوزارە بێ ناوەکە بوو کە لە کەرکووک و شوێنی دیکەدا ماڵەکەی کردبوو بەچاپخانەی حیزب.. چەندین جار گوتوومە بەردەوامی لەسەر فەرمان و پێداویستی ئەمەبێ کە بەرژەوەند و گوزەرانی پێوە بەند نییە ئەستەمترین کارێکە مرۆڤ بە خۆیەوە بگرێ. ئایەتی (فاستقم کما أمرت) بە ڕواڵەت بێ تەکلیفە کەچی هیچ تەکلیفێکی گەورە و گچکە و کوشندەش نییە بەر مەفهوومی نەکەوێ. ئافەرین بۆ باباپیەک بەناوی دیوەخانە کۆنە بۆقرێک دەکاتەوە و هەتا مردن خۆی پێوە دەلکێنێ بامەسرەفەکەشی ئەوە بێ کە یەک جگەرە بە میوان بدات. بەردەوامبوون لەسەر ڕاڕەوێکی قەرارداەی بێ پێچ و پەنا زەحمەتترە لەو ئەرکەی تێیدایە. تۆ وەرە ئەرکی ساڵێک لە خزمەتی دیوەخانەم بە دوو حەفتە لە کۆڵ بکەوە و ماڵت سەد جار ئاوابێ. میرزا ئەو بەردەوامە بوو کە من سەیرم پێی دێت: بەردەوامبوون لە شتێکدا چ سوودێکت بێ نەگەیەنێ.

لە وەزیفە ئەختێک هەڵکشا تا بوو بە مەعاون تەسوییە ئەمما ئەگەر لەوانەیەبایە خۆرە پێش دەیەخن ئەوەندە لێزان و سەعلانی کاری وەزیفە بوو هەموو ماوەیەکی مومکینی دەبڕی. کە خزرپێشکەر نەبوو یارمەتیشی لە کەس داوانە کرد پلەیەکی بەرەژوور

بیات. ئەم دوورییەی لە هەڵمەتەکاسمی بەلایەکدا، تەواوکەری ئەم خەسڵەتەی بە ئەرکتر بوو لە پشتگوێخستنی بەرەوپێشچوونی بە منەت. هەتا منداڵی هەراش دەبوون و گوزەرانی زەحمەتتر دەبوو لە بودجەی مەسرەفی کەم دەکردەوە تاکو داهاتی کەم بەری مەسرەفی فراژیبووی بکات. بەر لە هەموو شتێک خەرجی خۆی دادەشکاند، وازی لە جگەرە هێنا.. چوونە نادیی کەم کردەوە هەتا وازی لەویش هێنا. سەرت دەهەژێنم وەهای لێ هات ئەو جاروبارەی داوەتی یەک دوو برادەری تێدا دەکرد ئەویشی پێچایەوە کە منداڵەکانی بە دامەزران و شووکردن لێی دەبوونەوە بەرەژوورچوونی ڕێکاری گوزەران و نرخی کەرەستەی خۆراک و پۆشاک فەرقەکەی تێ دەبرد. دڵنی چیر کردنەوە لە نەخواردن و مەسرەف کەمکردنەوە هەتا ناچاری بەرتیل و قەرز و دەست پانکردنەوە نەبێ.

میرزا دەیتوانی بە بەرتیل دەوڵەمەند بێ. برادەری ئەوتۆشی هەبوون حەزیان دەکرد یارمەتییان لێ قبووڵ بکات یەکێک لەوان نازداری هەموو لایەک، زەعەی مەرگی ناکات ئەحمەدی حەمەدەمەهیناغای دزەیی، بەڵام میرزا لە منداڵییەوە هەتا مردن ئەو دەزنوێژەی (لە کەس وەرنەگرتن)ی ڕاگرت لەگەڵ مندا کە مێینە برادەر و لە یەکدی نزیک بووین هەمان خۆگرتوو بوو کە هەبوو. ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕووی تەکلیفی لێ نەنام. نەک هی پارە کە منیش نەمبوو، بگرە لە هیچ تەگەرەیەکی کە لە وەزیفەدا هاتبێتە پێشی (لەو جارە بەولاوە کە سفارشنامەم لە مەلا ئەفەندی بۆ وەرگرت، ئەویش هی بەرەوپێشچوون نەبوو، لەسەر خۆگرتنەوە بوو). لەم مەیدانەدا سێ هەڵکەوتی لێ دەگێڕمەوە کە خۆم تێیاندا شایەدم و بەر تەجرەبەی خۆم دەکەوێ:

یەکیان ئەوە بوو کە لە هاوینی ١٩٦١ میرزا لەگەڵ خۆپارێزیشی گیرا و دوور خرایەوە بۆ (رمادی). خواوڕاستان دوورخرانەوەی لەو ماوەیەدا بوو کە عەبدولکەریم قاسم لەلای خۆیەوە بنیاتی دۆستایەتیی لەگەڵمدا دانا. میرزا کەم و زۆر داوای یارمەتیی لێ نەکردم، لە خۆمەوە خواهیشتم لە حاکم عەسکەریی عام کرد کە میرزا بۆ ماڵ و وەزیفەکەی بگێڕێتەوە.

تەڕدەست میرزای بەردا.. لە ئۆتێل هاتە لام بۆمی گێڕایەوە کە چەندی پێ خۆش بوو لە وتووێژدا حاکم عەسکەری پێی گوتبوو فلان پاکانەی بۆ کردی، تومەز کابرایەکی سەر بە عەبدولکەریم وەهای ڕانواندبوو خۆی یارمەتیی داوە لە بەربوونی. میرزا گوتی: ڕازی بووم بەدوورخرانەوەم هەر هێندە قەرزداری ئەو کابرایە نەبم.

پاکانەکەی من بۆ میرزا ئەوە بوو کە لە وەڵامی تەکلیفدا لیوا عەبدی گوتی (میرزا ئەندامی پارتییە) منیش بێ گزمەکردن پێم گوتەوە لە پارتی بێت و نەبێت یەکێکی وەکو میرزای واقیعناسی لەسەرەخۆ هی ئەوەیە حکوومەت ئاواتەخواز بێ ئەندامی هەموو حیزبەکان وێنەیەکی ئەو بن. ئەم قسەیەم یەکسەر چووە دڵییەوە. کە لە رەمادییەوە گێڕایەوە بۆ بەغدا، زۆری ڕێز لێ نابوو کۆڵێکیش عوزرخوازیی لێ کردبوو. دواتر لای منیش مەدحی هۆش و زیرەکی و هێمنیی میرزای کرد.

تەجرەبەی دووەم ئەوە بوو کە لە دەمی وەزیریەدا میرزا بە هیچ جۆرێک تکا و خوایشتی بۆ خۆی نەکرد بەلام بۆ گەنجێکی کە لە سالانی ۹٥۹ و ۹٦۰دا بزوز و بێ عار بوو هاتە لام و ڕووی تەکلیفی لێ نام و گوتی: فلانە کەس فصل کراوە لە دایەرەی ئەمنی معاملەی گێڕانەوەی بۆ وەزیفەکەی ناڕوێنن زۆریش دەستکورتە چەندێکی بشڵێی شەرم دەکا بێتە لات منی بە وەکالەت ناردووە بۆ عوزرخوازیش. ئەو گەنجە بەزوویی گەڕایەوە سەر وەزیفەکە. بەر لە دوو ساڵێک مەرگ گلاندی.

تەجرەبەی سێیەم ئەوە بوو کە لە (مجلس الخدمة) ئەندام بووم میرزا بۆ تەرفیع لە ۷۰ – ۱۰۰ هاتە دیدەنیی مەجلیس. نە پێشتر داوای کرد یارمەتیی بدەم بۆ تەرشیحکردنی لەلایەن دایەرەکەیە و نە لە دیدەنیشدا هاناى هێنامە بەر. بە لێهاتوویی خۆی مەجلیسی منەتبار کرد کە مەئمووری ئەوتۆیی بەڕێزەوە وەرگری. من لەم تەجرەبانەدا چ نیازێکی خۆهەڵدانەوەم نییە کە دەزانم نازوفیزی خۆهەڵدانەوە و پەڕوباڵ فشکردن لە مرۆڤێک ناوەشێتەوە خۆ بە مرۆ بزانێ. من کە شایەد بۆ پیاوەتیی کەسێک پەیدا بکەم خۆم بەشایەد پتر جێی متمانەی خۆمم، ئەوەی بەشایەدیشی دەهێنمەوە بنیادەمێکە وەکو خۆم دەبێ پاکانەش بۆ قسەکانی بکەم.

گوتار بەبەرییەوە نییە هەموو لایەنێکی کەسایەتیی مرۆی باسکراو بگرێتەوە دەنا وەهام لێ خۆش دێت چ بە نووسینی خۆم و چ بە هی کەسێکی دیکە بێ سەرلەبەری بابەتی نووسین بەسەح بکاتەوە تا ئەگەر باسی شاعیرێکم خوێندەوە شارەزام بکات بەو کەسە وەک ئادەمییە نەک تەنها وەک شاعیر. خۆ ئەو کابرایە ساڵی دوازدە مانگ، شەو و ڕۆژ ٢٤ سەعات، هەر شیعر نالێ. کێ دەڵێ شیعرەکانی تەرجومانی ویژدانییەتی؟ هەڵسوکەوتی ژیانی تێم دەگەیەنێ چەند لە ڕەنگی شیعرەکانی ساختە و چەندی دروستە. دەزانم دەبێ بایەخی زۆر بە شیعرەکانی بدرێت بەلام ڕێزوێت و کۆتەڵی بێلایەن شیعر نالێن بۆیە دەبێ (شاعیر – مرۆ) بناسم نەک مەکینەی

کۆککراوی ئەدەب و سیاسەت. میرزا و عەمری میرزاش دەبیٚ لە سنووری دەسەڵاتدا بەو شێوەیە بناسریٚت تا هەر نەبیٚ پرسەکی گەورەی لەسەر هەڵستیٚ (پرسەك: علامة استفهام). تۆ کە فیلمت دەرهێنا لەسەر شاعیر و نووسەر و هونەرکار و سیاسی وەیا بۆرمیهاوی کورد خۆ نایەیت کامێرا بەسەر تاکە داوی ئەو سیفەتەی ڕاگریت، بەڵام هەتا ئێستا ئەو نووسینانەی نووسەرەکانی کورد کە مرۆی کوردیان بە خەڵق ناساندبیٚ لێیان هەڵناستیٚ بابێ فیلمێکی دە دەقیقەیی چەندوچۆنی مرۆیەتییان ڕەنگڕێژ بکەن. ئەمانە ڕاستیی ئەوتۆن دەمەتەقە هەڵناگرن بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە دەرفەتی بەسەر ڕاگەیشتنی سەرلەبەری بابەت لەبەر نووسەری کورددا ئەو فروانە نییە بتوانیٚ زات بکات قەڵەم و کاغەز و چاپەمەنی و مەسرەف و کات و ڕەنج خەرج بکات لە نەخشەکێشانی ئەو لایەنە شەخسییانەی کە بە ڕواڵەت پێوەندیی بەتەنیان لەگەڵ چارەنووس و دەردە کوشندەکانی کۆمەڵدا نییە. ئەمە ڕاستە و زۆریش تاڵە بەڵام خۆ ئەگەر ناو نەبوو دەبیٚ (تیەم) بکەین. لەسەرێکی دیکەشەوە ئەوەی پێی دەڵێین شیکردنەوەی مادی فەرمانێکی ناچاریی بەملدا بڕیوین کە دەبیٚ ڕەفتاری (کەس) لەگەڵ داخوازیی دەوروبەریدا بگونجێنین، دەوروبەریش تەنها کاریگەرە گشتییەکان ناگرێتەوە دەنا دەبوو زۆریەی خەڵق وەکو یەکدی ڕەفتار بکەن. لە دەوروبەردا کاریگەریی تایبەت بە (کەس) شەقڵی دیارتر دەبیٚ پێوەی چونکە مرۆ بەخۆی و بەسەرلەبەری پێکهێنەرەکانی مادی و مەعنەویی خۆیەوە تەعاول لەگەڵ دەوروبەری فرەواندا دەکات نێتر یا سەر دەنیٚ بەملکەچی یان یاغیگەری یان یەکێك لە پلە بیٚ ئەژمارەکانی نێوان ئەو دوو سەرپەرە لە حاڵەتی میرزادا بابێ ئێمەچە پێویست دەوروبەری، لەویش پێویستتر، ئەمیات و ڕەفتاری سروشتکردی باس کراوە لە ناچاریشەوە بەومندە ڕازیم چونکە ڕێگام نییە هەموو شتێك دەربڕم، دەرفەتیش لە گۆڤاردا چەنگ ناکەویٚ بۆ ئەوەی هەموو مومکینیش بگرێتەوە. ئێستا ماوە بڵێم لە میرزادا خەسڵەتی دیکەی بەرچاو دەوان بوون:

یەکیان ئەوە بوو تا ڕادەی بێزبوونەوە ڕقی لە تاکپەرستی بوو. ئەگەر قسە سیاسییەکانی گرد بکرێنەوە بەشێکی بەهۆزی ڕەخنەگرتن و عەیب دۆزینەوە و درۆ بەسەر گرتنەوە بوو لەو کەڵەمێردانەی ناویان بەتەقدیسەوە دەهات.

لە زۆر باردا ئەوانەی بە دوژمنی میللەتەکەیان دادەنا. نابیٚ لە بیر بکەین خەڵق تێکڕا نازان لە عەیبدارکردنی سەرۆکی باوەڕ پێکراوی عەمری خۆیان کەچی کوڕنوو

دەبەن بۆ ئەوەی خۆیان کە بەلای غەیرەوە عەیبدارە هەرچی میرزا بوو لە ئاست هەموو باوەڕێك و باوەڕ پێکراوێك بیروڕای خۆی هەبوو. کورتەی قسە ئەوەیە میرزا تاکتەپەرستێك بوو تاکی نەبێ.

خەسڵەتی دیکەی کە ئەویش سێبەرێکی یەکەمیانە ئەوە بوو خۆی بە گچکەی کەس نەدەزانی. هەرچەند ڕازی بوو بە پایەی خۆی لە کۆمەلایەتی، بەڵکو ڕەنگە بەهۆی ئەو ڕازیبوونەیەوە بووبێ کە ژوورچوونی بە مایەی شانازی نەدەزانی، بەرەویێژ وەستانی خۆی و هی وەك خۆیشی بە مایەی کەسایەتی نەدەزانی. هەتا بڵێی لەنگەرپەستنی واقیع لەسەر ئەو بارەی کە ئەوی تێدا بەرەژێرە بێ تەزاندن و داڕووشاندن بەسەر هەستیدا دەهات. نامەوێ بڵێم میرزا بەتەما بوو یان دەیەویست ئەو لەنگەرە هەر وەها بەردەوام بێ و نەگۆڕێ، ئەخێر بەلەنگەرێکی بەدی دادەنا بەلام نەوپستنی ئەو لەنگەرە نەیدەخستە سەر هەڵپەی بێ جێ و پەلەی بێ سەروبەر. تا ئەو ڕۆژەی باری کۆمەلایەتی بە چاکتردا دەگۆڕێ میرزا لە پایەی خۆیدا چەسپاو بوو. کە یەکێکی لە خۆی بەرەژوورتری پێدا ڕابووردبایە بەرزەپێ بۆی بڵند نەدەبوو مەگەر لە ڕێدا بەموحتەرەمی زانیبێ. لێرەشدا نامەوێ بڵێم میرزا شەڕی بەدنیا دەفرۆشت. حورمەتی ئەو حاکمە دادپەرسەی دەگرت کە خۆی کاتب بوو لای بەلام بێ قانوونیی بۆ نەدەکرد و مەلەی بێ دەگوتەوە و لە حاڵەتی چوونە کەشفی لادێ داب و دەستووری خەڵقەکەی تێ دەگەیاند جا ئەگەر قسەی نەبیستبایە لێی بێباك دەبوو.

کوردپەروەری بێ فێڵ بەلای میرزاوە چەندی بڵێی ڕێز لێگیراو بوو بەلام کوێرانە و دەروێشانە ڕێزی نەدەبەخشییەوە.

هەرچەند لە سنووری قانووندا پێی بە خواری دانەدەنا ئەمما ئەگەر بۆزەمباوی هەژاری بەدەست قەرزەوە سەغڵەت دیتبایە وەیا لە شکاتی تێوەگلاندن و پێوەکردندا عەتەری گیران و مەسئوولبوونی بۆ کابرا چاوەڕوان کردبایە تێی دەگەیاند چ بڵێت و بکات باشە بۆی. بیزانیبایە خەڵق قسەکانی دەبەن لە بن لێوانەوە وەك یەکێکی قسە لەگەڵ خۆیدا بکات چی پێویست بوو بۆی دەردکاند. کە لە یەکێکی وەکو منی تەقیە نەدەکرد بەڕوونی هەژارەکەی تێ دەگەیاند، لە زۆر باردا ئەزوحاڵی گەلالە دەکرد کە مافی هەژارەکە بپارێزێت بەلام ئەك بەهەتی خۆی. میرزاش و سەمەدی حاجی محەمەدی بەئەنا کە بە سەمەدی حاجی مەتجەل بێ قانوونی ڕۆیشتبایە. حسێن بازیانیش، خوا لەو و لەوانی دیکەش خۆش بێ، ئەو جورئەتەی لێ چاوەڕوان دەکرا.

چەند کاتێك هەبوون لە ناکامی پاکی و زانین و بێ ترسییانەوە حاکمەکان کۆمەیان لێ دەکردن.

میرزا هەروەك دەنگە خۆشەکەی بەکار نەهێنا دەسەڵاتی نووسەنیشی لە بیر خۆی بردەوە لەلایەکەوە وەزیفەی میری بۆ تەبیاتی ئەو شتێك نەبوو لەگەڵ نووسینی سەر بە سیاسەتی بەرەو کوردایەتی بگونجێت. لەلایەکی دیکەشەوە کە بوو بە مووەزەف جارێ شلك بوو مابووی لە ڕۆشنبیری و بەهرەی نووسەری دابمەزرێت، دواتریش کە وردەوردە هێزی قەڵەمی لە مەیدانی نووسینی ڕەسمی گەشەی کرد. چاپەمەنیی کوردی گەشەی نەکردبوو، لە پارێکیشدا نەبوو وەکو ئەوانەی لە چلەکاندا بە نووسەری کورد ناسران پێوەندیی بە جیهانی نووسین و بڵاوکردنەوەی کوردییەوە هەبێت. کە لە کەرکووکیش مەڵقەمنا بەرەو کۆیێ و ڕانیە و قەڵادزە هەر بە کاتبی، بەجارێ لە هەرێمی نەخسووناوی (وشەنووسی) دوور کەوتەوە ئەگەر لە چلەکاندا بۆی ڕێك بکەوتایە ساوەیەك لە بەندیخانە بمێنێتەوە باییی ئەوە بکات گەڕانەوەی بۆ وەزیفە وەزەحمەت بکەوێ دەشیا ڕێگەی نووسین بگرێتە بەر و تێشی بناسرێت هەر نەبێ لە دوو بابەت، هونەری (مۆسیقا و دەنگ) و سیاسەتی کوردبایەت. لە مۆسیقا چەند ڕۆژێکان پەنجەی لە عوود (یان کەمان) ڕاهێنا و (ڕێ، می، فا...)یشی لەگەڵ مامۆستایەکیدا گوتەوە. هەر لەویشم ئەو زاراوە مۆسیقییانە بیست بەڵام خێرا پشتی تێ کرد و بۆی نەچووەوە بەهەمەحاڵ وزەی هونەری و نەعمیی لای میرزا، تا ڕادەیەك، بوونە قوربانیی تەبیاتی دوورەپارێزی و مەشرەبی هاکی و خۆهەڵنەدانەوە و ئەو جۆرە هەسڵەتانەی.

کە بە وردی سەرنج لە میرزا ڕادەگرم نموونەی مرۆیەکم بە بەر زەیندا تێ دەپەڕێت کە بە کەڵکی ژیانی ئارام و کۆمەڵایەتیی بێ هەرای وەکو سوید و نەرویج دێت کە بەرهەم و تێری و ڕێکوپێکی بەخەڵق دەبەخشێت و تاکە پەك پاڵەوانی سیاسەت و فارمانی بگرە بەرمەمەی بۆ نارسکێنێت. لە شوێنی وەها هێمندا پاڵەوان سەر بەرز بکاتەوە حەپسی دەکەن.

## مەرگی میرزا

لە هاوینی ساڵی ١٩٧٨ ماوەی چەند مانگێکی حەسانەوەم لە (عمان) پایەتەختی ئوردون ڕابوارد. شەوێك بە عادەتی هەمیشەیی، لە ساڵۆنی ئۆتێل، مێوانانی بە دەموردوو کۆمەڵ بوویبووین قسەی بابەتمان دەکرد. لە سۆنگەی شتێکەوە گوتم، حەز لە

زۆرەی زیلی تەلەفۆن ناکەم، ئەم حەزنەکردنەشم شەرح دا... دوای ئەم قسەیەم تا کۆبوونەوەی سبەی شەومان، لە بەغداوە تەلەفۆنێك و لە لەندەنەوە دوو تەلەفۆنم بۆ کرا مەرگی پێنج خزم و دۆستمیان پێ ڕاگەیاندم، یەکێك لەوان مەرگی میرزا بوو لە لەندەنەوە پێم گەیشت. تەلەفۆنەکەی بەغدا جارێ خەبەری کۆیە و هەولێری نەبیستبوو. پێی ناوێ بڵێم لەخۆوە دیارە خەبەری ئەوتۆیی لە غەریبیدا چ کارێك دەکاتە سەر کانیاوی هەست و سۆز لە دەرووندا. لەو دەمەوە کە ئاشکرا بوو مەرگ شوێنەواری خەباتە هێمنە پڕ خەتەرە بێ ناو و شۆرەتەکەی میرزا کوێر دەکاتەوە بە دڵ بەرباری ئەرزێکی ئەدەبیی قورس بووم بەوەدا کەوا لە دەرفەت و بەهێنی توانین تۆز و ڕێی فەرامۆشی لە وێنە ونەکەی بتەکێنم، بەم گوتارەش بەشێکی قەرزەکەم لەسەر لادەچێ چونکە کەسایەتیی میرزا مارێتی بەمافی خۆی بگات لە جلوەبەستن و تێرڕەنگی.

کاروان، ژمارە ٤٩، ١٩٨٦

# مەرگی تاڵ و ژارا ئاوناوە شیرینیت..

بەدەم ڕۆژگارەوە، لە ژێر ئاسمانی شینا.. بەتەك گوڵ و بولبولی گوڵ و ویلدا، هەنگاوی شەکەتبووی هەزاران هەزار ساڵەی ئادەمی نەخشی کەنەفتی و پەژارەی خۆی لە ڕێبازی سەخت و دڕکاویی ئەم «ئەرزە کۆنە هەوارە» وەك مۆرکی باپای گومان لێکراوی دەفتەری پۆلیسخانە چەسپ کردووە. هەموو نیگایەکی سەرنجدەری بەرەو ڕابووردوو و لیستەی بێ برانەوەی ئاڵقە لە دوا ئاڵقەی شێوە زنجیرەی هەڵکەوتی دڕندە و ڕووداوی بڕندە و دیمەنی تاریك و مۆنی تابلۆی نەهار و نەساز دەخوێنێتەوە.. چەندێکی خەیاڵم گێژابێت لە دۆزینەوەی موعادەلەیەکی ساختە کە تێیدا (س – نوێنەری خۆشی) زاڵ بێت بەسەر (د – نوێنەری ناخۆشی)دا هەمیشە کشاوەتەوە بەرەو ئەنجامی ناقۆڵای ناحەزی نەویستراوی خەفەبوونی (ئا) لە ژێر سەنگی (نا)دا هەر لەو وەختەوە کە بەر لە هەزاران ساڵ دیمەنێکی لێ بەدی دەکەین تا ئەم ڕۆژانەی بەدوا جەنگ لەسەر جەنگی بێ ناوەرۆکدا خەریکین بەرامبەر پلوروسکەی خوێنی دەیان هەزار مرۆی بێ تاوان بە پانایی ڕووی ئەم زەوییەی پەسەییدا چاو بزرکاو و حەپەساو دەبین.. من باپایێکم لەوانەی بەشاسانی و زوو بەزوو برژەبرژی برینیان داناکەوێت.. لەوانەم بەتەنیشت و پێرخی ساڵی خەفەتبارەوە سەحلەبی و لوقمەقازییان بۆ ئاوا ناکرێت..

نەك چونکە ڕەشبینی لە مندا بەرپابەوە هەستی نایەتی (سلبی)ی خرۆشاندووە بە پێچەوانە، ئەوەندە بۆ نایەتی (ایجابیة) هەستیارم و وەها شەیدای کامەرانی و خۆشی و بێ ئازاری و تەبایی و ڕەهاییم هەموو هۆیەکی ناپەسەندی ئاژاوە و دەم تێکنان و بەکتر ئازاردان وەها دەبوغزێنم سەد ئەوەندەی خۆی پێی ئاشارام دەبم. بۆ جووجەڵەیەکی لە خۆڕایی بەساوایی بمرێت خەفەتی خۆی و ئەو هێلکە و مریشك و کەڵەشێرانەش دەخۆم کە ئەگەر جووجەڵەکە بوویایە مریشك لێی دەکەوتنەوە.

هەر ئەم تینوویەتییەم بۆ ترووسکەی خۆشی وەهای کرد ڕێکەوتی تێ هەڵئەنگووتنم لە یادنامەی دوو دۆستی کۆچکردووم شیرنایی لەو مەرگە تاڵە بگێڕێت کە دێت ئازیزێك لە کفنی نەبوون و بەسەرچوونا دەپێچێتەوە، سۆزێك لە دەروونا دەگرێنێت گەلێك زامدارترە لەو سۆزەی بۆ ئازیزێکی ئاوارە و سەفەرکردوو دەگیرسێتەوە.

ناگەهان و بێ مەبەست، چەند کاغەزێکی لێ نووسراوی بەرەو ژوورەوە قەدکراو، لە پڕ کەوتە بەرچاو و ناوەستەمەوە. دیمەنی زەرد هەڵگەڕاو و تۆزێکی لێی نیشتبوو پتر لە دە ساڵی گۆشەگیری و سەرنانەوەی ڕاەگەیاند..

هەڵم گێڕایەوە بەرەو ڕوو؛ لە سەرووی هەوڵ لاپەڕەی دەستووسم خوێندەوە:

دەسکەوتی خەبات

لە تەنیشتی دەستە چەپەوەی (هێمن)ی بێ نوختەی (ی)ەکەی نووسراوە و هەتێکی بەزێردا کێشراوە.

گورج هێمن و ڕۆژەکەی ئاهەنگی پەرەی لادان لە ڕووی پەیکەری حاجی قادرم هاتەوە بیر کە هێمنیش شاکارێکی خۆی تێدا خوێندەوە. ئەو ڕۆژە ڕێکەوتی ١٩٧٣/١١/٢٩ بوو. لە پەراوێزی لای دەستە چەپی پەڕی هەرە دوایندا هێمن ١٩٧٣/١١/٢٦ی داناوە بە ڕۆژی لێبوونەوە لە نووسینی شاکارەکە. چاکم لە بیرە، چەند ڕۆژێکی بەر لە ئاهەنگەکە بەشێکی بەرچاو لە بەشدارەکانی ئاهەنگ گەیشتنە کۆیێ... گرووپی هێمن و مەلا ڕەسووڵ و هەڤاڵە کوردە ئێرانییەکان لەوانە بوون.

لەو چەند ڕۆژانەدا، فرەکات پەکترمان دەدیت و زۆر جار لە ماڵی کاك مەجیدی ئامۆزام کە ئەوسا لە ناو شار بوو منیش لێ دابەزی بووم، پەیەکەوە کۆ دەبووینەوە. لەو ١٩٧٣/١١/٢٦ەوە دەبارە هێمن بڕە شیعرەکەی لەو ڕۆژەدا هۆنیتەوە. ئەگەر بیرکولی فێلم لێ نەکات لە هەوڵەوە وەمام دەزانی کەوا لە شەوی پێش ڕۆژی ئاهەنگەکە هێمن هەڵیڕژا و دەروونی خۆی لەو ئاگرە شلە بوركانییە بەتاڵ کرد. ئەوەی ڕاستی بێت من خۆم بۆم نەلوا تا شەوی پێش ئاهەنگەکە هیچ بنووسم.

هەواوڕاستان لە شەوە درێژەکانی کۆتایی ساڵ بوو، بەمەرییەوە هەبوو خۆی لێك بکێشێتەوە. وا بێ دەچێ بەهەمیاڵی ئەوەی کە خۆم لەو شەوەدا دەرروونم گووڕا بە نووسینەکەم وەها لە مجێژم خۆش هاتبێ کە هێمنیش وەکو من تا ئەو شەوە هەر پەنگاوی دانێتەوە سەرەڕای ئەوەی کە نایەتە بیرم هێمن لەو ڕۆژانەدا گوتبێتی جارێ هیچی نەنووسیوە بەهەمەحاڵ وەك لە لاپەڕە ٢٩٧ی دیوانی (تاریك و ڕوون)دا دەردەکەوێت هێمن هەتا بەرەبەیانی ١٩٧٣/١١/٢٦ خەریك بووە ڕەنگە ڕۆژی پێش ئەو بەرەبەیانەش گەیشتبێتە کۆیێ..

نوسخەی لای من کە بەخەتی هێمن نووسراوەتەوە لەوانەیە ئەوە بێ کە لە ئاهەنگدا

بەدەستییەوە بوو دەیخوێندەوە. ئەگەر ڕاستی بۆ چووبێتم، چ هۆی گومانیش لەوەدا هەڵناستێت، پێوەندیی زیندە دۆستایەتی و برایەتی وەهای لێ خۆش هێناوە نوسخەکە بە من ببەخشێت کە ئاشکاری نووسینی هەوەڵ جاریێ دیارە وەیا هەر نەبێ نووسینەوەی هەوەڵ جار، چونکە لە چەندین جێگە ڕاستکردنەوە و گۆڕینی داڕشتن و وشە تێتر نجاندن بەرچاو دەکەوێت. لە نیوەی دووەمی دێرە شیعری یەکەمی قەسیدەکە وشەیەك پەڕیوە کە گەڕامەوە بۆ ئەو دەقەی لە دیوانی (تاریك و ڕوون)دا بڵاو بووەتەوە میسرەعەکە بێ کەم و کەسر ئەمە بوو:

نە شۆڕەێن ورینگەی دێ لەبەر بێر

لە دەستنووسی لای مندا وشەی (بەر) پەڕیوە لەمەدا بیر بۆ ئەوە دەچێت کە نوسخەکەی لای من لەسەر یەکێکی دیکە نووسرابێتەوە بەڵام شوێنی دیکە هەن بە پێچەوانەوە ڕادەگەیەنێ، لە دێری دووەمی شیعرەکە وشەی (کیژ)ی لە بیر چووە، هاتووە خەتێکی بۆ هەڵکێشاوە و لە سەرووی دێرەکەی نووسیوە. لە دێری چوارەمیندا هەوەڵ جار نووسیویەتی، پەڕیوە سونبول و پێخوستە سوورگوڵ. ئینجا هاتووە وشەکانی یەقەڵەم سڕیوەتەوە لە سەرووی سونبول سوورگوڵی نووسیوە خەتێکیشی لە سوورگوڵەوە بۆ پەراوێزی کاغەزەکە ڕاکێشاوە و سونبولی نووسیوە. ئەمەشیان دەشێ هی نووسینەوەی دواتر بێت بەڵام لە دێری ٢٩دا [کە لە دیوانەکەدا کەوتووەتە لاپەڕە ٢١٢] هەوەڵ جار نووسیویەتی:

قریوە و چۆپی و گورمندە و سەمایە

ئینجا هاتووە خەتی بەسەر هێندێکی داهێناوە و نیوە دێرەکەی وەها گۆڕیوە:

قریوە و داوەت و چۆپی و سەمایە

خەتی دووەم جاریێ بە قەڵەمێکی جودا نووسیوە هەر ئەم دەقەیشە لە دیوانەکەدا چاپ کراوە لە چەند جێگەی دیکەش وشەی ڕەش کردوونەوە و گۆڕینێکی تێدا کردوون لە سەرەوەی نووسیونەتەوە:

لەدەستنووسەکەدا نووسیویەتی:

بوتی صاحب دلانی دڵ بەسۆیە

کەچی لە دیوانەکە (صاحب دلانی) بووەتە (ساحەب دلانی).

دیارە دواتر ئەم گۆڕانە کراوە کە ئەویستراوە پیتی (ص) بێتە ناو ڕێنووسی تازەوە لەدەستنووسەکەدا نووسراوە:

بەگژ خۆمانە و بێگانەدا چووی

لە دیوانەکەدا بووەتە:

بەگژ بێگانە و خۆمانەدا چووی

لەمانە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە دێڕە شیعرێکی سەرلەبەری ناو دەستنووسەکە لە دیوانەکەدا دەرنەکەوتووە. دەقی دێڕە شیعرەکە ئەمەیە:

کە شیعری تۆ ئەمایە هاندەری کورد
ئەوێستا جۆڵ و هۆڵ بوو سەنگەری کورد

ئەم دێڕە دەکەوێتە دوای دێڕی پێنجەمی لاپەڕە ٢١٥ی دیوانەکە. هەر چۆنێک بووبێت برایەتی و دۆستایەتیی هێمن و من بەوەندە زیاد و کەم ناکات ئایا کام نوسخە لە کامیان گیراوەتەوە.

ئەم دە لاپەڕەیەی تەمەن ١٢- ١٣ ساڵی کە ڕۆژی کۆتاییی مانگی مایسی ١٩٨٩ بەناکاو ئەمانەتەکەی هێمنی خستە دەستمەوە زۆر یادی لەبیرنەکراوی هێمن و برا پەنابەرەکانی کوردی کوردستانی ئێرانی لە پەردەی بیرکردنەوەمدا تیژرەنگتر کردەوە، ئەخشتێکیش بە کڕاندنی ژەنگی فەرامۆشی، هەستی ئەوە خەواڵووم داڕووشایەوە بەتایبەت بۆ ئەوانەی بەر زەبری قەدەر کەوتن و بوونە قوربانیی سەربڕاوی دوای ساڵانی ساڵی ئاوارەیی و بێ ئۆقرەیی و ناکامی و تەنگەتاوی. لە نموونەدا دەڵێم چ هێزێکی عادەتیی لە بیربەرەوە زەبەحی و قزڵجیم لێ دەشارێتەوە؟ لەتێکی دڵم لایانە؛ هەندێ جار خەیاڵی بڵاو شەرم پێ دەفرۆشێت و لێم دەبزرکێنێت و دەڵێت: ئەو شێت و شەیدایانەی وەتەنپەرست و باوەڕ قایم لە کوێوە زیاد لە ملیۆنان خەڵقی تەسەڵ و ئەوە تەسەڵ نیدای غەیبیان بیست کە هەر دەبێ «کۆتە لە دەس و دەس لە مل و مل لە تەنافا» بن؟ چ وەکالەتیان لەو حەشاماتە وەرگرتبوو؟ کەس هاتبوو دەست و پێیان ماچ بکات هەتا خۆ بهاوێنە باوەشی بەندیخانە و شکەنجە و مەرگەوە؟ چ عەیب و شوورەیی پەخەی دەگرتن ئەگەر وەکو ملیۆنان مەردمی گۆشەگیری بەرژەوەند بێن ژیانێکی بێ بەندی و ئازار و خنکاندیان ڕابواردایە؟ چ دەبوو هەر هێندەی «جەماهیر» بۆ مافە ئەوە خوراوەکان گیانبازییان کردبایە؟ مەتەڵە و هەڵنەهاتووە یان من هۆشم تێ بڕ ناکات

لەوەدا کە دەبینین لەخۆبووردووەکان و گیانبازەکان سەریان دەسووڕێت و بادەدەنەوە بۆ لای یەکتر لەناوبردن هەر دەڵێی بەسازی دوژمن هەڵدەپەڕن؟ بەو ئاگر و نوورەی فریشتان هیچیان مەتەڵ نین. مەتەڵ ئەمێ مرۆڤەکە خۆیەتی کە خوتخوتە چووە دڵییەوە ئۆقرەی لێ هەڵدەگیرێت، هەتا کرمی دڵی دائەمرێنێ ناسرەوێت.. سەیری مەراقی بۆکەرچی و دامەچی و ڕاوکەر و کۆترەباز و تاوڵەباز و ڕێسزباز و مێباز و هەمەبازێك بکەیت، هەریەکە لە مەیدانی خۆیدا وەکو نیشتمانپەروەر و چینپەروەر و شێخپەروەر خەو و خۆراکی لێ حەرام دەبێت هەتا مەراقەکەی دادەمرکێنێ، ئەویش بۆ ماوەیەك. ئینجا ئەمە مەراقی تاوڵە و دۆمینە و چگێنە حکوومەتی لێ بەخەبەر نایەت وەك کە لە بابای سیاسی بەدەنگ دێت، وەهاش دەبێ لزووم بەحکوومەت نەبینێ کە دۆمینەبازەکان خۆیان لەسەر هەبی بەبازێك یەکدی دادەپڵۆسن. ئینجا هەروەك پێویستە پێتۆڵێکی کەیفچی ببری لە تاوڵە و دۆمینە و دامە کردبێت و دای هێنابێ و خەڵق پێیانەوە مەراقگرتبوو بێ هەروەهاش دەبێ بزووتنەوەی چینپەروەری و دینپەروەری و نیشتمانپەروەری لە یەزدانی مێژوو گووڕابێت ئینجا خەڵقی بۆ شەیدا بێت، ئەوساش لە پێشەوە نازاندرێت کێ لە ڕاست و کێ لە چەپ و کێ لە ناوەندا دەبڕوات و چەندی لێ بەدەوام دەبێت و چەندی بۆ شەیدا دەبێت.

سەرێکی تێوە ڕامان لە هێمن خوار بکەینەوە دەبینین بەچارەنووسێکەوە گیرسایەوە دوور لە هەموو حیسابیان بوو. لە جیاتی ئەوەی لاپەڕەی مێژووی نیستیمار، حەمە ڕەزا پەهلەوی، دەرگەی بەهەشتی بۆ بکاتەوە کەچی بەخۆی و چارەنووس و ڕابووردوویەوە بوو بەپێنۆکێکی شەوەزەنگی بێ تالعتری و بەدبەختتری و قوڕبەسەرتری لە چاو ڕۆژانی غەریبی و ئاوارەیی... هەزار ڕەحمەت لە کفنەزی پێشوو، بەڵام چ فایدە دوای مردنی حەمە ڕەزا ئومێد بەو کفنەزەش نەما! ناچارین چاوەنۆڕی مێژووی دیکەی کۆنە جەمسەنمەکە بکەین. هەتا فریشتەیەکی عەرشی بەرین لە پەردەی غەیبەوە سەر وەدەربەنێت.. بێ و قەسەمی بەخێر، چەند قێنکە بای باڵە ڕەنگارەکانت.

لەو ساڵانەدا کە هێمن پەنابەری عێراق بوو منیش وەکو هەزاران هەزار کوردی گەنج و پیر، کوڕ و کچ، چەپ و ڕاست، دۆستێکی قەدرزانی ڕێزلێنەری دڵ لە دەستداوی بووم. پاش ئەوەی نشیمەنم بووە بەغدا هێمنیش هەر بووە بەغدایی، یەکتر دیتن و پێکەوە ژیانمان وەها بوو دەروون بۆ یەکتر بکەینەوە. لەو حەفت ساڵ و نیوەی سەرەتاکانی ١٩٧١ و حوزەیرانی ١٩٧٨ کە لە کۆڕی زانیاری کورد ئەندام بووم و سێ

ساڵی دوایینیشم بەجێگری سەرۆکی کۆڕ بردە سەر حەفتەی چەند جارێك یەکترمان دەدیت هەر ئەبێ کە من دەمراستی سێ لیژنەی زمان و ئەدەب و فەرهەنگ بووم هێمنیش تێیاندا ئەندام بوو. هەفتەی دوو جاران بۆ ڕێزمان کۆ دەبووینەوە بۆ ئەدەبیش بەلای کەمەوە جارێك. ناوناوەیش بۆ فەرهەنگ جگە لەوەی کە خۆی و هاوڕێکانیشی بێ حیساب و بێ ژووان سەردانی کۆڕیان دەکرد و هەر ئەبا بەشێکی ئەو سەردانەیان لای من ڕادەبووارد و کۆڕی ئوکتە و قسەی شیرن و باسی هەمەبابەتیان دەگێڕا. پێی ناوێ بڵێم، لە هەموو دانیشتنەکاندا هێمن ئاخێوەرێکی بەرچاو و سەرنجڕاکێشی بیسەران بوو. بابایەك بوو قسە بەتامی نوکتە ئارای کەشکۆڵ ئاوەدان کە بەپێی بابەتێ قسە لێوەکردن بتوانێ کوتاڵ و کالای گوتە سنجی. چ لە شیعر و ئەدەب بێت و چ لە خەبەر و گێڕانەوەی ڕووداو بێت و چ لە بیروڕای پێوەند بە ناوەوە و دەرەوەی وڵات وەیا سەر بەفکر و سیاسەتەوە بێت. تا ئەو تەرزە کوتاڵ و کالایە بخاتە بازاڕی کڕیار و نرخێنەر و ڕەخنەسازانەوە. هێمن لە وتوویژی هیچ مەجلیسێك دانەدەما. لە منداڵییەوە ڕاهاتووی ئاڵقەی قسەڕەوان و ئەدەبدۆست و خوێندەواران و کارگوزاران بوو. بۆ خۆیشی بەهرەی ڕاوێژی سازگار و ئارداوێژی لەباری هەبوو کە لە شیعر و پەخشانیشدا بەرەو ڕیزی هەرە پێشەوەی ئەدیب و نووسەرانی کوردییەوە برد.

هێمن خۆی و هەڤاڵەکانی و تێکڕای برا کوردە ئێرانییە پەنابەرەکان دۆست و خۆشەویست و جێی متمانەم بوون. وا بزانم هەمان هەستیش لەوانەوە بۆ من پەندی «دڵ ئاوێنەی دڵە»ی بەڕاست دەگێڕا. لە پەراوێزی تەسکی دەسەڵاتدا کە وەها دەبوو بەعەیارەی حاڵ و باری ئەوان بەتەسك حیساب نەکرێت، پایەی ئەو برا کوردانە لای من ڕەنگی تەقدیسی پێوە بوو، ئیستاشی لەگەڵدا بێت.. هەرگیز نەمانتوانی هێندەی کە من خۆشم ویستن خۆیانیان خۆش بویێت دەنا ئەدەشیا ناوناوە ساردیییان بکەوێتە نێوانەوە.

پێوەندیی توندوتۆڵی ئەو برایانە بەکۆڕ و منیشەوە بەشێکی بەرچاوی لە کەسانی دڵ کرمێ و دەروون کەرواوی و هەناسە بێگەنی بێ شەرم و شکۆ بەرەو پیسکە ڕێگەیەکەوە برد هەرگیزاوهەرگیز چ مرۆیەکی پێدا ناڕوات بایی تۆزقاڵێك هەستی مەردایەتیی تێدا هەبێت. شکاتیان گەیاندە بەرزترین پایەی دەوڵەتی کە ئەو کوردە پەنابەرانە هەمووی جاسووسی ساڤاکی ئێرانن ئینجا کۆڕی زانیاری کوردیش

بەهۆیانەوە بوومە دایەرەیەکی ساقاك. دوو جاران لە حکوومەتەوە لێ پرس هاتنە لام لە کۆڕ و پرسیارم لێ کرا لەبارەی ئەو تۆمەتەوە. حکوومەت لە من و لەو کەسانەش باشتر دەزانی کە تۆمەتەکە لە زرە بوختانێکی شەرمهێنەوە زیاتر نییە بەڵام دەبوو بەرواڵەت لەبارەیەوە پرسێك بکات چونکە دەستەیەکی هوروهوب بە ئاگاداری هەندێ کاربەدەستی کوردەوە بوختانەکەیان هەڵبەستبوو.

وەڵامی پێویستم دایەوە کە لە حوکمی بەندەکانی یاسای کۆڕی زانیاری کوردەوە هەڵدەستا. لە یاساکەدا هاتبوو کە دەبێ ئەندامی کارا لە کوردی غەیری عێراق هەڵبژێردرێن و ساڵی مانگێك ئەو ئەندامە کارایانە داوەت بکرێن بۆ بەشداربوون لە کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی کۆڕ و پاداشیان بدرێتێ و مەسرەفی هاتوچۆ و میوانەتیشیان لەسەر ئەرکی کۆڕ بێت. ئەو برا کوردە ئێرانییانە تێیاندا هەیە ئەندامی کارا و ئەندامی یاریدەری کۆڕن کە بەپێی فەرمانی یاسایەکی حکوومەتی (بعث) دایناوە ئەو سیفەتەیان وەرگرتووە. کۆڕ هەتا ئێستاش [واتە هەتا دەمی شکاتەکە] قوسوری کردووە لەوەدا کە هیچ کامێك لەو ئەندامانەی کوردی ئێران و هی یەکێتیی سۆڤیەت و شوێنی دیکەشی بانگهێشتن نەکردووە. ئەوەندە ئەبێ کە د. عەبدوڕەحمان قاسملو وەختێکی لە خۆوە میوانی عێراق بوویێت بۆ کۆبوونەوەکانمان داوەت کراوە چونکە یەکێکە لەو کوردانەی غەیری عێراق کە بەئەندامی کارا هەڵبژێردراون. ئەویش و هەموو یەنابەرە بەرێزەکانی دیکەش لە کوردی کوردستانی ئێران میوانی حکوومەتی عێراقن ئیتر (ساقاکایەتی) لە کوێوە هەڵقوولیوە. شکاتەکە ئیشایەوە هەرچەند وەها دەزانم فتیل خۆشکەری ئەو کارە بەهەتما لەلا یەنێکەوە بەخۆی ڕەوا دیت لە چەقی درۆ و بوختانی وەها ڕەجاڵدا هەڵوەستێت. دواتر ناوی ئەو خەبەردەرانەم لە بەرپرسێکی زۆر گەورە بیست کە بەقێزەوە باسی دەرکردن.

من هەرگیز لە هێمن و هەڤاڵەکانیم نەپرسی ئایا هەڵوەستیان بەرانبەر ئەو تەرزە کەسانە چ دەبێت چونکە پرسی ئەوتۆیی لەوبارەی ئەوانی تێدا بوون بە ئاوارەیی و پەنابەری، دەبوو بەرێگە لێیرینەوە لەو ڕووەوە کە لە تەنگەتاوی و بێ دەرەتانیدا مرۆ ناچار دەبێ سەر بە ماڵی دوژمندا بگرێت.

لە وتووێژدا کە باسی پێوەندیی باپیرم، حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیم بە ماڵی قازی و ئەمین ئەلئیسلامی سابڵاغەوە کرد هێمن کوتی خۆی نەوەی ئەمین ئەلئیسلامە.

لەمەوە دەرکەوت، تازە دەزووی تەتەنەوەی دۆستایەتیی نەوانمان لە ریشاڵی بنەیەکی سەد ساڵیی ئاشنایی و تەمەکاری کۆچ کردووانمان دەناڵێت. لەو کۆنە نامانەی بەر لە سووتانی بروبزگور و کەلوپەل و کتێب و متێبی زوورەکانی نهۆمی خوارەوەی ماڵەکەمان، ساڵی ١٩٦٣، نەکەوت وەلامنامەیەکە لە حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادەی باپیرمەوە بۆ (امین الاسلام)ی سابلاغ، سەرەتاکەی بەم دوو بەیتە دەست پێ دەکات:

آنــکــه امــروز اکــرام است
نور ایمان أمین الاسلام است
مــلــك صــاوجــبــلاغ أزيمنش
مرجع خاص ملجا عام است

بەدوا ئەمەدا سپاسنامەی کاغەز و دیاریی ئەمین ئەلئیسلام دێت کە (هەزار پیشە)یەکی تاقمی چایەی بۆ باپیرم هەناردووە. سەیر لەوەدایە کە ئەم تەرزە پێوەندییەی بەر لە سەد ساڵ بەو هەموو زەحمەتی بەیەکتر گەیشتن، لە خۆوە و بێ هۆی دەستنیشانی وەك ئاوارەبوون و لێقەومان بەردەوام بووە کەچی لە سەردەمی سەیارە و رادیۆ و فڕۆکە و پۆستەی چالاك، لە کۆتاییی سەدەی بیستەمدا هێمن و من لە یەکدیمان نەدەبیست، چ جایی برادەر بین. ئەگەر حەمە رەزای پەهلەوی لە پیاوچاکیی خۆیەوە هێمنی بەدیاری نەناردبایە بۆمان. بەلام دەبێ لە بیر نەکەین کەوا بەر لە سەد ساڵ و دووسەد ساڵ حکوومەتەکان وەکو ئێستا هاتوچۆی خەڵقیان مەنع نەدەکرد، بگرە ئەوسا چارێ بۆ حەشاماتی خەڵق پاسپۆرت و ڤیزەش جێی لێتۆزینەوە نەبوو.

بگەڕێمەوە بۆ قەسیدەکەی هێمن، کارم بەبەشێکی دوو لاپەڕەی دوایینی شیعرەکەوە هەیە:

لەو دێرە شیعرانەدا هێمن سۆز و مەهارەتی تێکەڵ کردوون، پێیانەوە بەرەژوور تێ هەڵکشیوە هەتا سنووری سەرسووڕکێی خەیاڵی بیسەر لەگەڵیدا باڵ دەگرێت.

لەسەر سەکۆی مەدحێکی زێدە هەستوخۆڵی حاجییەوە کە بەم چوار بەیتە دەیگەیەنێتە تۆقەڵە:

بەری دیوانەکەت گەنج و خەزێنە
وشەی شیرینی تۆ دوڕمن تەزێنە

هەموو پەندن قسەی سووك و دزێوت
وەكو پالّی پەری پاكە جنێوت
بەنرخە، تازەیە، بەرزە، بەعێزە
ئەوی فەرمووت لەبارەی پیاوی دێزە
ئەگەر كوردێك قسەی بابی نەزانی
مـــحـــقـــق ... ... .... .... زانـــی

بەدوا ئەمەدا، پاش سێ دێر لە هەڵدانەوەی دەوری شیعری حاجی بۆ بزاوتنی گیانی شۆڕشگێرانە لە دەمار و مێشكی « كورە كورد»دا دەستەملانێی واقیعی بێ فێڵ دەبێت و كەسەری تازە هەڵدەڕێژێت:

ئەوێستاش دەربەكورد نەكرا عیلاجی
ئەوێستاش كوردی كۆیلە ماوە حاجی

ئەم بەیتە و چەند بەیتێكی دیكەی وەك:

ئەوێستاش هەر دەمانكەن تیرباران
دەتەخشێنن بە خوێن كۆڵانی شاران

دڵی بۆ كوردستانی دیوی ئێران و غەیری ئەویش لێ دەدات بەهێنی والقیعی ئەو دەمەی شیعرەكەی تێدا دەخوێندنەوە، لەبەرەو كۆتایی ساڵی ۱۹۷۳.. تا لەم دوو بەیتەی خوارەوەدا خۆی دەكا بە كۆتەڵێكی زیندووی حاجی قادرێكی پەر لە ۷٦ ساڵ كۆچكردوو:

ئـەوێستـاش گـۆڕغـەریب زۆرن وەكـو تـۆ
ئـەوێستـاش بـێ نـەسیب زۆرن وەكـو تـۆ
ئەوێستاش بێ كەس و دوورەوەتەن هەن
ئـەوێستـاش شاعیـری پیـر و ڕەبـەن هـەن

شاعیری دوورەوەتەن و پیر و ڕەبەن هێمن خۆیەتی كە لە نوسخەیەكی حاجی قادری سەردەم بوو لەو دەمەدا.. هەقم بوو بڵێم مەرگ ناوناوە شیرینە. ئەگەر مەرگ لە بەیندا نەبوایە ئەو هەموو تام و شام و هێز و پێزە لە دەماری بەیتەكاندا نەدەگەڕا و نەبوو بەچێشتێكی كەمخوێ.. بەڵێ ڕاستە مەرگ و هەموو هۆیەكی ئازار و پەژارە نرخی ئەو زیندە تاو و تینەی بەرهەمی ئەدەبی و هونەریی بریندار لە مرۆ وەردەگرنەوە

و دنیاش بە تێکڕایی و لە هەموو ڕووبێکیشەوە گەش و خۆشتر دەبوو ئەگەر ئازار و کەسەر و سەفتوسۆ فەرپان بزربایە بەلام مادەم دنیا بەکەسەر و خۆشیەوە ئێمان ئالاوە وەیا ئێمە تێی ئالاوین با لە ڕووی ڕاستییەوە، وەك کوردی دەڵێ: قسەیەکی باشیشی بۆ بکەین بەوەدا کە لەوەتەی مرۆڤ تەعبیر لە خۆی دەداتەوە بەهەڵڕشتنی خەفەت و کەسەر فتیلەی چرای مەعنەویاتی هەڵکێشاوە ئەو دڵدارانەی بە ئاگری عیشقەوە سووتان لە یادی پشتاوپشتی زیندووواندا دەژین.. زوڵمی بێ ئامان و سامانی داستانی زوحاك ئەوروزی گەشاندووەتەوە. بەدەگمەنێکی زێدە دەگمەن ئەبێ گەلان بیرێشیان لەوە نەکردووەتەوە ئاهەنگی بیرکردنەوەی خۆشییەك بگێڕن کە هەر خۆشیی ڕووت بووبێت و هێوێنی بەڵایەکی گەورەی تێدا نەبووبێت.

بەهەمەحاڵ لە ساڵی ١٩٧٩باری سیاسیی ئێران گۆڕا و برا پەنابەرەکان دوعاخوازییان لێ کردین بەرەو وڵات و کەسوکاریان، من لە ڕووی نوکتەوە گوتم بەم گۆڕانەی وەزعی ئێران لە دوو کەس قەوما، یەکیان حەمە ڕەزا شا و ئەوی دیکەش هێمن. قسەکەم نوکتە بوو بەڵام دەمزانی هێمن بەزەحمەت بتوانێ لە هیچ شوێنێکی کوردستاندا بگاتە ئەو پایەی خۆشەویستی کە لە کوردستانی عێراقی هەبوو.. خۆی زۆر جاران باس و هەواڵی وەهای بۆ دەگێڕاینەوە لە نموونەی ڕوحەپەرەییی گەنجەکان بۆی، بەتایبەت کیژەکان، کە هەر لە خەیاڵدا شتی وەها بۆ مرۆی ئاسایی دەسازێت کەچی بۆ هێمن بەڕەهایی دەسازا.. ئەوەی من لە دەرووی نوکتەوە بۆ هێمنم کرد بەپێشگۆیی، زۆر بەداخەوە، ڕۆژگار ڕاستییەوە و کردی بەنوکتەیەکی دەسکردی خۆی کە هات (گۆڕغەریبی)یەکەی کە هێمن لە ساڵی ١٩٧٣ بەرانبەر پەیکەری حاجی قادر داد و بڕوی لە دەستاندا دەکرد، زۆر بەسەفتوسۆ و برژەبرژەوە جێگورکێی بێ کرد بۆ جەرگەی زێد و مەفتەن و نشیمەنی لە دیوی کوردستانی ئێران کە زانیمان هێمن دوای گەڕانەوەی بۆ ئەوێ هەناسەی ڕاحەتی تێدا هەڵنەهێنا هەتا بەدڵ شکستەیی و ئۆمێدی کوژاوەوە چاوەکانی بەسەر مەرگی تاریکدا لێك نان ..!

خوێنەر لێم بسەلمێنێ کەهەڵێم هەرگیز دڵم نەیهێنا بپرسمەوە لە چەندوچۆنی ئەو بارە بەرەوازەی بۆ هێمن خیچا چونکە هۆی ئەو ڕووداوە لە هەتای هەرلایەکەوە سەری هەڵدابێت وەهای بێ سەغڵەت دەبم کە تەسکینی تێدا نەبێت، با هەر لە پشت پەردەی گوماندا بێت کە دەتوانم بەمل باری ئالەباری دابپرم..

مەرگ دڕندەیەکی بێ بەزەییە بەلام ژیان خۆیشی لێی دێت بەجۆرێك بزێتەوە

تالابیی مەرگ بەلای شەرنابیدا بیات.. کە بلێم هێمن لە بیر ناکەم شابەدیی بیاوچاکیی خۆمم داوە چونکە هێمن لەگەڵ نەبزی مێژووی خەبات و ئەدەبی کورد فرکە دەکات..

هەروا بەدەم نووسینی ڕووپەڕەکانی سەر بەبابەتی پێشووەوە، دیسان بەڕێکەوتی بێ نیاز، لە کاتی کاغەز دەرهێنان و سەر بەم و بەودا گرتن و سەرەتاکەی بێ لزووم لێرە و لەوێکردندا ڕۆخی کاغەزێکی ناو کتێبێکی بەرگ سپی، بارست مامناوەنجیی بێ نەخش و نیگار بەسەرنجمەوە نووسا و لێی نەبوومەوە. ئەو هێندە نووسینەی کە بەسەر کۆتاییی دێرەکانی کاغەزەکەوە دیار بوو، ڕای دەگەیاند خۆڕاییی نییە کتێبێك بەرە کاغەزێکی لاوەکیی بەهەمناوی خۆیەوە گرتبێ.. سەیری بەرگی کتێبەکەم کرد دیتم لێی نووسراوە:

عیززەددین فەیزی

یەکێتیی نووسەرانی کورد و دوو کۆڕ

بێ ئەوەی زەکای مووقلاش پێویست بێت یەکسەر بیرم بۆ سەراو و دەراوی ئەو کتێب و کاغەزە ڕۆیی. نامەکە هی کاکە سۆرانی مامۆستا عیزەدین فەیزییە لە ڕۆژی ٨ / ٢/ ١٩٨٨ بۆمی نووسیوە و لەگەڵ کتێبەکەدا بۆمی هەناردووە .. پێشتر بە تەلەفۆن لەگەڵمدا دووا و لەسەر خوایشتی خۆم کتێبە باسکراوەکەی بۆم هەنارد تا لە دەرفەتێکدا بۆ بەشێکی ناوەڕۆکی کتێبەکە بچمەوە کە پێوەندیی هەیە بە ئالقەیەك لە ئالقەکانی زنجیرەی «گەشتی ژیانم»دا .. با لە نووکەوە حیکایەتی ئەو پێوەندییەت بۆ بکەم!

لە ئالقەیەکی «گەشتی ژیانم»دا کە دەگەمە باسی هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٥٣ بۆ خوێنەرم گێڕاوەتەوە کە خاتوون مامۆستایەکی قوتابخانەیەکی کچانی کۆیێ بەبۆنەی سەرکەوتنی بەرەی نیشتمانپەروەرەکانی ئەوسا شەکر و چوکلاتی بەشیبووەوە. ئەم خاتوون مامۆستایە (نەزیرە محمد)، شەوێکیان تەقەی لێ کرا و هەروا بەحاڵ گوللەی دەمانچەکە دوو ئینجێکی لە شوێنی سەری بەسەر بالیفەوەی لادابوو.. حکوومەت لە جیاتی دڵدانەوە و لاواندنەوەو بەدوا گوناهباردا گەڕان خوشکە نەزیرەی بۆ ڕەواندز هەڵداشت .. کارەکە سەرلەبەری، بەتاوانبار و حکوومەتیەوە، نامەردانە بوو چونکە بێگومان ئەگەر مرەشەحی حکوومەت لە هەڵبژاردنەکەدا سەرکەوتووبایە و

خوشکە ئەزیزە شەکر و قەیماغی بەشیبیایەوە ڕەنگ بوو تەرفیعی پێ بکەن، خۆ ئەگەر تەقەی لێ کرابایە دڵنیام کە بەرەی ئێمەی هەڵبژاردنەکە تەهلی تۆیهانی پێ دەکرا.. بەهەمە حاڵ هەڵوەستی خوشکە ئەزیزە هەرچەند لەودەمەدا دەردی سەری بۆ نایەوە و لە مردنی نزیک خستەوە، دیسانەوە لاپەڕەیەکی گەشی ژیانی پڕ دەکاتەوە و مایەی شانازیشە بۆ خۆی و منداڵەکانیشی.. تومەز ماموّستا عیزەدین فەیزی لە ژمارە (١٠٩)ی ڕۆژنامەی هەولێر، ڕێکەوتی ٣/ ٣/١٩٥٣، گوتارێکی ڕق هەڵستاوی نەترساوی بوێر لەبارەی ئەم ڕەفتارە دڕندەیەی بێ بەزەیی و شەرم بڵاو دەکاتەوە کەوا ڕەنگە کاتی خۆی هەر پێم نەگەیشتبێت، دواتر ئەگەر زانیبێتیشم تا دەمی دەرچوونی ئاڵقەکانی گەشتی ژیانم هیچم لەبارەیەوە لەیاد نەمابوو تەنها منێکی بەچرای گەنەگەرچەک بەدوا هەڵوەستی شەرافەتکارانەی خەڵقدا دەگەڕێم جۆناوجۆنی مەردایەتیی وەها زل لە برا و دۆستێکی زیندە بەڕێز و خۆشەویستی وەک عیزەدین فەیزییەوە کە هەتا سەرەمەرگ و گیانەلاوە بەکوردی و مەردی و پاکی ژیانی بردە سەر، چۆن نایکەم بەپرشنگێکی گەشی تریفەداری ڕاگوزەری گەشتەکەم بەتایبەت کە گەشتەکە خۆی داوای دەکات، بگرە لێ وسکتبوونی نوقسانییە... دوبارە پاش دەرچوونی ئەو ژمارەیەی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» کە لە ناو توێژی ئاڵقەی گەشتی ژیانمدا باسی ئەو ڕووداوەی تێدا هاتووە کاکە سۆران تەلەفۆنی بۆ کردم باسی کتێبەکەی باوکی کرد ئیتر لەسەر تەکلیفی خۆم کتێبەکەی هەنارد بۆم بەڵکو لە دەرفەتێکدا هەڵی دەرخستنی ئەو هەڵوەستە شیرینەی ماموّستا فەیزی دەڕەخسێت، دەرفەتیش نەمابوو کەلێنێکی بۆ بکەمەوە لە ئاڵقەکانی گەشتی ژیانمدا چونکە چی هەبوو لە یاداشتەکانم تا دەگەنە ناوەڕاستی حەفتاکان بەسەرپەرشتیکەرانی ڕۆشنبیری نوێ گەیشتبوو، زۆریشم لێ گران دێت هەڵی ساختە هەڵبەستم .. ئەم ڕێکەوتەی دەرکەوتنەوەی لاپەڕە باسکراوەکانی قەسیدەکەی هێمن و بەدوا ئەودا سەرکەلبوونەوەی کتێب و کاغەزەکەی باوک و کوڕان لە خۆوە و بێ ئەرک و هەناسەسواریی من سۆزێکی لە دەروونم گێڕا بۆ ئەو دوور کۆچکردووەی ئازیز، بەجۆرێک، دەرگای کردەوە بۆ ئارمایی گیانی چەندین ئازیزی دیکەی کاروانی ڕووەو مەرگستان .. لە یادکردنەوەدا گەلێک دیمەنی گەشی ئەو کۆچکردووانەم هێنایەوە بەرچاوی خەیاڵ و لەگەڵیاندا سەرلەنوێ بەهەندێک لە سەفەری ژیانیاندا دەهاتمەوە و تێیدا ڕۆدەچووم تا ئەوەی بەدزە بۆ بەراوردکردنی یادی ئەوان لەگەڵ یادی زیندووان دەچووم دەمدیت دەستە تەرازووی ئەوان قورسترە

لە هی زیندووان. لە ژێر نوا و سایەبانی مەرگدا تۆزە غەریبەی سالانی لە یەکتر دابڕانمان بەگەشاییی بەرەوەریەیان وەکو خەرمانەی شەوان کە تەنانەت وردە ئەستێرەش بزر دەکات، ئەویش هەموو کەم و کەسریی مرۆڤایەتیی عاتیفیانی لە خۆیدا دەشارێتەوە و هەر تریفەی گیانیان دەدایەوە بۆ بەرنیگای فرمێسک تێدا قەتیسماوم.. مەرگی تاڵ و ژار ئاوناوە شیرینێت.. لە یادی ئەو مردووە نازیزانەدا و بە نافەرینێك لە گیانی پاکی عەزەدین فەیزی، بەبڵاوکردنەوەی ئەو دێرە شەرافەتمەندانەی کە لەو ژمارەیەی گۆڤاری هەولێریدا بڵاو کردبوومەوە وا من لێرەدا بە دووبارە بڵاوکردنەوەی ئەرکێکی قەرزداری خۆم بەرانبەر فەیزی بەجێ دەهێنم و کەلێنێکی گرنگی ئاڵقەیەك لە ئاڵقەکانی گەشتی ژیانم پڕ دەکەمەوە ئەمەیە دەقی ئەو دێرانە.

شەرمە و ناشیرینە

«لە شەوی شازدەی مانگی شوبات هەندێك لە چەتە بێ دەسەلاتەکان لە کۆیە بەشەو بەتفەنگ پەلاماری مالی نانیسە ئەزیرە.. مودیرەی قوتابخانەی کچانی کۆیەیان داوە، چەند تەقەیەکیان لە پەنجەرەوە بۆ کردووە کە بیکوژن، ئەم خێزانە بەڕێزەش ژنن هیچ پیاویان تێدا نییە. زۆر خۆشی کە خوای مەزن ڕزگاری کردوون لە دەستی بەدکاران و هیچ گوللەیەکیان بێ نەکەوتووە جا برالەران وەرن سەیرێکی ئەم سەیرانە بکەن لە هیچ شوێنێك ئەمە نەکراوە و نەبیستراوە چەند شەرمە و ناشیرینە کە کۆمەڵێك پیاو دوژمنداریی کچێك بکەن کە چەکەکەی قەڵەم و نووسینە. هیوایەکی زۆرمان هەیە لە دانیشتوانی کۆیە کە هەموو خوێندەوارێکی تێگەیشتوو نیفتخاریان پێوە دەکات ئەم نەوعە کەسانە نەیەڵن لە ناویاندا بژین، ئاشکرایان بکەن، تەشییر بکرێن لە ناو کۆمەڵ و حکوومەتدا. بەڕاستی مامۆستایان لە هەموو لایەك بەتایبەتی مامۆستایانی کۆیە بەم بزووتنەوەیە زۆر دڵگیرن، هەموو خوشك و برایانی نانیسە ئەزیرە لە لیوای هەولێر نیحتیجاجیان پێشکەش دەکەن و تکایەکی زۆریش لە کاربەدەستان دەکەن کە بنج و بناوانی ئەم ئیشە بێ جێیە دەربخەن و بەقانوون جەزای خۆیان ببینن».

خوێنەر چاوپۆشی بکات لەوەی کە من خوشکە ئەزیرەم بە خاتوو مامۆستا دانا و تەقەکەیشم بۆ دەمانچە بردەوە هەرچی مامۆستا فەیزییە بە (مدیرە)ی ناو دەبات و باسی تفەنگیش دەکات.. بێ دوودڵی دەڵێم شایەدییەکەی مامۆستا فەیزی بۆ مودیرایەتی ئیشانەپێکاوترە، خۆ کارەکە لە بنەڕەتدا نە بەمودیرایەتی و نە

بەتفەنگبوون و دەمانچەبوونیش ناگۆڕێ. پڕووشکێکی بزووتنەوەی نیشتمانی بوو بەرەواژ گەڕایەوە بۆ کچێکی کوردی خاوەن هەست. کوردێکی مەریش دەنگی تاوانبارکردنی لێ بەرز کردەوە، مەسعوود محەمەدێکیش کە قەرزداری هەڵوەستی ئەو کچە و ئەو مەڕەیە دەیەوێ بەم یادکردنەوەیە قەرزەکە کەم بکاتەوە، یا بڵێین ئیستی یەکەمی لێ دەداتەوە زمانێکی مێژووی لەبیرکراویش لە هەندێ دێڕی تۆمارخانەی دەفتەری شەرافەت دەگێڕێ.. دەقی ئەو دێڕانەم بێ دەسکاری و بەشێواز و ڕێنووسی خۆی بۆ ئێرە ڕاگوێزت..

ئەم گوتارەم، هەر دەڵێی نەزری کردووە و لە خۆی گرتووە سەرەتا و ئەنجامی بەمەرگ بگەنەوە یەکتر، چونکە وەک لێرەدا دوعاخوازی پاش مەرگ لە یادی مامۆستا فەیزی دەکەم، کە جارێ بەرحەیاتیش بوو دوایین جار لە خەستەخانە نەخۆش بوو چووەمە هەواڵپرسیی.. دوای چەند ڕۆژێک لە هەولێرەوە خەبەری مەرگی هات. کەلێنێکی گەورەی لە شارەکەی خۆی و لە دڵی هەموو قەدرزانێک بەجێ هێشت..

کاروان، ژمارە ٨٠، ١٩٨٩

# قەرز دانەوەیە؟ یان خۆهەڵدانەوەیە؟

لە یادکردنەوەی ئەمراندا جووتە هەستێك بەیەکەوە سەر دەکەن: هەستێکی بێگەردی زامدارانەی پاك و پیرۆز لە کانی ئرخە زلەکانی ئەمریەوە خۆی لە دەروون و زمان و قەڵەمی بیرکەرەوە دەگێڕێ و بەرەو باوەشی نەرم و نۆڵی وردە خۆشکەڵەکانی دەمی وەنەوزییەوە دەبات، خۆی لە بیر دەکات.

هەستی دووەم هێندە سادە نییە، تێکەڵ پێکەڵییەکی لەگەڵدایە: هەتا یادکراو لە تەمی نەناسراویدا بێت مەیلی بێژۆکی خۆویستی وەها لە یادکەرەوە دەکات کە خۆی بە خاوەن چاکە و منەت بزانێ. هەر دەڵێی کابرایەکە خێر و سەدەقە دارەبەش دەکات، کەچی لەناخی ناخییەوە خەجاڵەتییەك بە گژی دەبلاچێنێ و وردەختووی پێدا دەهێنێ کە بە ساختە هەستی منەتباریی خۆی بەرانبەر ئەو یادە گۆڕیوە بە منەتداری. هەتا مرز دەگاتە ئەو پلەیەی لە سەرەتاوە لایەنی منەتداری لە دڵی خۆیدا هەڵدەکێشێ و شوێنەکەی پڕدەکاتەوە بەهەستی قەرزداری، خۆڕاهێنانێکی دەروێشانەی گەرمکە

کە یادکراو ناو و شۆرەتی هەموو هەستی یادکەرەوە بارێکی دیکەی دەبێت، مەگەر هەستەکە دەمکوت بکرێ، یادکەرەوە هەستی منەتداری ناکات چونکە خێر بە دەوڵەمەند ناکرێ، رەنگە کەم و زۆر، بە پێی کەڵەگەتیی خۆی لەتەك هی یادکراودا مزاشێکی شانازی و لە خۆڕازیبوون حندرحۆیێ لە هەناویدا بکات.

من کە دێم لە یادی حاجی میرزا عەبدوڵڵا (خادم)دا مەشقی قەڵەمگێڕی دەکەم نەمنەتداری و نەمنەتباری لە خۆمدا نادۆزمەوە چونکە ئەوەندە دۆست و ناشنام بوو (دق الباب) لە بەینمدا هەڵستابوو، منەتی کیسەجودایی مەعنەوی هیچابووەوە.

هەرچەند (خادم) لە تەمەندا بەلای جیلی پێش منەوە دەبووەوە بەڵام تەبیاتی رەندانە و دڵتەڕانەی لەگەڵ هەموو تەمەنێکی دەگونجاند. بە بیرمدا نایەت لە ئاخاوتن و وتووێژ لەگەڵیا تێر بووبم. خادیم ناچاری کردبووم کەوا بابیی هێز پێشکانم، لە میراتی حورمەتی ئەو بۆ باوکم و بنەماڵەی جەلی زادە، رازی ببم بە پشکێکی زیاد لە مافی خۆم. من لە دڵدا جێگەی مامێکم بۆ دانابوو، بەتایبەتی لە دوا کۆچی مامم شێخ نووری کە لە ڕۆژانی ناوەندی تەمووزی ١٩٥٢ ماڵاوایی لێ کردین، خادیمیش بە

ڕەفتار و گوفتاریش تۆڵەی دە ئەوەندەی بۆ دەکردمەوە تا ئەم هەڵوەستەی لە ئاستمدا، بەتەمەنی هەڵکشاوییەوە لە چاو تەمەنی من. نایەڵێ قەڵەمم لە یادی ئەودا بە لووسی و ڕەوانی لە سەر کاغەز بخشێت و زمانگیریم پێ دەکات و(١) هەستێکی خەجاڵەتیم وەبەر دەنێ کە دێم بە تەمای قەرزدانەوە هەریەك بەم چەند ئەمانەتێکی لام هەیە بیاندەمەوە بە تۆمارخانەی مێژووی ئەمران، کەچی تەرازوەی حاجی میرزا لەو ئەمانەتانەدا دەمهاوێتە سەر بای پاکانەکردن بۆ خۆم کە جگە لە حورمەتی یادی ئەم دۆستە و دەرهێنانی یەك دوو گەوهەری ئەو لە قدووی داهراودا ناشێ گومانی چ نیازێکی دیکەم لێ بکرێ.

حاجی میرزا لە ساڵی ١٩٥٢ەوە هەتا ڕۆژانی پێش مەرگی دۆست و ئاشنا و برا و کەس بوو. ڕەنگە بە هەمووی دوو سێ حەفتە کەوتبێتە نێوان دوایین نامەی بۆ یەکدیمان هەناردووە لەگەڵ ڕۆژی مەرگی. بەر لە ١٩٥٢ ناوناوەیەکی زۆر دوور لە یەکدیمان دەبیست و دەزانی، چونکە هاتوچۆ لە نێوان کۆیە و سولەیمانی لەو سەردەمەدا ئاسان نەبوو. لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٢ سێ چوار مانگ بە وەزیفەی حاکمی لە سلێمانی بووم کە تێتر دیدەنی بووە کاری ڕۆژانە یان حەفتانەمان. بەدەم زیادبوونی پێوەندیمانەوە هاتوچۆی نامە لە نێوانماندا زیادی کرد. بەموناسەبەی جێگە دەڵێم هەتا حاجی میرزا مابوو دەمگوت بەدەست نامەی دوو کەسەوە تێ دەمێنم، یەکیان کاك حسێنی خانەقا و ئەوی دیکەیان حاجی میرزا عەبدوڵلایە چونکە هەردووکیان هەتا بڵێی خەتیان خۆشە و چەندێکی بشتەوێ ئینشایان جوانە. خۆ ئەگەر لە وەڵامدا چاری ئینشاکەش بکەم هەر دەمێنێتەوە دەستە تەرازووی خەتم لەنگ بێ. جارێکیان لەم ڕوووەوە نامەم بۆ برادەرێك (شێخ ناوڕەحمانی شێخ ساڵح) لە کەرکووك نووسی و گوتم خەتەکەم لەگەڵ خەتەکەی خۆت ساپێنەیان بێ بکە.

لە ساڵی ١٩٦٥ بەدواوە کە نشیمەنم بوو بە بەغدا، بەتایبەتی لەو دەمەوە کە کەوتمە (مجلس الخدمة) حاجی میرزا، بەهۆی ئاسانبوونی گەیشتنی نامە پێم لەبەر ئاشکرایی ئەدرەسم خۆرایی دەکرد لە نامەنووسین، منیش بێ وەخران وەڵامم دەدایەوە. جارێکیان نەبێ پتر لە عادەت نامەم دواکەوت ئەویش لەبەر هۆیەکی لاوەکی کە هیچ درێغیی منی تێدا نەبوو بەڵام تۆڵەم کردەوە بۆی بە نامەیەکی درێژی نوکتە ئامێز و هۆی وەخرانم بۆ شەرح دا کە چۆن ڕاستیان گوتووە (یەك لەسەر کشتەکی مەزراح کەوتووە)، منیش لە دایەرە کاغەزم هەیە زەرفم نییە لە ماڵەوە زەرفم هەیە

کاغەزی لەبارم نییە. لە هەردوو حاڵدا پوولم نییە لە زەرفی چەسپ بکەم، پوولیش چەند نەوعە هی بەرید و هی دیفاع مەدەنی و نازانم چی. ئەوەی کاغەزی تەسلیم دەکەم کەی دەگاتە بەرید، کە ئەوسا دەبوو سەفەری بۆ بکەی، پوولان چۆن تەدبیر دەکات و تێیان دەگات. لە وەڵامدا حاجی میرزا لە ڕۆژی ۱۹٦۹/۳/۲۷ کاغەزێکی بۆ ناردم بە عادەتی هەموو جارانی پڕ لە نەوازشت و تەواژوع، لێرەدا چەند گوڵێکی مناسبی ئەم گوتارەی لێ ڕادەگوێزم. دوای پێشەکی دەڵێ: «لەم ڕۆژانە زۆر بیرم نەکردن ئەم شیعرەم هاتە سەر زمان کە بۆتان بنووسم:

وەهـا مـات و پـەرێشانم لـە مـیحـنـەت دەردی بـێ تۆیی

وەکوو کوردێکی مەرمردوو لە حەسرەت دەردی بێ دۆیی

بـەردەوام دەبـێ لـە نـامـەکـەی و دەڵـێ: لـەم ڕۆژانـە بـەحـەزمـەت نـامـەتـان گـەیشتم، فەرمووتانە زۆرتان قەرزدارم قوربان بە دەرچەیەك قەرزارت کردووەوە بەم عیباراتە جـوانـە و بـەم نـکـاتـە شـیرینـانـە وەکـو سـلـەمـی تـوجـارەکـانـی خـۆمـان کـە لەگەڵ تـوورتـنـەوانـەکـان ئـەیـکـەن قـەت لـە زۆری دەرتـایـەن، بـەخـوا منیش ئـەم قـەرزەم پـێ نـادرێـتـەوە جـا بـزانین خـوا بـەرەکـەتـی بـخـاتـە زەراعـەتـەکـمـان و لـە خـۆشـی قـسە خۆشەکانت ئەوا چەند شیعرێکم بۆ نووسی و نامەکەشت بەشی موددەتێکی زۆرم دەکا پێی ڕابوێرم هەموو ڕۆژ جارێکی دەیخوێنمەوە:

نـامـەی شـیـریـنت گـەیشتـە دەستـم

بـە یـادەی یـادت تـا ئـیستـا مـەستـم

شـەماڵ چریـانـدی مژدەی تۆ بـەگوێم

لـە خـۆشی ئـەوە نـەمزانـی لـە کـوێم

فـەرەحـیـی دایـە دڵـی غـەمـنـاکـم

ڕووناکـیـی دایـە چـاوی دەڕنـاکـم

نـامـەت ئـەنـیسی مـەحـفـەلـی شـادی

قـسەت جـەلـیسی لـە غـەم ئـازادی

جا قوربان با سەرت نەیەشێنم....» کۆتایی نامەکەی بە سفارش بۆ (سەلام حاجی سوور - کە ئێستا نایەتەوە بیرم) دەهێنێت لەگەڵ سڵاوی چەند برادەرێکی ئەوسام کە لە سولەیمانی مووەزەف بوون.

ئەم نامەیەی حاجی میرزا یەکێکە لەو پێنج نامەیەی کە فۆتان ڕێی پێ نەبردوون.

هەرە کۆنیان ئەوەیە لە ١٤/٥/١٩٦٨ بۆمی نووسیوە دوای پێشەکیی سڵاو و ئەحوالپرسی دەڵێ: «ئەحوالی ئەم موخلیسە پرسیار ئەفەرموون ئەوراقم لە موعامەلەیە (مەبەستی نزیکبوونەوەی مەرگە) دوعا بۆ عاقیبەتم بفەرموون..» لە دوا ئەمەدا بە شیعر دەمدوێنێ، (٩) بەیتی لێ نووسیون لەمانە شەشی پێشەوەیانی بە نامەی هۆنراوە بۆ مەلا محەمەدی قەڵادزەشی ناردووە نیتر نازانم زووتر بووە یان دواتر بۆی ناردووە. بەیتەکان لە نامەی کە بۆ مەلا محەمەدی ناردوون یەکەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و حەفتەم و هەشتەمی بەیتەکان دەگرنەوە. پاش ئەم شەش بەیتە دوو دێری دیکەی بۆ من نووسیوە کە لە نامەکەی بۆ قەڵادزەییی هەناردووە دەرناکەون:

تەمەننا جلوەی رازی ئێوەیە

تەماشا نەغمەی سازی ئێوەیە

لەکام خڵوەتە رێ بۆ ویصالتان

لە چ ئاوێنەیەک دیارە جەمالتان

یەکسەر دوای ئەمە دەڵێ: «جا لێرەوە ئەمتوانی هیچی تر خۆم ماندوو بکەم وە سەری ئێوەش بیەشێنم، دوعای بەرزی و موەفەقیەتتان بۆ دەکەم، بیستوومە ئەڵێن دوعای ئینسانی فاسق قبوول ئەبێ جا بزانین والسلام علیکم.

جلوەی هەر وەکو بەرقی سینەما

بوو بە ئاگرێ لە ناو سینەما

ئەوەی لە بیرمە کە نامەم بۆهات تاکە بەیتێکم نووسی لە بەرانبەر هێنمای بۆ نزیکبوونەوەی مەرگ لێی. بەیتەکە ئەمەیە:

ئەگەر مەولانا دوعای فاسق ئەدا کا

دوعای من عومری تۆ بێ ئینتیها کا

بەرمەڵست نامەکەمی وەەراند، بەڵام تاکە بەیتەکەی پێ گەیشتبوو، لە ٢٨/١٠/١٩٦٨ نامەی بۆ ناردم، لە پاش دوعا و سەلام دەڵێ: هەتا لەم رۆژانە وەرەقەیەکیان بۆ هێنام شیعرێکتان بۆ ئەمەندرێژیی من نووسیبوو زۆر مەسروور بووم. منیش ئەم چەند شیعرەم بۆ نووسی، هەرچەند جەسارەتە ئەمما گوتوویانە (الجاهل جاسر) و لە دوای چەند شیعرێ دوعام بۆ کردوویی دوعای فاسق قبووڵ بێ

هی (أنسقیش - ئەنسەقیش) هەر قبووڵە. (پاش چەند بەیتێکی کە لە موناسەبەی دیکەدا بۆمی ناردبوو ئەمانە دێن):

خەیاڵم پەرت بوو بۆ تۆ سوو بە سوو
دڵـیش پـێم ئـەڵـێ (ولاتـیـأسوا)
پیر و بێ تـاقـەت قـامەت چەمـاوە
جـوز یـادت موونیس لەلام نـەمـاوە

بێ بچڕانەوە ئەم ڕستەیە و شیعرەکانی دوایەوە دەنووسێ و دەڵێ: «ئەمەش چەند شیعرێکی ترە دوعای ئەنسەقە ئینشائەڵڵا قبووڵ دەبێ.

(قل أعوذ) هەر دوو پارێزگارت بێ
بـەرگـری بـەلا و چـاوەزارت بـێ
(قـل هـو الـلّـه أحـد) یـارت بـێ
(الـلّـه الـصـمـد) مـەدەدکـارت بـێ
(انـا فـتـحـنـا) بـۆت بـێ ئـامـادە
دەرگـای ڕەحـمـەتت بۆ بکا گوشادە
مـەستـی شەرابـی (ألـم نـشرحْ) بـی
دڵ پـڕ زانین و سیـنـە قـەرەح بـی
قـەڵـعـە و حـەسارت (آیةُ الکرسی)
قووەتی ڕۆحت بێ لەت نەبی بڕسی
لـە تـیـنـی تیشکی حادیسەی زەمان
شاپەڕی جیبریل بۆت بێ سایەبان
هاوڕێت لە ڕێگا ئیسمی ئەعزەم بێ
دڵـی بـێ کیـنـەت دایم بێ غەم بێ

ئینجا دەڵێ: قوربـان هەرچەند زۆرم مابوو ئیهانەتی پێ بێنم، وەک چاوەشی چاک، تازە سەریەکم بۆ خۆش بووبوو ئەمما لەبەر ئەوەکە تۆ سەرت دەئێشا. ئینشائەڵڵا عومرم ئەوەندە مابێ هەتا ئەمجارەش چاوم بەدەست خەتی ئێوە ئەکەوێ......»

بەسەر ئیمزاکەیەوە ئەمەی نووسیوە:

ویستم بنووسم بۆ ئیمزا موخلیس
خامە ڕاستی کرد کە نووسیی موفلیس

ئەم برە شیعرە لە لاپەڕە ٢٥٧ی بەرگی دووەمی دیوانەکەی نووسراوە بێ ئەوەی بڵێ بۆکێی بەرێ کردووە، هەر دەڵێ: "دوعاو پاڕانەوەی خادیم بۆ هاورێیەکی". بەڵێ دیکەش هەن خادیم لە موناسەبەدا یادی دۆستی دیکەی پێ کردوونەوە وەك کە لە لاپەڕە ٢٥٢ی بەرگی دووەمی دیوانەکەیدا بۆ ئەحمەد شوکری دەنووسێ.

نامەیەکی دیکەی لە ١٩٦٩/٧/١١ بۆ ناردووم لە سەرەتاوە دوای سەلام و پێشەکی دەنووسێ: «بەعزێ شەو لەگەڵ کاك بەکر حاکم و کاك حاجی قائمقام باستان ئەکەین..» ئنجا دەڵێ: «لەم چەند ڕۆژانە جەنابی شێخ محەمەدی خاڵ قازیی پێشوو سونالی لە بەندە کرد گوتی: ئەزانم مەلا محەمەدی کۆیی کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلایە، ئەمەوێ بە تەحقیق بزانم هەتا سەر مەلا عومەر کە شاعری مەشووانە بزانم کامیان کوڕی کامیانە. منیش عەرزم کرد منیش هەر ئەوەندە ئەزانم حاجی مەلا عەبدوڵلا کوڕی حاجی مەلا ئەسعەدە و ئەویش کوڕی مەلا عەبدوڕەحمانە لەوەش هەر موتەئەکید نیم جا لام وایە ئەیەوێ بیکا بە ریسالەی جەلی زادەکان، زۆر حەز دەکەم ئەگەر تەفسیراتم بۆ بنووسی وەعدم پێ داوە و ئەم شیعرەشم بۆ نووسی ئینشائەڵڵا هەر وایە:

دڵت ئاوێنەی ئەسراری نوور بێ
لە ژەنگ و تۆزی حادیسە دوور بێ

باقی باقی ئەمێ هەرچی بەقای تۆی ئەوێ.....»

ئێستە لە بیرم نەماوە لە ئاست داخوازییەکەی چیم نووسیوە یان هەر هیچم نەنووسیوە لێرەدا دەڵێم، بنەچەکەی جەلی زادان ناچێتەوە سەر مەلا عومەر، ڕەنگە عومەر ناو لەو سیلسیلەیەدا هەر چنگ نەکەوێ. حاجی مەلا ئەسعەدیش کوڕی (والق باللە مەلا عەبدوڵلای جەلی زادەیە کە دەکاتە عەبدوڵلای دووەم. عەبدوڵلای سێیەم باپیرم کوڕی حاجی مەلا ئەسعەدە)، مەلا عەبدوڕەحمانی کاکی جەلی باپیری حاجی مەلا ئەسعەدە و کوڕی مەلا عەبدوڵلای کاکی جەلییە کە عەبدوڵلای یەکەمە. بەمەیان ناگوترێ جەلی زادە وەك کە بە ئادەم ناگوترێ بنیادەم چونکە مەلا عەبدوڵلای یەکەم زادەی جەلی نییە، خۆی یەکەم کەسە لەو بنەماڵەیە هاتووەتە جەلی. ئادەمیش کوڕی

نامەم نییە. جەنابی شێخی خاڵ ئەو ڕیسالەیەی نەنووسیوە چونکە لە مانگی یازدەمینی ساڵی ١٩٨٦ سەردانێکیم کرد لەگەڵ هاوڕێ موستەفا ساڵح کەریم، یەکێك لە داخوازییەکانی شێخی خاڵ ئەوەبوو کە مێژووی جەلی زادان بنووسم، دیارە ئەگەر خۆی کردبایتی داواکەی نەدەکرد.

نامەی پێنجەمی خادیم لە ڕۆژی ١٩٦٩/١٢/٨ نووسراوە:

ئەمەیان بریتی وەڵامێکە لە پرسە نامەیەکی من کە بۆ مەرگی خوشکەزای خۆی سەرەخۆشیم پێ کردبوو لە عەبولحەمیدی حاجی تۆفیق، کە خوارزایەتی و برای ئەم خاتوونەیە. خاڵ بەزاری خوارزاوە دەنووسێ تا لە کاغەزەکە دەبێتەوە. ئنجا لە دامەنی کاغەزەکە بە مانیلی سێ دێری خۆی بۆ نووسیوم دەڵێ: سەرومەرم زۆر عەرزی ئیحتیرام و سەلامم هەیە. مودەتێ بوو بە خزمەت نامەتان نەگەیشتبووم هەر وەتەماشا کردن و یادتان باری ناساغییەکەمی سووك کرد ئیتر هەر بژی بەخۆشی.

دیارە مەبەستی ئەوەیە کە چاوی بە پرسەنامەکەی من بۆ عەبدولحەمیدی حاجی تۆفیق کەوتووە. خادیم هیچ هۆیەکی موجامەلەی نەدەهێشتەوە بێ ئەوەی ئەوازشتی دۆستی خۆی پێوە بکات.

بەداخەوە لەو نامانەی بۆی ناردمن تەنیا ئەم پێنجەیان لەدەستی تەفروتوون بوون ڕزگار بوون. لەوانەی منیش بۆ ئەوم ناردوون تەنیا نوسخەی یەکێکیان هەڵگیراوە ئەویش نازانم چ ڕێکەوتێك وەهای کردووە نوسخەی لێ وەربگیرێ.

لایەنی شاعیریەتی حاجی میرزا سێ شەقڵی پێوە دیارە: یەکیان بەهرەی زەوقی ئەدەبی. دووەمیان نەفەسدرێژی. سێیەمیان سۆزی عیشقێکی سووتێنەری نائومێدانە کە لە سەرەتای ژیانیدا مێشکۆڵەی ئێسکەکانی وە برژبرژ هێناوە. ئەم سۆزە لە زۆر هەنیسکەکانیدا بەلای ئەوونە شیعری هەرە سۆزناکەکانی شاعیرە مەشوورەکانی پێش خۆیدا دەباتەوە تا ئەوەی هەندێ جار بە (تضمین و اقتباس) ڕستەی تەواو، هەندێ جاریش مصرعی تەواویان لێ ڕادەگوێزێ بۆ ناو هەڵبەست. ئەمەیش دیاردەیەکە لە ناکارەکانی مرۆڤ کە لە غەمی غەمباردا لە دوو غەمدا دەژیت، یەکیان هی خۆی.

سەقافەتێکی حاجی میرزا هەبوو وەك هەنگوینی هەنگ خۆی لە شەربەتی کتێبە ئەدەبییە کلاسیکییەکانی هەڵمشتبوو، کەسێك نەبێ لە چەژی دەرسی مزگەوت کە ناوناوە لە شیعرە دنیاییەکانیدا تام دەداتەوە. هەرچی شیعری ئاینیی حاجی میرزایە

یەکسەر لە عەقیدەوە هەڵتەقوڵیّ و بۆ چەژی دەرس و دەور ناچێتەوە. بەڵای منەوە سوودی شاعیریەتیی لەوەدا بوو کە زۆر قووڵ تەهووبووەوە لە زانستەکانی سەردەم چونکە لە بارێکدا نەبوو بەم زانستانە ببێتە مامۆستای زانکۆ و بەرهەمی کارەبایی و فەلەکی پێشکەش بە جیهان بکات، هەر ئەوەندەی سوود لیّ وەرگرتن کە سەکۆیەکی پەند و وەعزی تازە مۆدێل لەو زانستانەدا سازدات و خۆیانی پیّ بکاتە پەندیار کە ئیتر نەتام لە شیعریدا دەما نەکەسیش بە دوو وەعزەکانیدا دەچوو. بۆ ئەو بەس بوو کە مرۆیەکی ڕۆشنبیر و بەرژەوەندناسی میللەت و وڵاتی خۆی و تێکڕای جیهانیش بوو، ناکاریشی لە خۆوە بەرەو مێرخاسیدا چووبوو. من و ئێوش سەدجاران بە پەرۆشتر شیعرە عاتیفییەکانی دەخوێنینەوە لەوەی خۆی لیّ کردبایەنایە نەغمەندی و بە مەنتیق لە خشتەی بردبایەن. مامۆستا لەم مەیدانەدا زۆرن چ لزووم نەبوو بەوەی کە خادیم ژمارەیەکی لیّ زیاد بکردایە ئەوساش ژمارەیەکی بەنرخ لە مریدەکانی جەزبەی سۆز و فرمێسک کەم دەبووەوە ئێمەی تێدا خەسارە کردوو دەبووین.

لە گیانی خادیم داوای لێبووردن دەکەم کە هاتم ئەم چەند دێرانەی دوایم وەباڵ یاداشتەکانی دا. ئینساف داوای دەکرد من تەڕاتێنە لەو مەیدانەدا نەکەم، بەڵان نییەتم پاکە و لەبەر تیشکی ئەودا چەند هەنگاوم بەم لایەدا هەڵێنا.

کاک جەمال محەمەد، کە نازانم ئێستا لە کویّ و لە چ بارێکدایە خزمەتی هەرەگەورەی بەگیانی خادیم و خادیم دۆستان ئەوەیە سەرگوزشتەی تەواوی ئەومان بۆ بگێڕێتەوە بەهەموو لایەکانییەوە. دەبیّ بزانین ئەو عیشقەی میرزا چ کارێکی لە ڕەفتاری کرد، لەو دەمانەدا چەندی شیعر پیّ هەڵبەست، کوا نموونەی؟ مەعشوقە چیی لیّ بەسەر هات؟ و چەندانی دیکە لە پرسیاری ئەوتۆیی بەدەوری ئاکە ڕووداوی عیشق لوت دەبنەوە. ژیانی قەڵادزەی، پاشتر لە سلێمانی بەهەڵسوکەوتییەوە بە جۆرێك کە ئەگەر تەنسیرێکی تیّ کردبیّ بتوانین لە هەڵبەستەکانیدا بیدۆزینەوە. خولاسە وەها خۆشە تامەزرۆییمان بشکێنیّ، هەتا یادیشی کۆن نەبووە کارەکە ئاسانترە کە دەورانی بەسەردا تیّ پەڕی دەبێتە تەپری هەڵفڕیو:

نیستەکەش فرسەتە گەلی یاران
کەهەنەك بۆچییە لە پاش باران

(۱) لە شەوی نێوان ۱۹۸۷/۱/۱ و ۱۹۸۷/۱/۲ نزیکی سەعات دوو کەوتمە سەر نووسینی ئەم گوتارە کە گەیشتمە ئەو وشەیەی (دەکات) کە ژمارەی یەکم لەسەر

داناوه بەنیشانە بۆ پەراوێز، وازم لەنووسین هێنا، ڕۆژی دیکە تا دوای نیوەڕۆ دەرفەتم نەبوو بۆی بگەڕێمەوە کاتێك بۆی چوومەوە خەیاڵێکم بەدڵدا هات، بۆچی نەزانم فەرقی تەمەنمان چەند بوو؟ بەرگی دووەمی دیوانەکەی لامە، بەڵکو لەوێدا ساڵی لەدایکبوونی نووسرابێ. داخەکەم تێیدا نەبوو، دەبێ لە بەرگی یەکەمی دیوانەکەیدا ساڵەکە نووسرابێ. لەگەڵ ئەم دەست بەتاڵییەشدا، گەڕانم بەدوا ساڵەکەدا نیگامی بۆ لای ئەو چەند وشەیەی (پێشکەش) کەوت کە لە لاپەڕە (۳)ی دیوانەکەدا سێ نیازی دەربڕیوە، هی سێیەمیان دەڵێ (بەوانەی لە ئاستی ناڕاستی بێدەنگ نابن».

چەندم لێ خۆش هات کە یەکەم هەنگاوم لە نووسینی گوتارەکە بە ڕێکەوت جووت هات لەگەڵ نیازەکەدا بەر لەوەی هاندەری ئەو نیازە بەمبزێوێت چونکە شاردنەوەی ئەو ئەمانەتە کارێکی ناڕاستە بەو پێیە لە خۆ دەبووە (بێدەنگبوون لە ئاست ناڕاستیدا). ئەم ڕێکەوتە خستمییە سەر چاوخشاندن بە پێشەکییەکەی دیوانەکەدا

منیش ئافەرین دەکەم لە کۆششی کاك جەمال کە شیعرەکانی میرزای خستە بەر ڕۆشنایی و تۆزی ڕۆژگار و ڕیسی جاڵجاڵۆکەی لێ تەکاندن بەڵام کە هاتم لەسەر ڕاگەیاندنی ڕووپەڕەی یەکەمی پێشەکییەکە (دەکەوێتە لاپەڕە پێنج لە دیوانەکە) کە گۆیا بە هۆی واتا لێدانەوەی بەیتەکان پێویست بە فەرهەنگۆك نەما، هاتم ئەو واتا لێدانەوانەم بە تاقیکردنەوە دیتم زۆر شوێنی ئاستەنگ بەجێ هێشتراوە، زۆر وشەی نائاشنا لەبەر گوێی ئەویاوەکانمان ڕوون نەکراوەتەوە لە نموونەی وشەی ئەوتۆیی بنواڕە لاپەڕە ۲۱ی دیوانەکە دەبینی لە دێڕی سێیەمدا (پیرمزاڵ) هەیە. کێ دەزانێ چ مەبەستە لێی؟ لە دێڕی (۵)دا (ڕەزم، مەساف – مصاف) چین؟ دەڵێین بەزم و ڕەزم بێ ئەوەی بەتەواوی لێکیان بدەینەوە لە دێڕی (۷)دا وشەی (نەبەرد) واتاکەی چییە؟ بە نەبەردی کە (پاڵەوان) دەگەیەنێ لێی بەسەهوو مەچوو، لێرەدا شتێکی دیکەیە، شەڕ و جەنگە.. (نهاڵ – نیهال) لەو لاپەڕەیەدا دەبوو ڕوون بکرێتەوە بە تایبەتی (نهالی کەشت) کە هەردوویان ناشئان و شێوازی کلاسیکی هێناوییەتە ناو هەڵبەست.

لەو لاپەڕەدا تەنها پەروانە و بێ پەروانە لە پەراوێزدا واتای دەقەکانیان لێ دراوەتەوە بە (پەپوولە و بێباك) بەڵام تێمان ناگەیەنێ بۆچی پەپوولە (بێباك) حیساب دەکرێ؟ دواین وشەی ئەم ڕووپەڕەیە وشەی (مەندەبوور) کە ڕوون نەکراوەتەوە و ڕاستییەکەشی (مەندەبوور)ە

له نموونەی شوێنی ئاستەنگ بڕوانە کۆتاییی لاپەڕە ٢٤٨ و سەرەتای ٢٤٩ کە ئەم دوو دێڕە دەخوێنێتەوە:

له ناکاو سەبا هێنای بۆ دەماغ
بۆنی پیراهەن بۆ دڵی پڕ داغ
کولبەی ئەحزانی بۆ کردمە گوڵزار
ڕووناکیی دایە چاوی ئینتیزار

تەنیا وشەی (پیراهەن) واتای لێ دراوەتەوە بە کراس، لەوەشدا حیرەتی خوێنەواری ئەوباو پتر دەبێ چونکە نازانێ مەبەستی حاجی میرزا کراسی یوسفە کە بۆ یەعقووبی باوکی چوو گوتی (انی اجد ریح یوسف). کە هستیانە سەر چاوە کوێربووەکانی (ارتد بصیرا – بۆوە چاوساغ). کولبەی ئەحزان ماڵەکەی یەعقووبە کە لە وەختی یووسفی لێ بە مردوو حیساب کرابوو بووبووە (بیت الحزن – ماڵی تازیەدار). من لێرەدا مەبەستم ئەبوو واتای هیچ شتێك ڕوون بکەمەوە بەڵام ناپاییی بەیتەکان زۆری بۆ هێنام.

بەنیازی خزمەتی دیوانەکە و شیعری حاجی میرزا و لەگۆشەی بایەخدان بە هەوڵی کاك جەمال محەمەدەوە ماوەیەك لەگەڵ ڕوویەڕەکانی ئەو دیوانە دەڕۆم و شوێنێکی کەم و کوریی تێدا بێ هەڵوەستی تێدا دەکەم. ڕاستییەکەی دەبوو پرس بە شارەزایانی عەرووز و واتاناراییی شێوازی کلاسیکی بکرێ ئنجا فەرهەنگۆك دابنرێت و دەقی بەیتەکان لەسەر کێشی ڕاستیان بنووسرێتەوە بەیتێکیش کە بە فەرهەنگۆك ڕوون نەبێتەوە ئەو شارەزایانە شەرحی بدەن.

له لاپەڕە ١٤ دێڕی پێنجەم وشەی (بووەتە) لەنگی کردووە ئەگەر (وابۆتە) بێ لەنگییەکە هەڵدەستێ:

«گوڵشەنی شادی بە وەیشوومەی خەزان وا بۆتە پووش»

له دێڕی ١٥ وشەی (داخێ) دەبێ (داخی) بنووسرێ (داخی بەجەرگم).

له لاپەڕە ١٥ دێڕی سێیەمی لەنگە بە پەراوێز هێنا کراوە کە لە هەموو نوسخەکان هەروەها بە لەنگی هاتووە ئەگەر وشەی (بگرن) ئەو (ب)ەی لێ بقرتێ لەنگاییی هەڵدەستێ:

«گوێ لە قرچەی جەرگی سووتاوی گرن بۆتە کەباب»

قرتانی ئەم (ب)ەی کە پێی دەڵێن ئیلتیزامی زۆر باوە حاجی میرزا خۆی لە چەندین جێگەدا قرتاندوویەتی.

لە لاپەڕە ١٦ دێری دەیەم لەنگە وشەی (گولاڕو) بەم شێوەیە جێگەی لەقە لە بەیتەکەدا. بەیتەکە بەم شێوەیە چاپ دەکرێ:

هەم بریقەی گوڵەنار، بەرق و تریشقەی هەورەکان

دێری پازدەمینیش لەنگە. سەرەتاکەی (مەل ملی دەرەخت بە خوێندن) واتاشی دیار نییە و لەنگیشە. وەها بزانم ڕاستییەکەی ئەمەیە:

مەل ملی دەرخست بەخوێندن بلبلیش پەرواز ئەکا

لە دێری ١٣، وشەی (سەروو) لە کۆتاییدا دەبێ (سەرو) بنووسرێ. لەدێری ١٤شدا (سەرووی ڕەوان) دەکرێتە (سەرەوی ڕەوان).

لە دێری ١٦ وشەی (بڕ) دەکرێتە (پڕ).

لە دێری ١٧ (خورەمی دڵگوشای) دەکرێتە (خورەمی وو دڵگوشای).

لە دێری٢٢ (خان و مان) وەها بزانم (خانمان)ە وەك (نیشتمان). ئەم (مان)ە پاشگرە دەلالەتی جێگەی هەیە. لە ئاڤێستا بە عەرش گوتراوە (گەروودەمان).

لە لاپەڕە ١٧ دێری یەکەم، وشەی (تۆ) تەئبیلی دەکات دەبێ (تو) بخوێندرێتەوە لە دێری دووەم وشەی (زستان) دەکرێتە (زەمستان) دەنا لەنگە.

لە لاپەڕە ١٨ دێری دووەم، وشەی (چییە) ئەگەر بە (چییە) نەخوێندرێتەوە لەنگ دەبێ ئەوساش ئاقۆڵا دەردەچێت، ئەگەر (کوانێ) بێ عەیبی نامێنێ.

لە دێری ٣ (خۆیی وەەی) دەکرێتە (خۆی وەەی).

لە دێری ٥ (پەژموردەو) دەکرێتە (پەژموردە وو) دەنا دێرەکە لەنگە.

لە دێری ٩ (بۆ گەڕاوو) دەکرێتە (بۆ گەڕاو) هەتا لەنگ نەبێ.

دێری ١٣ زۆر لەنگە واتاشی نایەت (کەیفەکەت نازیز مردووە ماتەمی داگرتووە). دەستخەتی نەبینم خەریکی ڕاستکردنەوەی نابم.

دێری ١٥ (بووەتە) دەکرێتە (بۆتە) (کەندووشیو) دەکرێتە (کەندوشیو).

دێری ١٩ (ولاتەکەی تۆی تێك ڕووخاند) دەکرێتە (ماڵەکەی تۆی تێك ڕوخاند).

لە لاپەڕە ١٩ دێڕی شەش، وشەی (کوچەیی) دەکرێتە (کووچەیی).

لەلاپەڕە ٢٠ دێری چوار (بۆ) دەکرێتە (بوو).

دێری ٥ (سەوزەیی) دەکرێتە (سەوزەی). (کردووم) دەبێ بخوێندرێتەوە (کردوو – ووم). دێری ١٥ وشەی (ئومێدم) دەخوێندرێتەوە (ئومەیدم). لەلاپەڕە ٢١ قەسیدەکە وەها دەست پێ دەکات:

خاوەنی عەزم و سەبات و سەفدەری مەیدانە کورد
مەنشەئی سیدق و وەفاو و ڕوستەمی مەیدانە کورد
بۆ شەجاعەت ڕۆستەمی زاڵی لەلا وەك پیرەزاڵ

وەها دەزانم لە دێری دووەمدا (حەیدەری مەیدان...) گۆڕاوە بە (ڕوستەمی مەیدان..) چونکە لەگەڵ (سەفدەر) باشتر دەڕوات و لە دێری سێیەمیشدا ڕۆستەم دەشکێنێتەوە ئیتر چۆن دەشێ جارێ بەمەدح جارێ بەشکانەوە ناوی ڕۆستەم بێ؟

لەدێری ٤ (بازیی) دەخوێندرێتەوە (بازیەی).

لەدێری ١١ (ئومێد) دەخوێنرێتەوە (ئومەید). لە دێری ١٥ (بە) دەخوێندرێتەوە (با). وەك پێشتر گوتم (مەندەبوو) لە کۆتاییی لاپەڕەکەدا دەکرێتە (مەندەبوور).

لە لاپەڕە ٢٣ دێری ٩ (خەیاتی) دەکرێتە (خەیاتی).

لە لاپەڕە ٢٤ دێری ٣ (بەدەورا بێ) دەکرێتە (بەدەورایی).

لە لاپەڕە ٢٦ دێری ٢ (بۆیێ) دەکرێتە (بۆیە).

واتای (چەشمەیی حەیوان) لە دێری دەیەمدا (ناوی حەیات)ە کە هەرچی لێی بخواتەوە نامرێت، نەك (سەرچاوەی ژیان) کە واتای بێ سنوورە.

لەدێری ١٤ (ئاشنامەو) واتاکەی دەباتەوە بۆ بێگانە دەبێ بگوترێ (ئاشنامە).

لەلاپەڕە ٢٧ دێری ٣ (پەرگار)ی ناو قەسیدەکە ڕاستە نەك (پەرگاڵ)ی شەرحەکە.

لەدێری ٤ (پەربازی) و (سەربازی) کە لە پەراوێز کراوە جێی لێ توژینەوەیە. لێرەدا مەودام نییە، چونکە دەچینەوە بۆ (باختن و می بازد) و دارشتنی ئیسمی فاعیلی لێکدراو بە (سەرباز) و پێوەلکانی (ی)ی ئیسمی مەعنا و.. و.. کورتەکە لە جیاتی (باخت) دەڵێ (بەخت – خۆی بەخت کرد) کە جۆرێکە لە بەکارهێنانی قرتاو.. لە دێری٥ وشەی (نیهەتی) دەخوێندرێتەوە (نی ییەتی) دەنا دەبێتە (لایەك).

له لاپەرە ٢٨ دێری ١٠ (کردییە) دەکرێتە (کردیە).

لەدێری ١٩ (بووم) دەبێ بخوێندرێتەوە (بوو – ووم).

لەدێری ٢١ (رەحمەتیتان) دەکرێتە (رەحمەتی تان) واتە رەحمەتی خۆی تان.

له لاپەرە ٢٩ (مەلە جوانەکەی سەر شاخ و کێوان) مەلە لە دەریای بێ پایانی ئاسمان دەکات نەك لە دەریای قووڵ و بی بن وەك کەلە پەراوێزدا شەرح دراوە. بەمر لە سەرکێوان چی دەکات؟

لـە دێری سێهـەمـی بـڕە شـیعـرەکـە (پـەرۆزی) لـە جـیـاتـی (پـەرۆزەی) دەگـوتـرێ، نەشمبیستووە (پیرۆزە) بە هوما گوترابێ وەك لە شەرحدا هاتووە.

لـێرە بـە دواوە تـەنـیـا هـێـمـا بـۆ ژمـارەی لاپـەرە دێرەکـان دەکـەم کـە هـەڵـە وەیـا کەموکوورییان هەبێ بێ ئەوەی ساغیان بکەمەوە مەگەر شوێنی زێدە گرنگ:

لاپەرە٣٣ دێری ١٠ لاپەرە ٣٥ دێری ٩، ١٧.

لاپەرە ٣٧ دێری ٣، ٩، لاپەرە ٣٨ دێری ١٧ وشەی عیجز هەڵەیە راستییەکەی (عەجز)ە دێری ١٩ میشك نەك (مێشك). لە لاپەرە ٣٩ دێری ٤ سەرلەبەری تەماوییە، (سەنجیە) چـیـیـە؟ نـازانم. سەرەنـاوی قـەسـیـدەکـە نـابـێ (ڕۆژ) بـێ چـونـکـە نـەعتی پێغەمبەرە.

لاپەرە ٤٠ دێری یەك (عومرێ) نەك (عومری).

لاپەرە ٤٢ دێری ٧ (ناڵەیی) نەك (ناڵەی).

لاپەرە ٤٣ دێری ٦ (جیلوەیی) نەك (جیلوەی). دێری ٧ (ڕێگەیێکە) نەك (ڕێگەیەکە).

دێری ٨ (پەردەیی) نەك (پەردەی).

لاپەرە ٤٤ دێری ٥ (تیها) نەك (تنها): نالی دەڵێ:

پـەچـەیی پەرچەمی بوو زولفی سیها
هـەر دەڵێی مـانـگەشەوە کولەمی تیها

دێری ٧ (بێدار) هەڵەیە (بیدار) ڕاستە. دێری ١٠ (دەریایی) نەك (دەریای).

لاپەرە ٤٧ دێری ٣ (بەقەد سەروی جۆیبار) نەك (سەرووی جۆیبار).

لاپەرە ٤٨ (بهدار) ڕاستە. دێری ٣ (بووی) نەك (بوویی).

لاپەڕە ٥٢ دێری یەکەم (تو) نەک (تۆ). دێری ٢ (تەماشایی ئەوا) نەک (تەماشای ئەوان). دێری ٣ (ئەمردی دڵی) نەک (دڵی ئەمردی).

لاپەڕە ٥٤ دێری یەکەم (قسێکت) نەک (قسەیەکت). دێری ٨ (جیاکەر).

دێری ٩ (بۆتە) نەک (بووەتە).

لێرەدا کۆتایی بەو تەتەڵەکردنە دەهێنم چونکە لەسنووربەدەر درێژەی هەیە هەر ئەوەندە دەکەم کە چاوێکی خێرا بە دیوانەکەدا بگێرم تا ئەگەر توانیم چەند زەق و زۆپییەک بە قازانجی دیوانەکە و خوێنەرانی چارەسەر بکەم بەدڵێکی ئارامەوە ماڵاوایی لە یادی خادیم بکەم بۆ هەڵێکی لەبارتر.

لاپەڕە ٦٢ بەیتی حەفتەم:

وەکو ئەم دای دەپۆشی ڕوویی خەزرا
بە ئەشکی خوێنی چاوان سوور بوو غەبرا

لە پەراوێزدا هەر ئەوەندە هاتووە کە (خەزرا) سەوزاییە. مەبەس لە خەزرا (خضراء) ئاسمانە کە هەناسەی دووکەڵاویی بێ چاران دەبوو بەتەم و ڕووی ئاسمانی دادەپۆشی. غەبرا (غبراء)یش زەوییە کە بە فرمێسکی خوێنین سوور هەڵدەگەڕا. ئەم خەزرا و غەبرایە زۆر هاتووەتە ناو شیعری شاعیرانەوە.

لە لاپەڕە ٦٧ بە پەراوێز هێما بۆ ئەوە کراوە کە نیوە بەیتی خوارەوە لەنگە

کەسێ نەیدیوە وابێ هیچ قەومێ

ئەم مصرەعە لەنگ نییە. دەبێ بەپێی دەستووری کێشی کوردی وشەی (هیچ) ببێتە دوو برگە (هی – چ) نەک یەک برگە. وەها دابنێ کە ئەم (چ)ە لە بەرابیی ڕستەوە دێت وەک کە نالی دەڵێ:

تۆ کە حووری وەرە نێو جەننەتی دیدەم (چ) دەکەی
لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەیی سووزانمدا

یان هەر نالی لە بەیتێکی دیکەدا بۆ کێشی شیعر دەنگی (س) قورس دەکات:

«ڕاستیی سەیقەلییە تیغی زمانی نالی»

لێرەدا (ڕاستی) سێ برگەیە: (ڕا – س – تی). لە ئەسڵیشدا دووە: (ڕاس – تی). دەبوو لە لاپەڕە ٦٤ بەم مصرەعە بڵێ لەنگە:

عەشایری لە کوردان زۆر لەگەڵ بوو

ئەم مصرععە ئەگەر (عەشایر)ی ئەکرێتە (عەشایەر) لەنگە. بەو شێوەیەش هەر عەیبدارە لە لاپەڕە ٦٠ مصرعەی: (نەیانهێشت مریشك و گۆشتی کاوڕ) دوو بڕگەی نوقسانە دەبێ وەها بنووسرێ:

(نەیانهێشت هیچ مریشك و گۆشتی کاوڕ) جێگەی دیکەش زۆرە لەم بابەتە.

ئەو (سەنزوومەی سەفەربەرلگ) کە لە لاپەڕە ٥٤ هەتا ٧٤ی دیوانەکەی گرتووەتەوە، لە بەرەو کۆتاییەکەیدا ئەفەتێك بە ناشاشکرایی دەدوێت. بە پێی سەرگوزشتەکە لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٢٠ یان لەدەوروبەری ئەو ساڵەدا بە پارەتیی برادەرێکی چووەتە قەڵادزە (ئەو برادەرە حاجی تاهیری کۆیی بووە) لەوێ سێ ساڵ ماونەتەوە چوونەتە سلێمانی.

هەتا نزیکی سێ ساڵێ لەوێ بووین
لە ئاخر بۆ سلێمانی بە ڕێ بووین

بەدوا ئەمەدا دەڵێ:

فەلەك بۆ قیسمەتی ئێمە لە هەر لا
بەچەپدا مۆرەیی نەردی فڕێ دا
سلێمانی هێنا قیسمەت وەها بوو
موعین و ناسری ئێمە خودا بوو

لەمەدا دوو پرسیار هەڵدەستێ: یەکیان ئەوەیە کە حاجی میرزا عەبدوڵڵا و حاجی تاهیر، وەك بزانم، پتر لە سێ ساڵان لە قەڵادزە مانەوە پرسیاری دووەم ئەوەیە کە ئەم مۆرە ئەحسەی فەلەك بە چەپیدا فڕێ دا بۆ ئەوان چی بوو؟ (سلێمانی هێنا) مانای چی؟ سلێمان کێیە؟ پێغەمبەر سلێمانی موبارەکە دیارە ئەو مەبەست نییە. یاخود شاری (سلێمانی)یە؟

لێرەدا بە تەلەفۆن لە کاك محەمەدی حاجی تاهیرم پرسیار کرد، ئومرەی تەلەفۆنەکەشیم لە مامۆستا بەکر ئیسماعیل سەرۆکی دادگای حوکمی زاتی وەرگرت، کاك محەمەد تێی گەیاندم کە ماڵی ئەوان و ماڵی حاجی میرزا عەبدوڵڵا پتر لە ٢٥ ساڵ دانیشتووی قەڵادزە بوون. دەوری ١٩٤٦ هاتوون بۆ سلێمانی. ئەو نەردی فەلەکی چەپ گەردیش هی ئەو ساڵانەی قەڵادزەیە کە دوو جاران لە دوو ڕووداوی

ناخۆشی گشتیدا ناچاربوون به ڕاگوێستن له قەڵادزە تا به زەرەر و زەحمەتی زۆرەوە سەرلەنوێ هەر جارە کەوتوونەتەوە سەر باری ئاسایی. بەمەدا دەرکەوت کە من ژمارەی (سێ)م بە (سێ) خوێندووەتەوە لە دیوانەکەش هەر (سێ) نووسراوە تومەز بە تەما نەبووم ئەو دوو بنەماڵەیە سێ ساڵ لە قەڵادزە بووبن (ئەم دیاردەیە لە نووسینەکانی فرۆیدی دەروونناس شی کراوەتەوە).

دەمتوانی لەم کێشەیەدا نووسینەکەم بگۆڕم و حیکایەتی تەلەفۆنکارییی تێدا ڕەش بکەمەوە بەڵام چ زەرەر لەو ڕاستییە سادەیە ناکەین. خۆشتریش دێت لەگەڵ تەبیاتی ژیانمان کە هێندە توند تەبیچراوینەوە بە سەهوو نەچین. وەها بزانم حاجی میرزاش سەهووی کردووە کە لە لاپەڕە ٧٦دا دەڵێ ساڵی ١٩٣٩ تەشکیلاتی حکومەت لە قەڵادزە کرا، وەک لە بیرمە ئەو تەشکیلاتە لە ١٩٣٧ بوو. بە هەمە حاڵ ئەم لایەنە لە منیش ڕوون نەبێ مێژووی هەیە. دوای ئەو تەلەفۆنەش دیتم حاجی میرزا دەڵێ لە ١٩٤٦ چووین بۆ سلێمانی.

لە لاپەڕە ٨٨ شەرحی (ئافەرین گۆیان) هاتووە بە (ئافەرینیان کرد). ئەم وشە لێکدراوە لێدوانی دەوێت.

لێکدانەکە فارسییە، لەوێشدا (گوویان) دەخوێندرێتەوە. وشە لێکدراوەکە فاعیلیەت و وەسف دەبەخشێ، لەلایەن ڕێزمانیشەوە کە کەوتە ڕستە بەلای (ناوەڵکار adverb)دا دەچێتەوە چونکە وەسفی (کردیان بەجەژنە) دەکات. ئەم (ان)ە هی فاعیلییەتە لە فارسیدا، بەزۆریش لە کاردێت وەک: لەرزان، دەوان، خەندان... هتد. لە کوردیدا باوی نەماوە مەگەر چۆناوچۆنی دەنا بۆ فاعیل بەکاری ناهێنین تەنانەت کە دەڵێین (لەرزان، ڕێبەندان، هەرزان..) لە بیرمان چووەتەوە کە ئەم وشانە ناوی کاران (اسم فاعل). وشەی ئافەرین تورکی نییە (وەک لە شەرحەکەدا دەڵێ کوردی و فارسی و تورکییە). بە ئەسڵ وشەیەکی ئاڤێستایە لە قاڵبی ئافرینە ئافریتی. ئافریفەنە هاتووە بە واتای ئافەرین کە لە ڕیشەی (فری) وەرگیراون بە واتای خۆشویستن و پەرستن و دڵخۆشکردن و هۆندن و خەلقکردن. کە دەگوترێ جیهان ئافەرین بە واتای (خالق الکون). ئەم (ئافەرین)ە لێرەدا خەلقکردنە. لە کوردیدا زۆر جاران بە شۆخی یەک بەیەکێک دەڵێ (ئافرەوان) و بەخەیاڵی خۆی واتای (ئافرەت)ی لێ داڕشتووە. لە ڕاستیدا ئەم (ئافریفەنە)یە دێتەوە سەر زمانان. دوور نابینم ووشەی (ئافرەت)یش هەر لە (ئافرینی) وەرگیرابێ کە ئازبێدانێکی تێدایە. نەک لە (اروادی)ی تورکی. لەم

مەیدانەی (نافەرین)دا تەماشای لاپەڕە ٢٠٦ و ٢٠٧ بکە لە کتێبی (مزد یسنا و ادب پارسی، جلد اول، د. محمد معین - هەرچی لەبارەی نافرەت و نافرەوانەوە گوترابێ هی خۆمە - م. م -). نەفرین کە لەعنەتە بەرانبەر نافەرین هاتووە.

لەلاپەڕە ٥٩ وشەی (تەل) شەرح دراوە گۆیا فارسییە بە واتای تەلەفۆن ئەم وشەیە telephone نەفارسییە و نەرۆژهەلاتی. کەرتی یەکەمی بەواتای (دوور)ە نەک تەل، وەک تەلەپاتی، تەلەگراف، تەلیکس. کەرتی دووەمی (فۆن) بە واتای (دەنگ) بە هەردووکیان دەکەن دووردەدەنگە، دەنگی دوور. وشەکان لاتینین. (فۆن) لە تەلەفۆن، گرامۆفۆن، دیکتافۆن..دا مانای (دەنگ) دەبەخشێ.

هەر لەو لاپەڕەیەدا (موهاجیر) بە (کۆچکەر) لێ دراوەتەوە. باشترە (مشەخت) بە واتای موهاجیر لە کاربێت. لە زاری کرمانجی سەرووودا بییستوومە ئەو واتایەی هەیە.

بازێک دەهاوێژم بۆ لاپەڕە ١٤٢ کە سەرەتای مەرسییەکەی بۆ باوکم لەوێوە دەست پێ دەکات. لە کۆتایی دێری یەکەم وشەی (گریان) لە صیغەی فاعیلییەتی فارسییەوە هاتووە بە واتای (باکی) نەک لە (گریان)ی کوردی بە واتای (بکاء) چونکە سیفەتە بۆ چاو. پێشتر باسی ئەم ڕێژەیەم کرد لێرەدا شایەدم بۆ هێنایەوە.

لە دێری نۆیەم (فاختە) کۆترەباریکەیە. دوای ئەمە (ناڵەی تەزرە) نووسراوە و واوی عەطفی پێوەیە بووەتە (تەزرەوو). ئەم وشەیە (تەزەروو)وە کە ناوی تەیرێکە وەک کۆترەباریکە. نالی مەدحی تاقمە مومتازەکەی (خاصەی شاه) دەکات و جارێکیان دەڵێ (سینە تەزەروون).

لە لاپەڕە ١٤٥ دێری ٣ (دوو دەماغ) هاتووە هەڵەیە. (دوودمان) ڕاستە بە واتای نەسەب و ڕەچەڵەک. لەم وشەیەشدا (مان) پاشگرە بە واتای جێگە وەک لە نیشتمانداد دەبیترێ. پێشتریش لەمە دوابووین. لە لاپەڕە ١٤٧ نیوەدێری دووەم (زانۆ)ی دەکرێ بە (زانوو). لە نیوەدێری چوارەمی شیعرەکە هەڵە زۆرە کە نووسراوە:

موتالای سەفحەی دیوانی مەعنایی کامەرانیم بوو

ئەمە ڕاستەکەیەتی:

موتالای سەفحەیی دیوانی مەعنای کامرانیم بوو

کامران لە (کام) و (ڕان) پێک هاتووە. (کام) بە واتای ئارەزوو، هەوەس دێت. (ڕام) کەرتی ناوی فاعیلی لێکدراوە لە (ڕاندن)ی فارسییەوە هاتووە بە واتای (لێخوڕین،

رواندن - لە ڕوێینەوە نەك ڕوان هاتووە-) تێکرای دەبێتە (ئارەزۆ لێخور - چەی بیەرێت دەیکات).

لە لاپەڕە ١٤٩ نووسراوە:

لە نەسلی ئەو (ڕەزا) بوو گەر ڕەزا نەبوو قەزا بوو
لە شیعر و قافیەی جوانی ڕەزا بوو بێ ڕەزا بوو

هەردوو مصرەعەکە لەنگە ئەمە ڕاستەکەیانە:

لە نەسلی ئەو (ڕەزا) بوو گەر ڕەزا نەبوا قەزایێ بوو
لە شیعر و قافیەی جوانی ڕەزابوو بێ ڕەزایێ بوو

دیسان لە مصرەعی شەشەم دەبێ (بۆ) بکرێتە (بوو) ئنجا (بوو) بکرێتە (بۆ).

لە سەرەتای لاپەڕە ١٥٠ مصرەعی دووەم دەنگی (ح) لە وشەی (فەتح) سووك بخوێندرێتەوە (خالید) دەبێ (ی) وەسفی بە دوادا بێت بکرێتە (خالیدی) ئەنجا (ئەووەل) دەبێتە سیفەتی.

دەچم بۆ لاپەڕە ٢٩٩ دوو مصرەعی بەیتی شەشەم نووسراوە:

خاکساری مەقامی بالایە
نیستی حازری مەقامی بالایە

مصرەعی دووەم هەم لەنگە هەم واتای ئالعبارە ڕاستی ئەوە بەیتەکە ئەمەیە.

نیستی حازری مەقامی حزوور

کە دەبێتە هاوقافیە لەگەڵ ظهور، لجور، طور، غفور.. کە قافیەی بەیتەکانن. نیستی بە واتای (نەبوون) لە فارسیەوە هاتووە مەعنای بەیتەکە ئەمەیە: وەکو خاکبوون مەقام بەرزیە. نەبوون بریتیە لە حازربوونی مەقامی (حضور)ی لیقای خوا.

لە لاپەڕە ٣٠٠ مصرەعی یەکەمی بەیتی سێیەم نووسراوە:

گاه تەسبیحی زوهدە ئەیگرێ

کە سەیری مصرەعی دووەم بکەیت نووسراوە:

دەستی ساعیز گرم کە ئەیزانم

مصرەعی یەکەم جگە لە لەنگی واتاشی ڕوون نییە مصرەعەکە بە یەکێك لەم دوو شێوەیە چارە دەکرێ:

گاه تەسبیحی زوهده ئەیگێڕێ

گاه تەسبیحی زوهده ئەگرێ مەی

چونکە (دەستی ساقیزگر) کە دەستێکە جامی شەرابی گرتووە جێگەی هەردوو شێوە هەموار دەکات.

چەند بەیتێك دواتر (زەننار) نووسراوە لە جیاتی (زیننار). پاشتر (ڕێگەیەکە) لەنگە (ڕێگەیێکە) دەست دەدات. پاشتر.

ئەشری ئەم شیعرە یە بوو لە دیوانم

یان دەبێ بکرێتە: ئەشری شیعرەیە لە دیوانم یان بنووسرێت:

ئەشری ئەم شیعرە بوو لە دیوانم

لە لاپەڕە ۳۰۱ مصرەعی سێیەم (هەروەك ئەلفی جانە ستوونی) لە قەسیدە مەدحەکەی حاجی قادر بۆ بارەگای قەرەنی ئاغای پیران وەرگیراوە کە سەرەتای دەڵێ: ئەم خەیمە کە شەمسییەیی شاهەنشەی ئەرزە (شەمسییە - چەتر). دەبێ دەنگی لام لە وشەی (ئەلفی) قورس بکرێ و وشەکە بەسێ بڕگە گۆ بکرێ: (ئە - لە - فی).

لە لاپەڕە ۳۰٤ مصرەعی یەکەم یەخۆڕایی لەنگ کراوە ئەگەر وشەی (ئەبدا) بکرایایە (ئەبەدا) لەنگییەکە هەڵدەستا.

لە مصرەعی یەکەمی بەیتی دووەم دەبێ (کە) بخرێتە دوای وشەی (ئەووەل). لە دێڕی ۱۱ «ئەم قانیەی ئەعلایە لەپاش موڕسەل» سێ بڕگەی کەمە دەبێ بگوترێ: «ئەم قانیەی ئەعلایە لە پاش ڕیحلەتی موڕسەل.

لە دێڕی ۱۷ (سایەی) دەبێتە (سایەیی). ئنجا دوای (عەرشایە) وشەی (لە) زیاد دەکرێ. پێشتریش لە دێڕی ۱٤ (عەرقەی) دەکرێتە (عەرقەیی).

لە لاپەڕە ۳۰٦ (سەحاب) بەواتای (جیوە)یە. لە کوردیدا (زیواو) بووەتە (جیوە). واتاکەی ئەوە دەبەخشێ کە زیوێکە شلە وەك ئاو. لە عەرەبیدا کراوە بە (زئبق).

لە دێڕی ۱٤ (ئەیقان) دەکرێتە (ئیقان).

لە لاپەڕە ۳۰۷ دێڕی ٦ (شوجاعەت) هەڵەیە (شەجاعەت) ڕاستە.

لەلاپەرە ۳۱۱ دێری یەکەم مصرعەکە «غوبارێکی ئالوودەپاتی تۆم» واتای نییە ڕاستییەکەی «غوبارێکی ئالوودەداماتی تۆم».

لێرەدا ئەم ڕچەیەی ئەتەڵەکردن دەبڕمەوە. هەر ئەوەندە دەڵێم گەلێ جێگەی دیوانەکە دەبێ ڕاست بکرێتەوە بە نموونە: لە لاپەڕە ۲۸٤ ئەو پارچە نازکەی شەش بەیتی دێری ٤، ۷، ۹، ۱۰، ۱۱ تێیدا زەدەیە هەر یەکە بە جۆرێك. (دهان)ی فارسیش خزمی (ددان)ی کوردی نییە. لە فارسی (دندان) ددانە.

لە کۆتایی ئەم گوتارەدا ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی گرنگی ناو دیوانەکە دەکەم بە (مسك الختام)ی ئەم ئاهەنگەی بیرەوەریی حادیمی ئەمری ئەدیبی جگەر سۆزی وەفادار. هەزاران هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی.

لە لاپەڕە ۱۱۹ بەیتی کۆتایی مەرسییەکەی بۆ مەرگی (بیخود) نووسراوە:

لە تەئریخی وەفاتی پیری مەعنی پێی وتم ئیمشەو
دڵێ (مەغفوورە) ئەم پیرە لە ڕەنگی ئەوجەوان ڕوویی

لە پەراوێزدا نووسراوە کە وشەی (مەغفوورە) بە حیسابی ئەبجەد ساڵی ۱۹۵۵ دەگرێتەوە. بە لێکدانەوە (مەغفوورە) ژمارەی (۱۳٤۲)مان بەدەستەوە دەدات. کەواتە ساڵی ۱۹۵۵ مەبەست نییە لەو مصرعەی کۆتایی مەرسییەکە. بە پێی جۆگەلەی ساڵانی هیجری و زایینی ۱۹۵۵ بەرانبەر ۱۳۷٤ - ۱۳۷۵ی هیجری دەوەستێ. بە ئەختێك زەینکاری دەرچوو کە ئەوەی تەئریخەکەی لێ وەردەگیرێ (دلی مغفورە)یە کە (۱۳۷۵)ی لێ پێك دێت و سڵاو لە خوێنەران.

بەیان، ۱۲۷ کانوونی دووەم ۱۹۸۷

# شەوی دووەم ڕاوە تارمایی

وەك مەلێکی بەسەر هێلانەوە بنیشێتەوە ئەویش لەسەر کورسییەکەی شەوی پێشوو دانیشتەوە. قاچەکانی لە یەکدی تێ پەڕاندن و پشتی دایە پشتی کورسییەکە و خۆی شل کردەوە. دەستێك بەبەر شەویلەی چەپە و دەستێك بەسەر باسکی کورسییەوە، وردە وردە چۆوە خەیاڵخانەی چیرۆکسازی.

قەڵەم و کاغەز ئامادەی خزمەت. پاکەت و کڵۆریت.. سوراحی و پەرداخ. گڵۆپی بەرەوڕوو، بێ دەنگی و دیمەنە تێك بزرکاوەکانی هەوەڵ هەوڵی ئەزۆك.. وەنەوز و کەڵەشێری سێیەم بانگ و خەوی بووڕانەوە.

«نەمزانی دوێنێ شەو چۆناوچۆنی چووبوومەوە سەر قەرێوڵەکەم. ئێمشەو بە تۆبزی چاو دانابچرم، هەر خەوم هات دەنووم. نووسینی خەواڵوو چ دەهێنێ؟ ناخوێندرێتەوە. کەنگر و ماست بە وەعدی خۆیە. خەیاڵێکی کردەوە.

هەڵستا سێ پایەکی بچووکی هێنا بۆ ڕادیۆ. «دوێنێ شەو ژوورەکەم دەتگوت فەنەی بێدەنگە. ناوناوە مۆسیقا بێ یان گۆرانی بێ گوتار و چیرۆك بێ.. دەنگوباسێك بێ دەماغ تەڕ دەکاتەوە. دز باماپە لە چیرۆکەکانی ڕادیۆ یەکێکیانم وێنە گۆڕ دەکرد بە ناوی خۆم بەڵام دەبوومە کابرای قتاری بە ئارەق کردەوە تا ئێرە بە خاوێنی هێناومە. دەستپاکی بە چیرۆکی دزراو نادەم. بە هیچی نادەم».

دەستێکی برد میلی ئیستگەکانی بە خێرایی بادا. وەکو گڕەی ماتۆڕ ترقەترقی ئیستگەی شەپۆل کورت بیری بردەوە بۆ لای برینشکەی سەر ئاگر. بەدەم خەیاڵی ڕێشکەی لادێ و تامەزۆیی منداڵییەوە میلەکەی لەسەر شەپۆلی ناوەندی گێڕا و گەشتێکی ئەم سەروسەری پێ کرد و ڕادیۆکەی کوژاندەوە. «جاری زووە بۆ بەرنامەی خۆش، ئەخباریش چی نوێی تێدا نییە».

سەعاتی مەچەکی بۆ تۆ دەچوو. جگەرەیەکی داگیرساند. چاوی بڕیە قەتاری مقەبەتی دووکەڵ لە وشکەمەڵەی ئاچاری کە بە هەواوەی دەکرد. مەترێك نەبزێی ووکەڵ پێچی کردەوە و ئەفەکانی تێکەڵ بوون و بڵاوەیان لێ کرد. داوی کشتەکە مزیەح پسا و دانەکانی هەڵوەرین

خەڵقی بازاڕی شەهناوردی ئەم پاش عەسرەش وەکو ئەم دووکەڵە دەچمین و لەوسەری بازاڕەوە بڵاوەیان لێ دەکرد. نەتدەزانی بۆ کوێ دەچن. بە دڵمدا هات، هەریەکێك لەو زەنبیل بەدەستانە چیرۆکێکی بەدواوەیە. خۆزایی نییە هی وەهایان تێدایە حیسابی نرخی بامیە و باینجانی بۆ ناچێتەوە سەریەك، دیارە بە دڵ لە شوێنێکی دیکە دەژیت.

کێ دەیزانی کە من خۆم دەستم بۆ ترێ برد. بیرم لە قارەمانێك دەکردەوە کە حەز لە هەنجیر بکا. هەر ئەوە بوو بە بەقاڵەکەم گوت کیلۆی هەنجیر بە چەند. گوتی هەنجیری چی؟

بەهەشتە ترێم مەبەستە، زەردەی هاتێ و چۆوە

«دووکیلۆ بە دوو دینارە».

سەرێکی ڕەفتەی ناو پەنجەرەی بەردەمیەوەی کرد. هێشتووە ترێیەکەی بۆ شەوی هەڵگرتبوو تۆپەڵە ڕەنگێك بوو لە مەیلەوڕەش هەتا ئاڵ هەتا پەمەیی هەتا زەردی نەباتی.. قاپی ترێ بایبی قەوارەی خۆی جێی بە دوولای پەرەکە چۆڵ کردبوو، کەلێنێکی شکڵ سێ سووچی تێ خستبوون لە شێوەی بورجی ئێفل.

ئەمەتە کۆتایی سەفەری ژیان، مێو ڕشایەوە و بوو بە پەرسیلە و بەڵەکە تا پێ گەیشت. دەستاودەستی کرد لە باغەوانەوە بۆ بازاڕ. لە فرۆشیارەوە بۆ کڕیار و بۆ ناو دەست و دەم.

سێ چوار بۆڵووی لێ خوارد: «بە لەزەتە بۆ ئەم کژە درەنگەی ساڵ. ترێخۆریش هەر لەم سووڕەوە پێچ دەکاتەوە بۆ ناو خاك. دەبێتەوە بە خۆراکی گیا. ئاژەڵ گیا دەخوا. بۆ خۆی دەبێتەوە خۆراك. دەچێتەوە ناو خاك...». هەناسەیەکی هەڵکێشا و پێنی بە خەیاڵەوە ناوە. «بازاڕی شینایی دنیایەکی بچووکی قەرغای سەیرە. ئەمڕۆکە بە چاوی ماڵەت سەیری ئەم خەڵقەم کرد دەتگوت لەمەوبەر نەمدیتوون. سەد چیرۆك لەبەر ئەو دوکانانەدا پێکەیدا تێ دەپەڕین. لە یەکدی دەخشان و تێك دەمخاڵقان. کێ دەڵێ من سەرنجی باشم لێ گرتوون. وردترم سەیر کردبانایە لێیان حاڵیتر دەبووم.

تۆ بڵێی بە ڕێکەوت باینجانەکانی کابرای پەستەك لەبەر و پیازەکانی ئافرەتی عەبا بەسەر پێکەوە ڕژانە سەر زەوی؟ بۆچی وەها لە یەکدی نزیك بوون؟ گۆیا ئەمەشیان ڕێکەوت بوو؟ پێکەوە داهاتنەوەیان بۆ کۆکردنەوەی پیاز و باینجان دەبێتە سێ

ڕێکەوت. کابرا ناچار بوو یان دەیگوت ناچارە بۆ خۆی و بۆ ئافرەتەکەشیان کۆ بکاتەوە. هیچی بە گوێدا چرپاند؟ کاغەزێک، ڕاسپاردەیەکی نەخستە زەنبیلەکەیەوە؟ دەبوو ئەوسا چاویان تێ بڕم نەک ئێستا بەدوا خەیاڵی یابردوو بکەوم. دەڵێن وێنەی شتان لە دەروونیدا نەقشبەستوو دەبێ، لەوانەن دواتر بێنەوە بەرچاو.

بڵێی بە قووڵبوونەوە هیچم لێ بەبیر بێنەوە! کە زیرەیٛ تایەی ئۆتۆمۆبیلەکە لە جادەوە خەڵقی وشت کرد و کابرایەکی گۆیاڵ بەدەست ڕای کرد. بەڕاست ئەم گۆیاڵ بەدەستە بەناو خەڵقەکەدا دەگەڕا و هیچی نەدەکڕی. زەنبیلەشی پێ نەبوو. چاکەت و پانتۆڵ و پۆشاکی عادەتیی مەیلە و کۆن بوون.. تێی چی دیکە. دەبوو سەرنجی لێ بگرم لای خۆی بەچاوی مامڵەت سەیری دنیام دەکرد. سەرنجم ورد نەبوو. دەتگوت بە پەلە چیرۆک دەخوێنمەوە قارەمانێکم دەستنیشان نەکردبوو، تومەز هەموو بازاڕەکە بەگردی قارەمان بوو. جاران بازاڕەکەش لە مێشکمدا چەسپ نەدەبوو. پێیدا تێ دەپەڕیم و تەدەدیت. لێرە بەدواوە وەها ناکەم. کەروێشکانی چاو زەق ناکەمەوە و هیچیش نەبینم. خەیاڵ دەڕوات و قاچ لە خۆوە ڕێگا دەبڕێت و چاو چ نابینێ. عادەت پێومگرتنە دەمانبات و دەمانهێنێت. ئەو ئۆتۆمۆبیلە برێکی توندی نەگرتبایە کابرای خاوەن گۆیاڵم نەدەکەوتە بەرهەست. یوەستە یوەستە وا دێتەوە بیرم. لەگەڵ دەربەڕینی گۆیاڵ بەدەستەکە باینجان و پیاز ڕژانە سەر زەوی و کۆکرانەوە. ئەمەشیان ڕێکەوتی چوارەم بێ؟ دواتر چی بوو؟

نا.. نا.. ئەخێر ئاناتای ناوێ هیچ نەبوو، گۆیاڵ بەدەست گەڕایەوە سەیرێکی بازاڕی کرد و گورج تێی قووچاند. دەتگوت ئەوەی دەیویست بیبینێ نەیدیت. منیش خۆ عەبابەسەر و پەستەک لەبەرم نەدیتنەوە. دیارە لەو دەمەی چاوم بڕیبوە گۆیاڵ بەدەست ئەوان بزر بوون. لاشانێکی بە پەستەک لە زارکی بازاڕی لای شەقامەوە پێچی کردەوە و لە قەڵەبالغیدا تێ چوو. پێنۆکێکی شان و پەستەک دیترا و نەدیترا ئنجا چی؟ عەبا بەسەری لەگەڵدا بوو؟ من هەستم پێ نەکرد. دەبێ لە زارکی دیکەی بازاڕەوە بۆی دەرچووبێ.. ئایا شوێنبزرییان لە گۆیاڵدار کرد؟

لەوانەیە پەستەک لەبەر بە ئانقەست ڕووە و لای جادە چووبێ هەتا گۆیاڵدار بە لای خۆیدا بکێشێ. دیارە کاغەز و ڕاسپاردە خراوەتە زەنبیلی عەبابەسەرەوە. گۆیاڵ بە دەستم نەدیتەوە. ئایا بەدوا کابرا کەوت یان ئافرەتەکە؟ تێرە شێرلۆک هۆڵمزی دەوێ. بەڕاست تەمەنیان چۆن بوو؟ وەک بۆی دەچم گۆیاڵ بەدەست ٣٥ ساڵی، کەمتر زیاتر،

بوو. ئەو بە عومرتر بوو لە بەستەکدار.

دەساڵێکیان بەین بوو. عەبا بەسەر سەرەژن بوو. بە عومر بێ ٣٥ ساڵی بۆ هەموو کارێك دەست دەدا هەر لە سیخوڕی هەتا دڵداری هەتا هەرچی بێ، ٢٥ ساڵی بۆ دڵداری و بۆ خۆخستنە مەترسییەوە لە بارترە. ئافرەتی پەنجا ساڵی زرە بۆ دڵداری، هەر دەتوانێ قاسیدی دڵداران بێ.. ڕاسپاردەش ڕادەگەیەنێ. ئەگەر مەسەلە دڵداری بێ ناشێ عەبابەسەر و بەستەك لەبەر لە گۆڕاڵدار بێ ئاگا بن چونکە دڵدار غەریمی خۆی دەناسێ.

ئەگەر مەسەلە سەر بە سیاسەتەوە بێ بڕیاری لێوە نادرێ، لەوانەیە هەردووکیان مەستیان بە گۆڕاڵدار کردبێ، لەوانەیشە خۆپاریزییان تەقیەی عادەتی بێ.. چوونی بەستەك لەبەریش بۆ لای جادە بێ مەبەست بێ. خۆ دەبێ ڕوو لەلایەك بکا. باشە ئەم بەستەکە زەق و زۆپە لە شاری وەها بەسرکە و کورکەدا وەك مادەی (عەسعەس مارا بگیر)ی لێ دێ. چاکەت و پانتۆڵ قات بوو بۆ شوێنبزری؟ یان کابرا لە دەشتەوە هاتووە بۆی نەکراوە جلك بگۆڕێ؟ بەڵکو دەرفەتی نەبووە یان جلکی چنگ نەکەوتووە. شکڵی شارستانی بوو. دەشتەکیش بووبێ خوێندنی تەواو کردووە تنجا چۆن ئەو بڕیارە بدەم بەدیتنێکی سەرپێیی بەپەلە. نەمکرد لە خۆی بپرسم! خەیاڵی پێچەڵپێچ سەریش گێژ دەکا.. گلاسێکی ئاو خواردەوە و جگەرەیەکیشی داگیرساند. دەستی برد میلی ڕادیۆکەی گێڕا. چندووکەکان قسەی پچڕپچڕیان کرد بە سەد زمان، یەك ئیستگەی بەدڵ بوو گزمگزی تەشویش تامی بڕیبوو..

گێڕای. گێڕای و پێداهاتەوە في الاقتصاد الـ قرت قرت باذن الباري؛ عز و قرت قرت ساعة لكل ذوق «ئەمەیان مۆنت کارلۆیە.. گوێم لە کوردی نابێ، دەستم ڕۆیشتبایە گوێی سەرۆك دەوڵەتە زلەکانم دەکێشا مەترێکم درێژ دەکردنەوە و لێم دەچریکاندن: هەی درۆزنە زلەکان بۆچی فیشاڵە چەور و لووسەکەتان بە کوردیش بڵاو ناکەنەوە، شەرتی پیاوان بێ هەر ئیستگەیەکی کوردی بکرێتەوە قوربانییەکی لە قەسەر حاڵی بۆ سەربڕم. پازدە بیست ملیۆن کورد لێی هەسار بێ بابیی شەترنجی بۆ خەرج بکرێ. بەك بەزیادم نەکردی دیموکراسی و دیکتاتۆریەتی درۆزنن.. چەند سەیرە ئەو درۆزنانە لە ئاست کورد ڕاستگۆن کە تێی ناخوێننەوە، بە درۆش بۆی نابزرکێنن...»

میلی گێڕا: "ومن هنا پستمد قرت قرت. صدق الله الـ . قرت قرت چەگونە

مستضعفین..." میلەکەی ڕاگرت: «بەڵێ کوردەکە بۆ کوشتن و بڕین لە گۆشەی مەهاباد و سنە مستضعفین نین، چەنگیز و هیتلەرن.. بەنەیوویەت».

میلی بە توندی بادا.. "قرت قرت قرت  فی فلسطین المغتصب. قرت قرت  گژقژ. تق." ڕادیۆکەی وەها بە توندی کوژاندەوە چی دیکەی تین دابایێ جارێکی دیکە هەڵنەدەبوومەوە.

تەفەزی سنگی پڕبوو لە حەفەت.. کونەلووتی لێ قش بوون. بەقوونکی جگەرەکە دانووسا تەفەسێکی قووڵ قووڵی لێ دالگرت دووکەڵ خەریك بوو لە کونەگوێیانی دەرچێ.. ڕێی نەبوو دەرچێ. لە لووت و زاریەوە بە لوولە و بەبڵاوی تێکیان کردەوە هەردوو لوولە سەرەژێر هەوروکەی زاریان سمی.. تەوژمیان ڕەوییەوە و تۆزاڵ تۆزاڵ بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەوە.

«ڕادیۆی هەموو دنیا بابی دووکەڵی جگەرەیەك شەهۆڵی کوردی نادەنەوە. دەشڵێن (أمم متحدة) درۆیەکی زل و زەبەندە، نە ئومەمە و نە موتتەحیدە. دەبوو بڵێن کۆمەڵەی دەوڵەتە نارێکەکان، هێی مامە ڕادیۆ بەڕاستی لەزەتم لێ کردی، چەندی دەکەم لەو پشتگوێ خستنەی زمانی کوردی ڕاناییەم، چشم پێ ناکرێ. کەس چیی پێ ناکرێ. دەبێ بە تەمات بن ئنجا بە زمانت دەدوێن. تا دنیا وەهابێ مەسەلەی ئێمە وەکو قاوێت و ڕەشەباکەیە».

ڕاست بۆوە بەرەو هۆڵ ڕۆیی، خێزان بەرانبەر تەلەفزیۆن کەوانەیان بەستبوو، سەرنجیان بۆی نەکشا. بە ئەسپایی کشایەوە لە مەتبەخ ساندویچێکی بەسەرپێیانەوە خوارد. چایە هەڵمی لێ هەڵدەستا، کوپێکی لێ تێ کرد و گەڕایەوە ژوورەکەی. ڕقی ناو دڵی لە ڕادیۆ نیشتبۆوە گوێی لە تریەی دڵۆپە باران بوو.

هەرمتی پەڵەیە. خوایە ئەمیشمان لێ نەکەیتە زمانی کوردی. ئەوەی دەغڵی چاندووە و ئەوەی بەتەمایە بچێنێ چاوی بڕیوەتە ئاسمان. هەوای لە ڕۆژان ساردترە، لە پاش نوێژی عەسریشەوە هەوری مەیلەو تەر کردووە هەستی ڕاگرت، دەتگوت بوونەوەر جێی بۆ دڵۆپە باران چۆڵ کردووە تا بەدڵی خۆی دابەزێ. چرتەچرتی سەرەتای پلووسکی سەربانی کەوتە بەرگوێیان. دانیشت و گوێی ڕاگرت، کوپە چایەی دەستی ڕاستی و جگەرەی دەستی چەپی و بارانی بەپلووسك لەو دەمەدا دەوریان لە هەست و هۆشی دابوو، لە ناویان دەخولایەوە بۆ چەند دەقیقەیەك لە سێ سووچی سێڵەی پلووسك و

هەڵمی چایە و دووکەڵی جگەرەدا پێچەوپەنەوەی دەکرد. پێیانەوە ئارام بوو هەڵم و دووکەڵی دەدیت. پلووسکی دەبیست. بە جۆرێك كە نەیدەزانی چۆنی وەسف بکا، هەستی تێکەڵ بەتام و شامی ئەو هەڵم و دووکەڵە دەبوو، وێکڕا لەگەڵ ئاوی باران بەپلووسکدا نەرم نەرم پارچە مۆسیقای سێ ئالەتییان دەڕشتەوە ناو دڵی. لە خۆی ڕازی بوو. گەییی سوابۆوە لە پڕ بلاچەی برووسکە پەردەی پەنجەرەکەی گەشاندەوە و بۆ یەك تروکەی چاو ڕایەڵەکانی ئاشکراکردن. گرمە گەیشتە بەرگوێی، میناکانی لەرلاندەوە، سێ سووچەکەی لێ بۆوە بە هەشت سووچی ژوورەکەی، خۆی و قەڵەم و کاغەزیش ئاکتەری چیرۆکی نەنووسراو. «گرمەت خۆش بێ.. دەڵێن بۆ دونبەلان باشە. نە کاکە گرمەی بەهارانە وەهای پێوە دەڵێن. کوڕە هەر کامێکیان بێ کیلۆی لە دە دینار نایەتە خوار، بۆ ئێمەمانان مەلاخۆرە نابێ». باران تێپی داپێ. پلووسك بێنی پێوەنا. «قدومت بەخێربێ، یاخوا پەڵەی تەواوت پێوە بێ. با بەهارێ سبەینێ پاڵی لێ دەدەمەوە هاتوچۆی ئاوجادەی قوراوی پاییی فلسیکە. پێش نیوەڕۆی ئیمڕۆ بارییابە نەدەچوومە بازاڕی میوە. گورج شێوەی عەبابەسەر و پەستەك لەبەر و گۆپاڵ بەدەستی هاتەوە بەرچاوان. پێیاندا هاتەوە هەر لەو کاتەوە کە سەرنجیان ڕاکێشا تا ئەو دەمەی لێی ون بوون. شتێکی تازەی بەبیردا نەهات. چەندە هەر هەندە دەبوو هەر حەیاڵێکی لێیان بکەم یەك یەك بە لیستە ڕیکی بپەخم. چیرۆك وردە وردە کەرستەی تەواو دەبێ خۆ نەقشی بەرد نییە تەچێتەوە. زەرەی برێکی ئۆتۆمۆبیل. ڕاکردنی گۆپاڵ بەدەست. تێکەڵبوونی باینجان و پیاز. پێچکردنەوەی شان و پەستەك. چیی دیکە؟

ئەرێ چیی دیکەی بۆچییە؟ جارێ با لەوە بگەین پەستەك شتێك نییە بۆ شوێن بزری لەبەریکرێ. پەستەك بۆ ئەوەی لێی ڕاپێی وەك پێستی لەشی لێ دێ. کوڕی چاك! پەستەك لەبەر خەڵقی شوێنێکە پەستەکی تێدا باو بێ. گەنجی ئەم کەرکووکە حەیاڵ لە پەستەك ناکاتەوە. کابرا لە دوورەوە هاتووە بەڵام کێ دەڵێ ئەویش وەك من نەهاتووە بۆ کەرکووك بەخۆی و پەستەکەوە نیشتەجێ بێ! ئەگەر تا کەراج شوێنی کەوتبامایە و بەدیتبایە بەرەو سلێمانی و کۆیی سەفەر دەکا دەمگوت مەکەمەکەی تێدا نییە ڕاسپاردەی پێ بووە ئەدی عەبابەسەر چووزانێ پەستەك لەبەر لە بازاڕی میوە بۆی ڕاوەستاوە؟ گۆپاڵدار چۆن سۆسەی کرد؟ دەشێ گۆپاڵدار بەدوا عەبابەسەردا هاتبێتە بازاڕ، ئەمما بەبێ خەبەر نە عەبابەسەر دەزانێ پەستەك لەبەر لە کوێیە نە ئەمیشیان ئاگای لە عەبابەسەرە. لەو پەینە دەبێ ژوانێك بەستراپێ. لێرەدا ئاڵقەیەکی زنجیرە

دیار نییە. چۆنی چارە بکەم؟ خەیاڵ بۆ کوێ بەرم کەلێنم بۆ بگرێ».

دەستێکی برد پاشەسەری بێ ماڵییەوە و خرووییەکی مەوموومی دامرکاندەوە بەجارێ ڕەپەی باران و شڵپەی پلووسک هووروژمی هێنا و زوورەکەی پڕ کرد لە دەنگ و ڕەنگ. هەر دەتگوت دنیای نووستووی ناوەێشکی لە پەنی پەنجە و پاشەسەری بەوتۆزە خوراندنە خەبەری بۆوە. لرفەی ڕەپەی ولاغە بەرزەی هاتەوە بیر کەدوای گەوزین تۆز لە خۆی دەتەکێنێ. هەر دەڵێی پێستی بە گۆشتەوە نەنووساوە وەهای دەهەژێنێ و دەلەرزێنێ. کەر وەهای بۆ ناکرێ. گوێیان دەلەقێنێ و هیچی تر. گوێی بۆ لای هۆڵ شل کرد. هیچی نەبیست. زانیی خێزان نووستووە. سەیری سەعاتی کرد بۆ یەک دەچوو: «عەجایب شەو وەها بە تیژی تێ دەپەڕێ و هەستی پێ ناکەم. سەیرە خەویشم نایەت. مەراقی عەبا و پەستەک و گۆپاڵ بۆتە گرێکوێرە. هەردەبێ بتکەمەوە حیکایەتێکت بۆ هەڵبەستم ڕاست و درۆ تێک بەستێ. درۆی ناچاری هاڵەبەخش کراوە کەسیش ئاگادار نییە چیم دیتووە لە بازاڕی شەنایی. هەرچی چیرۆکم بخوێنێتەوە وا دەزانێ هەمووی خەیاڵکردە. دام نا منیش دکتۆرم درۆی خۆشکەڵە دەکەمە پاڵپشتی دەرمان. دەمانەوێ نەخۆش ڕاهی بێ. چیرۆک بگونجێ».

دەستی برد تێلماسکێکی لە ترێیەکە قرتاند. یەک یەک و دوو دوو بۆڵووی دەخستنە زاریەوە. جگەرەیەکیشی بۆ داگیرساند. تامی ترێ و قەفی دووکەڵ دنیایەکی بچووکی ئارامی بۆ هەڵچنا. بیری بەسەر نەرمان و مەزرادا دەکشێ: «کاشکێ کێشەی ژیانیش وەک ئەم تامە خۆشە لە دەمارانیدا دەگەڕا. گرێ و گاڵیش هەر هێندەی دووکەڵی فشەڵۆک خۆی دەگرت. لە هیچە موشکیلە بۆ یەکدی دەنێینەوە. قۆنتەراتی موشکیلەمان بەملەوەیە. گۆپاڵ و عەبا و پەستەک بۆچی تێک بهاوێن! چاوشێرکێ لە یەکدی بکەن. هێمنی چەند بێ ئەرکە کەچی ئاژاوە ئاسانترە. شاهی نەقشبەند و گەیلانی بێنە کاکەحەمەدیشیان لەگەڵدا بێ بە ڕێجاکار ناتوانن ئەم گۆپاڵە لە مەرجشە بەرەن. یەک قەڵەم بە گۆپاڵی لێ ڕاست دەبێتەوە. قەڵەم هەیە خۆی دەکاتە گۆپاڵی تۆقاندن. دەبوو گۆپاڵ بە خۆیدا بشکێتەوە کەچی وەک عەلیشیش چەتر لێ دەدا! کەڵەشێرە و خۆی فش هەڵدێنێ». گورج بیری بۆ کەڵەشێرەکانی شەوی ڕابووردوو ڕۆیی چۆن دوو جاران بانگیان دا. بەر لەوەی هەمو بەڵایەدا بیاتەوە بیری کردەوە و لەبەر خۆیەوە گوتی: «دوو جار بوو یان سێ جار؟ چەندێکی نیشەو گوێم لە جارێکیشی نەبووە».

یەکسەر دوای ئەم خەیاڵە گوێی لە شڵپەی پلووسک و ڕەپەی باران بوو:

«کەی دەنگی کەڵەشێری ناو کۆڵێت لەم هەرایە بڕ دەکا. ماڵەکەشمان کەڵەشێری نییە لەبەر ئێزیکی ببیسین. هەر کۆترمان هەیە».

سەیرێکی سەعاتی کرد. درەنگ بووبوو. دەتگوت هەستکردن بە درەنگیی شەو دەمارەکانی هاوکردنەوە. باوەشێکی بەش هەردوو شەویلەی وەک دەرابەی دوکان داپچری. ڕاست بۆوە بۆ لای دەستشۆر ڕۆیی. بە دەموچاوی تەڕەوە گەڕایەوە. ڕادیۆی بەگەڕ هێنا، قاهیرە و بەغدا بەدەنگ بوون. یەکیان لە باسی قادسییەدا بوو ئەوی دیکەش گەشتێکی بەرەو ژاپۆنی دەگێڕایەوە «ماڵیان ئاوا بێ شەونخوونی دەکەن بۆ ئەوانەی کەم خەون، نەخۆش یان لە مەراقدان». مێلی گێڕا. شەپۆلگۆڕیی کرد بەسەر هیچ ئیستگەیەکەوە نەوەستا و ڕادیۆی کوژاندەوە. باران لەبەر گوێی بەدەنگ هاتەوە.

هەقە پەڵەیە. قەندیل سێ کراسەی بەفری لەبەر کردووە. چەند دەگەشایەوە کە هەوڵ جار ترۆیکی سەرەکانی بۆز دەبوون. لێرەوە دیارە بەڵام هەتا بە تەواوی سپی نەبێ دەرناکەوێ. لەبەر دووریی چاو تێی برناکا. خۆ تۆزیش نارەوێتەوە مەگەر باران بیمرێنێ. هێی هێی چەرخی زەمانە چ سەروبنێك بەو خەڵقە دەکەی، خۆرایی نەبوو پێشینان پێیان دەگوتی چەرخی چەپگەرد. ئۆباڵی خۆیانیان لە ئەستۆی تۆ دەبەست. کوڕە بێ دەسەڵاتیی خۆمانە دەیکەینەوە یە دەسەڵاتی فەلەك دەنا فەلەك چیی بەسەر چییەوە. خۆی هەیە هەتا دەسەڵاتی هەبێ؟ گۆپاڵ بەدەست فەلەك ناردوویەتی؟ فەلەك عەبا و پەستەك و گۆپاڵی کزکردووتەتەوە؟ تێکی بەستوون؟ بریکی بە نۆتۆمۆبیل گرت؟ ئێستا دەڵێین هۆی مادی دەمانهەژێنێ. فەلەك بێ و مادە بێ ئێمە جارێ هەر بێ دەسەڵاتین. خۆزی دەمزانی هێزی چەرخ و فەلەك بوو یان بڕیاری مادە بوو لەو بازاڕەدا سێ ڕسکانەی نابۆوە ئەدی چی بوو منی کرد بە شایەدی چاوبەستراو؟ من بە ڕێکەوت گەیشتمە دیار تەختەی سێ ڕسکانە، ترێ و شینایی دەھلێکیان نەبوو. لەوانە بوو زووتر یا درەنگتر بۆ ترێ و شینایی چووبامایە و هیچی بە عەبا و گۆپاڵم نەدیتانە. ڕێکەوت لە دەسەڵاتی فەلەك و بڕیاری مادە بەدەرە مەگەر هەر خۆمان هەڵسووڕ و داسووڕێکی تێدا بکەین. تۆ بڵێی وەهابێ؟ هێزێکی دیکەی نهێنی نەبێ بەولای چەرخ و مادەوە دەست لەم جیهانە بوەشێنێ؟

منیش بەو حیسابە دەچمەوە ڕیزی عەبا و پەستەك و گۆپاڵ. هێزی نهێنی دەبێ لەو دەمەدا منی گەیاندبێتە بازاڕ. هەرماوە چیرۆکیشم بۆ بنووسێ. هێزی نهێنی بمباتە بازاڕ و بمکاتە شایەدی سێ ڕسکانە و چاویشم ببەستێتەوە؟ دواتر بە نووکە سووژن

ئاگادارم بکاتەوە؟ ئەمەیە دەتبەمە سەر ئاو و ئاوپشت ئادەم. بەخوا بەم حیسابە ڕازی نیم. بەم دوعایە نالێم ئامین. فەرموو هێزی تەهێنی چیرۆکم بۆ تەواو بکە یان چاوم تیژتر بکە تا بتوانم سێ ڕسکانەی ژێر پەردە بخوێنمەوە. پەردەی چی و چاوی تیژی چی، بەو عەزیمە چریسکەی سەعات و زنجیری مەچەکی پەستەکدار نەبوایە هەر ئەشمەاتە بەرچاوم. کە دەستی درێژ کرد بۆ باهێنجانەکان قۆڵی سەعاتەکەی کەوتە بەر ڕوناکایی، زنجیرەکەشی گەشایەوە. سەعاتی وەها چریسکەدارم نەدیتبوو بۆیە زەینی ڕاکێشام. دەتگوت پشکۆی ئاگرە.

ئێستا بە چاکی دێتەوە یادم، سەعاتەکەی لە دەستی ڕاستی کردبوو. وەها ئەهایە ڕەنگ بوو نەیبینم چونکە لای ڕاستەی لە من بوو. کێ سەعات لە دەستی ڕاستی دەبەستێ؟ ئەم عادەتگۆڕییە بۆچی؟ بەڵکو کابرا چەپەوانە بێ؟ خەلق سەعات لە دەستی چەپە دەکەن چونکە ئەرکی لەسەر نییە. دەستی ڕاستە هی ئیشە سەعاتی پێوە خۆش نییە سەعاتەکەشی لە شکان نزیک دەبێ. ئەم کابرایە چەپەوانە ئەبێ بێ زەوقە. بەڵام چ دادی من دەدا پەستەک لەبەرێک چەپەوانە بێ! دنیا پڕە لە هەموو شت ئنجا چ فایدە؟ تەمووز شەل بوو، ڕەزاشا کەچەڵ بوو. خەلیفەیەکی کۆن زاریەکەتی بوو. پەستەک لەبەر چەپەوانە بوو. چش تەنکە ردێنێکی ڕەشیشی بە لاشەویلانەوە بوو. شاڵڵا ئەمیشیان بۆ سمێڵ و برۆیەکانی بڵێین چی؟ سمێڵ ڕەنگە ساختەبێ ئەمما برۆ هەر بۆیاغ هەڵدەگرێ. بەزۆری برۆ ڕەشن مەگەر سوورکاڵێک برۆی زەرد بێ. ئەمیان گەنم ڕەنگ بوو. ئەگەر پێستی ڕووی ڕەنگ کردبێ دەبێ دەست و ملیشی هەروەها. برژانگەکانی، مووی سەری ئەخێر ئەم هەموو ماکیاجە کاری کردن نییە. کابرا چەپەوانەی گەنم ڕەنگ بوو.

دەستی بۆ قەڵەمەکەی برد و بیسمیللای لێ کرد و وەک سفتاحی خاوەن دووکان لە شێوەی تێبینی ئەمەی نووسی: کابرایەکی ۳۵ ساڵەیی پەستەک لەبەر، چەپەوانەی گەنم ڕەنگە سمێڵ ڕەشی بە تەنکە ڕدێنەوە. سەعاتی مەچەکی ڕاستەی وەکوو پشکۆی ئاگر چریسکایەوە بەسەعاتەکەیدا دیار بوو چەپەوانەیە لە داهاتنەوە.

لە پڕ قەڵەمەکەی وەها هەڵبەزییەوە دەتگوت لە ترسان سڵەمییەوە. بە بزرکانی ڕوویدا دیاربوو فکرێکی تازە هەستی گەست. چاوی لە چووق نا و دەستی چەپەی بۆ تێو چەوانی برد. پشتی گەیاندە پاڵپشتی کورسییەکە. قەڵەم لەناو پەنجەکانی بە هەواوە حەپەسا:

خۆیەتی سوێندی لەسەر دەخۆم خۆیەتی. هەش بە سەرت حەمەی حاجی مراد ئەگەر ئەوەی بۆی دەچم ڕاست بێ. چۆن ڕاست نییە. لە بن چەرخی فەلەک یەک چەمەوانە هەیە لەو عومرە و لەو شێوەیە. گوێهاڵدار پاسەوانی بوو. بەنایەت سەر و دەمانچەیان لەبن چلکان شاردبوەوە ئەمە زۆراب و ڕاستان، چەمەوانە چەمەوانەی ڕاستان، کوڕە مەرگەمووش . بۆ حەمەی فەقێر ڕاستە و چەپە فەرقی چییە. ئێستە چی بکەم چاکە. حەمە تەلەفۆنی نییە. بەم درەنگە و لێزمەیە سەیارە چنگ ناکەوێ. بەپێیان بچم؟ لە خۆم ئەمین نیم. پۆلیس؟ چیی پێ بڵێم. نەخێر پۆلیس یەکجاری دەست نادا حەپای ئەو ماڵە دەچێ. ئەمەیە کونەمشک دەبێتە قەیسەری کەرکووکیش دەبێتە کونی دەرزی. باوکم هەڵستێنم پرسی پێ بکەم؟ بێ فایدەیە ئەو بێ چارەیە چیی پێ دەکرێ. هەر هێندەی منی لێ دەزانێ وەک منیشی پێ ناکرێ. بەو شەوەی توف و بەرەبەیان، تەنها چارە ئەوەیە حەمە ئاگادار بکەمەوە. ئەگەر کار لە کار نەترازابێ. حەمەی بەدبەخت ژن لە دنیا قات بوو؟ کەس ئەما چاوی تێ بڕیت گێلاس نەبێ؟ پارەی باوکت هەر بۆ ئەوە بوو دەردی سەری پێ بکڕیت؟ تف لە هەرچی پارەی دنیا هەیە ئێستە لەگەڵ ئەژدەمای چەمەوانە چۆناوچۆنی دەردەبەیت؟

بنگیوە هەبێ ئەم زۆرابەیە. خۆ من قەتم نەدیتبوو هەر بە بیستن ناسیبوومم بەڵام دیتنی بۆچی بوو، دنیا دەزانێ چۆن نفووراتیکە. کەس نییە نەیناسێ. منداڵی بێ ژێر دەکەنەوە. دەبوو لە دوازدە سوارەی مەریوان بێ. ئەو بەینە لە نزیک ئومەرمەندان دەورەی لێ درا. کەسی لەگەڵدا نەبوو خۆیشی دەرباز کرد و دووردەمانچەشی بەتاڵان برد، دوو کەسیشی لە ناحەزانی بەردانەوە لێی فروسماوە ئانەنگۆری کەللەی بەتاڵی خۆم! چۆن لەو دەمەی ناو بازاڕ کوێرایم دامات تازە سەد جاران دەست شکاندنەوە سوورتووە جگەرمیەک نامێنێ. حەمەی بەدبەخت، هەر دەڵێی بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا حەمە بەربەلای ئەژدەمای چەمەوانە حەزی لە گێلاس کرد. دەڵێن گێلاسیش دڵی بۆی دەچوو. کوێخا تۆفیقی باوکی بە مەسەلەکە ڕازی نەبوو. گۆیا گێژاوی زۆرابی لە کچەکەی دوور دەکردەوە. یەڵێ دەوڵەتیاریزی کرد هات بۆ کەرکووک. دەک هاتنت بەخێر نەبێ. خێری چی و ترخێنەی چی. زۆراب تاعوون و سیلە لێ دەربازبوونی نییە.

کوێخای نگبەتی! زۆراب کفری نەکرد کچەکەتی خۆش ویست. ئەدی خزمی خۆت نییە؟ دام نا تۆی بە خزمایەتی بەخشی، خاتری گێلاسیشی بۆ خستبتە پاڵ خزمایەتی، حەمە بۆ کوێ دەبەیت؟ گێلاست بەشوودا یان مەرگ؟ حەزت لێ بوو بێوەژن بێ؟ یان

عشقی یارەی مام مراد بووی؟ پیربووزەکان واز لە قۆرە خەیاڵی خۆیان ناهێنن، دەیکەنە تۆق و دەیخەنە ئەستۆی ئەولادیانەوە هەتا کەلەشیان ئەبێتی پاشگەز نابنەوە.

لە کورسییەکەی ڕاست بۆوە ڕێی بۆ لای هۆڵ. دڵی مێروولەی دەکرد بۆ حەمە. برابەری بوو، لەوەتەی هاتووەتە شار یەکدییان ناسیوە. حەمە کوڕێکی مەردە و لەسەرەخۆیە، تاڵانەی باوکیەتی. لە منداڵییەوە نۆکەری فەرمانی بووە و قسەی نەشکاندووە. هەر باوکیشی گێلاسی بۆ دۆزییەوە کە خوازبێنی کرا جاری کەس نەیدەزانی زۆرابی بەدواوە بووە. گێلاسی وەها کەش و زیر و بەرچاو، حەمەش هەرێتی ژن هێنانیەتی، مەکتەبی تەواو کردووە و یارییەی باوکی دەدا. باوکیشی کیسەی بۆ کردووەتەوە ئیتر چۆنی لێ ڕاوەستێ؟ کێ بووکی وەها نازداری چنگ دەکەوێ؟ دە ڕۆژێک دەبێ لە باوەخۆوند گەڕاوەتەوە بۆ ماڵی حەمە. مستەفا ئەمانەی بەخەیاڵدا دەهات و تێیان دەگەیی و پێشیان ڕازی بوو بەڵام دڵی بەشتێک ناوی نەدەخواردەوە. ئەم گێلاسە زیرە بەوێڵ و تەرتیبە چۆن مەسەلەی زۆرابی لە حەمە نەگەیاند؟ زۆراب لەوانە نییە حیسابی بسڕێتەوە. گێلاسیش ئەمە دەزانێ. ئەگەر نەزانێ گێلاس نییە. لە ڕووم ئەهات بڵێم حەمەگیان ئەمەم بۆ ڕوون بکەوە. خێزانت پێی نەگوتی پێشتر فلانەکەس بەتەمای بووە؟

مەسەلەکە هی لە ڕوودان نییە. نەگوتراوە و ناگوترێ. ماڵەی وەها ناسک هەتا سەر بە فەلاکەتەوە نەگەیەنێ قسەی لێوە ناکرێ. شەرم و شکۆ زاڵە بەسەر هۆش و بەرژەوەند. سەد مەسەلەحەتی گەورە لەبەر شەرم باسی ناکرێ و دەمرێ. ئەمەش هەروەها لاحەولەوەلا.

بەملا و بەولادا هاموشۆیەکی بێ ئامانجی کرد و لە پەنجەرەی هۆڵەوە چاوێکی بڕییە تاریکایی دەرەوە لە ڕەهێڵا دەهار بوو باران بە لێزمە دەباری. دانیشت، پەنجەی دەستەکانی تێک ترنجاندن و وەک کڵاو خستینە سەر ئەژنۆی. بێ ئۆقرەیی لێ دەتکایەوە، لە کەمەری بەهێشتەوە دەتگوت کێلەقەبرە قیت وەستابوو.

هەردوو قاچی وەکو دوو لوولەی ستوونی بەسەر زەوییەوە چەقی بوون. دوو قامکی بەدەوری یەکدیدا سووڕیان دەخوارد. چاوەکانیشی پەرەی ناو مێشکیان دەخوێندەوە تارمایی خوێن و دەماتچە. بەخۆی نەیوو دەستی لەو تارماییە وەشاند و بەلاوەی نا.

سەعاتی مەچەکی تریسکایەوە خێرا سەیری کرد- «مەلا بانگی داوە لەبەر هاژەی باران گوێم لێی نەبووە ئۆخەی هەر نەبێ بەهانە، شەو شریت پێچی کردبووم. سەعاتێکی دیکە نابا ڕووناک دادێت. تاکسیش پەیدا دەبێ. سەرخەوێکی گورگانەی بۆ دەشکێنم هەرنەبێ نیو سەعاتێك بنووم کفتوگۆی لەشم دادەکەوێ. ناچمە ئوێنەوە نەکا خەوم تێربێ، کەسیش نازانێ بە تالووکەم».

پەتوێکی بەخۆی دادا و لەسەر تەختێکی هۆڵ درێژ بوو. هەستی ئەوتۆی بە شەکەتی کرد نەتوانێ چیی دی خەست بیر بکاتەوە لە موشکیلەی حەمە. بێ ئارامی سواندبووی. هەر گەلاڵەیەکی بەدڵدا تێ دەپەڕی لە خۆوە دەڕما. دوو بارەشکی لەسەر یەکدی هاتنێ و هەستی تێکەڵ بە لێزمەی باران بوو. پڕووشکەکان پنۆك پنۆك بەسەر شەبەنگی سەرمای خەویدا دەنیشتنەوە تاکو «کاکە! کاکە»ی نافتاو هێنایەوە دنیای پڕ هەستوخوست. لە پێشەوە زڕە دەنگ و ڕەنگێکی بەدی کرد هیچ مەعنایان نەبوو. پەردەی خەو لەسەر هۆشی نیوەنووستووی هەڵستا ئنجا چوار دیوار بوونەوە بە هۆڵ، پلووسکیش پێوەندیی بە بارانەوە پەیدا کرد. نافتاو، جارێ، لە چارچێوەی گەورەتر بوو، نەترنجابووە ناو سیناریۆی پاش هەڵدانەوەی پەردەی خەو.

«ها نافتاو گیان چیتەوە؟».

«کاکە لە هۆڵی وا سارد و سڕ بە پەتوو سەرمات دەبێ. سەرلێفەکت بووبینم پان دەچیتەوە ژووری خۆت؟».

«سەرلێفی بێ ناوی وا تازە هەڵستام.»

سەعات حەفت بوو نەیدەزانی ڕۆژهەڵاتووە یان ماویەتی. هەور و باران تەمی خۆیانیان بەسەر ڕووناکاییدا هێنابوو.

«چایەت حازر کردووە؟».

«چایە حازرە، هێلکەت بۆ نەکوڵێنم؟».

تا هێلکە دەکوڵێ حەمە چیی بەسەردێ.

«هێلکە ناخۆم، خێرا ئیستیکانەیەکم چایە بکەیەنێ. » دوای سێ دەقیقە چایەی گەیشتێ. بە پەلە خۆی تەیار کرد و مشەمای بەسەر جلکاندا هێنا و ملی نا بۆ دەرەوە بەرێوە نافتاوی تێ گەیاند ئیشێکی هەیە وەخراندن هەڵناگرێ.

«زووش دێمەوە دڵت هیچ نەکا.»

جادە چۆڵ و هۆڵ بوو. بەرەو ماڵی حەمە ڕۆیی "بەپێیان بیست دەقیقەیەکی دەوێ". ملەچەرخێنی لە جادە دەکرد بۆ تاکسی. زۆری نەبرد تاکسی پەیدا بوو.

«لێ خورە بۆ ئەو بەر. کاکە گورج کە.»

هەندێ چەند قومێک لە جگەرە بدەی گەیشتە گەڕەکەی ماڵی حەمە. لە نزیک ماڵیانەوە دڵی پترێ لێ دا. لەبەر دەرگایان تاکسیی وەستاند. چەند هەنگاوێک ڕۆیی و گەڕایەوە، پارەی دایە شوفێر و بەڕێی کرد. هەمان دەرگە و دیوار و ڕیزە خانووی بەر لە چەند ڕۆژێک بوون کە لە سەردانی حەمە دیتبوونی. هەر بارانەکە ڕەنگێکی لێڵی لەو دیمەنە هەڵسووبوو. هەموو شتێک وەکو خۆی بوو.

"سا خودایە من بە سەهوو چووبێتم".

چووە ناو دەرگاکە. دوودڵ بوو. ئەو ناوە خەمەرێکی ڕانەدەگەیاند سەریەبنیادەمەوە بنێ و حەمە و گێلاسی تێدا بەدەنگ بێن. سروشت لە وتوویژدا بوو بەزمانێک کە هەر خۆی تێی دەگا یان تێی ناگا. تەڕە زەماوەندی بۆ خۆی دەگێڕا. گیانلەبەر دەوری لەو زەماوەندەدا نەبوو. کە دەرگە بدەم یان ڕێ و ڕێی بگەڕێمەوە؟ چ بەو خەڵقە بڵێم؟ بۆچی وەها بەر شەستبارانە خۆم خانەبەدەر کردووە؟ جارێ کەس لە نوێن دەرنەچووە، جومعەیشە دایەرەی حکومەت و قوتابخانەکان کەسیان بۆ نابڕوا. جادە دەڵێی چۆڵی تلفەیە. بگەڕێمەوە؟ ئۆقرە ناگرم تا تێ دەگەم چ باسە".

ڕیزە خانووی سەر ئەو جادەیە بێ باغچە بوون، ژوورەوەیان وەک سندووقی داخراو بوون چاو نەیدەدیتن. دەبوو دەرگە بکرێتەوە ئنجا پەرەی ئەو دیوی دەرگە وەکوو زمانی نێوان دوو لێوی بەش دەرکەوێ. دەستی بۆ زەنگ برد بە خۆی گوت دەڵێم ئیشم بە حەمە هەیە و لێی بەپەلەم. پەنجەی پێوە نا و گوێی لە زڕەی بوو. تاوێک دوای دووەم جار دەنگێک لە ژوورەوە گوتی کێیە؟ دەنگی حەمە بوو، هەرگیز ئەوەندە خۆش نەهاتبووە بەرگوێی.. خۆی پێ ناساند و چووە ژوورێ.. حەمە هەواڵوو بوو. پێوەی دیاربوو شەوێکی نارامی ڕابواردووە.

«فەرموو دانیشە با بچم سۆبەیەک بێنم هەوای سارده».

«سۆبەی بێ ناوێ کاکە حەمە، سەرمام نییە».

دانیشتن. حەمە بەدەنگ هات. بەدەنگ هات.

«بەو سبەینەی وەها تۆف خێرە ئیشاڵڵا، خۆ هیچ نەقەوماوە؟» وەزعی حەمە عادەتی بوو.

«شوکری هیچ نەقەوماوە هەر ویستم بتبینم بۆ قسەیەکی هاکەزایی».

«ڕاوەستە کاکە مستەفا، با بەماڵەوە بڵێم بەرچایی حازرکەن. مەعیەن هیچت نەخواردووە».

«پێی ناوێ کاکە حەمە».

«چۆن پێی ناوێ. سەرت لە قەبرستان نەداوە»

پاکەتە جگەرە و کفریتی بۆ دانا و بەرەو لای ماڵێ ڕۆیی.

مستەفا تەنیا مایەوە بەژوورەکەیدا ڕوانی، بزەیەکی هاتێ "ئەگەر چیرۆکنووسێن هێنابامایە ئێرە دەبوو شێوەی ژوورەکە هەڵگرمەوە و ورد ورد وەسفی بکەم. ژەنگی شیلمانەکان و درزی دیوارەکانیش وێنەکێش بکەم. خانووی شەعبی، دەوڵەمەندێکی کەونە لادێیی وەکو حاجی مرادی تێدا بێ دەبێ هەر ئاوا بێ وەک هەیە. کۆنە تاقمێک و مافووری نێوداشت و تەپڵەکە جگەرەی هەرزان. پەردە پەنجەرەی تەنک و تەسک. دەڵێن دەبێ چیرۆک وەکو فیلمی سینەما و وێنەی سەر کاغەز هەموو وردەکاتی تێدا دیار بێ. گۆیا چیرۆکێش هونەرێکە بە پێوانە و کێشانە. بوعدی دەروون و بوعدی کۆمەڵایەتی و نازانم چی و چیی هەبێ. چیرۆکیان کردووە بە نوێژ، دەستوور و هەلومەرج و ڕوکن و ناوەڕۆک و سەد مسیبەتی خوای لێ دەوێ. ئەدی ئەو هەموو چیرۆکەی لە خۆوە بێ نووسەر و بێ هەلومەرج وەکو دونبەلان و عارد دەقڵێشێنەوە و پەنجا زۆراب و حەفتا گێلاس و حەمە تێک دەناڵێنن لە چیهان کەمە؟ مانگێک خەریک بامایە گۆیهاڵ و عەبا و پەستەکەم بۆ خەلق نەدەکرا. کورە گوێ مەدە قسەی هەڵهاچراوی لەمەقدراو، ئازا بە بۆ خۆت شتێکی بەتام بنووسە و" ڕەحمەی پێی حاجی مراد و حەمە شریتەی فکری بچڕی و هاتنە ژوورەوە. حاجی بەخێرهاتنی کرد و کەمێک دانیشت و بە بەهانایەک ژوورەکەی بۆ بەجێ هێشتن. دەیزانی ئیشیان بەیەکدی هەیە. هێشتان سەرەکی وتووێژیان خۆش نەکردبوو گێلاس بە سینیی بەرچاییەوە هاتەژوورێ. بزەیەکی لەسەر لێوان بوو. لە نێو دەرگاوە «کاکە مستەفا بەخێربێ»ی بەرەو مێوان شلاندەوە و سینییەکەی لەسەر سێپایەک دانا. «بژیت گێلاس خان». دەرفەتی نەدا بگەڕێتەوە، بەقسە ڕای گرت:

«وا بەم سبەینە بێ وەختە خەوم زڕاندی و ماندووشم کردی، شاڵڵا دوێنێ میوانی عەسرانە و شەوانە مەشغوولیان نەکردبێت. تازە بووک سەربەمیوانن».

«ئەوەی ڕاستی بێ، کاک مستەفا، دوێنێ عەسر هەر پوور نایشێی حاجی برایم سەری لێ دابین. لە بازاڕ دەگەڕایەوە ڕێی کەوتە بەر ماڵی ئێمە سیلەی ڕوحمی بەجێ هێنا». "ها ها (مستەفا لەگەڵ خۆیدا گوتی) یەکسەر لە بازاڕەوە بۆ ئێرە"، ئنجا بەدەنگی بڵند: «دەسا خۆ من ئەم پوورە، پوورە کێ؟ پوورە نایش ناناسم ئەمما ئەگەر بیبازی بەزەمبیلەوە بێ پووری ئەوا ناسیم».

گێلاس نەختێک خێسەی لێ کرد: «ئنجا کەی خەڵق بەبیبازی چی و زەمبیلە ناسراوەتەوە؟».

حەمە بەدەنگ هات: «ئێوە چ دەڵێن بیبازی چی و زەمبیلەی چی؟ من پوور نایشم نەدیت کەنگێن هات؟». گێلاس توند خۆی گرتبوو بە دەنگێکی ئاسایی گوتی: «دوێنێ نیوەڕۆ هاتە ماڵمان، تۆ چووبوویتە دەرەوە هەر منیش دیتم مامۆژنم نووستبوو. ڕاستییەکەی ئەمانەتەکی منی لابوو هێنایەوە». تیلاکی چاوی بریە مستەفا.

حەمە ویستی زیرەکی بنوێنێ گوتی:

«بازنە مارپێچییەکەی لێ وەرنەگرتبێت نموونەی لەسەردروست بکا بۆ کچەکەی؟».

«شتێکە هەروا. خۆت دەزانی ئیشی ژنان چۆنە ئەوە نییە بۆ پیاوان باس بکرێ».

حەمە ڕووی لە مستەفا کرد: «تۆ ئەم پوور نایشەت نەدیتووە حاجی برایمیش هەر لەگەڵ ماڵی گێلاسدا هاتن بۆ کەرکووک، جارێ تازەن. پوورە نایش شیرینی داوەتە گێلاس بە چاوی کچەکەی خۆی سەیری دەکا...».

مستەفا سەرێکی ئەکاند و ڕووی لە گێلاس کردەوە و گوتی: «دوێنێ لە بازاڕ دیتم نافرەتێکی عەبابەسەر زەمبیلەی لێ کەوت بیبازەکانی بڵاوبوونەوە، کابرایەکی پەستەک لەبەر بۆی کۆکردنەوە خۆیشی زەمبیلەی لێ کەوت و بایەنجانەکانی تێکەڵ بەو بیبازانە بوون. ئەمما حەمەگیان کابرا سەعاتێکی لە دەستی ڕاستی بەستبوو ناورینگی دێنا دەتگوت ئاڵتوونی بیست و چوارە».

گێلاس هەر ئەوەندە بزێکا کە چاوی سەرنجدەر تێی بگات. لێی ڕوون بوو دەمودووی مستەفا دۆستانەیە. دەستی بۆ بەر زاری برد گوێیا باوەشکی پێ دەشارێتەوە، ئنجا گوتی: «پوورنایش نەختێکی گێڕایەوە بۆم. باش بوو تەڕوتووشی

ئەبوو ئەنا قوربانی ئەبوون خۆی و بیبازیشی. ئەچم چایەتان بۆ دێنم.»

مستەفا دەستی بەخۆراکەوە خەریك بوو، لە دڵیشدا مەسەلەکەی ئەم دیو ئەو دیو ئەکرد. پێ ئەچوو ئەو ترسەی تێدا نەبوو کە لێی ئۆقرەبوو. زۆرابی تێدایە بەڵام هەرمەشەکەر نییە. پوور ئایش خەریکی ماڵ کاولیی گێلاس نابێ. گێلاسیش پێوەی دیارە ئاگاداری هەموو شتێکە.

"چی لە گێلاسم بیست هی ئاوێژی و چارەسەرکردنە، رووە و هێزە. چ بە حەمە بڵێم؟ بۆچی هاتووم؟" لەگەڵ ئەم خەیاڵانەدا وەها رادەسابە خواردن و قسەی تێوەرێخی بەدوا یەکیدا رێی بە حەمە نەدا بیر لە پرسیار بکاتەوە. جارێ هیچ وەڵامێکی بۆ ساز نەدرابوو.

«دەستت خۆش بێ گێلاس بۆ هێلکەرۆنی وەها بەتام "ئاشکرات ناکەم". ماستەکەتان هی کوێیە حەمەگیان؟ "ئەڵێم بۆ قەرز هاتووم" لە پاروطی بەهێشتەوە ماستی چاکی لێ چنگ ئەکەوێ! چۆن چۆن کاکە حەمە؟ گۆیا چیم لە دڵدا بێ؟ نە سەغڵەتم و نە هیچ.»

گێلاس شیر و چایەی هێنا بە شەکری زیادەوە:

«بە ئارەزووی خۆتان شیر لە چایە بکەن.»

مستەفا رووی تێ کرد، پاروو لە دەستدا: «بژیت گێلاس خان. بەخوا هێلکەرۆنەکەت فرتەنەیەکە بۆ خۆی. من خەریکی ئەم تامە خۆشەم حەمە وا ئەزانێ بەمەڵهەم.»

حەمە زمانی لە زاری گێڕا، رێی قسەی خۆش کرد و گوتی: مستەفاگیان دڵت گرێیەکی تێدایە.

«کاکە حەمە نەگرێیە و نە موشکیلە "درۆی بۆ ساز درابوو". ئێستا بۆت باس ئەکەم چی هێناومی، گێلاسیش هەر خۆتی بۆ متمانە.»

گێلاس خەریك بوو جێهان بهێڵێ بەڵام نیازەکەی بەتاڵ کردەوە و چەقی. پشتی لە پەنجەرەکرد، رووی بەرەو ژوورەوە. مستەفا ئانەکەی بەزیادکرد و فرێکی گەرم و گوڕی لە شیر و چایەی هەڵماوی دا و گوتی: «راستییەکەی هاتبووم بێگارێکت پێ بکەم "لە تیلاکی چاوەوە ئەمدیت گێلاس راوەستاوە" بەڵام هەر بەرێوە بووم ژێوان بوومەوە.»

حەمە چاوی تێ بڕی، «بۆ ژیوان دەبیتەوە؟ ئەکەی بیما ڕائەبەڕمووی؟ بڵێ بزانم بێگارەکە چییە.»

«خۆت دەزانی، حەمە گیان پیاو چەندێکی لەگەڵ دۆست یەك ماڵ بێ کە هاتە سەر تەکلیفی پارە ترسی لێ دەنیشێ. بڕوات بێ بە شەرمەوە و لە ناچاری تەکلیف لە باوکم دەکەم بۆ پارە "مستی دەکرد گێلاس خاو دەبێتەوە". بەبێئەکە ئەم خرتە خرتەم لە دڵدایە، شەرم دای دەگرتم هەتا ئیمشە و هەزار خەیاڵم کردەوە و هەزار جەوابی خۆمم دایەوە ئنجا بەتەواوی ترسم لە تەکلیفەکە شکا و وا.»

«هەی بێ قەزابی مستەفا، بەینی ئێمە کەی شەرم و کۆمەکردن هەڵدەگرێ خۆتی تێدا وەها هەناسەسوار بکەیت. دەسا بەم زووانە پێویستم هەبێ شەرم ناکەم چاکەتەکەت لەبەرداکەنم.»

«حەمەگیان منیش هەروەهام لەگەڵ تۆدا، بەڵام ئیشەکە هی بەینی من و تۆ نییە، هی بەینی باوکم و باوکتە. ئەمما گێلاس خان بڕوات بێ من لەو کێشەیەدا شەو لەگەڵ خۆم فکرم دەکردەوە، هەر ناوناوە یەك بایەنجان و پیازم دەهاتنەوە بیر، تا دوای مەلا بانگدان نەنووستم. سەعات حەوت کە ئافتاو لە هۆڵەکە بەخەبەری هێنام یەکسەر بۆی دەرچووم نەکا دوودڵی دام گرێتەوە.»

حەمە قسەی لێ وەرگرتەوە: «دە بڵێ مەسەلە چییە؟ تۆ هەر کوتەکوت بەدەوری نیازەکەتەوە دەکەی نوختەیەکت نەرکاند؟»

«کاکە حەمە مەسەلە ئەمەیە: باوکم بەتەمای شەراکەتێکە لەگەڵ حاجی سلێمی بریندارانا، پارەی تەواوی نییە بە ریباش قەرز وەرناگرێ. گوتم بەڵکو باوکت حەقەرزێکی بداتێ.»

حەمە قسەی پێ بڕیەوە:

«باوەڕ ناکەم باوکم نکوولی لەو قەرزە بکات هەر ئەوەندەیە لە پارەکەی ئەمین بێ. ئۆت دەزانی دەستەی پێش ئێمە ئەختێك وەسواسن.»

مستەفا چاوێکی لە گێلاس کرد و بە ڕاوێژی "بووکی گوێت لێ بێ" گوتی: «قسەم ئاوە. جارێ بەرێگاوە بووم ساردبوومەوە لەبەر دەرگە دابەزیم خەریك بووم ڕێ و ڕێ گەڕیمەوە. دەزانی کاکە حەمە، پیاو لەگەڵ خۆیدا لێك دەداتەوە و باوەڕێك دەهێنێ، واتر کە ڕوویەڕووی خەلق و خوا بوو شتێکی دیکە دەبینێ و قەناعەتی دەگۆڕێ.»

«مستەفا گیان بۆ قەناعەت دەگۆڕیت خۆ.»

«بوومستە کاکە حەمە جاری ماوەمە.»

«هەرکە لە ناو دەرگەتان ڕاوەستام و دەستم برد زیل لێ بدەم بەدڵمدا هات هەرچی لەگەڵ خۆمدا گوتبووم ڕەنگە بێ بنەوان بێ. کێ دەڵێ شەراکەت سەرموخێرە. گێلاس خان! بنهایەم زۆر سەیرە بە موویەك دڵی دەگۆڕێ. تەنیا دیتنی ئەو دەرگە و دیوارانەی وەها ئارام بێ دەنگ و بێ نیاز بەندیباوی شەراکەت و خوولیاکانی شەویی تێك پێچایەوە. دەنگوت کوڕەکەی بەر لە چارەگە سەعاتێك نیم. سەریشت دێشێنم گێلاس خان.»

«بێ قەزا بی کاکە مستەفا چۆن دڵت دێ، تۆ ئاکە برامی.»

«ئاخر گێلاس دەمەوێ فەلسەفە لێ بدەم. خۆت دەزانی بەدبەختی وەکوو من لە خوێندنەوەوە سەدخەیاڵ ڕووم لێ دەنێ. زۆریشیان سەر بە ئاکامی ناخۆشەوە دەنێن. ئەمما واش دەبێ لاپەڕەی کتێبێك پیاو ئامادە دەکا بۆ ڕووداوی بە سفتۆسۆ کەچی بەر هەڵمداتەوە لەتکاو بەسەر خۆشیدا دەچێ. منیش ئەم سبەینەیە وەها بووم، بە دابەزینم لە بەردەرگەتان چی بە شەو هەڵم نابوو لە خەیاڵات و شەراکەتی نێوان باوکم حاجی سەلیم هەڵوەشایەوە چووە بارێکی دیکە.»

گێلاس ڕووی مەیلە و سوور هەڵگەڕا، پشتەو ڕووناکی، ئنجا گوتی:

«کاکە مستەفا سەدجار بەخێربێیت. مادەم دڵیشت حەسایەوە قبیرسیا لەو زەحمەتیەی بەریاران و بێ خەوییە دیبەتی حەمەش بۆ تۆ ئەوەندە دەهێنێ. هی حەمە و تۆ و مامەمراد.»

«ئامۆژنیشت ئابینم بەداخەوە بڕوات بێ بە باوکم نەگوتووە هەریکی شتێکی نەوتوویم. ئەرێ دەزانی حەزدەکەم ئەم پووریشە ببینم؟ من چوزانم خزمی گێلاسە..»

گێلاس بەدەنگ هاتەوە: «هەر خزم! بڵێ دایکمە. ئەوەندەی شیر داوەتمێ ناوناوە فلان و فلانیش دەبنە خوشك و برام چونکە ئەوانیش شیریان خواردووە. هەندێك پێشی باوەڕ ناکەن وا دەزانن دەیەوێ خەڵق لەیەکدی حەرام بکا بەناوەی خوشك و برایەتی.»

ئەرمە پێکەنینێکی هاتێ و دیسان ڕووی سوور هەڵگەڕا. مستەفا گوتی: «لە ئێستاوە بەدلیکی خۆم قبووڵە. حەمەگیان بە باوکت بڵێ مستەفا سەفەری بەغدای هەبوو، لە ترسی چنگ نەکەوتنی سەیارەش وا بە زوویی لە ماڵەوە دەرچووە. هاتبوو بزانێ

ئیشێکمان لە بەغدا هەیە نییە.»

«تۆ یەکجاری وازت لە شەراکتەکە هێنا؟»

«ئەکەی کاکە حەمە لای باوکت باسی بکەیت. بە ئەبووی دانێ. ئێتر بمبەخشن من دەڕۆم. دواتریش ئەگەر پێویست بوو دەڵێم سپارەم چنگ نەکەوت چونکە فکری سەفەرم نییە.»

مستەفا هەڵستا، حەمە و گێلاس تەکلیفی مانەوەیان کرد بۆ ئێوەڕۆ. پێی گوتن ئافتاو دڵی لە خرتوپرتدایە نازانێ بۆچی وەها بێ وەخت دەرچووم.

«خوا بەزیادی کا نانی وەها بەتام. بەیانیتان باش.»

هەردوویان لەگەڵی چوون بۆ بەردەرگە تا عەرەبانەیەک پەیدا بوو. کاتێک گەیشتەوە ماڵێ سەعات ٩ بوو. باران لە ڕێژنە کەوتبوو بەڵام تاڵگەی پلووسکەکان و شەقە جۆگەی شەقام و کۆڵانەکان هێشتان مۆزیەی پەلەیەکی تێز و بەپان دەدا. دینارێکی دایە عەرەبانەچی.

ئافتاو بەدیتنی کاکی گەشایەوە پێی گوت جارێ کەس هەڵنەستاوە دەسا ئافتاو گیان باسی چوونە دەرەوەم مەکە لزوومی نییە.

«کاکە چایەم لێ خەلیس بوو، هێلکەی کولاویشم لێ کۆن بوو ئەمما هەمووی.»

«ئافتاوگیان لەو چایە خەلیسە ئیستیکانێکم بۆ بێنە.»

دواتر چۆوە ژوورەکەی خۆی، بێ خەوی و بێ ئۆقرەیی شەوی ڕابوردوو لەگەڵ گەشانەوەی ئەم بەیانییە وەها تێکەڵ بوون وەکوو قاوەی شەکرلی پێی جودا نەدەکرانەوە. هەر بەو حەیاڵە دەستەملانی خەوێکی خەست بوو. کاتێک دەمەو عەسر خەبەری بۆوە دوا چۆڕاوکەی پلووسکی پاش باران بۆ چەند پەڵە هەورێکی بەرماوەی ڕەمێڵ کز کز دەگریا.

پاشکۆی عێراق، ژمارە ٥٢، کانوونی دووەم ١٩٨٤